١٩



# سوپای ئەیوبییان لە سەردەمی سەلاحەددیندا

## پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی


نووسینی

پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن

عوسمان عەلی قادر کردوویە بە کوردی





# سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا

**پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی**


**نووسینی:**

**پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن**

**عوسمان عەلی قادر کردوویە بە کوردی**


**٢٠٠٧زایینی –١٤٢٨کۆچی**

تیشک

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

**ناوی کتێب:** سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا، پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی

**نووسینی:** پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن

**وەرگێڕانی:** عوسمان عەلی قادر

**ژمارەی سپاردن:** (٦٨٢ ) ساڵی (٢٠٠٧).

**شوێنی چاپ:** کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠٠٧

**تیراژ:** ٢٠٠٠

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (١٩ )

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت :** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

**نامەی پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن دەربارەی چاپکردنی ئەم بەرهەمە لەلایەن پرۆژەی (تیشک)ەوە.**



بەناوی خوا

ئەم کتێبەی خۆم کە نامەی دکتۆرایە بەناوی (سوپای
ئەیوبیان لەسەردەمی صەلاحەددیندا) بە ڕەزامەندی
خۆم پێشکەشی پرۆژەی (تیشک)ی دەکەم کە
هەموو مافی چاپێکی بۆ ئەوان بێت و لە هەموو
ڕووبەڕووبوونەوەیەکی یاسایی خۆم بەرپرسیارم
بە ئومێدی ئەوەی کەلێنێک لە کتێبخانەی
ڕەسەنی کوردی پڕ بکاتەوە
سەرکەوتووبن.

پ. د. محسن محمد حسين
٢٠٠٧/١/٢٦



## سوپاسو پێزانین

ئەم کتێبی (سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا) ئەسڵی ئەو نامەیەیە کە پلەی دکتۆرامان، لە مێژووی ئیسلام لە کۆلێژی ئادابی. زانکۆی بەغداد دا پێ وەرگرت.

گفتوگۆکەی لە هۆڵی (الطبري) لە ڕۆژی (١٩٨١/٢/٩)دا، بە سەرپەرشتیی مامۆستای بەڕێز (محمد تۆفیق حسین) هاتە جێ. من لە وڵاتی غەریبی لە لیبیا، هەواڵی کۆچی دوایی ئەو زاتەم بیست، من حورمەتی زۆرم بۆی هەیەو چاکەی ئەو لە بیر ناکەم.

لیژنەی گفتوگۆیەکەیش لە مامۆستایانی بەڕێز: پرۆفیسۆر دکتۆر بشار عواد معروف، پ. رشید عبدالله الجمیلي، پ. خاشع عبادة المعاضدي و پ د. عبدالمنعم رشاد پێکهاتبوو. کە ئەمەی دواینیان لە دانیشتنەکەدا دیار نەبوو.

ئەم کتێبە، بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٤٠٦ك/ ١٩٨٦ز) دا، لە بەیروت–لوبنان– لەلایەن دەزگای (الرسالة) وە چاپکراوە. پاشان چەندین جار بەبێ ئاگادری خۆم چاپ کرایەوە. دەزگای چاپەمەنی (ئاراس)یش (کە زۆ سوپاسی دەکەم) سەرلەنوێ چاپی کردەوەو لە نیشتمانی باوباپیرانی سەلاحەددیندا، لە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستاندا، ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی خۆی گرت و ڕێزوحورمەتی بێ پایانیان لێ دەگرم. لە هەمان کاتدا، زۆر سوپاسی بێ پایانم بۆ (پرۆژەی تیشك) لە سلێمانی کە ئەرکی چاپ کردنیان لە ئەستۆ گرت، کە بۆ یەکەم جارە بە زمانە ڕەسەنەکەی سەلاحەددین چاپ دەکرێت.

**دانەر**

**سلێمانی**

**٢٠٠٧**

## پێشەکی

### بواری لێکۆڵینەوە:

لێکۆلینەوە لەسەر لەشکرو لەشکرگێڕی لە مێژوودا بە بابەتێکی گەلێ گرنگ دەژمێردرێ، کتێبخانەکانیشمان پێداویستییەکی تەواوی پێی هەیە. لێکۆڵینەوەی لایەنی لەشکرو لەشکرسازی لە مێژووی ئیسلامدا هەتا ئێستاش لە قۆناغەکانی سەرەتاییدایە، کەچی لایەنەکانی دیکەی بایەخێکی گەورەتری پێدراوە، نەخاسمە لایەنە سیاسیو هزرییەکەی، هەر ئەمەش وەهای لێکردم ئەو کایەیە هەڵبژێرمو لەو ماوەیە بکۆڵمەوە کە سەلاحەددینی فەرماندە سەرکردایەتیی لەشکرگەلی موسڵمانانی بەرەو ڕزگارکردنی خاکی شام لە خاچدروشمە داگیرکارەکان بگرێتە دەست. ئەوەبوو، لە دوای مەرگی سوڵتان نوورەددین مەحمودی کوڕی تێکۆشەر عیمادەددین زەنگی هەلومەرجێکی ئەوتۆی بۆ ڕەخسا، لەو ململانێ خوێناویەدا پێگەی بەرپرسی یەکەم وەربگرێ، چونکە سەرەڕای خەسڵەتی شارەزایی ڕێکخستنی سەربازییو فەرماندەیی لەشکرو کارامەیی لە لەشکرو لەشکرگێڕیدا هێزو توانایەکی بەرفراوانو بێشوماری خەڵکی ناوچەکەشی کەوتە دەست.

مۆرکی لێکۆڵینەوەی لەشکرسازی پێداویستی بەوەکرد کە خۆمان لەباسی مێژووی سیاسی لابدەین و دووی نەکەوین، لەبەرئەوە وازمان هێنا لە شرۆڤەی ڕووداوەکانی بەرەوەی ئەو سەردەمەی کە سەلاحەددین بە خاووخێزانەوە لە وڵاتی شام ژیاون، هەروەهاش باسی بارگۆڕانی میسرو چۆن چۆنیش جڵەوی حوکمی میسری کەوتوەتە دەست و چۆنیش هاتووە بۆ دیمەشق شرۆڤەی جموجوڵی لە وڵاتی شامو دەستگرتنی بەسەر باقیمەنی دەسەڵاتەکانی (نوورەددینی)دا، ئەوانەمان هەمووی پشتگوێ خستووەو ئەگەر زۆر پیویستیش نەبووبێ، خۆمان لەقەرەی ئەوە نەداوە کە باسی پێوەندی سەلاحەددین لەگەڵ لایەنە ئیسلامییەکانی دیکەی بە نموونە، وەك خیلافەتی عەبباسی لە بەغداو ئەتابەکی لە موسڵو میرانی جزیرەو هێزە حوکمبەدەستەکانی باکووری ئەفریقاو حوکم بەدەستانی ئەرمەنستانو ئیمپراتۆری بیزەنتەو لایەنی دیکەش بکەین.

خۆشمان بە تەواوەتی بە ماوەی ئەو چارەکە سەدەیەشەوە نەبەستووە کە سەلاحەددین لەو ماوەیەدا حوکمی میسری کردووەو پاشانیش حوکمی شام، چونکە ڕێکخراوەکانو دامودەزگا (سەربازیو ئیدارییو ئابوورییەکانو .. هتد) ئەمانە، بە بەسەرچوونی قۆناغێك و دەست پێکردنی قۆناغێکی نوێ بزر نابن، بەڵکو تا ماوەیەك لە هەناوی سیستەمە تازەکەدا هەر دەمێنێتو پاشان ئەگەر بێزران ئەوە بۆ خۆیان وردە وردە لاواز دەبنو دەپووکێنەوە، یانیش دەست دەکەن بە قۆناغێکی دیکەی بووژانەوەو گەشەکردن. لە لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوەکاندا گەلێك ئاڵۆزو زەحمەتە بتوانین ئەوە ساغ بکەینەوە کە ئەم دەوڵەت، یان ئەو سەردەم جۆرە دامو دەزگایەکی نوێو ئاکارێکی تازەبابەتیان داهێناوەو لێیان زیاد کردووە، چونکە هیچ دەوڵەتێ ناتوانێ بەبێئەوەی سوود لەوانەی پێشتری خۆی وەربگرێ چوار کۆڵەکەی ڕێکخراوەکانی خۆی داکوتێو بنیادبنێ، نەخاسمە ئەو ڕێکخراوە سەربازییانەش کە بۆ بارودۆخی ئەو دەوڵەتە بلوێو بگونجێ. لە دەوڵەتی نوێدا هەستو نەستی نوێ دەستپێدەکاو هەر شتێکیشی لە نوێ لێ پەیدا ببێ دەبێتە سەرباری دەساوەردە کۆنەکانو، لەمەشەوە ڕێکخراوگەلێ دهێنەدی، بەهی دەوڵەتە تازەکە لەقەڵەم دەدرێن.

ڕێکخراوە لەشکرسازییەکانی دەوڵەتی ئەییوبیش لەم ڕێسایە بەدەرنەبووە، خۆ ئەگەر بێتو ئەو گۆڕانکارییانەی سەلاحەددین لە میسردا هێنایەدی، نەخاسمە گۆڕانکارییەکانی لە پێکهاتەی لەشکری فاتمیو هێزی دەریاییدا وەدەرنێین، ئەوە بۆمان دەردەکەوێ کە دەوڵەتی ئەییوبی زۆرتر ڕچەی دابونەریتی زەنگییەکانی گرتووەتەبەرو مۆرکی خۆیشی لێناوە، چونکە ئەییوبییەکان هەر بە ئەسڵ لە ژێر چەتری عیمادەدین زەنگیو نورەددین مەحمودی کوڕیدا پەروەردەبوونو وڵاتی شامیش، بووبوو بە نەبەردی جموجووڵی لەشکری سەلاحەددینو ڕێکخراوەکانی ئەییوبییەکانیش کتومت هەروەك درێژەپێدانێکی ڕێکخراوەکانی دەوڵەتەکەی نوورەددین دەهاتە بەرچاو. (القلقشندي) هەر بەو باوەڕەوە دەڵێ: "دەوڵەتی ئەییوبی لە وڵاتێکی دیکەوە هاتبووە میسرو پاش نەمانی خۆیان فاتمییەکان هاتنە ئاراوە، لە زۆربەی کاروباری وڵاتەکەدا لەوان نەدەچوونو جیاوازبوونو زۆربەی دیمەنی وڵاتەکەشیان گۆڕیو

ڕەفتاریشیان هەر ئەو ڕەفتارە بوو کە دەوڵەتی ئەتابەکی لە سەردەمی عیمادەددین زەنگیدا لە موسڵو، پاشانیش (الملك العادل) نوورەددین مەحمودی کوڕی لە شام دەیانکرد".[1] لام وابێ ئەم درێژەپێدانە ڕێکخستنی لەشکرو جلوبەرگی سەربازو هێزی گرووپی سەربازیو بارەگاو سەربازگەکانی لەشکرو بەکارخستنی مەملوکەکان زۆرترو زیاتر دەگرێتەوە، وەك لە شتیدیکە. ئەمەشمان لە بەشەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ڕوون کردووەتەوە.

ئێمە نیازی ئەوەمان نییە بە درێژی لە ڕێکخراوە سەربازییەکانی دەوڵەتی نوریو زەنگیی بکۆڵینەوە، چونکە نامانەوێ لە بابەتەکە دەربچینو پاشانیش بگەڕێینەوە سەر ڕێکخراوەکانی پێش سەردەمی ئەتابەکی، بە تایبەتیش ڕێکخراوەکانی دەوڵەتی سەلجوقی کە ئەتابەکییەکانی لێ پەیدابوون، یان وەکو (أبو المحاسن، کوڕی تغري بردي) بڵێین: "نەوەی بووەیهی نەوەی سەلجوقیان پەیداکردو نەوەی سەلجوقیش نەوەی ئەرتقو ئاق سەنقەری باپیرەی نەوەی زەنگییان پەیدا کرد". و پاشانیش: "نەوەی زەنگیی نەوەی ئەیبوبی سوڵتانەکانی میسرو (شام)یان دروست کردو پاشتریش نەوەی ئەییوب مەمالیك و دەوڵەتی تورکانیان لە میسر دروستکرد، دە وەرە سەیری ئەم جیهانە بکەو بزانە چۆن چۆنی هەتا ئەمڕۆش ئەوە هەر کۆمەڵەو ڕێگای بۆ پەیدابوونی کۆمەڵێکی دیکە خۆشکردووە"[2]. واتا، تا ڕۆژانی ئەو مێژوونووسەش، (٨٧٤ك/ ١٤٦٩ز) ئەم بەزمە هەر بەردەوام بووەو بەردەوامیش دەبێ.

دەبێ ئەوەش بزانین کەئەم لیکۆڵینەوەیەمان لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری نییە، بەڵکو لێکۆڵینەوەی لەشکری ئەییوبی. سەلاحییە، بەو چەشنەی کە هەبووە، لە کاتی زەروریشدا تیشکمان خسستووەتە سەر واقیعی لەشکری نوری لە وڵاتی شامو جەزیرەو هی لەشکری فاتمییش لە وڵاتی میسر. ئەو زانیارییەش کە هەمانە لە سەر پێکهاتەکانی تیمەکەی نورەددین کە (أسدالدين شێرکۆ)ی مامی سەلاحەددین فەرماندەیی دەکردو بەرەومیسر ملی نا، نەخاسمە لە هەڵمەتی سێیەم (دوا هەڵمەت)ی نورەددین کە ئیدی لەو وڵاتەدا لەنگەریگرت، ئەو زانیارییەمان تا ڕاددەیەك زانینی پێکهاتەکانی لەشکری نورەددینمان بە گشتیی بۆ ئاسان دەکا، بەڕەچاوکردنی ئەوگۆڕانکاریو بەرفراوانبوونەش کە لە لەشکری ئەییوبیدا ڕوویدا کاتێ لە وڵاتی شامدا پێیداکوتا.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئێمە لەم باسەدا، باناەینەوە سەر باسی ئەو تیمەی ئەییوبی کە لە ژێر فەرماندەیی براکەی سەلاحەددین" شای مەزن شەمسوددەولە تۆران شای کوڕی ئەییوبدا (٥٦٩. ٥٧٧ك/ ١١٧٣. ١١٨١ز) نێرداریە سەر یەمەن، چونکە باسەکەمان تەنیا لەسەر لەشکری ئەییوبی. سەلاحییە لە میسرو لە شامدا، وڵاتی یەمەن هاوبەشیی لە هیچ کۆششێکی جەنگیی لەشکری سەلاحەددینذا نەکرد، بەڵام ئەوە دەڵێین کە ئەم هەڵمەتەو هەڵمەتەکەی تەقیەددین عومەری برازای سەلاحەددین بۆ سەر وڵاتی بەرقە (لیبیا) کە هەر زوو بە زوو دەنگو باسی نەما، بەشێك لە لەشکرەکەیان خەریککرد کە لەم دوو ناوچەیەدا لەنگەریان گرتو ئۆردوگایان دامەزراند. تۆران شا، جگە لەو گرووپە سەربازە تایبەتەی خۆی کە لەگەڵ خۆی بردنی، هەزار سواریشی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ یەمەن[3] ساڵی ٥٦٩ك/ ١١٧٣ز[4].

**بەشەکانی ئەم کتێبە:**

ئەم لێکۆڵینەوەیەمان کردووە بە حەوت بەش، لە بەشی یەکەمدا سەروسیمای ئەو قۆناغەمان باس کردووە کە

---

[1] صبح الأعشى في صناعة الانشا، المطبعة الاميرية، ج٤، ص٥.

[2] النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، چاپی (دار الكتب المصرية) بەرگی/ ٥، ل٢٧٩.

[3] (أبو شامة)كتاب الروضتين في أخبار الدولتين، ساغکردنەوەی د. محمد احمد حلمي چاپی (المؤسسة المصرية العامة) بۆ کتێبدانانو وەرگێڕانو چاپکردنو بڵاوکردنەوە. القاهرە، ١٩٦٢. ج١،ق٢، لاپەڕەی ٥٥٤.

[4] أبو مخرمة تأريخ ئغرعدن، چاپخانەی بریل، لیدن ١٩٣٦، ج١ ق١، ل٥٣٧. الخزرجی، العقود الؤلؤية في تأريخ الدولة الرسولية، بە ڕاستکردنەوەو دەستکاریکردنی شێخ موحەممەدی بەسیونی عسل، چاپخانەی هلال، مصر، ١٩١١، ب١، ل٢٩. الهمداني كتاب السمط الغالي الثمن في أخبار الملوك من الغزو باليمن، ساغکردنەوەی رکس سمث، چاپخانەی زانکۆی کمبرج، ١٩٧٤، ل١٥. الثمانی، بهجة الزمن في تأريخ ساغکردنەوەی مصطفی حجازي، چاپخانەی مخیمر، یەمەن، ١٩٦٥. ل٧٥ـ ٧٦.

دەوڵەتی فاتمی لە دوا دوای ڕۆژەکانیدا بەخۆیەوە دیونی، چۆن چۆنی میسر بوو بە دەوڵەتێکی بێ هێز، کە بەرلەوە، لە تافی گەشانەوەیدا، دەوڵەتێکی بەهێزی بەرفراوان بووەو توانیبووی چەندین بەشی بەرفراوانی خاکی شامو باکووری ئەفریقیا بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، پاشان ئەم بێهێزبوونەی لە لایەن خاچدروشمانەوە بەهەل زانرا کە چاوی تێبڕن و سوود لە داهاتی لە بن نەهاتووی وەربگرن و بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، دەستی تەواویش بەسەر خاکی شامو فەلەستین و میسریشدا بگرن. وەلێ ململانێی ناوخۆ، بۆ وەدەستهێنانی پلەو پایەی وەزارەت لە میسر، کارێکی وای کرد کە لایەنێك لە ململانێکاران هانا بۆ نورەددین مەحمود بباو داوای کۆمەکی لێ بکا، ئیدی ئەمیش، لێگا لێگا، هێز لە دوای هێز دەینارد بۆ میسر، تا دواجار بۆی کرا، بەر لە هەلپەو هەڵمەتی خاچدروشمان بگرێ و لە میسردا ڕەگ دابکوتێ و ڕێگاش بۆ کودەتایەك دژ بە خیلافەتی فاتمی خۆش بکات.

لەو بەشەدا هەروەها باسی پێکهێنەرەکانی لەشکری فاتیمان کردووە، تا لەو گۆڕینانەش بگەین کە سەلاحەددین پاش ئەوەی کە بوو بە وەزیری خەلیفە العاضدو پاشتریش دوای مەرگی خەلیفە بوویە سوڵتانی میسر، بە ئەنجامی گەیاندن.

هەرچی بەشی دووەمە، ئەوە، ئەو بەشەمان بۆ باسکردنی ڕێکخستنی لەشکری ئەییوبی تەرخان کردووە، باسی شاری دیمەشقمان تێداکردووە، باسی ئەو هۆکارانەمان تێدا کردووە کە بۆچی سەلاحەددین ئەو شارەی کردووە بە مۆڵگەی لەشکرەکەی لە وڵاتی شامداو لەوێوە بەرەو نەبەردەکانی جەنگ لەشکرکێشی دەکاو، دیلەکانی خاچدروشمان لەوێ دەحەوێنێتەوەو ئەوێی کردووە بە دیوانی لەشکری شام، هەروەها لەم بەشەدا باسی گۆڕانکارییەکانی جل‌وبەرگی سەربازانمان کردووە، کە لە سەردەمی سەلاحەددین و خەلیفەکانیدا دەبینران، هەر لە کڵاوی سەرەوە بیگرە تا دەگاتە پۆشاکی لەش و پێڵاوی پێ. ئنجا هاتووینەتە سەر ئازووقەو ناردنی خۆراك، پاشان ئۆردوگاکانی لەشکری نورەددینی (النوري)و لەشکری فاتمیی و درێژەکێشانیان تا سەردەمی سەلاحەددین. دوایی هاتووین باسی لەشکرکێشی و جۆرەکانی لەشکرکێشیمان کردووە، هەروەهاش باسی زرێی تایبەت (الحلقة الخاصة)و مەمالیکی سوڵتانیی و سیستەمی کۆمەکی سەربازیی (نظام الأطلاب)و بەشەکانی لەشکرو هەریەکە بە پێی چەکی خۆی کردووەو باسی سەربازیی ڕەزامەندیمان لە لەشکری ئەییوبیدا کردووە کە بە حەزو ئارەزووی غەزاو کوشتاری خاچدروشمی دوژمن خۆیان کردووە بە سەرباز، ئنجا باسی گروپەکانی بە نموونە وەك گروپی ئەندازیاریی و گروپی پزیشکیی و گروپی مۆسیقای سەربازیی و ئاڵای لەشکر بەدەستانیشمان کردووە، کە ئەو گروپانەش لە لەشکردا جێگای خۆیان هەبووە.

لە بەشی سێیەمدا لە سەر دامودەزگای دیکەی یاریدەدەری ڕێکخستنی لەشکرو بەڕێوەبردنی کاروباری جەنگ و مەسەلەی ئاشتیی و دیلی جەنگ ڕۆیشتووین و درێژەمان پێ داوەو ئەم بەشەمان کردووە بە دوو پشك. لە پشکی یەکەمدا باسی تەتەرو نامەبەریی و دەستەی چەرخەچی (البزك)و کۆتری نامەبەرو بۆسەمان کردووەو گوتومانە کەهەواڵگریی لە سەردەمی سەلاحەددیندا شارەزاییان لە شفرەو شفرەکاریدا هەبووە. وەلێ لە پشکی دووەمدا باسی ئەنجومەنی ڕاوێژکاریی جەنگمان کردووە کە ئەندامەکانی لە میران و فەرماندەکان بوون و لە کاروباری سەربازیی پرمەترسیی و بە تایبەتیش لە کاتی تەنگ و تووشیی دۆخی جەنگدا، ڕای خۆیان بۆ سەلاحەددین دەردەبڕی و پشتیان بەرنەدەدا. پاشان هاتووینەتە سەر باسی ئەو پلان و شێوازانەی کە لەشکر لە جەنگی جۆراوجۆردا دایدەنان، هەروەهاش باسی وەرزەکانی جموجووڵی سەربازیی، یان وەستاندنی جموجووڵی سەربازیمان کردوە. دواتریش چ جۆرە ڕەفتارگەلێکیان بەرامبەر بە دیلە خاچدروشمەکان نواندووە، ئەوەشمان باس کردوە، ئنجا ئەم بەشەمان بە باسی ئەو پەیماننامانەی کە لەنێوان سەلاحەددین و خاچدروشماندا مۆرکراوە، کۆتایی پێهێناوە، دواییینیان پەیماننامەی (الرملة) بووە، کە بەسەریدا ریشاردی شێردڵ فەلەستینی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی.

5 رنسيمان، تأريخ الحروب الصليبية، گۆڕینی: د. السيد الباز العريني، دارالثقافة، بيروت ١٩٦٨. بەرگی ٢ لاپەڕەی ٦٧٣.

بەشی چوارەممان بۆ باسی چەك و جبەخانەی لەشکری ئەییوبی تەرخان کردووە، دەشبوو یەکێ لەم دوو ڕێگایە بگرینە بەر" یان ئەوەتا، باسی بەراییەکانی بەکارهێنانی ئەم چەکانە، لە مێژووی ئیسلامدا بکەین" جا موسوڵمانان خۆیان دایانهێنابێ، یان لە میللەتانی دیکەوە فێریان بووبن، یانیش ئەوەتا باسی ئەو چەك و ئامرازانە بکەین کە لەو چاخەدا هەبوون و بەکارهێنرابوون. ڕێگای دووەممان گرتەبەر، چونکە ئێمە نەهاتووین باسی چەك بەشێوەیەکی هەموەکی بکەین، بەڵکو باسی چەکی سەردەمی سەلاحەددین دەکەین.

کۆگای چەکیشمان باس کردووە، کە ئەوکات (سیلاح خانە) یان پێدەگوت و لە سەردەمی مەملوکەکانیشدا (زەردخانە)یان پێ گوتووە. ناوی ئەو جێگایانەشمان بردووە کە ماددە سەرەکییەکانی دروستکردنی چەکی تێدا فەراهەم بووە، وەك، تەختەو ئاسن. ئنجا چەکەکانمان بە پێنج بەش داناوە، لە یەکەمیاندا باسی چەکی تاکەکەسیمان کردووە، بە نموونە وەك شمشێرو ڕم و کوتەك و کەوان کە یەك کەس هەڵی دەگرت. ئەم چەکەی دواییان زۆربەرەوچاکتر گۆڕاو گەلێ جۆری لێ پەیدابوون، ئێمە باسی حەوت جۆریمان کردووە کە جۆری وەهایان بووە، بۆ هەڵدان و هاویشتنی بەتەنیا یەك کەس نەکراوەو زیاتری پێویست بووە، لەبەرئەوە بە چەکی تاکەکەسەکی لەقەڵەم نادرێ، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەویشمان بەیەکەوە لەگەڵ کەوانەکاندا باس کردووە.

ئنجا باسی چەکی قورسی بە نموونە وەك ئاگروەشێنمان کردووەو وەسفی ئاوربارێن (المنجنیق)و جۆرەکانی ئاوربارێن و تانك و وردە بابەتەکانی تانك و جۆرەکانی چەکی لەشپارێزیی، بە نموونە وەك کڵاوی زریزەو خوودەو پەستەکی زیزەو پەیکوڵی ئاسن و گالیسکەش کردووە.

لە بەشی پێنجەمدا باسی هێزی دەریایی سەردەمی سەلاحەددینمان، لەبەر ئەوە کردووە تا وێنەیەکی تەواوکاری لەشکری سەلاحەددین بەڕوونی دەربخەین، بۆیە هاتووین باسی هێزی دەریایی میسری دوادوای سەردەمی دەوڵەتی فاتمی و ئەو چاکسازییانەش کردووە کە لەم بوارەدا سەلاحەددین بە ئەنجامی گەیاندون. ئەوجا باسی مەڵبەندەکانی کەشتی دروستکردن لە میسرو جۆرەکانی دیکەی هێزی دەریایی ئەییوبی و ئەو ئامرازو چەکانەش کردووە کە لە کەشتییە جەنگییەکاندا بەکاردەخران، هەروەها ئەو دەزگا تایبەتانەش کە بۆ بەرگریی دژ بە ئامێرو ئامرازەکانی دوژمن دەخرانەکار. ئنجا باسی قۆناغەکانی هێزی دەریایی ئەییوبی کراوەو کردوومانە بەسێ قۆناغ. دوای قۆناغی تەیارو ئامادەکردن و دانانی بنچینە، قۆناغی دووەم هاتە پێشەوە کە کەشتیگەلی میسریی تێدا بوژایەوە و هێزی دەریایی ئەییوبییەکان ڕۆڵی لە ململانێی دژ بە هێزی دەریایی بە توانای خاچدروشمان لە دەریای ناوەڕاستدا گێڕا، کە ئەو دەریایە بووبوو بە نەبەردی پێکداهەڵپرژانی هەردوو کەشتیگەلەکە، جگە لەو کۆششە نەزۆك و سەرنەگرتووەی کە خاچدروشمان لە دابەزینی سەرکەنارەکانی دەریای سووردا دووچاری بوون. دوا قۆناغیش ئەو قۆناغەیە کە پاش شەڕەکەی حوتەین بەسەر هێزە دەریاییەکەدا تێپەڕی.

لە هەردوو دوابەشی (شەشەم و حەوتەمیش)دا، باسی جموجۆڵی سەربازیی لەشکری سەلاحەددینمان لەبەرچاوترین جەنگی دژ بە خاچدروشمان کردووە، بۆئەوەی ڕێکوپێکی و پلانگەلی ئەم لەشکرە لەکات و ساتی بزووتنی بەرکرداردا بخەینە بەرچاو.

لەبەشی شەشەمدا جەنگی شوورەو قەڵاو جەنگی بەربەرەڵامان لێك جیاکردۆتەوەو باسی ئەوەیانمان کردووە کە نیشانەی ئاشکرا لە نێوان شەڕەکانیدا هەبووە، بەدرێژییش باسی هەموو شەڕەکانمان نەکردووە، چونکە شرۆڤەی تەواوی هەمویان چوونیەك و هاوشێوەن. باسی نسکۆکانی لەشکری ئەییوبیمان کردووە، وەلێ قسەکەمان بەتەنیا لەسەر نەبەردەکانی شام و فەلەستین نەبووە، هاتووین باسی گەمارۆکەی سەر شاری ئەسکەندەرییەمان کردووە کە خاچدروشمان بەدەستیانەوە نەهات و شکستیان تێدا هێناو موسوڵمانان تێیدا سەرکەوتن و بە چەشنی شەڕەکەی (دمیاط)" ئەمجارەش پلانی خاچدروشمانیان بۆ داگیرکردنی کەناراوەکانی میسر لە گۆڕنا. ئنجا باسی گەمارۆی یەك لە دوای یەکی سەر (کەرەك) مان کردووە کە لەشکری ئەییوبی، پاش (حطین) ئەوێشی داگیرکرد. هەروەها باسی

گەمارۆکانی سەر بەندەرگەلی کەناراوی شاممان کردوە کە سەلاحەددین سەرکەتووانە ئازادی کردن. ئنجا باسی ئازادکردنی (بەیتو لمەقدیس) مان کردووە کە لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامدا دەنگی دایەوە. باسی گەمارۆی (صور)و هۆکاری سەرنەکەوتنی ئەو گەمارۆیەمان کردووە کە چۆن چۆنی بوو بە خاڵێکی وەرچەرخان لە ڕەوشی ئایندەی لەشکری ئەییوبیدا. ئنجا بە کۆتایی هاتنی شەڕی یەکلاکەرەوە (حطین) ئیدی ئێمەش کۆتاییمان بە بەشی شەشەم هێنا.

لە بەشی حەوتەمدا باسی گەمارۆی درێژخایەنی نزیکەی دوو ساڵی شاری (عکا)و پێکدادانی نێوان لەشکری خاچدروشمی گەمارۆدەری شارەکەو لەشکری ئەییوبی گەمارۆدەری خاچدروشمەکان و نسکۆی پڕ ئازاری خۆبەدەستەودانی ئەو شارەو هۆکاری ئەو نسکۆیەمان کردووە، کە بەرامبەر (ریشارد) خەڵکی شارەکە ئەوپەڕی قارەمانێتییان لەشەڕەکەدا تۆمارکرد. ئنجا باسی گۆڕانکارییەکانی پاش ئەو خۆبەدەستەودانەو باسی کزبوونی لەشکری سەلاحەددینمان کردووە، بە تایبەتیش لە ڕەوی بەرەو شاری عەسقەلاندا. لەگەڵ ئەوەشدا لەشکری سەلاحەددین لە دەستوەشاندنی خۆی نەوەستا، بەڵام لەشکری خاچدروشمان بە فەرماندەیی ریشارد زەفەریان هێناو لە جەنگەڵستانەکەی (ئەرسۆف)دا بەسەر موسڵماناندا سەرکەوتن.

ئەم دوو ڕووداوەی (خۆبەدەستەوەدانی شاری عکاو بەزینی ئەرسۆف)ە کارێکی وایان کرد، سەلاحەددین پلانی پێشتری بەرگریکردنەکەی خۆی بگۆڕێ‌و بیکا بە پلانی وێرانکردنی ئەو قەڵا سەربازییانەی کە جێگای ستراتیژییان هەیەو لەشکری ئەییوبی ناتوانێ بەرگرییان لێ بکات، لەشکری خاچدروشمان دەیتوانی داگیریان بکاو بییانکات بە پێگەی هێرشبردن بۆ سەر مەڵبەندە گرنگەکانی، بە نموونە، وەك میسرو (بیت المقدس). لەبەرئەوە سەلاحەددین ئەو قەڵا سەربازییانەی ڕووخاند، کاتێکیش ئەو ئیشەی تەواوکرد، ئنجا کەوتە پاراستنی (بیت المقدس) لە هێرشی چاوەڕوانکراوی ریشارد. پاشان ئەوەبوو لەشکری ئەییوبی (کەدەمێك بوو خۆی کرکردبوو) هەلی دیارنەمانی ڕیشاردی قۆستەوەو یەکەم هێرشی خۆی بەرپا کردەوە کە لەوکاتەدا ریشارد خەریکی ڕاوێژو راوێژکاریی بوو لەگەڵ پایەدارانی لەشکری سەلاحەددیندا و ئارەزووی خۆی دەربڕی بۆ ئاشتبوونەوە لەگەڵ سوڵتان سەلاحەددیندا.

دەبێ لە کۆتایی ئەم قسانەمدا، دان بەوەشدا بنێم کە ئەم لێتوێژینەوەیەی من گشت حەقیقەتەکانی نەگرتوەتەوەو هەموو لایەنیکی بابەتەکەشی بە شێوەیەکی ئاودامان نەگرتۆتەوە خۆی، چونکە ئەوەیان ئاواتێکە بە گران دێتەدی، ئاسانیش نییە بە یەك لێکۆڵینەوە هەموو لایەنێك دەربخرێن. ئەوەش کە بە دەستمان هێناوە، تەنیا کۆششێکە بۆ ڕچەشکاندنی ڕێگایەکی لێکۆڵینەوەی تر، بۆ ئایندە، ئەمەی ئێستام بەپێزتر بکا، ئومێدوەرایشم، توانیبێتم شتێکم کەم‌و زۆر خستبێتە سەر لێکۆڵینەوەی مێژووی لەشکری سەلاحەددینی تێکۆشەرو ئازادیخواز.

لە کۆتاییشدا لەوە زیاترم پێ نییە کە سوپاسی بێپایان‌و پی زانینی خۆم پێشکەش بە سەرپەرشتی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەڕێز مامۆستا موحەممەد تۆفیق حسێن بکەم کە لە ماوەی ئامادەکردنی ئەم نامەیەدا بێوچان ڕێنمایی بەنرخی پێداوم. هەروەها سوپاسی هەردوو سەرپەرشتی راوێژکار د. مرتضی حسن النقیب و د. ڕەشید عبدالله الجمیلي دەکەم کە خۆیان بە خوێندنەوەی ئەم لیکۆڵینەوەیەوە ماندوو کردو ڕێنماییان کردم. سوپاسی بەڕێز مامۆستا دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکریش دەکەم کە لەبواری وەرگێڕاندا یاریدەی داوم، هەروەها سوپاسی دکتۆر فەیسەڵ السامر و پرۆفیسۆر دکتۆر عبدالقادر ئەحمەد الیوسفیش دەکەم بۆ ئەو ڕێنماییە دروستانەی لە ماوەی کارەکەمدا بە منیان نیشان داوە، سوپاسی بەڕێزان گفتوگۆکارانیش دەکەم بەرامبەر بەو تێبینی‌و سەرنجانەی کە لەسەر ئەم نامەیە پیشانیان داوە. سەرکەوتنیش هەر لە یەزدانەوەیەو یاریدەدەریش هەر ئەوە.

**دانەر**

## ڕوونکردنەوەی ژێدەرو سەرچاوە سەرەکییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە

لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشتمان بە کۆمەڵێ ژێدەرو چاوگە لە کتێبگەلی مێژووی گشتیی و مێژووی بنەماڵەی ئەییوبیی و جەنگەکانی سەلاحەددین و مێژووی هەندێ شاری عەرەبی وەك دیمەشق و حەڵەب و (بیت المقدس)و بەیروت و شاری دیکە بەستووە. هەروەها بەکتێبگەلی شاهێدحاڵ و کتێبگەلی باسی ئوسووڵی کوشتارو دروستکردنی چەك، کتێبگەلی ئیدارەو هی جوگرافیا و زمان و وێژەییش. زەروریش نییە لێرەدا هەموو ئەو کتێبانە بخەینە بەرچاو و یەکالایان بکەینەوە، تەنیا ئەوەمان بەسە باسێکی ئەو ژێدەرە ئەسڵیانە بکەین کە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیەوە هەیە، نەخاسمە ئەوانەیان کە کەسانێکی هاوچەرخی سەلاحەددین دایانناون، یان لەو بەرگانەوە وەریان گرتووە کە لەو سەردەمەدا دانراون و ئەسڵەکانیان بزربووە. لە مێژوونوسە پێشەنگەکانی ئەو سەردەمەش:

١. (العماد) نووسەری ئەسفەهانی، أبو عبدالله محمد کوڕی صفی الدین محمد کوڕی حامد (ت ٥٩٧ك/١٢٠٠ز)ە:

ئەم مێژوونووسە بەرچاوترین نووسەرو مێژوونوسی سەردەمی سەلاحەددین بووەو لە هەمووشیان زیاتر هەڤاڵی بووە، ئاشنای تەواوی ڕۆشنبیریی ئەو سەردەمە بووەو وەزیفەی زۆریشی لە وانەگوتنەوەو دیوانی ئینشا و باڵیۆزەکاندا دیوە. لە (٨)ی (جمادی الآخرة)ی ساڵی (٥٧٠ك) سەرەتای ساڵی (١١٧٤ز) دا خۆی گەیاندووەتە لای سەلاحەددین و ئەویش کردوویەتی بە نووسەری خۆی و پشتی پێبەستووە، تا مەنزڵگەی لە لای سەلاحەددین وەك پلەو پایەی وەزیری لێهاتووە، بەڵام نەگەیشتووەتە پلەی (القاضي الفاضل) وەلێ، العماد شوناسیی لەگەڵدا پەیدا کردووەو لە نێوانیاندا دۆستایەتییەکی بەتین پەیدابووە، نامەو نامەکاری و گفتوگۆی وێژەیی شیرین و ناسك لە نێوانیاندا ڕوویداوەو بووە، تا (القاضي الفاضل) پیایدا هەڵداوەو گوتوویەتی:"العماد وەك چەرخی ئاگرپژێن وایە".[6]

العماد کۆمەڵێ کتێبی داناوە، ژمارەیان گەیشتۆتە بیست کتێب و زۆربەیان مێژووەو باسی شیعرە، بەڵام ئەوانەیان کە بەلای ئێمەوە گرنگ بن دوو کتێبە، یەکەمیان :"البرق الشامي"یەو دووەمیان "الفتح القسي في الفتح القدسي"یە، هەرچی کتێبەکانی دیکەی مێژووە، ئەوە ئەوانەی لەسەر سەردەمەکانی پێش سەلاحەددین داناوە.

العماد کتێبی "البرق الشامي"ی بە حەوت بەرگ داناوە، لە بەرەوە باسی خۆی تێدا دەکا، کە چۆن لە عێراقەوە چووە بۆ شام و لە خزمەتی نورەددیندا سەربوردەی چۆن بووەو چۆن چۆنی گەیشتووەتە لای سەلاحەددین. لەبەرئەوەش ناوی ناوە (البرق الشامي)، چونکە ژیانی ڕۆژگاری ئەو سەردەمە جوان و بەختیارەی بە برۆسکە هەورێ چواندووە کە لە پڕێکا دێت و دەڕوات.[7]

العماد ئەو کتێبەی لە کات و ساتی مردنی سەلاحەددیندا تەواو کرد، واتا سەربوردەی بیست و هەشت ساڵی لەو کتێبەدا نووسیوە، کە بە درێژایی ئەو ماوەیە لە خزمەتی دیوانی نورەددین و پاشانیش لە خزمەتی سەلاحەددیندا بووە.

لەو کتێبە بەداخەوە تەنیا دوو بەرگی ماوە، ئەو دوو بەرگەش وان لە کتێبخانەکەی بۆدلیانی ئۆکسفۆرد، یەکێکیان بەرگی سێیەمە کە درێژەی سەربوردەکانی نێوان ساڵی (٥٧٣. ٥٧٥ك) کە ئەکاتە تەممووزی (١١٧٧ تا ئایاری ١١٨٠ز) تێدایە، ئەوی دیکەیان بەرگی پێنجەمە کە باسی بەسەرهاتەکانی (ساڵی ٥٧٨ك) تا سەرەتای (ساڵی ٥٨٠ ك) تێدایە کە ئەکاتە (ئایاری ١١٨٢. تەممووزی ١١٨٤ ز).[8]

دەشتوانین باسی ڕووداوەکانی باقیمەنی بەرگەکانی تر (بە ڕووداوەکانی ئەو دوو بەرگەشەوە) لە گێڕانەوەکانی (أبوشامە)وە وەربگرین، کە لە (البرق الشامي)یەوە دەیانگێڕێتەوە، هەروەها لە کتێبی (سنا البرق الشامي)یشەوە کە (البنداري) (ت. دوای٦٤٢ك /١٢٤٣ز) لەم کتێبەیدا ، کتێبی (البرق الشامي)ی بە شێوەیەکی هونەرمەندانەی وەها کورت کردووەتەوە، جەوهەری ڕووداوەکانی دەسکاری نەکردووە. (البنداري) ئەم ئیشە جوانەی لەسەر داوای (الملك المعظم

---

[6] ابن الساعي، الجامع المختصر في عنوان التواريخ وعيون السير، چاپخانەی سریانی کاسۆلیك، بەغدا ١٩٣٤. ٩/٦٤. الصفدي، الوافي بالوفيات، باعتناء هلموت ريتر، ط، فيسبادن، المانيا ١٩٦١. ج١، ص١٣٩.

[7] سنا البرق الشامي، کورتکردنەوەی (البنداري) پێداچوونەوەی د. رمضان ششن، دار الكتاب الجديد، بيروت ١٩٧١. ص٥٢.

[8] البروفيسور جب، هاملتون، أ، ر. صلاح الدين الايوبي، يوسف أيبش، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت ١٩٧٣، ص٧٣. د. محمد أحمد حلمي، مقدمة (كتاب الروضتين) ج١، ق٢، ص٣٦.

عیسی کوڕی الملك العادل)ی بەرپرسی گەورەی دیمەشق[9] بەجێ هێناوە.

العماد لەم کتێبەیدا باسی ڕووداوەکانی نێوان ساڵی (٥٦٣. ٥٦٩)ك بە کورتیی دەکات، ئەم ماوەیەش مێژووی سەلاحەددین ناگرێتەوە، هەروەهاش ڕووداوەکانی نێوان (٥٨٣. ٥٨٩ك)، چونکە لە کتێبی (الفتح القسي)ی خۆیدا شرۆڤەی پێداوە. هەرچی ڕووداوەکانی (٥٧٠. ٥٨٢ك)یە، ئەوە بەدووروودرێژی باسیانی کردووە.[10]

العماد هۆگری سەلاحەددین بووە، لە ئاشتی و لە جەنگیشدا لێی دانەبڕاوەو لە هەموو سەردانێکیشیدا بۆ باکووری دەلتا کە ویستوویەتی لە قایمکاریەکانی بەندەرگەلی میسر دڵنیابێ العمادی لەتەك خۆیدا بردووەو لەزۆربەی بۆنەکانیشدا دیلەکانی خاچدروشمانی بەسەرکردۆتەوە. بەچاوی خۆیشی سەرکەوتنەکانی سەلاحەددینی لە (بیت الأحزان و حطین و کەناراوەکانی شام– کەناراوەکانی سوریەو فەلەستیندا–) دیوەو نووسراوەکانی دەخالەت پێدانو داڵدەدانی خاچدروشمانیشی بەدەستی خۆی نووسیوەو بەدەستی خۆیشی مژدەی سەرکەوتنەکانی بۆ هەموو هەرێمەکان نووسیوە.

ئەوەتا لە وەدەستهانینی قودسدا دەڵێ: "ئەمڕۆ حەفتا نووسراوی مژدەنامەی نووسیوە، هەر یەکەشیانی بە مانایەکی تازە بابەتو جیاواز" کە لەبەر نەخۆشی،[11] بۆ قودسیش نەچوو بوو تا دووەم ڕۆژی گرتنی قودس، هەروەها لە لێقەومانەکەی ڕەملەشدا (ساڵی ٥٧٣ك/ ١١٧٤ز)[12] ئامادە نەبووەو لە شەڕە درێژخایەنەکەی (عکا)شدا، ڕۆڵی ڕۆژنامەوانێکی سەر ڕاستی لە باس کردنو خەبەردانذا گێراوە".[13]

(العماد) لە نووسینی مێژوودا بەشێوازێك دەنووسێ گرانیو خۆماندووکردنی پێوە دیارە. ئەم دوو کتێبەی پڕن لە سەجعو جوانکاریی زمانەوانی، بە نموونە، وەك (تەوریەو جناس و طباق و تنظیر) هەروەها ئایەتی قورئانیشی تێدایەو پڕیشە لە شیعرو پەخشانو شوبهاندنی جوان جوان.

کاتێکیش وەسفی شەڕەکان دەکا، ڕستەکانی یەك لە دوای یەك ئاهەنگو ئاوازو لەفزی پڕ لەڕەو زرنگانەوەیان لێ دەبارێ، بەڵام خوێنەریش ماندوو دەکەنو خوێنەر ناتوانێ بە ئاسانی حەقیقەتەکانی مێژووی لێ هەڵێنجێ.

ئەوەتا (لین پۆل Lane Poole) لە خوێندنەوەی بێزارەو، گوتوویەتی: "لە کێشدا نییە" واتا زەحمەتە.[14] کەسانێکیش زەوقو فیترەی دروستیان بووە، گاڵتەیان بەو هەموو تەجنیسە کردووە، چونکە بەڵگەی خۆماندووکردن بووە.[15]

(أبو شامة) دەڵێ: "العماد لە هەردوو کتێبەکەیدا (لە البرق الشامي و الفتح القسي)دا پشوویەکی درێژی لە سەجعو وەسفکردندا هەیە، کەسێ بیخوێنێتەوە لێی بێزاردەبێ و لە تێگەیشتنی ڕووداوەکاندا سەرسام دەبێ و تا ڕستە تازەکان تێدەگا، کۆنەکانی لەبیردەچێتەوە".[16]

جا، کە (العماد) مەسەلەی چوونی خۆی بۆ وڵاتی شامو خزمەتکردنی دەوڵەتی نورەددین مەحمودی کردبێ بە سەرەتای نووسینی کتێبی (البرق الشامي)[17]، ئەوا شەڕی (حطین)یشی کردووە بە سەرەتای دانانی کتێبی (الفتح القسي)، چونکە ئەو سەرکەوتنی لەشکری موسوڵمانانی ئەییوبیی لە شەڕی (حطین)دا بە کۆچی دووەم لە قەڵەم دەدا..

---

9 سنا البرق، ص٤٩.

10 سنا البرق ص٢٤ـ ٢٥.

11 الفتح القسي في الفتح القدسي، تحقيق وشرح محمد صبح، طبعة الدار القومية للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٥. ص١٣٢.

12 سنا البرق، ٢٥٣. الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٩٧.

13 د. سعداوي، المؤرخون المعاصرون لصلاح الدين، لجنة البيان العربي، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة ١٩٦٢ ص٢٣.

14 جب، صلاح الدين ص٧٢.

15 الصفدي، الوافي بالوفيات، ١/١٣٣.

16 الروضتين، ج١، ق١، ص٨.

17 سنا البرق، ٥٥. الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٦٨.

واتا کۆچی موسوڵمانان بۆ (بیت المقدس) کە ئەم کۆچەیان لەوی تریان زیاتر بەرقەرارە[18]. ئەم ناوی (الفتح القسي)یەشی کە لێ ناوە، لەسەر پێشنیازی (القاضي الفاضل)[19] بووە.

گرنگیی ئەم دوو کتێبەی"العماد" لەوەدایە کە وەك باسی ڕۆژانەی جەنگ وایەو، شاهید حاڵێك دەیگێڕێتەوە، دەستێکی باڵای لە نمایشی وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرادا هەیە، هەر دەڵێی ڕۆحی بە بەردا کردووەو، ئەوەی باسی دەکاو دەیگێڕێتەوە وەك ئەوە وایە کە پەیامنێرێکی جەنگ، لە نەبەردی شەڕدا، سەعات بە سەعات بە چاوی خۆی ڕووداوەکانی دیبێ و بیانگێڕێتەوە. لەبەر ئەوە ئەو دوو کتێبە بەڵگەنامەیەکی مێژوویی پڕ بایەخی سەردەمی سەلاحەددینن، دانەرەکەشیان بە پێی سیستەمی ساڵەو ساڵ"نظام الحوليات" ڕچەی شکاندووە، باسی ڕووداوەکانی ساڵێك دەکاو پاشان لەگەڵ ڕووداوەکانی ساڵێکی نوێدا لێکیان گرێدەداو، ڕۆژەکەو مانگەکەش دەڵێ و پێگەی بێهێزیی و پێگەی بەهێزیی لەشکری ئەیوبییش دەردەخاو هەستەو نەستی جەنگاوەرانی سەر زەوی و ناو دەریاش لە کاتی جەنگدا چۆن بووبێ بە ڕوونی نیشانیان دەداو، کابرا، هەر دەڵێی لەو شەڕەدا لەگەڵیاندا بووە. وەسفی ڕووداوەکانی جەنگ و چەك و جبەخانەی ئەو لەشکرە دەکاو، لە وەسفی هەرێم و وڵات و دامودەزگاکانیشدا کە شەڕەکانی تێدا ڕوویانداوە، تا ڕاددەیەکی زۆر سەرکەوتوو بووە.

ئەم نووسینانەی "العماد"یش هەروەك مێژوونووسەکانی تر کە دەگاتە سەر ڕەنووسەکان "الأرقام" زیاد دەڕوا و زۆریان وەسەردەنێ، هەروەهاش کە زۆر بە سوڵتان و بە لەشکرەکەیدا هەڵدەڵێ. ئەوەتا لە شەڕی "تل السلطان"دا کە لە نێوان ئەتابەگی موسڵ و سەلاحەددیندا ڕوویدا، دەڵێ "لەشکری موصل " جگە لە ڕەشوڕووتەکەی، بیست هەزار سوار بوون، لە پشتەوە کۆمەکیشیان بۆ دەهات و هەموو ڕۆژێکیش هێزەکەیان ڕوو لە زێتر دەبوو، وەلێ لەشکری ئێمە تەنیا شەش هەزار سوار بووین.[20] واتا سەلاحەددین بە شەش هەزار سوارەوە توانیی ئەو لەشکرە گەورەیەی موسڵ تێك بشکێنێ کە سێ هێندێ لەشکرەکەی خۆی زیاتر بوون. لەبەرئەوە "ابن الأثير" مێژوونووسی شانشین "بلاط"ی موسڵ، خۆی پێنەگیراو بەرپەرچی دایەوە.[21] بێگومان ئەم لایەنگیرییە لەوەوە هاتووە کە (العماد) زۆر هەواداری سەلاحەددین بووە، هەرچەندیشە بەوە ناسراوە کە ڕووداوەکان بە دروستی دەگێڕێتەوە، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هیچ ڕووداوێکی نەدەنووسی وەك لە کۆتایی کتێبەکەی (الفتح القسي)دا باسی کردووە، تا بە چاوی خۆی نەیدیتبا، ئەوەتا لەوێدا دەڵێ: "ئەوەی نەمدیتبێ نەمگوتووەو نەمنووسیوە.. گوێم بە هیچ ڕووداوێکیش نەداوە تا چاوو گوێم لێی پڕ نەبوو بێ، بنکەی هیچ شتێکیشم دانەمەزراندووە لەسەر بنچینەی ئەوە نەبێ کە لێی دڵنیابووم، لە ڕاستی و دروستیش بەولاوە هیچ نیازێکی ترم نەبووە، لە هەق و هەقیانەتیش زیاتر هیچم نەویستووەو، وشەیەکیشم نەگووتوە لەبەرد بکەوێ و هیچ نیازێکیشم نییە لەوە زیاتر کە خودا لێم ڕازی بێ و لیم نەڕەنجێ.[22]

٢. (ابن الأثير): أبو الحسن عزالدين علی کوڕی أبي الكرم محمد الجزري یە (ت ٦٣٠ك/ ١٢٣٣ز) کتێبی (الكامل في التأريخ)ی داناوە.

ئەم مێژوونوسە کاتێ لە دایك بوو، کە بەر لەو بە شەست و پێنج ساڵ خاچدروشمان ڕەگیان لە وڵاتی موسوڵماناندا داکوتابوو. ململانێیەکی قورس و گرانیش لە نێوان موسڵمانان و خاچدروشماندا لە ئارادا بوو، ئیتر کات و ساتی ئەوەی بۆ ڕەخسا کە بچێ بۆ مەیدانی شەڕ، لە شام و بەچاوی خۆی پێکدادانی نێوان سەلاحەددین و خاچدروشمان ببینێ.

ڕووداوی سەرسوڕهێن کە (أبن الأثير) لە دوا دوای تەمەنیدا بەسەری هات، هەرەسهێنانی دەوڵەتی زەنگی بوو، کە

18 الفتح القسي، ص٤٩.

19 الفتح القسي، ص٥٧. الصفدي، الوافي بالوفيات، ١/ ١٤٠.

٢٠ سنا البرق، ١/٢٠٠-٢٠١ ،الروضتين ،ج١ ق٢ ،ص٦٥١ .

21 الكامل، چاپی دار صادر ـ دار بيروت ١٩٦٦. ج١١، ص٤٢٩.

22 الفتح القسي، ص٥٨.

(أبن الأثير) به خاوو خێزانەوە لە ژێر سایەیدا گوزەرانی دەکردو چاودێری دەکران لەو ڕۆژەوەی کە لە شاری جزیرەی کوردەوە (جزيرة ابن عمر) هەڵکەندرابوون و هاتبوونە موسڵ، پێوەندیی نێوان ئەتابەکەکانی موسڵ و سەلاحەددینیش دۆستایەتیی تێدانەبوو، چونکە سەلاحەددین سێ جار موسڵی گەمارۆ دابوو تا ئەتابەکیی موسڵی بە پێی پەیماننامەی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز) خستە سەر دەوڵەتەکەی خۆی. ئەو، ئەم یادەوەرییانەی هەر لە زەیندا مابوو، کاتێ لە سەر داوای (بدرالدين لؤلؤ)ی بەرپرسی موسڵ، ئەوەی کە حوکمی دوایین کوڕی بنەماڵەی ئەتابەگی لەناوبرد. دەستی کرد بە نووسینی مێژووەکەی. ابن الاثير پڕ بە گومانەوە لە سەلاحەددینی دەڕوانی و وەهایشی نیشاندەدا کە هیچ ئامانجێکی نییە تەنیا ئەوەنەبێ ئارەزوی خۆی بێنێتەدی"[23].

ابن الاثير –بەنموونە– هۆی سەرنەکەوتنی سەلاحەددین لە گرتنی شاری (صور)دا بەوە لێکدەداتەوە کە سەربازەکانی بە سووکی دەستیان دایەو بەقورسی هات بە دەستیانەوەو هیچیان بۆ نەکراو تاوانەکەشی خستە ئۆباڵی سەلاحەددین کاتێ کە دەڵێ: "خەتای کەس نەبوو، لە سەلاحەددین زیاتر، چونکە ئەو متمانەی بە خاچپەرستمانی شارە گیراوەکان کردو دەخالەتی لێ قبووڵ کردن و ئەوانیش ئیشی خۆیان بە عاقلی گرت و لە (صور) کۆبوونەوەو بوون بە هێزێکی گەورەو بێ باك"[24].

هەروەها دەڵێ: "سەلاحەددین لە ترسی نورەددین لەشکری کردە سەر یەمەن و دەیویست خۆی و بنەماڵەکەی لەو وڵاتە خۆیان قایم بکەن، ئەگەر هات و نورەددین ویستی بچێتە میسرەوە". تەنیا (أبن الأثير) باسی گفتوگۆی نهێنیی نێوان کوڕانی بنەماڵەی ئەییوبی لە میسر دەکات کە تەگبیری ئەوەیان کردووە چۆن چۆنی بەرپەرچی نورەددین مەحمود بدەنەوە" ئەگەر ویستی بکشێ بەرەو میسر". سەیر لەوەدایە قسەو باسێ لە ژوورێکی داخراودا لە نێوان سەلاحەددین و باوکی سەلاحەددین و خزمەکانیدا کرابێ و بگاتە (أبن الأثير) و نەکەوێتە بەر گوێی نورەددین، کەوابێ هیچ جێگای عاجبایەتیش نییە ئەمێ بە چەك هێرشی بۆ بردبێ، بە قەڵەمەکەشی تانەو تەشەری لە سیاسەت و لە ئاواتی ئەو سوڵتانە دابێ.

ڕەخنەیەکی دیکەیش لە (أبن الأثير) دەگیرێ، ئەوەیە سەرچاوە ئەسڵییەکان دەرناخا کە جڵەوی قەڵەمەکەی لە گێڕانەوەیاندا شل کردووەو بە هەوەسی خۆی تاوتوێ و شەنوکەویان دەکا، وەك پرۆفیسۆر (جب) و دکتۆر (سعداوي) دەڵێن: "بەرادەیەکە دیتنەوەیان زۆر گرانەو زۆریش ستەمە دەستبکەون".[25] بە دەگمەنیش (أبن الأثير) مەگەر یەکجار گوتبێتی کە لە مێژوونووسێکی دیکەوە وەریگرتووە، ئەویش (العماد)ی نووسەرەو بەوەدا دەرکەوت کە نووسینەکانی (العماد) لە بارەی ژمارەی سەربازانی موسڵ لە شەڕی (تل السلطان)دا بەدرۆ دەخاتەوە.[26] بەڵام ئەم هەڵوێستانە لە بەهای ئەم مێژوونووسەی وەك مێژوونووسێکی هاوچەرخ کەم نەکردووەتەوە، نەخێر، بەڵکو بەهایەکی نوێی بە نووسینەکانی بەخشیوە، چونکە ڕاوبۆچوونێکی ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامییە دژ بە سیاسەتی سەلاحەددین و پێچەوانەی دیدی مێژوونووسەکانی سەر بە سەلاحەددینە. ئەم جیاوازییەش لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی مێژوودا کەسانێ دنەدەدا زیاتر بە دووی چیرۆکە ڕاستەو دروستەکاندا بگەڕێن تا بە بەراوردکردنیان حەقیقەت بدۆزنەوە.[27] ئەم مێژوونووسە، خۆی پێوەندی بە ئیدارەی موسڵەوە هەبووە، ئەمەش هەلێکی ئەوتۆی بۆ ڕەخساندووە، هەر هیچ نەبێ، ڕووداوەکانی دەرەوە بزانێ. ئەم خۆی بێ گومان سەلاحەددینی لە موسڵ و لە شامدا چونیەك دیوەو چاوی پێی کەوتووە، وەلێ هیچ

[23] ئەم بابەتەمان لە وتاری (ابن الأثير وأحداث عصره وموقفه من صلاح الدين) لە نامێلکەیەکدا لە ژێر ناوی (موضوعان في التأريخ الكوردي)دا شەنوکەو کردووە، ئەو نامێلکەیەش لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردییە، لە بەغدا، لە چاپخانەی الحوادث ١٩٧٦ چاپ کراوە.

[24] الكامل، ١١/٥٥٦.

[25] جب، صلاح الدين، ل٨٤. د. سعداوي، المؤرخون المعاصرون لصلاح الدين، ل١٠.

[26] الكامل، ١١/٤٢٩.

[27] دريد عبدالقادر نوري، سياسة صلاح الدين ، ماستەرنامە، چاپخانەی الارشاد، بەغدا، ١٩٧٦. ل٢٨.

بەڵگەیەك لە ئارادانییە كە سەروسەختی شەخصیی لە گەڵیدا بووبێ.[٢٨] لە پاش شەڕی (حطین) بەیەك ساڵ، بە جێگاو شوێنەواری ئەو شەڕەدا تێدەپەڕیّو ئەو جێگایە دەبینیّ پڕە لە ئێسكو پروسكی خاچدروشمانو، دەڵیّ: "هەر لە دوورەوە دیاربوو، هەندێكیان یەك لەسەر یەك كەڵەكە كرابوونو هەندێكیشیان تاكو تەرا، ئەمە جگە لەوانەی كە سێلاّوو لافاو ڕایانی ماڵیبوونو جگە لەوانەش كە لەو چۆڵو داڵدانەدا گورگو چەقەڵ پەلەكێشی كردبوون".[٢٩]

كتێبی دووەمی (أبن الاثیر) بەناوی (التأریخ الباهر في الدولة الأتابكية) كە[٣٠] باسی مێژووە، گرنگییەكی ئەوتۆی نییە، چونكە ئەوەی سەبارەت بە سەلاّحەددین دەیگێڕێتەوە، كتومت، هەر ئەوەیە كە لە (الكامل)دا هاتووە، وەڵیّ هەند بەفراوانی لەسەر ململانێی نێوان زەنگیەكانو سوڵتانی ئەییوبیو جێگرەكانی نەڕۆیشتووەو درێژەی پیّ نەداوە، چونكە بوودەڵەیی زەنگیەكان بەرامبەر بە سوڵتان دەردەخاتو، نەشیویستووە ئازاری دڵی شاكانی موسڵ بدات، یان لە گەورەیی (الملك القاهر) كەم بكاتەوە، كە ئەم كتێبەی[٣١] بۆ ئەو داناوە.

٣. أبن شداد، بهاءالدین یوسف كوڕی رافع كوڕی تەمیمە (ت ٦٣٢ك/١٢٣٤ز) كتێبی (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية) یان (سيرة صلاح الدين)ی نووسیوە:

هەر بە چەشنی (ابن الاثیر) لە موسڵ لەدایكبووەو، لەوێش گەورە بووە، پاشان چۆتە بەغداو لە قوتابخانەی (النظامية) پێی غەریبیی كراوەتەوەو تا ماوەی چوار ساڵ لەویّ (معید) بووە. پاشان لە ساڵی (٥٦٩ك) دا گەڕاوەتەوە بۆ موسڵ، ئەوكات تەمەنی (٣٠) ساڵ بووە، لە موسڵ لە قوتابخانەی (الشهرزورية) دەرسی گوتووەتەوەو لەویّ پلەو پایەی بەرزبووەتەوە. لەبەرئەوەی تابلێی بە ئاوەز بووەو خاوەن هزرێكی سەنگین بووە، لەبەرئەوە ئەتابەك كردوویەتی بە باڵیۆزو ناردوویەتی بۆ لای خەلیفەی عەباسیو بۆ لای سەلاّحەددینیش.[٣٢] كاتێكیش لە ساڵی (٥٨٣ك/ ١١٨٨ز) دا لە حەج گەڕایەوە، سەری دا لە (بيت المقدس)، لەویّ سەلاّحەددین لە دووی ناردو داوای لیّ كرد لە لای بمێنێتەوە، (أبن شداد) ڕەزامەندیی خۆی دەربڕیو مایەوە. دەڵیّ: "هەر لەو ساتەوەی چاوم پێی كەوت خوا خۆشەویستیی ئەوی لە دڵم چەسپاند. حەزو ئارەزووی لە غەزایە، لەبەرئەوە پێم خۆش بوو لەلای بمێنمەوەو، لە سەرەتای (جمادى الاولى)ی ساڵی ٥٨٤ك/ ١١٨٨ز)یشەوە خزمەتم كردووە".[٣٣] بەلاّم ئەم بەدڵدا چوونو خۆشەویستییە ڕێگای ئەوەی لیّ نەگرت كە مێژووی سەلاّحەددین بە جۆریّ بنوسیّ خوێنەر سەرسام بكات، بەهەستو نەستی پاكو ڕاستو دروستو بە ئەوپەڕی ئاوەزەوە مێژووی سەلاّحەددینی نووسی، بە جۆرێكیش كە لە كتێبەكەیدا هیچ شتێكی لەوبابەتە نابینین، كە (لين پۆل) ناوی دەنێ:"هەواداریی شەخصییەو پیاداهەڵدانی لەڕاددە بەدەری ڕۆژهەلاّتییە".[٣٤]

بەلاّم ئەم برادەرییەی ابن شداد و سەلاّحەددین لە پێنج ساڵ زیاتری نەخایان، لەو ساڵەوە كە باسمان كرد دەستی پیّ كرد تا مەرگی سەلاّحەددین، (أبن شداد) لەسەری ئامادەبوو، لەلای بوو. بەوتەو وشەی دڵتەزێنیش باسی ئەو تراجیدیایە دەكات، كە بەسەر موسڵماناندا هات.[٣٥] لەبەرئەوە (أبن شداد) بە تاكە مێژوونووسی ڕووداوەكانی ئەو كاتو

---

[28] جب، صلاح الدين ل٧٠.

[29] الكامل، ٥٣٨/١١.

[30] ئەو كتێبە، د. عبدالقادر أحمد طليمات پێیداچووەتەوە، دار الكتب الحديثة، القاهرە، ١٩٦٣.

[31] الباهر، ص١٧، سەیری كتێبی (ابن الأثير الجزري المؤرخ) بكە، كە د. طليمات دایناوە، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٩. ص٨٢.

[32] سەیری (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية) بكە تحقيق: د. جمال الدين الشيال، طبعة الدار المصرية للتأليف والترجمة، القاهرة، ١٩٦٤، ص٦٥، ٧٠، ٨٥.

[33] النوادر، ص٨٧.

[34] .lane – pool, Staney Saladin and the fall of The Kingdom of gerusalem, london 1914. P(٧٤)

[35] النوادر، ٢٤٦ـ ٢٤٧، بنۆڕە: ليكۆڵینەوەكەی خۆم (ابن شداد في نوادره، والايام الاخيرة في حياة صلاح الدين). مجلة كاروان، العدد، ١٤، سنة ١٩٨٣، ل١٣٩ـ ١٤٧.

ساته لە قەڵەم دەدرێ، ئەوەش ئەو ماوەیەیە کە خەباتی دژ بە خاچدروشمان لەوپەڕی گەرمیدا بوو، هێرشی تازەی خاچدروشمانیش کە بە هەڵمەتی سێیەم ناودەبرێ رووی دا کە دوای ئازادکردنی (بیت المقدس) ئەورووپا سەروبەری ناو بەرپای کرد. (أبن شداد) لەو ماوەیەدا دەنووسێ و دەڵێ: "ئەوەیە کە بە چاوی خۆم دیومە، یان لە کەسێ بیستوومە هەند بڕوام پێی هەیە کە لە بەچاودیتن زۆر نزیکە".[36]

هەرچی رووداوەکانی نۆزدە ساڵی نێوان (٥٦٥. ٥٨٤ك/ ١١٦٩. ١١٨٨ز) یشە، ئەوە (أبن شداد) بیستوونی و دەیانگێڕێتەوە. لەوانەدا هەرچەندیشە پشتی بە ژێدەرو سەرچاوەی بڕوا پێکراو بەستووە، وەلێ لە شرۆڤەو زنجیرەی زەمەنییدا هەندێ هەڵەی کردووە، دەڵێ: "هەرچییەکم بەر لە ساڵی (٥٨٣ك) گوتبێ، ئەوانەم لە زمان کەسانێ گێڕاوەتەوە کە بڕوام پێیان بووەو بە چاوی خۆیان بینوویانە".[37] سەرەڕای ئەوەش لە گێڕانەوەی رووداوەکانی ئەو ماوەیەدا دیارە کە بە کورتی دەیانگێڕێتەوە بە جۆرێ کە تەنیا یەك لاپەڕەو نیوی بۆ گێڕانەوەی باسی گرتنی شاری (القدس) نووسیوە، باسی رووداوەکانی دیکەش هەر بەوپێیە. کەچی ئەو رووداوانەی بەچاوی خۆی دیتبووی بە درێژی باسیان دەکا، ئەوەتا رووداوەکانی نۆزدە ساڵ. کە لە خەڵکی بیستووە. لە پەنجا لاپەڕەدا دەگێڕێتەوە، کەچی بە زیاتر لە سەدو شەست لاپەڕە باسی رووداوەکانی ئەو پێنج ساڵەی دوایین دەکا.

(أبن شداد) بەمێژوونووسێکی واقیعی دادەنرێ، هەرچییەکی دیتبێ و بیستبێ، ڕاستو دروست، بە شێوازێکی شیرین و بەبێ جوانکاریی زمانەوانی تۆماری کردوون. خەباتی سەختی لەشکری ئەیووبیی دژ بە سەربازانی هەڵمەتی سێیەمی خاچدروشمان بەشێوەیەکی تەواو نمایش کردووە، بەبێ ئەوەی بە دووی هەواو هەوەس پەرستنی قارەمانێتی دا پەلکێش ببێ، وەك ئەوەی بەسەر (أبن الأثير) هات، کە لە کتێبی (التأريخ الباهر)ەکەی خۆیدا، گەلێکی بەشان و باڵی ئەتابەکەکانی موسڵدا هەڵداوە. لەبەرئەوە بە دەگمەن سەرچاوەیەکی مێژووی سوڵتانێ یان میرێ لە سەرکردەکانی چاخی ناوین بدۆزرێتەوە هەندەی کتێبی (سیرة صلاح الدين) بایەخی مێژوویی هەبێ.

ئەم کتێبە هەند زانیاریی پڕ بایەخ و گرنگی تێدایە، هەندێکیان دەگاتە گرنگیی بەڵگەنامە مێژووییەکان، دەقی ئەو وتارانەی تێدایە کە کاغیگۆسی دەرەجەداری ئەرمەنی[38] ناردوونی، یان پەیامنێری ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتە بۆ سەلاحەددینی هێناوە.[39] ئاشتینامەکەی (پێکهاتنەوەکەی) (الرملة)ی بە درێژی تێدایە لەگەڵ ئەو بەندانەی کە هەردوولا لەسەری پێکهاتبوون، هەروەها باسی ئامرازەکانی کوشتارو زاراوەگەلی جەنگی، بە نموونە وەك: (یزك، کۆسات، جالیش، منجنيق، جرخ، نمجاة، زنبورك)و ناوی کەشتییەکانی گەشتیگەلی ئەیووبی، بە نموونە وەك: (شيني، طريدة، بيضة، حمالةو بركوس،.. تد).

هەروەها وەسفێکی وردو دەگمەنی (دەبابە)ش دەکاو[40] وەسفی بورجی خەرتومداریش دەکاو، هەر ئەم کتێبەشە کە باسی دابو دەستووری سەربازیی و ئیداریی خاچدروشمان بکات.[41] هەندێ لەوانەشمان لەم لێکۆڵینەوەیەدا باس کردووە.

٤. (أبن أبي طي، يحيی کوڕی حامدی حەڵەبی) (ت٦٣٢ك/ ١٢٣٤ز):

مێژوونووسێکی دیکەی هاودەمی سەلاحەددین بووەو خەڵکی حەڵەبە، بەرهەمی زۆرەو تەنیا لە بابەتی مێژوودا

---

36 النوادر، ٨٧.

37 النوادر، ٧٨.

38 النوادر، ١٢٤ـ ١٢٦.

39 النوادر، ١٣٢ـ ١٣٣.

40 النوادر، ١٤٠.

41 النوادر، ١٢، ١٢٦.

زیاتر لە دە کتێبی نووسیوە (داناوە).[42] یەکێکیان کتێبی (كنز الموحدين في سيرة صلاح الدين)ە[43]، ئەو کتێبەیە کە (أبو شامة) ناوی دەبات کاتێ کە باسی بە وەزیر بوونی سەلاحەددین لەلای خەلیفە (العاضد)ی فاتمی دەکا، هەموو بەرگەکانی ئەم کتێبە بزربوون[44]، ئەگەر ئەو نەختەی نەبوایە کە (أبوشامە)و پاشانیش (أبن الفرات) لێی دەگێڕنەوە، ئەوە هیچ ئاسەوارێکی ئەوتۆی نەدەما. هەرچەندیشە (أبوشامة) زۆری لێ وەرگرتووە کەچی لە پێشەکیی کتێبەکەی خۆیدا ناوی هیچ کتێبێکی (إبن أبي طي) لە ڕیزی ژێدەرەکاندا نابات و تەنیا بە بۆنەی لێوەرگرتنەکانەوە دەڵێ لەو مێژوونووسەوە وەرگیراون. ئەو کەسەی تەحقیقی کتێبی (الروضتين)ی کردووە دەڵێ: "یەك بە یەك ژماردوومە، (أبو شامة) سی و شەش جار لە (إبن ابو طي)یی وەرگرتووە"[45].

کتێبەکانی ئەم مێژوونووسە تا درەنگانێك هەر مابوونەوە، بێگومان هەموویان. یان هەر هیچ نەبێ، هەندێکیان. تا ڕۆژانی (أبن الفرات)یش، واتا سەدەی نۆیەمی کۆچی، (یازدەی زایینی) هەر مابوونەوە، وەلێ لەوە پاش هەموویان بزربوون.

(ابن ابو طي) مێژووی هەردوو سوڵتان، نورەددین مەحمودو سەلاحەددینی نووسیوە، لەبەرئەوە کتێبەکەی ئەڵقەیەکە، کۆتایی زنجیرەی حوکمی یەکەمیان بە بەرایی زنجیرەی سەردەمی دووەمیانەوە گرێ دەداتەوە. وەلێ لە نووسینەکانیەوە دیارە کە بەرامبەر بە نورەددین مەحمود بە خەشم بووە، چونکە ئەم باوکی ئەوی کە لە گەورە پیاوانی شاری حەڵەب بووە، لە ساڵی ٤٥٣ی کۆچیدا، لەوشارە سەرون (نفی) کردبوو.[46] باوکی بە کتێبدانەرو نووسەری مێژوو دەناسرا، یەحیای کوڕیشی دەنگوباسی زۆری لێوە گێڕاوەتەوە.[47] لە قسەی (أبوشامة)دا، دیارە کە ئەو کابرایە ناحەزی نورەددین بووەو شتی ناشایستەی ناوەتە پاڵی و بۆی هەڵبەستووە. ئەو سوڵتانە شیعەکانی حەڵەبی ملکەچ کردبوو، دروشمەکەشیانی پووچەڵ کردبووەوەو سوننەکانی بەهێز کردبوو.[48]

وەهاش چاوەڕوان دەکرا کە (أبن أبي طي)ی مێژوونووس، ئەمیش وەك باوکی ڕەفتار بکا، باوکی چۆن چۆنی دژ بە نورەددین وەستا، ئەمیش دژ بە سەلاحەددینی خەلیفەی نورەددین بووەستێ، بەڵام ئاکاری لێبوردەیی و سنگفراوانیی سەلاحەددین کارێکی وای کرد ناحەزانی نورەددین بەلای خۆیدا رابکێشێ. ڕاستیشت دەوێ دەقی نووسینەکانی (أبو شامەو ابن الفرات) ئاشکرای دەکەن کە (أبن ابي طي) لایەنی سەلاحەددینی گرتووە، بە نموونە ئەوەتا ئاشتبونەوەی سوڵتان لەگەڵ (سنان راشدالدين)ی سەرۆکی تایەفەی ئیسماعیلی و لادانی گەمارۆی سەر قەڵاچەی (مصياف) یان (مصيات) وەها لێکدەداتەوە کە: "سەلاحەددین لەوە دەترسا، فەرەنگەکانی ژووڕووی شام بووروژێنو. کە خۆیشی لەوێوە دوور بوو. شتێك بەسەر وڵاتەکەدا بێنن، لەبەرئەوە لەگەڵ (سنان)دا ئاشت بوونەوەو خۆیشی گەڕایەوە بۆ دیمەشق".[49] ئەم لێکدانەوەیە لێکدانەوەیەکی پاکەو ئەم مێژوونووسە نەیویستووە سەلاحەددین لەحەن ئیسماعیلییەکاندا بە دەسەپاچە پیشان بدات، بەڵکو ویستوویەتی ئەوە نیشان بدات کە سەلاحەددین سور بووە لەسەر

---

42 لەبارەی دانراوەکانییەوە : سەیری (الروضتين) بکە، ج١، ق١، ص٣٢، المقدمه. claude cahen, Lasyrie du nord, Al,Epoaue des Croisades et la principaute Franqued Antioche.

43 الروضتين، ج١، ق٢، ص٤١٥. سەيری: (كشف الظنون) بكة، ط، طهران الثالثة، ١٩٤٧، ج٢، ل١٥٢.

44 بەرای پرۆفیسۆر، جب، کتێبەکانی (ابن ابو طي) لەبەرئەوە بزرن چونکە شیعە بووە، هەرچەندە ئەو دانانەی کەماون وای دەردەخەن کە نووسەرێکی ئەسڵ بووە، (صلاح الدين الايوبي) ص٧١.

45 الروضتين، ص٣٢.

46 الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٤١.

47 ن، م، ص.

48 ن، م، ص، سەيری (ج١، ق٢، ص١٤٧)یش بکە.

49 الروضتين، ص٦٦٩ـ٦٧٠.

ئەوەی بەشەکانی باکووری ولاتەکەیان لەکیس نەچێ و خاچدروشمان داگیری نەکەن".

شێوازی نووسینی ئەم مێژوونووسە ئاسانەو هیچ رازانەوەیەکی تێدانییەو بە کورتی دەیدات بە دەستەوەو یەکسەر بابەتەکە روون دەکاتەوە. ئەم حەقیقەتە لە نووسین و گێرانەوەکانی (أبوشامة)شدا بەدەردەکەوێ، هەرچی بەرنامەی پۆل پۆل کردنی رووداوەکانیشە، ئەوە کاکی مێژوونووس بە چەشنی مێژوونوسەکانی دیکەی ئەو سەردەمە، ساڵ بە ساڵ جیایان دەکاتەوەو سیستەمی ساڵ بەساڵ (نظام الحوليات) بەکاردێنێ.

٥. أسامە کوڕی منقذ: دانەری کتێبی (الأعتبار)ە، (ت٥٨٤ک/ ١١٨٨ز)، میرێکە لە میرەکانی (بني منقذ)" ئەو بنەماڵە عەرەبەیە کە حوکمی شاری (شیزر)ی سەر ڕووباری (عاصي)ی نزیك شاری (حماة)ی کردووە لە ماوەی جەنگەکانی خاچدروشماندا. میرنشینی (بني منقذ) دراوسێی خاچدروشمان بووە. ئەم بنەماڵەیە لە سەردەمی شەڕیش و ئاشتیشدا پێوەندیی بەوانەوە هەبووە، لەبەرئەوە ئوسامە سەروسەختی لەگەڵیاندا هەبووەو سەردانی کردوون و هەرچیی لێ دیبێ و ڕووی دابێ لە کتێبی (الاعتبار)[٥٠]دا نووسیوونی. لێکۆڵەران گرنگییەکی زۆر بەو کتێبە دەدەن، چونکە ئەو کتێبە شاهێدییەکی مێژوونووسێکی هاوچەرخی هەند زیرەك و وردبینە، چونیەك و دروست چاکەو خراپەی فەرەنگ دەخاتە ڕوو.[٥١] شەڕێکی زۆریشی لەگەڵیاندا کردووەو قارەمانێتی و ئازایەتییەکی زۆریشی تێدا نیشان داوە.

(أسامە) بەشێکی ژیانی خۆی بەهاتوچۆی نێوان تەلاری شانشینی فاتمی لە قاهیرەو تەلاری شانشینی نورەددین لە دیمەشق بردە سەرو لە ماوەیەکی پر ئاشوبدا لە میسر ژیاوەو باسی ئەو کارەسات و ڕووداوە ترسناکانەشی کردووە کە لە نێوان وەزیرەکانی دوا دوای سەردەمی فاتمیدا قەوماوە[٥٢]، لە نزیکەوە ئاگای لێ بووە. لەگەڵ سەلاحەددیندا ماوەیەکی زۆر هاوزەمان بووە، بەلام باسی جموجووڵە سەربازییەکانی نەکردووە، هەرچەندیشە بەشان و باڵیشیدا هەڵی داوە، گوتوویەتی کە سەلاحەددین: "تازەکەرەوەی دەستووری چوار یاری پێغەمبەرەو پیاوچاکی دین و دنیایە".[٥٣] ڕاستیشت دەوێ کتێبەکەی کتێبی مێژوونییە، بەڵکو یادداشتگەلێکی میرێکی سوارچاکەو دیدو بۆچوونی خۆی لەو کتێبەدا بەساکاری و ڕاستگۆیی نووسیوە.

ئێمە لە بوارێ زیاتردا سوودمان لێی وەرگرتووە، ناوی تیپەکانی لەشکری سودانی لە میسر بردووەو، باسی بیابانشینەکانی سینا و باشووری فەلەستینی کردووە کە ببوون بە چاوساغی: "ئەو لەشکرانەی لە میسرەوە[٥٤] بەرەو شام مل دەنێن و ئەوانەش کە لە شامەوە بەرەو میسر مل دەنێن، باسی هێزو توانستی مەنجەنیقێکی فەرەنگی کردووە کە بەردێکی بیست و پێنج ڕەتڵی هەڵ دەدا (واتا نزیکەی دە کیلۆ) و بەردێکی ئەم مەنجەنیقە لە ماڵی برادەرێکی ئوسامەی داوەو بەتەنیا ئەو بەردە نهۆمی سەرو خواری ڕوخاندووە.[٥٥] (أسامە) مەدحی ئەو زینانەش دەکا کە لە شاری غەززەی فەلەستین دروست دەکرێن".[٥٦]

٦. الملك المنصور الايوبي، محمد کوڕی (تقي الدين عمر)، کوڕی شاهنشا، کوڕی ئەییوبە (ت٦١٧ک/ ١٢٢٠ز) دانەری کتێبی (مضمار الحقائق وسر الخلائق)ە[٥٧]:

ئەم کتێبە بەو زانیارییە وردەکارییانەی ناویدا دەناسرێت کە دانەرەکەی دیونی و تۆماری کردوون، وەلێ ئەوەی

---

[50] الاعتبار، تحقيق ونشر فيليب حتي، طبع جامعة برنستون، أمريكا، ١٩٣٠.

[51] قدری قلمچی، صلاح الدين الايوبي، قصة الصراع بين الشرق والغرب، مطابع شركة الطباعة الحديثة، دار الكاتب العربي، بيروت ١٩٦٦، ص٩٧. الهامش.

[52] الأعتبار ٧- ٨، ١٨- ١٩، ٢١- ٢٧.

[53] ن، م، ص١٦٥.

[54] ن، م، ص١١.

[55] ن، م، ص١١٣.

[56] ن، م، ص٢٨.

[57] مضمار الحقائق، تحقيق، د. حسن حبشي، مطبعة عالم الكتب، القاهرة، ١٩٦٨.

**خراپه كه پێداهەڵدانێكی زەق و زۆپی تێدایه، به جۆرێ كه جاروبار وادەزانی كتێبێكی ئیعلامییەو تەنیا بۆ پێداهەڵدانی مامی باوكی واتا (سەلاحەددین)و پێداهەڵدانی باوكی و دۆستایەتیی نێوانیان دانراوه. له كتێبەكەدا دەڵی: "كه سوڵتان راو تەگبیری به باوكی دەكرد (واتا باوكی دانەر) بەرلەوەی دەست به كارێ بكات، هەروەك له داگیركردنی (بیت الأحزان)دا كردی".[58] دیاریشه، ئەو مێژوونووسانەی، به نموونه وەك (أبي شامەو أبن واصل و حەنبەلی) و كەسانی تریش كه دەربارەی سەلاحەددین كتێبگەلێكیان داناوه، پشتیان به كتێبەكانی مێژوونووسه هاوچەرخەكان بەستووه، بەلام ناوی كتێبی ئەم مێژوونووسه ئەییوبییەیان له نێوان ژێدەرو سەرچاوەكانیاندا نەبردووەو هیچیان لێی وەرنەگرتووه. ڕەنگیشه لەبەرئەوە بێ كه كتێبی (مضمار الحقائق) به ڕای ئەوان نەگەیشتبێته بالای كتێبه بڕوا پێكراوەكانی مێژوو.**

**٧. (القاضي الفاضل محمد الدين عبدالرحيم) كوڕی علي، كوڕی محمد اللخمی البيساني العسقلاني) (ت٥٩٦ك/ ١١٩٩ز):**

**له دوا دوای سەردەمی فاتمیدا وەزیفەگەلێكی زۆری دیوه، سەلاحەددین كردی به وەزیرو ڕاوێژكاری یەكەمی خۆی و به جێگری خۆی بۆ حوكم كردنی میسر، یان دیمەشق. به گوتەی (المقريزي)[59]، به چاو دیتەكانی خۆی له كتێبێكی مێژوودا كه. بەكۆمەڵێ له تازه ڕووداوەكانی (المتجددات) ناسراوه. تۆماركردووه، ئەم كتێبه تۆماری ئەو واقیعانەیه كه دیونی و نووسیونی، هەروەها به كۆمەڵێ نامەو تەعلیقیش له چەندین بەرگدا كه نزیكەی سەد بەرگ[60] دەبن تۆماری كردوون.**

**لەوە دەچێ (أبوشامة والنويري والمقريزي والقلقشندي) لەو كەسانه بن كه زۆرتر له (القاضي الفاضل)یان وەرگرتبێ. (أبو شامة) له نامەكانی (القاضي) ماددەیەكی زۆری چڕوپڕی وەرگرتوەو بۆ نووسینی كتێبەكەی خۆی (كتاب الروضتين) سوودی له زۆربەیان وەرگرتووەو كۆمەڵه پەخشانێكی ئەم نوسەره بەتوانایەشی به سەجعێكی جوانو نایاب كه (لەوانەی پێشتر دەست بالاتره) بۆ كرد به پاشكۆ.[61]**

**خۆ ئەگەر ئەم كتێبەی (أبوشامه) نەبوایه، ئەوه، هەموو كۆششێكی (القاضي الفاضل) و نامەكانی باسی سیاسەت و جەنگو وێژەكانیشی بزردەبوون. بەو جۆره (كتاب الروضتين) بوو به ژێدەرێكی زۆر گرنگی زانینی مەنزڵگەو پێگەی یەكه پیاوی دەوڵەتەكەی سەلاحەددین،[62] له دوای ئەوەی كه زۆربەی نووسینەكانی فەوتانو تاكو تەرایەكی نەبێ هیچیان نەمان.[63]**

**ئەوەی (القلقشندي والنويري) بۆ (القاضي الفاضل)یان كرد، تا ڕادەیەك وەك ئەوه وایه كه (أبو شامة) بۆی كردووه. ئەو دوانه نامەگەلێكی زۆری ئەم نووسەرەیان له هەردوو كتێبەكەی خۆیاندا نووسیوه، هەرچی (المقريزي)یه، ئەوه، دەقێكی زۆری لێ وەرگرتووه، به تایبەتیش باسەكانی قەوارەی لەشكری ئەییوبیی له میسرو ڕەگەزەكانی ئەو لەشكرەو ئەو هەنگاوانەش كه سەلاحەددین بۆ نوێكردنەوەی ئەو لەشكرەو هێزی دەریایی ناوێتی. (المقريزي). جارجارەش. به وشەی (المتجددات) وەرگرتنەكانی پێشكەش دەكا.**

---

58 مضمار الحقائق، ص٢٥ـ ٢٦، ٢٧.

59 الخطط، (ط، بولاق) ١/٨٦. طبعة المعهد، ج٢، ق١، ص١٧.

60 وفيات الأعيان، تحقيق، د. احسان عباس، مطبعة الغريب، دار الثقافة بيروت ١٥٨/٣. النويرى، نهاية الأرب في فنون الأدب، المؤسسة المصرية العامة للتأليف والترجمة والطباعة والنشر، ٥١/٨. السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، مطبعة عيسى البابي الحلبي، ١٩٧٠، ١٦٧/٧. ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ١٥٦/٦.

61 وفيات الأعيان ١٥٨/٣.

62 النجوم الزاهرة ١٥٧/٦. ابن العماد، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، مطبعة االمقدسى، القاهرة، ١٩٣١، ٣٢٤/٤.

63 دامودەزگای حكومەتی ئیسرائیل كه له ساڵی (١٩٦٧)ەوه نیمچه دورگەی سینای داگیركردووه، گەلێ نامەو بەڵگەنامەی (القاضي الفاضل)ی دۆزییەوه. كاتێكیش ئیسرائیل به پێی ڕێكەوتننامه ئاشتییەكەی نێوان میسرو ئیسرائیل له سینا كشایەوه، ئەو بەڵگەنامانەی دایەوه دەست دامودەزگاكانی میسر.

**٨. (أبن القلانسي، أبو يعلى حمزة) كوڕی (أسد التميمي) (ت٥٥٥ك/ ١١٦٠ز):**

**کتێبەکەی خۆی (ذيل تأريخ دمشق)[٦٤] بە سەرچاوەیەکی ئەسڵیی مێژووی خۆرهەڵاتی نزیك دادەنرێ، بە تایبەتیش بۆ مێژووی وڵاتی شام و شاری دیمەشق کە دانەری کتێبەکە کردوویەتی بەتەوەری ئەو ڕووداوانەی کە خۆی دیونی و لە ساڵی مردنیدا لە نوسینی بووەوە. بە شارەزایانە باسی ڕووداوەکانی ئەم شارەی کردووەو زانیاریی چاکیشی خستۆتە بەردەستی لێکۆڵەران. ئەم مێژوونووسە پیاوێك بووە لە پیاوە ڕەسمییەکانی دیمەشق و دوو جاریش بەرپرسێتیی دیوانی ئەم شارەی وەرگرتووە. بەمەش هەلێکی بەرفراوانی بۆ هەڵکەوتووە لە نزیکەوە ئاگای لە ڕووداوو گۆڕانکارییەکانی جەنگی و سیاسیی ناو ئەو شارە بێ و بشزانێ کە دیمەشق لەگەڵ لایەنەکانی دیکەیدا چ ڕۆڵێکی هەبووە. هەرچەندیشە ئەم سەرچاوەیە باسی ئەو ڕووداوانە ناکات کە یەکسەر بوونەتە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەییوبی، وەلێ سوودی ئەوەی هەیە، ئەو زەمینەیە نیشان دەدات کە ئەییوبییەکان ڕۆڵی خۆیانیان لە خاکی شامدا بینیوە، بەرلەوەی بچن بۆ میسر، چونکە مێژووی ئەو ماوەیەی کە (ابن القلانسي) نووسیویەتی بە بەشێکی بنچینەیی مێژووی دەوڵەتی النوري (نورەددینی) لە قەڵەم دەدرێ کە لە میشەوە دەوڵەتی ئەییوبی سەری هەڵدا.**

**٩. (أبوشامة عبدالرحمن کوڕی اسماعیل کوڕی ابراهیم المقدسي، (ت٦٦٥ك/ ١٢٦٦ز):**

**سەر زەمانێ کە دەوڵەتی سەلاحەددین لە شام گۆڕاو، بوو بە ئەمارەتگەلێکی بچووك بچووك و لاواز، لە کەش و هەوایەکی پڕ لە پچڕپچڕی و ئاژاوەو پێکدادانداا لەو تەنگوچەڵەمەیەدا (أبوشامة)ی بە ئەسڵ مەقدیسی و بە نیشتەجێ دیمەشقی لە دایکبووەو هەر لەوێش گەورە بووەو بەساڵیشدا چووە. بۆ حەج و بۆ سەردانی (بيت المقدس) یش. نەبێ ئەویش بۆ ماوەی کورت کورت. دەنا لەوێ بەدەرنەکەوتووەو جێی نەهێشتووە، دواسەفەریشی ئەوە بوو کە چوو بۆ میسر، گەڕایەوە بۆ دیمەشق و ئیدی لە دیمەشق سەری نایەوە.**

**لە باسی مێژوودا کتێبێکی دانا بە (كتاب الروضتين في أخبار الدولتين)[٦٥] ناسراوە، پاشان پاشکۆیەکیشی بە ناوی (تراجم رجال القرنين السادس والسابع الهجريين)ەوە[٦٦] بۆ دانا.**

**لە دیباجەی کتێبەکەیدا هاتووە کە لە نووسینیدا پشتی بە کۆمەڵێ مێژوونووسی سەر ڕاست بەستووەو یەکە بە یەکەش ناویانی بردووە، ئەمانەن: (أبن عساكر، ابن القلانسي و أبن الأثير و أبن شداد)یش کە (أبوشامة) چووە بۆ لای و ئیجازەی هەموو شتێکی پێداوە بیگێڕێتەوە.[٦٧] هەروەها لە (العماد الكاتب)و لە کۆمەڵە نامەکانی (القاضي الفاضل)یشی وەرگرتووەو چەندین بەرگ و دیوان و نامەو نامەکاریشی[٦٨] لە هەردوو کتێبە بە ناوبانگەکەی (البرق الشامي)و (الفتح القسي) خۆیدا بۆ زیاد کردووە.**

**خۆێنەر لە کتێبەکەیدا بەوردی سەرنج لە زەمەنی سەلاحەییەکەی بدەین، ئەوە دەبینین باس هەر باسی بێنەو بەبەی لەشکرو شرۆڤەی جەنگ و وەسفی چەك و قەڵاو قایمەی سەربازی و کەشتیگەلی سەربازی و پەرەسەندنی کوشتارو کات و ساتی ئاشتی و شتی دیکەی لەو جۆرە بابەتانەی شەڕەکانی لەشکری سەلاحەددینە. ئەم مێژوونووسە لەمەدا سوودی لە دەقی ئەو بەڵگەنامانە وەرگرتووە کە لە سەرچاوە فەرمییەکانەوە وەدەستی هێناون، هەروەها لەو شیعرانەش کە مێژووی**

---

٦٤ (ذيل تأريخ دمشق) تحقيق آمدروز، القاهرة، ١٩٠٨.

٦٥ چاپی کۆنی هەردوو بەرگی ئەم کتێبە، چاپخانەی (وادي نيل) لە میسر (١٢٨٧ـ ١٢٨٨ك) چاپی کردووە، پاشان د. محمد حلمي محمد أحمد بەهەردوو بەشەکەی بەرگی یەکەمدا چووەتەوەو بڵاوی کردووەتەوە. بەشی یەکەم ڕووداوەکانی لە دوا دوای ساڵی (٥٥٨ك)دا تەواو دەبێ، لە چاپخانەی (لجنة التأليف والترجمة والنشر) لە ساڵی ١٩٥٦دا لە قاهیرە چاپ کراوە، وەلێ بەشی دووەمی ڕووداوەکانی لە کۆتایی ساڵی (٥٧٣)ی کۆچی تەواو دەبێ، لە چاپخانەی (المؤسسة المصرية العامة للتأليف والترجمة والطباعة والنشر) لە قاهیرە ساڵی ١٩٦٢، چاپ کراوە.

٦٦ بە چاودێری محمد زاهد الكوثري لە قاهیرە ١٣٦٦ك، ١٩٤٧ز چاپ کراوە، کتێبێکی بزربووشی هەیە بە ناوی (تأريخ دمشق) بە داوێنی کتێبەکەی (الحافظ ابن عساكر)ی ناوبراودا نووسیویەتی، هەمان ناویشی هەیە.

67 الذيل على الروضتين ص١٦٣.

68 الروضتين ج١، ق١، ص٨ـ ٩.

سەلاحەددین‌و باسی شەڕەکانی بە زیندوویی دەهێڵنەوە، یان ئەو نامەو شیعرانەی کە پیرۆزبایی و چاوڕوونی لە سەلاحەددین دەکەن‌و پێخۆشحاڵی بە هەمیشە گەڕانەوەی سەربەرزانەی بۆ دیمەشق دەردەبڕن.

دیارترین‌و جوانترین سیفەتی ئەم کتێبە بەنرخە بێجگە لەوەی باسی هەموو مێژووی سەلاحەددین دەکا، پشتی بە کتێبگەل‌و نامەو نامەکاریگەلێ بەستووە کە بزرن‌و نەماون، گرنگتریندیشیان بەرگەکانی کتێبی (البرق الشامی)و کتێبەکانی (أبن ابي طي)و نامەکانی (القاضي الفاضل)ن، هەروەها لە کتێبی (الذیل علی المذتظم)ی (محمد بن ابی العباس القادسي)یشی (ت٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز)[٦٩] وەرگرتووە.

١٠. (أبن واصل جمال الدین محمد کوڕی سالم کوڕی واصل) (ت٦٩٧ك/ ١٢٩٧ز):

مێژوونووسێکی شامەو خەڵکی شاری حەمایە، مێژووی دەوڵەتی ئەییوبی لە سەرتایەوە تا بە کۆتایی دەگا، لە میسرو شام و جزیرێدا لە کتێبێکدا بە ناوی (مفرج الکروب في أخبار أیوب)[٧٠] نووسیوەو (تا ئەم ساتەی کە من ئەم ئیشەم دەست پێ کردووە)، ئەو کتێبە تا بەرگی پێنجەمی چاپکراوە، بەڵام ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیەتی کە دەنگ‌و باسی دەوڵەتی نورەددینی تێدایە، بەرگی دووەمیشی دەنگ‌و باسی سەلاحەددینی تێدایە لەو ڕۆژەوەی کە دوای مردنی نورەددین مەحمود، سەربەخۆیی میسری لە ژێر ئالای خۆیدا دەسەبەر کرد، تا ساڵی ٥٨٩ك/ ١١٩٣ز کە لەو ساڵەدا خۆیشی ئەمری خوای کرد.

(ابن واصل) بەرنامەیەکی ڕوون و ڕۆشنی هەیە، جێگای بڕوایە، دەبینی ئەوەی لەبەردەستیدا هەیە، دەقەکانیان بەراورد دەکا، بە ڕای خۆی کامیان باشتر و دروستتر بێ ئەوەیان بەگەن دەکا، دەنگ‌و باسی ڕووداوێ لە تەنیا یەك سەرچاوەوە وەرناگرێ، بەڵکو لە سەرچاوەیەکەوە چەن دێڕێ وەردەگرێ، پاشان دەچێتە سەر سەرچاوەیەکی دیو لەویش چەند دێڕێك وەردەگرێ‌و لەوانەیە بشگەڕێتەوە سەر سەرچاوەی یەکەم‌و دووبارە لێی وەربگرێتەوە، یان لە سەرچاوەی سێیەم، یان چوارەمەوە وەردەگرێ‌و تەواوی دەکات.[٧١] هەر بەدەم ئەوەشەوە بەراوردیان دەکاو فەرق‌و جیاوازیی نێوان ڕاوبۆچوونی مێژوونووسان پیشان دەداو کامیشیان پێی لەباربێ ئەویان وەردەگرێ، هۆی ئەم بەگەنکردنەش دەردەخات.[٧٢]

ئەم کتێبی (مفرج الکروب)ە، ژمارەییێکی زۆری لە بەڵگەنامە فەرمیی تێدایەو زۆربەشیان بە پێنووسی (القاضي الفاضل و العماد الکاتب)ن، وەك نامەگۆڕکێی نێوان سەلاحەددین‌و دیوانی العزیز (خەلیفەی عەبباسی)، ئەوانەی نێوان خۆی‌و براکانی لە میسرو یەمەن‌و، ئەوانەی نێوان خۆی و کەسانی بنەماڵەی ئەتابەکی زەنگی، یان ئیمپراتۆری بیزەنتە، یان خەلیفە مووەحیدییەکەی مەغریب (یعقوب کوڕی یوسف کوڕی عبدالمؤمن). لە کتێبەکەدا شرۆڤەی شوورەی قاهیرەو[٧٣] شوورەی (بیت الأحزان)[٧٤]یشی تێدایە.

بەڵام ئەو ڕووداوە مێژووییانەی باسیان دەکا، گرنگییەکی تایبەتیان نییەو لەسەرچاوە گەلێکەوە وەرگیراون، کە ئێمە پێیان ئاشناین‌و لەبەردەستماندان. ئەم قسەیە کتێبی زۆرتریش دەگرێتەوە. بە تایبەتیش ئەو کتێبانەی کە باسی مێژووی ئیسلام بە گشتی دەکا، وەك کتێبی (البدایة والنهایة)کەی (أبن الأثیر) (ت٧٧٤ك/ ١٣٧٢ز)، هەروەها هەردوو

---

69 الروضتین، ج٢، ص١٥ـ ١٦. ٤ ص٢١١.

70 د. جمال الدین الشیال، (لە ساڵی ١٩٥٣، ١٩٥٧، ١٩٦٠دا بەهەر سێ بەرگەکانی پێشەودا چووەتەوە)، ج١، مطبعة جامعة فؤاد الأول، ج٢، المطبعة الأمیریة، ج٣، طبعة دار القلم. ج٤، ج٥، د. محمد حسنین ربیع (پێیاندا چووەتەوە) لە مطبعة دار الکتب المصریة، ساڵی ١٩٧٢، ١٩٧٧، ١٩٧٧، چاپ کراوە.

71 وەك د. الشیال ڕوونی کردۆتەوە، مقدمە ج٢، صفحە ك (سەیری ص٨٢، پەراوێزی (٢) یش بکە.

72 (بە نموونە سەیری) : ص٤٠ـ ٤١ بکە.

73 مفرج الکروب، ٢/٥٢ـ ٥٤.

74 مفرج الکروب، ٢/٨٤ـ ٨٥.

كتێبی (العبر في خبر من عبد) و (تأريخ الأسلام)ی الذهبي (ت٧٤٨ك/ ١٣٤٧ز)و كتێبی (مرآة الزمان)ی (سبط ابن الجوزي) (ت٦٥٤ك/ ١٢٥٦ز) و كتێبی (ذيل المختصر في أخبار البشر)ی ابن الوردیو كتێبی (المختصر في أخبار البشر)ی أبو الفداء (ت٧٣٢ك/ ١٣٣٢ز)و هەردوو كتێبی (الدرة المضية في أخبار الدولة الفاطمية)و (الدر المطلوب في أخبار ملوك بني أيوب)ی دوا داري (ت٧٣٦ك/ ١٣٣٥ز)، كە تەنیا دواداری، ئەویش لەم كتێبەیدا دەقی نامە هانا سەد هاناكەی (العاضد)ی نوسیووە كە بۆ نورەددین مەحمودی ناردووە، هەروەها كتێبی (العبر وديوان المبتدأ و الخبر)ی أبن خلدون (٨٠٨ك/ ١٤٠٥ز)، كتێبی (تأريخ ابن الفرات)ی ابن الفرات خۆی (ت ٨٠٧ك/ ١٤٠٤)و كتێبی (العسجد المسبوك)ی الغساني (ت٨٠٣ك/ ١٣٨٢ز)و كتێبی (النجوم الزاهرة في أخبار ملوك مصر والقاهرة)ی أبن تغري بردي (ت٨٧٤ك/ ١٤٥٣ز)، كتێبی (حسن المحاضرة في أخبار مصر والقاهرة)ی السيوطي (ت٩١١ك/ ١٥٠٥ز).

١١. (المقريزي، أبو العباس تقي الدين أحمد كوڕی علي) (ت٨٤٥ك/ ١٤٤٢ز)، پشتمان بە چوار كتێبی بەستووە ئەمانەن:

(المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار)[٧٥]، كە بە كورتی پێی دەگوترێ (الخطط). ئەم مێژوونووسە لەم كتێبەدا زانیاریی مێژوویی گرنگمان دەخاتە بەردەست، باسی ئەو چاكسازییانەمان بۆ دەكا كە سەلاحەددین لە لەشكری میسردا بە ئەنجامی گەیاند. بە بۆنەی نمایشی سەربازیی ساڵی (٥٦٧ك) كە لە میسر كرا، باسی قەوارەی ئەو لەشكرەی كردووە، دەربارەی هێزی دەریاییش زانیاریی پێ داوین و زۆر بە باشی باسی بنكەكانی دروستكردنی كەشتیگەلی میسری بۆ كردووین و هەنگاوەكانی نوێكاریی ئەو كەشتیگەلەو باسی چارەنووسی لاوازی ئەو كەشتیگەلەشی بۆ كردووین، كە پاش سەلاحەددین بەهۆی كەمتەرخەمیی شاكانی فەرمانڕەوای میسرەوە ڕووی دا. (المقريزي) سەرباری چڕوپڕی زانیارییەكانی، بایەخیشی لەوەدایە كە ئەو زانیارییانەی لە نامەو كتێبە بزربووەكانەوە وەرگرتووە، بە نموونە وەك (رسائل ومتجدداتەكانی القاضي الفاضل)و كتێبی (حسن السريرة في أتخاذ الحصن بالجزيرة)ی أبوعمرو عثمان النابلسي)و كتێبی دیكەش.

(المقريزي) بەشێ لە كتێبی (السلوك لمعرفة دول الملوك)ی[٧٦] خۆی بۆ مێژووی ڕوداوەكانی میسری سەردەمی سەلاحەددین دوای سەلاحەددین تەرخان كردووە، گرنگیی ئەم كتێبە لەوەدایە كە هەر ئەم كتێبەیە باسی هەندێ ڕوودلو بكات، بە تایبەتیش شرۆڤەی ئەو گۆڕانكارییانەی سەلاحەددین لە ڕێكخستنی كاروباری ئەم دەوڵەتە تازەیەیدا هێنایە كایەوە. ڕاستیشت دەوێ ئەوەی (المقريزي) لەم دوو كتێبەیدا دەیانگێڕێتەوە جاری وا هەیە چوونیەكن‌و جیاوازییان نییە.

ئەم مێژوونووسە لە كتێبی (اتعاظ الحنفا باخبار الائمه الفاطميين الخلفا)دا[٧٧] باسی ئەو بارودۆخە سەختە دەكا كە لە بەشێكی تەمەنی حوكمی فاتمیدا بەسەر میسردا هاتووە، بە تایبەتیش ئەو گرانی‌و برسێتی‌و قاتوقڕییەی لە سەردەمی (المستنصر)دا كەوتەوە، كە خەڵك و خوا لاشەی لە سێدارە دراوەكانیان خواردووەو كار گەیشتە ئەوەی هانا ببەنە بەر (بدر الجمالي)، فەرماندەی ئەرمەنی ڕەگەزی عەكا، تا ئەو بچێ پۆستی وەزارەت وەربگرێ، ئەمە خوایە بەربڕییەك لەو نەهامەتییە بكات. ڕاستیشت دەوێ كابرا ئەو كارەی بەدەستەوە هات. لە كتێبی چوارەمیدا (البيان والاعراب عما بارض ميصر من الأعراب)[٧٨] كە پشتمان بەوەش بەستووە، (المقريزي) باسی جێ‌و ڕێی ئەو خێڵە

[75] ئەم كتێبە چەندین جار چاپكراوە، كۆنترینیان چاپی (بولاق)یە لە قاهیرە ساڵی ١٢٩٤ك، پاشان چاپی (المعهد الفرنسي)یە ساڵی ١٩٠٧-١٩١٣ز، ئنجا چاپی (مطبعة النيل)ە لە ساڵی ١٣٢٤ك، پاشان هی (دار التحرير الجديدة)یە ساڵی ١٩٦٧- ١٩٦٨ز، وەڵێ ئێمە بەرگی یەكەم‌و دووەممان بە بنەما دانا.

[76] تحقيق، د. محمد مصطفي زيادة، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة، ١٩٣٤.

[77] تحقيق، د. محمد حلمي أحمد، مطابع ألأهرام التجارية، القاهرة، ١٩٧١.

[78] تحقيق د. عبدالمجيد عابدين، ملتزم الطبع والنشر، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٦١.

عەرەبانەشی کردووە کە ئەوکات لە وڵاتی میسر نیشتەجێ بوون.

١٢. (القلقشندي، أبو العباس أحمد کوڕی علي)یە (ت٨٢١ك/ ١٤١٨ز) مەسەلەی زۆر گرنگی لە کتێبی بەناوبانگی (صبح الأعشى في صناعة الأنشا)ی[79] خۆیدا باس کردووە، بە نموونە وەك باسی تاوەرەکانی کۆترو پۆستەو پاشکۆکانی پۆستە لە میسرو، کۆگای چەك‌و دروستکردنی چەکی بە نموونە وەك شمشێرو ڕم‌و تیروکەوان‌و کڵاوسن (خودە)و قەڵغان‌و چەکی دیکەی لەو جۆرە بابەتانە. هەروەها باسی ئامێرو ئامرازگەلی گەمارۆدانی، بە نموونە وەك مەنجەنیق‌و کووپەڵەی نەوتیش دەکا، ئەوەش گوتراوە کە یەکەم بەکارهێنانی باروت لە سەردەمی مەملوکەکاندا بووە.

هەروەها باسی دیوانی لەشکرو دەرەبەگ‌و لەشکری دەریاو جل‌و بەرگی سەربازانی سەردەمی فاتمی‌و ئەییوبی‌و سەردەمی مەملوکەکانیش دەکا.

١٣. (أحمد کوڕی ابراهیم الحنبلی، أبو البرکات عزالدین العسقلاني المصري) (ت٨٧٦ك/ ١٤٧١ز) و کتێبەکەی: (شفاء القلوب في مناقب بني أيوب)ە.[80]

ئەم مێژوونووسە وەك خۆی گوتوویەتی: لە کۆمەڵێ مێژوونووسی زۆری وەرگرتووە،[81] بە نموونە وەك (العماد الکاتب، ابن شداد، سبط کوڕی الجوزی‌و هەروەها لە مێژوونووسانی سەردەمی دوایین بە نموونە، وەك: أبوشامة، أبن خلکان، ابن واصل، دواداری، ابوالفدأ، الذهبي، الیونینی، پاشانیش لە المقریزي، العیني).

گرنگیی کتێبەکەی ئەمیش هەروەکو کتێبەکانی (أبو شامة و المقریزي) لەوەدایە کە لە کتێبگەلی نامە بزربووەکانەوە ناوەرۆکەکەی وەرگرتووە، بەنموونە لە نامەکانی (القاضي الفاضل)و لە کتێبی (الذيل على المنتظم)ی (محمد کوڕی أبي العباس القادسي) کە لە میانەوە (أبوشامة)ش وەریگرتووە. وەلێ ئەم وەرگرتنانەی لەم سەرچاوانەوە دەریهێناون، زۆرنین، کەمن‌و وەك أبوشامەش لە (ابن أبي طي الحلبي)ی وەرنەگرتووە.

(الحنبلي) کتێبەکەی خۆی بۆ باسی بنەماڵەی ئەییوبی تەرخان کردووە، وەلێ وەك نموونەی کتێبگەلی ژیاننامەی لێ کردووە نەك وەکو هی ساڵەو ساڵ، وەك خۆی لە (قاعدە الکتاب)دا گوتوویەتی: "ئەم ژیاننامانە چین بە چین باس دەکەین، چینی یەکەم کوڕانی شادی (باپیرەی سەلاحەددین)ن، چینی دووەم، هی کوڕەکانێتی، چینی سێیەم هی کوڕانی کوڕەکانێتی، .. ئیدی بەو جۆرە. تا دەگاتە کۆتایی کتێبەکە.[82]

بەدەر لە ڕەوشی سەلاحەدین، دانەری کتێبەکە سیستەمی ساڵ بە ساڵەکانی تێدا گرتووەتەبەر و زیاتر لە سێیەکی کتێبەکەی پێ گرتووەتەوە. کتێبەکە هیچ گرنگییەکی سەربازیی سەردەمی سەلاحەدینی تێدا نییە، وەلێ باسی هەندێ چیرۆکی تایبەتی مێژووی سیاسیی تێدایە.[83]

رامان لێرەدا لەوەیە، میسر بەدرێژایی سەردەمی سەلاحەددین مێژوونووسێکی تێدانەبووە ڕووداوو کارەساتی ماوەی سیاسی و سەربازیی بنووسێ، خۆ ئەگەر کتێبێکی مێژووی سەردەمی فاتمییەکانمان دەستنەکەوێ، ئەوا ئەو رامانە دوا سەردەمی فاتمییەکانیش دەگرێتەوە. کەچی لەبەرامبەر ئەمەدا، هەندێ نووسەر لە میسر هاتنەکایەوەو دەستیان کرد بە نووسینی بابەتی ئیداری‌و یاسایی. باسی بابەتی تیۆریشیان نەکردووە، بەڵکو باسی دامودەزگای ئەو رۆژانەی دەوڵەتی میسریان، چۆن بووبێ، هەروەك خۆی نووسیوە، واتا ئەم سەرچاوانە کتێبی وەسفن، وەسف دەکەن، بەڵام زانیاریگەلێکی زۆر گرنگیان تیادایە، چونکە دانەرانی ئەو کتێبانە بە تەواوی ئاگاداری بابەتی نووسینەکانیان بوون، کە لە دایەرەکانی دەوڵەتدا فرمانبەدەست بوون‌و خاوەن وەزیفە بوون. بەرچاوترینی ئەوانەش ئەمانەن:

---

[79] المطبعة الامیریة بالقاهرة، ١٥ جزء (١٩١٣- ١٩١٧)ز.

[80] شفاء القلوب، تحقیق، أ، د. ناظم رشید، مطبوعات وزارة الثقافة والفنون ـ دار الحریة للطباعة، الجمهوریة العراقیة، بغداد، ١٩٧٨.

[81] مقدمة الکتاب، للمحقق، ص١٢- ١٣.

[82] قاعدة الکتاب ص١٩.

[83] شفاء القلوب، ص١٢١، ١٥٢.

**١٤.** (ابن الصيرفي علي كوڕی منجب كوڕی سليمان المصري) (ت٥٤٢ك/ ١١٤٧ز): نووسەری كتێبی (الاشارة الی من نال الوزارة)يە، جۆرو بابەتی كتێبەكەش بە ناوو بە ديباجەی كتێبەكەدا ديارەو دانەرەكەشی ناوی وەزيرەكانی دەوڵەتی بردووەو باسی ئەو ڕووداوانەشی كردووە كە تايبەتن بە تەبيعەتی وەزارەتی ئەو سەردەمەی ميسر.[٨٤]

**١٥.** (ابن مماتي، أبوالمكارم الأسعد كوڕی الخطير المهذب كوڕی مينا) (ت٦٠٦ك/ ١٢٠٩ز) دانەری كتێبی (قوانين الدواوين)ە[٨٥]. لەم كتێبەدا باسی مووچەی سەربازی كردووە، مووچەی ئەو ڕۆژانەيان لێ داشكاندووە، ئەگەر نەچووبێ و ديارنەبووبێ، هەروەها باسی كۆگاكانی چەكی كردووە. (أبن مماتی) يەكەم كەس بووە باسی جۆرەكانی كەشتيی لەكەشتيگەلی ئەييوبيدا كردبێ. دانەری ئەم كتێبە لە سەردەمی سەلاحەددين‌و لە سەردەمی (الملك العزيز عمادالدين عثمان)يشدا بەرپرسی ديوانی لەشكريش بووە، لەبەرئەمەيە كە زانيارييەكانی پڕبايەخن.

**١٦.** هەرچی (فخر الدين عثمان كوڕی ابراهيم النابلسي)يە (ت، دوای ساڵی ٦٣٢ك/ ١٢٣٤ز)، ئەوە لە سەردەمی (السلطان الملك الكامل والملك الصالح نجم الدين أيوب)دا، لە گەورە كارمەندانی ديوانەكان بووە. لە ديواندا نزيكەی چارەكە سەدەيەك كاری كردووەو لەو ماوەيەدا كتێبی (لمع القوانين المضية في دواوين الديار المصرية)ی[٨٦] داناوەو پێشكەش بە (االملك الصالح)ی كردووە، ڕای خۆيشی سەبارەت بەو هەنگاوانەش نيشان داوە كە بۆ هەمواركردنی كاروباری بوارە جۆربەجۆرەكانی دەوڵەت پێويستن، بە قسەكانيشيدا دەردەكەوێ كاروباری دەوڵەت شێواو بووە، بە تايبەتيش كاروباری ئابوری و كاروباری لەشكر. بە دەم ئەو نووسينانەوە باسی بارودۆخی ميسری پێش ئەو سەردەمەش دەكا. لەم كتێبەوە ئەوەشمان بۆ دەركەوت، كاتێ كانزاو تەختەو ئەو جۆرە شتانە كران بە موڵكی دەوڵەت‌و ئيدی كەس نەيدەتوانی دەستكارييان بكا، ئەوجا سەلاحەددين دەستی كرد بە چاكسازی‌و هەمواركردنی باری هێزی دەريايی. پێدەچێ ئەم (عثمان النابلسي)يە بێ كتێبی (حسن السريرة في اتخاذ الحصن بالجزيرة)ی دانابێ، ئەو كتێبەيە كە (المقريزي)[٨٧] لێی وەرگرتووە.

**١٧.** سێيەم نووسەری ئەو سەردەمەی ميسر (أبو سالم محمد كوڕی طلحة الوزير) (٦٥٢ك/ ١٢٥٤ز) كە خاوەنی كتێبی (العقد الفريد للملك السعيد)ە[٨٨]، لە دوا دوای سەردەمی ئەييوبييەكاندا ژياوە، باسی ژياری‌و گوزەران‌و دەرەبەگە سەربازييەكانی كردووەو ديارە ماوەيەكی چاكيش لە ديوانی دەوڵەتدا فەرمانبەر بوە، باسی ئەو زەمانەتانەشی كردووە كە دوو لايەنی گرێبەست لەسەری پێك دەهاتن، چ كاتێكيش دەرەبەگەكە مافی ئەوەی دەبوو كە گرێبەستيەكە لەگەڵ لايەنی دووەمدا پوچەڵ بكاتەوە.

كتێبگەلی سەفەرو گەڕان‌و كتێبگەلی جوگرافياش، لە بوارە جۆربەجۆرەكاندا زانياريی بەنرخمان دەدەنێ كە بەسوودن‌و ناكرێ پشتگوێ بخرێن، پێشەنگی هەمووشيان (ناصر خسرو)ە.

**١٨.** ناصر خسرو، ئەم گەڕۆكە، سەفەرێكی دوورودرێژی لە ساڵی (٤٣٧ك / ١٠٤٥ز)دا لە شاری (مەرو)وەوە دەست پێكرد تا گەيشتە ميسرو لەوێ مايەوە تا ساڵی (٤٤٤ك/ ١٠٥٢ز)، پاشان لە ڕێگای حيجازەوە بەسەر ئەحساو بەسرەدا گەڕايەوە بۆ بەلەخ‌و هەرچييەكيشی ديتبوو هەمووی لە كتێبی (سەفەرنامەكەی)دا[٨٩] تۆماركرد.

ئەو دەمەی لە ميسر مايەوە كە ڕێكەوتی سەردەمی (المستنصر بالله الفاطمي) بوو، وەسفی شارە گرنگەكانی قاهيرەو ميسرو ئەسكەندەرييەو تەنيسی كردووە، بەڵام ئەوەی (ناصر خسرو) باسی كردبێ‌و بەلای ئێمەوە گرنگ بێ، ئەوەيە كە پێوەنديی بەم باسەی ئێمەوە هەيە" ئەو زانيارييە وردكارو بەسوودەيە كە دەربارەی قەوارەی لەشكری

---

84 تحقيق وتعليق عبدالله مخلص، طبع المعهد العلمي العربي، القاهرة، ١٩٢٤.

85 قوانين الدواوين، تحقيق عزيز سوريال عطية، مطبعة مصر، سنة ١٩٤٣.

86 لمع القوانين، طبعة المعهد الفرنسي، دمشق ١٩٦١.

87 ـ الخطط، طبعة المعهد الفرنسي، القاهرة، ج٢ ق١ ص١٥.

88 ـ العقد الفريد للملك السعيد، مطبعة الوطن، القاهيرة ١٣٠٦ك.

89 (سفرنامه) (كتاب السفر)، دار الكتب الجديد، بيروت، ١٩٧٠، د. يحيى الخشاب لە فارسيیەوە كردوويە بە عەرەبی.

فاتمییەکان‌و ناوی تیپەکان‌و ژمارەی سوارەو پیادەی تیپەکان نووسیونی، ئەمانەشی بەدەم وەسفی ئەو نمایشانەوە نووسیوە کە ساڵەو ساڵ، بە بۆنەی (فتح الخلیج)ەوە لە ئاهەنگەکاندا لە میسر سازدەدران یادەوەریی ئەم ڕۆژە گەورەترین جەژنی میسری سەردەمی فاتمییەکان بووە.[٩٠]

١٩. (ابن جبیر) أبو الحسن محمد کوڕی أحمد (ت٦١٤ك / ١٢١٧ز) دانەری کتێبی (الرحلة)[٩١] یە ناودارترین گەڕۆکی ئەندەلوسیی هاوچەرخی سەلاحەددین بووەو، زیاتر لە یەك جار سەردانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامنشینی کردووەو ئەو یادەوەرییانەی لەم سەفەرانەیدا نووسیونی هەمووی بە چاو دیتراون‌و ڕاستن. باسی شتی زۆر گرنگی کردووە، لەهەمووشیان گرنگتر ئەوەیە کە لە مانگی (ذی الحجەی ساڵی ٥٧٨ك)دا لەشاری ئەسکەندەرییە بە چاوی خۆی دیویێتی‌و تۆماری کردووە، ئەوە بوو لەو ڕۆژەدا کە خۆی لە ئەسکەندەرییە بووە خاچدروشمە دیلەکانیان کە هێرشیان کردبووە سەر کەناراوەکانی دەریای سوورو لەو شەڕەدا بەدیل گیرابوون،. هێنرابوون بۆ ئەسکەندەرییە. (ابن جبیر) باسی پێوەندیی تەبایی‌و ئیجابیی نێوان هەردوولایەنەکەشی کردووە، بەنموونە وەك ئاڵوگۆڕی بازرگانی‌و سەپاندنی باج‌و گومرگ لەسەر شمەکی بازرگانی یەکتر کاتی بەناو خاکی ئەم لا، یان ئەولادا تێپەڕدەبوو[٩٢]، کەچی شەڕیش لە نێوانیاندا هەر بەردەوام بووە.

(ابن جبیر) وەسفێکی بەچاو دیتەی شارەکانی وڵاتی شام دەکا، کە خاچدروشمان داگیریان کردبوو، شاری (عەکا)یشی بە قوستەنتینییە چواندووەو دەڵی: "بووەتە کۆمەڵگای کەشتیگەل‌و جێگای یەکدگیربوونی بازرگانانی موسوڵمان‌و کرستیانەکان، لە هەموو لایەکەوە".[٩٣]

وەسفی قەڵاو قایمەی قاهیرە دەکا کە بە دەوری شاری میسرو قاهیرەدا، سەلاحەددین بە خاچدروشمە دیلەکانی دروست کردبوو.[٩٤]

(ابن جبیر) هەروەها وەسفی شاری قودس‌و دەستە سەربازییە ئیسلامییەکەی دەکا دوای سەندنەوەی شارەکە لە ساڵی (٥٨٣ك /١١٨٧ز)دا. باسی شوورەو قەڵاو قایمەو دۆخی تۆبۆگرافی شارەکەشی کردووەو[٩٥] باسی دیمەشق‌و (میدان الرمادیة)ی ناو ئەو شارەشی کردووە[٩٦]. ئەم گەڕۆکە بە دڵبوونی سەلاحەددینی بەگەرمی نیشان داوە، کە چۆن چۆنی دڵی موسوڵمانانی هەموو وڵاتێکی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە[٩٧]. (أبن جبیر) کە زۆر سەلاحەددینی بەدڵ بووە لەبەرئەوە بووە کە (ابن جبیر) پیاوێکی بەدین بووەو هەستیشی بەوە کردووە کە خودا سەلاحەددینی بۆ ئازادکردنی خاکی موسوڵمانان لە داگیرکاران ڕەخساندووە. شێوازی نووسینی ئەم گەڕۆکە تا بڵێی بە بڕشت‌و ڕێك‌و ڕەوانەو شێوەی هەندێ دەسەواژەو وشەی دیالێکتی وڵاتی مەغریب‌و ئەندەلوسیشی پێوە دیارە.

٢٠. (عبداللطیف کوڕی یوسف کوڕی محمد البغدادي) (ت٦٢٩ ك/ ١٢٣٠ز) خاوەنی کتێبی (الأفادة والاعتبار في الأمور المشاهدة والحوادث المعاينة بأرض مصر)[٩٨]، ئەمیش یەکێکە لە گەڕۆکەکانی هاوزەمانی سەلاحەددین.

(عبداللطیف) پاش سەرکەوتنەکەی شەڕی (حطین)ی ساڵی (٥٨٣ك/ ١١٨٧ز) گەڕانێکی بە هەندێ ناوچەی شامدا

---

90 سفرنامە/ ٩٣

91 ـ رحلة ابن جبیر، طبعة دار صادر دار، بیروت، ١٩٦٤ز

92 ـ رحلة ابن جبیر ، ص٢٦.

93 ـ رحلة ابن جبیر ، ص٢٧٦.

94 ـ ن، م، ص٢٥.

95 ـ ن، م، ص٢٧٧ ـ ٢٧٨.

96 ـ ن. م، ص٢٦١.

97 ـ ن، م، ص٢٧.

98 ـ پشتمان بە چاپکراوەکەی ساڵی (١٩٦٥)ی لەندەن بەستووە (نشر کمال حافظ زاندور جون أ وایفي، أي، فیدین)، هەروەهاش چاپی (مجلة المصري) بە بێ بەروارو.. ئەوەش کە المقریزي لە (السلوك) ج١، ق١، ص٩٤دا گوتویەتی.

**دەست پێ کرد، پاشان بۆ دیداری سەلاحەددین چوو بۆ دیمەشق، ئەویش ڕێزی لێ ناو خەلاتیشی کرد، لەکاتی گەمارۆدانی شاری عەکاشدا، سەری لە بارەگای لەشکری ئەیوبی داو ئەو (شارەشی. سەربازگەیەشی) وەسفکردووە، کە موسوڵمانان لە کاتی گەمارۆ دوورودرێژەکەیدا بنیادیان نابوو، هەروەها وەسفی ئەو گەرمادانەشی کردووە کە مەغریبییەکان لەوێ بە قوڕو حەسیر دروستیان کردبوون، وەسفی هەندێ لە کەشتییەکانی کەشتیگەلی ئەیوبیشی کردووە[99].**

**لە بابەتی دیارکردنی جێگای هەندێ شاری ولاتی شامو میسرو جزیرێشدا پشتمان بەم سەرچاوانەی خوارەوە بەستووە:**

**٢١. (یاقوت الحموي، شهاب الدین یاقوت کوڕی عبدالله الرومي الحموي) (ت٦٢٦ك/ ١٢٢٨ز) ئەم ناوەمان لە کتێبی (معجم البلدان)ە[100]کەیەوە وەرگرتووە. خۆیشی بلدانییەو لە مێژووی سەردەمی سەلاحیەوە نزیکە. هەروەها لەم زاتانەشمان وەرگرتووە:**

**٢٢. (القزویني، زکریا کوڕی محمد کوڕی محمود) (ت٦٨٢ك/ ١٢٨٣ز) خاوەنی کتێبی (آثار البلاد واخبار العباد)ە[101]. لەم کتێبەدا باسی (عەکا)و گرنگیی (عەکا)و باسی (شاری صورو دمیاطو عەسقەلان)ی کردووە.**

**٢٣. (ابن شداد عزالدین محمد کوڕی علی الحلبی)یە، (ت٦٨٤ك/ ١٢٨٥ز) خاوەنی کتێبی (الاعلاق الخطیرة في ذکر أمراء الشام والجزیرة)یە،[102] باسی سامانی کانزای ئاسنو دارستانی سنەوبەری چیاکانی لوبنانی تێدا کردوە.**

**هەرچی کتێبگەلی تایبەت بە باسی چەكو ڕێکخراوە سەربازییەکانو دەستووری شەڕو کوشتارن، ئەوانە، بایەخی تایبەتی خۆیان هەیە، نەخاسمە ئەو کتێبانەی بە تایبەتی بۆ سەلاحەددین دانراون، بە نموونەو وەك کتێبی:**

**٢٤. "الطرسوسي، مرضي کوڕی علی کوڕی مرضي" (ت٥٨٩ك/١١٩٣ز) کە پێی دەڵێن: (تبصرة أرباب الألباب في کیفیة النجاة في الحروب من الأسواء، ونشر أعلام الأعلام في العدد و لآلات المعدنیة علی لقاء الأعداء"[103]. ئەمە کتێبێکی نایابەو لەوەدەچێ گرنگترین کتێب بێت کە لە مێژوویو ئیسلامیی ناویندا، لەبارەی چەکی کانزاییو کیمیاییەوە دانرابێ، بە قسەی دانەری کتێبەکەدا دەردەکەوێ کە بە شارەزاییو بە دیتەیی، باسی دروستکردنی چەکەکانی جەنگ دەکات، جاروباریش لە زمانی (الشیخ أبو الحسن الأبرقي الأسکندراني)[104]ی مامۆستایەوە دەئاخەفێ.**

**(الطرسوسي) قسەکانی بە باسکردنی شمشێرەوە دەست پێ دەکاتو باسی ئەو ماددانە دەکا کە شمشێریان لێ دروست دەکرێ، پاشان دێتە سەر باسی جۆرەکانی کەوانو ڕمو پیكو درەگورزو قەڵغانو زرێو پەستەکی زرێدار، ئنجا باسی مەنجەنیقی عەرەبیو تورکیو فارسیو مەنجەنیقی (فەرەنگ)ی خاچدروشمو (دەبابە)و قولەو سەنگەر دەکا، کەمیکیش لەسەر پەیکوڵی ئاسن (المثلثات) دەدوێ، کە (حەسەك)یشی پێدەگوترا، پاشان دێتەسەر باسی نەوتو دەرهێنانو شێوازەکانی پالاوتنی نەوتو ماددەی سووتێنەری ئەوتۆش کە کوژانەوەی بۆ نییە.**

**٢٥. (الأوسي الأنصاري، عمر کوڕی ابراهیمی خاوەنی کتێبی تفریج الکروب في تدبیر الحروب)[105]دانەری ئەم کتێبە**

---

[99] ـ طبعة لندن ص١٨٦.

[100] ـ معجم البلدان ، دار صادر ـ دار بیروت، پێنج بەرگە، ١٩٥٥ـ١٩٥٧.

[101] ـ آثار البلاد، دار صادر ـ بیروت، ١٩٦٠.

[102] ـ الأعلاق الخطیرة، تحقیق سامي الدهان ، ط، المعهد الفرنسي للدراسات العربیة، دمشق١٩٦٢، ج٢، ق٢.

[103] ـ دەستنووسێکە (١٩٢) پەڕەیە، لە ژێر ژمارەی (٢٨٤٨)دا لە کتێبخانەی ئەیاسۆفیا لە ئەستەمبول، لە کتێبخانەی بودلیانی زانکۆی تۆکسفۆردیشدا هەیەو ژمارەکەی (٢٦٤)ە، لەسەر ئەوەی بوودلیانیش، ئێمە دانەیەکمان بە مایکرۆفیلم گرتووەو هەمانە، ئوستاد کلۆدکاهینیش لە ساڵی (١٩٤٨)دا، لاپەڕە گرنگەکانی لێ بلاوکردووەتەوە".

[104] ـ (سەیری پەڕی (أ٧٨)و پەڕەی ٨٨ب، بکە).

[105] ـ تحقیق جورج سکانلون، منشورات الجامعه الأمریکیة بالقاهره، ١٩٦١.

لەبەرایی سەدەی نۆیەمی کۆچی (کە ئەکا سەدەی پانزەیەمی زایینی)دا ژیاوەو هاوسەردەمی (فرج کوڕی برقوق)ی سوڵتانی مەملوکی بووەو، وەکو موحەقیقی کتێبەکەشی دەڵێ: "ئەم کتێبە، ڕای گشتیی خۆرهەڵاتی ئیسلامی دەربارەی جەنگ لە ماوەی شەڕەکانی خاچدروشماندا، چی بووبێ، هەر ئەوە دەڵێ".

ئەم کتێبە، کتێبێکی ڕێنمایی کردن و ڕێنیشاندانە، ڕێگای ڕاست نیشانی خاوەن دەسەڵات و فەرماندەکان دەدات، کە چی پێویستە بیزانن و چی باشە بیکەن، سەیر دەکەی باسی شورە کێشان و خەنەقلێدان بەدەوری شارەکان و قەڵاو قایمەکاندا دەکات[106]. دواا دەکات پۆستە بە کۆتری نامەبەرو بە هێستر بنێردرێ و سیخوڕو جاسوسان بنێنەوە[107]. باسی خەسڵەتەکانی جاسوسی چاك دەکاو باسی خەسڵەتەکانی جڵەوکێشی لەشکر دەکا[108]، هەروەها باسی چۆنێتی دەسەویەخەبوونی دوژمن و جێگاو کات و ساتی شەڕ دەکا، شارەزایی بۆسە دانان و لەشکرکێشی و شتی دیکەی لەو جۆرە بابەتانە نیشان دەدا.

٢٦. (الهروي، علي کوڕی أبوبکر کوڕی علي) (ت٦١١ك/ ١٢١٥ز) دانەری کتێبی (التذكرة الهروية في الحيل الحربية)یە[109]، بە ئەسڵ هەراتی و لەدایکبووی موسڵەو لەحەڵەب گەورەبووەو هەر لەوێش مردووە. هاوسەردەمی سەلاحەددین و (الملك الظاهر)ی کوڕی بووە، کتێبەکەشی بۆ ئەوە داناوە، ببێ بە چاوساغ و ڕێنیشاندەری کاربەدەستان لە هەڵسووڕاندنی حوکمدا. خەسڵەتی چاك و شێوازی هەڵس و کەوت لەگەڵ ڕەعیەو مسکێن و ئاکارو نەریتی جوانی بۆ ئەو کەسانەی، بە نموونە وەك وەزیرو میرو فەرماندەی لەشکرو قازی و دادوەر، ڕوون کردۆتەوە). (الهروي) لە بیست و چوار بەشی کتێبەکەی، سیازدەبەشی بۆ باسکردنی کاروباری شەڕو کوشتارو چەك و هەواڵگری و دەستەویەخەبوونی دوژمن و دزەکردنی لق و پەلەکانی لەشکر تەرخان کردووە.

لە قسەی دانەری کتێبەکە ڕا دەردەکەوێ کە خۆی، لەدوا دوای سەردەمی سەلاحەددیندا، لەگەڵ لقە سەربازییەکانی میسردا، لە میسرەوە بەرەو شام هاتووە،[110] لەو باسە سەیرو سەمەرانەی کە تەنیا ئەم دەیگێڕێتەوە ئەوەیە کە دەڵێ: "ئەو خاچدروشمانەی لە قەڵاکەی (کوکب) بەرگرییان دەکرد، خوێیان لەلا نەماو تەواو بوو لەبەرئەوە قەڵاکەیان دا بەدەستەوە.[111]

٢٧. (حسن کوڕی عبدالله العباسي) ئەمیش کتێبێکی بەناوی (آثار الأول في ترتيب الدول)ی[112] لە ساڵی (٧٠٨ك/ ١٣٠٨ز)دا، لە میسر داناوە، ئەم کتێبەی بۆ باسکردنی خەسڵەتی نەتەوەکانی، بە نموونە، وەك عارەب و تورك و کورد و فارس و دەیلەم، تەرخان کردووە کە چوونەتە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە. باسی هەندێ جۆرە چەکی، بە نموونە وەك پێنج تیر، و (حسك)و قەڵغان و ئامرازو ئامێری گەمارۆدانی بە نموونە وەك دەبابەو مەنجەنیق دەکات و چۆنێتیی لەشکرکێشی و فڕوفێڵی شەڕ، بۆ ئاڵۆزاندن و زیانلێدانی دوژمن، ڕوون دەکاتەوە، بە نموونە، ژەرنیخاویکردنی ئاوی خواردنەوەی دوژمن و پیسکردنی کەش و هەواو جێ و ڕێی، دوژمن. ئنجا دێتە سەر باسی شەڕی ناو دەریاو باسی ئەو چەکانەش دەکا کە لە ناو کەشتییەکانەوە لە کاتی جەنگدا دەخرانە کار.

٢٨. (ابن منكلي، محمد الناصري کوڕی محمود المصري) (ت٧٧٨ك/١٢٧٦ز) خاوەنی کتێبی (التدابير السلطانية في

---

106 ـ تفريج الكروب، ص١٢.

107 ـ تفريج الكروب، ص١٧ـ١٨.

108 ـ ن. م. ص٤١.

109 ـ التذكرة الهروية، تحقيق مطيع المرابط، منشورات وزارة الثقافة ، دمشق، ١٩٧٢.

110 ـ التذكرة، ص٩٠ـ٩١.

111 ـ ن. م ص٨٦.

112 ـ آثار الأول، مطبعة بولاق، القاهرة، ١٢٩٥هـ.

سیاسة الصناعة الحربیة)یە[113]، لەم کتێبەش سودمان وەرگرتووە. ئەم (ابن منکلي)یە لە سەڵتەنەتی (الملك الاشرف شعبان)دا کە سوڵتانێ بووە لە سوڵتانە مەملوکەکانی میسر، نەقیبی لەشکر بووە. سوودمان لەو قسانەی وەرگرتووە کە باسی جۆرە (قسیی)یەك دەکاو دەڵێ (البنجکان) کە بەکوردیو بە فارسیش مانای (پێنج تیر هاوێژ)ەو بە کورتی (پێنج تیرە). هەروەها باسی (التجفاف) ی کردووە واتا (بن زین)، کە لە بن زینەوە لەشی ئەسپیان پێ داپۆشیوە تا ئاگری بەرنەکەوێ.

هەندەی گوتمان بەسەو، پێویست بە سەربوردەی ژیدەرەکانی دی نییە. هەرچی سەرچاوەکانیشە، ئەوە، لە لیستێکی تایبەت بە خۆیاندا، لە کۆتایی ئەم کتێبەدا یەك بە یەك دەستنیشان کراون.

---

113 - لە کۆڕی زانیاریی عێراقدا، دانەیەکی بە فۆتستات وێنەگیراوی بە ژمارەی (٦٤٦ - چەك) هەیە، لە نوسخەی دەستنووسی ژمارە (١١٤٧ - ب) ی دار الکتب المصریەی قاهیرەوە وێنەی گیراوە.

# بەشی یەکەم
# دامودەزگای لەشکرتاری

## کەرتی یەکەم

## کۆتایی دەوڵەتی فاتمیو دامەزرانی لەشکری ئەییوبی:

١ـ هەڵمەتی نوورەدینی بۆ سەر میسر: هۆکارەکانو ئاکامەکانی.

٢ـ هەڵمەتی دووەمی نورەددینی.

٣ـ دوا هەڵمەتو جێگیربوونی شێرکۆو سەلاحەددین لە میسر.

٤ـ پێکهاتەی تیپی بۆ میسر نێردراوی نورەددین.

٥ـ ڕەگەزەکانی لەشکری فاتمی.

أ. مەغریبییەکان ( بەربەرەکان ).

ب. سودانییەکان (قولە ڕەشەکان )

ج. عەرەبەکان

د. تورکەکان.

ه. ڕەگەزی دیکەی وەك:

١ـ ئەرمەنییەکان. ٢ـ کوردەکان. ٣ـ نەتەوەی دیکەش.

٦ـ قەوارەی لەشکری فاتمی.

٧ـ پاکتاوکردنی لەشکری فاتمی.

٨ـ کرۆکی لەشکری ئەییوبی.

٩ـ قەوارەی لەشکری ئەییوبیو بەرەو چاتر چوونی ئەم لەشکرە.

### ١ـ یەکەم هەڵمەتی نورەددینی بۆ سەر میسر ساڵی ٥٥٩ك/ ١١٦٤ز

### هۆکارەکان و ئاکامەکانی

لە سێیەکی دووەمی سەدەی شەشەمی کۆچی، سەدەی دوازدەمی زایینیدا باری میسر دای لە ناڵەباری و داهێزرا[١١٤]، ئاشوب دایگرت و کاولکاریی تێدا کەوتە برەو ئێمە لێرەدا نیازمان نییە باسی مێژووی سیاسیی ئەو ڕۆژانەی میسر بکەین، وەلێ پێویستیشە بە کورتی ئاماژە بۆ ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانە بکەین، کە گەیشتە ئەوەی هانا بۆ هێزێکی دەرەکی ببرێ بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو ناهەموارییە.

یەکەم و گرنگترینی ئەو گۆڕانکاری و شڵەژاویەش وەژێر ڕکێفنانی هەڵسوڕاندنی حوکم بوو لەلایەن وەزیرەکانەوە، کە بە ئامان و زەمان چنگیان لێی بەرنەدەدا. ئەو وەزیرە فاتمییانە دەیەها ساڵ بوو دەستیان بەسەر کاروباری وڵاتی میسردا گرتبوو واتە لەو کاتەوەی کە پێگەی خەلیفە کەوتبووە لێژی. هاش و هوشیش ناکەین گەر بڵێین ئەو فەرمانڕانییە یەك سەدە بوو، بەر لەوەی بشڕووخێ بەرەو هەڵدێر دەچوو، نەخاسمە لە ساڵە دوورو درێژەکانی حوکمی (المستنصر)ی خەلیفەی فاتمیدا کە لە (٤٢٧. ٤٨٧ك) واتا لە (١٠٣٥. ١٠٩٤ز)ی خایاند.

دەشتوانین ساڵی (٤٦٦ك/ ١٠٧٣ز) بە ساڵی پشتشکێنی، یان بە ساڵی بادانەوەی مێژووی خەلافەتی فاتمی لە قەڵەم بدەین، ئا لەو ساڵەدا، خەلیفەی فاتمی (بدر الجمالي)ی حاکمی ئەرمەننەژادی[١١٥] شاری عەکای بانگهێشت کە بچێ بۆ میسرو، باری دوای ئاژاوەکەی میسر، هێور بکاتەوەو بیهێنێتەوە سەربار، ئەوەبوو (بدرالجمالي) بەدەنگییەوە چوو، بەخۆی و لەشکرێکی ئەرمەنەوە گەیشتە میسرو ئیشەکەی بەدەستەوەهات و خەلیفەش لە پاداشتدا دەستباڵای کردو دەسەڵاتێکی بەرفراوانیشی پێ سپارد.[١١٦] بەدوای ئەوەدا چینی فەرمان بەدەست لە ناو خۆیاندا تێکچوون و بوون بە دوو بەرە، بەرەیەکیان سەر بە (نزار)ی کوڕە گەورەی خەلیفەو بەرەکەی دی چوونە پاڵ (المستعلی)ی کوڕی دووەمی خەلیفە، ئەمیان (الوزیر الافضل کوڕی بدر الجمالي) کە لە جێگای باوکی بوو، بوو بەوەزیر، کەوتە یارمەتی و پشتگیری کردنی.

دیاردەی ملهوڕیی وەزارەت بەسەر چارەنووسی وڵاتی میسرەوە، تا لە گۆڕنانی دەوڵەتی فاتمی درێژەی کێشا، بەم بۆنەیەوە (علي بيومي) کە باسی دامەزرانی دەوڵەتی ئەییوبیی نووسیوە، گوتوویەتی: "هۆی ئەم ناڵەبارییە ئەوەیە کە "زۆربەی ئەو وەزیرە گەورانە لەسەر مەزەبی دەوڵەت نەبوونە لە جیاتی ئەوەی خزمەتی دەوڵەتەکە بکەن، ناوبانگیان لەکەدار کردووەو خراپەیان بەرامبەر کردووە".[١١٧]

باو، باوی ئەوە بوو، هەرکەسێ هێزو توانستی بەخۆی شك بردباو حەزی لێ با، وەزیرێکی دەکوشت و جێگاکەی دەگرتەوە، بە تایبەتیش والیی هەرێمەکان. (أبن الاثیر)[١١٨]، گوتەنی: "وەزیری بۆ ئەو کەسە دەبوو، وەزیرێ ببەزێنێ".

---

[114] (حوکمی فاتمی لە میسر لە ساڵی (٣٥٨ك/٩٦٩ز)وە، لە سەردەمی خەلیفە (المعز)ی فاتمیدا دەستی پێکردو لە حوکمی دوا خەلیفەی فاتمی (العاضد) لە ساڵی (٥٦٧ك/ ١١٧١ز)دا کۆتایی هات، واتا فاتمییەکان (٢٠٩) ساڵی کۆچی حوکمی میسریان کردوە، سەیری: المقریزی (اتعاظ الحنفا بأخبار الأئمة الفاطميين الخلفا) بکە. تحقبق: (د.جمال الدین الشیال)، ط، دار الفکر العربی، مطبعة لجنة التألیف والترجمة والنشر، سنة ١٩٤٨، ج١، ص٣٠٩.

[115] ابن خلکان، وفیات الاعیان، طبعة بیروت، دار الثقافة ١٩٦٨، ج٢، ص٤٤٩، الدواداری، أ[illegible]دالله بن أيبك، الدرة المضية في أخبار الدولة الفاطمية، طبعة المعهد الألماني للآثار بالقاهرة/١٩٦١، ص٣٩٩. المقريزي، الخطط (طبعة المعهد الفرنسي) ج١، ق١، ص١٣.

[116] السجلات المستنصرية، تحقيق ونشر، د. عبدالمنعم ماجد، ص١٠٨. ابن الوردي ، تأريخ ابن الوردي، المطبعة الحيدرية، النجف١٩٦٩، ج١، ص٥٢٤ ـ ٥٢٥، د. حسن أبراهيم حسن، تاريخ الدولة الفاطمية، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة، ط٣، سنة١٩٦٤، ص١٧١ت ١٨٠.

[117] على بيومى، قيام الدولة الأيوبية في مصر، دار الفكر الحديث، القاهرة، ١٩٥٢، ص٣٧.

[118] الكامل في التاريخ ط، دار صادر، دار بيروت، لبنان ١٩٥٦، ج١١، ص١٨٥ (ابن الأثير) ئەم دەڵێ: خەلیفەکان پشت پەردە کەوتوون، وەزیرەکان وەك داگیرکەری مولکن کەم کەسیش لە دوای (الأفضل) بەبی شەڕ وەزارەتی وەرگرتووە، ئەویش ئەنجام هەر کوژراوە.. شتی دیکەی لەو بابەتانەش، (ابن شداد)یش دەڵێ: هێزی میسرییەکان بە لەشکری وەزیرەکانیانەوە بووەو بە وەزیریان گوتووەوە (سوڵتان)، النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية (سيرة صلاح الدين) تحقيق: د. جمال الدين الشيال، طبعة الدار المصرية، القاهرة، ١٩٦٤، ص٣٦، وفيات الأعيان، ٧/١٤٥، والروضتين، ج١، ق٢، ص٣٣١.

**(الافضل) له ساڵی (٥٢٤ك/ ١١٣٠ز)دا[119]، له لایەن (المأمون البطائحی)یەوە کوژراو، البطائیحیش له لایەن (أحمد أبن الافضل)یەوە کوژرا، ئیدی بەو جۆرە، ئەم بەزمە تا کۆتایی حوکمی فاتمییەکان درێژەی کێشا، "ئەم بەزمە هەموو بارودۆخێکی گرتەوە، به تایبەتیش بارودۆخی ئابووری، تا وای لێ هات، نرخی خۆراکی زەرووری، به نموونه وەك نان و ڕۆن و برنج دوو قات زیادی کردو گەیشتە ئەوەش گەنم به ئاشەوانەکان نەبێ نەدەفرۆشرا"[120]. به تایبەتیش لەو ساڵانەدا که ئاوی (نیل) دادەکشاو دەیدا له کەمی و خەڵکەکە شپرزە دەبوون.**

**له ساڵی (٥٤٤ك/ ١١٤٩ز)دا[121] ئاژاوەو فیتنەیەك له قاهیرە له نێوان گروپەکانی لەشکردا هەڵایساو خەلیفە (الحافظ)ی تێدا کوژراو (الفائز)ی کوڕی، که هێشتا منداڵ بوو به یاریدەی (الوزیر عباس) کرا به خەلیفە، بەو جۆرە میسر لەوە نەدەچوو خەلیفەی هەبێ، سەردەمی (الفائز) وەك (المقریزي) دەڵێ: کەوتبووە ژێر ڕکێفی وەزارەتەوە[122]. (الملك الصالح طلائع کوڕی رزیك)ی ئەرمەنی نەژادی، والی (الأشمونین)[123] ئەمەی به هەل زانی و به هێزەکانی خۆیەوە، ملی نا له قاهیرەو، (الوزیر عباس) هەڵات و پاشان کوژرا. (طلائع) وەزارەتی داگیرکرد، زۆری نەبرد خەلیفە منداڵەکەش، که هێشتا تەمەنی یازده ساڵان بوو، ئەویش له ساڵی (٥٥٥ك/ ١١٦٠ز)دا سەری نایەوە، بەرلەوەش بمرێ، ئەقڵی پەڕی، شێت بوو، چونکه ئەو ڕۆژەی کردیانە خەلیفە، لاشەی مامە کوژراوەکانی به چاوی خۆی دیت و له ترسانا، تا مرد هەر دەیقیژاندو هاواری دەکرد.[124]**

**(العاضد)ی برای (الفائز) خەلیفایەتی وەرگرت، ئیدی ئەم دوا خەلیفەی فاتمیی بوو، جا وەرە، حاڵ بەو خراپییەو، ئەم خەلیفەیەش دیسان تەمەنی له یازده ساڵ زیاتر نەبوو، (طلائع) کەوتە کار ڕێکخستن و ئاین و ئۆین و کچەکەی خۆی له خەلیفە مارەکرد، تا به ئاسانی خەلافەت بخاتە ژێر دەستی خۆی، وەلێ (طلائع)یش له ساڵی (٥٥٦ك/ ١١٦١ز)دا کوژرا، پاش ئەم (رزیك)ی کوڕی که به (الملك العادل) ناوداربوو، ئەرکی وەزارەتی گرتە دەست، لەوەو پێشیش (طلائع) کوڕەکەی خۆی ڕاسپاردبوو که خۆی له شەڕی (شاور کوڕی مجیر السعدي) والیی (قوص)ی صعیدی میسر بپارێزی و له**

---

[119] ـ الکتبی، محمد بن شاکر، عیون التواریخ، تحقیق: د. فیصل السامر ونبیلة عبدالمنعم داوود، ط، وزارة الاعلام، بغداد، دار الحریة ١٩٧٧، ج١٢، ص٢٢٠.

[120] ـ الخطط، ط أوفسیت، ٢١٧/٢، وانظر: علی بیومی، قیام الدولة الایوبیة . ص٥٤، د. حسن ابراهیم حسن، تاریخ الدولة الفاطمیة، ص١٧١ ـ (لەبارەی گرانی و کەوتنەوەی برسێتیە ئابڕوبەرەکەی که میسری سەردەمی فاتمیی گرتەوە، سەیری: (ابن الصیرفي المصري بکه)، الأشارة الی من نال الوزارة. طبعة المعهد العلمی الفرنسی، القاهرة ١٩٢٤، ص٤٣. المقریزی، أتعاظ الحنفا باخبار الأئمة الفاطمیین الخلفا، تحقیق د.محمد حلمي محمد احمد، مطابع الاهرام التجاریة، القاهرة ١٩٧١، ج٢ص١٦٥،١٦٤، ١٧١، ١٧٠، ٢٧٩، ٢٨٠، ٢٩٨، "نەهامەتیو برسێتی یەك له دوای یەك دووبارەو سێبارە.. دەبوونەوە، به جۆری که خەڵکو خوا شتی بۆگەنو کەلاکی مردارەوە بووی کەرو هێسترو گۆشتی زەلامی له سێداره دراوو ئەو جۆره شتانەیان دەخواردو خۆراکیان له دەست یەکدی دەرفاند، ئەم حاڵەتە ئاسایی و باو بوو هەموو ڕۆژێ به چاو دەبینران و ڕێبوارانیشیان دەرفاند، ص٢٩٨، أغاثة الامه، ص٢٣ـ ٢٤".

[121] ـ (ململانێ له سەر کورسیی وەزارەت، له نێوان وەزیرەکاندا ڕووداوو کارەساتی زۆری لێ کەوتەوە، لێرەدا هەر به نموونه، باسی ئەو ڕووداوە دەکەین که له ساڵی (٥٢٨ك)دا ڕووی دا، لەو ساڵەدا، وەزیر ـ ابن سالار الکردی، ابن وهال)ی وەزیری کوشت تا خۆی له جێگاکەی ببێ به وەزیر ـ سەیری ئەمانه بکه: ابن القلانسی، ذیل تاریخ دمشق، مبطعة الآباء الیسوعیین بیروت ١٩٠٨، ص٢٤٢، ٣١١. أسامة بن منقذ، کتاب الاعتبار، طبعة جامعة برنستون، امریکا، ١٩٣٠، ص٧ـ٩ (ئەمە وەك به چاو دیتبێتی وەها قسه دەکا). ابن الأپیر، الکامل، ١٨٤/١١ـ١٨٥، الکتبی، عیون االتواریخ. ٤٣٨/١٢، ٤٨٥.

[122] ـ الخطط، ط، أوفسیت ٣٥٧/١.

[123] ـ الأشمونین: شارۆچکەیەکه له (صعید)ی میسر.

[124] ـ الخطط، ن.م (بۆ زیاتر زانینی باسی ئەم کارەساته) بنۆڕە: د.محمد عمارة، عندما أصبحت مصر عربیة، طبعة المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، بیروت ١٩٤٧، ص١٦٣ـ ١٧٢.

**والیّتی دەری نەکا.[١٢٥]**

**کەچی، ئەم هەر زوو دەری کرد، شاوریش هەستا خەڵکێکی زۆری لەدەوری خۆی خڕکردەوەو بەرەو قاهیرە ملیان نا، (العادل) ڕای کردو پاشانیش کوژرا، بەنەمانی ئەمیش، حوکمی دوا وەزیری بە توانای میسریش نەماو کۆتایی هات. (عمارة الیمني) دەڵێ: "بەنەمانی دەوڵەتی کوڕانی ڕزیك، دەوڵەتی میسریش لەناو چوو".[١٢٦]شاور جێگای (العادل)ی لە وەزارەتدا گرتەوەو نازناوی (میری لەشکرەکان)ی لەخۆی نا.**

**دوای ماوەیەك ئنجا (الملك المنصور ضرغام) کوڕی (سوار اللخمي) فەرماندەی لەشکری میسر، بەرەو قاهیرە کەوتەڕێ، شاور هەلاّت بۆ شام و ضرغام بوو بە وەزیر. بەم جۆرە، دەبینین هەر لە ماوەی ساڵی (٥٥٨ك/١١٦٣ز) دا، سێ وەزیر فەرمانیان بەسەر میسرەوە ڕاندیوە، ئەمانەن: "العادل کوڕی ڕزیك و شاورو ضرغام). ابن الأثیر دەڵێ: "ضرغام، هەر کە وەزارەتی کەوتە دەست، زۆرێك لە میرەکانی میسری کوشت، تا وڵاتەکەی بەبێ ڕکابەر بۆ تەخت ببێ، بەو جۆرە دەوڵەت باری کەوتە لێژی و هاتە لاوازی، تا وای لێهات جڵەوی وڵاتەکەیان لەدەست بەربوو".[١٢٧]**

**شاور پەنای برد بۆ شام و هانای بردە لای سەرگەورەی شام، نوورەددین مەحمود کوڕی عیمادەددین زەنگی، بەڵێنی سێیەکی داهاتی میسرو بەشی ئەرك و مەسرەفی لەشکری پێدا، کە ببێ بە فەرماندەی لەشکرەکەی و بە خۆی و بە لەشکرەوە، لە میسر نیشتەجێ بن، بە مەرجێ خۆیشی واتا شاور، بە فەرمانی نورەددین هەڵسووڕێ.[١٢٨] گەورەی شام هەرچەندیشە لەوە دەترسا ئەم کارەی سەرنەگرێ و خۆیشی پێداویستی بە سەربازەکان هەبوو بۆ وڵاتەکەی خۆی، نەخاسمە شاور جێگای بڕوا نەبوو، ناوبانگی باش نەبوو، چونکە لەوەو پێش ڕزیکی کوشتبوو، ئەو کارەساتەش "ڕووی سپیی ڕەش کردبوو".[١٢٩]ڕێگاش نەهات و پڕ مەترسی و لە ژێر دەسەڵاتی بازگەو سەربازانی خاچدروشماندا بوو،[١٣٠]بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا دەستی نەنا بەڕوویەوە. نورەددین مەحمود دەیزانی کە میسر لە ڕووی ئابوورییەوە قورس و دەوڵەمەندەو پێگەو ڕێگەیەکی ستراتیجی گرنگی هەیەو دەتوانێ لە شەڕی ئایندەی خاچدروشماندا ڕۆڵێکی چاك بگێڕێ[١٣١]. هەروەها دەشیزانی کە میسر کەوتۆتە قۆناغێکی شپرزەیی ناخۆشەوە، لەبەرئەوە دەترسا خاچدروشمان بەسەر ئەو هەلەوە نەچن و لە دەستی خۆیانی دەرنەکەن و پەلاماری میسر بدەن.. هەروەکو لە کاتی کوژرانی خەلیفە (الفائز)دا (٥٥٥ك/ ١١٦٠ز) ویستیان بیکەن، بەڵام لەوەدا پاشەکشەیان کرد، چونکە (طلائع کوڕی ڕزیك) کە ئەو کات وەزیر بوو، بۆین بوو بەوەی کە ساڵانە سەدو شەست هەزار دینار سەرانەیان بداتێ،[١٣٢]وەلێ خاچدروشمان هەر لێی نەوەستان و لەشکریان کردە سەر میسرو بیانووی ئەوەیان هێنایەوە کە میسرییەکان بەڵێنی خۆیان نەبردووەتە سەرو**

---

[125] ـ الكامل، ٢٩٠/١١.

[126] ـ عمارة اليمني، النكت العصرية في أخبار الوزارة المصرية، مطبعة مرسو (مدينة شالون) فرنسا ١٨٩٧، ص٦٨. النجوم الزاهرة، ٣٤٦/٥.

[127] ـ الكامل، ٢٩١/١١. الخطط، ط، أوفسيت، ٣٥٨/١.

[128] ـ الكامل، ٢٩٨/١١. ابن العديم، زبدة الحلب من تأريخ حلب، تحقيق: د. سامي الدهان، المطبعة الكاثوليكية ١٩٥٤، ٣١٦/٢. ابن قاضي شهبة، الكواكب الدرية في السيرة النبوية، تحقيق: د.محمود زايد ، بيروت ١٩٧١ ص١٦٣ـ ١٦٤.

[129] ـ النكت العصريه، ص٦٨. (بنۆڕە: النجوم الزاهرة، ٣٤٥/٥).

[130] ـ ابن الأثير، التاريخ الباهر في الدولة الأتابكية (بالموصل وحلب)، تحقيق: د.عبدالقادر أحمد طليمات، ط، دار الكتب الحديثة بالقاهرة، ١٩٦٣، ص١٢١. الكامل، ٢٩٨/١١. أحمد بن ابراهيم الحنبلي، شفاء القلوب في مناقب بنى ايوب، ص٢٦. الكواكب الدرية، ١٦٤. الروضتين ج١، ق٢، ص٣٣٢. ابن واصل، مفرج الكروب في أخبار بني أيوب، تحقيق: د.جمال الدين الشيال، مطبعة جامعة فؤاد الأول، القاهرة، ١٩٥٣، ج١، ص١٣٨.

[131] ـ "وەك ستیڤن رنسیمان دەڵێ: "داهاتی میسر حەددو حیسابی نەبوو". تأريخ الحروب الصليبيه، ترجمة، د.السيد الباز العريني، مطبعة دار الثقافة، بيروت ١٩٦٨، ج٢، ص٦٧٣.

[132] ـ د. عبدالفتاح سعيد عاشور، الحركه الصليبيه، مكتبة الأنكاو مصرية، مطبعة لجنة البيان العربي، القاهرة، ١٩٦٣، ج٢، ص٦٨١، نقلا عن ميخائيل السرياني ووليم الصوري.

**پارەکەیان نەداوە، ئەوکات وەزارەت بە دەست ضرغامەوە بوو، ضرغامیش نەیکردە نامەردی فەرمانی دا بەنداوەکانی سەر ڕووباری نیل بکەنەوەو ئاویان تێبەردەن.[١٣٣] ئیدی ئەوە بوو (ئاموری یەکەم)ی[١٣٤] شای خاچدروشمان ناچار گەڕایەوە، دەشیزانی کە میسر تا بڵێی لاوازو بێ دەسەڵاتەو خاوەن سامانێکی قورس‌و گرانیشە، دەشیزانی کە بە ئاسانی داگیر دەکرێ، وەلێ خۆی بۆ داگیرکردنێکی گەورەتر تەیارو ئامادەکرد.**

**جا لەبەر ئەوانە، ئەمجارەیان، نورەددین مەحمود بڕیاری دا کۆمەك بە شاور بکات، ئەوەبوو فەرمانی دا بە پێشەنگ (مقدم)ی لەشکر (ئەسەدەددین شێرکۆی کوڕی شادی)[١٣٥] فەرماندەیی لەشکر بگرێتە دەست‌و بەرەو میسر بجوڵێ، بێگومان دەستنیشانکردنی شێرکۆ، ئەوە دەگەیێنێ کە بارودۆخەکە تا بڵێی تیژو ترسناك بووەو ئەوەش نیشان دەدا کە نورەددین مەحمود زۆر بە تەنگ مەسەلەی میسرەوە بووە.**

**(ابن الأثیر) دەڵێ: "نورەددین ئاگادار بوو کە شێرکۆ "هەند جێ دەستی دیار بووەو هەند ئازا و قارەمان و بەجەرگ بووە، لەبەرئەوە زۆری لێ ڕازی بووەو کردوویەتی بە پێشەنگی لەشکرەکەی خۆی".[١٣٦] شێرکۆ لە فەرماندەیی دەوڵەتی نورەددینیدا دەستێکی هەند باڵای هەبووە، کەس نەیتوانیوە بڵێ من شێرکۆم، "تا وای لێ هات، هەر دەتوت شەریکە بەشی موڵك‌و شاهێتی نورەددینە".[١٣٧]**

**شێرکۆ، بەم داوایەی نورەددین قایل بوو، بەرەو میسر کەوتەڕێ‌و (سەلاحەددین یوسف کوڕی ئەیوب)ی برازای خۆیشی لەگەڵ خۆی برد، سەلاحەددین ئەو کات لاوێ بوو، تەمەنی لە بیست‌و حەوت ساڵ تێنەپەڕیبوو) میرانی دیکەو شاوری وەزیری لێخستەشیان لەتەك خۆیاندا بردو لە (جمادي الأولی) ساڵی (٥٥٩ك/ ١١٦٤ز)دا گەیشتنە میسر، هەرچی نورەددینە، ئەو دەوروبەری جێگاکانی خاچدروشمانی دەدا تا نەتوانن ڕێگا لەم هەڵمەتەی شێرکۆ بگرن.[١٣٨]**

**شێرکۆ، بە هەزار سوارەوە گەیشتە خاکی میسر[١٣٩] و لە بلبیس دابەزی[١٤٠] و لەگەڵ لەشکری ضرغام کە (ناصر الدین)ی برای وەزیر فەرماندەیی کرد، تێکهەڵپژان‌و لەشکری ناصرالدین شکاو[١٤١] خۆیشی هەڵات‌و ڕایکرد.[١٤٢]**

**ئنجا شێرکۆ شاوری کردەوە بە فەرمانڕان، وەلێ شاور هەر زوو پشتی بێ وەفایی تێکردو لەو بەڵێنەی بە نورەددینی دابوو، پاشگەزبووەو، چووە پاڵ خاچدروشمان‌و داوای کۆمەکی لێ کردن‌و تەماعی پارەی خستنەبەرو، ترسی ئەنجامی**

---

[133] ـ حسن ابراهیم حسن، الفاطمیون في مصر واعمالهم، المطبعة الأمیریة، القاهرة ١٢٣٢ن ص٣٠٢، على بیومي، قیام الدولة الأیوبیة، ص١٠٣د.عیدالقادر أحمد الیوسف، علاقات بین الشرق والغرب، منشورات المکتبة المصریة، صیدا، ص١٢٥ ـ د. الباز العریني، الشرق الادنى في العصور الوسطى، (الأیوبیون)، دار النهضة العربیة للطباعة والنشر، ١٩٦٧، ص٣١. د. عاشور، الحرکة الصلیبیة، ٦٨١/٢، معتمدا على کتاب:
Lane- pool, salad in and the fall of kinghom of Jerusatem, London, 1914, p81 schlumberger, .compagnes, pp, 38-48

[134] ـ (ناوی ئەم شایە بە چەندین جۆر هاتووە، وەك: عەموري، أموري، امري، مری، (بە ئینگلیزیش: ئەمالریك: Amalric).

[135] ـ ذیل تاریخ دمشق، ٣٤٩.

[136] ـ التأریخ الباهر ، ١٢٠.

[137] ـ التاریخ الباهر ص١٦٨.

[138] ـ الکامل، ٢٩٩/١١، الحموي، التاریخ المنصوری، تلخیص الکشف والبیان في حوادث الزمان، نشر بطرس غریاز نویج، طبع دار النشر للآداب الشرقیة. موسکۆ ١٩٦٠، ص١٧٥. زبدة الحلب، ٣١٦/٢. الروضتین، ٣٣٢/١. مفرج الکروب، ١٣٨/١، الکواکب الدریة، ص١٦٤.

[139] ـ الخطط. طبع المعهد الفرنسي، نشر M.Gaston Wiet ، ط ١٩١٣، ج٢، ق١، ص١٥.

[140] ـ (بلبیس: شارێکە، کەوتوەتە سەر ڕێگای شام‌و حەوت قۆناغ لە (الفسطاط)ەوە دوورە)، یاقوت الحموي، معجم البلدان، دار صادر، دار بیروت، ج١، ص٤٧٩.

[141] ـ الکامل، ٢٩٩/١١. الخطط، ط، أوفسیت، ٣٥٨/١، مفرج الکروب، ١٣٩/١.

[142] ـ الکامل، ن.م، الخطط، ن. م ، وفیات الاعیان، ٤٤٢/٢. الروضتین، ٣٣٣/١. زبدة الحلب، ٣١٧/٢. شفاء القلوب، ٢٦. Lane- pool, .saladin, p , 82, saladin . p, 82 .

فەرمانڕانینی ئایندەی شێرکۆی خستە دڵیان و لە حوکمی ژێردەستەیی نورەددینیش بە ئاگای هێنانەوە، خاچدروشمان، پاش ئەوەی قەناعەتیان بە قسەکانی هێنا، بەهێزێکی سەربازی کەوتنە کۆمەککردنی و شا ئەموری بە خۆی فەرماندەیی ئەو هێزەی گرتە دەست و[143] هێزەکە گەیشتە میسرو (بلبیس)یان بە هێزەکانی شێرکۆوە گەمارۆدا، بەڵام نەیانتوانی بیبەزێنن. لەم هەنگامەدا، هەواڵیان وەرگرت، کە خاچدروشمان لە (حارم)[144]ڕایان کردووەو نورەددین قەڵاکەیانی لەوێ داگیرکردووەو، بەرەو (بانیاس)یش کشاوە، بەمەش، خاچدروشمان ریسەکەیان لێ بووەوە بە خوری و ناچار لەگەڵ شێرکۆدا کەوتنە نامەو نامەکاری بۆ وەستاندنی شەڕو داوایان لە شێرکۆ کرد کە هەردوولایان بگەڕێنەوە بۆ شام. بەم جۆرە، هەڵمەتی یەکەمی نورەددین (هەڵمەتی یەکەمی شامی نورەدیینی) بۆ سەر میسر کۆتایی هات.

**٢ـ هەڵمەتی دووەمی نورەددین ساڵی ٥٦٢ك/ ١١٦٦ز بۆ سەر میسر:**

هیچ لایێ لەم ململانێیەدا بە ئاواتی خۆی نەگەیشت. تەنیا شاور نەبێ.، لە لایەکەوە ضرغامی دوژمنی لە کۆڵ بووەوە، لە لایەکی ترەوە شێرکۆ بە ڕک و توڕەییەوە گەڕایەوە بۆ شام.[145] ئەم هەڵمەتە، ئەوەی بۆ نورەددین دەرخست کە میسر، وڵاتێکی بێ خاوەنەو هەموو کاروبارێکی بە هەڵخەڵەتاندن و فروفێڵ بەڕێوەدەچێ".[146] لەبەرئەوە نورەددین هەڵمەتی دووەمی لە ژێر فەرماندەیی (أسدالدین شیرکۆ)دا پاش نزیکەی سێ ساڵی دی، واتا لە ساڵی (٥٦٢ك/ ١١٦٦ز)دا بە دوو هەزار سوارەوە بردە[147] سەر میسر، ئەم جارەشیان سەلاحەدیینی هەر لەگەڵدا ناردن چەند میرێکیش لەگەڵ لەشکرەکە کەوتن. هەر کە شاور بەمەی زانی دەستبەجێ ناردی لە دووی شا ئەموری، ئەمیش دەرحاڵ گەیشتە ئەوێ، لەگەڵ هێزەکانی شێرکۆ لە شەڕی (البابین)[148]دا کە دەکەوێتە (صعید)ی میسرو، دە میل لە باشووری (المنیا)ی ئێستاوە دوورە، بوو بە کوشتار.[149] هەرچەندیشە لەشکری ئەموری زۆر قەبەو گەورەبوو، بەڵام شێرکۆ سەرکەوت. "ئەم شەڕە سەیرە، چووە ناو مێژووەوە، سەیرەکەشی لەوەدایە کە دوو هەزار سواری شام توانیویانە لەشکرگەلی میسرو لەشکری خاچدروشمانی کەناراوی میسریش پێکەوە تێکبشکێنن".

شێرکۆ، هەر بەو سەرگەرمییەوە ڕوویکردە ئەسکەندەرییەو بە سانایی ئەوێشی داگیرکردو، سەلاحەددینی بە بەرپرسی شارەکە داناو خۆی گەڕایەوە بۆ (صعید). وەلێ خاچدروشمان و میسرییەکانیش لێنەگەڕان شێرکۆ ئەم پاروە چەورەی بکەوێتە دەست، هەستان چوون بۆ گەمارۆدانی ئەسکەندەرییە. ئەوجا شێرکۆ لە (صعید)ەوە گەڕایەوە ئەسکەندەرییە، بۆ کۆمەکی سەلاحەددین، ئیدی ئەوەبوو خاچدروشمان گەمارۆکەیان لابرد، بەمەرجێ هەردوولایان خاکی میسر بەجێبهێڵن، بەو جۆرە، شێرکۆ ئەم ئاشتییەی بە نابەدڵی قبوڵ کرد، چونکە بەبرێ پارە قایلیان کرد، ئەویش دەیویست بەهەر نرخێ بێت خاچدروشمان لە میسر دەربچن، حاڵی لەشکرەکەی خۆیشی نالەبار بوو، وەلێ

---

[143] ـ ئەمە دووەم هەڵمەتە کە ئەموری دەیکاتە سەر میسر . یەکەم هەڵمەتیش (وەك باسمان کرد) لەسەردەمی وەزارەتی (ضرغام)دا بوو، واتا، ئەموری، وەك لەمەودوا دەبینین، فەرماندەیی چوار هەڵمەتی بۆ سەر میسر کردووە.

[144] ـ حارم: قەڵایەکی قایمکارەو نیمچە شارێکە دەکەوێتە بەرامبەر شاری (أنطاکیة)و سەر بە حەڵەبە، معجم البلدان ، ٢/٢٠٥.

[145] ـ النجوم الزاهرة، ٣٤٨/٥، (ابن شداد) دەڵێ: (شێرکۆ بە ناچاری و نابەدڵی و دڵسووتاویەوە گەڕایەوە بۆ شام) النوادر، ٣٨.

[146] ـ النوادر ، ص٣٦، وفيات الأعيان، ١٤٧/٧، الروضتين، ج١، ق، ص٣٣٧.

[147] ـ الكامل، ٣٢٤/١١، زبدة الحلب، ١٣٣، الباهر، ٣٢٢/٢، مفرج الكروب، ١٤٨/١. الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٦٤. تأريخ ابن الوردي، ١٠٢/٢. وفيات الأعيان، ١٤٧/٧. ابن العماد، شذرات الذهب في أخبار من أدب، مطبعة القدس، ١٣٥٠ه، ج٤، ص٢٠٣. stevnson, W.B,the Crusadres in the east, Cambridge 1907,P191. (الذهبي) یش دەڵێ: (زۆربەی لەشکرەکەی نورەددینی لەگەڵ خۆی بردە سەر میسر) العبر، تحقيق: د.صلاح الدين المنجد، مطبعة حكومه الكويت، ١٩٦٣، ج٤، ص١٧٦.

[148] ـ (بۆ شرۆڤەو زێدەزانین لە بارەی ئەم شەڕەوە بنۆڕە: الكامل، ٣٢٥/١١ت٣٢٦، الباهر، ١٣٣ـ سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان في تأريخ الأعيان، مطبعة مجلس دار المعارف العثمانية، حيدر آباد، الهند ١٩٥٢ ج٢، عن ٢٦٨ـ ٢٦٩، مفرج الكروب، ١٥٠/١ـ ١٥١. الكوكب الدرية، ١٩٦ـ١٧٠. د.حسن حبشي، نورالدين والصليبيون، ص١١٤.

[149] ـ د.حسن ابراهيم، الفاطميون في مصر ، ٣٠٤.

لەولاوە، ئەموری ڕێکەوتنێکی لەگەڵ شاوردا مۆرکرد کە خاچدروشمان (شحنە) واتا بەرپرسێکیان[150] لە قاهیرەدا ببێ، وەك بڵێین نوێنەرێکی باڵا (مفوض سامي)[151] و بازگەی دەرگاکانی شارەکەش بە دەستیان بێت، نەوەکا نورەددین سەربازەکانی خۆی بنێرێتە سەریان و دزە بکەن بۆ ناو شارەکە، هەروەها فەڕەنگەکان ساڵانە سەد هەزار دیناریش لە داهاتی میسر وەربگرن.[152]

ئەم هەموو کارەسات و کەین و بەینە ڕووی دەدا، کەچی خەلیفە (العاضد) فاتمی هیچ هێزو دەسەلاتێکی نەبوو، کاری بەسەر هیچەوە نەمابوو، ئاگاشی لە هیچ نەبوو، چونکە شاور کاری خۆی لێکردبوو و لەبەرچاوان نەیهێشتبوو.[153]

**٣ـ هەڵمەتی سێیەم (دوا هەڵمەت): پێداکوتانی شێرکۆو سەلاحەددین لە میسر (صفری ٥٦٤ك/ تشرینی دووەمی ١١٦٨ز):**

بەم هەڵمەتگەلی شامیی و خاچدروشمییە بۆ سەر میسر، هەردوولایان لە بارودۆخی میسرو خاڵی لاوازی میسر[154] شارەزاییان بە دەستهێناو زانیارییان لە بارەی سەروەت و سامانی زەبەنی میسرو پێگەی ستراتیجی میسر دەستکەوت، ئیدی لەوەدا نەما هیچ لایەکیان بتوانێ واز لە بیرۆو فکری فەرمانداری و داگیرکردنی میسر بهێنێ. وەهاش دەردەکەوێ خاچدروشمان زیاتر بەتەمابوون، میسر بکەن بەموڵکی موفتی خۆیان، نەخاسمە کە میسریان بەو بێ هێزیی و لاوازییەوە بۆ دەرکەوت.[155]

شا، ئەموری، کاتێ دەستی کرد بەم هەڵمەتە تازەیەی، هەر هەمان بیانووی هێنایەوە کە لە هەڵمەتی یەکەمیدا دەیهێنایەوە، بیانووەکەش ئەوەبوو کە میسرییەکان (واتە وەزارەتەکەی شاور) سەرانەو باجێ کە سەپاندبووی بەسەریانا، دەغەڵی تێدا دەکەن و دوای دەخەن، ڕاستیشت دەوێ، شاور دەیزانی ئەو سەرانەو باجە، باری شانی میسری گران کردوەو پێی هەڵناسێ، ئەو کۆمەك و یارمەتییەش کە لە خاچدروشمانی داوا کردبوو، بۆی بوو بە (شحنە) واتە نوێنەرێ کە خاچدروشمان لە قاهیرە دای بنێن و خۆشیان پاسەوانی خۆیان لە دەرگاکانی قاهیرەدا هەبێ و بازگەکانیان بە دەستەوە بێت.[156]

لەگەڵ ئەوەشدا فەرماندەی بازگەو پاسەوانانی خاچدروشمان لە قاهیرە ئەمجارەیان ناردیان لە دووی شا ئەموری و مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی کە بچێ بۆ میسر،[157] لەبەرئەوە ئەموری، ئەمەیان چوارەم هەڵمەتی بوو، بە لەشکرەوە بەرەو میسر بەڕێ بکەوێ.

هەرچی شاورە، هەوڵیدا بەر بە لەشکرەکەی بگرێ، بەڵام بێ هودە بوو، بۆی نەکرا، ئەموری گەیشتە (بلبیس)، پاشان گەیشتە قاهیرە، شاور کە هیچی بۆ نەکرا، ئەوجا ڕۆژێك بەرلەوەی خاچدروشمان بگەنە شاری میسر (الفسطاط) فەرمانیدا شارەکە بسووتێنن، نەوەکا دەستی خاچدروشمانی بگاتێ و بیکەن بە موڵکی خۆیان، گڕو بڵێسەی ئەو شارە

---

150 ـ شحنە: (واتە وەکیلو جێگری سوڵتان کە بتوانن کاروباری وڵات بە کارامەیی کۆنترۆڵ بکەن). ابن منظور، لسان العرب، دار صادر، دار بيروت (١٩٥٥ـ ١٩٥٦) ٢٣٤/١٣.

151 ـ بڕوانە: كارل بروكلمان، تأريخ الشعوب الأسلامية، دار العلم للملايين، بيروت ١٩٦٤، ط٤، ص٣٥١.

152 ـ الكامل، ٣٢٧/١١، مرآة الزمان، ٢٦٩/٨. مفرج الكروب، ١٥٢/١. الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٦٦. الخطط، ط المعهد الفرنسي، ج٣، ق٢، ص١٨٩ـ ١٩٠. الكواكب الدرية، ١٧٢. ابن خلدون، كتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر، طبعة دار الكتاب اللبناني. مجلد٥، ق٢، ص٤٤٨، ق٣، ص٦١٨.

153 ـ الباهر ، ١٣٤. النجوم الزاهرة، ٣٥٠/٥. الكواكب الدرية، ١٧٢.

154 ـ زبده الحلب، ٣٢٢/٢. النجوم الزاهره ، ٣٤٩/٥.

155 ـ الروضتين، ج١، ص٤٣٥. وفيات الأعيان، ١٤٨/٧. شفاء القلوب، ٣٢.

156 ـ الكامل، ٣٣٥/١١، الباهر، ١٣٧. الكواكب الدرية ١٧٢.

157 ـ الكامل، ٣٣٥/١١. الباهر، ١٣٨. مفرج الكروب، ١٥٦/١.

زیاتر له پەنجا ڕۆژ درێژەی کێشا.[١٥٨]

جا، ئەوجا خەلیفە (العاضد) پێی زانی کە وڵاتەکەی تووشی چ ئاگرو چ ژێر دەستەیی و وێرانییەك بووە، ناچار، هانا بەری ناردە لای نورەددین، کە بێت بە دەنگییەوەو نامەیەکی کاریگەریی پێدا ڕەوانەکرد، تەنها (الدواداری) دەقی ئەو نامەیە باس دەکا، کە (وەك ئەو دەڵێ) وێنەیەکی لەو نامەیە دەستکەوتووە، نامەکە دەڵێ: "هاوار هەی هاوار، فریای ئایینی ئیسلام بکەوە، بگرە ئوممەتی موحەممەد (درووودی خوای لەسەربێ) هانا، هانا بۆ تۆ نورەددین".[١٥٩] چەن تەوقێکیشی لە زلف و پرچی خانمانی تەلاری شای فاتمیشی[١٦٠] خستە توێی نامەکە، بۆ ئەوەی نورەددین غیرەت بیگرێ و مەسەلەکە بە گرنگ بگرێ.

نورەددین بە وەرگرتنی نامەکە بۆی دەرکەوت کە کار لە کار ترازاوە، دەبێ خۆی بچێ بۆ میسر. وەلێ "فەرماندەی لەشکری موسڵ (میر زەینەدین عەلی کچك)[١٦١] ئەمری خوای کردو نورەددینیش لەشکری بەرەو ڕۆژهەڵات بەرێخستبوو بە تەمای داگیرکاری". لەوەش دەترسا لەشکر لە شام نەمینێ و خاچدروشمان ڕۆیشتنی خۆیشی بە هەل بزانن و بەسەریەوە نەچن و هێرش ببەن بۆ شام.[١٦٢]

نورەددین ئەنجومەنی جەنگی کۆکردەوە و کەوتە ڕاوێژکاری و تەکبیر، هەمووشیان ڕایان هاتە سەر ئەوەی (أسد الدین شێرکۆ) بە لەشکرێکی گەورەوە بنێرێ، چونکە أسدالدین شێرکۆ لەوانی دی پتر شارەزای میسر بوو، بەتەواویش بۆ ئەو ئیشە تەیارو ئامادەبوو. چوونەوە بۆ میسریشی بە (ئاوات و ئامانج و ئارەزوی خۆی)[١٦٣] دەزانی، (أبن الأثیر) دەڵێ: "نورەددین لەو دەستوبردو خێرا ئامادەبوونەی سەرسام مابوو"[١٦٤].

ئەم جارەیان، شەڕ لە نێوان شێرکۆو ئەموریدا نەقەوما، چونکە شاور توانیی بە فرۆفێڵ ئەموری قایل بکا بگەرێتەوە بۆ (بیت المقدس)، وەلێ شاور لەم لاوە دەستی کردەوە بە فرۆفێڵ و دەستخەڕۆکردنەوەی شێرکۆو نەبردنە سەری ئەو بەڵێنانەی بە نورەددینی دابوو، هەر لەبەرئەوەش بوو سەلاحەددین و بەیەکەوە لەگەڵ (عزالدین جوردیك) عەزمیان

---

[158] ـ الکامل، ١١/٣٣٦. الروضتین، ج١، ق٢، ص٤٣٢. مفرج الكروب، ١/١٥٧. تاریخ ابن الوردي، ٢/١٠٦. ابن خلدون، مجلد ٥، ق٢، ص٤٥١ن ص٦١٩. النجوم الزاهرة، ٥/٣٥٠. الخطط، ط، أوفسیت ١/٣٥٨. شفاء القلوب، ٣٣. الكواكب الدرية، ١٧٦. ابن الفرات، تاريخ ابن الفرات، تحقيق: د. حسن محمد الشماع، مطبعة حداد، البصرة، ١٩٦، ج١، مجلد ٤، ص٢٤. العليمي، الأنس الجليل بتاريخ القدس والخليل، قدمه محمد بحر العلوم، منشورات مطبعة الحيدرية في النجف الأشرف العراق ، ١٣٨٨/١٩٦٨، ج١، ص٣١١. ابن أياس بدائع الزهور في وقائع الدهور (تأريخ المصر) المطبعة الكبرى الأميرية، بولاق ـ مصر ١٣١١هـ، ج١، ص٦٨. العصامی المكی، سمط النجوم الموالي، المطبعة السلفية، القاهيرة، ج٤، ص٥. د. سعداوی دەڵێ: "ئاگر تێبەردانەکەی شاری (فسطاط) یەکێکە لە کارەساتە زەق و تۆقێنەرەکانی مێژووی جەنگ لە میسردا، کە هەتا ئەمڕۆش ئاسەوارەکانی لەزەوییە لمینەکانی میسری دێریندا ، دیارە". بنۆڕە کتێبەکەی: التاريخ الحربي المصري، مكتبة النهضة المصرية. مطبعة لجان البيان، ، القاهيرة١٩٥٧. ص١٤.

[159] ـ الدرر المطلوب في أخبار ملوك بني أيوب، تحقيق: د. سعيد عبدالفتاح عاشور، مطبعة عيسا البابي الحلبي، القاهيرة ١٩٧٢ ص٣٠.

[160] ـ الکامل، ١١/٣٣٧. الباهر، ١٣٨. الروضتین، ج١، ق٢، ص٣٩١. زبدة الخلب ، ٢/٣٢٦. مفرج الكروب، ١/١٥٨. الذهبي، العبر، ٤/١٨٤. أبوالفداء، المختصر في أخبار البشر، دار الكتاب اللبناني، بيروت، ٢/٦٢. ابن خلدون مجلد٥، ص٤٥٦. ابن الفرات، ج١، مجلد٤، ص٢٢. ابن الوردي ، ٢/١٠٦. الكواكب الدرية، ١٧٦. العليمي، الانس الجليل ١/٣١١. السيوطي، حسن المحاضرة في تأريخ مصر والقاهرة، تحقيق: محمد أبوالفضل ابراهيم ط١، دار أحياء الكتب العربية، ١٣٨٧هـ/ ١٩٦٧ـ ١٩٦٨ز، ج٢، ص١٨. شفاء القلوب، ٣٤، شذرات الذهب، ٤/٢١١.

[161] ـ باوکی (مظفرالدین کوکبری بەناوبانگی) میری هەولێرە.

[162] ـ النوادر، ٣٨ـ٣٩. وفيات الأعيان، ٧/١٤٨. ابن الفرات، ج١، مجلد٤، ص٢٢.

[163] ـ ابن الفرات، ج١، مجلد٤، ص٢٢.

[164] ـ الکامل، ١١/٣٣٨. الروضتین، ج١، ق٢، ص٣٩٢، الكواكب الدرية، ١٧٦.

جەزمکرد شاور سەروبن بکەنو لەناوی ببەن.[165] پاشان (العاضد)یش فەرمانیدا سەری بېڕنو کەللەکەی بۆ بنێرنو دەرحاڵیش وەزارەتی بە شێرکۆ سپاردو کردیشی بە فەرماندارى گشتیی لەشکری دەوڵەتی فاتمیو نازناوی (الملك المنصور)، واتای شای سەرکەوتووی‌و پێ خەڵات کرد. وەڵێ شێرکۆ لەو پلەو پایەدا زۆری نەخایاندو دوای نزیکەی دوو مانگ لە (جمادي الآخرى ٥٦٤ك/ ١١٦٩ز) کۆچی دوایی کرد.[166] بەڵام (العاضد) دانەماو، دەستبەجێ پلەوپایەکەی شێرکۆی دا بە سەلاحەددینی برازای شێرکۆ، هەرچەندیشە هەندێ لە میرە نورەددینییەکان بەوە ڕازی نەبوون، نەخاسمە (عين الدولة الياروقي وعزالدين جورديك)و کەسانی دیکەش. ئەمانە پێی قایل نەبوونو دانیان پێدا نەناو گەڕانەوە بۆ شام[167] و بەوە قایل نەبوون لە ژێر فەرماندەی سەلاحەددیندا ئیش بکەن، کە لە هەموو میرەکانی دی مندالتر بوو.

بەر بەرایی ساڵی ٥٦٧ك/ ١١٧١ز ، سەلاحەددین خەلافەتی فاتمیی لاداو کۆتایی پێهێنا، ئەوەش لە سەر داواو مکوڕبوونی نورەددین مەحمود بەجێهێنا.[168] بەسەرئەوەدا (العاضد) نەخۆش کەوتو زۆری نەبرد گیانی لەدەستدا، حوکمی سەربەخۆیی میسری بۆ سەلاحەددین بەجێهێشت.

**٤ـ پێکهاتەی لەشکر (تیپ)ی بۆ میسر نێردراوی نورەددین:**

شێرکۆ سوارەو جەنگاوەری خۆی لە لەشکری تەوزیمیی نورەددین هەڵبژارد، نورەددینیش هەموو پێداویستییەکی چەكو جبەخانەو وڵاغو جلو بەرگی خستە ژێر دەستی، لە هەڵمەتی یەکەمدا، هەزار سواری لەگەڵ خۆیدا بردو لەبەر کەمیی لەشکرەکەی، شێرکۆ لەو هەڵمەتەی کەوتە مەترسیو خەمی سەرەنجامی ئەو هەڵمەتەی هاتە پێش. (المقريزي) دەڵێ: "نورەددین هەزار سواری تەیارو ئامادەکردو (أسد الدين) شێرکۆی کردە پێشەنگیانو فەرمانی پێدا بچێ بۆ میسر، وەڵێ شێرکۆ قایل نەبوو، گوتی: "نەڕۆیشتوومو ناڕۆم، چونکە خۆمو ئەوانەش کە لەگەڵمدا دێن تووشی مەرگ دەبین".[169]

بەڵام لە هەڵمەتی دووەمیدا، وەکو گوتمان، دوو هەزار سواری لەتەکدا بوو، وەڵێ لە هەڵمەتی سێیەمدا، بوو بە دوو ئەوەندە. سەرچاوەکانیش دەڵێن، نورەددین، سەرباری دوو سەد هەزار دینارو لاوگەلێکی زۆرو وڵاغو ئامرازو ئامێرو چەکی جەنگ، دوو هەزاریش لە ئازاترینی سوارەکانی لەشکرەکەی خۆیشی خستە ژێر دەستی، شێرکۆ ئەوەی بە کەم دانا، هەستا شەش هەزار سواری دیکەشی خڕکردنەوە.[170]

لەناو ئەو سوارانەدا، تیپی (الأسدية) کە بەناوی (أسد الدين شێرکۆ)، واتا ناوی خۆیەوە خڕی کردبوونەوە

---

[165] ـ تەنیا (ابن أياس) دەڵێ: "شێرکۆ شاوری لەبەر دەرگای قاهیرەدا لەسێدارە دا، چونکە بە ڕەزامەندیی ئەو شاری فوسطاط ئاگری تێبەردرا". بدائع الزهور ، ٦٨/١.

[166] ـ النوادر، ٤٠. التاريخ المنصوري ١٧٦. مرآة الزمان، ٢٧٨/٨. وفيات الأعيان ، ٤٨٠/٢. الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٠٥، ٤٣٦. مفرج الكروب، ١٦٨/١. العبر، ١٨٥/٤. النجوم الزاهرة، ٣٥٣/٥. الخط، ط أوفسيت، ٣٥٨/١. الكواكب الدرية، ١٧٩. شفاء القلوب، ٤٤. الأنس الجليل ٣١٢/١. ١٨٦/١. العبر، ١٨٥/٤. النجوم الزاهرة ٣٥٣/٥. الخطط أوفسيت.

[167] ـ (ابن كثير) دەڵێ: "نورەددین مەحمود گلەیی لە (عين الدولة الباروقي) کرد کە قایل نەدەبوو سەلاحەددین پلەو پایەی وەزارەتی میسر، دوای مامی وەربگرێ). بنۆڕە: البداية والنهاية، مطبعة السعادة، مصر ١٩٣٢، ج٢٥٧/١٢. هەروەها بنۆڕە: الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٠٧، النجوم الزاهرة ١٨/٦.

[168] ـ النوادر، ٤٥. ابن الجوزي، المنتظم في التاريخ الملوك والامم، مطبعة دائرة المعارف العثمانية، حيدر آباد ـ الدكن، الهند ١٣٥٨هـ/ ١٩٣٩ز، ج٢٣٧/١٠. الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٦٥ـ ٤٦٦. الكواكب الدرية ١٩٦.

[169] ـ الخطط، (طبعة المعهد) ج٢، ق١، ص١٥.

[170] ـ الكامل، ٣٣٨/١١. الباهر، ١٣٩. وفيات الأعيان، ٤٤٧/٢. زبدة الحلب، ٣٢٦/٢. الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٩٢. مفرج الكروب، ١٥٨/١. البداية والنهاية، ٢٥٦/١٢. ابن الفرات، ج١، مجلد٤، ص٢٦. السيوطى، حسن المحاضرة، ١٨/٢. العصامي المكي، سمط النجوم، ج٤، ص٥.

"تەنها، (العماد)ی نووسەری ئەسفەهانی دەڵێ: "جگە لە دوو هەزار سوارەکە ، پێنج هەزار زەلامی قارەمانی لەتەکدا بووە". بنۆڕە: تلخيص البنداري لكتابه (البرق الشامي) تحت أسم (سنا البرق الشامي). تحقيق: رمضان ششن، طبعة دار الكتاب الجديد، بيروت ١٩٧١، ج١، ص٧٦.

**ڕێکخرابوون، ئەو تیپەیە کە بۆ سەلاحەددین مایەوە، لە کارەسات و ڕووداو گەلی پاشیندا، چ لە میسرو چ لە وڵاتی شام، دەوری زەق و زۆری قارەمانێتی گێڕا، ئەو تیپە، تەنها پێنج سەد سوار بوون.[١٧١] واتا ژمارەی سوارەکانی، بەو تیپەشەوە، لە هەڵمەتی سێیەمدا گەیشتە هەشت هەزار.[١٧٢]**

**سەرچاوەکان باسی ژمارەی پیادەکانی هەڵمەتەکەیان نەکردووەو تەنیا بە (حشود)، واتە کۆمەڵ کۆمەڵ ناویان هێناوە،[١٧٣] وەلێ لەوانەیە ژمارەیان لە دوو هێندەی ژمارەی سوارەکان کەمتر نەبووبێ، چونکە شەڕی ئەو سەردەمانە بەو جۆرە باو بووە، هەندێ مێژوونوسیش دەڵێن "ئەو لەشکرەی شێرکۆ بە پیادەو بە سوارەوە خۆی لە حەفتا هەزار دەدا"،[١٧٤] ئەگەر ئەم قسەیەش ڕاست بێ ئەوە ژمارەی پیادەکان دیارە گەلێ زۆر بووە.**

**هەرچەندیشە سەرچاوەکان دەڵێن ئەم هەڵمەتەی سەر میسر لە تورکمان سازدرابوو، یان لەوانەی کە بە (غز)[١٧٥] لە هەندێ سەرچاوەدا[١٧٦] ناویان هاتووە، وەلێ ئەوەی دیارە ئەوەیە کەناودارترین فەرماندەکانی شێرکۆ کورد بوون، ئنجا تورکمان، ئەمەش بەو گفتوگۆیەدا دەردەکەوێ کە (القاضي ضياء الدين عيسى الهكاري الكوردي) لەگەڵ ئەو فەرماندانەدا کردی و دەیویست قایلیان بکا، کە سەلاحەددین پاش مردنی مامی جێگای بگرێتەوەو وەزارەت وەربگرێ.**

**(أبن الأثير)و مێژونوسانی دیکەش دەڵێن: "کاتێك خەلیفە "عاضد" سەلاحەددینی کرد بە وەزیر، فەرماندەکانی لەشکری نورەددین کە لەگەڵیدا هاتبوون، گوێڕایەڵی نەبوون و قایل نەبوون، چونکە حوکمیان بۆ خۆیان دەویست"، زانای شەرعی (الهكاري) کە ئەویش لەگەڵ لەشکرەکەدا بوو، هەوڵیدا (سيف الدين علي المشطوب الهكاري) قایل بکا لایەنی سەلاحەددین بگرێ و پێی وت: "تا عين الدولة الياروقي و کوڕی تليل الهذباني و شهاب الدين الحارمي. خاڵی سەلاحەددین. لە ئارادا بن، نۆرە ناگاتە سەر تۆ" تا قایلی کرد، ئنجا چووە لای. الحارمیو پێی گوت: "سەلاحەددین خوشکەزاتە، هێزو پێزو موڵکی هەر هی خۆتەو ئێستا وا گەورەیی بۆ ڕەخساوە، تۆ لە پێش هەموو کەسێکەوە نائومێدی مەکە، خۆ نۆرە ناگاتە سەر تۆ"، بەم جۆرە ئەویشی ڕاکێشا.**

**ئنجا گەڕایەوە سەر– قطب الدين خسرۆ کوڕی تليل–، پێی گوت: "خەڵك و خوا هەموو بە سەلاحەددین قایل بوونەو تەنیا تۆو (الياروقي) ماون، سا بەهەر حاڵ، تۆ کوردی و ئەویش کوردە، ئەو بۆ تورکان مەشکێنەو بێبەشی مەکە". جا ئەوجا هاتەوە سەر (عين الدولة الياروقي)، ئەمیان خەڵکێکی زیاتری لەگەڵدا بوو، هەموو کۆششێکی لەگەڵ ئەمدا بێهودە بوو، ئەم گوتی: "من هەتا هەتایە خزمەتی سەلاحەددین ناکەم، لێیدا گەڕایەوە بۆ لای نورەددین و ئەوەیش لە تەکیدا چوو، چوو.[١٧٧]**

**لێرەدا پێویستە ئەوەش بخەینە بەرچاو کە هەندێ لە مێژوونووسان بەهەموو ئەوانەی لەگەڵ لەشکری نورەددین دا بۆ میسر نێردرابوون بەهەموویان هەر دەڵێن (الغز الأتراك)، سا ئەوانە تورك بووبن، یان کورد بووبن، یان هەر نەتەوەیەکی**

---

[171] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٣٨. جب دەڵێ: "جەنگاوەرەکانی ئەم تیپە هەر هەموویان کورد بوون". بنۆڕە کتێبەکەی بە ناوی (صلاح الدين الأيوبي، دراسات في التأريخ الأسلامي)، ترجمة يوسف آيبش، المؤسسات العربية للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٧٣، ص١٥٤).

[172] ـ (الدواداري) دەڵێ: "لەشکرەکەی گەیشتە دە هەزار سواری ئازاو قارەمان"، الدرر المطلوب ٣١. الذهبي، دول الأسلام، مطبعة الدائرة المعارف العثمانية، حيدرآباد، هند، ط٢، ١٣٦٥هـ، ج٢، ص٥٦.

[173] ـ شفاء القلوب ٢٩

[174] ـ الكواكب الدرية، ١٧٧. شذرات الذهب ٢١١/٤.

[175] ـ الغز: تورکمانە موسڵمانەکانی پشت ڕوبارو (ماوراء النهر)، الروضتين ج١، ق١، ص٢٨٥، هامش ٣، شاکانی سەلجوقییەکانیش لەوانن. القلقشندي، قلائد الجمان في التعريف بقبائل عرب الزمان، طبع دار الكتب الحديثة، مطبعة السعادة ، القاهرة. ١٩٦٣، ص٢٨، صبح الأعشى ٤٤٧/٤. الكتبي، عيون التأريخ ٤٦٥/١٢.

[176] ـ الكامل، ٣٥١/١١. الباهر ١٤٣. النكت العصرية ، ٨١ـ٨٧. ابن الفرات ج١، مجلد ٤، ص٢٦. المقريزي، اتعاظ الحنفا، ط١٩٤٨، ج١، ص٢٩٠. الخطط،ط، اوفسيت، ج١، ص٣٥٨.

[177] ـ الباهر، ١٤٢، الكامل، ٣٤٤/١١. الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٠٧، وفيات الأعيان ١٥٥/٧.

دی، ئەوەتا المقریزی کاتێ باسی تەلارەکانی فاتمیەکان دەکات، کە دوای ڕووخاندنی خەلافەت کەوتنە ژێر دەستی سەلاحەددین دەڵێ: "تەلارەکەی لای خۆرئاوا، میر موسەکو میر "أبوالهیجاء السمین، والغز"ی دیکەی تێیدا دادەنیشتن" .[178] ئاشکراو ڕونیشە کە ئەم دوو میرە کوڕی هەزەبانینە.

لەوەدەچێ یاروقییەکان دیارترین ئەو تورکانە بن، کە بەشداریی هەڵمەتەکەیان کردبێ، (ابو شامة)و کەسانی دیکەش دەڵێن: "کۆمەڵی (عین الدولة الیاروقی) گەورەترین کۆمەڵەو زۆرترین کۆمەڵەی هەڵمەتەکە بوون.[179] وەلێ ئێمە نەئەزانین ژمارەی یاروقییەکان چەند بووە، نە ژمارەی کۆمەڵەکانی دی، هەرچی ئەو کۆمەڵە کوردانەش کە بە گەڵ (أسد الدین شیرکۆ) کەوتبوون، کە بۆ دواتریش هەر ئەوان بەرچاوترین کۆمەڵی لەشکری ئەیوبییان پێکدەهێنا، هەموویان کوردی هەزبانی بوون. کە تا ماوەیەکیش فەرمانڕەوایی هەندێ ناوچەی کوردیشیان کردووە، یەکێ لەو ناوچە کوردنشینانەش هەولێری پێش سەردەمی ئەتابەگی بووە.[180]

بنەماڵەی ئەیبوب خۆیان هەزەبانینە، چونکە لە کوردەکانی هۆزی ڕەوادییەکانن، ڕەوادییەکانیش بەرەیەکن لە هەزەبانی.[181] سەرەڕای ئەوە میرموسەکو ئەبوالهیجائیش هەردووکیان هەزەبانین، هەروەها میر (قطب الدین خەسرۆ کوڕی تلیل)یش برازای ئەبو هیجاءە.[182]

کۆمەڵانی کوردی دیکەش کە لەو هەڵمەتەدا بەشداربوونە هەکارییەکانن.[183] بەسەرکردایەتی (سیف الدین علی کوڕی أحمد الهکاري)، کە دواتر دەبێ بە گەورەترین میر لە میرەکای سەلاحەددین‌و نازناوی (المشطوب) واتە (ڕووشاو)ی بەسەردا دەبڕێت، چونکە لە یەکێ لە شەڕەکاندا چیغێ لە ڕووی کەوتبوو ئەم (ابن شداد)و کەسانی دی بە (شای گەورەی کوردان)ی ناودەبەن.[184] یەکێکی دی لەو هەکارییانەی لە هەڵمەتەکەدا بەشدار بووە (زانا ضیاءالدین عیسی الهکاری)یە، وەك باسمانکرد، لە قایل کردنی فەرماندەکانی لەشکرەکەی شێرکۆدا، کە پشتی وەزیری لاو، سەلاحەددین بەرنەدەن، ڕۆڵێکی گەورەی گێڕاو دوای مردنی مامی سەلاحەددین، لە خڕکردنەوەی میرو فەرماندەکاندا، لە دەوری سەلاحەددین، دەستی بالای هەبووە.

ڕاستیشت دەوێ، کورد پێش سەردەمی نورەددین و ئەتابەکو سەلجوقیش لە لەشکرگەلی ئیسلامیدا هەر بەکارخراوە، چونکە بەشەرت جەنگاوەر بوون، فێری ساردیی‌و گەرمیی سەختی ژیان بوونەو، تیروکەوان هەر قابیل بە خۆیان بووەو نیشانشکێنی دەستومەچەك ڕەنگین بوونە.[185] (الحسن کوڕی عەبدوڵلای العباسي) وەسفیان دەکاو دەڵێ:

---

[178] ـ الخطط، ط أوفسیت، ٤٩٦/١.

[179] ـ الروضتین، ج١، ق٢، ص٤٠٧، کواکب الدریة ١٠٨. ئەم تایفەیە سەربەگەورەی خۆیان (یاروقي بن أرسلان الترکماني) ینە، بڕوانە: ابن فرات، ج١، مجلد ٤، ص٧٨، ٧٩.

[180] ـ الکامل، ٦٣٨/١٠. الباهر ٣٠، سەیری کتیبەکەی خۆشمان (أربیل في عهد الاتابگی) بکە، مطبعة أسعد، بغداد، ١٩٧٦، ٣٢١/٣٧.

[181] ـ الکامل، ٣٤١/١١. وفیات الأعیان ١٣٩/٧. الروضتین ج١، ق٢، ص٣٢٩.

[182] ـ الروضتین، ج١، ق٢، ص٤٠٦.

[183] ـ الهکاریون: ئەو خێڵە کوردەیە کە لە ڕۆژهەلاتی ولاتی موسڵ گەلێ دالدەو پەناگەو قەلای قایمکارو دێهاتیان هەیە. وفیات الأعیان٣/٣٤٥. یان (ناوچەی هەکاری ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ)ە واتە باکوری کوردستانە، دەکەوێتە تورکیای ئەم سەردەمە، بذۆرە: ف ـ ف مینۆرسکی، الأکراد ترجمة وتعلیق دکتۆر معروف خەزنەدار، مطبعة النجوم، بغداد ١٩٦٨. ص١٧.

[184] ـ النوادر، ١١٠، بنۆڕە: مرآة الزمان، ٢٧٨/٨، ٤٢٠. وفیات الأعیان ١٨٣/١. النجوم الزاهرة ٣٥٤/٥. الیونیني، ذیل مرآة الزمان، طبعة حیدر آباد، الرکن الهند ٢٢٤/٢.

[185] ـ الدواداري، الدرة المضیة في أخبار الدولة الفاطمیة، ص١٦٦.

"چ سواریان چ پیادەیان، ئازاو فریاگوزارو بە غیرەتن".[186]

(عين الدولة الياروقي) کە گەڕایەوە بۆ شام، هەموو تورکومانەکان بە گەڵی نەکەوتن، هەندێکیان لە میسر مانەوە، وادیارە ئەوانە بوو بوون بە مایەی سەرئێشە بۆ خەلیفەی فاتمیو بۆ سەلاحەددینیش.

بەڵگەی ئەوەش دیارە، ئەوەتا خەلیفەی فاتمی بۆ نوورەددین مەحمودی نووسیوە، داوای لێدەکا، لە میسر بیانکێشێتەوە، خەلیفە ئەم نامەیەی کاتێ نووسی، کە وەزیرەکەی کە لە شەڕی (دمياط)دا بەسەر خاچدروشماندا سەرکەوت، هەر لەو نامەیەدا، داواشی لێکرد، تەنیا سەلاحەددینو خوێشەکانی لە میسر بمێننەوە. کەچی نورەددین داواکەی ڕەتکردەوەو لە نامەیەکدا کە بۆی دەنووسێ: "گەڵێ بە شانو باڵی تورکان هەڵدەڵێ، دەڵێ: ئەو تورکانەی لەبەرئەوە ناردووە، پشتی پێیان بەستووە، چونکە (قنطاريەکان)ی فەرەنگ، مەگەر بە تیری تورکان تێکبشکێن، فەرەنگ لەوان نەبێ لەکەس نەتۆقیون، ئەوان نەبن، فەرەنگ تەماعی زیاتر لە میسر دەکەنو ئاواتی زیاتریان بە وڵاتی میسر هەیە، بەڵکو ئەمە خوایە گرتنی (مسجد الأقصى)مان بۆ سانا بکاو بەرەکەتی بێ پایانیشمان بۆ بهاوێتە سەر".[187] بەمەدا دەردەکەوێ، نورەددین مەحمود چەندە پشتی بە تورکان بەستووە، کە جەنگاوەری چاك بوونە، چ لە سەردەمی خۆیو چ لە سەردەمی پێشوو تریشدا.[188]

ڕاستیشت دەوێ، تورکان، هەر لە سەردەمی خەلیفە (المعتصم)و چاخی عەباسییەکانەوە لە پێکهاتەی لەشکری ئیسلامدا ڕەگەزێکی دیارو بەرچاو بوون، خاچدروشمان، لە شەڕی هەڵمەتەکانی یەکەمیاندا،[189] ئاوێتەی ورك و کەللە شەقییەکی توندی تورکان بوون. خاوەن کتێبی (أعمال الفرنجه وحجاج بيت المقدس) ئاخ هەڵدەکێشێو دەڵێ، تورکان کە بە لێوەشاوەییو بەهرەمەندیی جەنگو ئازایەتی ناودەبرێن، دەسداو تەبەعەی مەسیح[190]نینە. ئنجا دەڵێ: "ڕاستیان گوتووە کە گوتیانە هەرکەسێ فەرەنگ نەبێ، یان تورك نەبێ، ناشێ سوارچاکی پێبگوترێ، کەسیش وەك ئەوان بەهێزو ئازاو شەڕزان نییە".[191] بێگومان ئەم قسانە هەندێ پێدا هەڵدانی تێدایە.

**٥- ڕەگەزەکانی لەشکری فاتمیی:**

زانینی ڕەگەزەکانی لەشکری فاتمیی، واتا پێکهێنەرەکانی ئەو لەشکرە، زانینیان پێویستە، چونکە بەو زانینە ئەو گۆڕانکارییانەشمان بۆدیار دەبن کە سەلاحەددین لە لەشکری میسردا بەجێی هێناون، ڕاستیشت دەوێ ئەو کۆمەڵە جۆربەجۆرانە، بە گشتیی هەموویان بیانی بوونەو میسری نەبوون. ئەم ڕەگەزانە موسڵمان بووبن یا ناموسڵمان، گەلێکیان بەر لە سەردەمی فاتمییەکانیش هەر لە میسردا هەبوون، و بەکارهێنرابوون. وەڵێ ئێمە دەقی وەهامان

---

186 ـ الحسن بن عبدالله العباسی، آثار الأول في ترتيب الدول، مطبعة بولاق، مصر، ١٢٩٥هـ، ص١٤٧. (هارۆڵد لامپ: کوردان، یاساو ڕێسای شمشێریان دەزانی، خەسڵەتێکیان ئەوەیە کە قەد باریکنو .. کەیفیان بە جەنگ دەهاتو بۆ ئیسلامەتی دڵبەجۆش بوون". (شعلة الأسلام) ترجمة محمود عبدالله يعقوب ، مطبعة الأرشاد، مؤسسة فرانكلين ودار المتنبي، بغداد ١٩٦٧، ص٥٦).

187 ـ قنطاريات: كۆی (قنطارية)يە، وشەیەکی یۆنانیە، جۆرە ڕمێکە لە دارو بەم ناوەو ناسراوە) مفرج الكروب ، ١٨٣/١، هامش ٣.

188 ـ الحسن بن عبدالله العباسي، وەسفی تورکمان دەکاو دەڵێ:"ئازان، بە غیرەتن، زەلامی دڵڕەقنو سوارچاکی مەیدانو تیرەندازو شمشێربازی لێزانن..". آثار الأول، ص١٤٦.

189 ـ بنۆڕە کتێبی: (أعمال الفرنجي وحجاج بيت المقدس) لمؤلف صليبي مجهول، ترجمة: د.حسن حبشي. طبع دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٥٩، ص٤٠، ٥٠، ٥١، ٥٧، وغيرها.

190 ـ ص٤١.

191 ـ ص٤٠، بشنۆڕە: R.C Smail, Crusading Wrafair, Cambridge, 1956 P.758.

Claude Chaen, Les Changements Techniques Meletaires Anse Proche orient Medievafet Leur Importance Historique.

گوتارێکیش لە کتێبی: War Technology and society in the Middle east, edited v. l, parrg and M.E.Y app London ١٩٧٥, P. ١٢١.

لەبەردەستا نییە گوتبێتی، سەلاحەددین میسرییەکانی لە لەشکردا وەرگرتبێ، نەك هەر ئەوە، بگرە (المقریزی) کە خۆی مێژوونوسێکی میسرییە ڕای وایە کە سەلاحەددین میسرییەکانی لە لەشکر وەلا ناوەو، دەڵێ: "سەلاحەددین خەڵکی میسری لە لەشکر دوورخستەوەو گەندەڵ و کەوەدەنی کردن". [192]

ئەمانەی وا لە خوارەوە باسیان دەکەین، زەقترین ڕەگەزەکانی ناو لەشکری فاتمیی بوونە:

**أ. مەغریبییەکان (بەربەر):**

کاتێ فاتمییەکان میسریان لە ساڵی (٣٥٨ك/ ٩٦٩ز) داگیر کرد، لە ساڵی (٣٦٢ك/ ٩٧٣ز) پشدا کردیان بە بارەگای خەلافەتی خۆیان، وەختێ خەلیفە (المعزالدین لله) بە لەشکرێکی مەغریبییەوە چووە ناو قاهیرەوە، ئیدی هۆزەکان (القبائل)ی خەڵکی مەغریب، ئەوان بوونە ڕەگەزی بنچینەیی لەشکری فاتمییەکان، بە هۆی فاتمییەکانەوە کۆمەڵگەیەکی زۆری هۆزەکانی بەربەر کۆچیان کرد بۆ میسر. ڕاستیشت دەوێ، فاتمییەکان بە پشتی ئەم بەربەرانە دەوڵەتی خۆیان لە مەغریب دامەزراند. لەبەرئەوە لەشکرەکەیان تیپی زۆری بەربەری هەبووە. ئاساییە، خەلیفە بچێ بۆ میسر، کۆمەڵێکی زۆریش لەوانەی لەگەڵدا دەچن. [193]

ناوی (المغاربة) هەموو ئەو هۆزو بەربەرانەش دەگرێتەوەکە بۆمیسر کۆچیان کردووە، بە نموونە، هۆزی (کتامە) لە قەیرەوانەوە هاتبوون، [194] لەسەر مەزهەبی (شیعەی ئیسماعیلی)، فاتمییەکانیش بوونەو بووبوون بە بڕبڕەی پشتی دەوڵەتی فاتمیی لە میسر. [195] دەیانگوت کاتێ ئەمانە لەگەڵ خەلیفە (المعز) هاتنە میسر، بیست هەزار سوار بوون، [196] پاشان هۆزی (زویلە)، ئنجا (الباتلیون)، ئەمانە بەرلە هاتنی خەلیفە هاتنە میسر. [197] دوایی گروپی (المصامدة)، ئەمانیش بیست هەزار زەلام دەبوون. [198] هۆزی (لواتە) [199] و (الباطلة)و (الجودیە) [200] (البرقیە) (ئەمانە لە ناوچەی بەرقەی لیبیاوە هاتبوون) [201]. عەشرەتو هۆزی زۆری دیکەیش هاتبوون. بە نموونە وەك (هوارە)و (صنهاجە)و (دنهاج)و هیدیش. [202]

ئیدی بەو جۆرە مەغریبییەکان شانو شەوکەتیان پەیداکرد، تا وای لیهات هەندێ لە فەرماندەو سەرۆکەکانیان پلەو

---

[192] ـ المقریزي، أتعاظ الحنفا، ط١٩٤٨، ص٢٩٠. دکتۆر سعداوی دەڵێ: (سەلاحەددین، نەلە کەشتیگەلی دەریاو نە لە لەشکر، میسرییەکانی نەخستووەتە کارو تەنها لە هێڵەکانی پشتی جەنگو لە کارگەو سەنعەتکاریی دەریاییدا ئیشی پێکردوون). التأریخ الحربي، صفحة (ع/ط) مقدمة الکتاب.

[193] ـ المقریزي، البیان والأعراب عما بأرض مصر من الأعراب، تحقیق: د.عبدالمجید عابدین، ملتزم الطبع والنشر، عالم الکتب، القاهرة، ١٩٦١، ص١٣٢.

[194] ـ ناصر خسرۆ، سفرنامە، نرجمة، د.یحیی الخشاب، دار الکتب الجدید، بیروت، ١٩٧٠، ص٩٤. بشنۆڕە: الکامل، ١٠/١–٨٢. البیان والأعراب، ص٥.

[195] ـ د. حسن ابراهیم حسن، تأریخ الدولة الفاطمیة، ص١٢١. د.محمد جمال الدین مسرور، الدولة الفاطمیة في مصر، دار الفکر العربي، القاهرة ١٩٦٦، ص١٠.

[196] ـ سفرنامە، ص٩٤، د. عبدالمنعم ماجد، ظهور الخلافة الفاطمیینن وسقوطها في مصر، طبعة دار المعارف، الأسکندریة، ١٩٦٨، ص٣٧.

[197] ـ سفرنامە، ن، ص، المقریزي، البیان والأعراب، ص٥٠.

[198] ـ ن، م، ص، بنۆڕە: الکامل، ١٠/٨١ـ٨٢. البیان والاعراب، ص٤٩. القلقشندي، قلائد الجمان، ص١٦٩.

[199] ـ اتعاظ الحنقا، ٢/٢٩٩. أسامە الاعتبار ص٨. القلقشندي دەڵێ: "هۆزی لواتە گەورەترین هۆزی بەربەرەکان بووە، بەرەبابیان لە هەموو هۆزەکان تر پتر بووە". قلائد الجمان، ١٧٢.

[200] ـ د. سرور، الدولة الفاطمیة، ص١٤٧.

[201] ـ عمارة الیمني، النکت العصریة، ٧٤. الأعتبار ٢٣.

[202] ـ المقریزی، البیان والاعراب ، ص٥٠ـ ٥٨.

پایەی بەرزیان لە دامودەزگای دەوڵەتدا بەدەستهانی، بە نموونە وەك وەزارەت و دیوانی لەشکر.[٢٠٣]

وەلێ ئاشوب و ئاژاوە گێڕییان بەرپاکرد، بە تایبەتیش کاتێ پێگەی مەغریبییان گۆڕدرا. لەبەرئەوە پلەو پایەیان دای لە کزیو لەدامودەزگای لەشکردا پێگەیان نەماو لە داخا دەستیان کرد بە ڕەفتاری توندوتیژ دژ بە خەڵك و خوای وڵاتەکەو بە یەکجاری خەڵکی میسریان لە خۆیان هەڵگێڕایەوە، نەخاسمە مەزهەبیشیان جیابوو، مافی سیاسی بەرفراوانیشیان هەبوو.[٢٠٤] کاتێکیش لەگەڵ تورکەکانیشدا کەوتنە ململانێ،[٢٠٥] ئیدی، پتر پێگەیان کەوتە لێژی، چونکە پاش ئەوەی کە تورکەکانیان شکاند، ئیدی ناچاربوون بڕۆن و کۆچیان کرد بۆ باکوور کە (الوجة البحري) پێدەگوترێ، لەوێ مۆڵ بوون. خەلیفە (المستنصر) لە ساڵی (٤٦٦ك/ ١٠٧٣ز) ناردی لە دوی فەرماندەی عەکا (بدر الدين الجمالي) ئەرمەنی نەژاد، کە بێتە میسرو باری نالەباری چەندین ساڵەی دووردرێژی میسر ڕاست بکاتەوە.[٢٠٦] میری لەشکر، بدرالدين جمالي بەخۆیو هێزێکی ئەرمەنییەوە گەیشتە میسرو هەندەی نەبرد، مەغریبییەکان کەوتنە بەر کوتەکی پشتشکێن.

میری لەشکر، هەر کە گەیشتە میسر، لەشکری بەردایە سەر گروپە سەربازییە جۆراوجۆرەکان، بە تایبەتیش سەر مەغریبییەکان، ئەوەبوو "لواتە"کانیان وەگێرهێناو (سليم اللواتی)ی پێشەنگ و کوڕەکەشیان کوشتن و کەوتنە تاڵانو بڕۆیانو هیچیان بەدەستەوە نەهێشتن، هەندەشیان لێکوشتن، هەندەك دەڵێن کوژراویان گەیشتە بیست هەزار کەس.[٢٠٧] هەر لەبەر ئەوەشە کە لەدوا دوای دەوڵەتی فاتمییدا هیچ ئاسەوارێکی ئەوتۆیان دیار نییە.

(ابن أياس) لەناو ئەو ڕەگەزانەی، سەلاحەددین دوایی پێهانین،[٢٠٨] ناویان دەبا، ئەم مێژوونووسە، ڕەنگە مەبەستی (بەرقییەکان) بووبێ، کە (شاور)ی وەزیر، میرەکانیانی لەسەرخۆو یەك لە دوای یەك دەکوشتو[٢٠٩] باریانی خستە لێژی، بێدەسەڵاتی کردن.

**ب. سۆدانییەکان (زنجە - کۆیلەکان):**

سۆدانی، یان (زنجەکان) لە کۆنەوە، لە لەشکری کۆنی میسردا هەبوونە، پێدەچی ناوبانگیان بچێتەوە سەر ئەو سەردەمەی کە ئیخشیدییەکان[٢١٠] وەك سەربازی شڕەخۆرو نانەزگ ڕایان دەگرتن. لە لەشکری فاتمییەکانیشدا، ئەوە، لە سەردەمی خەلیفە (الحاكم بامر الله ٣٨٦. ٤١١ك/٩٩٦. ١٠٢٠ز)یەوە هەبوونە، واتا ئەم خەلیفەیە یەکەم خەلیفەی فاتمییەکان بووە پشتی پێیان بەستبێ،[٢١١] ئەم سۆدانیانە بەرە بەرە زیادبوون، تا وای لێهات کەوتنە بەرپاکردنی ئاژاوەو، وەزیر (الجرجرائی) ناچار بەرپرسەکانیانی گرت.[٢١٢]

خەلیفەی پاش ئەو، (الظاهر) (٤١١. ٤٢٧ك/ ١٠٢٠. ١٠٣٥ز) ئەمیش وەك خەلیفەکەی پێش خۆی، سۆدانییە شڕەخۆرەکانی ڕادەگرت و پشتی پێیان دەبەست و بگرە زیاتریش لە خۆی نزیك دەکردنەوەو کۆیلە ڕەشێکی سۆدانیشی مارە کرد، لەو ئافرەتە کوڕێکی بوو، ئەم کوڕە بۆ دواڕۆژ خەلیفە (المستنصر)ی لێدەرچوو (٤٢٧,٤٨٧ك / ١٠٣٥. ١٠٩٤ز)، لەسەردەمی ئەمدا، سۆدانی هێندە زۆر بوون، لەوە پێش میسر بە خۆیەوە نەدیبوو، گەیشتنە پەنجا هەزار

---

203 ـ ابن الصيرفي، الاشارة، ٤٧.

204 ـ د. حسن أبراهيم، تأريخ الدولة الفاطمية، ٦٢١.

205 ـ أتعاظ الحنفا، ١٧٧/٢.

206 ـ ابن الصيرفي، الأشارة، ٥٥. الدواداري، الدرة المضية، ٣٩٩.

207 ـ الأشارة ، ٥٦.

208 ـ بدائع الزهور (تأريخ مصر) ٧٠/١.

209 ـ النكات العصرية، ٧٤.

210 ـ الخطط،( طبعة المعهد) ج٢، ق١، ص٤٤. د. حسن ابراهيم حسن، تأريخ الدولة الفاطمية، ص٦٢٤، د.سرور، الدول الفاطمية، ٢٠٢.

211 ـ النجوم الزاهرة ١٨١/٤.

212 ـ الخطط، ط أوفسيت، ١٨١/١.

**سۆدانی.[٢١٣] (ناصر خسرۆ)ی گەڕۆکی فارسنەژادیش کە لە سەردەمی ئەو خەلیفەیەدا سەردانی میسری کردووە، دەڵێ: "بەندە کڕدراوەکان سێ هەزار زەلام دەبن".[٢١٤]**

**پێدەچێ، فەرقو جیاوازی نێوان ئەو دوو ژمارەیە، لەوەوە هاتبێ کە ئەم گەڕۆکە، بەرلەوەی (المستنصر) سۆدانییەکان لە لەشکرەکەیدا زیاد بکا، ئەو گەیشتوەتە میسر، دیاریشە ئەم خەلیفەیە، دوای سەردانەکەی (ناصر خسرۆ) بۆ میسر، نزیکەی نیو سەدە ژیاوە.**

**سۆدانی، کە لە میسر بەکاردەخران، بە کڕین دەیانهێنان، یان بە غەزا.[٢١٥] بۆیەکیشە خەلیفە (المستنصر) پشتی پێوەدابوون، دەیویست پەنجە پەنجە لەگەڵ تورکاندا بکا، وەڵێ تورکان بەرامبەر بەم جەنجاڵیو لێشاوەی ئەم ڕەگەزە دەسەوەستان دانەمان. ئەوەبوو بەرەو (صعید)ی میسر هەڵیانبرین، تا لە ساڵی (٤٥٤ك/ ١٠٦٢ن)دا، پازدە هەزاریان لەو ناوچەیە گیرسانەوە، دەستیان تێیدا دەڕۆیشت.[٢١٦] سەرەنجامیش ڕەنێوهاتی کشتوکاڵ دای لە کزی، چونکە نەیاندەهێشت کشتوکاڵ لەو زەویانەدا بکرێ. سەرکەوتنی سەربازانی تورك، بەسەر سۆدانییەکاندا هیچێکی لە شەوکەتی ڕەگەزی سۆدانی کەم نەکردەوەو،[٢١٧] دەشتوانین بڵێین (المستنصر) ئەوەی پێی کرا، کردی، تا حوکم بخاتە دەست ئەم ڕەشانە، لەبەرئەوە بە (صاحب السودان) دەناسرا.[٢١٨]**

**المقریزي دەڵێ: "دیل لە میسر وەك والی دەخوڕێو دایکی (المستنصر)یش لە تورکان بێزارەو کەمایەتیو سوکایەتییان پێدەکا".[٢١٩] سۆدانییان لە میسر تا کۆتایی حوکمی فاتمییەکانیش شانو شەوکەتیان هەر مابوو. ئەم مێژوونووسە لە جێگایەکی تردا دەڵێ: "دەستیان بەسەر لەشکرو دەوڵەتو تەلاری شاهانەشدا گرتبوو، لە وەزیرێ هەڵچوونایە دەیانکوشت".[٢٢٠] تا وای لێهات لە وڵاتی میسردا هیچ شارو شارۆچکەو گوندێ نەما، گەڕەکێکی سۆدانیانی تێدا نەبێ، نە کادیرو نە سەرکارو نە والی نەیاندەوێرا قەرەی بکەون، زەرەرو زیانێکی گەورەشیان لە خەڵكو خواو خێزانو ماڵو موڵکیان دەدا.[٢٢١] ژمارەشیان تا دەهات پتر دەبوون. هەندێکیان وایان دەخەملاندن، کاتێ سەلاحەددین ڕایماڵین و تەرتەو وەرتەی کردن، ئەوکات ژمارەی زەلامیان لە لەشکری فاتمیاندا سەد هەزار کەس بووبێ.[٢٢٢]**

**گەورەترین و بەرچاوترین هۆزەکانی سۆدانی کە چووبنە ڕیزی لەشکری فاتمییانەوە، هۆزەکانی (الریحانیة و الجیوشیة و الفرحیة) بوونە.[٢٢٣]**

### ج. عارەب:

**پێشتر باسمانکرد، خەلیفەگەلی فاتمییان، میسرییەکانیان لە ڕیزی لەشکری خۆیاندا وەرنەدەگرتو پشتیان بە**

---

213 ـ الکامل، ٨١/١٠. الخطط (طبعة المعهد)٢، ق١، ص٤٥. شفاء القلوب، ٧٢. أتعاظ الحنفا، ٢٧٣. د.سرور، الدولة الفاطمیة، ١٠١.

214 ـ سفرنامە، ٩٤.

215 ـ د. ماجد، (جۆرە وەستهانێنێکی دیکەی ئەم زنجانەی بۆ میسر دەرخستوەو دەڵێ: "پەیماننامەیەك لە نێوان خەلیفە عوسمانو شای وڵاتی نۆبەدا مۆرکرا بوو دەبوو، شا، ژمارەیێ لەو پێست ڕەشانە بدات بە والیە ئیسلامییەکانی میسر، بۆیە لە میسردا زیادیان کرد". ظهور خلافة الفاطمیین ٣٧٢ـ ٣٧٣.

216 ـ ابن الصیرفي، الأشارة، ص٥٥. أتعاظ الحنفا، ٢٩٩/٢.

217 ـ أتعاظ الاحنفا، ٢٧٣/٢. د.حسن ابراهیم حسن، تأرخ الدولة الفاطمیة، ص٦٢٦.

218 ـ د. ماجد، ظهور خلافة الفاطمیین، ص٣٧٢.

219 ـ أتعاظ الحنفا، ٢٦٧/٢.

220 ـ الخطط "طبعة اوفسیت" ٢٩/٢. شفاء القلوب ٧٢.

221 ـ ابن الفرات، ج١، مجلد ٤، ص٧٢.

222 ـ مفرج الکروب، ٢٦/٢. النجوم الزاهرة، ٧٨/٦.

223 ـ ابن الفرات، ج١، مجلد٤، ص٧٠.

**بیانییه غه‌یره میسرییه‌کان ده‌به‌ست، وه‌لێ (وه‌ك چاوه‌ڕوانیش ده‌کرا) هه‌ندی هۆزی عاره‌بی میسر، یان عاره‌بی ناو شاره‌کان، یان عاره‌بی دیکه‌ی ده‌ره‌وه‌ی میسر، نه‌خاسمه دۆستانی فاتمییه‌کان، له له‌شکره‌که‌یاندا به‌شدارییان ده‌کرد، هه‌روه‌ها ئه‌وانه‌ش که هه‌میشه له شڕه‌خۆری ده‌گه‌ڕێن.**

**(ناصر خسرۆ) له‌م ڕووه‌وه باسی سارانشین (البدو) ده‌کاو ده‌ڵێ: "خه‌ڵکی حیجازن‌و گوایه ئه‌مانه تیره‌ندازییان زانیوه"و ده‌ڵێ: "له‌شکری میسر له‌م سارانشینانه‌ی زۆر تێدابووه‌و خۆیان داوه له په‌نجا هه‌زار سوار".[٢٢٤] مێژوونووسێکی میسری ده‌ڵی: "کتامه (که به‌ربه‌رن) له‌گه‌ڵ تورکان پێکه‌وه داوایان کرد له خه‌لیفه (الحاکم بأمر الله) که کابرایه‌کی ڕاڕا بوو، واز له ڕه‌شپێستان بهێنێ‌و هه‌ند ژێر به ژێر لایه‌نیان نه‌گرێ‌و له تورکان گاڵیان نه‌دا، هه‌ڕه‌شه‌ی ده‌رکردنی عاره‌به‌کانیشیان لێکرد، "گه‌ر ده‌ستیان لێ هه‌ڵنه‌گری، قاهیره‌ش ئاگر ده‌ده‌ین و عاره‌بانیش له میسر وه‌ده‌رده‌نێین"[٢٢٥] ئه‌مه گه‌واهی ئه‌وه‌یه که عاره‌بان له میسر، به تایبه‌تیش له‌و قۆناغه‌دا چه‌ندێ زۆربوون‌و چه‌ند به هێزبوون.**

**المقریزي به‌ده‌م باسکردنی کاره‌ساتی ساڵی (٤٦٩ك/ ١٠٧٦ز) ه‌وه ده‌ڵێ: "له شاری (طوخ)ی ناوچه‌ی (صعید)ی میسردا عاره‌بێکی زۆری هۆزه‌کانی (جهینة والثعالبة والجعافرة) گردبوونه‌وه، بۆ شه‌ڕی (بدر)ی میری له‌شکر، وه‌لێ ئه‌م فه‌رمانده‌ی له‌شکره لێیان نه‌وه‌ستاو زۆربه‌ی زۆریان هه‌ر به کوشتن، کوشت. ئه‌وانه‌شیان که ڕایان کردو هه‌ڵاتن له ده‌ریاکه‌دا خنکان‌و ته‌نیا که‌مێکیان نه‌بێ که ده‌رباز بوون، هیچیان نه‌مان. جا ئه‌وجا ده‌ستی به‌سه‌ر ماڵ و موڵکیشیاندا گرت‌و تالانییه‌کانیشی نارد بۆ خه‌لیفه (المستنصر).[٢٢٦]**

**پاشان (بدر) به‌شێ له هێزه‌کانی کرده سه‌ر ناوچه‌ی (الوجه البحري)و دوای عاره‌بی (قیس‌و بني سنبس) ی بڕییه‌وه‌و هه‌ندێ لێ لارکردنه‌وه، له ژماردن نه‌ده‌هات، ده‌ڵێن کوژراویان گه‌یشته بیست هه‌زار زه‌لام.[٢٢٧]**

**(ابن أیاس) ده‌ڵی: "عاره‌بی (االشناترة)[٢٢٨] واتا (گواره له گوێکان)[٢٢٩] ئه‌وانیش گروپێك بوون له‌و عه‌ره‌بانه‌ی که سه‌لاحه‌ددین ئاسه‌واریانی نه‌هێشت‌و له‌ناوی بردن. (المقریزي) ده‌ڵێ: "(شناترة) قه‌ومێکی به جه‌رگ‌و به‌سام بوون، به قه‌لافه‌ت‌و که‌ته بوون".[٢٣٠]**

**شاعیرێ، له شاعیران، سه‌ربازانی (أسدالدین شێرکۆ) به تورك له‌قه‌ڵه‌م ده‌داو ده‌ڵی: بۆ شه‌ڕی عه‌ره‌به‌کانی میسر هاتوونه‌ته ئه‌م وڵاته‌و ده‌ڵێ:**

**له‌شکری تورکان به‌ره‌و میسر دێ   عاره‌ب ڕاده‌کاو عوربانه هه‌ڵدێ[٢٣١]**

**(بنو الکنز)یش، له ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٤ز)دا ئاشوب‌و ئاژاوه‌یه‌کی زۆریان نایه‌وه، له‌به‌رئه‌وه سه‌لاحه‌ددین به ڕه‌چه‌ڵه‌کیاندا چووه خواره‌وه‌و ئاریانی به‌سه‌ر پاریانیه‌وه نه‌هێشت، ئه‌مانه به‌ره بابێ بوون له هۆزی (ربیعة).**

**له‌ولاشه‌وه، هه‌ندێ کۆڕو کۆمه‌ڵی عاره‌ب، پشتی (أسدالین شێرکۆ)و هه‌ڵمه‌ته‌که‌ی نوره‌ددینیان گرتبوو، هاوکاریان بوون.**

---

224 ـ سفرنامه، ٩٤.

225 ـ النجوم الزاهره، ١٨٢/٤.

226 ـ أتعاظ الحنفا، ٣٢٠/٢.

227 ـ د. ماجد، ظهور خلافة الفاطمیین، ص٣٩٤.

228 ـ ابن أیاس، بدائع الزهور، ٧٠/١.

229 ـ لسان العرب، ٤٣١/٤.

230 ـ الخطط، (طبعة المعهد الفرنسي) ١٦٠/٧.

231 ـ الکامل، ٤١٤/١١. مفرج الکروب، تحقیق: د. جمال الدین الشیال، المطبعة الأمیریة بالقاهرة، ١٩٥٧، ج٢، ص١٦. المقریزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقیق: د. محمد مصطفی زیادة، مطبعة دار الکتب المصریة، ١٩٣٤، ج١، ص٥٧. الخطط (طبعة المعهد) ج٣، ق٢، ص٢٨٤. البیان والأعراب ٤٤ ـ ٤٦.

ئەوانەی وڵاتی (الصعید)یش کە چوونە پاڵ (أسدالدین شێرکۆ)، کاتێ کە (أسدالدین) دوای شەڕەکەی (البابین) ڕووی لەو وڵاتە کردبوو، ئەوانیش عارەب بوون و لەو دوورە هەرێمەی وڵاتی میسر دەژیان.(٢٣٢)

(الجعفریون والقریشیون والطلیحیون) کە ناودارترین کۆڕو کۆمەڵی عارەب بوون، پشتی شیرکۆیان گرتبوو.(٢٣٣)

**د- تورك:**

تورکەکان خەسڵەتی جەنگاوەرییان پێوە دیار بوو، لەبەرئەوە بەشێکی کاراو کارزانی لەشکری فاتمییان پێکهێنابوو، ڕۆڵی ئەمان، هەر زووتر لە پێکهێنانی لەشکری فاتمییاندا دەرکەوتبوو[٢٣٤]، بە تایبەتیش لە سەردەمی خەلیفە (العزیز)دا (٣٦٥. ٣٨٦ك/ ٩٧٥. ٩٩٦ز) ئەم خەلیفەیە تورکانی بە زۆری هێنایە ناو لەشکرو بە خۆی ئاشناکردن، ئیدی لەو کاتەوە بوون بە لایەنێکی گرنگ لە لەشکری فاتمییدا، تا وایان لێهات دژ بە خەلیفە (الحاکم بأمر الله)ی پاش (العزیز) شۆرش بەرپا بکەن، چونکە ئەم خەرج و بەخششی لێبڕین و کەوتە پشی پشی لەگەڵ مەغریبییەکان.(٢٣٥)

وا دیارە ئەم سیاسەتە، هیچ تینێکی بۆ دوورخستنەوەی ڕەگەزی تورك لە پێگە پڕ هێزەکانی ژیانی لەشکر نەهێنا، حوکم و حکومەت بە جۆرێ شێویا، لە نۆ ساڵی بەرایی نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی کۆچییدا، چل وەزارەتی جیاوازو جۆراوجۆری دوا بەدوای یەك دەهاتن و دەچوون، دەسەڵات لەو ماوەیەدا کەوتبووە دەست سەربازە تورکەکان و بۆ وەرگرتن و وەدەستهێنانی داواو خواست و پێداویستیان دەستیان دەدایە چەك، تەلارەکانی خەلیفەکانیان خەسارو کاول کرد، بوونە مایەی بێبازاڕیی ئابووریی و داکشانی ڕەنێوهاتی کشتوکاڵ.(٢٣٦)

هەندێ لە وەزیرانی دەوڵەتی فاتمیی، تورك بە پاسەوانی خۆدانانیان کرد بە باو، ئەو پاسەوانانە ڕۆڵی گەورەیان لە کێشەو ململانێی ناو تەلاری شاهانەدا گێڕا، کە لە ساڵی (٥٤٨ك/ ١١٥٣ز) دا سەری وەزیر (أبن سالار)ی تێداچوو. ئەم وەزیرە (٣٠٠) سواری تورکی بۆ پاراستنی خۆی دامەزراندبوون.(٢٣٧) زۆر جاران، لە هەر لایێ ئاشووبێ، ئاژاوەیێ هەڵایسابا، پەنجەی تورکانی تێدا بووەو تورکان لایەنێك بوونە لە ئاژاوەگێڕان. بە نموونە، ساڵی ٤٢٠ك/ ١٠٢٩ز، لە سەردەمی خەلیفە (الظاهر)دا، ئاژاوەو تێکهەڵپرژانی گەورەیان لەگەڵ مەغریبییەکاندا نایەوەو تورکێکی زۆری تێدا کوژرا، وەك (المقریزي) دەیڵێ، تا خەلیفە، خۆی نەگەیشتە سەریان، بڵاوەیان لێنەکرد، ئەوجا بە میانەیی خەلیفە ئاشتبوونەوە.(٢٣٨)

تورکان، وەك نانی هارخواردو ئۆقرەیان نەبوو، هەندەی نەبرد ئنجا، کەوتنە گروگێچەڵکردن بە زنجە (سۆدانییەکان)، کە خەلیفە (المستنصر) بە ئامۆژگاریی دایکی هێنابوونی، (چونکە دایکی بە ڕەچەڵەك لەو زنجییانە بوو)، ئەوەبوو، لەو ئاژاوەو دەستەویەخەیەدا کە ساڵی (٤٥٩ك/ ١٠٦٦ز) لە نێوان هەردوولادا ڕوویدا، تورکەکان بەسەر زنجییەکاندا زاڵبوون و بەرەو (الصعید) ڕایانماڵین، هەر چەندیشە خەلیفە بە خۆو بە دایکەوە کۆمەکیان بە زنجییەکان دەکردو گاڵیان دەدان (دژ بە تورکان بجەنگن و لە میسر دەریان بکەن).(٢٣٩)

---

232 ـ الروضتین، ج١، ق٢، ص٤٢٧. الخطط. (طبعة المعهد) ج٣، ق٢، ص١٨٩. النجوم الزاهرة، ٣٤٩/٥. شفاء القلوب ٣٠.

233 ـ الروضتین، ج١، ق٢ن ص٤٢٥. (بۆناسینی ئەو هۆزانە، بنۆڕە: المقریزي، البیان والاعراب ، ص٢٢، ٣٣، ٤٠).

234 دیارە تورکەکان، هەر لە ڕۆژانی دەوڵەتی (طولۆنی)یەوە ژمارەیان لە میسر دای لە زیادی، چونکە دامەزرێنەری ئەم دەوڵەتە (أحمد کوڕی طولۆن)، خۆی تورکی وڵاتی (ماوراء النهر) بووە. ئەو خۆی ئەم تورکە زۆرەی بۆ پشتیوانی خۆی هێنا بووە میسر. بنۆڕە: الخطط، (طبعة المعهد) ج٢، ق٢، ص٤٣، ٤٤. د. سیدة أسماعیل کاسف، أحمد بن طولون، طبعة دار القومیة للطباعة والنشر. القاهرة ١٩٦٥، ص١٩. د. حسن ابراهیم حسن، تاریخ الدولة الفاطمیة ١٠٢، ١٠٣.

235 ـ د. سرور ، الدولة الفاطمیة في مصر ، ١٠٢ ـ ١٠٣.

236 ـ أتعاظ الحنفا، ص٢٠. د. حسن ابراهیم حسن، تأریخ الدولة الفاطمیة، ٥٨٠ ـ ٥٨١.

237 ـ ابن قلانسي، ذیل تأریخ الدمشق ، ص٣٢٠.

238 ـ أتعاظ الحنفا، ج٢، ص١٧٧.

239 ـ ن، م ، ص٢٧٣.

ساڵی دواتر، تورکان بە هەوای ئەو سەرکەوتنەی بە دەستیان هێنابوو، لەخۆبایی بوونو داوایان لە خەلیفە (المستنصر) کرد موچەکانیان زیاد بکا، ئەوەبوو، لە ساڵی (٤٦٠ك/ ١٠٦٧ز)دا مانگانەیان گەیشتە چوار سەد هەزار دینار.[٢٤٠] کە لەوەو پێش تەنها بیستو هەشت هەزار دینار مانگانەیان وەردەگرت.

کاتێکیش دەرکەوت کە خەلیفە، داواکەیان بەجێناهێنێ، ملهوڕانە، ملیان لێناو "المستنصریان، تەنگە تاوکردو هەرچی پارەی هەبوو دزییانو بردیان"[٢٤١]. نەخێر تورکان، هەندە شووڵیان لێ هەڵکیشا، خەلیفە ناچار هانای بردە بەر میری لەشکر (بدر الجمالي)ی ئەرمەننەژاد، کە ئەوکات فەرماندەی هێزی (عکا)ی سەر بە دەوڵەتی فاتمیی بوو، خەلیفە ساڵی ٤٦٦ك/ ١٠٧٣ز داوای لێکرد، بەخۆو بە لەشکرەوە بگاتە میسر. بە گەیشتنی ئەم هێزەش لایەنێکی نوێی دیکە لە پێکهاتەی لەشکری فاتمییدا زیاد بوو، ئەو لایەنە نوێیەش نەژادی ئەرمەنیی بوو. ئەم ئەرمەنییانە ئازایانە، بە ڕێنمایی (الجمالي) کەوتنە شوێن پێهەڵگرتنی تورکانو کون بە کون بە دوویاندا دەگەڕانو لە هەر کونو قوژبنێکی وڵاتی میسردا سووسەیان بکردنایە ڕاویان دەنان، بە تایبەتیش لە هەردوو شاری قاهیرەو میسر، کە تورکان بە چڕیو لەو دوو شارەدا دەستباڵا بوون.[٢٤٢]

(ناصر خسرۆ) کە لە ساڵی ٤٤١ك/ ١٠٤٦زدا سەردانی میسری کردو وەسفی ئاهەنگەکەی گرتنی کەنداوی کرد (فتح الخليج)، تورکان لە ناو تیپی (المشارقة)دا ناودەبا، کە بریتی بوو، لە "تورکو عەجەم"و دەڵێ: "بە هەردوو لایان دە هەزار زەلام دەبوون".[٢٤٣]

ڕاستیشت دەوێ دەستی باڵای تورکان، لە دوادوای قۆناغی مێژووی دەوڵەتی فاتمییاندا، دای لە کورتیو بە تەواوی نشێوتو نەوی، بە جۆری، کاتێ هێزەکانی شام لە ژێر فەرمانداریی (شێرکۆ)دا گەیشتنە میسر، ئاسەوارێکی ئەوتۆی تورکی تێدا بەدی نەدەکرا.

### هـ. ڕەگەزی دیکە، لە لەشکری دەوڵەتی فاتمییدا:

سەرباری ئەو ڕەسەنو ڕەگەزانە، لەشکری فاتمییەکان، ئەرمەنو کوردیشی تێدا هەبوون، وەڵێ کەمیان لەبارەوە دەزانین.

#### ئەرمەنیەکان:

بوونی ئەرمەنیان، لە میسر، لە نیوەی ماوەی حوکمی فاتمییەکانەوە دەست پێدەکا، لەو کاتەوەی کە لەگەڵ فەرمانداری فاتمیی، ئەرمەننەژاد، میری لەشکر (بدر الجمالي)دا لە (عکا)وە هاتنە میسر. ئەو فەرماندارە کاتێ خەلیفە (المستنصر) هانای بۆ برد، لەگەڵ خەلیفەدا شەرتوشروتێکی بەست، کە بە مەرجێ دێتە میسر هەر سەربازو لەشکرێ خۆی بیەوێ و بە دڵی خۆی بن. ئەوانە لە شامەوە دەهێنێ، تا بتوانێ جێگای سەربازانی سۆدانی و تورک و مەغریبی بگرێتەوە، ئەوە بوو خەلیفە بەو شەرتوشروتەی ملی داو قایل بوو.[٢٤٤] ڕاستیشت دەوێ ئەرمەنیی بەر لە چوونی (بدر الجمالي) بۆ میسر[٢٤٥] لە لەشکری فاتمییدا، بوونیان نەبووە، بەوەشدا دەردەکەوێ کە (ناصر حسرۆ) لە سەردانەکەی ساڵی (٤٤١ك/ ١٠٤٦ز) یدا، واتە بەر لە هاتنی (بدر) بە چارەکە سەدەیەکیش، لە باسی پێکهاتەکانی ئەو لەشکرەدا، ناوی ئەرمەنیی نەهێناوە. ئەرمەنیان، پاشان لە لەشکری فاتمیدا مانەوەو بەردەوام بوون، تا سەلاحەددین لە شکۆی خستن.[٢٤٦]

---

240 ـ الكامل، ١٠/٨٣.

241 ـ أتعاظ الحنفا، ٢/٢٧٥.

242 ـ أتعاظ الحنفا، ٢/٣٠٠.

243 ـ سفرنامه، ٩٤.

244 ـ الخطط( طبعة أوفسيت) ١/١٣٨، د. سرور، الدولة الفاطمية، ص١٠٧، بنۆرە: د. ماجد ظهور خلافة الفاطميين، ص٣٩٢، ٤٠٢.

245 ـ سفرنامه، ص٩٤.

246 ـ مفرج الكروب، ٢/٢٦.

**کورد:**

هەرچەندیشە (القلقشندي) لە باسی ڕەسەنگەلی پێکهێنەری لەشکری فاتمییدا ناوی کوردیشی هێناوە، وەلێ ئێمە هیچ نیشانەیەکی ئەوەمان لە لا نییە، کورد لە جموجوڵی لەشکری فاتمیدا بەشداربووبێ.[247]

بەڵێ، چەند کوردێ، پلەو پایەی باڵایان لە دامودەزگای دەوڵەتی فاتمییدا گرتبووەوە، لەم ڕووەوە بە نموونە: یەك لە وەزیرانی دوا سەردەمی دەوڵەتی فاتمیی (العادل ابن السالار سیف الدین ابو الحسن علي) کورد بووەو لە هۆزی زەرزاری بووە، ئەم کوردە، ساڵی ٥٤٣ك/ ١١٤٨ز لە سەردەمی خەلیفە (الظافر) دا وەزارەتی بەدەست بووە.[248]

(القلقشندي) ناوی دەیلەمو ڕۆمو فەڕەنگیش دێنێ، هەروەها دەڵێ (الصقالیة)ش کە ئەمانە، هەموویان لە لەشکری فاتمیدا هەبوونە، بەڵام ناوبەناو.[249] هەرچی دەیلەمە، ئەوە، خەلیفە (العزیز بالله) (ت٣٨٦ك/ ٩٩٦ز) لەگەڵ تورکاندا ئەوانیشی بەگەڕخستووە، وەك (المقریزي) دەڵێ: "ئەم خەلیفەیە بە درێژایی خەلیفایەتی خۆی تەنیا ئەو دوو ڕەگەزەی خستۆتە کار".[250]

لەبارەی عەجەمەکانیشەوە،[251] کە بە تورکیشەوە دوو هەزار سەربازیان لە تیپی (المشارقة)دا هەبووە، هیچ بەڵگەو نیشانێکمان بە دەستەوە نییە، تەنها هەندە نەبێ، کە (ناصر خسرۆ)ی گەرۆك دەڵێ، زەلامی کەتە کەتە بوون، هەمووشیان لەسەر خاکی میسر لە دایکبوونە.[252]

دەڵێن، لەشکری فاتمییەکان، تایەفەگەلی جۆربەجۆری تێدابووە، هەر تایەفەو سەر بە خەلیفەیەك بووە، بە نموونە: ئەوانەی سەر بە خەلیفە (الآمر) بوونە، پێیان دەگوترا (الآمریة)و ئەوانەش کە سەر بە خەلیفە (الحافظ) بوونە پێیان گوتراوە (الحافظیة). تایەفەش هەبووە سەر بەیەکێ لە وەزیرەکان بووە بەناوی ئەوەوە دەناسران، بە نموونە، وەك (الجیوشیة) کەسەر بە (أمیر الجیوش) بدر الجمالي بوونەو، (ألأفضلیة) کە سەر بە وەزیر (ألأفضل) بوونە.[253]

لەشکری ئەییوبییش هەر بەو جۆرە، بوو بە فرەڕەگەزیی کاتێ کە تیپی سەر بەو شاو، سەر بەم فەرمانداری گەورەی تێدا دروست بوو، بە نموونە وەك تیپی نورەدینی و تیپی یاروقی (ئەوانەی سەر بە فەرمانداری تورکڕەسەن، یاروقی کوڕی ئەرسەلان بوون، هەر بەو جۆرە (الأسدیة، الصلاحیة، و العادلیة)، العادلیە: سەر بە (الملك العادل سیف أبوبکر) برای سەلاحەددین بوونە.

ئەم بارە نالەبارە، دیاردەیەك بوو لە نیشانەکانی گەندەڵیی و لاوازیی دەسەڵاتی خەلیفەی فاتمییو ئاشووب و شڵەژاویی ئاسایش، تا گەیشتە ئەوەی وەزیرەکان، هەریەکەو بۆ خۆی هێزی تایبەتی هەبێو بە هەوەسی خۆی هەڵیانسوڕێنێ، ئەوەی خەلیفە دەیکرد، ئەمانیش دەیانکرد.

سەرئەنجام وا دەردەکەوێ میسرییەکانیش، نەخاسمە شاریو گوندیو فەلایان، لە ساڵەکانی دواداوی حوکمی فاتمییدا، دەچوون ناوی خۆیان لە ڕیزەکانی سوپاو لەشکردا دەنووسیو دەبوونە سەربازی فەرمی وەڵامنامەکەی وەزیر شاور بۆ (الأمیر أسدالدین شێرکۆ) کە بە هانای شاورەوە چوو بوو، ترسی ئەو لەشکرە لەبن نەهاتووەی فاتمییانی کەوتبووە دڵەوە، لەو وەڵامنامەیەدا، شاور بە (أسدالدین) دەڵێ: "لەشکری فاتمیی جێگای مەترسی نییە، چونکە زۆرینەی زۆریان جوڵاو فەلان، بە سانایيو ئاسانی پرشو بڵاو دەکرێنەوە".[254]

---

[247] - صبح الاعشی، ٤٧٨/٣.

[248] - وفیات الاعیان، ٤١٦/٣. الکتبي، عیون التواریخ، ٤٧٥/١٢. د. حسن ابراهیم حسن، الفاطمیون في مصر، ص٢٩٦.

[249] - صبح الأعشی، ٤٧٨/٣. بنۆڕە: الخطط (طبعة المعهد) ج٢، ق١، ص٤٤.

[250] - الخطط، ن، م.

[251] - (ئەم مێژوونوسە مەبەستی لە (العجم) چییە، نەیگوتووە)، ڕەنگە مەبەستی لە (خۆراسانییەکان) یان (فارسەکان) بووبێ.

[252] - سفرنامە، ٩٤.

[253] - صبح الأعشی، ٤٧٨/٣.

[254] - الروضتین، ج١، ق٢، ص٤١٩.

**٦ـ قەوارەی لەشکری فاتمییەکان:**

سوپای فاتمییان، بە سوپایەکی مەزنی هاوشانی سوپاگەلی سەردەمەکانی حوکمی ئیسلام لە قەڵەم دەدرێ. (المقریزي) لە وەسفی لەشکری (المعز الدین لله)دا دەڵێ: "زەمین، پاش لەشکری ئەسکەندەری مەکدۆنی، لەشکری لەبن نەهاتووی وەك ئەوەی (المعز)ی بەسەر پشتی خۆیەوە نەدیوە".[255] (ناصر خسرۆ) ژمارەی زەلامی ئەم لەشکرە بە دوو سەدو پازدە هەزار دەخەمڵێنێ و دەڵێ: "سەدو پازدە هەزاریان سوارەو، سەد هەزاریان پیادە بوونە".[256]

وا دیارە ژمارەی سەربازانی ئەم لەشکرە (ئەگەر خسرۆ و ابن مماتی ڕاستو ڕەوانیان گێڕابێتەوە)، دوای هاتنی (بدر الجمالي) داکشابێ و دابێتی لە کەمی، چونکە (بدر) کەوتە تەتەڵەو لە بێژنگدانی هەندێ ڕەگەزی بەربەرو تورکو، تەنیا پشتی بە ئەرمەنی و سۆدانی قایم کرد).

(الأسد ابن مماتي) کە لە دوای باوکی، بووەتە بەرپرسی دیوانی لەشکری میسر،[257] لە سەردەمی (رزيك بن طلائع)ی وەزیردا، لە (القاضي الفاضل)ی پرسی، دەبێ ژمارەی سەربازانی لەشکری فاتمی چەند بووبن؟، واتا، بەر لە ڕووخانی دەوڵەتی فاتمی بە دەساڵ، (القاضي الفاضل) وەڵامی دایەوە گوتی: چل هەزارو پێنج سەد سوارێ دەبوونو، سی هەزار پیادەی سۆدانیش.[258] وەلێ ژمارەی ڕەگەزەکانی دیکەی نەگووت. کەچی (القاضي الفاضل) هەر خۆی، لە نامەیەکدا کە دەینووسێ و سەلاحەددین بۆ خەلیفەی عەبباسی (المستضيء)ی دەنێرێ، دەڵێ: "ژمارەی زەلامی سۆدانی، هەر خۆیان بە تەنیا، لە سوپای فاتمییدا (ئەوانەی کە لەشکری سەلاحەددین لە ژێر فەرمانداری (الملك العادل)ی برای و (أبو الهيجاء، عزالدين موسك)دا، لە ناویان بردن"، گەیشتە سەد هەزار زەلام.[259]

دووریش نییە، ئەم زیادبوونە لەوەوە هاتبێ کە سۆدانییەکی زۆری دیکە، بۆ بەهێزکردنی پێگەی ئەم ڕەگەزە، بەرامبەر بە لەشکرەکەی سەلاحەددین، هاتبنە ریزی لەشکری فاتمییەوە، کەچی، دەبینی، (عثمان النابلسي) لە کتێبە بزربووەکەی خۆیدا (حسن السريرة في أتخاذ الحصن بالجزيرة)دا، کە (المقريزي) لێی وەرگرتووە، گرتوویەتی: "من چۆن چۆنی بچم بۆ هەرێمێ، دە هەزار سوارەو چل هەزار (بەندە)[260]ی، واتا سۆدانیی تێدابێ؟".

سا بەهەرحاڵ، ئەم هەموو قسەگۆڕینو وێکنەچوونەی لە نێوان نووسینو گێڕانەوەی مێژوونووسانو، جاروباریش لە جیاوازی نووسینەکانی یەك مێژوونووسیشدا، کە (المقريزي) خۆیەتی، وامان لێدەکەن کە لێیان دوودڵ بینو قسەکانیان بە ڕاستو دروست دانەنێین، لەگەڵیاندا سەر حساب ببینەوە، نەخاسمە کە مەسەلەکەش بریتی بێ لە گێڕانەوەی ڕووداوی واقیعی قۆناغێکی زۆر کەمی دوارۆژەکانی دەوڵەتی فاتمیی، لەلایەکی ترەوە، دووریش نییە ئەم هەموو ناسەر ڕاستییە لە بارودۆخی شێواوو شڵەژاوی ژیانی بەدبەختی میسری ئەو سەردەمەوە هەڵتۆقیبێ، یان بە هۆی گۆڕانی قەوارەی لەشکرەوە پەیدابووبێ، کە لە وەختی شەڕدا زیاد دەبێ و لە کاتی ئاشتیدا قەوارەی دەدا لە کەمیی.

**٧ـ شڵەژانی باری میسرو پێچانەوەی لەشکری فاتمییان:**

ئێستا ئەوەمانزانی ڕەگەزو ڕەسەنە جۆربەجۆرەکانی سوپای فاتمیی، لە زۆربەی قۆناغەکانی مێژووی ئەم دەوڵەتەدا، لە نێو خۆیاندا دوژمن بوونو بە کوشتاری یەکدییەوە سەرگەرم بوون، هەرچەندیشە وەزەنیان بۆ لوتکەی ڕژێم نەبووە. ئەو ململانێیانە بە ئاواتی لەناوبردنی دەوڵەتی فاتمییەوە نەبووە، هەرچەندیشە بە بیانووی پاراستنی ئەو حوکمەوە ئەم

---

[255] ـ الخطط (طبعة معهد) ج٢، ق١، ص٤٤.

[256] ـ سفرنامه، ص٩٤ـ ٩٥.

[257] ـ ياقوت الحموي، معجم الادباء ، مكتبة عيسى البابى الحلبي وشركاه بمصر، طبعة أحمد فريد رفاعي، القاهرة، ج٦/ ١٠٩ـ ١١٣. وفيات الاعيان ٢١٠/١.

[258] ـ الخطط (طبعة المهد) ج٢، ق١، ص١٥.

[259] ـ مفرج الكروب، ٢٦/٢. بنؤرة: النجوم الزاهرة، ٧٦/٦.

[260] ـ الخطط، ن، ص.

هەموو شەڕو هەلاّیەیان بەرپا دەکرد. ئەنجامیش، وەك، چۆن بەهۆی گەندەڵی و لاوازیی حوکمەوە، ئەم پاشاگەردانییە لەبرەودا بوو، بوو بە هۆی ڕووخانی دەوڵەتی فاتمیی.

بە پێویستی نازانین دووبارە بێینەوە سەر باسی ئەم گەندەڵیو گەلحۆییەی کە حوکمی فاتمییانی گرتەوەو، ڕووبەری جوگرافی دەوڵەتی میسری فاتمی هێنایەوە سەر ئەو ڕوبەرەی کە باکوری ئەفریقا و فەلەستینو پارچەی دیکەی لێ جیابووەوە.[261]

دوای هاتنی هەڵمەتە شامییەکەی شێرکۆو ڕوودانی ئەو هەموو کارەساتە قورسو گرانەی باسمانکردن، چار نەبوو، دەبوو لەشکرێکی نویٚ ڕێکبخریٚو جێگای لەشکری ئاڵۆزی فاتمییان بگرێتەوە، نەخاسمە خاوەنی هەڵمەتەکەش، واتە: نورەددین مەحمود، هەر لە یەکەم هەڵمەتەوە، بۆ تێکشکاندنی شانو شەوکەوتی فاتمییەکان تێدەکۆشاو دەیویست میسر بهێنێتەوە ژێر رکێفی دەوڵەتی عەباسی، هەرچەندیشە بارودۆخی ناوخۆی میسر، بەپلەی یەکەم، خۆی چارەنووسی میسری کێشا. هەرچی سەلاّحەددینە، ئەو بەڕەنگرشتنی حوکمێکی سەقامگیرو بەرقەراری نوێوە سەرگەرم بوو. خۆ دەبوو هێزێکی سەربازی ڕێكوپێکیشی هەبیٚ و لە خۆبووردەبیٚ و لە تەنگوچەڵەمەی چاوەڕوانکراوی ئایندەدا جێگای متمانەی بیٚ و ئەرك و مەسرەفیشی بەتێریی بۆ تەیارو ئامادە بکریٚ. دەشبوو چاپووکانەو ژیرانە، بۆ لەناوبردنی سوپای فاتمییان بکەوێتە خۆ.[262]

ڕاستیشت دەوێ کارەساتی لەسەریەکی میسرو دووربینیی سەلاّحەددینو ئەو توانستو لێزانینە سەربازییانەیەی لە (شحنە)کەی شاری دیمەشقدا (بەرلەوەی لەگەڵ مامیدا بێتە میسر)[263] بەدەستیهێنا، هەروەها ئەو ئەزموونە چڕو دەوڵەمەندەی لە میسر شارەزایی لەلا پەیداکرد، چ لەگەڵ مامی، چ دوای مەرگی مامی، هەروەها کە کۆمەڵیٚ قەومو خوێشو خزمو لایەنگرانی لەدەوری خڕبوونەوە. ئەم هۆکارانە، بە ڕاستی، سەلاّحەدینێکی فەرماندەی قاڵی سەربازیی پڕهزرو بە ئاوەزی پەیداکردو کردی بەو شەخسیەتە جەنگاوەرە بیٚ باكو بە جەرگە، بەرلەوەی حوکم بگرێتە دەستو بەرلەوەش کە لەشکرێکی ڕێکوپێکی جڵەو لەدەستی خۆی دامەزرێنیٚ.

پیمۆایە، شەرەکەی (البابین) یەکەم شەڕ بووبیٚ کە سەلاّحەددین وەك یاریدەدەرێکی شێرکۆی مامی بەشداری تێدا کردبیٚ. بەڕاستی ئەم شەڕە، بەهرەمەندییو لێوەشاوەیی ئەم فەرماندارەی دەرخستو جارێکی دیکەش سەلماندی کە شێرکۆ ڕابەرێکی سەربازیی لێزانەو تەکتیکسازێکی بێوێنەی یەکەمە. ئەوەبوو، بەهێزێکی کەمەوە، ملی نا لە هەردوو لەشکری خاچدروشمو لەشکری میسری (فاتمیی)و هەردوکیانی پایەماڵ کرد. ئەم پەلامارە بەزەفەرو پڕشکۆیە، وەك عاجبایەتییەکی سەرسامهێن، بەشانازییەوە لە مێژوودا تۆمارکرا، "بەڕاستیش سەیرە تەنیا دوو هەزار سوار، دڕ بە دوو سوپای میسرو سەربازگەی فەڕەنگی کەناراوی میسر بدەنو تێکیان بشکێنن!".[264]

لەم شەڕەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئیدی پێویستی بەوەکرد، فەماندەو گەجەرو گوجەری لەشکری میسری (لەگەڵ دوژمن دەستتێکەڵ) پاکتاو بکرێن، ئەو سەرکەوتنە لە سایەی شێرکۆی فەرماندارەوە هاتە دەست، ئەو پلانەی شێرکۆ بۆ ئەو شەڕەی دانابوو، وەستایانە بەکارخرا. شێرکۆ، لەشکرەکەی خۆی دابەش کردو کردی بە بەرسنگێكو دوو قۆڵی لای ڕاستو لای چەپو، سەلاّحەددینیشی لە پێش سنگی لەشکردا دانا، چونکە دەیزانی دوژمن لەوێوە هێرش دێنی،

---

[261] ـ لەم بارەیەوە بنۆڕە: د. حسن ابراهيم حسن، تأريخ الدولة الفاطمية، وكتابه (الفاطميون في مصر) د. ماجد ، ظهور خلافة الفاطميين. د. سرور، الدولة الفاطمية في مصر.

[262] ـ علي بيومي، قيام الدولة الأيوبيية في مصر، ص١٠١.

[263] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٢٥٠.

[264] ـ الكامل، ٣٢٦/١١. الباهر، ١٣٤. الروضتين، ج١ ق٢، ص٤٣٨. الذهبي، العبر، ١٧٦/٤. مفرج الكروب، ١٥٠/١. الكواكب الدرية، ١٧١. شذرات الذهب، ٢٠٣/٤.

چونکە سەرلەشکر لەسنگی لەشکردا دەبێ. شێرکۆ فەرمانی دا بە سەلاحەددین لە کاتی دەستەویەخەدا، بەرە بەرە بکشێتەوەو خۆیشی فەرمانداریی قۆڵی ڕاستی دەکرد، واتا شێرکۆ ئەم پلانەی بۆ چەواشەکردنی دوژمن دانا. ئیدی ئەوەبوو، کاتێ هەردوو لەشکر تێکهەڵپرژان، سەلاحەددین بە پێی پلانەکە کشایەوەو خاچدروشمان دووی کەوتن، تا پاشکۆی لەشکرەکەیان کەوتە بەردەم شێرکۆ، جا ئەوجا شێرکۆ، بایدایەوەو پشتی لێگرتن‌و چاپوکانە، کەوتە پەلامارو لەشکری دوژمن ئاڵۆزاو بەیەکدا دەهاتن، ئەنجام ترسیان لێنیشت‌و نەبەردیان جێهێشت‌و هەڵاتن. پاشانیش سەلاحەددین بەرەو پیریان پێشکەوتەوەو گەیشتە سەریان، مامیشی لە دوایانەوە دایدەپڵۆسین. دوژمن کەوتە نێوان مام‌و برازا، ملیان بۆ شمشێرو ڕمیان کەچکردو خۆیان دا بەدەستەوە.[265] بێگومان، ئەم شەڕە مەشق‌و ئەزموونێکی دیکەی لای سەلاحەددین زیاتر کردو لەوەوە فێربوو، کە پلانی ژیرانە، گەڵێ جار لە زۆری‌و بۆری سەرباز چاکترە. ئیدی لەو شەڕەوە پتر لە توانست و لێهاتوویی خۆی دڵنیایی پەیداکردو بڕوای زیاتری بەخۆی هێنا. ئەزموونێکی دیکەی ئەوەبوو، ساڵی ٥٦٢ك/ ١١٦٧ز، کە لەگەڵ مامیدا لە ئەسکەندەرییە بوون، لەشکرێکی هاوبەشی خاچدروشمان‌و وەزیر شاور گەمارۆیان دان، ئەوەبوو شێرکۆی مامی، بەجێیهێشت‌و ڕووی کردە دەڤەری (الصعيد)[266] و سەلاحەددین بە تەنیا بەری لە هەردوو لەشکری خاچدروشمان‌و لەشکری میسری گرت، کە لە قاهیرەوە بۆ گەمارۆدان‌و داگیرکردنی ئەو شارە هاتبوون. لەشکری لە ئەسکەندەرییە گەمارۆدراوی سەلاحەددین، بەهۆی سەختیی گەمارۆو کەمیی خۆراك‌و درێژەی ماوەی گەمارۆکەوە کە چوار مانگی خایاند،[267] کێشەیەکی لە کێش نەهاتووی بەسەرهات، وەلێ کۆڵی نەدا، لەوەشدا سەلاحەددین بە ناسۆرترین وانەی گەمارۆ فێربوو، هەرچەندیشە خەڵك‌و خوای ئەو شارە لە هەموو ڕێگەیەکەوە کۆمەکیان پێدەکردو "شانبەشانی سەلاحەددین شەڕکردنیان بە چاکەو بە ئەرکێکی ڕاست دەزانی".[268] ئەو خەم‌و تاڵاوەی لەو گەمارۆیەدا نۆشیی هەرگیزاو هەرگیز لەبیر نەدەچووەوە. بۆ هەڵمەتی سێیەمیش کە مامی داوای لێکرد، خۆی تەیارو ئامادە بکا بچێتە میسر، بە مامی گوت: "مامە، بە خودا قەسەم، هەموو موڵکی میسرم بدەنێ، هەنگاوی بۆ نانێم. ئەو تاڵاوەی لە ئەسکەندەرییە نۆشیم هەتا مردن لە بیرم ناچێت".[269]

دەنگی گەمارۆی ئەسکەندەرییە گەیشتە شێرکۆ، کە ئەو کات لە (قوص)ی دەڤەری (صعيد)ی میسر، ئۆردوگای هەڵدابوو، خێرا کەوتە خۆیی‌و بە هانای سەلاحەددینەوە ڕێگای ئەسکەندەرییەی گرتە بەر. خاچدروشمان‌و دۆستانیان، هەرکە پێیانزانی گەمارۆیان هەڵوەشاندەوەو بەرەو دوا گەڕانەوە بۆ قاهیرە.

پاشان شێرکۆ لە (جمادى الاخر ٥٦٤ك/ ١١٦٩ز) دا کۆچی دوایی کرد. ئەستێرەی برازاکەی زیاتر ورشەی سەند "وەلێ سەلاحەددین گەورەترین پشتیوانی لەکیس چوو، هەرچەندیشە ژیانی ئایندەی تەنیا نەبووەو پیاوەی زیرەك‌و دانای لە دەورووپشت بووەو لە کاتی تەنگانەو لێقەوماندا ڕێنماییان کردووە". سەلاحەددین کە لەوەوپێش بەفەرمانی مامی ڕەفتاری دەکرد، بە مردنی مامی، ئیدی یەکسەر فەرمان کەوتە دەست خۆی. دەبوو خۆی بڕیار دەربکاو فەرمان بدات، بۆ هەموو ئەمانەش ئەنجومەنی جەنگ‌و ڕاوێژ، کە لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدا بوو، بۆ ڕاوێژو تەکبیر کۆی دەکردنەوەو لەسەر بڕیارو فەرمانان پێکدەهاتن. دواتریش دەبینین بڕیارەکانی ئەم ئەنجوومەنە لە وڵاتی شامدا، کاتێ پێکدادان لەگەڵ خاچدروشماندا دەستپێدەکا، چەند گرنگ‌و بە بایەخ بووە.

گرنگترین شت کە سەلاحەددین لە ڕووداوە سەربازییەکانی پێشتر بۆی بوو بە دەرس. نەخاسمە شەڕی (البابين)و

---

[265] ـ شفاء القلوب، ٣٠. الكواكب الدرية، ١٧١. Lane – poole, Saladin, p, 89.

[266] ـ سنا البرق الشامي، ٦٤. مرآة الزمان، ٢٦٩/٨. الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٦٦. الكواكب الدرية، ١٧١.

[267] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٧٠. الكواكب الدرية، ١٧١. وفي سنا البرق (شهورا) ص٦٤.

[268] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٧٠.

[269] ـ الكامل، ٣٤٣/١١، الباهر، ١٤١. الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٩٤. الكواكب الدرية، ١٧٧. ابن الطقطقا، محمد بن على بن طبا طبا، الفخري في الآداب السلطانية والدول الأسلامية، طبعة دار صادر، بيروت ١٩٦٦.

گەمارۆکەی ئەسکەندەرییەی. ئەو دەرسەیە، کە بڕاو بڕ ناکرێ و ناشێ، بۆ جەنگ پشت بە سەربازانی فاتمیی میسر ببەسترێ. ڕووداوە چاوەڕوانکراوەکانیش وەهای لێکرد بە زووترین کات بڕیاری پاکتاوکردنی ئەو لەشکرە بدات، کە هێشتا خۆی وەزیری خەلیفەی (العاضد) بوو. باسی ئەوەشمانکرد، کە وەزیرەکان هەروەك خەلیفە، لەشکری تایبەت بە خۆیان هەبوو، کەواتە سەلاحەددینیش وەزیر بووەو، وەك ئەوان، ئەمیش لەشکری خۆی هەبووە.

یەکەم ڕووداویش، ئەوەبوو کە سۆدانییەکان لە تاوسانی ساڵی (٥٦٤ك/ ١١٦٩ز)دا شۆڕشیان بەرپاکرد، چونکە بەرامبەر بەم وەزیرە لاوەی هێزی شامی هێناوەو دەیەوێ جێگای سەربازانی میسرو بە تایبەتیش جێگای سۆدانییەکان بگرێتەوە، زۆر داخ لە دڵ و تۆڵەخوازبوون، ئەوەبوو سەرگەورەی خەساوە ڕەشپێستەکان، ئەمینداری خەلیفە، کە (جوهر)ی ناو بوو، دەستی کرد بە فروفێڵ و لەگەڵ کۆمەڵێ میسریدا پێکهاتن، کە نامە بنێرن بۆ خاچدروشمان و بانگیان بکەن بۆ داگیرکردنی میسرو کە سەلاحەددینیش بۆیان بەدەرکەوت، ئەمان پشتی لێبگرن و بیخەنە نێوان دوو ئاگرەوەو لەناوی بەرن، بەڵام زەلامێ لە لایەنگرانی [270] سەلاحەددین نهێنی ئەو تەتەرەی کە دەبوو بچوایە بۆ لای خاچدروشمەکان هەڵماڵی، ئیدی سەلاحەددین فەرمانیدا بکەونە سوسەی کابرای ئەمینداری خەلیفە. کاتێکیش نیازی ناپاکانەی ساغ بووەوە، ئەوجا بێ سێ و دوو گرتی و لە پەتیدا، گەلێکیش لە قەوم و خوێشەکانی هەڵواسی، بەم کارەش سەربازی سۆدانییەکان لێی بەرقا کەوتن و "دەستیان کرد بە خڕبوونەوەو خۆئامادەکردن تا لە پەنجا هەزار کەس تێپەڕین"[271]. ئەوجا دەستیان کرد بە شۆڕش و داواکردنی تۆڵەو خوێنی سەرگەورەکەیان و لەگەڵ هێزەکانی سەلاحەددیندا کە (المقدم ابی الریجاء السمین) فەرمانداری دەکرد، لە جێگایەکدا لە قاهیرە کە هەتا ئەمڕۆش (بین القصرین)ی پێدەڵێن. شەڕ قەوما، سەربازانی سەلاحەددین لەو شەڕەدا زەفەریان هیناو سەرکەوتن و ئاوریان لە ماڵە سۆدانییەکان بەردا و گەڕەکی (المنصور)ەشیان سووتاند، کە گەڕەکی سۆدانییەکان بوو.[272]

(شمس الدولة تورانشاه)ی برای سەلاحەددین ئەمیش هەتا (الجیزة) ڕاوەدووی نان و لەوێش تەنگەتاوی کردن تا (الصعید)، ئیدی لەوێ چەندین جاری دیکەش یاخی بوون، ئەمیش سەرکوتی دەکردن، تا وای لێکردن هەر دەتگوت مەسەلەی سۆدانی هەر نییەو هەر نەشبووە.[273]

لەو زنجیرە یاخیبوونانەدا، یاخیبوونی (الکنز) لە هەموویان ترسناکتر بوو، (الکنز) لە ساڵی (٥٧٠ك/ ١١٧٥ز)دا سۆدانییەکانی هەڵاتووی (الصعید)ی لە ژێر ئاڵای خۆیدا خڕکردنەوەو شۆڕشیان دەستپێکردو لەو شەڕاندا برایەکی (الهیجاء) بە دڕاندانەیی کوژراو چەند میرێکی دیکەش سەریان تێداچوو. ئەوجا سەلاحەددین زانی کە مەسەلەکە هەروا سانا نییەو ترسناکە، دەستبەجێ هێزێکی لە ژێر فەرماندەیی (الملك العادل)ی برای و (عزالدین یوسك بن چکۆ)ی خاڵۆزایدا کردنە سەرو ئەمان یاخیبوونەکەیان سەرکوت کردو (الکنز)یشیان کوشت. وەك (عماد الکاتب) یش دەڵێ: "دەوڵەت دوای ئەو کنزەی، کەنزی تری بەدەستەوە نەما".[274]

بەو نامەیەشدا کە سەلاحەددین بۆ (المستضیء)ی خەلیفەی عەبباسی نارد، دەردەکەوێ ژمارەی ئەو سۆدانییانەی لەناوی بردبوون لە سەد هەزار زەلام زیاتر بووە".[275]

پاشان سەلاحەددین بایدایەوە سەر سەربازە ئەرمەنییەکان و کەوتە وێزەیان. نامەیەکی بۆ بەغداد نارد، دەڵێ: "ئەرمەنییەکان، بەجەرگ و بە سامن، چەکی شەککەیان بە دەستەوەیەو وەك کۆڵنجی شان و مل بە ئازارن، زەهرن، تا

[270] ـ الکامل، ٣٤٥/١١، ٣٤٦. مفرج الکروب، ١٧٤/١ـ ١٧٥. البدایة والنهایة ، ٢٥٧/١٢ـ ٢٥٨. ابن خلدون، مجلد ٥، ق٣، ص٦٢٣.

[271] ـ سنا البرق، ٨٣/١. الکامل، ٣٦٥/١١. الروضتین، ٤٥٣/١. مفرج الکروب، ١٧٦/١. ابن الفرات، ج١، مجلد ٤، ص٦٩. الکواکب الدریة، ١٨٤.

[272] ـ الروضتین، ٤٥١/١ـ ٤٥٢. ابن خلدون، مجلد ٥، ق٣، ص٦٢٤. ابن الفرات، ج١، مجلد ٤، ص٧١. شفاء القلوب، ٧٢. الکواکب الدریة، ١٨٥.

[273] ـ النجوم الزاهرة ، ٣٥٤/٥، ٧٦/٦. ابن الفرات، ن، م، ص Lane Poole, Saladin. P. 101.

[274] ـ سنا البرق، ١٧٥/١ـ ١٧٦. بنۆڕە: النوادر، ٤٧، ٤٨. الکامل، ٤١٤/١١. مفرج الکروب، ١٦/٢ـ ١٧. السلوك، ٥٧/١ـ ٥٨. البیان والأعراب، ٤٦.

[275] ـ مفرج الکروب، ٢٦/٢. النجوم الزاهرة، ٧٨/٦. (دەڵێن لەم شەڕەدا هەشتا هەزار زەلامیان کوژراوە). شذرات الذهب ٢٣٦/٤.

بڵێی لووت بەرزن".[276] ئەرمەنییەکان نیشانشکێنی لێزان بوون. سەلاحەددین (ئەهلی ذمە)[277]ی نەدەویست، بۆ لەشکر، ئەهلی کیتابی نەسرانی و جوولەکەشی ڕێنەدەدا ببن بە سەرباز.

ئەرمەنییەکان لە سەربازگەکانی خۆیاندا، لە نزیك ماڵە سۆدانییەکانەوە، پەنا گیرو یاخی بووبوون. لە بۆسەی ئەوەدا بوون، لەشکری سەلاحەددین لەبەر سۆدانییەکان هەڵبێ و ببێ بە نێچیری ئەوان. سەلاحەددینیش نەیکردە نامەردیی بارەگاکانیانی. کە کەوتبوونە نێوان ئەو تەلارەی باسمان کردن. ئاوری تێبەرداو هەموویانی سووتاند. ئەرمەنییەکان لەو سەربازگەیاندا، بەزۆری و بە چرو پری مۆڵ بووبوون، لەو شەڕەدا کەسیان دەرباز نەبوون.[278]

بەم جۆرە سەلاحەددین بڕ بڕەی پشتی سوپای میسری شکاند، لە گۆڕەپانی میسردا. پیاوی بە دەستو هێزی بەرامبەر بە خۆی نەهێشت، ئەو هێزەشی لەناوبرد کە خەلیفە پشتی پێدەبەست.

سەرکوتکردنی ئەم بزوتنەوەیەی ئەرمەنەش ئەوە دەسەلمێنێ کە سەلاحەددین بووەتە خاوەن هێزێکی زەبر بەدەستو دەتوانێ لەشکرێکی گەورەی بە ئەزموونی وەك لەشکری فاتمییان پایەماڵ بکات. ساڵێکیش دوای ئەوە، واتا لە ساڵی (٥٦٥ك/ ١١٧٠ز) دا هێزێکی گەورەی خاچدروشمان کە بە کۆمەك و پشتگیریی هێزەکانی بیزەنتەی (صقلیە) لە شاری (دمیاط) دابەزیبوون، ئەوانیشی تێکشکاند.[279]

سەلاحەددین، بەرلەوەی خاچدروشمان لە (دمیاط) دابەزن، بەپەلە گەیشتە دمیاطو بە پێی ئەزموونەکەی شاری ئەسکەندەرییە، کە لەوێ گەلێ شت فێربوو بوو، هەستا شاری دمیاطی تەژی کرد لەچەك و سەربازو ئازوقەو خاروبار، جا ئەوجا، لەناوجەرگەی شارەوە و لەدەرەوەی شاریشەوە پەلاماری دوژمنی داو نەیهێشت بەوەدا بگەن خۆیان بۆ هێرش ئامادە بکەن، نورەددین مەحمودیش کۆمەکی پێگەیاند، چونکە سەلاحەددین هەواڵی بۆ ناردبوو، کە لەشکرەکەی لە مەترسیدایەو بۆی نوسیبوو: "من ئەگەر لە پەلاماری (دمیاط) دوابکەوم، دەکەوێتە دەست فەڕەنگو ئەگەر بشڕۆم، ئەوا، میسرییە فاتمییەکان هەر دوا بە دوای من ئەکەونە ئازاردانو تاڵانو بڕی خەڵکەکەیو لە فەرمانبەرداریم دەردەچن و بەدوشمدا دێنو فەرەنگیش لە پێشمەوەیەو کەسمان لێدەرناچێ". ئیدی نورەددین بێوچان، پۆست لە دوای پۆست هێزی بۆ دەنارد.[280] لەهەمووشیان بەرچاوترو گەورەتر، ئەو هێزە بوو کە لە ژێر فەرماندەی (قطب الدين خسرو الهدباني)[281]دا بۆی نارد. پاشان نورەددین خۆیشی هەڵیکوتایە سەر جێگاکانی ژێر دەستی فەڕەنگو سەرو ماڵیانی حەلاڵ کردو خەڵکی تێبەردان. ئەم هێرشەی نورەددین پلانێ بوو لە جێی خۆیدا بوو، نورەددین ئەمە یەکەمجار نەبوو کە بۆ بار سووککردنی بەرەی شەڕی میسرو کۆمەکی سەلاحەددین، ئەم جۆرە هێرشانەی کردبێتەسەر خاچدروشمان لە پێگە ئەسڵییەکانی خۆیاند لە وڵاتی شام، دەیویست بەم جۆرە لە دوژمن بگەیەنێ ئەگەر لە میسردا زیادەڕۆیی بکەن، لە پێگەکانی شامیاندا تووشی بەڵا دەبنو جێگەیان پێلەق دەکرێ، لەبەرئەوە خاچدروشمان بەوجۆرە گەمارۆیە قایل دەبوون، تا نورەددین یەخەیان بەربدا، بەم بۆنەیەوە، (ابن الأثير)ی مێژوونووس بە نەستەق، لەسەر ئەم گەمارۆیە دەڵێ: "وشتر مرغ، بە دووی دوو قۆچدا دەگەڕا، هەردوو گوێچکەشی نایە بانی".[282]

---

[276] ـ مفرج الكروب، ٢/٢٦.

[277] ـ السلوك، ١/٤٧. معجم الأدباء ٦/١٠٩.

[278] ـ ابن الفرات، ج١، مجلد ٤، ص٧٠.

[279] ـ الكامل، ١١/٣٥١، الباهر، ١٤٣. الروضتين، ج١، ق٢ ص٤٥٦. مفرج الكروب، ١/١٨٠. الخطط (طبعة المعهد) ٥/٤٢. شفاء القلوب، ٧٣.

[280] ـ الكامل، ١٠/٣٥٢. الباهر ١٤٤. ابن الفرات، ج١، ق٤، ص٨٤. ابن خلدون، مجلد ٥، ق٣، ص٦٢٥.

[281] ـ سنا البرق ١/٨٧. الروضتين، ١/٤٥٩.

[282] ـ الباهر ١٤٤.

گەمارۆی (دمیاط) پتر لە پەنجا ڕۆژی خایاند[283]، خاچدروشمان لەم ماوەیەدا هەموو جۆرە ئامێرو ئامرازێکی گەمارۆی، نموونەی: مەنجەنیق و دەبابەو چەرخەی ئاور بارێنیان[284] خستە کارو لەبەندەرەکەشدا هەزارو سەد کەڵەکو کەشتیان دابەزاند.[285] وەك (المقریزی) دەڵێ: "بەڵایەکی سەختو گران بوو".[286]

گرنگیی تێکشکانی ئەم گەمارۆیە لەوەدایە، کە بووە هۆی بادانەوەی سیاسەتی خاچدروشمان بەرامبەر بە میسرو هێزی میسری سەردەمی ئەم وەزیرە تازەیەیان بۆ دەرکەوتو، بۆیان ساغ بوویەوە، کە هەر کۆششێ لەم بارەیەوە بە خەرجی بدەن بێهودەیەو وازیان لە دەستێوەردانی میسر هێناو خۆیان لێ کرکردو تا نورەددین و پاشانیش سەلاحەددین، هەردووکیان مردن، واتا تا چارەکە سەدەیەك. بە مردنی (الملك العادل) ساڵی ٦١٥ك/ ١٢١٨ز، خاچدروشمان لە دمیاط دووبارە تێهەڵچوونەوە، هەرچەندە ئەمجارەشیان هەر هیچیان بۆ نەکراو نووشووستییان هانی، چونکە سەلاحەددین هەتا مابوو لێگا لێگا قایمکاریی دروستدەکرد، ئەوەبوو ڕێسایەکی کوشتاری ڕێکوپێکی بۆ سەر هەردوو تاوەرەکەی هەردوولای بەندەرەکە دانابوو ئەم دوو تاوەرە کاتی خۆی بۆ بەربەستکردنی کەشتیی هێرشهێنان دامەزرابوون و هەردووکیشیان بە زنجیری ئاسن پێکەوە بەسترابوون.[287]

خوا هەڵناگرێ خەلیفەی فاتمییانیش لەم شەڕەدا بەکردار یارمەتی سەلاحەددینی دەداوە، لێگا لێگا خەرج و مەسرەف و کەلوپەل و خاروباری بۆ ئەم وەزیرەی خۆی دەنارد، وە نەبێ سەلاحەددینیش نکوڵی لێکردبێ، ئەوەتا ئەویش دەڵێ: "لە (العاضد) چاوتێرترم نەدیوە، لە ماوەی شەڕی فەرەنگ لە (دمیاط)دا هەزار دیناری میسری بۆ ناردم، جگە لە جل و بەرگ و شتی لەو جۆرە بابەتانەش".[288]

وەلێ مێژوونووسان نەیانگوتووە، زەلامەکانی خەلیفە لەو شەڕەدا بەشداربووبن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە تەنیا لەشکرەکەی سەلاحەددین، ئەو دەستو توانستەی هەبووبێ میسر بپارێزێ، بگرە لە سەردەمی حوکمی خودی خەلیفەی فاتمییشدا. ئەم لەشکرە، ئەم ناوبانگ و شان و شەوکەتەی بە لێهاتوویی خۆی بەدەستهێنا، کە دوای ئەو هەموو شەڕانە کۆتایی بە سوپای فاتمییان هێنا. چ بە لە ناوبردنی ڕەگەزەکانی، بە تایبەتیش سۆدانییەکان، چ بە نانبڕینی کارمەندەکانی و، چ بە کوشتنی میرەکانی، کاتێ "هەر میرەو لە میرەکانی شام، بۆ لەناوبردنی میرێ لە میرەکانی میسر دامەزران".[289] ئەوەبوو، لە تاریکایی شەودا، پڕ چەك دەوریماڵەکانیان گرتن و کاتی بەدەرکەوتنیان باڵبەستیان کردن و "دەستیان بەسەر خانەو کاشانەو تەویلەو ئاغەڵ و گەنجینەو خاروبارو ماڵومولك و هەموو شتێکی دیکەیاندا گرت".[290]

ئەو ڕووداوانە پێش ماوەیەکی کەم لە مردنی (العاضد) ڕوویاندا، کاتێکیش بەرگوێی کەوت، گەلێکی پێ نیگەران

---

[283] سنا البرق ٨٧/١. الكامل ٣٥٢/١١. الروضتين، ٤٥٧/١. الكواكب الدرية، ١٨٦. بدائع الزهور، ٧١/١. ابن الفرات، ج١، ق٤، ص٨٤. ،Stevenson, The Crusaders in The east

[284] ـ الروضتين، ٤٥٧/١. ابن الفرات ج١، ق٤، ص٨٢.

[285] ـ ابن الفرات ، ن، ص. ابن اياس دەڵێ: "٢٠٠ کەڵەکو کەشتی بوون". تأريخ مصر ٧٢/١. لین پۆڵیش دەڵی: "٢٢٠ کەڵەکو کەشتی بوون". .١٠٣Saladin . p

[286] ـ الخطط، (طبعة المعهد) ٤٢/٥.

[287] ـ القزويني، آثار البلاد، طبعة دار صادر د ار بيروت، لبنان، ١٩٦٠. ص١٩٣. الظاهری، زبدة كشف المماليك وبيان الطرق والمالك، اعتناء وتصحيح بولس راويس، مطبعة الجمهورية، باريس ١٨٩٤. ص٣٥. الخطط، (طبعة المعهد)، ٤٣/٥. ميخائيل عواد، المآصر في بلاد الروم، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٤٨، ص٣٩.

[288] ـ الكامل، ٣٥٢/١١. مفرج الكروب، ١٨٣/١. الروضتين، ٤٥٧/١. الذهبي العبر، ١٨٩/٤. النجوم الزاهرة، ٧/٦. شفاء القلوب، ٧٣. الخطط (طبعة المعهد) ٤٣/٥.

[289] ـ ابن الفرات ج١، مجلد ٤، ص١٣٠.

[290] ـ ن، م، ص.

بوو، که (العاضد) له سەلاحەددینی پرسی، ئەمەی بۆچی کردووە؟ سەلاحەددین پێی گوت: "ئەو میرانە لە فەرمانی تۆ یاخینە، دەیانکوژین، کەسانی دیکەت بۆ دادەنێین، گوێ بە فەرمانت بن، خەلیفەش قایل بوو، زیاتریش سەلاحەددینی بەدڵدا چوو".[291]

ڕێی تێناچێ (العاضد) بڕوای بە قسەکانی سەلاحەددین کردبێ، وەڵێ چاریش ناچار بوو، هیچی لەباردا نەبوو، سەری گوریسەکەشی لەدەست دەرچوو بوو. بەهەر حاڵ سەلاحەددین ئەوەی ویستی، کردی، شان و شەوکەتی بەهێزتر بوو. دەنگوباسی سەربازانی میسر پێچرایەوەو لە ئارادا نەما.[292]

ڕاستیشت دەوێ سوپای فاتمیی هەر خۆی لە خۆیدا کەوتبووە قۆناغی کەنەفتیی و بێدەستی و لاربوونەوە، داواکردنی یارمەتی و هانابردن بۆ نورەددین نیشانەی ئەم بێدەسەلاتییەو بەو سانایی لەناوبردنەی ئەو سوپایەیە، هەرچەندیشە لەشکرەکەی سەلاحەددین و سوپای فاتمیی لەقەبارەدا، بە تەواوێ فەرق و جیاوازییان هەبوو. (أبن أبي طي الحلبي) کە هاوچەرخی سەلاحەددین بووە، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (أسدالدین شێرکۆ) لە هەڵمەتی یەکەمیدا بۆ سەر میسر کە ئەم هەموو سەربازەی دەوڵەتی فاتمییەی بە چاوی خۆی دی، هەموو لایەکیان کۆنترۆڵ کردووەو ڕێگاوبان و سەرکۆلانیان بە تەواوی گرتووە، کە ئەمانەی دی لای کردەوە بەلای شاوری وەزیرداو گوتی: "کابرا، تۆ ئێمەت کەشەنگ و ماندو کرد، ئێمەت لە خشتە بردو گوتت، میسر سەربازی تێدانییە، ئێمەش، بەم لەشکرۆکە کەمەوە، بەهەڵەداوان هاتین، شاور وەڵامی دایەوە، گوتی: "خەمت نەبێ، بەزۆری و بۆریدا مەڕوانە، ئەمانە زۆربەی زۆریان جۆلا و فەلان، بەدەنگی دەهۆڵ خڕ دەبنەوەو بەدارو گالۆرك بلاوەی لێدەکەن، ئەی، ئەگەر، شەڕ بقەومێ و کوشتار گەرم بێ و سەگ خاوەنی خۆی نەناسێ، ئەوسا چۆنیان تێدەگەی؟"[293]

بێگومان ئەمە، بەڵگەی ئەوەیە کە سوپای فاتمییەکان، لە دوا دوا ساڵەکانی تەمەنی ئەم دەوڵەتەدا، بەیەکجاری گرۆڵەی کەوتبووە لێژی و، بەخێرایی بەرەو سەرەنگرێبوون دەچوو.

لەوەی باسمان کرد، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سەلاحەددین، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، زیاتر بەرپێی خۆی بۆ کۆنترۆڵکردنی میسر دەبینی و بەهەموو شێوەیەك بۆ لەناوبردنی لەشکری میسر لەپەژارەو کۆششدا بووەو بۆ بنیادنان و بەرەو چاتر پێشخستنی سوپاکەی خۆی بەردەوام سەرگەرم بووە.

**٨ـ کرۆکی سوپای ئەییوبییەکان:**

دوای مردنی شێرکۆ، تیپە سەربازییەکەی، مایەوە، کە بە ناوی خۆیەوە ناونرا (تیپی ئەسەدی)، ڕۆڵی ئەم تیپە لە بە وەزیردانانی سەلاحەددیندا، ڕۆڵێکی بەرچاوو دیارە، ئەم تیپە لە پێنجسەد سوار کەمتر نەبوون.[294] هەر ئەم تیپە بوو بەکرۆکی لەشکری ئەییوبی لە میسر، میرو فەرمانداری گەورە گەورەی تێدا پەیدابوون و پێگەیشتن، بە نموونە وەك" جاولی الاسدی، حسام الدین تمرتاشی کوڕی و سیف الدین بازگۆج و ئەرسەلان بغاو عزالدین ارسل و سنقر الوشاقی و کەسانی دیکەش".

پاشان تیپێکی نوێی دی سەری هەڵداو، ئەویش هاتە کایەوە پێی دەوگوترا تیپی (الصلاحیة). ئەم تیپی دووەمە هەمووی قەوم و خوێش و هەڵبژاردەی سەلاحەددین بوون و (ألأمیر أبو الهیجاء السمین الهذباني) فەرماندەیی دەکرد، لە ڕیزەکانی ئەم تیپەوە تاقمێ میری ناوداری، نموونەی وەك" فخر الدین چهارکس الناصري و سیف الدین بن علي أحمد المشطوب و کەسانی دیکەش" هەڵکەوتن و ناویان دەرکرد، هەروەك چاوەڕوانی دەکرا، سەلاحەددین پاش لەناوبردنی لەشکری فاتمیی فەرماندەو کاربەدەستانی دووبارە لە کوردو تورك دانایەوە، تا سەرلەنوێ لەشکر بنیاد بنێنەوە و

---

291 ـ ن، م، ض. بنۆرِة: الروضتین، ج١، ق٢، ص٤٩٨.

292 ـ ن، م، ص.

293 ـ الروضتین، ج١، ق٢، ص٤١٩.

294 ـ الروضتین، ج١، ق٢، ص٤٣٨. ابن الفرات ج١، ق٤، ص٥٦.

سۆدانی و ئەرمەنی و بەربەری تێدانەهێشت.

المقریزي دەڵێ: "کە سوڵتان سەلاحەددین دەوڵەتی فاتمیی ڕامالّی، ئیدی ڕەش پێستو میرەکانی میسرو عوربان و ئەرمەنیشی لە سوپاکەی دا نەهێشتو لەشکرێکی نوێی لە کوردو تورك، بە تایبەتی لەم دوو نەتەوەیە پێکهێنا".[٢٩٥] ئەو دوو نەتەوەیە، بە کەمبەشی و برسێتی و ژیان گوزەرانی سەخت ڕاهاتبوون و زیاتر بەرگەی ژیانی کاروانی و سەفەرو کوشتاریان دەگرت.[٢٩٦]

ابن ایاس گوتویەتی، سەلاحەددین هەر ئۆردوگاو لەشکرێکی ساختە لە میسردا بووبێ، هیچی نەهێشتن، کە بریتی بوون لە "صقالبة،کدانة، مصامدة، ئەرمەن و شناترة العرب، کۆیلەو ڕەشپێست". ئەو تایەفانەی سەر لەبەر سڕینەوەو سەربازگەلی نوێی بە تایبەتیش لە کورد پڕچەك کرد".[٢٩٧]

لەم حیکایەتەوە دەردەکەوێ، ژمارەی تورك لە لەشکری سەلاحەددیندا، لەوەی سەردەمی مامی کەمتر بوونەوە، چونکە وەکو پێشتر باسمان کرد، (عین الدولة الیاروقي)، سەرتیپی یاروقییەکان و (عزالدین جوردیك النوري) و کەسانی تورکلی دیکەی سەر بە نوورەددین، کە هەموویان تورك بوون، لە لەشکرەکەی سەلاحەددین کشانەوەو، لەبەرئەوەی قایل نەدەبوون سەلاحەددین پاش مردنی مامی کرا بە وەزیری میسر. ئەوان وەزارەتیان بۆ خۆیان دەویست. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە یاروقییەکان وازیان هێنابێ و بەشدارییان لە سوپای ئەییوبییەکاندا نەکردبێ، نەخێر. بەشدارییان کردووەو لە شەڕەکانی دژ بە خاچپەروشماندا، ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوەو سەلاحەددین ئەمانیشی لەگەڵ ئەو سوپایەدا نارد، کە ڕۆیشتن بەرلە هەڵمەتەکە بگرن، کە ئەڵمانییەکان بە نیازی داگیرکردنی خاکی شام و کەناراوەکانی فەلەستین دەستیان دابوێ.[٢٩٨]

ئەمان لە کاتێکی هاتوونەهاتا (لحظة حرجة)، گەیشتنە گۆڕەپانی شەڕەکەو، فەرماندەی قۆڵی ڕاستی لەشکری سەلاحەددین درا بە مان و لەپشت قودسیشەوە کەوتنە پەلاماری ڕێگاوبانی هێنانی ئازووقەو خاروباری لەشکری خاچپەروشمان، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر کاری کردە سەر دوژمن و ناچار کران پاشەکشە بکەن و لەشکرکێشی ڕابگرن، بە تایبەتییش کاتێ: "بدرالدین دلدرم الیاروقی بە خەڵکێکی زۆری تورکمانەوە گەیشتە ئەوێ و سەلاحەددین چاوی پێی کەوت و ڕێزی پێویستی لێنا".[٢٩٩]

ڕاستیشت دەوێ، سەلاحەددین لە پێکهێنانی سوپاکەیدا، تەنیا بە کوردو پاشانیش بە تورکمانیش دانەکەوت، بەڵکو وەك دەگێڕنەوە، مامی بەچەند هۆزێکی عارەب کە لە میسرو شام نیشتەجێ بوون پشتی قایم کردبوو. دەبێ ئەوەش بزانین، کە گوتت عەرەب، واتا خەڵکی شارانشین و هۆزەکان، دەبێ ئەوەش بڵێین کاتێ (أسدالدین شێرکۆ) داڵدەی بردە ناوچەی (جیزە)، هۆزە عەرەبەکانی ئەوێی لەخۆی نزیك کردەوەو دۆستایەتی لەگەڵیانا سازدا، بەتایبەتیش لەگەڵ "شەرەفمەندانی جەعفەری و طلحي و قرشي و خەڵکانی تریش".[٣٠٠] پاشان بەرەو لای (الصعید) کەوتەڕێ و کاتێکیش شاری (قوص)، "عورباتێکی زۆرو خەڵکی ئەو ولاتەشی چوونە پالّ".[٣٠١]

---

[295] ـ الخطط (طبعة اوفسيت) ٩٤/١.

[296] ـ مقدمة ابن خلدون، المطبعة البهية المصرية، ميدان الأزهر، (تأريخ بلا) ص١٩٠. ابن الأزرق، بدائع السلك في طبائع الملك، منشورات وزارة الأعلام، بغداد ١٩٧٧، ج١، ص١٥٥. د. سعداوي، جيش مصر، طبعة لجنة البيان العربي، القاهرة ١٩٥٦. ص٩.

[297] ـ بدائع الزهور، ٧٠/١. امين الخولى، الجندية والسلم، مطبعة الرسالة القاهرة ١٩٦٠، ص٥.

[298] ـ العماد الكاتب، الفتح القسي في الفتح المقدسي، تحقيق: محمد محمود صبح، الدار القومية للطباعة والنشر، القاهرة ١٩٦٥، ص٣٩٤. النوادر ص١٢٦.

[299] ـ النوادر، ٢١١.

[300] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٢٥. المقريزى ، البيان والاعراب ص٢٢.

[301] ـ الروضتين، ص٤٢٧. الخطط (طبعة المعهد) ج٣، ق٢، ص١٨٩. شفاء القلوب، ٣٠.

سەلاحەددین بە پێی ڕەوشی مامی، عەرەبەکانی میسری دەهێنایە ڕیزی لەشکرەوە، وادیارە بەشێکیشیان هەروەك سەربازی فەرمیی هاتبنە ڕیزی لەشکرەوە. لەو نمایشە سەربازییەشدا کە سەلاحەددین لە ڕۆژی (٨)ی موحەڕڕەمی ساڵی (٥٦٧ك/ ١١ئەیلولی ١١٧١ز)دا، واتا دوابەدوای بڕینی گوتاری فاتمیی و پێش مردنی (العاضد) بە دوو ڕۆژ سازیدا، عارەبی (الجذامیون)یش لەگەڵ بەشداربووانذا بەشدارییان کرد.[302] ئەو عارەبانەحەوت هەزار سوارەیان هەبوون، پاشان کەمکرانەوە بۆ هەزارو سێ سەد سوارە و پارەو پوولێکیش کە بۆیان بڕدرابوویەوە کەمکرایەوە، هاتە سەر دەیەك (العشر) واتا، کرا بە سەدهەزار دینار، لەگەڵ عارەبەکانی (الفعالبة) یشدا هەر بەو پێودانگە. ئەمەش بووە مایەی ئەوە کە هەردوو گروپی عارەبی (الجذامیء الفعالیە) "بتۆرێن و تورەبن و هەڕەشەی لایەنی فەرەنگ گرتن بکەن".[303]

نشینە (المواطن)ی الثعالبة کەوتبووە ئەم لای میسر، بەر بە شام، کەوتبوە نێوان (العریش رفح)ەوە، هەرچی نشینەی هۆزی (الجذامین)ە، ئەوە، کەوتبووە نێوان قاهیرەو (عقبە ایلە)[304]وە. ئەمانە عارەبی کۆنی میسرن و لەگەل هێرشەکانی سەرەتای ئیسلامدا هاتنە ئەم ولاتە.[305]

وێڕای ئەمانەش، کۆمەلانی خەڵکی دیکەی عارەب، چ بۆ غەزاو چ بۆ تالان و چەپاوڵ، وەك سەربازی نافەرمی و غەیرە نیزامی یاریی سەلاحەددینیانداو کۆمەکیان لەگەڵدا کرد. بەهەمان شێوە، نورەددینیش لەگەڵ هۆزەکانی عارەبی شام، بەنموونە وەك (بني بحتر القحطاني) کردیە هاوکاریی و بڕیاریشی بۆ دەرکردن هەر ماڵ و موڵکێ بە دەستیانەوە هەیە، بە دەستیانەوە بمێنێ و بۆ خۆیان بێت.[306]

نورەددین سوودی لە عوربانی دانیشتووانی بەشەکانی باشوور و خوارووی ولاتی شام بینی و وەك چاوساغ و شارەزای ڕێگاوبان بە کاری دەهێنان و پێش لەشکر دەکەوتن، بە تایبەتیش لە هەردوو سارای نێوان میسرو شامدا.[307] ڕووداوەکانی پاشینیش دەریخست کە ئەو عارەبانە لە سوپای سەلاحەددینیشدا وەك شارەزاو چاوساغی ڕێگاوبان ئیشیان دەکرد. لەلایەکی دیکەوە، بەشێکیان بووبوون بە جاشی خاچدروشمان.[308] بەتایبەتیش بە جاشی هێزەکانی ڕیشارد شێردڵ.

بێگومان بەدووی سارانشینی جاشی خاچدروشمان کە هەرگیز لە خزمەتی دوژمنی خۆیان و دوژمنی ولاتەکەشیاندا بوون، بوونە مایەی سەرئێشەو کێشە بۆ لەشکرەکەی سەلاحەددین، بە تایبەتییش هۆزی (بنی عباد)[309] کە وەك (العماد الکاتب) باسیان دەکا دەڵێ، ئەمانە چاونەترس و بەجەرگن، لەناوچەیەکدا دەژیان پێی دەگوترێ ناوچەی (صرخد) کە لەگەڵ ناوچەی (حۆران)دا، دراوسێی شانبەشانەو هەردوو ناوچەکەش سەربە ئیدارەی دیمەشقن.[310]

سەلاحەددین لە ساڵی (٥٦٨ك/ ١١٧٢ز) دوو سەد قارەمانی هەلاتوویی جەنگی دوورخستبوونەوە بۆ دیمەشق و داواشی لە نورەددین مەحمود کردبوو کە "لە هەرێمێکدا هەر بە موڵك، نەخشەی چەند پارچە زەوییەکیان بۆ بکێشێ و

302 ـ السلوك، ٤٧/١. الخطط (طبعة المعهد) ج٢، ق١، ص١٦.

303 ـ السلوك والخطط، ن، ص.

304 ـ البيان والاعراب، ص١٩.

305 ـ ن، م، ص٢٣.

306 ـ صالح بن يحيى، كتاب تأريخ بيروت، المطبعة الكاثوليكية، بيروت ١٩٦٩، ص٩٠. د. ابراهيم علي طرحان، النظم الاقطاعية، دار الكتاب العربي للطباعة والنشر، القاهرة ١٩٦٨، ص٣٢.

307 ـ اسامة بن منقذ ، الاعتبار ، ص١١.

308 ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٢٦. مرآة الزمان، ج٨، ق١، ص٢٩٣.

309 ـ النوادر، ٢١٣، مفرج الكروب، ٢٨٣/٢. أبو شامة ، الروضتين في اخبار الدولتين، مجلد يضم الجزء الاول والثاني، مطبعة وادي النيل، القاهرة ، ١٢٨٧هـ، ١٩٢/٢.

310 ـ سنا البرق، ١٢٥/١. القلقشندي، نهاية الارب في معرفة انساب العرب، مطبعة النجاح، بغداد ١٩٥٨، ص١٣٤.

دەستیان لە کفرو لەوڵاتەکشی وەکێشی". [311] مەبەستیش ئەوەیە، کە ئەوانە هاوکاریی خاچدروشمان دەکەنو لە ناوچەی نێوان میسرو شامدا مەترسییان پەیدا کردووە، بە تایبەتیش کە "شارەزاو ئاگاداری جرتو فرتو فڕوفێڵی ئەو ناوچەیەن". [312]

دووریش نییە، ململانێی نێوان سارانشینانی ئەو ناوچەیە لەناوخۆیاندا، بووبێتە مایەی ئەوەی هەندێکیان لەڕقی هەندێکیان پاڵی بە دوژمنەوە دابێ، هەواو هەوەسی سارانشینانیش ئەو هەستو هۆشە ئایینیو ئەو ژیانە ڕێکوپێکە هەڵناگرێ و ئەو ئاوەزەی نییە بچێ شانبەشانی لەشکری سەلاحەددین بکەوێتە غەزاوە. خاچدروشمانیش لێگا لێگا دەمیان شیرین دەکردنو بۆ لای خۆیان ڕایاندەکێشانو دەیانکردن بە جاشی خۆیانو لە میللەتەکەی خۆیان هەڵیاندەگەڕاندنەوە، تا وای لێهات دەغڵو دانیشیان بۆ فەرەنگەکان ئاوەدیو دەکرد. [313] هەر لەبەر ئەوەشە کە (العماد الکاتب) شتی کرچو کاڵو ترشو تاڵیان پێبڵێ. [314]

هەروەك هەندێ لەو عەرەبانەی باسمانکردن، چەندین دەستەو کۆمەڵیش لە مەغریبییەکان چوونە ڕیزی لەشکری سەلاحەددینەوە، ڕەنگە ئەمانیش هەروەك سەربازگەلی نافەرمییو غەیرە نیزامیی بۆ غەزاو بۆ ئایین ئەمەیان کردبێ. لەوەش زیاتر کە (ابن جبیر)ی گەڕۆکی خەڵکی مەغریب، لەسەردەمی سەلاحەددیندا بە میسرو شامدا گەڕاوەو باسیان دەکا، هیچ شتێکی تریان لەبارەوە نازانین. ئەو باسیان دەکاو دەڵێ: "زەلامی دەوڵەمەندی خێرخوازو چاکەکار، خانمانو ئاغاژنان، بەشێ لە دارایی و سامانی خۆیان بۆ ئازادکردنی ئەو مەغریبییانە تەرخان دەکرد، کە بەدیلی کەوتبوونە دەست خاچدروشمان". [315]ڕاستیشت دەوێ مەغریبییەکان هەروەك لە لەشکری میسری فاتمییدا هاوپشك بوونە، وەك باسمان کرد، لە لەشکری نورەددین مەحمودیشدا بەشدارییان کردوە. (ابن جبیر) دەڵێ: "نورەددین مەحمود کاتێ نەخۆش کەوت، نەزری کرد دوازدە هەزار دینار بۆ سەرکڕینەوە (فداء)ی دیلە مەغریبییەکان دابڕدرێ". [316]

سەرچاوەو ژێدەران دەڵێن، ئەوانەی کاروباری گەرماوەکانی لەشکری ئەییوبییەکانیان لە ماوەی دوو ساڵ درێژەکێشانی گەمارۆکەی (عکا)دا بەڕێوەبرد، زۆربەی زۆریان مەغریبی بوون. [317]

**٩- قەوارەو بەرەو چاتر گۆڕانی سوپای ئەییوبییەکان:**

گوتمان، ئەو ڕووداوە گەورەو گرنگانەی هەر لە هەڵمەتەکەی شامی نورەددینەوە بەسەر میسردا هاتن، بوونە بنەمایەك لە بنەماکانی پەیدابوونی سوپای ئەییوبی، ئەو سوپایەی چ لە سەردەمی وەزارەتی شێرکۆو سەلاحەددینو، چ دوای لە ناودانی خیلافەتی فاتمییەکان، پاراستنی وڵاتی میسری گرتە ئەستۆی خۆی، توانستو توانی ئەم لەشکرە هەند بەرەوچاتر گۆڕاو، هەند دای لە زیادی، توانی بەر بەهێرشەکانی خاچدروشمو صقلیەو بێزەنتییەکانیش بگرێو تێکیانبشکێنێو بزووتنەوەکانی دژ بەر حوکمی تازە پەیدابووی ناوەخۆی میسریش سەرکوت بکات.

دوای زانینی ڕەگەزو ڕەسەنگەلی پێکهێنەرانی ئەم سوپایە، ئێستا بۆ زانینی سەویەو توانستی کوشتارو جەنگاوەریی ئەم سوپایە" بە گشتیی پێویستە قەبارەکەشی بزانین. (المقریزي) لە زمان گەورە ڕاوێژکاریی سەلاحەددین (القاضي الفاضل)ەوە، دەگێڕێتەوەو نووسیویەتی: "سەرەتای ساڵی (٥٦٧ك/ ١١٧١ز)، هەر بە لەناوبردنی خیلافەتی فاتمیان نمایشێکی سەربازی سازدرا. هەموو جۆرە بەشەکانی کۆنو نوێی سوپای سەلاحەددین، بە چەكو ئەسپو

---

311 ـ سنا البرق، ١٢٥/١.

312 بۆ شرۆڤەی زۆرتر، بنۆڕە: کتاب، درید عبدالقادر نوري، سیاسة صلاح الدین، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧٦ ص١٠٢ـ ١٠٣.

313 ـ السلوك، ٧١/١.

314 ـ سناالبرق الشامي، ٢٩٩/١. وجب (صلاح الدین) ص١٧٣، هامش ٧١، نقلا عن مخطوط (البرق الشامي)، ج١، ورقة ١٧.

315 ـ رحلة ابن جبیر، طبعة دار صادر، دار بیروت، بیروت ١٩٦٤، ص٢٨٠.

316 ـ ن ، م، ص.

317 ـ السلوك، ٩٤/١، نقلا عن عبداللطیف البغدادی، معاصر صلاح الدین في کتاب (الأعتبار).

**ئامێرو ئامرازی جەنگەوە بەشدارییان تێدا کرد". ئەو کاتە تازە من گەیشتبوومە قاهیرە، نوێنەرانی بێزەنتەو خاچدروشمەو ڕۆمەو فەرەنگیش بانگ کرابوونو لەوێ بوون. بەڕاستییش نمایشێکی سەربازی تا بڵێی گەورەو گرنگ بوو، هێز لە دوای هێزو (طلب دوای طلب)،[318] واتا لق دوای لق، بەدووی یەکدا، ملیان لێنابوو بەڕیز دەڕۆیشتن.**

**طلب، بە زمانی (الغز)، وەك (المقريزي) دەڵێ: "میری لقە، ئاڵای بەرزو شەپیووری تایبەت بە لقەکەی خۆی لە پێشەوەیەو دووسەد سوارو، سەد سوارو، حەفتا سواری لە ژێر ئاڵادایە". نمایشەکە لە بەیانییەوە تا خۆرئاوابوون و تاریکبوونیش درێژەی کێشاو دوایی نەدەهات، سەدوچلو حەوت لق لەو خۆ دەرخستنەدا بەشداربوون. جگە لەوانە بیست لقیش دیار نەبوونو نەهاتبوون، (القاضي الفاضل) درێژەی پێدەداو دەڵی: "بەمەزەنندە چواردە هەزار سوارە دەبوون، زۆربەیان (طواشي)،[319] واتا لە نۆکەرە نزیکەکانی خەلیفە بوون". (طواشي) کە بە کوردی، ئەکا، نۆکەر، پاداشتیان حەوت سەد دینارو، هەزار دینارو، سەدو بیست دینار بووە. (برك)یشیان، واتا وڵاغیشیان لە دەسەر بەرەو ژێر ئەسپو ئێسترو گوێدرێژو وشتریان پێبووە. هەرزەکارێکیش چەکەکەی بۆ هەڵدەگرتو باقیمەنی سەربازەکانیش (قراغلامييه)،[320] واتا لە هەرزەکارە ڕەشپێستەکان بوون.**

**لەم شرۆڤەیەوە. کە لە کردارێکی سەرژمێری دەچێ. دەردەکەوێ کە سەلاحەددین سوپایەکی هەبوو، نزیکەی شازدە هەزار هەر سوارەی تێدابووە، وەلێ نە (المقريزي)و نە (القاضي الفاضل)یش ژمارەی (الطواشية)و ژمارەی (القرەغلاميه)یان پیشان نەداوە، تەنها هەر هێندە دەڵێن کە زۆربەی (الأطلاب)ەکان، (طواشي) بوونە.**

**پاش تێپەڕبوونی دە ساڵ، واتا لە ساڵی ٥٧٧ك/ ١١٨١ز) دا، سوڵتان سەلاحەددین دەستی کردەوە بە سەرژمێرییەکی نوێی هێزەکانی سوپاکەی، بێگومان لەماوەی ئەو دە ساڵەشدا هەموو شتێ گۆڕا بەرەوچاتری گۆڕانێکی زەقو بەرچاویش لە مێژوو ناوچەکە هاتبووە کایەوەو لەشکرەکانی سەلاحەددینیشی گرتبووەو کاری تەواویشی لە پێکهاتەو توانستو قەبارەو پسپۆڕیی و ئەزموونو شارەزایی سوپای ئەییوبی کردبوو. ئەوەبوو، هێرشێك لە ژێر فەرماندەیی (شمس الدولة تۆران شاه بن أيوب) ی برای سەلاحەددیندا، لە مانگی ڕەجەبی ٥٦٩ك/ ١١٧٤ز[321]دا، کرایە سەر وڵاتی یەمەن.[322] پاشان لە کۆتایی ساڵی (٥٦٩ك)و بەرایی ساڵی (٥٧٠ك/ ١١٧٤ز)[323]دا، دابەزینە بەرفراوانەکەی**

---

[318] ـ (طلب) وشەیەکی کوردی تورکییە، هەروەك (المقريزي) دەڵی، سەیرێکی سەرەوە بکە، ماناى ئەو میرەیە کە لە مەیدانی شەڕدا دووسەد سوارەی لە ژێر دەستە، هەروەها بە فەرماندارییی سەد سوارو، حەفتا سواریش دەگوترێ، ئەم وشەیە یەکەمجار لە میسرو شامدا کەوتە سەر زمان، لە ڕۆژانی سەلاحەدیندا. بنۆڕە: السلوك، ج١، ق١، ص٢٤٨. پەراوێز. مفرج الكروب، ٢/ ٥٩ پەراوێزی/٣.

[319] ـ (المقريزي) لە شرۆڤەی وشەی (الطواشي) مەتنەکەدا، دەڵێ: خزمەتکاری خەلیفە بوون، واتا نۆکەر، (الأستاذون)یشیان پێگوتراوە، صبح الأعشى، ٣/ ٤٧٧. لە مانایەکی تردا، کە لەگەڵ ئەم بابەتەدا نالوێ، بە "نۆکەرە خەساوەکان" هاتووە، صبح الأعشى، ٥/ ٤٥٦. بنۆڕە: د. حسن الباشا، الالقاب الأسلامية فى التأريخ والوثائق والآثار، ، مطبعة لجنه بيان العربي، القاهرة، ١٩٥٧، ص٣٨٢، ئەمەش ئەوە دەگەیەنی کە (الطواشي) لەو سەردەمەدا ، مەبەستی لە پلەیەك زیاترو بەرزتر بووە، چونکە (طواشي) بەمانای (سوارچاکیش) هاتووە. لین پۆڵ ، saladin. P, ١٥٤. لایوایە کە (طواشي) لەتاوسەوە هاتبێ Toassin، وەك وليم الصوري دەڵی: تاوسیش بۆ وەسفی زەلامی قۆز بەکاردێ، ئەم (الطواشي)یانە ش هەڵبژاردەی خەڵکن. هەندێکیان لە سوپای سەلاحەددیندا بوونە فەرماندە. د. سعداوي، التأريخ الحربي ص١١٠، هەرچەندیشە من خۆم ڕای (لین پۆڵ) بە ڕاست دانانێم.

[320] ـ الخطط (طبعة المعهد)، ج٢، ق١، ص١٦. (القراغلامية)ش، بە تورکی، واتا (کوڕی ڕەش)، ڕەنگە هەر بە سۆدانییەکان گوترابێو پاشان هەموو ئەو سوارانەشی گرتبێتەوە کە لە (طواشي) پلە نزمترن، هەروەك لە شرۆڤەکەوە دەردەکەوێ.

[321] ـ النوادر، ٤٦. الكامل، ١١/ ٣٩٦. وفيات الاعيان، ١/ ٣٠٦. الروضتين ج١، ق٢، ص٥٥١. البداية والنهاية ١٢/ ٢٧٣. أبو مخدمة، تأريخ عدن، ج١، ق٢، ص٣٧. الكواكب الدرية ٢٢١ـ ٢٢٢.

[322] ـ الكامل، ١١/ ٤١٢. مفرج الكروب، ٢/ ١١. النويرى، كتاب الالمام بالاعلام فيما جرت به الأحكام. مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية، حيدرآباد، الدكن، الهند، ١٩٦٨، ج١، ص١٦٣ ـ ١٦٥.

**(صقلییەکان) لە ئەسکەندەرییە ڕوویداو لە ساڵی (٥٧٠ك/ ١١٧٤ز)[٣٢٤]دا شۆڕشەکەی (الکنز) بەرپابوو. پاشانیش سەلاحەدین هەڵمەتی یەکەمی بەرەو وڵاتی شام دەستپێکردو هەندێ شاری لە قوڵایی شامدا گرت، ئنجا گەڕایەوە بۆ میسرو هێرشیکی کردە سەر باشووری فەلەستینو ئیدی ئەو تێکشکانە بوو لە (الرملة) کە تێکشکا.[٣٢٥]**

**ئەو هەموو ڕووداوانەو شتی دیکەی لەو جۆرە بابەتانە ڕوویاندا، سەرباری ئەوانەش سەلاحەددین موڵكو زەویو زاری لە کۆمەڵێ کورد سەندەوە،[٣٢٦] چونکە گوایا ئەوان بوون بە هۆکاری ئەو تێکشکانەی[٣٢٧] (الرملة)، ئەمەش بووە هۆی کەمبوونەوەی سەربازەکانی سەلاحەددین، بەڵام زۆری نەخایاند ئەو کەموکورتییەی پڕکردەوە. ئەمەش بەو ڕەنووس و ژمارە تازانەدا دیارە کە (المقریزي) لە تازە پەیدابووەکانی ساڵی (٥٧٧ك/ ١١٨١ز)دا باسیان لێوە دەکاو دەڵێ: "سەلاحەددین دووبارە بە کاروباری سوپاکەیدا چووەوە، تا بزانێ ژمارەی سەربازەکانی، چی کەمی کردووەو چەندی زیادکردووە"، لە کۆتایی سەرژمێردا دەرکەوت کە هەشت هەزارو شەشسەدو چل، (٨٦٤٠) سوارەی هەیە، سەدو یازەدەیان میر لقن، شەش هەزارو نۆسەدو حەفتاو شەش نۆکەری (طواشي)[٣٢٨]و هەزارو پێنجسەدو پەنجاو سێ (١٥٥٣)[٣٢٩] (قەراغلامیشی) هەیە.**

**کۆی هەمووی دەبێتە پتر لە حەڤدە هەزار جەنگاوەر، واتا زیاترە لە نمایشە سەربازییەکەی ساڵی (٥٦٧ك/ ١١٧١ز). ئەركو مەسرەفی ساڵانەی سوپا گەیشتە (٣٦٧٠٠٠٠) دینار، ئەم بڕە پارەیەش بۆ ئەو چەرخ و زەمانە زۆر بووە.**

**(المقریزي) لەو حسابو حسابکارییانەدا، گەلێ گروپو تاخمی ناونووس نەکردووە، بە نموونە (المحلولون من الأجناد) (العاطلون عن العمل العسکري)، واتا سەربازی خزمەت تەواوکردووی بێکاری حساب نەکردووە. کە ڕەنگە ئەمانە سەربازی نانەزگ بووبن. هەروەها عوربانیی، لەخۆوە بە سەرباز بووی لای (الشرقیة والبحیرة)و کەتانییەکانو میسریو فوقەهاو قازیو سۆفیو ئەوانەی دیوانەکانو تا چەند ئەركو مەسرەفیان بۆ دیاری کراوەو خەڵاتی هەزار هەزار (واتا یەك ملیۆن)[٣٣٠] دینارو شتی دیکەی لەم جۆرە بابەتانەی حساب نەکردوون.**

**بێگومان، سەلاحەددین نەیدەتوانی گشت هێزەکانی میسر لە هەڵمەتەکانی پاشتر بۆ سەر وڵاتی شام بخاتەکار، خۆ دەبوو بەشێك لە هێزەکانی لە میسر بەجێبهێڵێ، تا ئەگەر دەستدرێژییەکی لەناکاوی دەرەکیی کرایە سەر میسر، یان جموجوڵێکی ناڕەزاییو بەرهەڵستکاریی وەکو ئەوانەی ساڵی ٥٦٩ك/ ١١٧١ز، ٥٧٠ك/ ١١٧٣ز، ٥٧٢ك/ ١١٧٦ز، قەومان، بتوانێ وڵاتەکە بپارێزێو بەر لە دوژمن بگرێ، ئەوانەی ناوەوەش سەرکوت بکات. (أبوشامە) دەڵێ: "سەلاحەددین، کە دواجار میسری بەجێهیشت و لە مانگی (موحەڕڕەمی ٥٧٨ك/ مایسی ١١٨٢ز) دا گەڕایەوە بۆ شام، نیوەی لەشکرەکەی لەگەڵ خۆی هێناو نیوەکەی تری بۆ پاراستنی بەندەرەکانی میسر جێهێشت".[٣٣١]**

---

323 ـ الکامل، ٤١٢/١١. مفرج الکروب، ١١/٢. النویری، کتاب الألمام بالأعلام فیما جرت به الأحکام، مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانیة، حیدرآباد، الدکن، الهند ١٩٦٨. ج١، ص١٦٣ـ١٦٥.

324 ـ الکامل، ٤١٤/١١. النوادر، ٤٧ـ ٤٨. وفیات الأعیان، ١٦٥/٧. مفرج الکروب، ١٦/٢ـ ١٧. الخطط (طبعة المعهد) ج٣، ق٢، ص٢٨٤.

325 ـ سنا البرق، ٢٥٧/١ـ ٢٦٠. الکامل، ٤٤٢/١١ ـ ٤٤٣. مفرج الکروب، ٦٠. الروضتین، ج١، ق٢، ص٦٩٩ـ ٧٠٣. الذهبي ، العبر، ٢١٦/٤.

326 ـ أخباز: بەو پارچە زەویو زارانە دەگوترا کە دەدرا بە گەورەناوداران، بنۆڕە: السلوك، ٨٥/١. النوادر ٢٤٥. بولیاك: الأقطاعیة في مصر وسوریا، منشورات دار الکشوف، بیروت طبعة الثانیة ١٩٤٨، ص٥٩.

327 ـ السلوك، ٦٥/١.

328 ـ ئالێرەدا فەرقو جیاوازیی نیوان سوارچاكو (الطواشي)مان بۆ دەردەکەوێ.

329 ـ الخطط، (طبعة المعهد) ج٢، ق١، ص١٦.

330 ـ هەمان سەرچاوەو دوو لاپەڕەکە.

331 ـ الروضتین، ٢٧/٢.

**لە هەڵمەتی یەکەمی سەر شامیدا، لە سەربازانی میسر تەنیا یەك کەتیبەی[332] حەوت سەد سوارەیی[333] لەگەڵ خۆیدا برد.**

**سەلاحەددین دەشیزانی کە ئەو هێزە کەمەو بەشی ئەوە ناکا شامی پێداگیر بکا، وەلێ ئەم هەڵمەتەی بەلای ئەوەوە تەنیا بۆ ئەوەبوو بگەڕێتەوە بۆ ولاتێ، کە ئەوە شەش ساڵە لێی دابڕاوەو خۆیو مامو باوكو خێزانی لەوێ گەورە بوونە. هەرکە گەیشتیشە دیمەشق، یەکسەر چووە خانووەکەی باوکی، کە خانووی (العقیقي)[334] یان پێدەگوت، بەگەیشتنیشی شاری دیمەشق سەرلەبەری کردیان بە ئاهەنگو شایی.**

**ئەمەش مانای ئەوەیە کە سەلاحەددین سەرپاکی لەشکرەکەی لەمیسر هێشتەوە، تەنیا ئەو هێزە کەمە نەبێ کە لەگەڵ خۆی بردبووی، لەگەڵ ئەوەشدا کە میسر تازە لەو ڕووداوە سەختو گرانانە دەرباز بوو بوو، کە لە ماوەی لە ساڵێك کەمتردا (نیوەی دووەمی ساڵی ٥٦٩ك و بەرایی ساڵی ٥٧٠ك/ ١١٧١ز) بەسەری هاتو هەندەی نەمابوو، حوکمی ئەیییوبیان لەگەڵ خۆیدا ڕاماڵێ. ڕووداوە یەك لەسەر یەکەکانی لەو ماوەیەدا ڕوویاندا: پیلانکارییەکەی (مؤامرة) عمارة الیمني و هاوڕێکانی[335] و دابەزینی خاچدروشمان لە شاری ئەسکەندەرییە[336] و شۆڕشەکەی (الکنز) لە (الصعید)[337]، ئەمە لە کاتێکدا بوون، کە سەلاحەددین پێش ئەم ڕووداوانە بەشێ لە هێزەکانی کردبووە سەر ولاتی یەمەن (ڕەجەبی ساڵی ٥٦٩ك)، سەرباری ئەوانە، نوورەددین مەحمودیش لە (شەوالی ساڵی ٥٦٩ك/ ١١٧٤ز) مردو کۆمەکە سەربازییەکانی بۆ میسر بردراو نەمان، هەرچەندیشە لە دوا سێ ساڵەی تەمەنیدا، لەگەڵ سەلاحەددین لێکتر کەوتبوونە گومانو دڵەڕاوکێ.[338]**

**بە بۆنەی سەرکەوتنەکانی سەلاحەددین لە دوای (حطین) ٥٨٣ك/ ١١٨٧ز، ئەوەبوو سەلاحەددین بانگهێشتی سەرلەبەری سوپای میسری کردو داوای لە (الملك العادل)ی برای کرد، بەخۆیو (بەو لەشکرەی کە لە میسر ماوەتەوە) بەڕێبکەونو بگەنە سەرناوچەکانی فەرەنگو گەمارۆیان بدەن.[339] کاتێکیش ئەمەی کرد، کە زانی بارودۆخی دەرەوەو ناوەوەی میسر ئارامەو ترسی لەسەر نییە.**

**سەلاحەددین ئەوەبوو دوای ئەوەی گەیشتە ولاتی شام، کەوتە نزیککردنەوەی لەشکرەکەی نورەددینو، دۆستایەتی لەگەڵیاندا سازداو ڕایکێشان بۆ لای خۆیو لە هەموو شارەکانی دیمەشقو حەڵەبو حەمماو شارەکانی دیکەشدا کە داگیری کردن، سەربازەکانی نورەددینی لە دەوری خۆی خڕکردنەوەو لەشکری ولاتی لێدروست کردنو لە هەموو هەنگاوێکیدا دەستەو نەزری بوون. هەرچی ئەو کەتیبە میسرییەشە کە لەگەڵ خۆی هێنابوونی، هەموویانی ناردەوە بۆ میسر تا لەوێ بحەسێنەوە، چونکە بۆ ئەو کاتە هیچ پێویستی پێیان نەمابوو.[340]**

**ئیتر لای سەلاحەددین ئاسایی بوو کەینێ بە پێویستی بزانێ بنێرێ هەندێ چەکدارو سەربازی لە میسرەوە بۆ بێ و**

---

[332] ـ سەرچاوەکان دەڵێن: سەلاحەددین (جریدە)یەکی لەتەك خۆیا برد ، واتا (کەمترینی لەشکرەکەی). بنۆرە: الثعالبي، فقە اللغة وسر العربیة مطبعة الأستقامة، القاهرە ١٩٥٩، ص٣٢٩. یەك کەتیبەش ئەکا (١٠٠ـ ١٠٠٠) سەرباز، بنۆرە: النویری، نهایة الأرب، ط، القاهرة ١٩٥٤، ١٨٩/٦.

[333] ـ الکامل، ٤١٦/١١. زبدة الحلب، ١٩/٣. مفرج الکروب، ١٩/٢. ابو الفداء، المختصر، ٧٦/٥. السلوك ٥٨/١ـ ٥٩. شفاء القلوب، ٨٤.

[334] ـ بنۆڕە سەرچاوەکانی پێشتر، هەروەها النوادر،٥٠. سنا البرق، ١٧٦ـ ١٧٧. الروضتین، ج١، ق٢، ص٦٠٢ـ ٦٠٥. ابن العبري، تاریخ المختصر الدولة، المطبعة الکاثولیکیة، بیروت ١٩٥٨، ط/٢، ص٢١٦. البدایة والنهایة، ٢٨٨/١٢. شذرات الذهب، ٢٣٦/٤.

[335] ـ سنا البرق، ١٤٧/١ـ ١٤٩. الکامل ٣٩٨/١١ـ ٤٠٠. مفرج الکروب ، ٢٤٣/١ـ ٢٤٥. السلوك، ٥٣/١ـ ٥٤.

[336] ـ سنا البرق، ١٦٩/١، ١٧٠. الکامل، ٤١٢/١١ـ ٤٤٤. النوادر، ٤٨ـ ٤٩. مفرج الکروب، ١١/٢ـ ١٦، الألمام ١٦٣/١ـ ١٦٩. السلوك، ٥٥/١ـ٥٧.

[337] ـ الکامل، ٤١٤/١١، النوادر، ٤٧ـ ٤٨. وفیات الأعیان ١٦٥/٧.

[338] الکامل، ٣٧١/١١، ٣٩٢. الباهر، ١٥٨. مفرج الکروب، ٢٢١/١. الروضتین، ج١، ق٢، ص٥١٨.

[339] ـ الکامل، ٥٤٠/١١.

[340] ـ ن، م، ٤٣٥/١١.

**کەینێ ئیشی پێیان نەما فەرمان بدا بگەڕێنەوە بۆ میسرو ئەم هێنانو ناردنەوەیەش چەند جاران ڕوویداوە[341].**

**واتا ئەگەر سەرنجی بدەینێ بۆمان دەردەکەوێ کە سەلاحەددین خاوەنی دوو سوپا بووە" سوپایەکی وەك یەدەگ لە میسر هەبووە، کەینێ زۆری پێویست پێبووبێ، هێناونی بۆ هاوکاریی لەشکری شامو ئەگەر پێویستیش نەبووبێ، یان میسر مەترسیی دەرەکی لەسەر بووبێ، ئەوە لە میسر دەمانەوە. ئەم هێزەی میسر، هەر لەو هێزەوە پەرەی سەند کە کاتی خۆی لەژێر فەرماندەیی شێرکۆدا لەلایەن نورەددینەوە نێردرا بۆ میسر، کە هەشت هەزار سوارەو هەزاران پیادەی هەبوو، پاشانیش کۆمەڵانی دیکە چوونە ژێر ئاڵای ئەو لەشکرەو بەرەبەرە زیادی کرد، تا بوو بە دوو ئەوەندە، وەك دیتمان.**

**هێزەکەی تری، ئەوەی شام بوو، کە یەکسەر بەدەست خۆیەوە بوو، لە هەموو جموجوولێکیدا دوی دەکەوتن، ئەم هێزە بارەگای لە دیمەشق بوو، سەربازەکانی، زۆرتر سەربازانی سوپاکەی نورەددین مەحمود بوون، تەنیا حەڵەبی لێدەرچێ، کە نەخرایە سەر دەوڵەتی سەلاحەددین، تا مردنی سەرگەورەی حەڵەب (الملك الصالح أسماعيل بن نوورەدین مەحمود)، دووساڵیش بەسەردا تێپەڕی ئنجا حەڵەب کەوتە سەر دەوڵەتەکەی سەلاحەددین. واتا لە (موحەڕرەمی ساڵی ٥٧٩ك/ مایسی ساڵی ١١٨٣ز) ئەم (الصالح)ە، دوای مردنی باوکی بەزۆری یەکێ لە میرەکانی ژێر دەستی باوکی بە ناوی (کمشتکین). ئەم میرە، شاری حەڵەبیشو میر منداڵی کوڕی ئاغاکەیشی خستبووە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.[342]**

**سەلاحەددین، ئیدی هەر شارێکی بخستبایە سەر دەوڵەتەکەی، لەشکری ئەو شارەی دەکردە لەشکری خۆی، شارەکەشی دادەبڕی بۆ حوکمی یەکێ لە خزمەکانی، یان بۆ میرێ لە میرەکانی خۆی، تەنیا ئەو شارانە نەبێ کە کەوتبوونە دەرەوەی وڵاتی شام، نەخاسمە وڵاتی جزیرێ، بە نموونە، وەك شاری ئامەد، هەروەها ئەربیلو شنگارو (جریرەی ابن عمر) وموسڵ. ئەم شارانەی هەریەکەو بەدەست سەرگەورەی شارەکەوە هێشتەوە. ڕەنگیشە لەبەرئەوە بووبێ، کە لە سەرگەورەکانیان دڵنیابووبێ، چونکە دۆستیشی بوونو لەنەتەوەکەی خۆشی بوون. لە هەمووشی گرنگتر، خەڵکەکانیان کوردنو لێیان دڵنیاو پشت ئەستوور بووە. تەنیا شاری موسڵ تەریك مایەوە، چونکە سەرگەورەکانیان ملیان نەداو تاماوەیەکیش کەوتنە دوژمنایەتی سەلاحەددین. وەلێ سەلاحەددین شەرتوشروتی لەگەڵ ئەم شارانە ئەوەبوو، کە بۆ کاتی پێویست، بۆ غەزا ئامادەبن. قایل بوونی شاری حەلەبو پاشانیش شاری موسڵ دوای کۆششو ماندووبونێکی بێوچانو گەمارۆی شار، ئنجا هاتەدی، شاری حەڵەب بە مەرجێ هاتە ژێر ئاڵای سەلاحەددینەوە کە سەرگەورەی شار (عماد الدين زنگی بن قطب الدين مودود) لە جیاتی حەڵەب، شاری شەنگالو دەوروبەری شارەکە وەربگرێ.[343]**

**شاری موسڵ هەرچەندیشە سوپاکەی لە مەیدانی شەڕدا هەموو جارێ دەشکانو هەڵدەهاتن، بەڵام شارەکە، بەرامبەر بە سێ جار گەمارۆ وەستانو لە بەربەرەکانێو ڕکابەری سەلاحەددین بەردەوام بوون.[344]**

**سەرگەورەی شاری موسڵ، دانەدەما، هەرچی لەدەستی بهاتایە دەیکرد، تەنانەت کۆمەکی لە خاچدروشمانیش وەردەگرت. نەك هەر ئەوە، تایەفەی ئیسماعیلییەکانیش کە دوژمنی سەلاحەددین بوون، ئەوانیش پشتیان گرتبوو، بەهەرحاڵ، سەرەنجام موسڵیش بە پێی ڕێکەوتننامەیەك کە لە نێوان هەردوولادا لە ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)[345]دا بەسترا، چووە ژێر ئاڵای سەلاحەددینەوە. بەو جۆرە لەشکری موسڵ، ئیدی لەو ڕۆژەوە لە ژێر فەرماندەیی سەلاحەددیندا**

---

[341] ـ ك، م، ١١/٥٤٠، ٤٣٥، مرآة الزمان، ٣٣٣/٨، ٤١٥. الروضتين، ٨/٢، ٢٧. زبدة الحلب، ٢٦/٣. السلوك، ٦١/١.

[342] ـ (الملك الصالح) کاتێ کە باوکی مرد، ئەو منداڵێکی یازدە ساڵان بوو.

[343] ـ النوادر، ٥٩. الكامل، ٤٩٦/١١ـ ٤٩٧. مرآة الزمان، ٣٧٥/٨. زبدة الحلب، ٦٦/٣. الروضتين، ٤٢/٢.

[344] ـ لە بارەی گەمارۆی یەکەمی موسڵەوە، ساڵی، ٥٧٨/ ١١٨٧ز، بنۆڕە: النوادر، ٥٧. الكامل، ٤٨٥/١١. گەمارۆی دووەم ٥٨١ك/ ١١٨٥ز. الكامل، ٥١٥/١١. مفرج الكروب، ١٦٧/٢. گەمارۆی سێیەم، ٥٨١ك/ ١١٨٥ز، بنۆڕە : مفرج الكروب، ١٧٠/٢. هەروەها بنۆڕە: د. رشيد الجميلي، دولة الأتابكية فى الموصل بعد عماد الدين زنكي، طبعة دار النهضة ، بيروت ١٩٧٠، ص١٣٨ـ ١٦٠.

[345] ـ لەبارەی پێکهاتنەکەوە بنۆڕە: النوادر، ٧٠.الكامل، ٥١٧/١١. الروضتين، ٦٤/٢. زبدة الحلب، ٨٣/٣.

دەجەنگاو سەرگەورەی موسڵ قەڵغان و چەك و نەوتی سپیی[346] بە لەشکری سەلاحەددین دەدا.

هێزی موسڵ لە هێزی هەموو شارەکانی دیکەی ناوچەکە گرنگترو گەورەتر بوو، جگە لەوەی شوورەی شارەکەش تا بڵێی سەخت و قایم بوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە خۆی لەبەردەمی هەڵمەتەکانی سوپای سەلاحەددیندا ڕادەگرت و نەدەشکا.

موسڵ تەنیا میرنشینێکە، سەرچاوەکان بە پوختی باسی قەوارەی لەشکرەکەیان کردبێ، ئەو باسی قەوارەی لەشکرەش بە بۆنەیەکی زۆر سەیرەوە هاتە دەست، ئەوەبوو کە (ابن الأثیر)ی مێژوونووسی ناوداری شاری موسڵ ناچار بوو سەرژمێرییەکی ورد لە لەشکری موسڵدا بکات، بۆ بەدرۆخستنەوەی (العماد الکاتب)، مێژوونووسی بەرەی سەلاحەددین، کە باسی سەرکەوتنی سەلاحەددینی کردووە بەسەر لەشکری (سیف الدین غازي) و فەرماندار (عزالدین زلفندار)، لەشەڕی (تل السلطان) دا کە لە (١٠)ی شوالی ساڵی (٥٧١ك/ ١١٧٦ز)دا لەسەر ڕێگای (حماه). یەك قۆناغەڕێ دوور لەشاری حەڵەبەوە ڕووی دابوو. (العماد) گوتی: "هەواڵمان بەدەست گەیشت، کە ئەوان. مەبەستی لە سوپای موسڵ و حەڵەبە. بێجگە لەسەربازی ڕەشۆکی، بیست هەزار سوارەن، لە پشتیشەوە، خاروبارو کۆمەکی زۆریان لەگەڵە، بەڵێنی بەهانا هاتنی فەرەنگیشیان پێدراوە، ڕۆژ بە ڕۆژیش هێزو سامیان ڕوو لە زیادییە، ئێمەش تەنیا شەش هەزار سوارەمان خڕکردوەتەوە"[347].

لێرەدا، (ابن الأثیر) ڕاپەڕی و بە پێویستی زانی بەرپەرچی قسەکانی (العماد) بداتەوەو گوتی: "العماد الکاتب، لە کتێبی (البرق الشامي)ی خۆیدا، گوتوویەتی.. لەشکری (سیف الدین) لەم شەڕەدا، بیست هەزار سوارەی هەبوون، وەهاش نەبووەو ڕاست ناکا، بەڵکو، یەقینم لە شەش هەزار زیاتر بووەو، زیاترەکەش نەگەیشتوەتە پێنج سەد، من خۆم لیستی نمایشەکەم دیوەو لە ڕیزکردنی بەرەو قۆڵی ڕاست و قۆڵی چەپ و بەرسنگی لەشکرو پێشەنگەکانی دڵنیام.[348] سەرپەرشت و نووسەرەکەشی (مجد الدین ابا السعادات المبارك)ەو، (العماد)یش تەنیا مەبەستی ئەوەیە هەڤاڵەکەی خۆی هەڵکێشێ. مەبەستی لە سەلاحەددینە،. دەیەوێ بڵێ، سەلاحەددین بە شەش هەزار سوارەوە، بیست هەزار سواری ڕاوناوە، هەقوایە، هەقیانەت بگوترێ، بەلام، باشە، من نازانم، موسڵ تادەگەیتە ڕووباری فوراتیش بۆچی بۆ خۆی چەندە، تا بیست هەزار سوارەی هەبێ؟[349]

ئێمە مەبەستمان لەم داکۆکی کردنەی (ابن الأثیر) کە لە هەلاتن و دوڕاندنی ئەتابەکی موسڵی دەکا، ئەو زانیارییەیەکە لەبارەی لەشکری موسڵەوە بۆمانی ڕەخساندووە، ئەویش ئەوەیە کە لەشکری موسڵ، شەش هەزار سوارەو نزیکەی پێنجسەد سوارێ دەبوون، بێگومان، لەشکرێ وەك لەشکری موسڵی ئەو زەمەن و سەردەمە، ئەمە ژمارەی بووبێ، لەشکرێکی مەزن و کۆك بووە، نەخاسمە لە چاو سوپاکەی سەلاحەددیندا کە لەشکری شام و بەشێکیش لە لەشکری سوارەی میسری لەگەڵدا بووە.[350]

خۆ ئەگەر بێت و لەگەڵ لەشکرەکەی شەڕی (حطین)ی سەلاحەددینیشدا بەراوردی بکەین، ئەوە بۆمان دەردەکەوێ، لە دوو هێندەی لەشکرەکەی موسڵ پتر نەبووە.

جا، بەو جۆرە، دەتوانین تا ڕاددەیەك، لەشکری باقیمەنی میرنشینەکانی دیکەی ناوچەکە، بە پێودانگی لەشکرەکەی

---

346 ـ الفتح القسي، ٣٥٠. الروضتین، ١٤٨/٢.

347 ـ سنا البرق، ٢٠٠/١ـ ٢٠١. مرآة الزمان، ٣٣٣/٨، الروضتین، ج١، ق٢، ص٦٥٠، ٦٥١. نقلا عن البرق الشامي، مفرج الكروب، ٣٨/٢ـ ٣٩.

348 ـ "وشەی (پێشەنگ) لەم وەرگێڕانەدابۆ (الجالیش)ی عەرەبی دانراوە، مانای (الجالیش) ئەسڵەکەی، واتا ئالای گەورەو نووکەکەی باقەنەیێ (گورزەیی) مووی پێوەیە، پاشان کرا بەناوی پێشەنگی بەرسنگی لەشکر، یان ڕابەری لەشکر"، صبح الأعشی، ٨/٤.

349 ـ الكامل، ٤٢٩/١١. مفرج الكروب، ٣٢/٢.

350 ـ (سەلاحەددین داوای هێزیکی میسریی کرد، تازە گەیشتبوونە نەبەردی شەڕەکە) النوادر، ٥٢، الروضتین، ج١، ق٢، ص٦٥٠، مفرج الكروب ٣٢/٢.

میرنشینی موسڵ بخەمڵێنن، کە موسڵ گەورەترو بەهێزترین میرنشینەکانی ئەو سەردەمە بووە.[351]

پێموایە گەورەترین قەوارەی سوپای ئەییوبییەکان لە حاڵەتی جەنگدا، ئەو قەوارەیە بوو کە لە کاتی شەڕەکەی (حطین)دا بوویەتی.

هەندێ لە مێژوونووسانی هاوچەرخ و کەسانی دیش، باسی ژمارەی سوپاکەی سەلاحەددین دەکەن. (ابن الأثیر) دەڵێ: "هاوکاران و سەربازان، کۆمەڵ دوای کۆمەڵ دەهاتن، سەلاحەددین لەگەڵیاندا کۆبووەوەو هەموویان پێکەوە ڕۆیشتن لەشکر لە مەیداندا خۆی دەرخست و سەرژمێرکران، سەرەنجام، جگە لە سەربازانی تەوعی، ئەوانەی سەر بە دەرەبەگی سەربازی و مووچەخۆرانی میری گەیشتنە دوازدە هەزار سوارە.[352] کەچی، (العماد الکاتب) لە (الفتح القدسی)دا، ژمارەی سەربازانی سەلاحەددینی نەنووسیوە، تەنیا ئەوەندە نەبێ، کە گوتویەتی: "لەشکری لەو لەشکرە تۆکمەترو گەورەتری نەدیوە"،[353] بەڵام لە (البرق الشامي)یەکەی خۆیدا نووسیوویەتی، کە (ابو شامة) لێی وەرگرتووە، (الذهبي) ژمارەی جەنگاوەرانی ئەییوبییەکانی بە هەشتا هەزار سوارەو پیادەی خەملاندووە.[354]

(رنسیمان) دەڵێ: "ئەوەی (عماد الدین) لە (البرق)دا نووسیویەتی، لەگەڵ مێژوونووسانی دیکەشدا، کە گوایا سوپای ئەییوبییەکان لە دوازدە هەزار سوارەو ژمارییێکی زۆری لە سەربازی تەوعی پێکهاتووە، ئەو قسەیە لە ڕاستی بەدەرەو زۆری وەسەرخراوە.... خۆئەگەر (العماد) وادابنێین کەمێکیشی وەسەرخستبێ، هێشتا ناگاتە خەملاندنەکەی سوپای مەسیحییەکان، کە ئەو گەیاندبوویە پەنجا هەزار.[355] بەڵام (رنسیمان) هەر زوو بە زوو خۆی بە درۆ دەخاتەوەو ئەو قسەیەی نەختێ لەمەوپێش کردی بە ڕاستی دادەنێ و دەڵێ: "دەشێ وەها دابنێین لەشکری فەرمیی سەلاحەددین گەیشتبێتە دوازدە هەزار زەلام، بەڵام ئەو زیادبوونەی لەوەوە هاتووە کە سەربازگەلی تەوعی بە زۆری چوونە پاڵ لەشکرەکەی سەلاحەددین و دۆستەکانیشی گەلێ کەتیبەیان بۆ نارد، بەو جۆرە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی هەژدە هەزار زەلام".[356]

---

[351] - "جب" لەشکری دیمەشق بەهەزار سەربازو هی حەلەبیش بە هەزار سەربازو هی حمص بە پێنج سەد سەرباز دەخەمڵێنێ". صلاح الدین ١٦٥-١٦٦.

[352] - الکامل، ٥٣١/١١. زبدة الحلب، ٩٢/٣. الروضتین، ٧٦/٢. مفرج الکروب، ١٨٧/٢. السلوك، ٩٣/١. البدایة والنهایة، ٣٢٠/١٢. الذهبي، تأریخ الأسلام، مخطوط مصور في مكتبة الدراسات العلیا: "واتا دەستنووسێکە لە کتێبخانەی خوێندنی باڵا". بەشی (١)، ژمارە (١٦٥٩) کاغەزی (٧).

[353] - الفتح القسي، ص٦٤.

[354] - الذهبي، مخطوط، ن، و.

[355] - رنسیمان، تاریخ الحروب الصلیبیة، ٧٩٨/٢.

[356] - رنسیمان، ٧٩٩/٢.

## کەرتی دووەم

## سیستەم و ڕێکخراوەکانی سوپای ئەییوبیان

١ـ دیمەشق: مۆڵگەی سوپای ئەییوبییەکان

٢ـ دیوانی سوپا

٣ـ جل وبەرگی سەربازەکان.

٤ـ ئازووقەو خاروبار.

٥ـ دەرەبەگی لەشکرسازی.

٦ـ تەیارو ئامادەباشیی سەربازیی ( لەشکرکێشی ):

أـ سیستەمی پێنج هێزەکی.

ب. ئەڵقەی تایبەت و مەملوکەکانی سوڵتان.

٧ـ لقەکان و جوونەکانی سوپا، هەر جوونەو بە پێی چەکی خۆی.

أ. جوونی ( سنفی ) سوارە.

ب. جوونی پیادە.

ج. جوونی دیکە.

٨ـ سەربازانی حەزەکی ( تەوعی ) لە سوپای ئەییوبیدا.

٩ـ تیپەکانی وەل سوپا ( الملحقة بالجیش ):

أ. تیپی ئەندازیاری.

ب. تیپی پزیشکیی.

ج. تیپی مۆسیقای سەربازی.

د. ئالاَ بەدەستانی سوپا.

**١ـ دیمەشق: مۆڵگەی سوپای ئەییوبییەکان:**

وڵاتی شام بوو بووە مۆڵگەی بەگژداچوونەوەی خاچدروشمان لەلایەن موسوڵمانانەوە، بەتایبەتییش لە سەردەمی نوورەددین مەحموددا، کە لە ساڵی (٥٤٩ك/١١٥٤ز)دا دیمەشقی لە حوکمی (مجیرالدین أبق کوڕی محمد کوڕی بوری کوڕی طغتکین أتابك) ڕزگارکردو خۆی جێگای گرتەوە[٣٥٧].

کاتێکیش سەلاحەددین لە ساڵ (٥٧٠ك/١١٧٤ز)دا، بەرەو شام کشا، دیمەشقی کرد بە مۆڵگەی حوکمی ئەییوبییەکان. بێگومان نزیکیی ئەم شارە لە ناوچە، خاچدروشم داگیرکەردەکانو پتەویو قایمی شوورەکەیو فەراهەمی مایەی ژیاریو گوزەرانو خۆشیی ئاوهەواکەی، ئەم خەسڵەتانەی ئەم شارە، وای لە سەلاحەددین کرد کە بیکا بە مۆڵگەی لە شکرەکەیو لەوە باشتری دەستنەدەکەوت کە لەوێوە، بەرەی موسوڵمانان یەکبخاو دەستبکا بە سەندنەوەی هەرێمە داگیرکراوەکانی عەرەب. هەرچی شاری حەڵەبە، ئەوە لە خاچدروشمانەوە دوور بووە، ماوەیەکیش بەدەست میرەکانی نورەددینەوە مابەوە، تا ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٣ز).

ئیدی سوپاو لەشکری ئەییوبی، لە دیمەشقەوە، هێرش لە دوای هێرشیان دەکردە سەر دوژمنو چەندین جار پەلاماری قەڵای قایمکاری (الكرك)یان داو لە ساڵی(٥٨٣. ٥٨٤ك)دا هێرشیان بردە سەر (طبرية)و (حطين)، هەروەها بۆ باکووریش بەرەو (أنطاكية)و دەوروبەری بەرەو ژوور کشان، بەرەو باشووریش خۆیان گەیاندە (صفدو کوکبو بیسان)[٣٥٨]و جێگایانی دیکەش. سەلاحەددین، هەموو جارێکیش پاش تەواو بوونی ئەو جەنگانەی، هێزەکانی دەکشانەوە بۆ دیمەشق.[٣٥٩] جاری وەهاش بووە، هەموو لەشکرو سەربازەکانی، وەکو ئەوەی ساڵی (٥٨٠ك /١١٨٤ز)[٣٦٠]و ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز)، هەمووی لە شاری دیمەشق خڕ دەبوونەوە. ئەمەش مانای وایە، سەرپەرشتانی سوپای ئەییوبی لەشکرگای گەورە گەورەیان، بۆ حەوانەوەی لەشکری گەورە لە دیمەشق دەستەبەرو فەراهەم کردووە، خۆراك و جێگای حەسانەوەشیان بۆ ئەو هەموو سەربازەو بۆ وڵاخەکانیشیان دابین کردووە. ڕاستیشت دەوێ پێیان دەگوت لە شکرگای (الجابية) لەسەر زەوییەکی بەرفراوانی نزیك دیمەشق بنیادنرا بوو.[٣٦١] کە ئیسلامیش سەری هەڵداو، غەزایان گەیشتە ئەم ناوە، کردیان بەو لەشکرگایە مەزنە، ئاوو هەوای (الجابية) هەند خۆشو لە بار بوو، کردبوویان بە جێگەی شفاو گوڕپێدانەوەی سەربازان.[٣٦٢]

جگە لەوە، دوو گۆڕەپانی بەرفراوانیشی تێدا بوو، بۆ مەشق کردنو وەرزش، فەرماندەکان هەندێکیان، بە نموونە، وەك نورەددین مەحمود و سەلاحەددینو کەسانی دیکەش دەیانکرد. (ابن جبیر) لە سەردەمی سەلاحەددین، کە هاتە دیمەشق، دەڵێ: "ئەم دوو گۆڕەپانە کەوتوونەتە دەرەوەی شار، بەلای ڕۆژئاوادا، هەند کەسكو جوانن، هەر دەڵێی بە ئەتڵەسی سەوز داپۆشراون... ڕووبارەکەش بەنێوانیاندا دەڕوا، سوڵتان دەچێتە ئەو یاریگایانەو بە گۆپاڵی گۆڵف[٣٦٣] قاشوانانێ دەکا. هەموو شەوێکیش کوڕەکانی سوڵتان دەچنە ئەوێ‌و بە تیراندازیو وازیو ئەم یاریی گۆپاڵ‌و گۆڵفەوە،

---

[357] الكامل، ١١/١٩٧.

[358] لەم ڕووەوە، جان سۆفا جیە دەڵێ: ئەتابەکی سەلجوقیەکان و، ئەییوبییەکانیش، دیمەشقیان کردبوو بە پێگەیەکی جەنگی. بنۆڕە: کتێبەکەی خۆی دمشق الشام، المطبعة الكاثولكية، بيروت ١٩٣٦،ص ٣٤.

[359] هەر بە نموونە بنۆڕە : الكامل ٤٥٢/١١، ٠٦/١٢، زبده الحلب، ج٣ الصفحات ٩–٢١، ٢٦، ٢٧، ٥٥، ٥٦، ٧٢، ٧٣، ٧٤، ٧٩، ٨٤. ٩٠١، ١٠١، ١٠٨ ابوالفداء/ المختصر/ ج٥ ص ٨٧، ٩٠، ٩١، ٩٨.

[360] محمد بن تقي الدين عمر الأيوبي، مضار الحقائق و سرالخلائق ، مطبعة عالم الكتب، قاهيرة ١٩٦٨، ص١٨٨، السلوك، ١، ٨٤–

[361] معجم البلدان، ٣/٩١.

[362] دائرة المعارف الاسلامية، ط/١٩٣٣، ج٦، ص٢٣٣، لە بارەی گرنگیی (الجابيه) وە ،بنۆرە: الكامل،٢/٥٠٠–٥٠١، ٥٣٥

[363] (الصولجان): گۆپاڵێکی سەر چەماوەیە، واتا یاریی گۆڵف GOLF، (بە کوردی: قاشوانانێ).

دەبیەنە سەر[٣٦٤]. کێبڕکێیەکی دیکەیان دەکرد، پێی دەگوترا (القبق)، تێڵایەکیان دەچەقاند، نیشانەیەکیان بە نووکی تێڵاکەوە دەنایەوە، دەبوایە، سوار لە گەرمەی غاردا بە تیر بیپێکێ، نورەددین مەحمود، خۆی، زۆر حەزی لەم یارییە دەکرد[٣٦٥]. هەرچی گۆڕەپانی دووەمە، ئەوەیان کەوتبووە باشووری دیمەشق، زەویەکەی زیخەڵ بوو، پێی دەگوترا گۆڕەپانی (الحصی)[٣٦٦]. قەڵایەکەی دیمەشق زەقترین‌و دیارترین شوێنی بەرچاوی سەربازیی‌و ئیداریی ئەم شارە بووە. هەموو قەڵەمڕەوی میری تێدابوو، کۆگای چەك (الزردخاناه)و بەندیخانەو (بیت المال)، واتا دایەرەی دارایی لەوێ بووە.[٣٦٧] دیمەشق بوو بوو بە داڵدەی توانای شەڕنەماوەکان، بوودەڵەگەل‌و بێدەسەڵاتانی جەنگ، کە لەگەڵ ئەو لەشکرانە لەجێگە دوورەکانەوە دەگەڕانەوە، دەهاتنە دیمەشق.

دیمەشق کۆگای چەك‌و زەخیرەی یەدەگیشی تێدا بووە[٣٦٨]، بوو بوو بە داڵدەی دیلی فەڕەنگ، ئەو دیلە فەڕەنگانەی، زۆرتر لە جێگا نزیکەکانەوە دەکەوتنە دەستی[٣٦٩] موسوڵمانان، دەهێنران بۆ دیمەشق‌و لێرەوە بە ئاسانی لەگەڵ دیلە موسوڵمانەکانی ژێر دەستی فەڕەنگدا ئاڵوگۆڕ دەکران.

**٢- دیوانی سوپا:**

ئەم دیوانە بەرپرسی کاروباری تایبەتی سوپا بووە، کەسێکیان لە سەر دادەنا کەبەتەواوەتی شارەزایی لە ئیش‌و کاری ئەم دەزگایەدا بوو بێ، مەرجیش ئەوە بوو ئیسلام بێ‌و پلەیەکی پیرۆزو پێگەیەکی بەرزی هەبێ. ٣٧٠ ئەم دیوانە لە جیاتی وەزارەتی بەرگری ئەم سەردەمەی خۆمان بووە. سەرۆکەکەشی بەرپرسێکی شارەزای ئەحواڵی سەربازانی دادەمەزراند، کەهەر کاروبارێکی، وەك بۆ دەوام هاتنیان‌و نەهاتنیان‌و باری تەندروستی‌و مردنیشیانی تۆمار دەکرد. ٣٧١ زۆرتریش پێدەچێ دوو دیوان هەبوو بن. یەکێکیان بۆ میصرو، ئەوی دیکەیان بۆ شام، وەلێ نازانین سەرۆکی ئەم دیوانەی شام کێ بوو بێ؟ بەڵام سەرۆکی ئەوەی میصر (المهذب بن ابي المليح مماتي) بووە،. ئەم (مماتي)یە لە دوادوای سەردەمی فاتمییەکاندا ئەو سەرۆکایەتیەی گرتە دەست‌و لە بەرایی سەردەمی سەلاحەددینیشدا لەسەر ئەم ئیشەی مایەوە.، وەلێ "بە پێی قسەی (ياقوت الحموي)"، ئەگەر لای سەلاحەددین، خۆی، یان لای (اسدالدين شيركۆ) بۆیان تێچاند، کابراش نەسرانی بوو "ترسی لێنیشت، ڕۆژێکیان، منداڵەکانی خڕکردنەوەو بەخاوو خێزانەوە خۆیان گەیاندە لای سوڵتان‌و، لەسەر دەستی سوڵتاندا بوون بە ئیسلام، سوڵتان، لێی قبوڵ کردن‌و، یارمەتییەکی چاکیشی دان‌و دەسەڵاتیشیانی زیاتر کرد"، [٣٧٢]هەر لە سەر ئەو ئیشەی مایەوە تا لە ساڵی (٥٧٧ك/١١٨١ز)دا مرد. پاش ئەو، (الاسعدی)ی کوڕی، دیوانی کەوتە دەست. (الأسعد) کتێبی "قوانين الدواوين"ی تەصنیف کردووە. بۆ

---

[364] مرحلة ابن جبير، ص ٢٦١.

[365] الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٧٩. یاری (العقيق) جۆرە مەشقێکی تیرئەندازەییە یارییەکی رمبازییە، تێڵایەکی داری درێژیان دەهێناو دەیانچەقاند، نووکەکەی (قرعە)ی پێوە بوو، ئەمەش مانای ئەسڵی (قبق) دەگەیەنێ بە تورکی، لە جیاتی نیشانە. کۆترێکیشیان تێدا دادەنا، ئەوجا سوارەکان بەتاو دەهاتن و تیریان لە قبق (القرعة) دەگرت، براوەش ئەو سوارەیە بوو کە کۆترەکەی هەڵدەفڕاند، جاری وەهاش دەبوو، لە جیاتی (القرعة) کە–واتە لە جیاتی نیشانەکە، تەلأشی تەختەیان دادەنا، پەراوێزی (٢)، الروضتين.

[366] محمد ياسين الحموي، ديمشق في العصر الايوبي، المطبعة الهاشمية، دمشق ١٩٤٦، ص٥٩، جان سۆفاجیه، دمشق، الشام ص٣٥.

[367] الحموي، ن، م، ص.

[368] الكامل، ١١/ ٤٧٨.

[369] مضار الحقائق، ص ٢٩.

[370] صبح الاعشى، ٣ /٤٨٨.

[371] ن. م. ص.

[372] معجم الادباء، ٦/ ١٠٨. العماد الكاتب الاصفهاني/ خريدة القصير و جريدة العصر، قسم شعراء نشر احمد امين و شوقي ضيف واحسان عباس، مطبعة لجنة التأليف و الترجمة والنشر، القاهرة ١٩٥١،ج١ ،ص ١١٣.

ماوەیەکی دوورو درێژیش هەر بە سەرۆکی دیوان مایەوە، پاشان، هەر لە ڕۆژانی سەلاحیو عەزیزییدا،[373] دیوانی دارایشی خرایە سەر. ڕوونتر بڵێین، (المهذب)و (الأسعد)ی کوڕی، بەدرێژای حوکمی سەلاحەددین، دیوانی سوپایان بەدەستەوە بووە. (ابن خلکان) خەسڵەتی ئەم (الاسعد)ە باس دەکاو، دەڵێ: "چاکەی زۆر هەنە، (دانراویشی زۆرە)، (سیره السلطان صلاح الدین)و، کتێبی (کلیلەو دمنە)شی ڕێکخستووەو دیوانێکی شیعریشی هەیە بەدەستخەتی کوڕەکەی، خۆم دیومەو چەند کۆپلەیەکیشم لە بەر نووسیووەتەوە.[374]

وەڵێ (ابن خلکان) خۆی لە باسی (قوانین الدواوین) نەداوە. (الاسعد) لە شاری حەڵەب لە ساڵی (٦٠٦ک/ ١٢٠٩ن)دا، لە تەمەنی (٦٢) ساڵیدا، مرد.[375]

لە بارەی ئەم دیوانەی سەردەمی سەلاحەددینەوە، هیچ شتێکی تر نازانین، نەخاسمە بەشەکانی دیوانو ئەو ئیشوکارانەش کە سەرۆکەکانی ئەم دیوانەو یاریدەدەرەکانیان دەیانکرد.

**٣- جلوبەرگی سەربازەکان:**

(القلقشندي) بە ئاسانیو بەبێگرفت باسی شکڵو شێوەی لەشکری میسری سەردەمی مەمالیکی. تورکی کردووە، ئەو سەردەمەی کە گەلێ دابو دەستووری حوکمو ئیدارەو نووسینو سوپاو داراییو شتی دیکەی لەو جۆرە بابەتانە سەقامگیر بوو بوونو جێی حۆیان گرتبوو، کە مێژوو نووسان بە درێژەپێدانی سەردەمی ئەیییوبی لە قەڵەم دەدەنو بگرە، سەردەمی ئەییوبیەکانیش کە لەمیسر، لە هەشتا ساڵ زیاتری نەخایاند. بە ئەڵقەیەکی نێوان زنجیرەی سەردەمی سەلجوقی. ئەتابەکیو، زنجیرەی سەردەمی مەملوکی لە قەڵەم دەدەن، کە سەردەمی مەملوکی نزیکەی سێ سەدە (٦٤٨ک. ٩٢٣ک/ ١٢٥٠. ١٥١٧ن)، بەردەوام بووە. بەتایبەتی باسی دابو دەستووری سەربازیی، کەچی سەردەمی فاتمییەکان کە لە میسر، زیاتر لە دوو سەدەی خایاند، ئەو کاریگەرییەی لە پەیکەری دەوڵەتی ئەییوبیەکان نەکرد، هەروەها لە مەملوکەکانیش. هەرچەندیشە ئەییوبیەکان، یەکسەر دوای ڕووخانی دەوڵەتی فاتمیی حوکمی میسریان گرتە دەست، کە، نەسەلجوقیو نە ئەتابەکی، ڕۆژێ لە ڕۆژان حوکمی میسریان نەکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، سەلجوقیو ئەتابەکی کاریگەرییان لە حوکمی ئەیوبیو، پاشانیش لە حوکمی مەمالیك، تابڵێی ئاشکرایەو دیارە.[376]

ڕاستیشت دەوێ، زانیاری فەراهەمو بەردەست دەربارەی سەردەمی مەمالیك بە چڕوپڕی هەیە، مەگەر بە ئاستەنگ بتوانین بڵێین سەردەمی ئەیوبیەکانیش وەك سەردەمی مەمالیك بووە، درێژیی حوکمی مەمالیکیش لە میسر، وەهامان لێدەکات بڵێین: مێژوونووسێکی وەك (المقریزي) یان وەك (القلقشندي)، یان وەك (أبن أیاس)، یان مێژوونووسێکی دیکە، کە باسی سیستەمی قۆناغێکی مەممالیك دەکات، مەرج نییە ئەو باسەی سیستەمی قۆناغێکی دیکەی مەمالیك بگرێتەوە، چونکە مەمالیك لە میسر ماوەیەکی دوورو درێژ حوکمیان کردووە.

قەلقەشەندی کە باسی جلو بەرگی فەرماندەو سەربازانی ئەییوبی دەکا، دەڵێ: "کە دەوڵەتی ئەییوبی، بەدوای دەوڵەتی فاتمیدا هاتو لە وڵاتی میسردا جێگەی گرتەوە، زۆربەی تەرتیبی مەملەکەتەکەی، وەك خۆی نەهێشتو گەلێ شکڵو شێوەی گۆڕی، وەكو ئەوانەی دەوڵەتی ئەتابەکی زەمانی (عماد الدین زەنگی) موسڵو وەکو ئەوانەی (الملك

---

[373] نسبة الى المليك عزيز عماد الدين عثمان بن صلاح الدين الذى خلف والده في حكم مصر.

[374] وفيات الاعيان، ١/٢١٠/ بنۆڕە: البداية والنهاية ،٢٥٣/٢٣، شذرات ذهب، ٢٠/٥.

[375] "پاش ئەوەی لە دەست (صفي الدين بن شکر)ی وەزیری (مليك العادل ابوبكر) ڕای کرد. ئەم (الملك عادل)ە بە دوای (المليك عزيز عثمان بن صلاح الدين) حوکمی میسری گرتە دەست.

[376] صبح الاعشى، ٤/٥. (پێدەچێت، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوویێ کە دابوو دەستووری حوکمی ئەییوبی لە میسرو لە شامیش) بە ئەسڵ لە دلو دەستووری حوکمی وڵاتی شامو وڵاتی جزیرێی (فوراتەوە) هەڵقولابێت.

**العادل) نورەددینی کوڕی لە شام، لێکردەوە". "ئەوان دەستووریان وابوو کلوتەی زەردیان لە سەر دەکرد،[377] بەبێ مێزەر، قژو پرچیشیان بە ژێریدا شۆڕ دەبووەوە، مەملوك و میرو ئەوانی دیکەش هەروەها بوون"[378]. بەڵام پۆشاکی سەر، لە قۆناغەکانی حوکمی ئەتابەکی و ئەییوبیدا گۆڕانی بەسەردا هات، بەنموونە (سیف الدین غازی کوڕی عماد الدین زەنگی) کە دووەم ئەتابەکی موسڵ بووە، (٥٤١- ٥٤٤ك/ ١١٤٦-١١٤٩ز) سنجەق لە سەر نانی داهێناوە، شاکانیش چاویان لێکرد، فەرمانیشیدایە سەربازان شمشێرەکانیان لە کەمەریان ببەستن و ئەسپسوارو حوشتر سواریش درەگورزەکانیان لە ژێر ئەژنۆیانەوە قایم بکەن[379].**

**کاتێکیش "سەلاحەددین حوکمی میسری گرتە دەست، هەر بەو پێودانگە، یان زۆرتر لەو پێودانگە رەفتاری دەکرد"[380]. هەرچی "الملك المعظم عیسى کوڕی الملك العادل أبوبکر"ی سەرگەورەی دیمەشقە (٦١٥- ٦٢٤ك/ ١٢١٨-١٢٢٧ز)، ئەوە، ئەو، کلۆتەی زەردی بێ مێزەری داهێنا[381]، وەك (القلقشندي) دەیگێڕێتەوە[382]. وەلێ کلۆتە لە سەردەمی سەلاحەددیندا، بە مێزەرەوە لەسەر دەکرا، تا (الملك المعظم) مێزەرەکەی نەهێشت، ئیدی ئەم کلۆتەی بێ مێزەرە هەر مایەوە تا سەردەمی مەمالیك، ئیتر ئەوەبوو (الملك الأشرف خلیل کوڕی السلطان محمد کوڕی قلاوون) فەرمانیدا کە کلۆتە پێویستە بەمێزەرەوە لە سەر بکرێ، هەروەکو جاری جارانی سەلاحەددین[383]، بۆ پۆشاك (قباء)[384] (واتە سەر کراس)ی پان و پۆڕی تەتەری و لەسەر ئەویشەوە (تکلات)و، ئنجا لەسەر ئەوانیشەوە (قباء)ی ئیسلامییان لەبەر کردووەو شمشێریان بەلای چەپیانەوە دەبەست و (صولق)[385] و (گیزلك)[386] واتا: هەگبەی چەرمین و خەنجەریان لەلای ڕاستەوە دەبەست، ئەمە بەگوێرەی قسەکانی (القلقشندي)[387].**

**یەکەم کەسیش کە ئەم گۆڕانکارییەی داهێنا بێ، سیف الدین غازی سەرگەورەی موسڵ بووە. لەمەدا میرو پێشەنگ و سەردارانی لەشکریش چاویان لێکرد، ئیدی ئەمانە دوو (قباء)یان لەبەر دەکردو ئەوەی سەرەوەیان قۆڵەکانی، لەوەی خوارەوەیان کورتتر، بەڵام هەراوتربوون[388].**

**پۆشاکی هاوینەیان. بێگومان. لە پۆشاکی زستانەیان جیاواز بوو، (القلقشندي)یش. کە، هەر ئەو، بەم فراوانییە باسی جل وبەرگی سەربازی دەکا. مەبەستی لە جل وبەرگی سەربازەکان نییە، نەخێر، مەبەستی تەنیا لە جل و بەرگی میرەکانە، وەلێ بەڕای ئێمە ئەم وەسفە، جل و بەرگی لەشکری ئەییوبی ناگرێتەوە، نەخاسمە پشتێنی زێڕپۆش، یان**

---

[377] (کلۆتات جۆرە پۆشاکێکە، لە هیندستان لەبەردەکرا، هەروەها میرەکانی میسریش لەبەریان دەکرد) دوزي، المعجم الفصل باسماء الملابس عند العرب، ترجمة: د.اكرم فاضل ، طبعة دار الحرية ، وزارة العلام، بغداد ١٩٧١ة ص٨٥.

[378] صبح الاعشى، ٤/٥،٣٩.

[379] الکامل،٣٨/١١، المختصر ، ٣١/٤.

[380] صبح الاعشى،٦/٤.

[381] الشاش: کە ئێمە لەم تەرجەمەیەدا (مێزەر)مان بۆداناوە، دەڵێ : پارچە قەماشێکە بە دەوری (طاقیة یا عرقیة)، یان بە دەوری سەردا دەپێچرێ‌و، وشەیەکە لەجیاتی مێزەر بەکارهاتووە ) دوزی الحجم المفضل ، ص ١٩٧-١٩٩.

[382] صبح الاعشى،٥/٤

[383] صبج الاعشى، ص٦

[384] القباء: کراسێکەو لە سەر پۆشاکەوە لە بەردەکرێ.

[385] الصولق: هەگبەیەکی چەرمینە، بەلای ڕاستدا هەڵدەواسرێ ، پێداویستی و تێشووی سەفەرو ڕێگای تێدەنرێ. کۆی (صولق) (صوالق)ە. السلوك، ج١، ق٣، ص٧٨٩. ئەم وشەیە تورکییە، بە تورکی واتا: (لای چەپ، نەك لای ڕاست)، چونکە (صول) بەتورکی واتا (چەپ).

[386] الکزلك: خەنجەرە، یان چەقۆیە.. سید الدیوەچی، الموصل في المعهد الأتابکي، مطبعة شفیق، بغداد ١٩٥٨ ،ص ٧٢ .. الجمیلي، دولة الموصل، ص ٢٥٨.

[387] صبح الاعشى، ٤/٤ .

[388] صبح الاعشى، ٤٠/٤ .

پشتێنی زێڕی ڕازاوە بە (الیشم)[٣٨٩] واتە زمڕدکوت. هەروەها باسی جل‌و بەرگی زستانەش، کە وەسفی دەکاو دەڵێ: "لە خوری دەگمەن‌و گرانبەهاو ئاوریشمی نایاب دروستکراون‌و لە ژێریشەوە فەروەی سمۆرەی ناسکیان لەبەردەکرد" و میرەکانیش کەوڵی چاکیان لەبەر دەکرد لە پێستی ئاژەڵی دەگمەنی وەك دەڵەك‌و سەگلاوو ئەمجۆرە گیانلەبەرانە دروستدەکران کە لە نیشتمانی ئەسڵیی مەمالیکەوە، واتا لە ئاسیای ناوەڕاستەوە دەیانهێنا، تەنیا کەوڵی ئاژاڵی دڕندە نەبێ کە لەمیسردا هەبوو، پێویست بەهێنانی نەبوو.

هەرچی پێڵاوە، ئەوە بە هاوینان، کاڵەی سووکی چەرمگیان (کلاش) لە پێدەکرد، بە زستانیش کاڵەی زەردی پێستی تایفییان لەپێدەکردو میهمازگەلی زیویان بەسەر کاڵەکەدا دەبەست، ئەو میرانەش کە دەرەبەگی سەربازی گەورە بوون، ئەوانە، میهمازی زێڕیان بەسەر کاڵەکانیاندا دەبەست.

هەرچەندیشە (القلقشندي) سوور نییە لەسەر ئەوەی، ئەم جل‌و بەرگ‌و پێڵاوە، تەنیا هەر تایبەت بووە بەمەملوکەکان، وەلێ ئێمە ڕامان وایە کە سەردەمی ئەییوبییەکان، سەردەمی غەزاو ململانێ بووە دژ بە خاچدروشمە داگیرکەرەکان، لەبەرئەوە کاتی ئەو کەش‌و فشەیان نەبووەو لە ڕواڵەت‌و پۆشاك‌و پێڵاوی لەم جۆرە بابەتانە دەستیان گرتووەتەوەو ئەو زیادە مەسرەفەیان نەکردووە. ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە بەرپرسانی سوپا هەر بەیەکجاری گوێیان بەجل‌و بەرگ نەداوە، یان زمستان‌و تاوسان، جل‌و بەرگیان بەپێی وەرز نەگۆڕیبێ، نەخێر، ڕیزی لەشکر، میرو دەرەبەگی سەربازی دەوڵەمەند.. دەوڵەمەندی تێدا بووە. مەمالیکی خاوەن دەستوری شاهانەی ڕەسەنی تێدابووە، کە بەفەرمانی سوڵتانی ئەییوبی، هەند گوێ لەمست نەبوونە، هەرچەندیشە کەبانگ بکرابان بۆ شەڕ، ئامادە دەبوون، بەتایبەتیش میرو سەرۆکەکانی موسڵ‌و دیاربەکر. بەهەرحاڵ ئەم لەشکرو جلوبەرگەی (القلقشندي) باسی لێوە دەکا، مەبەستی لە لەشکری میسرە، مەبەستی لەشکری شاو میرەکانی شام‌و جزیرێ نییە، ئەم وەسفانە پڕ بەپێستی لەشکری مەمالیکی – جێگرەوەی ئەییوبییەکانە، کە مەمالیك لە هەموو قۆناغەکانی دیکەی مێژووی میسری ئیسلامی، پتر ڕەوش‌و ئاکاری کەش‌و فشی حوکمیان بەکارخستووە و خویان پێوەی گرتووە.

سا، هەرچۆنێ بووبێ، ئەگەر بێت‌و ئێمە، دووی وەسفی جل‌وبەرگ‌و ناوو بارودۆخی ئەم جۆرە شتانە بکەوین لە وولاتە جۆربەجۆرەکانی موسوڵماناندا‌و سەدە بە سەدە باسی گۆڕانیان بکەین، ئەوە دەبێتە دورکەوتنەوەو فرە بڵێی‌و سەرچاوەکانی مێژووش ئەو یارمەتییەمان نادەن. ئەوەش دەڵێم، میرەکانی لەشکر، یان هەندێکیان. دوورنییە سەربازەکانیشیان. هەندێ شمەك‌و پێداویستی خۆیان، لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتبێ بۆ ئەو ماوەیەی کە لە ماڵ‌و خێزانیان دوور دەکەونەوە، بەنموونەوەك (السکین، الدرفش[٣٩٠]، خیوط، الدسترك[٣٩١]، مطرقة، مسلة) واتا: چەقۆو درەوشەو دەزوو و مشارو چەکوش‌و دەرزی، کە (ابن الاثیر) لە باسکردنی (الامیر زین الدین علی گچك[٣٩٢])دا، باسی ئەوانەش دەکات، لەگەڵ هەندێ ئامرازی ئامادەکردنی خواردن‌و خۆراك.

### ٤- ئازووقەو خاروبار:

گەیاندنی ئازووقە لەو شەڕانەی زەمانی زوودا، گرنگترین کێشەی ئامادەباشی‌و لەشکرکێشی بووە، چونکە ڕێگاو بانی هاموشۆ سەخت‌و زەحمەت بووەو کەروباریش ماندوو دەبوون‌و لەسەرخۆ ڕێگایان دەبڕی‌و خۆراکیش خراپ دەبوو، کە نەشدەماو تەواو دەبوو، بەزەحمەت داوادەکراو لەکاتی خۆیشیدا نەدەگەیشتە جێ‌و گەلێ جاریش چارەنووسی شەڕەکان‌و مەسەلەی لەشکرکێشیی لەسەر گەیاندنی ئازووقە دەوەستاو ئەو لایەنە شەڕەکەی دەبردەوە کە یەدەکی تەواوی خۆراك‌و ئاوی دابین دەکرد. فەرماندار دەبوو، هەندەی هەبێ بەشی ڕێگای لەشکری بکا، هەروەهاش بۆ

---

389 الیشم: (بەردارێکی گرانبەهایە، لە زمرد دەچێ، وەلێ گچکەترە).. المنجد في اللغة/ المطبعة الكاثوليكية، بيروت، ط /١٧.

390 الدرفش = درەوش، درەوشە.

391 الدسترك: شارێکی بچووکە، هنداوي، ١٦٥.

392 الباهر ١٣٥.

کاتی شەڕەکەو بۆ ڕێگای گەڕانەوەشیان، دەبوو ئەوەشی لە بیر نەچێ کە بۆ کاتی پێویست، بەردەوام ئازووقەی پێبگاو لێی نەبڕێ‌و ڕێگاوبانی هێنانی ئازووقەی سەلامەت‌و بێمەترسی بێ.

لە شەڕەکەی (حطین)دا کە لە مانگی تەمووزدا ڕوویدا، خاچپەرستەکان، بەو هاوینە گەرمە ئاویان لێبڕاو ئاویان نەماو تینویەتییەکی مەرگاوەریان تووش بوو، پەکیان کەوت و شکانێکی پیس تێکشکان.. کەواتە چەکی ئاو، بێگومان لایەك بەسەر لایەکدا زاڵ دەکا، خاچپەرستەکانیش کە گەمارۆی (عکا)یان دابوو، ئەگەر (عکا) ئازووقەی پێگەیشتبا بۆیان داگیر نەدەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا لەشکری شام دوو ساڵ بەرەنگاریان کرد، تا بەتەواوی ئازووقەیان نەما.

خاروباری سوپا خواسایی لە "ساقة" واتا لە پاشکۆی سوپاوە دادەنرا، پێیان دەگوت بارگەو قورسایی، جاریکیشیان، لە هێرشێکدا بارگەکەیان هێنابووە ناوەڕاستی سوپاکەوە، واتا نزیك بەرسنگی لەشکرەکە، ڕەنگە لەترسی ئەوە بووبێ کە نەوەکا دوژمن لە دواوە بیگاتێ‌و زیانیان پێبگەیەنێ، لە ناوەڕاستی (جمادي الاولی ساڵی ٥٨٤ك/ ١١٨٨ز)دا "سوڵتان، خۆی چوو بۆ تەیارو ئامادەباشی هێرشێ بۆ سەر دوژمن" هەموو لق‌و سەر لقەکانی بە ڕێك‌وپێکی دانا، بەر لە هەموویان قۆڵی ڕاست پێشکەوت‌و بەرسنگ کەوتە ناوەڕاست‌و قۆڵی چەپ کەوتە پاشەوەی لەشکر بەپێشڕەوی ( مظفرالدین کوڕی زین الدین) بارگەکەشیان لە ناوەڕاستی لەشکرەکەوە دەڕانی [393]. سەربازەکانیش هەریەکەو، تێشوی حازر بەدەستی خۆی لەناو هەگبەیەکی چەرمیندا بە لاشانی خۆی دا دەکرد. بەرلەوەی لەشکر بجوڵێ بەماوەیەکی کەم سەربازان دەچوونە بازاڕو پێداویستی خۆیان دەکڕی، پێموابێ لەنان‌و پەنیرو پیازو هەندێ قاورمەو کەمێ گەنم‌و پاقلەو میوەی وشك‌و خورما، زیاتر نەبوو. لە ئامادەکاری پەلامارێکی سەر (الرملة)دا، کە لە ساڵی (٥٧٣ك / ١١٧٧ز)دا بەبەزینی سەلاحەددین هاتە کۆتایی، (العماد الکاتب) بەشێوە نووسینە سەجعینە ناودارەکەی، دەڵێ: سەربازانیان بانگەشەکرد "خۆراکی دە ڕۆژی دیکەش بێنن، پێویستمان دەبێ، چوومە بازاڕی سەربازان شت بکڕم، نرخ هەمووی ڕوو لە زیاد بوونەو هەر هەڵدەکشێ..." [394]

لە غەزاکانی پاش شەڕی (حطین)یشدا، کاتێ کە سوپای ئەییووبی، لە ساڵی (٥٨٤ك / ١١٨٨ز)دا هێرشی کردە سەر کەناراوەکانی ناوچەی میرنشینی (طرابلس)، کە بە دەست خاچپەرستەکانەوە بوو، جاڕیاندا بۆ سەربازان: "واهێرش دەبەینە سەر کەناراوەکان، لەوێ ڕزق‌و بژێوی کەمەو دوژمنیش ئەوێ نشینگەی خۆیەتی‌و لە قۆڵەکانی دیکەوە گەمارۆمان دەدەن، خۆراکی مانگێك لەگەڵ خۆتان بهێنن [395]".

کاتێکیش لە گەمارۆ سەخت‌و درێژخایەنەکەی سەر (عکا)دا، خەڵکەکەی تووشی قاتووقڕی‌و برسێتی هاتن، میر (بهاءالدین قراقوش)، لەناو شارەکەوە ناردیە لای سوڵتان‌و هانای بۆ برد کە ئازووقەو زەخیرەیان نەماوە، ئەوجا سوڵتان (بطسة)یەکی بۆ بارکردن لە خۆراك (بطسة، کەشتیی گەورەیە). جا بۆ ئەوەی ئەم (بطسة)یە بە بێوەی بگاتە (عکا)، هەندێ نەسرانی خەڵکی بەیرووتی، کە بوو بوون بە ئیسلام سواری (بطسة)کە کرد، تا لەگەڵ دوژمناندا، کە گەمارۆی شارەکەیان دابوو بکەونە گفتووگۆ، بە زمان‌و جل‌وبەرگ‌و ڕیشی تاشراویانەوە [396]، بیان خەڵەتێنن، بۆ شوێنە ونیی زیاتریش، فەرمانی پێدان خاچ بە دارە بەرزەکانی کەشتییەکەدا هەڵواسن‌و چەند بەرازێکیشیان خستە سەر پشتی کەشتیەکەو بەرەو (عکا) کەوتنەڕێ. لە ڕێگا خاچپەرستەکان ڕێگایان لێگرتن، بەڵام ئەوان توانیان فێڵەکەی خۆیان ببەنە سەرو خۆیان بەخاچپەرستەکان لە قەڵەم بدەن، بەو جۆرە، بە چوارسەد غەرارە گەنم‌و باری پەنیرو پیازو [397] چەندین سەر

[393] النوادر، ٨٧، مفرج الكروب، ٢/٢٥٦ .

[394] سنا البرق، ٢٥٣/١، الروضتين، ج ١، ق٢، ص٦٩٧.

[395] النوادر، ٨٦.

[396] مەبەست ئەوەیە، کە ئیسلامەکان ڕیشیان دەهێشتەوە.

[397] الفتح القسي، ٤١٧. مرآة الزمان، ٨ / ٤٠٤ . مفرج الكروب، ٢ / ٣٣٠ –٣٣١. البداية والنهاية، ١٢ / ٣٣٧ .

بەرخ و پێداویستی لەو جۆرە بابەتانەوە گەیشتنەوە ناو بەندەرە گەمارۆ دراوەکە[398].

گەمارۆی (عکا) زۆر درێژەی کێشا، لەبەر ئەوەی چەند جاران ئازووقەی بۆ دەنێردرا، جگە لەوەی کە لە بەیرووتیشەوە[399] بۆی دەچوو، لە میسری پڕ سامانیشەوە بۆیان دەنارد. بۆ ئەوەی ئەو شارە خۆی بەدەستەوە نەدا، موسوڵمانان لە هەر ڕێگایەکەوە بکرایە، ئازوقەیان بۆ ئاودیو دەکرد. پاشان بۆڕیان داو (عکا) کەوتە دەست دوژمن، نەگەیشتنی ئازوقەش وەك باسمان کرد بووە هۆی ورەبەردان و خۆبەدەستەوەدانی شارەکە.

هەندێ شاریش، کە بەدەستی خاچدروشمانەوە بوو، دیسانەوە لەبەر بێئازوقەو نەگەیشتنی خاروبار، خۆیان دا بەدەست سوپای ئەییوبیەکانەوە، نەك هەر ئەوەندە، بگرە قەڵای قایمکاری (کوکب) کە لە (طبرية)وە نزیکە "لەبەر بێ خوێیی کە خوێیان نەمابوو، بەملکەچی لەشار دەرچوون"و شاریان دا بەدەست لەشکری ئەییوبییەوە،[400] کە نەبوونی خوێ زۆر سەیرە ببێتە چۆڵکردن و بەدەستەوەدانی شارێك.

دەشبینین لەشکری ئەییوبی لەکاتی شەڕدا، ڕێگای ئازوقەو خاروباری دوژمنی دەبڕی، تا تووشی برسێتی بکاو ملکەچی بکا، خۆی بدا بەدەستیانەوە، هەر بۆ ئەم ئامانجە، کشتوکاڵ و ڕەزو باخی خاچدروشمانی خراپ دەکرد، ئەوەبوو، لەناوچەی (الكرك)، بۆ تەنگەتاوکردنی (ڕینۆدی شاتیۆن )ی[401] سەرداری ئەم ناوچەیە، دارەکانیان بڕی و پاشان دەغڵ و دانیان درەوکردو باغ و بێستانی لێوشك کردن[402].

**٥ـ دەرەبەگیی لەشکرسازی:**

ئەو سیستەمانەی سەلاحەددین پێڕەوی دەکردن وەك باسمان کرد، لە بنچینەوە، هەند لەگەڵ سیستەمەکانی نوورەددین مەحموددا فەرق و جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو، چونکە دەوڵەتی ئەییوبی، بە پێودانگی ئەو ڕەفتاری دەکرد.[403] سیستەمی دەرەبەگیی لە جیهانی ئیسلامدا بە گشتی هاوشێوەو بە چوونیەکی مایەوە، هەرچەندە فەرق و جیاوازییەك لێرەو لەوێ بەرچاو دەکەون، هۆکاری ئەوەش سرووشت و سیستەمی کۆمەلایەتی وڵاتانی ئیسلامە، ئەمەش (لەلایەکی ترەوە) مانای ئەوەیە کە ئەم سیستەمە زۆر جیاوازترە لەو سیستەمەی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لەئەورووپا لە کاردا بووە، بە پێی ئەو داب و دەستوورە دەرەبەگییە ڕەگداکوتاوەی کە لە ئەورووپادا هەبووە، لەبەرئەوە، ئەوەی دەرەبەگایەتی ڕۆژهەڵاتی پێدەڵێن، تەنیا ناوەو هیچی دیکە، پێویستیش وەهای دەویست کە یەك لەم دوو سیستەمەی (ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی)یە ناوێکی تری بۆ بدۆزرێتەوە، لاموایە ئەمەش لە سرووشتی گۆڕانی ئابووریی و سیاسیی و کۆمەلایەتیی هەردوو جیهانەکەوە ئاودەخواتەوەو لە پەیدابوونی بەناو (جوونی ڕەنێوهانینی ئاسیاییەوە = نمط الأنتاج الأسيوي)یەوە سەرچاوە دەگرێ.[404]

هەرچەندیشە ئەم جۆرە ئیش وکارە ئەوەی دەخواست کە فەرمانداریێکی وەك سەلاحەددین بە پێی ئەم بارودۆخە تازەیە هەندێ گۆڕانکاریی بکردبا، وەلێ، دەرەبەگیی لە سەردەمی سەلاحەددیندا چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێ بەرەو چاتر گۆڕانکاریێکی ئەوتۆی تێبکەوێ. بەپێی ئەو بەڵگەو نیشانانەش کە بە دەستمانەوەیە، سیستەمی دەرەبەگیی بەشێك بووە لە پێڕۆو سیستەمەکانی نورەددین و بۆ سەردەمی سەلاحەددین ماوەتەوەو ئەمیش پێڕۆی کردووە، کە لە چاخی مەملوکەکان لە میسردا بە ئاشکرا دەبینرێ، ڕاستیشت دەوێ، سیستەمی دەرەبەگیی لە سەردەمی ئەییوبییەکاندا لە

---

398 النوادر، ١٣٥. الفتح القسي، ٤١٧. الروضتين، ٢/ ١٦٠–١٦١. مفرج الكروب، ٣٣٠/٢ .

399 النوادر، ١٧٣. الفتح القسي، ٤١٩.

400 الهروي، التذكرة الهروية في الحيل الحربية. تحقيق : مطبع المرابط ، منشورات وزارة الثقافة السورية ، دمشق ١٩٧، ص ٨٦ .

401 لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا بە ( أرناط) ناسراوە، لەمەودوا زۆر باسی دەکەین – مفرج الكروب ١٨٦/٢ .

402 الروضتين، ٨/٢.

403 النجوم الزاهرة ٢٧٩/٥، صبح الأعشى، ٥/٤.

404 بنۆڕە: أحمد صادق سعد: ست دراسات في النمط الأسيوى للأنتاج، دار الطليعة بيروت ١٩٧٩.

**ولاَتی شامدا، بە شێوەیەکی ڕوونترو ئاشکراتر دەبینرا، لەوەی کە لە میصردا پێڕۆ دەکرا، چونکە بارودۆخی ژینگە لەو دوو ولاَتەدا کاری جیاوازی کردبووە سەر بارودۆخی ئابووری و هەل‌ومەرجی سیاسیی هەردووکیان، دوورنییە ئەوەش بە هۆی ئەو دابەشبوونە سیاسیە زەق‌و ئاشکارەوە بووبێ کە بە زۆربەی قۆناغەکانی مێژووی ولاَتی شامەوە دەبینرا، بگرە، لەو قۆناغانەشدا کە کەوتبوە ژێر ڕکێفی فەرمانداریٚکی بەهێزی وەك نورەددین مەحمودو سەلاَحەددینەوە.**

**مەبەست لە دەرەبەگایەتیی زەمانی سەلاَحەددین، ئەوەیە، کە زەوی‌و زار دادەبڕدرا بۆ گەورە میرانی دەوڵەت‌و خزمانی سوڵتان، بۆ ئەوەی کاروباری ڕەنێوهانینی ئەو زەوییانە بە ئازادیی بەڕێوە ببەن بۆ خۆیان لە جیاتی مووچە[405] و حاسلاَت‌و داهاتەکانیشیان هەر لە سنووری ئەو دەرەبەگایەتییەدا بەخەرج بدرێ، بەمەرجێ، ئەگەر هات‌و سوڵتان جەنگی بەرپاکرد، ئەو میرانە بەشداریی تێدا بکەن‌و سەربازو لەشکری بە بارو بارگەوە بۆ ڕەوانە بکەن. ئەو دیوانەش کە سەرپەرشتی کاروباری سوپای دەکرد، ناونرا (دیوانی دەرەبەگیی)[406] ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخا، کە ڕێکخستنی سوپای ئەیوبی بە سیستەمی دەرەبەگایەتی پشت ئەستوور بووە.. خزمەتی سەرەکیی دەرەبەگ بەرامبەر بە سوڵتان، ئەوەبوو کە لە کاتی شەڕدا خزمەتی بەرەی شەڕ بکاو ژمارەیێ سەرباز بەجل‌وبەرگ و کەرەستەو خۆراکەوە بنێرسێ بۆ یارمەتیی سوپا، چونکە دەرەبەگەکان بەڵێننامەیان دابوو بە سوڵتان، کە لە کاتی شەڕدا هەموو جارێ کابرای دەرەبەگ بە خۆی‌و چەند سەربازێکەوە بگاتە شەڕەکە.[407]**

**ئێمە هەندێ بەڵگەو دەقی ئەو سەردەمەمان لە لایە، مانای دەرەبەگایەتی زەمەنی نورەددین‌و زەمەنی سەلاَحەددین بنوێنێ، لە شەڕی (البابين)دا کە لە ساڵی (٥٦٢ك/ ١١٦٦ز)دا لە میسر، لە ماوەی هەڵمەتی دووەمدا بەرپا بوو، هەندێ لە میرەکانی شێرکۆ، لە شەڕەکە پشتساردبوون‌و نەیانویست لەگەڵ خاچدروشماندا کە (الملك أمور)ی فەرماندەیی دەکردن‌و هێزی فاتمییشیان لەگەڵدا بوو بچنە شەڕەوە، بۆیە شرف الدين برغس. کە میرێ بوو لە میرەکانی نوورەددین. لێیان ڕاپەڕی‌و گوتی: "کەسێ لە مردن‌و دیلی بترسێ با نەبێ بە خزمەتکاری شا، بابچێتەوە ماڵەوە بۆ لای ژنەکەی، بە خودا بگەڕێینەوە لای نوورەدین‌و مژدەی سەرکەوتنمان پێنەبێ و هیچ پاساوێکیشمان نەبێ، دەرەبەگایەتی‌و کارمەندیشمان لێدەسێنێتەوە[408] و لەو ڕۆژەوەش تا بە ئەمرۆ دەگا چیمان لێوەرگرتوەو خزمەتمان کردوە، هەموویمان دەکەوێتە سەرو نائومێدمان دەکات‌و ئەوجار پێشمان دەڵێ: پارەو کرێی موسڵمانانیش وەردەگرن‌و لەبەر دوژمنانی موسڵمانانیش هەڵدێن‌و ولاَتێکی وەك میسریش دەدەن بە دەست کافرەکانەوە.. حەقیشێتی"[409].**

**دەقی ئەم قسانە، بناغەی دەرەبەگایەتی نورەددینیمان پیشان دەدا، کە سیستەمێك بووە، تایبەت بە بەرخورداریی زەوی‌و زار، خزم‌و دۆستی سوڵتان بەرخورداری بوون‌و تا نێوانی سوڵتان‌و میر خۆش بووبێ و دۆست بووبن، داهاتی بۆ میر بووە. ئەو دەقەی (المقريزي) هێناویەتییەوە، بایەخێکی تایبەتی خۆی هەیە. وادیارە پێوەندی دەرەبەگایەتیی نێوان سوڵتان‌و میرەکانی پێوەندییەکی کاتیی و ڕەفتەنی بووە، درێژیی ماوەکەشی بە ئارەزووی زەوییبەخشەکەیە، واتا بە ئارەزووی سوڵتان بووە، کەینێ ویستبێتی پێوەندییەکەی پچڕاندووە، نەخاسمە کاتێ زەوی پێبەخشراوەکە، بە پێی**

---

[405] البنداري، تأريخ دولة السلجوق شركة طبع المكتب العربية، مطبعة الموسوعات، ١٩٠٠، ص٥٥، الحسيني، أخبار الدولة السلجوقية، نشريات كلية پنجاب، لاهور ١٩٣٧، ص٦٨. "سەیری ئەم کتێبەی باسی دەرەبەگەی (کاهین cahan) یش بکە: the Encycl of islam (NEW Edition, ١٩٧١ vol (١١١ ,p ,١٠٨٨ art lkta)). هەروەهاش: سوبر نهيم في دائرة المعارف الاسلامية، ط١٩٣٣، ٤٧٨/٢. ويولياك، الاقطاعية، .. ص٥٩ـ ٦٠.

[406] ابن فضل الله العمري، التعريف بالمصطلح الشريف، مطبعة العاصمة، القاهرة، ١٣١٢ك، ٨٩.

[407] محمد حسين ربيع، النظام المالية في مصر زمن الأيوبيين، مطبعة جامعة القاهرة، سنة ١٩٦٤، ص٣٥. parry and yapp: war Technology and Society in the middile east, p, 59.

[408] الجامكية: کارمەندانی مووچەخۆری سوڵتان. (القلقشندي) ٤٦٠/٣، ٥١٩، ١٤٠/٥. وشەیەکی فارسییە: د. زكي، السلاح في الاسلام، طبعة دار المعارف بمصر، القاهرة ١٩٥١، ص١٨.

[409] الكامل، ٣٢٥/١١. الباهر، ١٣٣. الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٦٥. مفرج الكروب، ١٥٠/١. شفاء القلوب، ٣٠.

پێویست لە خزمەتدا نەبووبێ، لە مەرجەکانی پێوەندییەکە لایدابێ.

پاش ئەوەی سوپای ئەییوبی لە (جمادي الآخر ٥٧٣ك/ کانوونی یەکەمی ١١٧٧ز) دا، لە شەڕی الرملة – تل الجزر- دا تێکشکاو بەزی، سەلاحەددین گەڕایەوە بۆ میسر، دەرەبەگایەتی[410] و چاوگەی ڕزقی لە کۆمەڵێ کورد بڕی، چونکە ئەوان شەڕەکەیان دۆڕاندبوو.[411] هەروەها لە گەمارۆ دووروودرێژەکەی شاری (عكا)شدا چەند میرێکی سەلاحەددین، هەلاتن، بە نموونە، وەك (عزالدين أرسل، حسام الدين تمرتاش بن جاولي، سنقر الوشاقي الأسدي)، هەموویان لە ترسی سزای سوڵتان، خۆیان دەشاردەوەو دیارنەدەبوون، سوڵتانیش ناچار زەوی و زارەکانی لێسەندنەوەو لە دەرەبەگایەتی خستن[412].

ئەم دەرەبەگایەتییەش وەك ئەو بۆ ماوە پشتاو پشتە نەبوو، کە خەڵك دەیزانن، لەگەڵ ئەوەشدا، جاری وا هەبوو، میرێك، زەوی و زارو دەرەبەگایەتییەکەی خۆی بۆ کوڕە گەورەکەی بەجێدەهێشت، خۆ ئەگەر بهاتباو کوڕی باڵغی نەبایە، جا ئەوجا سوڵتان پیاوێکی لەگەڵدا بۆ دەسازان "پیاوێکی ئەمین و ئومان کوڕەی پەروەردە دەکرد تا گەورە دەبوو"[413]. ئەو پیاوە سەرپەرشتیی کورەکەی دەکرد وەك ئەتابەك[414]. هەموو میرێ ناوی سەربازانی خۆی لە دەفتەری دیواندا تۆمار دەکرد، "لەگەڵ چەك و ولاغ و شتومەکی دیکەی، نەوەکا میرێ لە میرەکان، بیکاتە ڕەزیلی، یان لەبەر دەستکورتی خۆی، بەشێکی بۆ خۆی گل بداتەوە"،[415] چونکە عادەت وەهابوو کە، میر، دوو سێیەکی دەسهات و داهاتی میرنشینەکەی بۆ دابینکردنی پێداویستی و ژیاریی سەربازەکانی تەرخان بکا.[416]

میر هەمیشە ئامادەبوو داوای سوڵتان بەجێبهێنێ، چونکە سەربازانی دەرەبەگایەتییەکان بڕبڕەی پشتی ولاتپارێزیی بوون. لەم بارەیەوە (أبن الأثير) لە زمانی نورەددین مەحمودەوە، دەڵێ: "ئێمە هەمیشە خەریکی لەشکرکێشیین، لەبەرئەوە ئەگەر سەربازانی گشت میرەکان بە چەك و تفاقەوە ئامادە نەبن، لەوبارەدا ئیسلام، تووشی لاوازی و شکستیی دەبێ.[417]

وەلێ، سەربازانی میری دەرەبەگ، پێویستە، لە وەرزی کشتوکاڵ و درەودا، لەسەر زەوی و زاری خۆیان بمێنن، مەگەر، لەو وەرزەدا شەڕ بەردەوام بووبێ و نەیانتوانیبێ شەڕەکە بەجێبهێڵن. گەلێ جاریش دوژمن بەسەر ئەو هەلەوە نەدەچوو، هێرشی دەکردە سەر زەوی و زارەکان، (أبو شامه) لە (أبن أبي طي)یەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: "لە ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٣ز) دا لەشکری (صقليه) لە ژێر فەرماندەیی جۆرج (جرج) ویستیان هێرش بکەنە سەر شاری ئەسکەندەرییەو لەوێ دابەزن، هەستان نامەیەکیان بۆ شای فەڕەنگ نووسی، گوتیان: "سەربازو لەشکرگەلی سەلاحەددین، چوونەتەوە سەر زەوی و زاری خۆیان و وەرزەکەی وەرزی دەغڵ و دانەو هەموویان بلاوەیان لێکردووە، کەمێك نەبێ، قاهیرە سەربازی لێنەماوە"[418].

وامان بۆ دەردەکەوێ، ڕژێمی فاتمیی لە میسر، لەگەڵ دەستوورو ڕێسای دەرەبەگایەتییەکەی نورەددین کەمێك نەبێ،

---

[410] لە عەرەبییەکەیدا بە (الأخبان) هاتووە: واتا دەرەبەگایەتیی. بنۆڕە: اليوتيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٢٢٢، ٢٢٥. السلوك، ٨٥/١.

[411] المقريزى، السلوك، ٦٥/١.

[412] الفتح القسي، ٥٠٨، الروضتين، ١٨٧/٢. مفرج الكروب، ٣٥٧/٢. ابن الفرات، ج٢، مجلد ٤، ص١٧.

[413] الباهر، ١٦٩. الروضتين، ج١، ق١، ص٢٠. مفرج الكروب، ٢٨٠/١.

[414] ئەتابەك: پەروەرشتکار ـ میری باوك (باوك)، صبح الأعشى، ١٨/٤. الكامل، ٨٠/١٠. د.حسن الباشا، الألقاب الاسلامية، ١٢٣.

[415] الباهر، ١٦٩.

[416] برنارد لويس، العرب فى التأريخ، دار العلوم للملايين، بيروت ١٩٥٤، ص٢٢٢.

[417] الباهر، ١٦٩. مفرج الكروب، ٢٨٠/١.

[418] الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٦٥.

هیچ فەرق‌و جیاوازییەکی نییە. دیوانی دەرەبەگایەتی کە (دیوانی ئەنجومەنیشی)[419] پێدەگوترا، دیوانێك بوو لەو دیوانانەی کە بە "دیوانی سوپاوە" بەسترابوو، ئیشی سەرەکیی ئەوەبوو کە کاروباری دەرەبەگایەتی هەڵسوڕێنێ، بە تایبەتی دەرەبەگایەتی سەربازیی، بەرپرسی دیوانی سوپاش بۆی نەبوو یەکێ لە میرلەشکرەکان بگۆڕێ، یان دەسکاریی زەوی‌و زارەکانیان بکات، مەگەر بە فەرمان (مرسوم)[420].

سنووری زەوی‌و زارەکەش بۆ هەر دەرەبەگێ، لە بڕوانامەی دەرەبەگەکەدا[421] دەنووسراو "دیوان الأنشاء"یش بەڵگەنامەیەکی بۆ دەردەهێنا پێی دەگوترا "سجل". سیستەمی سەلاحەددینیش هەر بەو پێودانگە هەڵدەسوڕا. ئەوەبوو کاتێ (أبن المقدم)ی لە ساڵی (٥٧٨ك/ ١١٨٢ز)[422]دا دامەزراند بە والی دیمەشق، بلاوکراوەیەکی بۆ دەرکرد. بگرە بۆ دامەزراندنی کوڕو برای خۆیشی، بلاوکراوەی بۆ دەردەهێنان. بە نموونە، کاتێ لە ساڵی (٥٨٠ك/ ١١٨٤ز) (الملك العزيز العثمان)ی کوڕی خۆی بە کەفالەتی (تقي الدين عمر)ی ئامۆزای، بە والی میسر دامەزراند، بلاوکراوەیەکی، یان باشتر بڵێین، جاڕنامەیەکی بۆ جاڕدا. هەروەهاش، کاتێ (الملك الأفضل نورالدين علي) کوڕەگەورەی خۆی، بە کەفالەتی (الملك العادل)ی مامی. کە ئەوکات سەرگەورەی حەڵەب بووە.[423] کرد بە والیی شام، جاڕنامەی بۆ دەرکرد.

خەلیفەی فاتمییەکانیش زەوی‌و زاری دەوڵەتی بە دۆست‌و ناسیاوانی خۆی دەدا بەشێوەی (دەرەبەگایەتی وەبەرهانین – أقطاع أستغلال)،[424] واتا مافی ئەوەیان هەبێ زەوییەکە وەبەربهێنن‌و سوود لە داهاتەکەی ببینن، بەڵام زەوی‌و زارەکە نەدەبوو بەموڵك‌و لە باوکیشەوە بۆ کوڕەکەی نەدەمایەوە، بەڵکو هەر بەدەست کابرای دەرەبەگەوە دەمایەوە، تا ئەو ماوەیەی بۆی دیاریی دەکرا. زانایانی ئایینیش بواری ئەوەیاندا زەوی‌و زار بدرێ بە فەرماندەکانی لەشکر لە جیاتی ئازووقەو لەبری ئەو ماندووبوونەی بۆ سوپا و بۆ جەنگی بەخەرج دەدەن، بۆ ئەوەش شەرتوشروتیان دانا، کە دەرەبەگ باج‌و خەراج‌و سەرانەی دەکەوێتە ئەستۆ، سا، بە شێوەی دابەشەکی لێی وەربگرن، یان بە پێودانگی ڕووبەڕوو و گەورەیی زەوی‌و زارەکە.[425] کاتێکیش زەوی پێبەخشراوەکە بمرێ، یان لە شەرتوشروتی پێکهاتنەکە لابدا، ئەوە، لەوبارەدا زەوی‌و زارەکە دەبێتەوە بە هی خەلیفە.

بەوەش ئەم دەرەبەگایەتییە دەبێت بە "دەرەبەگایەتی وەبەرهێنان‌و بەخشینی سوودئاوەر". موڵکدارێتی زەوی‌و زاری گشتیی نەدەدرا بە دەرەبەگ، کە بۆ کوڕەکانیشی بە وەراسەت بمێنێتەوە، بەڵکو بۆ ماوەیەك لە سوود لێوەرگرتن‌و وەبەرهێنانیدا جێگای خەلیفەی دەگرتەوە، ئەو ماوەیەش بە پێی ڕێککەوتنێك دیاریی دەکرا.[426] ئا ئەمە هەندێکە لەو فەرق‌و جیاوازییەی نێوان دەرەبەگایەتیی نێوان وڵاتانی ڕۆژهەڵات‌و دەرەبەگایەتیی ئەوروپا. دەرەبەگایەتیی ڕۆژهەڵات دەرەبەگایەتیی حکومەت بوو، هی والییەکان بوو، لەوە بوو درێژە نەکیشێ، وەلێ ئەوەی ژێر حوکمی نورەددین، جاروبار، وەکو دەرەبەگایەتیی ئەوروپا، لە باوکەوە بۆ کورەکەی دەمایەوە.

هەرچی سەلاحەددینە، هەردوو ئەم کەلەپوورەی نورەددین‌و فاتمییەی بۆ مایەوەو پێڕۆی کردن‌و زۆر هەوڵیدا سوودیان لێوەربگرێ‌و لە پێناوی مەسەلەی جیهادی ئیسلامیی و بەرژەوەندی دەوڵەتی ئەیبوبیدا بیانگونجێنێ و جارجارەش دەرەبەگەکان بەشێوەیەك بگۆڕێ لەگەڵ ڕەوشە نوێیەکەدا بلوێ. لەبەرئەوە، زەوی‌و زاری بە کەسێ دەدا

---

419 صبح الأعشى، ٣/٣٨٩ـ ٣٩٠.

420 صبح الأعشى، ٣/٤٨٨. الخطط (طبعة أوفسيت) ٢/٢٤٢.

421 محمد بن طلحة الوزير، العقد الفريد للملك السعيد، (نەناوی چاپخانەکەی هەیەو نە ساڵی چاپکردنی)، ص١٥٨.

422 جب، صلاح الدين، نقلا عن مخطوط البرق الشام: ج٥، ورقة ٤٧أ.

423 السلوك، ١/٨٥.

424 الماوردي، الأحكام السلطانية والولايات الدينية، طبعة مصطفي البابي الحلبي، مصر ١٩٦٠، ص١٩٤ـ ١٩٧.

425 ن، م.

426 صبح الأعشى، ٤/٥١. د. طرخان، النظم الأقطاعية، ص٢٢.

شایستەو لێهاتووبێ، تا وای لێهات، لەسەردەمی ئەودا هەموو وڵاتی میسر بووە دەرەبەگایەتیی، (المقریزي) دەڵێ: "لە ڕۆژانی حوکمی سەلاحەددینەوە تا بە ئەمڕۆ دەگا، (واتا هەتا ڕۆژانی المقریزي) هەر هەموو زەویو زاری میسر، بۆ سوڵتانو میرەکانی سوڵتانو فەرمانداری لەشکرەکانی سوڵتان دادەبڕدرێن".[427] "واتا هەندێ سەربازیش زەویو زاریان پێدرابوو". وەزیر (محمد کوڕی طلحة) باسی هۆکاری زەوی سەندنەوە لە سەرباز دەکا و باسی "هۆکارەکانی خۆ لە دیوان دەربازکردنی سەربازو خزمەتنەبردنە سەری سەرباز دەکات"[428].

ئەم گرێبەستیو پێکهاتنەی نێوان هەردوولا وەك (أبن طلحة الوزیر) شرۆڤەی دەکاو لە دەقی پێکهاتننامەکەدا تۆماردەکران بریتی بوون لە شەرتوشروتی بنەماکانی سەرڕاستیو لێوەشاوەییو چەندایەتی دەسهاتو داهات". کە جارەهای جار، زەوی بۆ ماوەی جیاواز جیاواز وەرگرتووەو سوودو نرخی جیاوازیان هەبووە. بە دەربڕین و نووسینی ئەم سەردەمە، ئەوەیە: کە تا چەند سوودی بە دەوڵەت گەیاندووەو، تا چەند ئامادەباشیی سەربازیی نواندووەو، تا چەندیش فڕوفێڵی کردووە، واتا بە پێودانگی ئەم خەسڵەتانە، زەویو زاری پێ دەدرا، یان نەدەدرا. ئەوجا ماوەکە دیاری دەکراو یەکەم ڕۆژو، دوا ڕۆژی تەواوبوونیشی دەنووسرا. "پاشان مافو مزوکرێی قەرسیاوو ئامرازی نووسراوو بەشە ڕەواکان کە دەکەونە ئەستۆی مەلاو کشتکار، هەمووی لە قەواڵەو قۆچانی ئەو زەوییە بەخشراوانەدا تۆماردەکرانو، شەرتوشروتی ئەوەشی دەخرایە سەر کە پێ درێژی نەکاو، بەردەوامیی ئیشو سەقامگیریی ئەركو فرمانی خۆی نەشێوێنێ، جا ئەوجا سنووری زەویو زارەکەشی بۆ نیشان دەکرا". جگە لەوەش، "ئامادەباشیی سەربازییو چەكو تفاقی شەڕو پێداویستی خزمەتو سوودی سوپا، بە پێی شەریعەتی ڕێککەوتنامەکە هەمووی دەنووسران"[429].

زەویو زار، بەو پێیە بە هەموو میرەکان نەدەبەخشرا، بەڵکو تەنها بە ئازاو چاونەترسو دوژمن کوژەکان دەدرا. هەرچی ئەوانەشە کە زەوییان نەبوو، ئەوانە لە لیستی بەخششدا ناویان دەنووسراو مووچەی فەرمانبەریان پێدەدرا، ئەوانەش، هەربەشێ بوون لە سوپاو هەمیشەئامادەبوون بۆ شەڕ، هەرچی ئەوانەشە کە نەمووچەخۆری سوڵتان و، نە دەسدای دەرەبەگ بوون، ئەوانە پێیان دەگوترا (بێ کارەکان) کە زۆر جاران ناویان لە سەرچاوەکانی ئەو سەردەمەدا بەرچاو دەکەونەوە.[430]

(عمادالدین الکاتب) دەڵێ: "کاتێ سەلاحەددین هێزی تازەی لە جێگای هێزەکانی ناو (عکا) دانا، فەرمانی دا، بێ کارەکان بانگهێشت بکرێنو ئەركو مەسرەفی خۆیان وەربگرن".[431]

ئێمە نازانین هەر میرێکی دەرەبەگ، چەند سوارەو پیادەی دەدا بە سوپای سەلاحەددین، چونکە وەك (المقریزی)[432] دەڵێ: "هیچ مێژوونووسێ، کتێبێکی تایبەت بە سوپای لەشکر دانەناوە"، بەڵام ئەوەی لێمان ڕوون و ئاشکرایە، ئەوەیە کە خزمەتگوزاریی جەنگ و دەرەبەگ، پێ بە پێی پتر بوونی دەرەبەگایەتی لە زیادبووندا بوو، ئەگەر سوڵتانیش، دەرەبەگایەتییەکی نوێی سازبدایە، کابرای دەرەبەگی تازە، دەبوو ژمارەیەکی پتر سەربازی بدایە بە سوپای پایتەخت (سوپای سوڵتان)[433].

سەلاحەددین، هەر زوو، کە هێشتا خۆی سەر بە نوورەددین مەحمود بوو، کەوتە دابەشو بەخشینی زەویو زارو سازدانی دەرەبەگایەتی، کاتێکیش نورەددین مەحمود (الأمیر خالد القیسراني) ی خاڵۆی خۆی، بۆ دڵنیایی لە

427 الخطط (طبعة المعهد) ٢/٥٤.

428 العقد الفرید للملك السعید، ص١٥٨.

429 العقد الفرید، ص١٥٨. بنۆرە: النویري، نهایة الأرب، ٨/٢٠٠ـ ٢٠١.

430 بنۆرە: الروضتین، ج١، ق٢، ص٥٣٢. نقلا عن ابي طي، السلوك، ١/٧٣.

431 الفتح القسي ٤٥٧.

432 الخطط (طبعة بولاق)، ١/١٤٧.

433 محمد حسنین ربیع، النظم المالیة في مصر زمن الأیوبیین، ص٣٦.

ئیشەکانی سەلاحەددین ڕەوانەی میسر کرد، سەلاحەددین، هەموو "لەشکرو ئۆردوگاو ئەرک و مەسرەفی دەرەبەگایەتیی و مووچەی فەرمانبەرانی سولتانیو مووچەو دەرماڵەکانی دیکەی، پیشان دا"[434].

یەکەم زەوی وەرگرو تازە دەرەبەگی میسر، باوکی سەلاحەددین (نجم الدين أيوب) بوو، کە سەلاحەددین (ئەسکەندەرییەو دمیاط و البحيرة)ی لە مانگی ڕەجەبی ساڵی (٥٦٥ك/ ١١٧٠ز)دا، هەر بە گەیشتنی بۆ میسر لەگەڵ (شمس الدولة تورانشا)ی کوڕە گەورەیدا، بۆ دابڕیو پێیبەخشی. ئەوە بۆ باوکی، (شاری قوصو أسوانی صعیدی میسرو عیذابی سەر دەریای سوور)[435]یشی، دا بەم برایەی، لە ساڵی (٥٦٦ك/ ١١٧١ز) دا، تورانشای برای داوای زەویو زاری پتری کرد، سەلاحەددین قایل بوو، "بوش"ی صعیدی میسرو ناوچەی (جیزە)و (سمنود)و زەویو زاری دیکەشی پێ دا.[436]

تورانشای ناوبراوی برای سەلاحەددین، هەڵمەتی بردە سەر وڵاتی (النوبة) لە باشوری میسر. تورانشا (میر أبراهیم الکوردي)ی لەتەك خۆیدا بردبوو، ئەویش داوای قەڵای (أبريم)ی صعیدی میسری لێ کرد، ئەویش ئەو ناوچەیەی پێ داو کۆمەڵێ کوردی بێکاریشی لەگەڵدا ناردن.[437] ئەمەش، مانای ئەوەیە کە برای سولتانو ڕەنگە کەسانی دیکەش، پێگەی ئەوتۆیان دەزگیر بووبوو، بۆیان هەبوو، زەویو زار بە هەرکەسێ بیانەوێ بیدەنێ.[438] پاشان لە شەووالی ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٤ز)[439]دا سەلاحەددین ئەم برایەی بە هەزار سەربازەوە نارد بۆ غەزاو داگیرکردنی وڵاتی یەمەن. تورانشا، پاش سەرکەوتنو وەدەستهێنانی وڵاتی یەمەن، ئەم وڵاتەشیان خستە سەر مەملەکەتی ئەیبوبیو هەستا یەمەنی بەجێ هێشتو گەڕایەوە بۆ دیمەشق. ئەوکاتەی سەلاحەدینی برایشی هاتبووە دیمەشق، تورانشا لە ساڵی (٥٧٤ك/ ١١٧٨ز)دا، داوای (بعلبك)یشی لێکرد. سەلاحەددین ناردیە سەر سەرگەورەی (بعلبك)، کە ئەوکاتە (شمس الدين محمود کوڕی عبدالملك. ناسراو بە أبن المقدم) بوو، لە گەورە میرانی نورەددینیش بوو، داوای لێکرد، دەست هەڵبگرێ لە شارەکە، بۆ تورانشای برای، (ابن المقدم) داواکەی دایە دواوەو قایل نەبوو، ناچار سەلاحەددین زۆی بۆ هێناو ناچاری کرد دەست لە سەروەری شارەکە هەڵبگرێو (بعلبك) درا بە تورانشا، کابرا بۆ ساڵی پاشتر، دەستی لە (بعلبك) هەڵگرت، ئنجا کەوتە داواکردنی ئەسکەندەرییە لە جیاتی (بعلبك)، سەلاحەددین دیسان داواکەی بەجێ هێناو (بعلبك)ی دابڕی بۆ (عزالدين فرخشا)ی کوڕی (شاهنشا بن أيوب)ی برای.

تورانشای چاوبرسیو بە هەڵپە، یەکێ بوو لەو گەورە پیاوە بە ژمارە کەمانەی دەوڵەتی ئەییوبی کە زەویو زارێکی زۆر بەرین و بەرفراوانیان بۆ خۆیان دابڕیبوو، هەروەها براکەی دیکەی کە ( الملك العادل) بوو، سەلاحەددین میسریشی جار جار[440] بۆ ئەو دابڕ دەکرد، بە مەرجێ (الملك العزيز عماد الدين عثمان)[441]ی کوڕیشی لە تەکدا بێ، چونکە حەڵەبی لەم سەندبووەوەو دابووی بە (الملك الظاهر الغازي)ی کوڕی. هەرچی (السلطان الأكبر الملك الأفظل نورالدين علي)ی کوڕیشێتی، ئەوە، دیمەشقیشی بۆ ئەو دابڕی.[442]

هەرچی (الملك المظفر تقي الدين عمر بن شاهنشا بن أيوب)یشە، ئەوە، ئەو ناوچەگەلێکی زۆری لێك دووری وەك

---

434 الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٥٨. مفرج الكروب، ٢٥٧/١ـ ٢٥٨. السلوك، ٥٢/١.

435 الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٦٦.

436 ن، م. ص٤٨٨. بوش: في بني سويف، بنۆڕە: السلوك ٨٢/١.

437 الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٣٢. السلوك، ٧٣/١.

438 الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٣١. بنۆڕە: سنا البرق الشامي، ١٢٩/١. البداية والنهاية ٢٧٠/١٢.

439 الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٥١. ابن الوردي، ١١٧/٢. البداية والنهاية، ٢٧٣/١٢. شفاء القلوب، ٥٠. الكوكب الدرية، ٢٢١ـ ٢٢٢. ابن مخرمة، تأريخ ثغر عدن، ج١، ق٢، ص٣٧.

440 السلوك، ٨٢/١.

441 الكامل، ٥٢٣/١١.

442 ن، م، ص.

(سیمیساط، میافارقین، حەما، المعرة، السلمیة، منبج، قلعة نجم، جبلة، اللاذقیة، بلاطنس[443] و جبل جور[444])ی کەوتە دەست. ئنجا سەرباری ئەم هەموو ناوچانە، (کفرطاب[445] و بغراس[446])یشی بۆ دابڕکراو لە میسریش شارو دەوروبەری شاری (الفیوم و القایاتو یوش)یشی[447] وەرگرت.

کاتێکیش (مظفرالدین کوکبري) دەستی لە موڵکەکانی خۆی هەڵگرت کە بچێ (أربیل) وەربگرێ، سەلاحەددین، شارەکانی (حران، الرها، الموزر)و هەندێ شاری دیکەی جزیرێ کە بە دەست خۆیەوە بوون، هەمووی خستە سەر دەرەبەگایەتییەکەی (تقي الدین عمر)، بەو جۆرە (تقي الدین) لە هەموو خزمەکانی سەلاحەدین گەورەتر دەخوڕیو لە هەمووشیان پتر حەزی لە موڵکداریی دەکرد. ئیدی بەو شێگیرییەوە هەڵمەتێکی بردە سەر باکووری ئەفریقا، بۆ ناوچەکانی (جبال نفوسەو بەرقە) لە لیبیاو[448] مەبەستی ئەوەبوو سەربەخۆیی خۆی وەربگرێ، لە سەلاحەددین جیابێتەوە. وەلێ سوڵتان قایلی کردو موڵکی زیاتری بۆ دابڕی. بە مردنی (تقي الدین) لە ساڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز) دا، سەلاحەددین بەشێ لە موڵکەکانی بۆ (الملك المنصور محمد)ی کوڕی دابڕکرد، بریتی بوون لە (حماە، سلمیة، المعرة، منبج و قلعة نجم). لە ساڵی ٥٨٢ك/ ١١٨٦ز)دا، سەلاحەددین کە چوو بوو بۆ (حران) لە خاکی جزیرێ لەوێ نەخۆشکەوت، لە میسر بوو بە قاو کە گوایا مردووە، "لەولاوە لە میسر (تقي الدین) کەوتە خۆ بۆ دەستبەسەراگرتنی میسر"[449]. ئەمەش سەلاحەددینی وا لێ کرد دووبارە چاو بە سیاسەتی سیستەمی پێشتری دەرەبەگایەتییەکەیدا بخشێنێتەوە. لەبەرئەوە کاتێ ناساغییەکەی لەکۆڵ کەوت، هەستا (الفقیه ضیاء الدین عیسی الهکاري) کە زۆر ڕێزی لە لای هەبوو و، لە سوپاشدا قسەی سوار بوو، ناردی بۆ میسر، ئەم (تقي الدین)ەی قایل کرد کەمیسر جێ بهێڵێو سەلاحەددینیش موڵکی زۆری بەرفراوانی لە شام پێ بەخشی.

سەندنەوەی حەڵەبیش لە (العادل). وەك دەگێڕنەوە، کاتێ ڕوویدا کە میرێ لە میرەکانی سەلاحەددین بە ناوی (علم الدین سلیمان کوڕی جندر) کە ناحەزی (العادل) بوو کاتێ لە گەڵیدا لە حەڵەب بووەو، [450]هەردووکیشیان دایك بران، هەستا چوو بۆ لای سەلاحەددینو هزرو بیری گۆڕیو لە بارێکەوە هێنایە سەربارێکی ترو وەهای لێکرد، لە ناساغییەکەی دواینیدا، وەسیەتی کرد کە ئەگەر مرد چۆن چۆنی ولاتەکەی لە نێوان کوڕو خزمو میرەکانیدا دابەش بکرێت. سەلاحەددین ئەم جارەش سەری بەرزکردەوەو لە نەخۆشییەکەی چاك بووەوە. (علم الدین سلیمان) خۆی گەیاندەوە لایو پێی وت: "بە چ ئاوەزو عەقڵێکەوە زانیت کە وەسیەتەکەت بەجێ دەهێنرێو دەکرێ؟، بۆچی تۆ وادەزانی چوویت بۆ ڕاو تا دێیتەوە هەموویان دەستەو نەزەر بۆت ڕاوەستاونو کەس ناڵێ نەء؟ شەرم ناکەی باڵندە لە تۆ شارەزاتر بێ بەرژەوەندی خۆی لە تۆ باشتر بدۆزێتەوە؟!".

سەلاحەددین پێی گوت: چۆن؟ (علم الدین) پێی گوت: باڵندە بە سەر لقە بەرزەکانەوە هێلانەی خۆی دروست دەکات، تا بێچووەکانی بپارێزێ، کەچی تۆ قەڵا بەرزو قایمەکانت بە دەستەو دایەرەی خۆت داوەو کوڕەکانی خۆت لەسەر زەوی بەجێ هێشتووە، فەرموو، ئەمە حەڵەبە کە بە دایکی ولاتەکەت لە قەڵەم دەدرێ داوەتە دەستی براکەت، ئەوە حەمایە داوتە بە (تقي الدین)ی برازات، ئەوە (حمص)ە داوتە بە کوڕەکەی (أسدالدین شێرکۆ)، هەروەها (الأفضل)ی کوڕت، لە

---

443 بلاطنس: (قەلایەکی قایمکارە لەسەر کەناراوی شام، بەرامبەر (لاذقیة)، سەر بە حەڵەبە)، معجم اللبلدان ٤٧٨/١.

444 جبل جور: (شارو ناوچەیەکی گەورەیە لە دیوی ئەرمەنستانەوە لەگەڵ دیاربەکر پێوەندە، قەلاو گوندی زۆرن). معجم البلدان ١٠٢/٢.

445 کفرطاب: (شارۆچکەیەکە دەکەوێتە چۆڵەوانی نێوان (المعرة)و حەڵەبەوە)، معجم البلدان ٤٧٠/٤.

446 بغراس: (شارێکە لە چیای لەکام، چوار قۆناغ لە ئەنتاکیەوە دوورە)، معجم البلدان، ٤٦٧/١.

447 القایات: (لە منیای ئێستایەو لە قەراغ بیابانەکەیە، لە ڕۆژئاواوە).

448 الکامل، ٥٢٣/١١ـ ٥٢٤.

449 الکامل، ٥٢٤/١١.

450 الکامل، ٥٢٤/١١. وفیات الأعیان ١٧١/٧. النجوم الزاهرة، ٣٠/٦ـ ٣١.

**میسر لەگەڵ (تقي الدين عمر) دا ناوە، کەی دەرییەڕێنێ، دەریدەپەڕێنێ، کوڕەکەی دیکەت، ها لە ژێر دەوارێکدا لەگەڵ براکەت دەژی، چی لێبکا دەیکا، سەلاحەدین گوتی: هەرچی دەڵێی ڕاستە، بەڵام جارێ بیشارەوە باکەس نەزانێ، جا ئەوجا کەوتە خۆو حەڵەبی لە (العادل)ی برای سەندووە دای بە (الملك الظاهر)ی کوڕی‌و پاش ئەوەش، بۆ ئەوەی شام بە تەنیا بەدەست کوڕەکانی خۆیەوە بێت، هەستا (حران، الرهاو ميافارقين)يشی دا بە (الملك العادل)، تا لە شام دووری بخاتەوە.[٤٥١]**

**پاشان لە ساڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز)دا، سەلاحەددین داوای لە (العادل) کرد، دەست لە هەموو موڵکەکانی وڵاتی شام هەڵبگرێ‌و وازی لە نیوەی وڵاتی میسریش بهێنێ‌و، تەنیا (الكرك، الشوبك، السلطو البلقاء)ی "واتا موڵکەکانی باشووری شامی بەدەستەوە بمێنێ و لە جیاتی ئەوەش موڵکەکانی لای ڕۆژهەڵات (وڵاتی جزیرێ)ی بداتێ. هەرچی (الملك القاهر محمد کوڕی شێرکۆ)یشە. کە خۆی بە بەرترو پێشتر لە سەلاحەددین بۆ حوکم کردن دادەنا. ئەوە سوڵتان، (حمص، تدمر، الرحبة والسلمية)ی بۆ دابڕی. کاتێکیش ئەم (القاهرة) لە سالی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)دا مرد، سەلاحەددین زەوی‌و زارەکانی بۆ (أسدالدين شيركۆ)ی دووەمی کوڕی هێشتەوەو فەرمانیشی بۆ دەرکرد.[٤٥٢] بەو جۆرە دەبینین سەلاحەددین بە تەواوی هەستی بەزەرورەتی پێداچوونەوەی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی هەرێمە گرنگەکانی دەوڵەت‌و قەڵاو قایمکارەکانی بەسەر کوڕەکانی خۆیدا کردبوو، بەرلەوەی کار لە کار بترازێ و بەرلەوەش کە میر (علم الدين سليمان ) داوای لێبکاتەوە، وەلێ مێژوونووسان لەسەر ئەوە ڕاهاتوونە ڕووداوو کارەساتە گەورەکان بە حەزو ئارەزووی کەسێکەوە ویستبێتی ببێ، گرێ بدەن. دووریش نییە میری ناوبراو، بووبێتە هۆکاری ئەو گۆڕانکارییانەی کە ڕوویاندا.**

**سا، بەهەر حاڵێ، ئەوەی بووە، بووە، ئێمە لێرەدا، مەبەستمان لەوە نییە درێژە بە باسی ڕووداوەکانی دابەش‌و دابەشکاریی زەوی‌و زاری دەرەبەگایەتییەکانی بدەین، بەڵکو لەو باسە، مەبەستمان لە سیفەت‌و خەسڵەتەکانی ئەو سیستەمە سەربازییەیە کە سەلاحەددین لەسەری دەڕۆیشت‌و پێڕۆی دەکرد.**

**میرانی نورەددین‌و ئەسەدیی، کە لە سەردەمی سەلاحەدیندا پێگەی قایم‌و جێگەی لە پێشیان هەبوو، زەوی‌و زارو ناوچەی دەرەبەگایەتیی گرنگ‌و قەشەنگیان پێدرابوو، یەکێ لەو میرانە (سابق عثمان بن داية)یە، سەلاحەددین (شيزر)و (أباقبيس)ی نزیك بە شیزری بۆ دابڕی.[٤٥٣] (ناصرالدين بن متكورس بن خمارتكين)، ئەوە، قەڵاکاری برزيەو صهیۆن[٤٥٤]ی بە دەستەوە بوو. (بدرالدين دلدرم)، ئەوە (تل باشر)ی لە دەست بوو.[٤٥٥] (عزالدين أسامة) خاوەنی (كوكب و عجلون)[٤٥٦] بوو. (بعرين)[٤٥٧]درابوو بە (عزالدين ابراهيم بن شمس الدين بن المقدم)، (كفرطاب و فامية)[٤٥٨]یش هەر بەو درابوون. هەرچی (ناصرالدين)ە، کە کادیرێکی سەلاحی بووە لە حەڵەب، ئەوە (عين تاب)[٤٥٩]ی پێ درابوو. لە میرەکانیش (سيف الدين علي بن أحمد الهكاري) کە بە (المشطوب) ناوبانگی دەرکردبوو، ئەوە، ئەو، دەرەبەگی خاوەن نابلس‌و گوندەکانی**

451 وفيات الأعيان، ١٧١/٧. الكامل، ٥٢٥/١١، زبدة الحلب، ٨٤/٣ـ ٨٥. مفرج الكروب، ١٨٣/٢. شفاء القلوب، ١١٧.

452 النجوم الزاهرة، ٩٩/٦ـ ١٠٠. شفاء القلوب، ٤٩. د.طرخان، النظم الأقطاعية، ص٣٩.

453 النوادر، ١٢٦، ٢٤٥، الفتح القسي، ٣٩٤، المختصر، ١١٤/٥.

454 النوادر ٢٤٥. مرآة الزمان، ٣٥/٨. المختصر، ١١٥/٥. (برزيه): قەڵاکارێکە نزیك کەناراوی شام، وا بە قۆچی شاخێکی بەرزەوە). معجم البلدان، ٣٨٣/١. ..(صهیۆن): قەڵایەکی قایمکارە لە ناوچەی (حمص)، معجم البلدان، ٤٣٧/٣.

455 المختصر ١١٥/٥.

456 ن، م، ص.

457 بعرين، يان بارين: شارێکە لە نێوان حەڵەب‌و حەممادا، لەلای ڕۆژئاواوە، معجم البلدان، ٣٢٠/١.

458 الفتح القسي، ٣٩٤. النوادر، ١٢٦. المختصر، ١١٥/١٥. وفاميە: شارێکە لە کەناراوەکانی حمص. (أفاميە)شی پێدەگوترێت. معجم البلدان، ٢٣٣/٤.

459 شفاء القلوب، ١٩٧ـ ١٩٨.

نابلس[٤٦٠] بوو، کە لە ساڵی (٥٨٨ك/ ١١٩٢ز)دا، مرد. (ابن عماد الدين. ابن مشطوب) جێگای گرتەوە. پاش ئەوەی وڵاتی (نصيبين) لە ساڵی (٥٧٨ك/ ١١٨٢ز)دا کەوتە دەست سوپای ئەییوبی، ئەوە، ئەو وڵاتە درا بە میر (حسام الدين أبا الهيجاء الهكاري) پێشەنگی کوردو ئەسەدییەکان کە بە (السمين) بەناوبانگ بوو. کە لە ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) دا (زين الدين يوسف) یش مرد، (أربیل‌و شارەزوور) دران بە میر (مظفر الدين كوكبری). (دربساك[٤٦١]و بفراس[٤٦٢])یش دران بە (علم الدين سليمان بن جندر)، خاوەنی قەڵاکاری (عزاز)ی نزیك شاری حەڵەب.[٤٦٣]

هەر هەرێمێکیش لە ژێر دەستی میری عارەب (حجي بن كرامة)دا بوو، ئەوە، سەلاحەدین لە پاداشت‌و خەڵاتی ئەو میرەدا ئەو خزمەت‌و شۆڕشەی کە لە ساڵی (٥٨٣ك/ ١١٨٧ز)دا لە کاتی گرتنی شاری بەیروتدا، دژ بە دوژمن بەرپای کرد، هەمووی بۆ کرد بە خەڵات. هەرچی خێڵی (بنوجذام و ثعلبة) شە لە میسر، ئەوە سەلاحەدین زەوی‌و زارێکی زۆرو بەرفراوانی بۆ دابڕین، لە پاداشتی پاراستنی ئاسایشی میسرو هاوپشکییان لە غەزادا، زۆربەی ئەو زەوی و زارانەشیان کەوتبوونە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی میسر، کە زەوی‌و زاری حەیدەرییەکان، کوڕانی (حيدرة بن معروف) بوون لە (البرامون).[٤٦٤] هەروەها کۆمەڵە عەرەبێکی زۆری دیکەی وڵاتی میسر، زەوی‌و زاریان پێدرا.[٤٦٥]

### ٦- تەیارو ئامادەباشی سەربازیی ( لەشکرکێشیی ):

تەیارو ئامادەکردنی لەشکر ئەو ئەرك‌و فرمانانەیە کە فەرمانداری لەشکر لە بواری نەبەردو خڕکردنەوەی سەربازو لەشکرکێشیدا بۆ مەیدانی شەڕ ئەنجامی دەدا، یان ئەو ڕێکخستن‌و دروستکردنی هاودەنگییەیە کە بۆ بەربەستی هێرشی دوژمن و بەرەڤانی‌و تێکشکاندنی دوژمن بەجێی دێنێ[٤٦٦]. جا، تەیارو ئامادەکردنی لەشکرو سوپا، بەمانای کۆنی، یان بە مانای تازەی، هەر هەمان مانایەو نەگۆڕاوە، ئەوەی کە گۆڕاوە تەنیا شێوازی کارو سنفەکانی لەشکرو سوپاو، ئامێرو ئامرازی جەنگ‌و چەك‌و جبەخانەی سوپایەو هیچی تر. ئەو تەیارو ئامادەباشییەی کە ئێمە مەبەستمانەو بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە، بزانین سوپای ئەییوبیان لەو سەردەمەی خۆیاندا چۆنیان هەڵسوڕاندووەو، هەقمان بەسەر لەشکرگەلی ئیسلام و عەرەبەوە نییە، کە زووتر چییان کردبێ‌و چۆنیان کردبێ، وەلێ ئەوە دەڵێین کە چاکترین و بەرچاوترین جۆری ڕێکخستنی سوپا، ڕیزبەستنی شانبەشان‌و سیستەمی کردۆسە.[٤٦٧]هەرچی سیستەمی سوپای ئەییوبییە، ئەوە ئەوان سیستەمی پێنج هێزەکییان بەکارخستووە.

#### أ- سیستەمی پێنج هێزەکیی:

ئێمە، وای دەبینین، ئەم سیستەمە، سەلاحەددین داینەهێناوە، بەرلە سەلاحەددینیش هەر هەبووە، ئەم شێوازەی سەلاحەددین بەکاری خستووە هیچێکی بە ئەسڵ لە شێوازی فەرماندارە بەناوبانگەکانی پێشتر جیاواز نییە، وەلێ لە لێکۆڵینەوەی ئەم سیستەمی پێنج هێزەکییەدا گرێ‌و گۆڵمان دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە، ئایا جۆری ئەم پێنج هێزەکییە چۆن بووەو شێوازی ڕیزبەستن‌و شانبەشانبوون لەم پێنج قۆڵەدا چۆن چۆنی ڕێکخراوە؟.. نەخاسمە هەردوو قۆڵی ڕاست‌و چەپ. و پێگەی ئەم دوو قۆڵە لەچاو بەرسنگی لەشکردا. ئەو کتێبانەی لەبەردەستماندان و پشتمان پێیان بەستووەو بۆ بوارو بابەتی ڕیزو ڕێکخستنی سوپا دانراون، باسی چەندین سیستەم دەکەن، کە لەشکرگەلی ئیسلام، لە

---

460 البداية والنهاية، ١٢/٣٥٢.

461 دربساك: دەکەوێتە ئەوپەڕی باکووری شامەوە، بەرامبەر (بفراس).

462 بفراس: شارێکە لەناو چیای (لكام)دا، چوار قۆناغ لە (أنطاكية)وە دوورە، معجم البلدان، ١/٤٦٩.

463 الفتح القسي، ٢٥٨.

464 برامون، البرمونيين: بنۆڕە: ابن الجيعان، التحفة السنية باسماء البلاد المصرية، مكتبة الكليات الازهرية، القاهرة، ١٩٧٤، ص٤٦.

465 بنۆڕە: د. طرخان، النظم الأقطاعية، ص٤١- ٤٢.

466 الزعيم طه الهاشمي الجغرافية العسكرية، مطبعة دار السلام بغداد ١٩٢٧، ص ٨٣.

467 عن نظام الكراديس، انظر: مقدمة ابن خلدون، المطبعة البهية المصرية، ص١٩٠- ١٩١.

سەدەكانی ناویندا پەیڕەویان كردووە. ڕاستیشت دەوێ، ئەو كتێبانە لە ڕووی زانستییەوە تیئووێتی هیچ لێكۆڵەرێ ناشكێنن‌و باسی شتی وەها دەكەن لەوەدەچێ لەو سەردەمەدا هەر ڕووی نەدابێ، نەك تەنیا لەباسی ڕێكخستنی لەشكردا، بەڵكو لە باسی ڕووداوو كاروباری دیكەی لەشكریشدا. لەبەرئەوە بە پێویستی نازانین خۆمان لەم جۆرە باسانە بدەین كە تەنها مۆركی تیۆرییان لێدراوەو هیچی تر. ئەوەندەشمان بەسە كە تەنیا بگەڕێینەوە سەر ئەو واقیعانەی ڕووداونووسان تۆماریان كردوەو بەگوێرەی تواناش سوود لە كتێبگەلی شەڕو جەنگ‌و دەقە تیۆرییەكانیش وەربگرین.

ڕێكخستنی سوپای ئەییوبی، بەو شێوازە سەربازییەی، لە ڕشتەو بونیادی ئەندامە سەرەكییەكانی لەشی مرۆ دەچوو، وەك خاچیش دێتە بەرچاو. قەدوقاڵبی ناوەڕاست، ئەوە بەرسنگی لەشكرەو كەللەكەشی ئەوە پێشەنگی لەشكرەو هەردوو قۆڵ‌و باڵیشی لە هەردوو شانییەوە ئەوانەش قۆڵی ڕاست‌و قۆڵی لای چەپی لەشكرن‌و، هەردوو لاقیشی، ئەوانەش دابنێ بە پاشكۆی لەشكرەكە. واتا ئەم جۆرە ڕێكخستنە لەسەر پێنج بەش، ڕوونتر بڵێین لە سەر پێنج هێز دامەزراوە. ئیدی لەوەوە ئەم ناوی پێنج هێزەكییەی بەسەردا بڕدراوە.[468]

(ابن منكلي) وای بۆ دەچێ كە ڕیزەكان بە سێ جۆر ڕێك دەخران، جیاوازیی نێوان ئەو سێ جۆرەش لەوەدا بەدی دەكرا كە جێگەو پێگەی هەردوو قۆڵی ڕاست‌و چەپ لە چاو جێگەی بەرسنگی سوپاكەدا، بە سێ جۆر دەگۆڕان، جاری وا هەبوو هەردوو قۆڵی ڕاست‌و چەپ وەپێش بەرسنگی سوپا دەكەوتن، جاری واش هەبووە بەرسنگ، پێش هەردوو قۆڵەكە دەكەوت، جاری سێیەمیش ئەوەیە كە قۆڵی ڕاست‌و قۆڵی چەپ‌و بەرسنگی سوپاكەش، هەرسێكیان، هاوشان لەسەر یەك هێڵی ئاسۆیی دەوەستان، لەم بارەیاندا پێیی دەگوترا: ڕیزی تەخت. (ابن منكلي) دەڵێ: ئەم جۆرە ڕیزەیان تۆكمەترو بەجێترە، پێدەچێ كە لە هەمووشیان بەناوبانگتر بێت، ئەمەیان بە شەش ڕیز ڕێك دەخرا، هەر ڕیزەو سەدو یازدە سوارەی تێدا دەبوون. جۆرەكەی دی، پێی دەگوترا: (ڕیزی كەوانەیی)، دەكەوێتە دەرەوەی قۆڵەكان‌و لە كۆتایی هەریەكە لە قۆڵەكاندا، كردۆسێ ئەسپ، بۆ بەهێزكردنیان ڕیز دەكران.

جۆری سێیەمیان پێچەوانەی كەوانەیی بوو، پێی دەگوترا ڕیزی چەمیاگ (المعطوف)، ئەم ڕیزە دەكەوێتە ناو هەردوو قۆڵەكەوە، موسوڵمانەكان لە كاتی زەروردا نەبوایە، ئەم جۆرە تەرتیبەیان نەدەخستەكار، ئەوان كەسانی بەجەرگ‌و بەهێزیان لە قۆڵی ڕاست‌و قۆڵی چەپەوە دادەنا، یانەخۆ بەرسنگی لەشكرەكەیان بەدوو كردۆس ئەسپ بەهێز دەكردو لە ڕێكخستنی ڕیزەكانیشدا زەلامە كورتە بالآكانیان لە تواوە (پێشەوە) دادەناو بالآبەرزەكانیش لەدواوە ڕیزیان دەبەست[469] و، جۆری دیكەی ڕێكخستنی كەمترگرنگ‌و بەناوبانگی لەشكریش هەبوون.[470]

(الطرطوسي)ی هاوسەردەمی سەلآحەددین وای دەبینێ، كە سەربازە پیادەكان پێویستە لە پێش سوارەكانەوە دابنرێن، تا بۆ سوارەكان ببنە سەنگەر، بەمەرجێ پیادەكانیش لەبەردەمی خۆیانەوە سەتەرێ هەبێ، لە مەترسی شمشێربازو ڕم وەشێن و تیرئەنداز بیانپارێزێ. لە نێوان هەردوو پیادەشدا تیرەنداز هەبێ، "ئەگەر هەلی بۆ ڕەخسا، تیر لە دوژمن بگرێ، یان ئەگەر ڕیز تێكچوو، تیری خۆی بوەشێنێ"[471]. جێگای سوڵتانیش، خواسایی هەر لە ناو ڕیزەكانی

---

[468] مرضي بن علي الطرسوسي، تبصرة ارباب الالباب في كيفية النجاة في الحروب، مخطوط في مكتبة لودليان، بجامعة اكسفورد ـ انكلترا. تحت رقم ٢٦٤، وفي حوزتنا نسخة مصورة منه، ورقة ١٩٠أ، الفتح القسي ٨٩، ١٥٤، حسين يوسف موسى وعبدالفتاح الصعيدي، الافصاح في فقه اللغة، مطبعة المدني، دار الفكر العربي، ط/٢، ١٩٦٤، ج١، ص٦١٩.

[469] د. جهادية القرةغولي، التنظيمات الادارية والعسكرية في العراق والشام، مطبوع بالآلة الكاتبة، ص١٧٢. نقلا عن الأدلة الرسمية في التعابي الحربية، مخطوط، ورقة ١٣ـ ١٤.

[470] بۆ شارەزابوونی زیاتر بڕوانە: جرجي زيدان، تأريخ التمدن الاسلامي، منشورات دار مكتبة الحياة، مؤسسة خليفة، للطباعة بيروت ١٩٦٧، ج١، ص١٩٩.

[471] الطرسوسي، التبصرة، ورقة ١٩ب.

ناوەڕاستی بەرسنگی لەشکردا[472] بووە، ئالاکانیش لەگەڵ خۆیدا بووە، تا هەموو میرەکان چاویان لێیبێ و فەرمانەکانی سوڵتان بەجێ بگەیێنن، وەلێ سوڵتان جارجارە جێگای خۆی دەگۆڕی و بەلای قۆڵێ لە دوو قۆڵەکەدا بای دەدایەوە، بۆ ئەوەی هێزو هزری بوروژێنێ، جارجارەش ئەگەر ئاڵۆزیی و شپرزەیی توش بووبێ دووبارە ڕێکی بخاتەوە. سوڵتان جاروبار بەرەو پێشەوە تەکانی دەدا، تا سەربازەکانی بێنێتە جۆش و دوژمن بتۆقێنێ.

سەلاحەددین فەرماندارو میرە ناودارەکانی بۆ فەرمانداریی هەردوو قۆڵەکە دادەناو، سوارەی ئەسپی بەتاوو سووکەڵەو تیژڕەوی نەبەردی جریتبازی و دەستەویەخەشی[473] لە پێشەوەو بە سەر پێشڕەوی لەشکرەکەوە دادەنا. لەزەبرە گەورەکەی (مورجی عکا)دا کە لە مانگی شەعبانی ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز) دا قەوما. ئەو زەبرەی کە خاچدروشمان دوای بەزینیان لە حطین و قودس و جێگاکانی دیکەدا. هەموو هێزو توانای خۆیان بۆ خستەکار، سەلاحەددین هێزەکانی خۆی ڕێکخست، لە قۆڵی لای ڕاست، دوو کوڕی خۆی (الملك الافضل نورەددین علی و، الملك الظافر خضر)ی دانا، پاشان لەشکری موسڵ لە ژێر فەرماندەیی (ظهیرالدین بن البتکری)دا دانا، ئنجا لەشکری دیاربەکری لە ژێر فەرماندەیی (قطب الدین بن نورالدین) گەورەی قەلای قایمکاریی (کیفاو آمد)دا دانا، ئنجا (حسام الدین لاچین، (لاشین))، خوشکەزای سەلاحەددین و سەرگەورەی نابلس، ئنجا (صارم الدین قایماز النجمی)و پۆل پۆل و کۆمەڵ کۆمەڵی دیکەشی، هەموویانی لە قۆڵی لای ڕاست دانا، فەرمانداری گەورەی هەمووشیان، درایە دەست (الملك المظفر تقي الدین عمر)، ناودارترین ڕۆڵەی ئازاو چاو قایم و بوێری بنەماڵەی ئەییوبییەکان بوو، ئەم قۆڵە بەڕووکاری دەریاکەدا دەیڕوانی.

هەرچی قۆڵی لای چەپیشە، ئەوە، کەوتبووە ژێر فەرماندەیی پێشەنگی کورد، میر (سیف الدین علي بن أحمد المشطوب) و میر (مجلي بن مروان)و کۆمەڵێ لە کوردانی مهدانی و هەکاری و (مجاهدالدین برتقش. پێشەنگی لەشکری شنگار.) و کۆمەڵی مەمالیك، ئنجا، (مظفر الدین بن زین الدین "کوکبری") بە خۆی و لەشکریەوە. گەورە پیاوانی (الاسدیە)ش، بە نموونە وەك. سیف الدین بازوکۆچ و ئەرسەلان بغا. کەوتبوونە دامێنی ئەم قۆڵەوە. (الفقیە ضیاءالدین عیسی الهکاری) و چەکدارەکانیشی لە پێشی پێشەوەی بەرسنگی لەشکرەکەدا دامەزرابوون. هەرچی سوڵتان خۆیەتی، ئەوە، ئەو بەسەر لقەکانەوە دەگەڕاو دنەی دەدان بۆ جەنگ و ورەی بەبەردا دەکردن[474]. مادامێکی میرە قورس و گران و ناودارەکان، دانران بە چەرخەچی و جڵەوبەدەست و سەرلەشکری قۆڵەکان، کەواتە، قورسایی گەورەی شەڕو پێکدادان کەوتووەتە سەرقۆڵی ڕاست و چەپ، بەلام پێشەوەو بەرسنگی سوپا، فەرماندەی ناوداری ئەوتۆی بۆ دانەدەنران. ئەم تەرتیبە، بەکەمە گۆڕینێکی لێرەو لەوێ نەبێ، دەنا لە هەموو جەنگەکانی سەلاحەدیندا، هەروەك خۆی مایەوەو نەیگۆڕی[475].

(ابن شداد) ی مێژوونووس کە خۆی لە کارەساتەکانی ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)ی شەڕی (عکا)دا بەشداربووە، دەڵێ: سوڵتان فەرمانی بە لەشکرەکە دا سوارە جەنگاوەرەکان لە قۆڵی ڕاست و قۆڵی چەپ و بەرسنگی لەشکردا تەیارو ئامادەی شەڕ بکات، بەو پێیە، هەرسێ کوڕەکەی خۆی و لەشکری موسڵ بە فەرماندەیی (علاء الدین خرم شا بن عزالدین مسعود)و، (الملك العادل)ی برای سوڵتان کە کەوتبوونە کلکەی ئەو سەری قۆڵەکەو، (حسام الدین لاشین و صارم الدین قایمازو عزالدین جۆردیك و حسام الدین بشارەو بدرالدین دلدرم الیاروقی)و گەلێکی دیکەش لە میرەکان، ئەمانە

---

472 مفرج الکروب، ٢/٢٩٥. الحسن بن عبدالله، آثار الأول ص١٧٥.

473 آثار الأول، ص١٧٥. الطرطوشی، دەڵێ: "جێگەی داخ و خەفەتە، پارێزەرانی پیاوگەلو قارەمانان، خۆیان بکەونە ناوجەرگەی (بەرسنگی) سوپاوە، چونکە هەردووقۆڵەکە تێکیش بشکێن، خەڵك هەر سەیری بەرسنگ دەکەن، بەلام بەرسنگ بشکێ، هەردووقۆڵەکەش دەشکێن". بڕوانە: سراج الملوك ، مطبعة بولاق، ١٢٨٩ك، القاهرە، ص/١٧٥.

474 النوادر، ١١٠، مفرج الکروب ٢/٢٩٥ـ ٢٩٦.

475 الفتح القسي، ٣٠٨.

هەموویان لە قۆڵی ڕاستدا ڕیزبەندو ئامادەباش بوون. هەرچی قۆڵی چەپە، ئەوە، لەوێدا (عمادالدین زنگی سەرگەورەی شنگارو، معزالدین سەرگەورەی جزیرە ابن عمری. برازای. و لەو پەڕیشەوەی (تقي الدين عمرو سيف الدين علي المشطوب و خۆشترین الحکمیو) کۆمەڵێکی گەورەش لە میرە کوردەکانی مهدانیو هەکاری و حەمیدیو زەرزاری، هەموویان لە قۆڵی لای چەپدا تەیارو ئامادەبوون. هەرچی ئەڵقەی سوڵتانییە[476]، ئەوان لەناوجەرگەی (بەرسنگی) لەشکرەکەدا دایانکوتابوو. سوڵتان، خۆیو لەشکرەکەی سەروبەر دەناو، بەناو ڕیزەکانیدا سەرومڕ دەهاتو دەچوو.[477]

سوڵتان بۆ ئەوەی بزانێ کاتی تێکچوونی ڕیزەکانی لەشکر، چی بکاو چی نەکا، پەیوەندی توندوتۆڵی هەناسە بە هەناسەی لەگەڵ بەشەکانی سوپادا دەهێشتەوەو سەری لە میرەکان دەداو سەرپەرشتی ڕەوشی شەڕەکەی دەکرد. لەبەرئەوە هێزی یەدەگی لە جێگەی لەبارو پێویستی خۆیدا دەخستەکارو لەبەرەڤانی کردنی دوژمنیشدا سەربازی لێ گاڵ دەدانو دەستپێشخەریی دەکرد.[478]

## ب. ئەڵقەی تایبەتو مەملوکەکانی سوڵتان:

ئەڵقەی تایبەتی سوڵتان لە کۆمەڵێ سەرباز پێك هاتبوو، دەوری سەڵاحەدینیان دەگرت، سەربازانی ئەو ئەڵقەیە وەك پاسەوانو حیمایە دەیانپاراست. مەملوکە تایبەتەکانی سوڵتان، پێیان دەگوترا: "ئەڵقەی تایبەت".[479] ئەم ئەڵقەیە لە شەڕە جۆربەجۆرەکاندا جێگای خۆی هەبوو، جێ دەستی دیاربوو، لە غەزای کەناری دەریاو داگیرکردنی قەڵاتە قایمکارەکانی خاچدروشماندا ڕۆڵی بەرچاوو گرنگی گێڕاوە. (ابن الأثير) کە بە چاوی خۆی شەڕی ئازادکردنی قەڵاو قایمکاریی (بەرزێ)ی دیوە دەڵێ: "بەرزێ کەوتووەتە ناوچەیەکی پڕ لە چیای ڕەقەنو سەختەوە، تا بڵێی قایمکارو بێ منەتە". باسی ئەوەش دەکا، کە سەڵاحەددین چۆن لەشکرەکەی خۆی کرد بە سێ بەش و بە نۆرە دەچوونە شەڕەکەوە، دەڵێ: کاتێ نۆرەشەڕ گەیشتە سەر "ئەڵقە تایبەتەکەی سەڵاحەددین"، دەربایستی گەرمای تاوسێنی ئەو ڕۆژە[480] نەبوونو ملیان لێ ناو کوشتارێکی بە دڵو بە جەرگی قارەمانانەیان بەرپاکرد.

هەروەها، ئەڵقەی تایبەت، لە گەمارۆکەی شاری (عکا)شدا، ڕۆڵێکی شەرەفمەندانەیان گێڕاو، شان بەشانو بە دووی سەڵاحەددینەوە، لە گردی (الخروبة)وە، لەگەڵیدا دەچوونە (شفرعم)و لەوێشەوە، بە غار دەچوونە گردی (کیسان). بەوجۆرە، چواردەوری شاری (عکا)یان کۆنترۆڵ کردبوو، شارەکەشیان تەواوێ تەنگەتاو کردبوو. کاتێکیش زستان هاتە بەرەوە و سەرماو سۆڵە زۆری هێناو لەشکرگەل بۆ حەسانەوە گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، تەنیا ئەو ئەڵقەیە نەگەڕایەوە و لە تەك سەڵاحەددیندا مایەوە، ئەم ڕووداوە لە ساڵی (٥٨٨ك/ ١١٩٢ز)دا ڕووی دا. زۆربەی سەربازانی ئەو ئەڵقەیە سەربازی میسریی بوون.[481]

گرنگیی ئەم ئەڵقەیە وەك (ابن شداد) دەیگێڕێتەوە، کە خۆی لەم ئەڵقەیەدا بووە. دەڵێ: "گرنگیی ئەم ئەڵقەیە، لەوەوە هاتووە کە تەنیا خۆی لەناوجەرگەی (بەرسنگی) لەشکری ئەیبوبیدا بووە.[482] جارێکیشیان سوڵتان بەرەو ڕووی دوژمن دەچوو، لەم ئەڵقەیە بەولاوە کەسی دیکەی لەتەکدا نەبوو".[483]

وا دیارە سەربازانی ئەم ئەڵقە تایبەتە، بوون بە تیپێك و بە ناوی سوڵتانەوە ناونرا (تیپی سەڵاحی، یان تیپی

[476] النوادر ١٤٧، الروضتين.

[477] ابن منكلي، التدبيرات السلطانية في سياسة الصناعة الحربية، مخطوط مصور في مكتبة المجمع العلمي العراقي، (سلاح ٦٤٦، ص٢٧.

[478] التذكرة الهروية، ص٩٩.

[479] النوادر، ١٧٨. الكامل، ١٥/١٢. الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٥٤. بنۆڕە: الباز العريني، الفروسية في مصر في عصر سلاطين المماليك، دار النهضة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٦٧، ص١٥٩ـ ١٦٠.

[480] الكامل، ١٥/١٢.

[481] ن. م، ٨١/١٢.

[482] النوادر، ص١٤٧.

[483] ن، م، ص١٧٨.

**ناصری) لەمەوبەریش گوتمان، ئەو جەنگاوەرانەی دەچنە ژێر فەرمانی فەرمانداریێکی گەورەوە بەناوی ئەوەوە ناودەنران، چونکە دەبوونە مەملوکی ئەو، یان دەبوونە خولامی ئەو، بە نموونە نورییەکان مەملوکی نورەددین مەحمود بوون‌و، ئەسەدییەکانیش لە میسر، لە ساڵی (٥٦٤ك/ ١١٦٨ز) دا مەملوکی (أسدالدین) بوون.. أسدالدین (کۆمەڵێ خولام‌و پێنج سەد مەملوکەکەی ناونرا الأسدیة).[484] ئەمەش مانای ئەوەیە، کە سوپای ئەیوبییەکان سیستەمی مەملوکایەتی هەبووە. (بورسورت) دەڵی: کۆمەڵێ سوڵتان لە پاسەوانە عەبدەکانی سوڵتانەکانی ئەیوبییەوە پەیدابوون‌و ئەو کەسەش کە پەیدای کردن سەلاحەددین خۆی بووە.[485] لەشکری میسری سەردەمی مەملوکەکان، لە پاشماوەی سوپای ئەیوبییەکانەوە. کە زۆربەیان مەملوکە تورکەکان و پاشماوەی کوردەکان بوونە. پەیدابووە.[486]**

**وەلێ، لە کارەسات‌و ڕووداوەکانی ئەو ماوەو مودەتەوە دەردەکەوێ، سەلاحەددین بنەماڵەی سوڵتانگەلی مەملوکی پەیدا نەکردووە، بەڵکو مەملوکە تورکەکان، لە وەکایەهاتنی دەوڵەتی سەلجوقیەوە بوو بوون بە بڕبڕەی پشتی دەوڵەتی سەلجوقی، دابودەستووری سەلجووقیانیش. بە پێی مێژووی سەربازیی سەلجوقی. وەهابوو کە پشتیان بە هاوولاتییە ڕەسەن‌و ئازادەکانی خەڵکی عەرەب‌و فارس‌و کورد نەدەبەست وەڕیز لەشکریان بهێنن، بەڵکو پێیان باشبوو پشت بە مەملوکەکان ببەستن کە لە ولاتی (القبجاق)[487] ەوە، دەهێنران‌و لەتەلاری شاهانەو لەبەردەستی سوڵتانەکان و میرەکاندا پەروەردە دەکران‌و گەورە دەبوون، دووریش نییە بەشێکیان لە هەرێمەکانی دیکەی ولاتی بەرفراوانی تورکانی ناوەڕاستی ئاسیاوە، بە نموونە وەك لە فەرغانەوە هاوردرابن.[488]**

**بنەماڵەی ئەییوبییش هەر لە سەر ڕەوشی سەلجوقی‌و ئەتابەکەکانیان، واتا (عمادالدین زنگی‌و نورەددین)ی کوڕی، بەزۆری مەملوکی تورکیان دەهێناو لە ڕیزی لەشکردا دایاندەمەزراندن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەییوبییەکان، یان دامەزرێنەرانی بنەماڵەی ئەیوبییان، خۆیان، نە ئەتابەك بوون‌و نە مەملوکی کەسیش بوون‌و "هیچ کەسێکیش لە بنەماڵەی ئەییوبیان عەبدایەتی نەکردووە".[489]**

**لەو ناکۆکییەش کە پاش مردنی سەلاحەددین کەوتە نێوان میرەکانی تیپی سەلاحی‌و تیپی ئەسەدییەوە هێزی بوزرگی مەملوکانمان لە سوپای ئەییوبیدا بۆ ئاشکرا دەبێ،[490] تیپی سەلاحی لە ژێر فەرماندەیی (فخرالدین چەرکەس) دا بوو بە لایەنگری (الملك العزیز عمادالدین عثمان)ی کوڕی سەلاحەددین، هەرچی تیپی ئەسەدیشە کە(سیف الدین بازکوج)ی مەملوکەکەی شێرکۆ فەرمانداریی دەکرد، ئەم، بوو بە ناحەزی (العزین)، نەیدەویست ببێ بە شاو پاڵی دا بە لای (الملك العادل)ەوەو، وەك ئەو، ئەمیش دەستی کرد بە دووبەرەکی نانەوە لە نێو بنەماڵەی ئەییوبیدا وەلێ (الأمیر**

---

484 الروضتین، ج١، ق٢، ص٤٣٨.

485 تراث الأسلام، تصنیف جوزیف شاخت، ترجمة: د، محمد زهیر السمهوري، الکویت، ١٩٧٨، القسي الأول ص١٨١.

486 النجوم الزاهره، ١٢٤/٦.

487 القبجاق (القفجاق): ڕەگەزێکی تورکن لە هەرێمی حەوزی فولگا، خوارووی ڕۆژهەلاتی ڕوسیای ئەمڕۆ و باکوری دەریای ڕەشدا نیشتەجێن،"ڕەنگە مەبەست ولاتی قەفقازی ئەمڕۆ بێ". شمس الدین سامي، قاموس الأعلام (ترکي) مهران، مطبعة سي، باب عالي جادة سندة، أستانبول، ١٣٠٦- ١٣١٤. ج٥، ص٣٥٩٩. ئەمانە سارانشین بوون‌و بەرلەوەی بیانهێنن بۆ ولاتی موسوڵمانان، لە ئیسلام بێ ئاگا بوون.. فازیلی بارتولد، تأریخ الترك في آسیا الوسطی، ترجمة احمد السعید السلیمان، القاهرة ١٩٥٨، ص١١٢. بنۆرە: صبح الأعشی ٤/ ٤٥٨، Heyd, Histore ducommerce, p, ٥٥٩. د. أحمد مختار العبادي، قیام دولة الممالیك الأولی في مصر والشام، دار النهضة العربیة للطباعة والنشر، بیروت ١٩٦٩، ص٧٣.

488 .Lane- poole, Saladin, P,158

.Claude Cahen Les Changements Techniques Militaires, p,121

489 النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥.

490 النجوم الزاهرة، ١٣٨/٦. السلوك، ١٢٥/١.

بهاءالدين قراقۆش الأسدي)، ئەم، ئەو كارەی نەكردو بە دڵپاكیو دڵسۆزی (العزين) مايەوە تا لە ساڵی (٥٩٧ك/ ١٢٠٠ز)[491]دا مرد. ململانێ لە نێوان ئەم دوو تیپەدا بە بەردەوامی مايەوە، تا سەرەنجام (الملك العادل) ئەويتری لێ خستو، بنەماڵەكەی كردەوە بە يەك، بێ گومان ئەمەش بوو بە هۆی بردنەوەی تیپی ئەسەدی[492]لە ميسرو دوڕاندنی مەملوكەكانی سەلاحەددين، بە تايبەتييش دوای ساڵی ٦٠٨ك/ ١٢١١ز كە چاركسی تێدا مرد.[493]

بەڵام، كتێبو سەرچاوەكانی ماوەی ژيانی سەلاحەددين باسی ئەوە ناكەن، مەماليكيان لە كێندەرێوە هێناوەو، ئەييوبييەكان چۆنيان پەروەردە كردوونو چۆنيان گەورەكردوونو ئامادەكردوون. وەلێ (المقريزي) وەسفی ئەوە دەكات كە لە سەردەمی سەلاحەدديندا لە ميسر، ئەو پەروەردەكردنە چۆن چۆنی بووە، لەبەرئەوە بۆمان هەيەو دەتوانين پشت بەم وەسفە ببەستين، هەرچەنديشە درەنگتر كەوتووەو دەتوانين وەسفی ڕۆڵو ڕەوشی مەماليكەكان سەردەمی سەلاحەددين، وەك ئەوەی سەردەمی مەماليكەكانی دوای سەلاحەددين لە قەڵەم بدەين. ئێمە دەزانين دەوڵەتی مەماليك لە نەمانی دەوڵەتی ئەييوبييانەوە هاتووەتە ئاراوەو سيستەمێكيش مەماليك پێڕۆيان كردووە، زۆرتر درێژەپێدانی هەمان سيستەمی ئەييوبييەكانە، وەك باسمان كرد، ناشتوانێ لەوە دوورتر بڕواو لەوە زياتر بكاو لێی لابدا، تەنها هەندە نەبێ كە بە حوكمی زەرورەتو پێداويستيی نوێ، هەندێ گۆڕينی تێدا كرابێ. لەبەرئەوە، كەمو زۆر دڵنيايين لە قسەكانی (المقريزي).

مێژوونووسی ناوبراو گوتويەتی كە "ئەگەر بازرگانێ مەملوكێكی بفرۆشتايە، دەيدا بە سوڵتانو، ئەميش لە چينو توێژەكەی خۆيدا، دايدەناو دەيدايە دەست (الطواشي)[494]: "واتا مەملوكە نۆكەرو سەركارەكانی سوڵتان كە مەملوكە تازەكان دادەكەن"، ئەوجا ناونووس دەكراو پێش هەموو شتێ هەندێ سوورەتی قورئانيان فێر دەكرد. هەموو تايەفەيەكيش (كۆمەڵێكيش) مەلايەكيان بۆ دادەنان، هەموو ڕۆژێ سەری لێدەدانو قورئانی فێر دەكردنو، مەشقی خۆشنووسیو وانەی شەريعەتو ئەزكاری پێ دەدان. ڕێساو دەستووری ئەو چەرخو زەمانەش وابووە، بازرگانان دەبوو تەنيا مەملوكی منداڵيان بهێنايە، كە نەختێ گەورە دەبوون، ئەوجا، مەلا هەندێ فيقهی شەريعەتو قورئانی فێر دەكردن، كاتێكيش كە باڵق دەبوون ئەوجا هەموو جۆرە هونەرێكی شەڕو كوشتار فێر دەكران، بەنموونە، وەك تيرەندازیو شمشێربازیو ڕم وەشاندن، هەر گروپەو دەدران بە مامۆستايێ، چی پێويست بووايە فێريانی دەكرد.

كاتێكيش بەسەر پشتی زينەوە بكەوتنايەتە ڕمبازیو تيرەندازی، ئەوە، لەوبارەدا نەبۆ سەرباز هەبوو قسەيان لەگەڵدا بكاو نەمير دەيتوانی بيياندوێنێو لێيان نزيك بكەوێتەوە، جا، ئەوجا، دەگوازرانەوە بۆ خزمەتكردن. ئيدی پلە بە پلە سەردەكەوت تا دەبوو بە مير، تا ئاكارو ڕەفتاريشی بە تەواوی پاراو نەبوايەو بە ئەدەب نەبوايە و موسوڵمانێتی لە دڵيدا نەچەسپايەو دەستو بازووی فێری ڕمو شمشێرو شير نەبوايەو، نەبوايە بە سوارچاك، نەدەكرا بە مير. ئەمانە پەروەردەكارو گەورە نوێدەران، يەك بە يەك دەيانخستنە بەر پشكنينو تاقيكردنەوە، سەرزەنشتيان دەكردنو بە

[491] وفيات الأعيان، ٩٢/٤. (قراقوش): "أبو سعيد بهاءالدين عبدالله الاسدي"يە، بەناوی أسدالدين شيركۆوە ئەم قراقوشە مەملوك بووە، پاشان خزمەتی سەلاحەددينی كردووە، تەلاری فاتمييەكانی بەدەست بووە، لە هەندێ بۆنەشدا نوێنەری سەلاحەددين بووەو سەرپەرشتی دروستكردنی قەڵاو شووراو پردی (الجيزە) بووە، كە (عكا)شی گرت، بوو بە سەرگەورەی عەكا و شوورەی كرد، پاشان خاچدروشمان بەديل گرتيانو سەری خۆی بە (١٠) هەزار دينار كڕييەوە، ساڵی (٥٩٧ك/ ١٢٠١ز) مردو لە (مقطم)ی قاهيرە نێژرا. (قراقوش) وشەيەكی توركييەو مانای هەڵۆيە، (باڵندەی ڕەش) بنۆڕە: وفيات الأعيان ٩١/٤ـ ٩٢.

[492] السلوك، ١٢٨/١.

[493] وفيات الأعيان، ٣٨١/١، ذيل الروضتين، ص٧٩، الخطط، ٨٧/٢ـ ٨٨.

[494] طواشي: نۆكەرە نزيكەكانی سوڵتان لەناو تەلارەكەيدا، پێشيان دەگوترا: (الأستاذون) واتا "وەستاكان"، صبح الأعشى، ٤٧٧/٣. ئەمانە نۆكەری خەساوو بوون، صبح الأعشي، ٤٥٦/٥. بنۆرِە: د. حسن الباشا، الالقاب الاسلامية في التأريخ والوثائق والآثار، مطبعة لجنة البيان العربي، القاهرة، ١٩٥٧، ص٣٨٢.

توندییش ڕەخنەیان لێدەگرتن و، هەموو هەڵسوکەوتێکیان دەخستنە بەر لێپێچینەوە، خۆ ئەگەر بهاتباو مامۆستای قورئان، یان یاساوڵەکەی. کە هەمیشە حاکمێ بوو بەسەر سەریەوە. گوناهێکی لێ دیتبا، یان لە ڕێساو دەستوور لای دابا، یان دابونەریتێکی ئایینی، یان دنیایی پشتگوێ خستبا، ئەوە لەو بارەدا، بەپێ ودانگی ئەو تاوانە سزای دەدا، لەبەرئەوە گەورەو سەروەربوون و، مەملەکەت و وڵاتیان بەڕێوەدەبردو فەرماندارانێ بوونە، لە ڕێگای خوداو ئایینی ئیسلامدا لە غەزادا بوون.[495]

**٧ـ لقەکان و جوونەکانی سوپا، هەر جوونەو بە پێی چەکی خۆی:**

سەلاحەددین لە ڕێکخستنی سوپاکەیدا سیستەمی لق لقی بەکارهێنا. ئەوەبوو کە پێشتر باسمان کرد، ئەم سیستەمە ئەوەیە سوپا دابەش بکرێتە کۆمەڵ کۆمەڵ و هەر دووسەد سوارەیێ، یان هەر سەد سوارێ، یان حەفتا سوارێ، میرێکی لەپێشی بەسەرەوە بێ.[496] ئیدی بەسەر زمانانەوە بوو، خەڵك دەیانگوت، فلانە هەڵمەت ئەوەندەو ئەوەندە لق بووە. وەلێ ئێمە ئەوەمان بۆ ساغ ناکرێتەوە کە سوپای ئەییوبی سیستەمی لق لقی بەو وردی و دروستییەی لقەکانی سوپای میسری سەردەمی مەملوکەکانی تورکی ڕێکخستبێ، هەرچەندیشە ئەم وشەی لق لقە لە کتێبگەلی مێژوونووسانی هاوسەردەمی سەلاحەددیندا بەزۆریی بەرچاو دەکەوێ[497]. وەلێ وشەکە جاروبار وەك بڵێی بەمانای تەرتیب و ڕیزو شتی لەو جۆرە بابەتانە هاتووەو باسی ژمارەی ناکات.

هەر سنفێ لەو سنفە جەنگاوەرو یاریدەدەرانەش خەسڵەتی جیاوازی خۆی هەبوو. ئەم جیاوازی و لێکنەچوونەش بە جۆری چەك و جبەخانەو ئەرك و فرمانیاندا دەردەکەوت. ئەگەر سوپاش هەمووی یەك دەنگ و هاودەنگ نەبێ و لە پێکداداندا هاوکارو هاوکۆمەك نەبن، ئەوە ناتوانێ پێش بکەوێ و بەسەر دوژمندا سەرکەوێ، لە لەشکری ئەییوبیدا سەرەڕای دوو سنفی بنچینەیی، سنفگەلی لاوەکیش هەبوون.

سنفە بنچینییەکانیش ئەمانەن:

**أ. جوونی ( سنفی ) سوارە:**

گشت لەشکرێ، لەم سنفەی هەردەبێ ببێ، ئەمان، ئیشە شایان و گرنگەکان بەجێ دێنن، ئەم سنفە لە شەڕو جەنگەکانی سەدەکانی ناویندا، شادەماری سوپاکان بووەو، ئەرکە سەرەکییەکانی ئەوە بووە کوشتاریش بکاو شوێن پێ هەڵگرتن و سووسەی پێش لەشکریش بکات، وەك لەمەودوا باسی دەکەین، چونکە ئەم دوو چالاکی و فرمانە، گوڕو خێرایی دەوێ، تین و تاوی دەوێ، هێرشبەرێ و شوێن پێ هەڵگرێ و سووسە بکاو دوژمن ڕاوەدو بنێ و، ڕێگای لێبڕێ و نەیەڵێ بگەڕێتەوە بۆ سەر خاروبارو ئازوقەی خۆی، ئەم ئیشە گرنگانە سوارەی خێراو چاپوك نەیکا، ناکرێ.

لە شەڕو جەنگدا خواسایی بە کەسانی ئەزموون و شارەزاو ڕاوێژکارو فریادڕەسیان بۆ ئەم ئیشە گرنگانە دەدۆزییەوە، لە کاتی سووسەو شوێن پێ هەڵگرتنیشدا خۆیان لە دوژمن نەدەدا، چونکە مەبەستیان لەم ئیشە، تەنیا ئەوەبوو بزانن هێزی دوژمن چەندەو لە چیدا لاوازەو لە کوێوە زەفەری پێ دەبردرێ.[498]

سوارەکان، دەستبەجێ بەهانای ئەو پێگەو سەنگەرانەشەوە دەچوون کە بەرهەڵمەت و مەترسیی کوتوپڕ دەکەوتن، وەلێ وەك (الطرطوسي) دەڵێ: "با سوارەو قارەمانەکان بکەونە پاش پیادەکانەوە، چاوەنواڕی هەڵمەت بن، کە هەڵمەتیشیان برد، پیادەکان کەلێنێکیان بۆ دەکەنەوەو پێکەوە هەڵمەت دەبەن"[499]. لەبەرئەوە سوارەکان هەمیشە لە پاش پیادەکانەوە دەوەستان.

---

[495] الخطط، (طبعة بولاق) ج٢، ص ٢١٣ـ ٢١٤.

[496] المقريزي، الخطط (طبعة المعهد) ج١، ق١، ص١٦.

[497] النوادر ٧٦، ١٤٨، ١٦٠، ١٨٥، الفتح القسی ٦٩، ٧٠، ١١٥.

[498] الهرثمي، تفريج الكروب، تحقيق: جۆرج سکۆنلۆن، منشورات الجامعة الامريكية، القاهرة، ١٩٦١، ص٥١.

[499] التبصرة، ورقة ١٩١/أ.

سوارچاکی ئازاو تەواو، دەبوو بەهێزبێ، وەرزشکاربێ و خاوەن دەست و باهۆیەکی پتەوو لەشێکی جیڕو قایم بێت، دەبوو لە دەستەویەخەی دوژمندا لێزان و خاوەن هونەربێ، زۆرانبازبێ، ڕمبازبێ، تیرەندازو نیشانشکێن بێت.[500]

سوارەکان شمشێرو ڕمی درێژیان پێ بوو، زرێی ئەڵقە ئەڵقەیان لەسەرەوە لەبەردەکرد، کڵاوی ئاسن (خودە)یان لەسەر دەناو قەڵغانیان بەدەستەوە بوو، هەرچی ئەسپەکانیانە، پێدەچێ لەبن زینەکەوە بن زینی (تجفاف)[501]ی قایمیان لەسەرپشتی ئەسپەکانیان دانابێ، تا ئاگر نەیسووتێنێ و چەك نەیدڕێ و کونی نەکاو لەشی ئەسپەکان پارێزراو بێ. هیچ دەقێکیشمان نەدیتەوە ئەمەی گوتبێ.

**ب. جوونی ( سنفی ) پیادە:**

بەشی زۆری سوپا لەم سنفە پێك دەهات، ئەرکی کوشتارو قورسایی شەڕو ئەنجامەکانی جەنگ کەوتبووە ئەستۆی پیادەکان، پیادە چەکی سووکی پێ بوو، چەکی قورسیان بۆ هەڵنەدەگیرا، چونکە بەپێ دەڕۆیشتن. پیادەکان، شمشێرو کەوان و ڕمی کورتیان بەکاردەهێناو ئەرکێکی دیکەیان ئەوەبوو دوژمن لە خەندەق و سەنگەران وەدەرنێن و بیاذکوژن.[502]

ئیشی گرنگ و ئەرکی گرانی پیادەکان ئەوەبوو سوپا، لەتەکان و کشان و ڕەوت و ڕێگادا بپارێزن و نەیەڵن بەر پەلاماری ئەم دیوو ئەو دیووی ڕێگا بکەوێ، پیادەکان کاروانی ئازووقەو جبەخانەشیان لەبەربرو بۆسەی دوژمن دەپاراست و بەری ڕێگەیان لە مەترسیی چەپاوڵ و تاڵان و چەتەو پیاوخراپان بۆ پاك دەکردەوە.[503]

لە ڕیزەکانی لەشکردا، پیادەکان لە پێشەوە دادەنران، وەك (الطرطوسي) دەڵێ، سوارەو قارەمانەکانیش لە دوای ئەوانەوە دەهاتن.[504]

**ج. جوون ( صنوف )ی دیکەی یاریدەدەر،** هەر جوونەو بەناوی چەکەکەیەوە ناو دەبران، یان بە پێی ئەرك و فرمانیان، ناویان لێ دەنرا، بەنموونە وەك جوونی مەنجەنیق و جوونی دەبابەو جوونی بارەنەوت و موخابەرەو ئازووقەو خاروبارو، جوونی دیکەی لەو جۆرە بابەتانە.

پێش بەرەوپیرچوونی جەنگ، سەلاحەددین سوپای لە مەیداندا نمایش دەکردو جێگەو پێگەی لقەکانی دیاردەکردو کەلێن و کەلەبەری بۆ پڕەدەکردنەوەو لە چەك و جبەخانەیان دڵنیا دەبوو. بە نموونە، بەر لە شەڕەکەی (حطین)، سوڵتان لە ڕۆژی نمایشەکەدا لەبەردەمی سوپاکەیدا وەستاو لەدوورەوە تا دەگاتە نزیکەکەیان، جوون بە جوون و لق بە لق، دەستە بەدەستە، ڕیزی دەکردن و ڕێك وپێکی دەخستن. ئەرك و فرمانی یەك بەیەکی میرەکانی دەستنیشان کردو ئازاو بەرجەرگەکانیشی لە پێگەی شایستەی خۆیاندا داناو جێگەو ڕێگەی سەربەرزان و کەندو لەندی بۆسەچییەکانی پیشان دان و... شوێن و پێگەی هەریەکە لە میرەکان، لە قۆڵی ڕاست و قۆڵی چەپدا بۆ نیشانەکردن کە لەوێ نەجووڵێن و نەگوازنەوە، نە بە تاك و نە بە گشت، جێگای خۆیان بەرنەدەن و چۆڵی نەکەن. ئەوجا (الجالیشیه)[505]واتا پێشەنگە تیرەندازەکان و ئاسنین و زرێپۆشە ئازاو بەجەرگەکانی لە هەموو لقێ دەرهێناو لەبەرسنگی سوپاکە کردنی بە پێشەنگ و پێشڕەو، پاشان ئامۆژگاریی گروپەکانی کرد، کە هەر گروپەو ئاگای لە گروپەکەی نزیك بە خۆی بێ و هاوکۆك بن. کە ئەمانەی تەواو کرد ئنجا گوتی: "کە چووینە ناو خاکی دوژمن، دەبێ ئاوەها بەم تەرزە بڕۆین، ئەمەتا، تەیارو

---

[500] بولیناك، الاقطاعیة، ص٥٤.

[501] احسان هندي، الحیاة العسكریة عند العرب، مطبعة الجمهوریة، دمشق ١٩٦٤، ص١٦٦.

[502] طه الهاشمي، دروس في المعلومات الجغرافیة، مطبعة الشعب، بغداد ١٩٣٦، ص١٨.

[503] خالد الجنابي، تنظیمات الجیش في العصر العباسي الثاني، رسالة ماجستیر، مطبوعة بالآلة الكاتبة، كانون الثاني، ١٩٧١، بغداد ص٣٠.

[504] الطرطوسي، التبصرة، ورقة ١٩١/أ.

[505] الجالیشیه: "ئەسڵەکەی ئاڵای گەورەی نووك قژنە، پاشان کرا بەناوی پێشەنگەکانی بەرسنگی لەشکر" صبح الأعشی، ٨/٤. پێشتریش لە جێگایەکدا شرۆڤەمان کردووە.

ئامادەییمان، ئەمە جێگەو پێگەی لق و پەلەکانمانەو ئەمانەش پێشەنگە قارەمانەکانمانن". [506]

جگە لەوانە، لە سوپادا، زەلامێکیش هەبوو، بە دەنگی بەرزو نەعرەتەیەکی بەسام، بانگهێشتی دەکردو سەربازانی بۆ کوشتارو پەلامار وەجۆش دەهێنا، ورەی بەبەریانا دەکردو، لە نزیك سوڵتانەوە دەوەستاو، سوڵتان هەر دەنگێکی لێوە بهاتبایە ئەو بە نەعرەتەیەکی بەرزو دەنگێکی گەورە دەیدا بە گوێی هەموویاندا. بەم زەلامەیان دەگوت (چاوەش)، [507] بانگی ئامادەباشیی هەڵدەداو لەکاتی زەروورداو داوای لە فلانە میر دەکرد بەخۆیو لقەکەیەوە بگاتە فریای فیسارە لق و فلانە کەلێن پڕبکاتەوە کە دوژمن دزەی لێوە کردبێ.. سەربازانی دەهێنایە جۆش و خرۆشی کوشتارو هاواری دەکرد (هۆ.. هۆ.. موسڵمانان و لەشکری مووەحدیین، پەلامارێ.. پەلامار)[508] ئەم بانگهێشت و بانگەوازە بە ئاشکرا دوای ساڵی ٥٨٣ك/ ١١٨٧ز، واتا دوای شەڕەکەی (حطین) هاتە ئاراوەو، لە هیچ سەرچاوەیەکیشدا ناوی چاوەش، بەر لەو بەروارە نەهێنراوە[509].

پەیدابوونی چاوەشیش لەبەرئەوەیە کە سوپای ئەییوبی تا دەهات گەورە دەبوو، خۆ، دەبوو، زەلامێکیش هەبێ، ئەم کارە بکاو فەرمانەکانی سوڵتان بگەیێنێ بە تیپ و قۆڵەکان، ئێمە وەهای بۆدەچین کە دنەدان و وەجۆشهێنانی جەنگاوەران، بوو بە شتێکی پێویست، چونکە لەم قۆناغەدا، سوپا وەك جاران سەرکەوتنی وەدەست نەدەهێناو توانستی تەکان و هەڵمەتی دابووی لە کزی، زۆرتر بە هۆی ئەوەی کە لێگا لێگا لەشکری تازەو کۆمەکی نوێ بۆ خاچدروشمان دەهات، کە هەتا ئەوکاتەش، هەندێ قەڵاو قایمکارییان لە خاکی فەلەستین و کەناراوەکانی شامدا بەدەستەوە مابوو.

### ٨- سەربازانی حەزەکی (تەوعی) لە سوپای ئەییوبیدا:

سەرەڕای جەنگاوەری سوارەو پیادەی، لە دیوانی سوپای ئەییوبیدا تۆمارکراوو، وێڕای سەربازانی دەرەبەگایەتیی سەر بە میرانی ئەییوبی و میرانی دیکەش، کە یەك لە دوای یەك چوونە ژێر ئاڵای سەلاحەددین و لە کاتی زەروورردا جەنگاوەریان بۆ سوپای ئەییوبی فەراهەم دەکردو، سەرەڕای مەملوکە سوڵتانییەکانیش، سەرەڕای هەموو ئەوانە، سەربازگەلێکیش هەبوون، حەزەکی، بە حەزو ئارەزووی خۆیان، لە سوپادا خۆیان ناونووس کردبوو بۆ غەزاو ڕزگارکردنی خاکی عەرەب و ئیسلام لە خاچدروشمان. ڕاستیشت دەوێ سەردەمی بەئاگاهاتنەوەی ئیسلامەتی، بە وەئاراهاتنی (عمادالدین زنکی)، دامەزرێنەری ئەتابەکێتی موسڵ، بەئاشکار دەستی پێکردو، لە سەردەمی (نوورەدین مەحمود الشهید)ی کوڕیدا، دای لە زیادیو لە سەردەمی سەلاحەددینیشدا گەیشتە پۆپەی.

ئەم فەرمانداره ڕۆژانی کوشتاری حەزەکی و ئارەزوومەندانەی غەزای سەردەمی نۆبەرەی ئیسلامی هێنایەوە یاد. هەر لەبەرئەوەشە سوپای سەلاحەددین لە کاتی شەڕەکانیدا، نەخاسمە لە شەڕی (حطین)و شەڕی سەندنەوەی (بیت المقدس)و شەڕەکانی پاشتریش، جەنگاوەری حەزەکی، بە زۆری لێ خڕدەبوونەوەو خۆیان بەسەرباز ناونووس دەکرد، ئەمەشە کە زەینی مێژوونووسانی ڕاکێشاوە. [510] (ابن کثیر) دەڵێ، کاتێ سوڵتان ئارەزووی گرتنی (بیت المقدس)ی ئاشکرا کرد، زانایان و پیاوچاکان چوون بۆ لای و خۆیان بۆ غەزا ناونووس کرد. [511]

ئەرك و فرمانی سەربازانی حەزەکی و تەوعی، فەرق و جیاوازیی هەبوو لەوەی سەربازانی فەرمی و نیزامی، سەربازانی حەزەکی لە دەوروبەری هەر دوو قۆڵەکەدا دادەنران و لە زەبری دوژمن هەردوو قۆڵەکەیان دەپاراست و تێکەڵ

---

506 الفتح القسي، ٦٩- ٧٠.

507 چاوەش بە ئەسڵ وشەیەکی تورکییە. بنۆڕە: السلوك ١/٨٧٠. هامش (٢). مفرج الکروب ٢/٢٩٥. هامش (١).

508 النوادر، ١٩٠. مفرج الکروب، ٢/٢٩٥- ٣٢٦.

509 بنۆڕە: الفتح القسي، ٢٣٥. النوادر، ٩٨، ١٠٩، ١٤٧، ١٥٩، ١٧٨، ١٨٥، ١٩٧. مفرج الکروب ٢/٢٩٥.

510 البدایة والنهایة ١٢/٣٢٢. lane- poole, saladin,P204 عبدالعزیز سید الاهل، أیام صلاح الدین، المکتب التجاري للطباعة والنشر، بیروت ١٩٦١، ص٢٠

511 البدایة والنهایة، ١٢/٣٢٤.

به سەربازە نیزامییە ڕاهاتووەکان نەدەبوون، یان ئەرکی جاڕس کردنو ئاڵۆزکردنی سەربازانی ناو بنکەکانی دوژمن و تێکدانی ڕێگاوبانی ئازووقەو خاروبارییان پێ دەسپێردرا، جاری وەهاش دەبوو وەدووی دوژمنی شکاوو هەڵاتوویان دەخستن. [512]

سەربازانی حەزەکی بەگشتی بێ مەشقو بێئەزموون بوونو توانستی بەربەرەکانێو سەبریان نەبوو، وەلێ جارجارەش سوارچاكو نیشانشکێنو زەلامی چاپوكو گورج و گۆڵیان تێدا هەڵدەکەوت. هەندێ موسوڵمانیش بە ناوی ئیسلامەتیو غەزاوە، بۆ خاتری دەستکەوتی مادديیو پڕکردنی گیرفانی خۆیان دەچوون، وەلێ (بیت المال) هیچی پێ نەدەدانو لە تالانو بڕۆیش هیچیان دەست نەدەکەوت. [513] بەلام بەشی خۆیان، خێرو سەدەقەیان وەردەگرت، نەك هەر ئەوەندە، بگرە، نوورەددین لە (بیت المال)یش بەشی دەدان، چونکە سەربازگەلی حەزەکی ڕێزو حورمەتیان لەلای ئەوو لەلای سەلاحەددینیش هەبوو و، لە سۆزو ڕێزو پێزی ماددیی و ئەدەبیی بێبەشیان نەدەکردن. ڕۆژێکیان برادەر و دۆستانی نورەددین، کە دیتیان بەخششی زۆرەو دەستبلاویی دەکا، یەکێکیان پێی گوت: "تۆ هەر لە ولاتەکەی خۆتدا خێرو بێرو سەدەقەیەکی زۆرت، بەسەر مەلاو هەژارو سۆفیو قورئانخوێندا باراندووە، ئەگەر بۆ ئەمڕۆ گلدەیەوە چاکترە". نورەددین بە تووڕەییەوە وەلامی دایەوەو گوتی: "سا بە خودای، من بەبێ ئەوان ئومێدم بە سەرکەوتن نییە، ئێوە، هەمووتان ڕزقو سەرکەوتنتان بە شانو باهۆی ئەو هەژارو داماوانەوەیە، منێ کە لە ناو پێخەفی خۆمدا، بە دڵنیایی بنوومو ئەوان بە تیری نیشانشکێن بمپارێزن، چ خوا هەڵدەگرێ، ئەو خێرو بێرە لەوان بگرمەوەو بیدەم بە کەسانێ تا نەمبینن، شەڕم بۆ ناکەنو تیرەکانیشیان نیشان دەشکێنێ، یان ناشکێنێ، ئەو خەڵکە مافی خۆیانەو بەشی خۆیان لە (بیت المال)دا هەیەو کەی بۆ من ڕەوایە لێیان گل بدەمەوەو بیدەم بە خەڵکی دی". [514]

ئەو جەنگاوەرانە غەزاچی بوون، لەبەرئەوە هەمیشە ئامادەبوون بۆ پەلامارو لە هەڵمەتەکاندا یەکسەر بەشدار دەبوون. [515] وەلێ لەبەر نەزانینی هونەرو فێڵی شەڕ. وەك باسمان کرد. گەلێ جاران، بە نەفامیو، بە دڵگەرمییەکی زۆرەوە هەند بەرەو پێش دەچوون ئاگایان لە لەشکرەکەی خۆیان نەدەماو دەبوونە هۆی ئاژاوەو ئاڵۆزی. لەبەرئەوەیە کە شەڕەکانی سەلاحەددین، لە پێکداداندا زیاتر ڕێکوپێکییەکی پێوە دیاربوو، کەچی، هەرئەوەندەت دەزانی، سەربازانی حەزەکی، بە مەستیی ئاینەوە، لە ناوەختو لەناکاودا بەبێ فەرمان، پۆتیان دەشکاندو لەشکریان دەهێنایە ئاڵۆزیو بێ سەروبەرییو، بە قوربانی و ملشکانی خۆیان تەواو دەبوو. بە نموونە، لە (جمادي الاولى)ی ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز)دا، سەلاحەددین بە ژمارەیەکی کەمی جەنگاوەرانی ئەڵقە تایبەتەکەی خۆیەوە، بەسەر چیایەك کەوت، تا لەو بەرزاییەوە ببینێو بزانێ ئەو فەرەنگانەی کەمو زۆر لە نزیك سوپای موسوڵمانانەوە هەڵیانداوە چەندنو خەریکی چینە. کەچی لەولاوە، سەربازانی حەزەکی غەزاچی، لە عەجەمو عارەب، وایانزانی سەلاحەددین بۆ هەڵمەت بردن و بۆ شەڕ سەرکەوتووە، لەبەرئەوە فوویان لە دۆ نەکردو ملیان نا لە دوژمنو هەند بەرەو پێشچوون، سوڵتانیشیان وەپشتی سەرناو گەیشتنە ناو ڕیزەکانی دوژمن. سەلاحەددین چەند میرێکی نارد، بیانگێڕنەوەو، بەشەڕ ڕزگاریان بکەن، بەلام ئەوان گوێیان لێئاخنیو نەگەڕانەوە. [516] "خاچدروشمان لەم بەزمە سەرسام بوونو، سەیریان پێ دەهاتو وایانزانی، کە ئەم کەینو بەینە، هەبێو نەبێ، بۆسەیەکی بە دواوەیە، زەلامیان نارد بزانێ مەسەلەکە چییە، زەلام گەڕایەوە، گوتی: ئەمانە سەرەڕۆنو وێڵ بوونو لە لەشکری خۆیان دابڕاونو هیچ مەترسییەکیان لە دواوە نییە، جا ئەوجا، فەرەنگ وێکڕا پەلاماریاندانو هەموویان بە جارێ لاڵو پاڵ خستو گشتیان کوشتن. سەلاحەددین ئەمەی زۆر پێ ناخۆش هاتو، ڕك و غەزەبی لێنیشتو گوتی: شەرت بێ ئەمەتان بەسەرەوە نەڕوا، هەر هەندەی گوتو بەخۆیو ئەو کەمە سەربازانەی

---

[512] فتحي عثمان، الحدود الاسلامية، البيزنطية بين الاحتكاك الحربي والاتصال الحضاري، نشر الدار القومية، القاهرة ١٩٦٦، ص٢٧١- ٢٧٢.

[513] النويري، نهاية الارب، ١٥٣/٦. أبو يعلى الفراء، الأحكام السلطانية، تصحيح وتعليق: محمد حامد الفقي، شركة مكتبة ومطبعة مصطفي البابي الحلبي وأولاده بمصر، ١٣٥٦ك/ ١٩٣٨ز، ص٢٣. د. سعداوي، جيش مصر، ص١٧. نقلا عن ابن منكلي، مخطوط، الاحكام الملوكية، ص١٦.

[514] الكامل، ٢٩٦/١١. شذرات الذهب، ١٨١/٤.

[515] ديمومبين، النظم الاسلامية، ترجمة: د. السامر، د. صالح الشماع، مطبعة الزهراء، بغداد ١٩٥٢، ص١٦١.

[516] الكامل، ٢٩/١٢.

**لەگەڵیدا بوون، لە چیا دابەزیو دڕی بە دوژمن داو ئەوەی کوشتی، کوشتیو ئەوەی نەیکوشت و دەستی پێی نەگەیشت لە ئاودا خنکا".[517]**

**جەنگاوەرانی حەزەکیو تەوعی لە چینە جۆربەجۆرەکانی موسڵمانانەوە دەهاتن، لە عەشرەتو هۆزەکانەوە دەهاتن، دێهاتیو گوندی، شارستێنی، گەداو هەژارو دەوڵەمەندو، مەلاو سۆفی... لە هەموو چیزەیەکی تێدا بوو. (إبن القلانسي) دەڵێ: نورەددین مەحمود فەرمانی دابوو، بانگهێشت و جاڕدان وەهابێ، جاڕچی بە دەنگی بەرز بڵێ: "ئەی غەزاچیو خۆبەختکارانو هەرزەکاران، ڕۆڵەکانی زلاتانو بێ دەرەتانو غەریبان، تەیارو ئامادەباش بن، بۆ شەڕی فەرەنگی موشریکو مولحیدان.."[518] ئەوکات، لە جیاتی وشەی (حەزەکی) وشەی (هەرزەکاران)یان بەکاردەهێنا، پاشان وشەی (حەزەکی)، واتا تەوعی جێگای گرتەوە، مەبەستیش ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کە دەبوون بە جەنگاوەری بێ نیزام.**

**لە مزگەوتەکانیشدا، خەڵك و خوایان هاندەدا، بەشێوەیەکی حەزەکیو ئارەزوومەندانە ببنە سەربازی سوپای ئیسلام، هەرکە وتاربێژانیش لە مینبەرو سەکۆی گوتار دەهاتنە خوار، نوێژکەران دەستیان دەکرد بە هوتاف کێشانو بانگهێشتو یەك یەكو کۆمەڵ کۆمەڵ ڕوویان دەکردە سەربازگەکان.**

**سەلاحەددین، جار جارە سەربازانی حەزەکی سەرپشك دەکرد، بە دەستی خۆیان دیلەکان بکوژن، بە تایبەتیش وەرگەڕاوان (المرتدين)و تیرەندازەکانی سوپای خاچپەرستان، وەك ئەوەی لە (بيت الأحزان) لە ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٧٩ز) دا ڕووی دا، ئەوەبوو، پاش سەرکەوتنەکەی (حطين)، سەلاحەددین داوای کرد لە "جەنگاوەرە حەزەکیو بەڕەحمو سۆفییەکان" کە هەریەکەیان، دیلێ لە دیلەکانی تیپی (الداوية والاستبارية)[519]ی خاچپەرستان. کە زۆر ناحەزو دوژمنی ئیسلام بوون. بکوژێ.**

**حەزەکیو تەوعییەکان، ئەو ڕۆژەی کوشتارەکەی (حطين) ئیشێکی گەورەو گرانیان بە ئەنجام گەیاندو بوونە مایەی سەرکەوتنی سوپای ئەییوبی لەو شەڕەدا زۆر بە خێرایی، ئەوە بوو "ئاگرێکی زۆر کەوتەوەو بەرەو ڕووی دوژمن کشاو گەشایەوە".[520] بایەکەش بەرەو ڕووی دوژمن هەڵی کردبوو، وەك (أبن الأثير)و کەسانی دیکەش دەگێڕنەوە و دەڵێن: "گەرمایی ئاورو گەرمایی شەڕو گەرمایی دووکەڵی بە جارێ لە دوژمن بەردا".[521]**

### ٩- تیپە وەل سوپاکان (الملحقة بالجيش):

### أ. تیپی ئەندازیاری:

---

[517] ن، م، ص، ٣٠. مفرج الكروب، ٢/٢٨٥- ٢٨٦.

[518] ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق ص٣٤٠.

[519] الداوية، أو الهيكليين، "وشەیەکی عەرەبییە، بە ئەسڵ سریانییەو عارەب بەو جۆرەیان شێواندووە، لە سریانییەکەیدا، بە مانای (هەژار) هاتووە. ڕێکخراوێکە، بە ئەسڵ ناوەکەی لاتینیەو، بەم جۆرە دەنووسری: paupere, commilitones christi واتا: سوارە هەژارەکانی مەسیح، فيليب حتي، تأريخ العرب، مطول، ٧٣٤، محمد العروسي المطوي، الحروب الصليبية في الشرق والغرب، دار الكتب الشرقية، تونس ١٩٤٥، ص٧٠. (الاسبتارية)ش، واتا: سوارەکانی قدديس يوحەننا، فليب حتي، هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە، محمد المطوي، والعروسي، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٧١، مكسيموس مونروند، من تأريخ الحروب الصليبية، ترجمة: كيريو مكسيموس مظلوم، طبع في اورشليم، في دير الرهبان الفرنستسكانيين، ١٨٦٥، ص١٩٩. السيرجون، أ، هامرتن، تأريخ العالم. مقال(السلاح) لشارلز. ح، فولكس، مجلد٥، ص١٧٥. وشەی (أستباريه) شێوێنراوی وشەی هەسپیتاڵە (Hospital) ، واتا سوارەکانی نەخۆشخانەکە. ئەم دوو گروپە پێشتر لە خاکی موقەددەسدا، وەك دوو گروپی خێرخوازی ئایینی هاتنە کایەوە بە تایبەتیش لە هەڵمەتی یەکەمی خاچپەرستاندا. وەلێ هەر زوو گۆڕانو بوون بە دوو تیپی سەربازیو لە شەڕەکانی پاشتردا جێگا دەستیان دیاربوو، ئەمانە لە شەڕە جۆربەجۆرەکاندا چالاکانە بەشدارییان کرد، قەڵاو قایمکاریی تایبەت بە خۆیان هەبوو، بەرەڤانییان لێ دەکردو لە موسڵمانان بە داخ بوونو گۆتاوەڕۆی زۆریان بەسەرهێنان، لەبەرئەوە سەلاحەددین بڕیاریدا بە سەختی تۆڵەیان لێ بستێنێ.

[520] الروضتين، ٢/٧٧. بنۆڕە: مرآة الزمان، ٨/٣٩٣.

[521] الكامل، ١١/٥٣٥. ابن العديم، زبدة الحلب، ٣/٩٤.

خواسایی، دوو تیپ، تیپی ئەندازیاری و تیپێکی پزیشکیی وەل (مع) سوپا دەکەوتن، یەکەمیان ئەرك‌و فەرمانێکی بەجێ دەهێنا، پێویستی بە زانست‌و شارەزایی ئەندازەی سەربازی‌و کوشتار هەبوو. بەتایبەتیش کوشتاری دەوروبەری شووورەو کەندو خەندەقان. بە نموونە، وەك دانان‌و داکوتانی ئامێرو ئامرازەکانی چەکی قورسی جەنگ (مەنجەنیق‌و دەبابەو کەوانە قورس‌و گرانەکانی، وەك: جیرەکەوان‌و شوورەپارێزو کەوانی قفڵدارو کەوانی نەوتهاوێژ). هەروەها بنیادنان‌و دروستکردنی سەربازگەو شووره، بەتایبەتیش لە پێگەو جێگە سەربازییە گرنگەکاندا، هەروەها دامەزراندن‌و ڕماندنی پرەپێڵ‌و، پڕکردنەوەی کەندرو خەندەق‌و بیرلێدان‌و نیشانکردنی جێگای گەمارۆدانی شوورەو شاران‌و کاول کردنی شوورەو، گۆڕین‌و لادانی ئاوەڕۆی ڕووباران و ئیشی دیکەی لەو جۆرە بابەتانە، کە هەمووی ئەرك‌و فرمانی ئەم تیپە ئەندازیارییە بوون.

بەر لە گەمارۆدانی (بیت المقدس)، سەلاحەددین و سوپاکەی پێنج ڕۆژ دەورو خولی ئەم شارەیان دەداو تاقی دەکردەوە، تا دواجار، شارەزایانی شووره، لە باکوری شوورەی شارەکەدا جێگایەکی لەباریان دۆزییەوە، بەرەو دەرگای (عەموداو کڵێسەی سەهیۆن)، جا ئەوجا سەلاحەددین فەرمانی دا، ئامێر و ئامرازی گەمارۆ، لەو جێگەیەدا دامەزرێنن. [522]

لە ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)دا، کە لەشکری سەلاحەددین گەمارۆی شاری موسڵی داو، گەلێکی پێوە ماندوو بوون‌و لەبەر قایمیی شوورەکەی نەیانتوانی بگەنە ناوشارەکە، ئەوجا هەندێ لە پیاوەکانی سەلاحەددین تەگبیری ئەوەیان بۆ کرد ئاوەڕۆی دیجلە بگۆڕێ‌و شارەکەش تینوو بکات. ئەوجا، هەستان تەگبیریان بردە لای (مەلای زانا فخرالدین بن الدهان)ی بەغدایی. ئەو کابرایە ئەندازیارو شارەزای ئەو سەردەمە بوو.. گوتی: "ئەم کارە، یارای کردنە، بەئاسانی دێتە دەست‌و هیچ گرێ‌و گۆڵی تێ ناکەوێ". [523]

جا، ئەوجا سەلاحەددین نامەیەکی بە ڕاوێژکاری ناوداری خۆی (القاضي الفاضل) بۆ خەلیفەی عەبباسی نووسی‌و دەڵێ: "ئەندازیارانی شارەزا، دەڵێن، دەکرێ دیجلە لە موسڵ بابدرێتەوەو بەناویدا نەڕوا، بەجۆرێ، جێگای هەڵێنجانی ئاو، تەواوێ لە شارەکە دووربکەوێتەوە، لەم بارەدا خەڵکی شارەکە ناچار دەبن، شار بە بێ کوشتار وەدەستەوە بدەن‌و، نەزیان‌و زەرەری تەنگەتاوی‌و نە شەڕی خوێناوی". [524] بەڵام سەلاحەددین پرۆژەکەی وەبەرکارنەخست، چونکە لەلایەکەوە کارێکی زەحمەت‌و ئەرك‌و مەسرەفی زۆریشی دەویست، لەلایەکی دیکەشەوە پرۆژەگەلی گرنگتری بەدەستەوەبوو، نەدەپەرژایە سەر لادانی دیجلە، لەبەرئەوە، پشت گوێی خست‌و گوێی لێ خەوان.

**ب. تیپی پزیشکی:**

کارێکی پێویست‌و زەرور بوو تیپی پزیشکی لەگەڵ سوپادا بڕواو لەنەبەردو مەیدانی شەڕدا، بریندارن‌و زامداران‌و نەخۆش‌و دەردەداران بلاوێنێ‌و چارەسەریان بکات. پزیشکان‌و کۆمەککارانیشیان جۆرە پێکهاتەیەکیان بەشێوەی نەخۆشخانەیەکی گەڕۆك سازدابوو، داوودەرمان‌و ئامێرو دەستەبەرە(نقالات)ی هەڵگرتن‌و گواستنەوەی ناساغ‌و نەخۆشانیان هەبوو، هەموویشی بەپشتی وڵاخەوە دەگەڕان‌و نەخۆشخانەکەشیان لەبن دەواردا سازدەداو بیمارو بریندارانیان لەوێ دەخەوان‌و چارەسەریان دەکردن.

ڕاستیشت دەوێ، لەسەردەمی سەلاحەددیندا کاروباری پزیشکی‌و چارەسەری بووژایەوە، چونکە لەلایەکەوە زۆر پێویستیان پێی هەبوو، لەلایەکی تریشەوە چ سەلاحەددین و چ میرەکانیشی بە سنگفراوانی و چاوتێرییەوە باربۆیان دەکردن‌و ئەرك‌و مەسرەفیان دەکێشان. سەلاحەددین هەر زوو خەمی کاروباری پزیشکی‌و پزیشکانی کەوتبووەو دڵ‌و، بە گەرمی دنەی پزیشك‌و حەکیمانی دەداو پزیشکانی تەلاری شاهانەی فاتمیی میسرو، ئەوانەی تەلاری شاهانەی

[522] الکامل، ٥٤٧/١١. الروضتين، ٩٢/٢. النجوم الزاهرة، ٣٦/٦.

[523] الروضتين، ٦٢/٢ـ ٦٣.

[524] الروضتين، ٦٣/٢. مفرج الكروب، ١٦٧/٢.

نوورەددینی ئەتابەکی کە زووتر لەو جێگایانە خزمەتیان کردبوو هەموویانی بەڕێزەوە سەیر دەکردو بواری کارو خزمەتی بۆیان دەڕەخساند. بە نموونە پزیشك (أبوالبیان بن المدور)، ئەم پزیشکە (جامکیة)ی واتا مووچەی سوڵتانی بۆ بردرابوویەوە، هەموو مانگێ دەگەیشتە دەستیو تا بیست ساڵیش بەمجۆرە مایەوە، پاشان دابڕاو ئیدی تەنیا لە ماڵی خۆیان سەیری نەخۆشانی دەکرد، وەڵێ کەسێ "زۆری خۆش نەویستبا"، چارەسەری نەدەکرد، بەڕاددەیێ، کاتێ "میر أسامة بن منقذ الشیزي (خاوەنی کتێبی – الاعتبار–ە)، لە یەمەنەوە بەنیازی چارەسەری هاتبوو"، کابرای پزیشك ناردی پۆزشی بۆ هێنایەوەو چارەسەری نەکرد. (أبو البیان) گەلێ کتێبی لە ئەزموونی پزیشکی دا هەیە".[525]

(أبو الفضل عبد المنعم بن عمر الفساني) کە بە حەکیمی زەمان ناودەبرا و زانای سەنعەتی پزیشکیو دروستکردنی کل بووە، ئەمیش یەکێ بووە لە پزیشکانی سەردەمی سەلاحەددین، ئەم لە دیمەشق بردیە سەرو لە عیادەکەی چارەسەری بیمارو ناساغانی دەکرد، سەلاحەددینیش زۆر ڕێزی لێ دەناو حورمەتی دەگرت.[526]

دوو پزیشکی دیکەش ناوبانگیان هەبوو، یەکێکیان بە ناوی (أبو الحسن علي بن أبي عبدالله عیسی)، بە (إبن النقاش البغدادي الدمشقي)[527] دەناسرا، ئەویتریان بە ناوی (عفیف الدین بن عبدالقاهر)، ئەمیان کتێبێکیشی داناو بە سەلاحەددینی پێشکەش کرد. وەڵێ ئێمە لەم هەموو پزیشکانە، نازانین تا چەند لە هەڵمەتەکانی سوپاگەلی سەلاحەددیندا بەشداریان کردووە، ئەوە نەبێ کە دەزانین هەندێ پزیشکی، بە نموونە وەك (أبو زکریا أمین الدولة یحیی بن أسماعیل الأندلسي) کە یەکێ بووە لە قوتابیانو شاگردانی (الحکیم مهذب الدین)، ئەم (أبو زکریا)یە وەل سوپای سەلاحەددیندا دەچووە بەرەکانی شەڕ، پاشان، ئەمیش وەك زۆربەی زۆری پزیشکانی ئەو سەردەمە، لە دیمەشق گیرسایەوە. وادیارە گیرسانەوەی پزیشکان، بە زۆریی لەم شارە، بە هۆی (بیمارستانەکەی) نورەدیینەوە بووە. ئەو بیمارستانەش کە لە دیمەشقدا بووە، لەبەرئەوە بووە کە شارەکە لە بەرەکانی شەڕو جەنگەوە نزیك بووەو ناساغو بیمارو بریندارانی شەڕ، بۆ ئەوێ حەواڵە دەکران. (أبو زکریا) لە دوادوای ژیانیدا لێکەوتو پەکی کەوتو لەکارکەوت،[528] بەڵام سوڵتان کە خەمخۆری پزیشکان بوو" وەك مووچەی بۆ (أبو الدهان البغدادي)[529] و، کلچی (الکحال أبو الفضل سلیمان المصري)[530] بڕیبووەوە، بۆ ئەمیشی بڕییەوەو تا ڕۆژی مردنی مووچەکەی وەرگرت.

ناودارترین پزیشك، لە پزیشکانی سەلاحەددین (موفق الدین أبو نصر أسعد) بووە، کە بە (أبن مطران الدمشقي) دەناسرا، ئەم پزیشکە لە هەموو غەزاکانی سوڵتاندا لە تەکیدا بووە،[531] لە (بیمارستانەکەی) نوورەددینیشش، لە دیمەشق کاری دەکرد، کۆمەڵێ کتێبی پزیشکییشی داناوە، وەك (المقالة الناصریة في حفظ الامور الصحیة)[532] و گەلێ کتێبی دیکەش. (العماد الکاتب) باسی ئەم پزیشکە دەکاو دەڵێ: پزیشکێکی دەست سووكو لێزان بوو، تا بڵێی قسەخۆش بوو. گەلێکیش بە پیاوەتی و دڵسۆزییدا هەڵدەدا، کە سەلاحەددین زۆر ڕێزی لێگرتووەو لەلای سەلاحەددین زۆر لە پێشو پێگەی بەرزبووە، پزیشکێکی بە فامو بە کامو فەراسەت و زیرەك بووە[533] و زامدارێکی زۆری شەڕو، جەنگو، نەخۆشی زۆری چارەسەر کردووە، بە خودی (العماد)ی مێژوونووسیشەوە.[534]

---

525 ابن ابی أصیبعة، عیون الأنباء في طبقات الاطباء، أصدار دار الفکر، بیروت ۱۹۵۷، ج۳، ص۱۹۱.

526 ن، م، ۳/۲۵۹.

527 ن،م، ۳/۲٦٥.

528 ن،م، ۳/۲٦۸.

529 ن،م، ۳/۲۹۸.

530 ن، م، ۳/۲۹۹.

531 ن، م، ۳/۲۹٤.

532 ن، م، ۳/۲۹۷.

533 الفتح القسي، ٥٧٦.

534 ن، م، ٥٧٧.

بێ لەوەش سوڵتان پزیشکی خۆی هەبوو، بۆ هەر شەڕێ دەچوو لەگەڵیدا بوو، چونکە سوڵتان خۆی جار جارە هەستی بە ئازار دەکرد، دڵی دانەدەکەوت‌و دومەڵ لە پشت‌و ناوشانی دەهات، تا هەڤاڵ‌و دۆستانی گلەییان لێ کرد، سەرزەنشتیان کرد، کە بۆچی هەند بە ئاگای خۆیەوە نەماوەو گوێ بە خۆی ناداو واناکا کەمێ بحەوێتەوەو، تەزووی دەست‌و پەنجەی دەرچێ. کەچی ئەو وەڵامی دەدانەوە، دەیگوت: کەینێ خۆم بهاوێمە سەرپشتی ئەسپەکەم، بە ئەزمی غەزا، ئێش‌و ئازار چییە لە لەشمدا نامێنێ، تا دادەبەزم. پزیشکە تایبەتەکەی خۆیشی وەنەبێ تەنیا هەر ئاگای لەو بووبێ‌و بە چارەسەری ئەوەوە خەریك بووبێ، نەخێر بەڵکو چارەسەری گەورە فەرماندارانو میرانی لەشکرەکەشی دەکرد. بە نموونە کاتێ سەرگەورەی هەولێر (أربیل) (زین الدین یوسف نیالتکین) ساڵی ٥٨٦ك/ ١١٩٠ز، لە گەمارۆکەی (عکا) دا، تووشی لەرزو تا هات‌و هەر بەو نەخۆشییەش گیانی لەدەستدا، پزیشکەکەی سەلاحەددین چوو بۆ لای بۆ چارەسەرکردنی.[535]

سوڵتان، گەلێ جار، خۆی سەرپەرشتیی تیمارکردن‌و چارەسەرکردنی بریندارانی دەکرد، بە نموونە، وەك لە تێکشکانەکەی شەڕی (ئەرسۆف) کە لە شەعبانی (٥٨٧ك/ ئەیلولی ١١٩١ز)دا لە سوپای سەلاحەددین قەوما. سەلاحەددین، لەوێ دانیشت‌و داوای کرد یەکە یەکە زامدارەکانی بۆ بهێنن‌و دەستی کرد بە تیمارکردنیان.[536]

**ج. تیپی مۆسیقای سەربازی:**

هەر، کە چاوەش (جاڕچی)، لەشکری بۆ تەیارو ئامادەباشی بانگهێشت بکردبا، یەکسەر تەپڵی جەنگ (الکوسات)[537] دەهاتە لێدان‌و دەنگدانەوە. مۆسیقای سەربازیی ئەو سەردەمە ئەوەبوو" ئەم مارشەی ئێستا هەیە" ئەوسا هەر ئەوەبوو، کە هەبوو، بۆ وەجۆشهاوردنی جەنگاوەران لێ دەدرا.[538]

ڕاستیشت دەوێ لە سەردەمی سەلاحەددیندا، بەکردار، ئیشی ئەوتۆ لەم ڕووەوە ئەنجام دراوە، ئەوەمان بۆ ساغ دەکەنەوە کە مۆسیقای سەربازی لە سوپادا جێگای باڵاو بەشکۆی خۆی هەبووە، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی یانەیەکی تایبەتی بەناوی (تەپڵخانە)وە بۆ تەرخان بکرێ. (المقریزی) لەم ڕووەوە دەڵێ: هەر بە گیرسانەوەی سەلاحەددین لە میسرو کۆتایی هاتنی دەوڵەتی فاتمی، "یانەی نۆرەکاری تەپڵخانە"[539]ی دامەزرانداو، کاروباریشی ڕێکخست. (القلقشندي) مانای ئەم زاراوەیە شرۆڤە دەکاو دەڵێ: "واتا خانووی (ماڵی) تەپڵ، تەپڵ‌و شەیپوورو ئامێری دیکەی مۆسیقای تێدایە. ئەم ئامێرانە لە کاتی شەڕدا لێ دەدران، لە ڕۆژانی دیکەدا، ڕۆژانە سێ جار لێ دەدران.[540] بە تەپڵژەنەکەیان دەگوت (دیندار)و بە شەیپورچییەکەیان دەگوت (منفر) واتا نەفیرچی، هەرچی زیل بە دەستەکانە، ئەوانە پێیاندەگوترا (کوسی).[541]

عادەتیش وابوو، گەورەی سەربازان دەرکەوتباو بهاتبایە، زیل‌و بەمیان بۆ لێ دەداو ئاڵاو بەیداغیان هەڵدەکردو شەیپوور دەکەوتە قووقەقووق، بەنموونە وەك ئەو ڕۆژەی کە (الملك الظاهر غازی) کوڕی سەلاحەددین هات‌و پێشوازییان لێ کرد.[542] بۆ هەر بۆنەیەکیش ئاوازێکی تایبەت بەو بۆنەیە لێ دەدراو بەرلەوەش مەشقیان لەسەر دەکردو فێری دەبوون‌و جەنگاوەرانیش گوێیان پێی ڕاهاتبوو و تێی دەگەیشتن. لێدانی تایبەت هەبوو بۆ بەردەوامبوونی شەڕ، کە

---

[535] الفتح القسي، ٤٣٨.

[536] الروضتین، ١٩١/٢. مفرج الكروب، ٣٦٨/٢. وارسۆف: شارێکە لە گوێی دەریای شام "دەریای ناوەڕاست"، کەوتووەتە نێوان قیسارییەو یافا. معجم البلدان ١٥١/١.

[537] الکوسات: زیلە، وەك سینی وایە، لە قەڵغانی بچووك دەچێ دوانە، دەدرێن لە یەکتری. صبح الأعشی ٩/٤.

[538] النوادر، ١٤٩.

[539] الخطط (طبعة أوفسیت) ٢٣٣/٢.

[540] ن، م، ص٥.

[541] صبح الأعشی، ١٣/٤.

[542] النوادر، ١١٩.

شەڕ نەوەستێت، هەرچەندیشە خۆیان شکستیان خواردبووبێ، کابرای زیل بەدەست (هەر لێی دەداو بەزرنگەو زیڕەی دەهێنا).[543] بۆ مژدەی سەرکەوتنیش ئاوازی وەجۆشهێنی خۆی لێ دەدرا، بە نموونە، لە شەوالی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز) دا، هەواڵ گەیشت، کەوا کەشتیگەلی ئەییوبی بەلەمو کەشتییەکانی فەڕەنگیان بە زیاتر لە پێنج سەد خاچدروشمەوە بەدیل گرتووە، هەر بە گەیشتنی ئەو هەواڵە، خەڵكو جەماوەرو ئەییوبیان دەستیان کرد بە ئاهەنگو، شەیپووری زەفەر، گوێی زەلامی کەڕدەکرد".[544]

**د. ئاڵابەدەستانی سوپا :**

لە ناو سوپادا، گروپێ هەبوون، ئاڵای سوڵتانیان هەڵدەگرتو دەیانپاراست. ئاڵا، یان بەیداخ وەك هێمایەك وابوو، کۆمەڵو تیپەکانی پێ دەناسرانەوە، دەوڵەتانی پێ جیادەکرانەوە، چونکە هەر دەوڵەتە، چ ئیسلامیی، چ غەیرە ئیسلامیی، ئاڵای جیاوازی خۆی، بەڕەنگی[545] جیاوازی خۆی هەبوو.

ئاڵای سەلاحەددین ڕەنگەکەی زەرد بوو، لە ناوەڕاستیدا وێنەی هەڵۆیەکی تێدابوو، کە ماناو نیشانەی بەهێزیو زەفەرو سەرکەوتن دەنوێنێ. لە ناو ئاڵاکاندا "ئاڵایەکی گەورەی لە ئاوریشمی زەرد دروستکراوو بەزێڕ نەخشێنراوی تێدابوو، نازناوەکانی سوڵتانو ناوی سوڵتانی لەسەر نووسرابوو، پێیان دەگووت (عصابة) ئاڵایەکی کە (جالیش) یان پێ دەگوت، بە نووکەکەیەوە تەوقەنێ قژ(موو)ی پێوە بوو، ئاڵای زەردی گچکە گچکەش هەبوون، پێیاندەگوتن سنجەق".[546]

هەرچی ئاڵا گەورەکەیە، ئەوە، خواسایی کاروانی سوڵتان هەڵیاندەگرتو لای ئەوان دەبوو، وێنەی هەڵۆیەکەش ئەوە لە زەمانی پێشترەوە لەسەر ئاڵاکانی دێرین هەر هەبووەو بەسەر ئاڵاگەلی زۆربەی دەوڵەتە دێرینو کۆنەکانەوە دیتراوەمێژووی[547] ئیسلامییشدا، (عمادالدین زنگی) لەسەر دراو نەخشی کێشاوە، پاشانیش ئەرتەقیەکان کردنیان بە شەقڵو هێمای خۆیان. سەلاحەددینیش لەسەر ئەوەی ئەوان ڕۆیشتو نەیگۆڕیو لەسەر ئاڵاکەی خۆی وێنەی کێشا. وەلێ پێدەچێ سەلاحەددین خۆی ڕەنگی زەردی[548] بۆ ئاڵاکەی بە گەن کردبێو لە کەسەوە فێر نەبووە. (العماد) ساڵی ٥٨٣ك/ ١١٨٧ز، کاتێ کە شاری (صیدا)یان گرت و چوونە ناو شارەکەوە، گوتی "چەند زەلامێك لە لایەن سەرگەورەی شارەکەوە هاتنو کلیلەکانیان بۆمان هێنا، ئێمەش بە چرای عەزمو ئیرادەی بێ گەردو چەرمگ تاریکاییەکانمان ڕەواندەوەو ئاڵای زەردمان بە دەستو مەچەکی سپی لەسەر شوورەی شارەکە هەڵدا".[549] العماد دەڵێ: "ئاڵاکانی سوڵتان زەردبوون".[550] گەلێ جاریش بە بۆنەی چەند سەرکەوتنێکی لەشکری سەلاحەددینەوە بەسەر خاچدروشماندا، ناوی ئاڵا زەردەکەی لە شیعری شاعیراندا هاتووە، کاتێکیش لە ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٧٩ز) دا، (بیت الأحزان) کاول کراو

---

[543] ن، م، ص ١٨٣ـ ١٨٤.

[544] ن، م، ص١٩٦. بنۆڕە: مفرج الکروب ٢/ ٣٧٣ ـ ٣٧٤.

[545] لە عەرەبییەکەشدا هەر نووسراوە: (رەنك، رنوك)، دەڵێ وشەیەکی (فارسی)، یان (کوردی)یە، دروشمێکەو سوڵتان دەیدات بە (میر)و هێمای دامەزراندنی ئەو میرەیە لەسەر ئەو میرنشینی یە، د. زکی، السلاح فی الاسلام، ص٢٩.

[546] صبح الأعشى ٤/٨.

[547] فیلیب حتي (دەڵێ: ئەسڵەکەی سۆمەرییە)، تأریخ سوریة ولبنان، ترجمة کمال الیازجي، مراجعة د. جبرائیل جبور، دار الثقافة و مؤسسة فرانکلین، المطبعة البولیسیة، بیروت ١٩٥٩، ص٢٥١.

[548] د. الباز العریني دەڵێ: "بەکارهێنانی ئەم وشەی (الرنوك)ە، لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواشدا، لە سەدەی (٦)ی کۆچی (١٢ز)دا بڵاوبۆتەوە". بنۆڕە: کتاب الممالیك طبعة دار النهضة للطباعة والنشر، بیروت ١٩٦٧ ، ص٢٢٧. نەشمانزانی ئاڵاکەی نورەددین چ ڕەنگ بووە، وا دیارە دەوڵەتی ئەییوبییش ئەم ڕەنگە زەردەیان تاسەر نەبردبێ، بە نموونە، (الملك الناصر داوود) سەرگەورەی دیمەشق، (کوڕەزای الملك العادل) ڕەنگی ڕەشی بەکارهێناوە، وەك ڕەنگی ڕەشی عەبباسییەکان، الممالیك، ص٢٢٧.

[549] الفتح القسي، ص١٠٣.

[550] سنا البرق الشامي، ١٥٠/١، بنۆڕە: دیوان القاضي الفاضل، مطابع دار الکتاب العربي بمصر، القاهرة ١٩٦١، ج١، ص٣٩. الروضتین ج١، ق٢، ص٦٩٧.

لەشکری سەلاحەددین سەرکەوت، کۆمەڵێ شاعیر پیرۆزباییان لیٚ کرد، یەکێ لەو شاعیرانە (بهاءالدين أبو الحسن علي الساعاتي الخراساني) بووە (ت ٦٠٤ك/ ١٢٠٧ز)، ئەم شاعیرە پیایدا هەڵدەڵیٚو، دەڵێ:

ئالاّی زەردت کە دەرکەوێ ماخولیایان پیٚ ئەکەوێ

ئالاّکەت وەکو خۆر بەرزە هەرگیز بە ناحەز ناکەوێ

دەبا کوێربێ، کۆستی کەوێ ئالاّی سەربەرزان نانەوێ

چاوت ڕوون، یەعقوبی زەمان دۆعاکەی یوسف سەرکەوێ[551]

شاعیرێکی دی بە ناوی (الحسن)، ناسراو بە (العلم الشاتاني) ئەمیش بەشیعرێ پیایدا هەڵدەڵیٚو دبێژێ:

هۆ ئالاّ زەرد، هەر هەموو ئومێدمان پێتە

ئالاّی زەردی، پرشنگ زێڕین

ئالاّی دێرین

توند توند بیگرە، خۆت ئاسایی پێشمان کەوە

هەمووەمان سەرمان لە ڕێتە..[552]

جگە لەوانە، گەلێ شیعری دیکەش بەسەر سەلاحەددین و ئالاّی ئەیوبیاندا هەڵدراوە.

ئەو کاتیش، ئالاّ هێمای سەروەری بووە، بەسەر قەلاّو قایمکارو کەشتیی و دامودەزگا سەربازییەکاندا هەڵدەدرا. هەر کاتێکیش، لایەنێ ببەزیایە، لایەنی سەرکەوتوو یەکەمجار ئالاّکەی دادەگرتو ئالاّی خۆی لە جێگای هەڵدەدا، موسڵمانان کە بەسەر خاچدروشماندا سەردەکەوتن، ئا وەهایان دەکرد. کاتێکیش خاچدروشمان لە (عکا) بەسەر موسوڵماناندا زاڵ بوون و چوونە ناو شارەکەوە، "مەرکیسی نەعلەتی چووە ناو شارەکەوەو چوار ئالاّی پیٚ بوو، ئالاّیەکی لەسەر قەلاّکە هەڵدا، ئالاّیەکیشی لەسەر منارەی مزگەوتەکەو ئالاّی سێیەمی لەسەر تاوەری (الداويه) هەڵداو، ئالاّی چوارەمی لەسەر (برج القتال) هەڵداو، ئالاّ زەردەکانی سەلاحەددینی[553] داگرت".

هەرچی، ئالاّی خاچدروشمانە، (أبن شداد) بەسەر عارەبانەیەکەوە دیویەتیو دەڵێ: "ئالاّی دوژمن بەسەر عارەبانەیەکەوە هەڵدراوەو توندوتۆڵ چەقێنراوە. هێستر ڕایدەکێشێ. خۆشیان پاڵی پێوە دەنێنو دەیپارێزن. ئالاّیەکی زۆر بەرزە، ئەڵێی منارەیە، تەختەکەی سپییەو، سوورێکی وەك خاچی تێدا دەدرەوشێتەوە"[554]. واتا ئالاّی خاچدروشمان لە ئالاّی (ڕێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتی) ئێستا دەچوو.

---

551 مفرج الكروب، ٢/٨٣ـ ٨٤. مەبەست لە (يوسف) سەلاحەددینە.

552 وفيات الأعيان، ٧/٢١١. سنا البرق ١/٢٥٠. الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٩٦.

553 النوادر ١٧١، الروضتين، ٢/١٨٨.

554 النوادر، ١٤٩. مفرج الكروب ٢/٣٤٣.

## کەرتی سێیەم:

## دامودەزگای یاریدەدەری ڕێکخستنی سوپاو هەڵسووڕاندنی کاروباری کوشتارو ئاشتیو دیلەکان

**یەکەم: تەتەرو پۆستەو هەواڵگری.**

**١- ڕێکخستنی کاروباری پۆستەو تەتەر.**

**٢- یزك ( تیپە چەرخەچییەکان ).**

**٣- کۆتری نامەبەر**

**٤- بۆسە.**

**دووەم: هەڵسووڕاندنی کاروباری شەڕو ئاشتیو بەدیلگیراوان.**

**١- ئەنجومەنی جەنگی سوپای سەلاحەددین.**

**٢- پلان‌و شێوازەکانی کوشتار.**

**٣- وەرزی شەڕو کوشتار.**

**٤- هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلەکاندا.**

**٥- پەیماننامەگەل و ئاگربەستەکان.**

## یەکەم: تەتەرو پۆستەو هەواڵگری

### ١ـ ڕێکخستنی کاروباری پۆستەو تەتەر:

بارودۆخی جەنگو، تاوسەندنی ململانێی نێوان موسوڵمان و خاچدروشمان، پێویستی کرد، دەزگایەك هەبێ، سوسەی بارودۆخی دوژمن بکاو ئاگای لە جموجوڵی ببێ و بزانێ هونەرو هێزی ئامەدەیی و، جۆری چەك و بارگەو جبەوخانەی چۆنەو چەندەو بتوانێ هەواڵو دەنگو قاو لەهەموو لایەکی وڵاتەکەوە وەربگری. کاربەدەستانی دەوڵەتیش بۆ شاردنەوەی نهێنییەکانی سوپا هەند بە تەنگەوە بوون هەند بە پەرۆش بوون، نەیاندەهێشت هیچ نهێنییەك بێتە دزین و بگاتە دوژمن.

ڕێکخستنی کاروباری تەتەرو پۆستەش، دیوانێك (دایەرەیەك) هەڵی دەسوڕان پێی دەگوترا دیوانی پۆستە. ئەم دائیرەیە هەندێ فەرمانبەری هەبوون سەرپەرشتیان دەکرد. هەواڵو پێویستییەکانیشیان بە وڵاخ و ئەسپی قوتە (کلك بڕدراو)دا دەنێردران تا خەڵك بزانن کە ئەو ئەسپانە ئەسپی فەرمین و لە وڵاخەی کاروانی جیاوازن. پۆستەو تەتەر هەر بەم شێوەیە بەڕێوەدەچوو تا داهاتنی سەردەمی بەرەی زەنگی و بەرەی ئەیوبی، ئەوجا ئەمان حوشتری چاکیان بۆ ئەو کارە هەڵدەبژارد[٥٥٥] سەردەمی ئەمانیش بەو جۆرە چووە سەر پاش نەمانی ئەمانیش ئیدی دەوڵەتی تورك واتە مەملوکەکان[٥٥٦]هاتە کایەوە.

کاربەدەستانی ئەم دەزگایە تەتەریان دەنارد، تەتەر تا پێی بڕکات دەڕۆشت بەرەو جێگای دوور دوور دەچوو، تا دەگەیشتە قۆناغێ لە قۆناغەکان، لە نیوان هەرێمێك و هەرێمێکی دیدا لە دەورەبەری ناوچەکاندا، قۆناغ گەل هەبوون (خان) هەبوو. لەو خانانەدا ئاو و خۆراك و ئالفی وڵاخ تاقەت دەکرا، ژووری گەرم و گوڕ بۆ زستان جێگای فێنکی بۆ هاوینان فەراهەم بوو. تەتەرەکان لەم خانانەدا ماندوویان دەحەسایەوە، هێستری پەککەوتەو ماندوویان لەوێ بەجێ دەهیشت و هێستری حەساوەو گورج و گۆڵیان لە جیانی وەردەگرت و دووبارە ملی ڕێگەیان دەگرتەوە تا بۆیان کرابێ زووتر دەگەیشتنەجێ و ڕێگای هەموارترو باشتریان دەگرتە بەر.[٥٥٧] تەتەرەکانیان هەڵبژاردبوو، هەموویان تەتەری دەست و دڵ پاك و بە ئاوەزوو زیرەك و توانا بوون، شارەزای هەردو بەردو ڕەچەو ڕێگا بون، سروشتی وڵاتەکەیان بە چاکی دەزانی، ئەو ئیشەی پێیان سپێردرابوو تا بڵێی گرنگ بوو، (القلقشندي) دەڵێ: "تەتەر پێویستە قسەزان و زمان پاراو بێ، لەبزی شیرین بێ، ڕستەو وشەی ڕوون بێ، ئاخاوتنی بەجێ بێ، هزرو فکری دروست بێ، لەسەرخۆ بێ، هەڵەشە نەبێ، نەزۆر ڕەق بێ بشکێ و نەزۆر نەرم بێ بپچڕێ، دەبێ ڕاستگۆ بێ، دڵپاك بێ، بێ غەل و غەش بێ و چاوچنۆك و چاو لە دەست و بە تەماع نەبێت".[٥٥٨] هەرچی (الأوسی الأنصاري)یە ئەوا، ئەو خەسڵەت گەلێکی زۆری هێناوەتەوە، کە بەڕای ئەو دەبێ لە تەتەری (چاوگێڕو سیخوڕدا) فەراهەم بن، بۆ نموونە دەڵێ: پێویستە باوەڕپێکراو بێ، گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی شل بکرێ و ڕاستگۆ بێ و هەند هەستەوەرو دووربین و فەراسەتزان بێ، کە بتوانێ دوژمنی قسە نەدۆڕ بە چاویدا بخوێنێتەوەو، لە بەڵگەو نیشانەوە نهێنیی دوژمن هەڵماڵێ. دەبێ بە ئاوەزو بلیمەت و فرو فێڵزان و، دوژمنخەڵەتێن بێ، دەبێ لە گەڕان و لە سەفەردا خاوەن ئەزموون و کردەبێ ی ئەو وڵاتە بێ کە ڕووی تێدەکا، زمانیان بزانێ و، دۆستیان لە ناودا پەیدا بکات و بزانێ چی دەڵێن و چی ناڵێن. دەبێ خۆی لە نەتەوەی دوژمنەکان نەبێ، چونکە مرۆڤی ئاسایی دڵی بۆ نەتەوەکەی خۆی لێ دەدا، خۆ ئەگەر هاتوو کەوتە دەست دوژمن، ئەوا لەو بارەدا، پێویستە بە ئۆقرە بێ و ورە بەرز بێ، لە ئەشکەنجەو سزا نەترسێ، قسە نەدۆڕێنێ و باسی سەرگەورەی خۆی نەکاو، کێ

---

[555] بەو جۆرە حوشترە دەڵێن (نجیب) واتە حوشتری بەهێزو سوكو چاپوکو ، تاج العروس، ٤٧٧/١.

[556] المعري، التعريف ص ١٨٦، ١٨٧. صبح الاعمش ٣٧٠/١٤. الأوسي، تفريج الكروب ص ١٤. محمدی کوری علی ، خطط، الشام، المطبعة شرقی دیشمق ١٩٢٥. ج٥، ص١٨.

[557] د. عطية مصطفی شرف، نظم الحکم بمصر في عصر الفاطميين، مطبعة الأعتماد نشر دار الفکرالعربي، سنة طبع بلا) ص١٣٢.

[558] ـ صبح الأعشی، ص١١٦.

ناردووییەو کێ نەیناردوەو باسیان نەکاو ناویان نەهێنێ کەموکورتیی و لاوازیی بەرپرس و لەشکری[559] بەرەی خۆی بشارێتەوەو نەیدرکێنێ. بێ گومان کابرایەکی هەواڵگر بەم هەموو خەسڵەتەوە زۆر زەحمەتە ببێ و دەست بکەوێ، خۆ زەلامێکی لەم جۆرە ئەگەر هاتوو دەستیش کەوت ئەوا هەواڵگرێکی بێ وێنەیە.

ڕاستیشت دەوێ، تەتەرکاریی و هەواڵگری لە سەردەمی سەلاحەددیندا وەها دەنگی دابووەوە کە لەوەی خاچپەرستان بەهێزترو دەستبالاتر بووە[560] بەنموونە شەڕەکەی "الرملة" کە لە باشوری فەلەستین، لە ساڵی "٥٧٣ك/ ١١٧٧ز" دا ڕوویداو بەدۆڕاندنی لەشکری ئەییوبی کۆتایی هات، دوژمنانی سەلاحەددین لە میسر کردیان بەقاو کە سەلاحەددین گوایە لەو شەڕەدا کوژراوەو مرخیان لە میسر خۆش کرد، کە جێگای بەرپرسانی ئەییوبی لێژ بکەن و لە ورەیان بخەن و جێگایان بگرنەوە، بەڵام تەتەرو هەواڵگرەکانی سەلاحەددین هەند کاراو چالاك بوون، هەر زوو بەزوو لەسەر فەرمانی سەلاحەددین، بە سواری هێستر خۆیان گەیاندە شاری قاهیرەو دوژمنانی سەلاحەددینیان بەدرۆ خستەوە کە سەلاحەددین نەکوژراوەو، ماوە. لەلایەکی دیکەشەوە، کۆتری نامەبەر، نامەی مژدەبەخشی، بەرەو قاهیرەگەڕانەوەی سەلاحەددینی گەیاندە ناو شار[561].

لە ساڵی (٥٧٨ /١١٨٢ز)دا، کاتێك کە سەلاحەددین خۆی لە میسر بوو، هێرشێکی بردە سەر شاری (الكرك)و تا ماوەی دە ڕۆژیش گەمارۆی شارەکەی داو، لەبەر ئەوەش کە خاروبارو ئازوقەی لەشکرەکەی لەوە زیاتری بەبەرەوە نەمابوو، کەم بوو، فەرمانی دا بە لەشکرەکەی بگەڕێتەوە بۆ میسر. مێژوونووسی ئەییوبی (محمد بن تقي الدين عمر) کە خۆیشی لەگەڵ دەستەودایەرەی سوڵتاندا بووە، دەڵێ: "ئێمە بەڕێوە بووین، چاومان لێبوو کە "نەجیب سواران"، واتا سوارەکانی کە حوشتری چاکیان لە ژێردا بوو، بە پەلە خۆیان گەیاندە لای و مژدەی سەرکەوتنی (عزالدين فرخشا)ی مامیان لە غەزای (دبوريه)دا، پێدا".[562]

پۆستی هەواڵگریی سەلاحەددین هەند ڕژدو خێراو چالاك بوو "هەواڵی دوژمنی سەعات بە سەعات، تا بەرەبەیان دەگەیاندە سەلاحەددین"،[563] بە تایبەتیش لە گەمارۆکەی شاری (عكا)دا.

هەواڵگریی سەلاحەددین هەندێ لە خاچپەرستانیشی تێدا بوون کە سەلاحەددین جاروبار، بەم بۆنەکەو، ئەو بۆنەکەوە" بەلای خۆیدا ڕایکێشابوون و دڵی دابوونەوە، بایەخی ئەوانەش لەوەدا بوو کە زمانی دوژمنیان دەزانی و، کەس گومانی لێ نەدەکردن و نەیاندەزانی کە ئەمانە پیاوی سەلاحەددینن، چونکە بە زمان و بە ڕەنگوڕوو هەروەك ئەوان بوون، ئا، ئەمانە، چ هەواڵێکی دوژمن گرنگ بوایەو بە زەحمەت بە دەست موسوڵمانان بکەوتایە، ئەمانە دەیانهانی، بە نموونە، جارێکیان خەبەریان هێنا بۆ سەلاحەددین کە دوژمن نیازی وایە "شەبەیخون بکاتە سەر لەشکری موسڵمانان"،[564]یان مەنجەنیقە گەورەکەی کە هەزارو پێنجسەد دیناریان لێدابوو (تێدا خەرج کردبوو)، بۆ ئەوەی هێرشی پێ بکەنە سەر شاری (عكا).[565] هەروەها هەڵمەتە ئەڵەمانییەکەش،[566]هەواڵ و دەنگوباسی ئەوانە هەمووی دەگەیشتە سەلاحەددین، بەرلەوەی ڕووبدەن و بقەومێن.

تەتەر، لە گەمارۆکەی (عەكا)دا، بەهەموو جۆرێك لە هەموو ڕچەو ڕێگەیەکەوە بۆ دزەکردن بۆ ناو سەربازە

---

559 ـ الأوسي، مفرج الكروب ، ص١٧.

560 ـ رنسيمان، تأريخ حروب الصليبية ، ترجمة د. الباز العريني، ط، دارالثقافة، بيروت، ١٩٦٨. ج٢، ص٦٧١.

.Henry Treece, The Crusades,N.Y,1962, P. 131

561 ـ سنا البرق ، ٢٦٠/١، الروضتين، ج١، ق٢، ص٧٠٢. رنسيمان، ٦٧٣/٢، ٠له ـ وليم الصورى ـ يەوە وەرگیراوە.

562 ـ مضمار الحقائق، ص٩٣ ـ ٩٤.

563 ـ النوادر، ١٤٨.

٤٤٤ ن، م، ١٣١.

565 ـ النوادر، ص١٣٤.

566 ـ ن، م ، ص ١٤٠.

گەماڕۆدراوەکانی خۆیان دەخرانەکار تا لە دۆخی ستەمو شڕۆڵی خۆیان بە ئاگابن‌و، شمەک‌و پارە و پولیان بۆ بنێرن. جگە لەوە، بە کۆتری نامەبەریش پێوەندییان لەگەڵدا دەکردن‌و مەلەوانەکانیش ڕۆڵی گرنگیان دەگێڕا، بە نموونە چیرۆکی قارەمانێتی (عیسای مەلەوان) لە تەتەریی ناو دەریا و هەواڵگریدا دەنگی دایەوە ئەم عیسایە هەموو جارێ بەئاسانی دەچووە ناو شاری عکاوەو، هەر هیچ گوێی بە گەمارۆو مەمارۆ نەدەداو، پارەو پوول و نامەو ڕێنماییگەلێ کە سوڵتان پێی دەسپارد، توندو تۆڵ لە کەمەری خۆی دەبەستن و بە مەلەوانیی خۆی دەگەیاندە شاری (عکا)و هەر بەگەیشتنیشی، لەوێوە برادەرانی هەواڵگریی خۆی، کۆتری نامەبەریان بەنامەی سەلامەت گەیشتنی هەڵدەداو دەگەیشتە سەلاحەددین. عیسای قارەمان، شەوێکیان ملینا لە دەریا، سێ توورەکە شمەکی لەپشت وکەمەری خۆی توندو تۆڵ بەستبوو، هەزار دینارو هەندێ نامەشی بۆ لەشکرەکەی ناو (عکا) تێدابوو، بەڵام ئەمجارەیان نەیتوانی بگاتەجێ لە ئاوەکەدا خنکا، برادەرانیشی کە هەر چاوەڕێی کۆتر بوون، کۆتر هەڵنەدراو نەهات، ئەوجا زانییان کەهەبێ‌و نەبێ شتێکی بەسەر هاتووەو تێوەگلاوەو نەگەیشتۆتە جێ، ئیدی ئەوە بوو پاش چەند ڕۆژێ بەخنکاوی دۆزییانەوەو دراوە زێڕەکان‌و مێوی نامەکان هێشتا بەکەمەریەوە مابوون. (ابن شداد) لەو بارەیەوە دەڵێ: "ئەم پیاوە بەولاوە کەسێکی دی نەبینراوە بەزیندوویی و بەمردوویش ئەمانەت بەجێ بێنی". [٥٦٧]

**٢- یزك ( تیپە چەرخەچییەکان ):**

وشەی (یزك) فارسییە، واتا (پێشەنگی لەشکر) [٥٦٨]. پێویستە وشەی (یزك)و وشەی (جالیش)مان لێ تێکەڵ‌و پێکەڵ نەبێ. (جالیش)، پێشەنگی بەرسنگی لەشکرە، یان پێشەنگی لەشکرە، وەکو سەرقافڵەچی وایە، بەشی بەرەوەی بەرسنگی لەشکرە، کە پێکەوە بەرەو شەڕەکە دەڕۆن. هەرچی "یزك"ە، ئەوە کۆمەڵێ چەرخەچین‌و لە پێش لەشکرەوە دەنێردرێن بۆ بەرەی دوژمن، بەرلەوەی لەشکرەکەی خۆیان کەوتبێتە ڕێ.

ئەرك‌و فرمانی جەنگاوەرانی چەرخەچی، بەشێك بوو لە سیستەمی هەواڵگری کە دەنگ‌وباسی لەشکری دوژمن دەسبەجێ وەربگرێ‌و بەخێرایی بیگەیێنێتە فەرماندەی لەشکرەکەی خۆیان. کەواتە دەتوانین بڵێین، چەرخەچێتی بزاڤێکی تەتەری ڕۆژانەیە، کەسانی بەئەزموون، هەمیشە ئامادەن بۆ بەجێ هانینی ئەو ئەرکە بڕۆن‌و لە سوپای دوژمن نزیك ببنەوەو، بزانن چی دەکەن‌و چی ناکەن‌و خەریکی چ پلانگەلێکن‌و نیازیان چییە.

زەلامی چەرخەچی، بۆ ئەنجامدانی ئەو ئیشە گرنگە، لە ئامۆژگارکارو ڕاوێژکارو خاوەن ئەزمونان هەڵدەبژێردران. ئەوانە لە کاتی خۆلێگرتن‌و هەواڵگریدا، خۆیان لە قەرەی دوژمن نەدەداو، خۆیان لێ ئاشکرا نەدەکرد، چونکە ئەرکی سەر شانی ئەوان، تەنها ئەوە بوو، بزانن هێزی دوژمن چەندەو، کەلێن و لاوازیی کامەیەو لەکوێیدایە. هەر لەبەر ئەوەشە کە زرێ‌و قەڵغان‌و چەکی قورسی ئەوتۆیان لەگەڵ خۆیاندا نەدەبرد، تا ماندوو نەبن‌و لەپێنەکەون ئەسپی بەهێزو سووکەڵەو هێورو هێمنیان لەگەڵ خۆدا دەبرد، ئەسپگەلێکی وا سەرکێش نەبن‌و شاخەنەکەن‌و لە دوژمنیان ئاشکرا نەکەن [٥٦٩]. ئەسپی سم ساغ‌و، بەناڵ‌و چوارپەل قایم و بەکێش‌و ڕەسەنیان لە ژێردا بوون.

ڕاستیشت دەوێ، مێژوونووسانی ئەو چەرخ‌و سەردەمە، بەتایبەتیش (ابن شداد)و پاشانیش (العماد الاصفهاني) لەو شتانەی کە باسیان دەکەن‌و دەیگێڕنەوە، باسی ئەو چەرخەچییانەش دەکەن و دەڵێن: ئەرك‌و فرمانی گەورەو گرنگی زۆریان بەجێ هێناوە، یەکێ لەو فرمانە گرنگانەش هەواڵ‌و دەنگوباس ناردن بووە. [٥٧٠]

گرنگیی‌و بایەخی چەرخەچییان بەوەدا دەردەکەوێ کە سەلاحەددین، فەرمانداری سەربازی گەورەو بەناوبانگی

---

[567] - ن، م ، ص١٣٥ ١٣٦، بنۆرە : الفتح، ٤٢٣ ،الروصتين ، ١٦٢/٢.

[568] - أدى شير، الألفاظ الفارسية المعربة، المطبعة الكاثوليكية، بيروت ١٩٠٨، ص١٦٠، محمد التونجي، المعجم الذهبي، دار العلم للملايين، بيروت، ط١، سنة ١٩٦٩، ص٦١٩. بشنۆرە: مفرج الكروب، ٣٨/١، هامش/٣.

[569] - الهرثمي، مختصر سياسة الحرب، تحقيق : عبدالرؤوف عون، القاهرة، المؤسسة المصرية العامة للتأليف والترجمة والطباعة والنشر، ص ٤٨- ٤٩. الاوسي، تفريج الكروب، ٥١.

[570] - النوادر، ١٤٧، ٢٣٢. الكامل، ٢٩/١٢. الروضتين، ٢٠١/٢.

دەکرد بە فەرمانداریان، بە نموونە: (الملك العادل)ی برای سوڵتانو[٥٧١]، (الملك الافضل)[٥٧٢]ی کوڕە گەورەی خۆیو گەورە میرانی، بەنموونە، وەك (بدرالدين دلدرم الياروقي)[٥٧٣]و (عزالدين ابن المقدم)[٥٧٤]و، (عزالدين جورديك)و[٥٧٥]، (علم الدين سليمان بن جندر)و[٥٧٦]، کەسانی دیکەش. ئەم میرانە، بەنۆرە فەرمانداریێتی تیپی چەرخەچییانیان دەگرتە دەستو هەریەکەو نۆرەی خۆی دەهات[٥٧٧].

کارێکی زۆر گرنگی چەرخەچییەکان ئەوە بوو، سووسەی هەستو نەستی ناو شارەکانیش بکەن، نەخاسمە (بيت المقدس)، چونکە ئەم شارە، پاش ئەوەی لە ساڵی (٥٨٣ ك / ١١٨٧ز)دا ئازاد کرا، خاچدروشمان دووبارە کەوتنەوە هەڕەشە کە ئەم جارەش داگیری بکەنەوە، لەبەرئەوە، سەلاحەددین لێی نەوەستاو، هەستا (الملك العادل)ی برای بەهێزێکی چەرخەچییەوە نارد، تابزانێت توانستی بەرەڤانیی لەم شارەدا چەندەو چۆنە، (العادل)یش لە مانگی رەمەزانی ساڵی (٥٨٧ك/١١٩١)[٥٧٨]دا ئەو ئەرکەی بەجێ هێنا.

هەروەها (الامير عزالدين جورديك)و (جمال الدين فرج)و کەسانی دیکەشی بە تیپێکی چەرخەچییەوە نارد کە لە شاری (يافا) نزیك ببنەوەو بزانن چەند پیادەو چەند سوارەی تێدا هەیە.[٥٧٩]

چەرخەچییەکان، جاری وەها دەبوو بۆسەیان دەنایەوە، بەنموونە وەك بۆسەکەی رێگای یافا کە ئەنجامدانی بە (بدرالدين دلدرم) سپێردرا، "بەم دیوو ئەو دیوی رێگاکەدا بەلقی چەرخەچیی چاپووكو ئازاوە بۆسەیەکی بۆ کۆمەڵێ سوارچاکی دوژمن کە پاسەوانیی کاروانێکی خاروباریان دەکرد نایەوە، لە نێوان هەردوولادا، بووە کوشتارو کاروان دوای ئەوەی سێ کەسی لێ کوژرا شکاو کۆمەڵێکیشی لێ بەدیل گیران.[٥٨٠] ئیدی چەرخەچییان هەر هەلێکیان بۆ رەخسابا پەلاماری خاچدروشمانیان دەدا، تا جارێکیان هەندەی نەمابوو ریشارد شێردڵیش بە بریندارى بە دیل بگرن کە خەنجەرێکی لێ درابوو، بەڵام جەنگاوەرێکی خاچدروشم "خۆی لە پێناویدا بەخت کرد، جلوبەرگی نایابی لەبەردا بوو، کابرای خەنجەر وەشێن سەری لێ تێکچوو، لە جیاتی ریشارد ئەمی بە دیل گرتو ریشارد دەربازی بوو، نەگیراو خۆی بزر کرد، وەلێ کۆمەڵێ لە سەربازو سوارەکانی کوژرانو بە دیلیی کەوتنە دەست چەرخەچییەکانو باقیمەنییان تێکشکانو هەڵاتنو زارەترەك بوون".[٥٨١]

چەرخەچییەکان سوپای ئەیوبییان لە پەلاماری ناکاویش دەپاراست، بە نموونە، هێرشی لە ناکاوی خاچدروشمان کە لە (أنطاكيه) کردیانە سەر لەشکرەکەی سەلاحەددین.[٥٨٢]

ئەو هەموو ئەركو فرمانو بەرپرسێتییە جۆربەجۆرە گرنگانەی بە چەرخەچییەکان سپێردرابوون، پێگەو جێگەی بەرزی ئەم هێزە لە سوپای ئەیوبیدا دەسەلمێنن.

واتا، ئەم رێکخراوە سەربازییە، باشترینو ئازاترین سەربازی سوپای ئەیوبی لەناو ریزەکانیدا جێگایان بۆ

---

571 ـ النوادر، ١٩٢.

572 ـ الكامل، ٦٩/١٢.

573 ـ النوادر، ٢١٢، ٢٣٢.

574 ـ الفتح القسي، ٥٤١.

575 ـ النوادر، ٢١٧، ٢٣١.

576 ـ الفتح القسي، ٥٤٢. النوادر، ١٨٢. الروضتين، ١٩١/٢.

577 ـ النوادر، ١٨٢.

578 ـ ن، م، ص١٩٢.

579 ـ ن، م، ص٢٣١. الروضتين، ٢٠٣/٢.

580 ـ النوادر، ٢١٢.

581 الفتح القسي، ٥٥٢. بنۆڕە: النوادر ١٩٠. الروضتين، ١٩٢/٢.

582 ـ الجاحظ، الحيوان، تحقيق وشرح عبدالسلام محمد هارون، مطبعة مصطفي البابي الحلبي وأولاده، مصر ١٩٣٨، ٢١٤/٣.

کرابووەوە، کەمو زۆریو قەوارەی هێزی چەرخەچی، بۆ هەر کارێ، بە پێی ئەو کارە دیاری دەکراو، لە هەموو کارێکی سەربازییدا هەرەمەکیو چوونیەك نەبووە. لەبەرئەوە، مەزەندە دەکرێ سوارێکی زۆری هەبووبێو، جاروباریش خۆی دابێ لە هەزار سوارە، بەنموونە، وەك ئەو چەرخەچییانەی کە سەلاحەددین دایمەزراندنو بەدەوری شاری (عەکا)دا هەڵیانداو جێگای خۆیان قایم کرد، چونکە سەلاحەددین بڕیاری دا کە هێزو بارەگای خۆی بباتە چیای (خروبة).

بەم جۆرە دەبینین، هێزی چەرخەچی، بەرە بەرە، لە ئەرکو فرمانی سووسە کردنو سیخوڕیی کردنەوە کە شان بەشان لەتەك تەتەرو پۆستەدا ئەنجامی دەدانو، تووشی پێکدادانێکی زۆری خوێنین دەبوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پێگەی دەگۆڕاو بەرەو چاکتر دەچوو، تا بوو بە ڕێکخراوێکی چالاکی کوشتارو جەنگو، ئەرکو فرمانی زۆری پاراستنی سەربازگەکانی سوپای ئەییوبیو شارەکانیشی کەوتە ئەستۆو، لە شەبەیخونو پەلاماری لە ناکاویشدا بۆ سەر سەربازگەو پێگەکانی دوژمنو، لە بۆسەنانەوەیشدا، بە ئامانجی شێواندنی ڕیزەکانی دوژمنو زیان پێگەیاندنو لە ورەخستنی دوژمن، هەمیشە هەر لە کاردا بوو.

**٣ـ کۆتری نامەبەر:**

گرنگترین ڕێگای پەیداکردنی هاودەنگییو پێوەندیی نامەو نامەکاری، (واتا نامەهێنیو نامەبەری)، لە چاخە کۆنەکانو سەدەکانی ناویندا، بە کۆتری نامەبەر دابین کراوە، بەم جۆرە کۆترە، (کۆتری شارەزا)ش دەگوترێ، چونکە بۆ دۆزینەوەی ڕێگای خۆی، توانستێکی عاجباتی هەیە، بلیمەتێکە، لە سەدەها قۆناغەوە دەگاتەوە هێلانەکەی خۆیو هەرگیز لێی بزر نابێ. لەبەر ئەم توانستەشی، (الدميري) ناوی ناوە شەیتان.[٥٨٣] هەرچی (القاضي الفاضل)یشە، ئەوە، ئەو، ناوو خەسڵەتگەلی زۆر جوانو ناسکی داوەتێ، ئەو دەڵێ: کۆتر فریشتەی شاکانە، هەروەك چۆن فریشتە لە ئاسمانەوە دێتە خوار بۆ لای پێغەمبەران، بەو چەشنە، کۆتریش لە ئاسمانەوە دێتە خوار بۆ لای شا، کۆتر ئەمانەتپارێزە، تا بڵێی ئەمینەو خیانەت ناکا.[٥٨٤] دانەری کتێبی (الروضتين) هەندێکیش دەنێتە سەر قسەکانی (القاضي الفاضل)و دەڵێ: "ئافەرین بۆ وەسفێ کردی، خەسڵەتی چاکی لە کۆتر دیتوەتەوە، بە ویژدان باسی کردووەو، ئەو قسانەش هەر لەو دەوەشێتەوەو کۆتریش هەر ئەو دەیناسێ".[٥٨٥] ئەم جۆرە کۆترە، وێڕای ئەوەش کە هێلانەکەی بزر ناکاو زوو دەیدۆزێتەوە، هەند لانەدۆستو هەند خێرایشە،[٥٨٦] کە ئەگەر بشدرزێت، یان ڕاو بکرێتو ببرێت بۆ جێگایەکی دوورو، دە ساڵیش لە غەریبی بمێنێتەوە، ئەوەند بە ئاوەزو بیرتیژە، ئەوەند بۆ هێلانەکەی بەسۆزە، هەر کە هەلێکی بۆ بڕەخسێ، دەدا لە شەقەی باڵو دەگەڕێتەوە سەر هێلانەکەی.[٥٨٧] لەبەرئەوە نرخی کۆتر دای لە زیادبوونو گەیشتە حەوت سەد دینار، کۆتری وەهاش هەبوو هەزار دیناری دەکردو یەك هێلکە لە هێلکەکانی ئەم جۆرە کۆترانە بە بیست دینار دەفرۆشرا.[٥٨٨]

ئەم کۆترە نامەبەرانە، هەر چوار قۆناغ ڕێگاو مەنزڵگەیەکیان بۆ دروست کرابوو، ئەوە هێلانەکەیان بوو،[٥٨٩] بورجەوان (پاسەوان) یان هەبوو، وەستایانە چاودێرییان دەکردنو بە مەشقدانو دان پێدانو حەساندنەوەو گوزەرانیانەوە هەمیشە سەرگەرم بوونو، کاتی پێویست هەڵیاندەدانو لە گەڕانەوەیاندا لە پێشوازیاندا بوون.

---

[583] ـ حياة الحيوان الكبرى، دار الطباعة القاهرة، ١٢٩٢هـ، ج١، ص٢٩٦.

[584] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٢١. السيوطي، حسن المحاضرة ، ١٦٦/٢.

[585] ـ الروضتين، ن، ص.

[586] ـ (أمين الخولي)، دەڵێ: کۆتر، هەیە بە ڕۆژێ سێ هەزار قۆناغ دەبڕێ. (الجندية والسلم، ص٧٢). واتا نزیکەی هەزار کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا، ئەمەش ماقول نییە.

[587] ـ البستاني، دائرة المعارف، مطبعة الأدبية، بيروت ١٨٨٧. مجلد ٧، ص١٦٨. أمين الخولي، الجندية والسلم، ص٧٢.

[588] ـ صبح الأعشى، ٣٩٠/١٤.

[589] ـ (ابن فضل الله العمري) دەڵێ: "ماوەی نێوان مەنزڵگەیەكو مەنزڵگەیەك چوار قۆناغ بوو، واتا نزیکەی (٣٢کم). التعريف ، ص١٨٤.

خواسایيش ئەگەر نامەی پێبوایە کابرای بورجەوان بە دەستی خۆی لێی نەدەکردەوە، دەبوو بیبات بۆ خەلیفە، یان بۆ سوڵتان، نەبادا نامەکە نهێنییەکی تێدابێ کە نەدەبوو کەس بیبینێ. خۆ ئەگەر ناوەختیش بوایە، واتا، بە نموونە، سوڵتان لەو کاتەدا، لەسەر نانخواردن بوایە، یان لە خەودا بوایە، ئەوا، نانەکەی بەجێ دەهێشت، یان لە خەو بە ئاگایان دەهێنایەوە، تا ئەگەر شتێکی بەپەلەی تێدابا، زوو بە زوو بە ڕێی بخاو نەیەڵی دوا بکەوێو زیانی بۆ خۆیو میللەتەکەشی لێبکەوێتەوە، ئیدی سوڵتان بە دەستی خۆی نامەکەی لێ دەکردەوە.[٥٩٠] جاری واش هەبوو، سەرۆکی پاسەوانەکانی نامەکەی دەکردەوە.[٥٩١]

پۆستەو کۆتری تەتەر، بەم جۆرەو لە ڕێگەی ئاسمانەوە، بێ گرێو گۆڵو بێ کێشە نەبووە، وەڵێ هەڵسوڕێنەرانی ئەم فرمانە، بەپێی توانست چارەسەریان بۆ ئەو کێشانەش دۆزیبووەوە، دەهاتن، بۆ ئەوەی دڵنیابن، لە گەیاندنی نامەکە، دوو جاریان دەنووسی، جاری یەکەم بە کۆترێکدا هەواڵەیان دەکرد، جاری دووەمیش دوای نزیکەی سەعاتێ بە کۆتریکی دیکەدا دەیانناارد. ئەگەر بهاتباو کۆتری یەکەم دەست ڕاوچیو منداڵان کەوتبا، یان دەست دوژمن کەوتبا، یان بەرچنگی واشەو کۆلارەی ئاسمان کەوتبا، لەوبارەدا پشتیان بە کۆتری دووەم دەبەست.[٥٩٢] عادەتیشیان وابوو، کۆتریان بە تێری بە ڕێ دەخست، تا لە ڕێگا برسی نەبێو ئەگەر بارانیش باریبا، تا خۆشی نەکردبایەتەوە نەیاندەنارد.[٥٩٣] نامەکەش بە کورتی دەنووسراو بسمیلایان بۆ دەنووسی، کاکڵو کرۆکی ماناکانیان لە سەر کاغەزێکی سووکو تەنك دەنووسی، بەرواروو ڕۆژو سەعاتی نووسینەکەیان لەسەردەنووسی، بۆ ئەوەش کە تەڕ نەبێ، ئەگەر هاتو بارانی لێباری، دەهاتن، بە ژێر باڵی کۆترەکەیانەوە دەبەست. هەرکە بشگەیشتبایە بورجەکە، کابرای بورجەوان دەیگرت و نامەکەی لێدەکردەوەو بە ژێر باڵی کۆترێکی دیکەی بورجی دووەمەوەی دەبەست، ئیدی، با نەڵێین دەساو دەس، بڵێین (کۆتراو کۆتر) ئەم نامەیە، بورج بە بورج، دەچوو، تا دەگەیشتە بورجی ئەو شارەی کە سوڵتانی لێیە، لەوێ بورجەوان دەیگرتو بە نامەکەوە دەیبردو دەیدایە دەستی سوڵتان.[٥٩٤]

ئێمە نامانەوێ بە قووڵی باسی مێژووی ئەم جۆرە کۆترانە بکەینو بزانین لەو سەدەو سەردەمە جۆراو جۆرانەدا چۆن بووەو چەند بووە، وەڵێ هەندێ دەڵێن کە ئەمجۆرە تەتەرە ئاسمانییە، لە موخابەراتو نامەو نامەکاریی میللەتانی دێریندا، بۆ ئەو وەختە، ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە، بەڵام موسوڵمانان، لە هەموو کەسێ پتر خەمخۆری بوونو بە گرنگیان زانیوە.[٥٩٥]

هەرچەندیشە عەباسییەکانیش خەمخۆری ئەم لایەنە بوون، وەڵێ سەرچاوەو ژێدەران بە دڵنیاییەوە دەڵێن کە ئەتابەکەکانی موسڵ لە هەموو کەسێ پتر کۆتریان پەروەردە کردووەو، نورەددین مەحمودو سەلاحەددینیش هەر بەو جۆرە، چونکە ململانێی ئەم دوو بنەماڵەیە لەگەڵ خاچدروشماندا، ئەوەی دەویست کۆتری نامەبەر ڕابگرنو وەك تەتەری ئاسمانی بەسوودیان بێنن، ئەم جۆرە کۆترە لە میسری فاتمیەکانیشدا هەر هەبووە.[٥٩٦]

کۆتری نامەبەر، هەر لە بەرایی سەرەتای سەردەمی ئەتابەکەکاندا، لە هەرێمی جزیرێ، هەبووەو بەکارخراوە، (ابن الأثیر) دەڵێ: (عماد الدین زەنگی)ی دامەزرێنەری ئەتابەکییەکەی موسڵ، لە ساڵی (٥٢١ك/ ١١٢٧ز)، واتا هەر هەمان ساڵی دامەزراندنی ئەتابەکییەکە، بە لەشکرێکەوە ڕووی لە (نصیبین) کرد کەداگیری بکا. (نصیبین) ئەوکات بە دەست

---

[590] ـ السيوطي، حسن المحاضرة، ٢/١٦٦.

[591] ـ ميخائيل صباغ، مسابقة البرق والغمام في سعادة الحمام، رسالة منشورة في مجلة المورد البغدادية، نشر حكمت توماس، مجلد ٢، عدد٣، ص١٤٤.

[592] ـ صبح الأعشى ، ١/١١٨ـ ١١٩.

[593] ـ الخطط (طبعة اوفسيت) ٢/٢٣١ ـ ٢٣٢.

[594] ـ صبح الأعشى ١/١١٩.

[595] ـ جرجي زيدان، تأريخ تمدن الاسلامي، ١/٢٣٣.

[596] ـ العمري، التعريف، ١٩٦. الظاهري، زبدة كشف، ص١١٧. د. عطية مشرفة، نظم الحكم، ص١٣٢ـ ١٣٦.

سەرگەورەی شاری ماردینەوە، واتا بەدەست (حسام الدین تمرتاش کوڕی ایلغازی کوڕی أرتق)ەوە بوو، ئەم (حسام الدین)ەش، دەستبەجێ، داوای هاناو هاوکاریی لە (رکن الدین داود کوڕی سقمان الأرتیقی)ی ئامۆزای خۆی کرد، کە ئەوکات سەرگەورەی قەڵاو قایمکاری (کیفا) بوو. (رکن الدین) بەڵێن بوو یاریدەی بدات، هەستا، لەشکری خڕکردەوەو کەوتە خۆ تەیارو ئامادەکردن، (حسام الدین)ی ئامۆزاشی گەڕایەوەو چووەوە بۆ ماردین‌و لەوێوە بە بن باڵی کۆتردا نامەیەکی بۆ (نصیبین) ی گەمارۆدراو نارد، نووسیبووی: کە خۆی‌و ئامۆزاکەی، وا بە لەشکرێکی گەورەوە بەڕێکەوتوون، با سێ ڕۆژ بەرەڤانی بکەن‌و ورە بەرنەدەن، تا دەگەنە لایان. زەنگی ڕۆژێ لە دەوارەکەی خۆی دا دانیشتبوو، چاوی لێبوو، لە پڕێکا کۆترێ خۆیدا بە دەوارێکی هاوسێیدا، فەرمانی دا کۆترەکەی بۆ بگرن، نامەکەی چاو پێکەوتوو لە کۆترەکەی کردەوە. ئەوجا فەرمانی دا نامەیەکی دی بە بن باڵی کۆترەکەوە بکەن‌و تێیدا بنووسن: "لە حسام الدینەوە .. من چووم بۆ لای رکن الدینی ئامۆزام، بەڵێنی دامێ بە لەشکرەوە بگاتە هاناتان، ئەوپەڕی بیست ڕۆژ، مەگەر دوا بکەوێ". ئنجا کۆترەکەیان بەم نامە (ساختە)یەوە هەڵدا، کاتێ کۆتر گەیشتە (نصیبین)و نامەکە خوێندرایەوە سەربازەکان ورەیان بەردا، چونکە دەیانزانی کە ناتوانن بیست ڕۆژ خۆیان ڕابگرن‌و شارەکە بپارێزن، ناچار زەلامیان ناردە لای زەنگی‌و لەگەڵیدا ڕێککەوتن‌و قەڵاکەیان دا بە دەستەوە، بەو جۆرە، (تمرتاش‌و داود) ڕیسەکەیان بووەوە بە خوری‌و ئیشەکەیان سەری نەگرت.[597]

ئەم چیرۆکە کورتە، ئەوەمان بۆ ساغ دەکاتەوە کە کۆتری نامەبەر لە بەرایی مێژووی ئەتابەکیاندا بەکارخراوە، جاری وەهاش بووە کۆترەکە ڕاوکراوەو نەگەیشتوەتە جێ‌و نامەکەی بن باڵیشی بەر گۆڕین‌و فڕوفێڵ کەوتووە. لەبەرئەوە بۆ پاراستنی لە دوژمن‌و ناحەزان، چییان پێکراوە کردوویانە، دووریش نییە، زەنگی سوودی لەم ئەزموونە وەرگرتبێ، بۆیە ئەو تەتەرە ئاسمانییەی بۆ خۆی ڕێکخست، بەڵام کۆتر ڕاگرتن و گرنگی بە کۆتردان، لەسەردەمی نورەددین زەنگیدا گەیشتە لوتکە، دەڵێن: "یەکەم کەس کۆتری پەروەردە کردبێ، ئەو بووە[598]". بە جۆرێ کە زەینی مێژونووسانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە. بە نموونە (ابن القلانسي)، دەربارەی ڕووداوەکانی ساڵی (٥٥٢ك/ ١١٥٧ز) دەڵێ: کاتێ نورەددین بە خۆی‌و سوپاکەیەوە گەیشتە دەوروبەری شاری بانیاس‌و بە مەنجەنیق شارەکەی هەراسان‌و تەنگەتاو کرد، کۆتر لە سوپای سەرکەوتووی دەشتی بانیاسەوە نامەی هێنا، دەڵێ مژدەبەخشی سوپای (أسدالدین) شێرکۆ لە ناوچەی (هونین)ەوە مژدەی هاتنیانی هێناوە.[599]

ئەمەش مانای وایە، کۆتری نامەبەر هەر لەسەرەتای سەردەمی نورەدین مەحمودەوە بەکارخراوە، نەخاسمە باوکی، کە پێش ئەویش بەکاری هێنابوو. وەلێ مێژوونووسان دەڵێن، نورەددین لە ساڵی (٥٦٧ك/ ١١٧١ز)ەوە، واتا بەر لەمردنی بە دووساڵ، بەکاری خستبوو، واتا پاش ڕووخانی خیلافەتی فاتمی لە میسرو، بەرفراوانبوونی دەوڵەتەکەی خۆی، پێویستی بەو جۆرە کۆترانە بووە. هەردوو مێژوونووسی ئەو سەردەمە (عماد الدین کاتب‌و پاشانیش إبن الأثیر) دەڵێن: نورەددین کە لەم ساڵەوە کەوتە ڕاگرتن‌و بەکارخستنی کۆتر، لەبەرئەوە بوو کە وڵاتەکەی زیادی کردو بەرفراوانتر بوو، وەزیفەشی بۆ کۆترەوان و کۆتربازان دۆزییەوەو مووچەو ئەرك و مەسرەفی پەروەردەکردن‌و پاراستنی ئەم جۆرە کۆترانەشی بۆ دابین کردن، ئەوجا هەستی بە دڵنیایی کردو سوودی چاکیشی بۆ موسڵمانان لێکەوتەوە[600] و ئیدی نامەو نامەکاری لە وڵات‌و شارێکەوە دەگەیشتە وڵات‌و شارێکی دی و کەلێن و بەندەرەکانیشی ئاسوودە بوون‌و پارێزراوە.[601] (عماد الکاتب) لە نێوان باسی ڕووداوەکانی ساڵی (٥٦٧)ی کۆچی دا، باسی ئەوەش دەکا، کە نورەددین

---

[597] ـ ابن الأثیر، الباهر، ص٣٧.

[598] الظاهری، زبدة الكشف، ١١٧. بنۆڕە: مادة (برید) في الدائرة المعارف الاسلامیة، ط ١٩٣٣، ج٣، ص٦١٠. بقلم (هارتمان).

[599] ـ ذیل تاریخ دمشق، ٣٤٠/ ٣٤١.

[600] ـ الكامل، ٣٧٥/١١.

[601] ـ الباهر، ١٥٩.

ڕۆژانی بەهارو هاوین لەشار نەدەماو بەخەمخۆریی کەلێنو بەندەرو خزمەتی وڵاتەوە لە ئەندێشەدا بووە، بۆ هەواڵو دەنگوباسی میسرو بارۆدخی میسر بەپەرۆش بووە، لەبەرئەوە، وای بە چاکزانی، ئەم جۆرە کۆترانە بەخێو بکاو لەسەر فرینو گەڕان مەشقیان بدا، تا نامەگەلی دەنگوباسی وڵاتانی بۆ بهێنن.[٦٠٢]

نورەددین مەحمود، هەروەکو باوکی، لەو کاتەوە کەوتە پەروەردەکردنی کۆتر، کە حوکمی حەڵەبو شامی کەوتە دەست، وەڵێ ئەوەی لە ساڵی (٥٦٧ك)دا کردی، ئەوە بوو کە کاروباری ئەم کۆترانەی لەسەر سیستەمێکی نوێ بنیادناو گرنگییەکی زیاتری پێ دان. کە نورەددین چاودێری چۆنێتیی پەروەردەکردنی کۆتری کردبێو، لە هەموو لایەکی دەوڵەتەکەیدا لانەو مەنزڵگەی بۆ سازدابێو بورجەوانگەلی بۆ دامەزراندبێو، دەستووری نامەو نامەکاریو چۆنێتی بەستنو کردنەوەی نامەو ناردنی کۆترو پێشوازیی لێکردنی، زانیبێو کردبێ، کەوابێ کاتێ سەلاحەددین حوکمی گرتەدەست هاتوەتە سەر حازریو، تەتەری ئاسمانی، پێش ئەو ڕێکخراوەو بووە. وەڵێ سەلاحەددین ئەم کارەی بەرەو چاکتر گۆڕیو لە ڕێگەی تەتەری ئاسمانییەوە، میسری زیاتر بە شامەوە هاودەنگ کرد، تا وای لێ کرد تۆرێکی بەربڵاوی مەنزڵگە (فرۆکەخانە) ی کۆتری نامەبەر لە میسرو شامدا پەیدابوو، هەر لەوپەڕی باشووری میسر، لە ئەسوانی (صعید)ەوە لە (عیذاب)ی سەر دەریای سوورەوە، تا دەگاتە قاهیرەو لە ئەسوانەوە بۆ قاهیرەو بۆ سویسو بلبیس، هەریەکە بە جیاو، پاشان لە بلبیسەوە بۆ شامو، لە بلبیسەوە بۆ (المصالحية)و (قطيا)[٦٠٣] و لە (قطيا)ەوە بۆ (الواردة)ی ڕێگای (غزة)، هەر هەمووی بەجارێ گرتەوە. واتا (بلبیس) لە ڕۆژهەلاتی قاهیرەوە بوو بوو بە مۆڵگەی مەنزڵگاکانی کۆترەکانی میسرو، هەروەها (غزة)ش لەسەر کەناراوی باشووری فەلەستین، کە لەوێوە بە هێڵێك دەگەیشتە (الخليل)و لەوێوە بۆ (اللد)و لەوێشەوە بۆ (قاقون)،[٦٠٤]ئنجا بۆ (جنين)و (صفد)و (بيسان)و (أربد)و (طفس)و لەوێشەوە بۆ (الصنمين)[٦٠٥]و، بۆ (دمشق). لەهەریەکە لەم مولگەو شارانەشەوە، بۆ شارو شارۆچکەکانی دەوروپشتی، بەنموونە لە (بيسان)ەوە بۆ(اذرعات)و[٦٠٦] لە (دیمشق)ەوە بۆ (بعلبك)و بۆ (قارة)و[٦٠٧] لەوێشەوە بۆ (حمص)و لەوێشەوە بۆ (حماه)و (المعرة)و (حلب)و (البيرة)، ئیدی بەو جۆرە باقیمەنی شارەکانی ( الجزيرە)ی شامی گرتبووەوە[٦٠٨].

ئەم مەنزڵگایانە، بێگومان کۆترێکی یەکجار زۆریان تێدا بوون. پاشانیش کۆترەکانی بورجی قەڵاکەی قاهیرە، بەتەنیا، مەزەندە دەکران گیشتبنە نزیکەی دوو هەزار کۆتر[٦٠٩].

لەبەرئەوە پیشەی کۆترەوانیو کۆتربازی پەرەی سەندو تەشەنەی کردو سوودێکی زۆریشی لێ دەکەوتەوە، چونکە ڕەواجێکی زۆری پەیدا کرد، بەتایبەتیش کاتێ خاچدروشمان (عكا)یان گەمارۆدا. (عماد الكاتب) دەڵێ: وامان لێهات پارەمان دەدا بەخاوەن کۆترو مەراییشمان دەکردو گەلێکیشمان بەشانو باڵیدا هەڵدەداو داواشمان لێدەکرد کۆترەکانی زیاتر بکاو بەشەوو بەڕۆژیش بەرۆکیمان بەرنەدەدا، هەر داوای کۆترمان لێدەکرد، تا وای لێهات کۆتر دای لە کەمیی،

---

[602] ـ سنا البرق، ١١٩/١.بنۆڕە: مرآة الزمان٢٨٥/٨ ـ ٢٨٦. الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٢٠ ـ ٥٢١. مفرج الكروب، ١/ ٢٨٣. العمري، التعريف،١٩٦. (دەڵێ: نورەددین ساڵی ٥٦٥ك کەوتە کۆتر ڕاگرتن). حسن المحاضرة ١٦٦/٢.

[603] ـ قطيا: گوندێکە لە سەر ڕێگەی میسر، کەوتووەتە لمینەکانی نزیك (الفرما) معجم البلدان، ٣٧٤/٤.

[604] ـ قاقون: قەڵاتێکە لە فەلەستین، لە نزيك (الرملە)وە، نیو ڕۆژ لە (قسارية)ەوە دوورە، معجم البلدان ٢٩٩/٤. رحلة بنيامين، المطبعة الشرقية ١٩٥٤، ص٩٥.

[605] ـ الصنمين: گوندێکی ناوچەی دیمەشقە لە بەرایی حۆرانەوە، لە دیمەشقەوە دوو قۆناغ دوورە. معجم البلدان، ٤٣١/٣.

٤٠٥ (اذرعات): شارێکە لە دەوروبەری شام ، نزيك ( البلقاء وعمان ).ن م ١/ ١٣٠

[607] قارە: گوندێکی گەورەی سەر ڕێگایە، مەنزڵگەی یەکەمە بۆ کەسێ لە (حمص)ەوە بەرەو دیمەشق بچێ. دوا سنوری (حمص)ە. ن. م، ٣٩٣/٤.

[608] العمري، التعريف، ١٩٦ـ ١٩٧. صبح الأعشى، ٣٩٣/١٤.

[609] ـ میخائيل صباغ، مسابقة البرق، مجلة المورد، ص١٤٤. جرجي زيدان، تأريخ تمدن الاسلامي، ٢٣٣/١. احسان هندي، الحياة العسكرية، ٢١٧.

لەبەر ناردن و فرۆشتن و بەخشین، خەریك بوو ئاسەواری ببڕێتەوە [٦١٠].

سوپای ئەییوبیان لە دەزگای تەتەرو پۆستەی نورەددینیان سوودی وەرگرت و، سەلاحەددین و نوێنەرو جێگرانی سەلاحەددین لەکاتی تەنگانەدا دەیانخستەکار. کۆتری نامەبەر لەکاتی شەڕی (الرملة)دا، بە ڕزگار بوون و سەلامەتیی سەلاحەددین مژدەی لەفەلەستینەوە برد بۆ میسر. (العماد) دەڵێ:" مژدەمان بە کۆتردا نارد، بەنامەوە کۆترمان هەڵداو زمانی درۆو دەلەسەمان لاڵکردو ترسمان بەسەلامەتی و دڵنیایی گۆڕی".[٦١١] سوپای ئەییوبی هەمیشە کۆتری ئەو جێگەو هەرێم و ناوچانەی پێبوو کە دەیویست پەیوەندیان لەگەڵدا بکات و دەنگوباسیان لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ بکات، یان داوای هاناوکۆمەکییان بکات. بەنموونە وەك ڕووداوەکەی ساڵی (٥٧٤ك/١١٧٨ز) کە خاچپەرووشمان گردبوونەوە بەدەوری شایەکەی خۆیان کەوتن بەرەو شاری دیمەشق و هەموو دیمەشقیان تاڵان کردو گەلێکیشیان بەدیل گرت و، کوشت و ئافرەتیشیان وەپێش خۆیانداو بردیانن. سەلاحەددین (عزالدین فرخشا)ی برازای بە لەشکرێکەوە ناردە سەریان و فەرمانی پێدا کەنزیکیان بووەوە بەبن باڵی کۆتردا خەبەری بۆ بنێرێ، تا ئەمیش بگاتە فریایان. ئەوەبوو فرخشا بە خۆی و لەشکرەکەوە کەوتە ڕێ.[٦١٢] وەلێ شتێك ڕوویدا، هەر لە پێکدادانەکەی (بيت الأحزان)ی ساڵی (٥٧٥ك/١١٧٩ز) دەچوو، ئەویش ئەوەبوو "نامەی باڵندەکە گەیشتە دیمەشق، ئەوجا سوڵتان لە دیمەشق بەدەرکەوت و کەوتەڕێ هەرکە گەیشتە (الكسوة)ی نزیك شاری دیمەشق دیتی وا خاچدورشمان بەدیل گیراون و بۆ لای ئەویان دێنن، بەو جۆرە بە سەربەرزیی و سەرکەوتوویی گەڕایەوە.[٦١٣]

لەگەمارۆ دوورو درێژەکەی (عكا)دا، ئەو هەموو کۆترەی لەهەموو لایەکی ولاتەکەوە بەسەر سەلاحەددیندا دەباری، ڕێکخستنی وەستایانەو لێزانانەی تەتەری ئاسمانیی سەردەمی سەلاحەددینمان بۆ دەردەخات .(إبن شداد) دەڵێ: لە ڕەمەزانی ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ ز)دا کۆترێ لە حەڵەبەوە نێردرا بۆ حەماو، لەوێشەوە بۆ (عكا)، نامەیەك بەبن باڵیەوە بوو، نوێنەرانی (الملك الظاهر)ی سەرگەورەی حەڵەب نووسیبوویان: سەربازە خاچپەروشمەکانی میرنشینی (أنطاكية)، کە لە حەڵەبەوە نزیکە، کەوتوونەتە پەلاماردانی گوندەکانی ناوچەی حەڵەب و ئەوەیان بەهەل زانیوە کە لەشکرەکەی حەڵەب لەوێ نییەو لەژێر فەرماندەیی (الملك الظاهر)دا بەرەو شاری (عكا) ڕۆیشتوون، وەلێ ئەو کەمە هێزەی لەحەڵەب مابوون و نەڕۆشتبوون بۆیان کەوتبوونە بۆسەدانان و تەگبیری خۆیان کردبوو. بەوجۆرە، دەستدرێژکارانیان نابووت کرد، "هەر ئەوەندەیان زانی شمشێربەدەستان تێیان کەوتن و حەفتاو پێنج سەربازیان لێ کوشتن و زۆرێکیشیان لێ بەدیل گرتن".[٦١٤]

ئیسلامەکان بەهرەوەرانەو هونەرمەندانە نهێنییەکانی خۆیان لەدوژمن دەشاردەوەو نەیاندەهێشت پێ بزانێ و زەفەریان پێ بەرێ، بەتایبەتیش لە گەمارۆکەی شاری (عكا)دا، تەنانەت هێمای (شفرە)ی تایبەتیشیان بەکاردەهێنا، کە لەناو خۆیاندا تیێ دەگەیشتن و پێشتر لەسەری پێکهاتبوون. (العماد) دەڵێ: "تەتەرەکان نامەیان دەبردو کۆتریشیان دەبرد لەگەڵ خۆیاندا، لەو سەریشەوە بەنامەو کۆتری ترەوە دەهاتنەوە. ئێمە بەپێی ئەو شفرە نهێنییەی خۆمان، نامەمان بەباڵی کۆتردا بۆ دەناردن و ئەوانیش نامەیان بۆمان دەنارد، نهێنیی دڵی خۆمان بەهێمای کەس لێ نەزان بۆ یەکدی دەنووسی".[٦١٥]

ئێمە دەربارەی بەکارهێنانی نیشانەی ئاگرو نیشانەی دووکەڵ، هیچمان لە سەردەمی نورەددین و سەلاحەددین

---

[610] الفتح القسي، ٣٦٠.

[611] سنا البرق الشامي، ١/٢٦٠. الروضتين، ج١، ق٢، ص٧٠٢.

٥٧ الكامل ١١ /٤٥٢ –٤٥٣ .

[613] الروضتين ٦/٢.

[614] النوادر، ١٤٣.

[615] الفتح القسي، ٣٦٠.

چنگ نەکەوتووە کە بۆ پێوەندی ئاڵوگۆڕی نامەو نامەکاری بەکار هێنرا بن، وەك ئەوەی دەوڵەتی مەغۆل لە ئێران‌و شامدا بەکاریان دەهێنا. مەغۆلەکان، بەسەر گردو زورگ‌و لوتکەکانەوە رەبیەو سەنگەریان هەبوو، لەو بەرزاییانەوە سەیری پادەشتەکانیان دەکردو دوژمنیان ببزوایە چاویان لێی بوو، زەلامەکان لەو بەرزاییانەوە، بۆ هەر جۆرە رووداوێ ئیشارەتێکیان دەداو، بە شەو، بەئاگرو، بە ڕۆژیش بە دوکەڵ. ئیدی ئەو خەبەرە رەبیە بە رەبیە دەڕۆیشت، تا دەگەیشتە دەست فەرماندار.[616]

**٤ـ بۆسە:**

بەدرێژایی مێژووی ئیسلام، بزاڤی بۆسەنانەوەو بۆسەکاری، گەربووبێت زۆربەی زۆری لەسەردەمی شەڕەکانی خاچدورشماندا بووە، بەتایبەتییش ڕۆژانی سەلاحەددین، چونکە خاچدروشمان هاتبوونە سەرکەناراوەکانی وڵاتی شام‌و بنکەو قەڵاو قایمکاریان لێ سازدابوو، لەوێشەوە کەوتبوونە دەستبزێوی‌و دەستوەشاندن.

(سەرچاوەکان) دەڵێن، بۆسە ئەوەیە کەدەستەیێ، یان پەلێ"جریدة"[617]أو سرية[618]" سوارەی جەنگاوەر لەپڕ دەچوونە سەر دوژمن‌و، زووتر هەروا دووربەدوور دەستیان لێ دەوەشاند، بەڵام نەیاندەگەیاندە ئەوەی شەڕی گەورەو بەرفراوان بکەن، واتا زۆرتر هێرشەکەیان بەنهێنی‌و شەبەیخون دەکرد. لەبەرئەوە، دەبوو ئەو زەلامانەی ئەم کارە دەکەن کۆمەڵێ خەسڵەتی چاکی وەهایان هەبێ، بتوانن ئەو ئیشە گرنگانە بەچاکی‌و بەسەربەرزیی بەجێ بێنن. کتێبگەلێ، کە لەسەر ڕێساو دەستووری شەڕوجەنگ دانراون، بەدرێژی باسی ئەو خەسڵەتەیان کردووە، (الدوسي) دەڵێ : زەلامگەلی بۆسە، دەبێ ئازاترین‌و بەمەشقترین‌و قاڵترین سوارچاکی شەڕبن‌و لە هەموو سەربازان بەئەزموونترین، چونکە ئەمانە لە سوپاو لەشکر دادەبڕێن‌و دەکەونە جێگایەکەوە، لە لەشکر دوور دەبن، بێ پشت‌و پەنا دەبن، سەربازگەکانیان دوورە و کەس بە هانایانەوە ناچێ. دەبێ شارەزای کاروبارو فڕوفێڵی کوشتار بن‌و لە ڕچەو ڕێگاو چیاو چۆڵ‌و شیوو دۆڵ‌وکەن‌و کەندڕی ناوچەکە بێئاگا نەبن، تابتوانن لە کاتی کێشەو کشانەوەدا خۆیان حەشار بدەن‌و لە چاو بزر ببن، بۆ ئەوەی ئامانجی ناردنەکەیان وەدی بهێنن.[619]

(بكتوت الرماح) دەڵێ: سوارچاکێ بۆ بۆسەنانەوە دابنرێ، دەبێ لە سەرت‌و سەختیدا بە جەرگ‌و بەتەکان بێ، هەمیشە بەسەر پشتی ئەسپەوە بێ، دڵدار نەبێ، کۆکەی نەبێ، زۆر نەپژمێ، خێزەی سنگی نەیێ، قوڵپەی گەرووی نەیێ، دەنگی گڕنەبێ، سەرکزی دڵ وریا، بێدارو بەئاگابێ، خەواڵو نەبێ، ئێشکچییەکی لەش قورس و تەمەڵ نەبێ، دڵی لاوازو سست نەبێ، چاو کوێرو سەرکوێر نەبێ، گوێ قولاغ بێ، گوێ سووك بێ، لەسرکەی مار و مێرو ئاگادار بێ، کاتی هاناو بانگەشەو تەنگانە، وەك کێچ ڕاپەڕێ... تد[620].

هەرچی ئەو ئەسپانەشە کە بۆ بۆسەدانان بەکاریان دەهێنا، ئەوە، دەبوو خەسڵەتێکی چاکی زۆریان هەبن، دەبوو سم قایم بن، شان‌و پشت سەلامەت بن، نەغەزرێن.[621] سەرکێش نەبن، نەحیلێنن. وڵاغگەلێ بېرێنە بۆسە، دەبێ هەموویان ئەسپ بن، یان هەموویان ماین بن، چونکە ئەگەر بەیەکەوە بن، دەیکەنە حیلەو سمکۆڵ‌و دوژمن لە خۆیان ئاگادار دەکەن‌و تووشی زەرەرو زیان دەبن.[622] ئەو جێگەیەش کە بۆسەکەی لێ دەنێنەوە، وەك (الأوسي) دەڵێ: دەبێ شاردراوەو نەدیو بێت، پەنا بێ، ئاوی لێ بێ، لەوەڕی هەبێ‌و شتی دیکەی فەراهەم بێ، کە بۆسەدانەران پێویستیان پێی

---

616 المقدسي البشارى، أحسن التقاسيم، مطبعة بريل، ليدن، هولندة، ١٩٠٧، ص١٧٧. صالح بن يحيى، تأريخ بيروت، ٣٥.

617 الجريدة: بەکوردی دەکا (دەستە)، کەمترین سەرباز، بەشێکە لە (پەل)ێك .. الثعالبي، فقة اللغة. ص٣٢٩.

618 سرية: لەدەستەیەك زیاترە، ... ن. م. ص.

619 مفرج الكروب ص٧١.

620 ـ بكتوب الرماح، السؤال والامنية، مخطوط ص١٩١. نقلا عن د. سعداوي، التأريخ الحربي، ص٢٢٢.

621 ـ غزريو "الحرن": ئەو ئەسپەیە کە تەواوێ ماندوو دەبێ ئیدی دەچەقێ‌و دەغەزرێ‌و ناجووڵێ، تأريخ العروس ١٧٢/٩. المنجد، ص١٣٠.

622 الأوسي، تفريج، ص٧١.

دەبێ..[٦٢٣] بەڵام ئەم هەموو خەسڵەتە چاکانە، بەو ئاسانییە دەست نەدەکەوت و ئەو زەلامانەی بۆ بۆسە دەنێردران، بەدەگمەن بەشێ لەو خەسڵەتانەیان هەبوو. لەبەرئەوە سەلاحەددین زۆرتر سوودی لە سارانشینان (البدو) وەردەگرت، ئەوان فێرە سەرماو گەرما بوون، فێرە تینوویەتی و برسییەتی بوون، لەسەر گەڕان و ڕاوو کۆچ و کۆچبەریی ڕاهاتبوون، لەکاتی تەنگانەدا بەئاسانی کۆمەکیان بە لەشکری سەلاحەددین دەکرد، زەلامیان بۆ شەڕ دەچوو، بۆ بۆسەدانان دەچوون، دوژمنیان سەر لێ دەشێواندو شوێنە ونکێیان دەکرد، خێراو چالاك و لەش سووك بوون، بەڕاستیش خزمەتی زۆریان بەسوپای ئەییوبییەکان کرد.[٦٢٤]

جا، بەرلەوەی بێینە سەر باسی کارەسات و ڕووداوەکانی بۆسەو بۆسەکاری، دەمەوێت ئەوەش بڵێم کە ژێدەرو سەرچاوەکان، هەر بەتەنگ ئەو باسەوە نین، تەنیا لە قۆناغی دووەمدا نەبێت، کە وەها دەهاتە دی، هەر دەتگوت مسوڵمانان، لە سەرکەوتن وەستاون و ساردبوونەتەوە. ڕاستیشت دەوێ، ئەم ساردبوونەوەیەش. لەو ڕۆژەوە دەستی پێ کرد کە لەشکری سەلاحەددین لەبەر قایمیی شورەی شاری (صور) پاشەکشەی کردو گەڕایەوە، هەروەها لە گەمارۆکەی شاری (عکا)شدا هیچیان بۆ نەکرا، جگە لەوەش هەڵمەتێکی تازەی خاچدروشمانیش هاتە پێشەوە، کەپێی دەگوترا (هەڵمەتی سێیەم)، لەژێر فەرماندەیی (ڕیشارد)، شێردڵی شای ئنگلستان و (فیلیپ او غستیسی) شای فەرەنسادا. ئیدی ئەوە بوو، لەم هەڵمەتە تازەیەدا شاری (عکا) یان گرت و مسوڵمانان لە (أرسوف) شکان و ڕایانکردو خاچدروشمان ویستیان ئەم جارەش (بیت المقدس) داگیر بکەنەوە، تا پەیماننامەکەی (الرملة) مۆرکرا.

سەلاحەددین، وادیارە دوای ساڵی ٥٨٥ك/ ١١٨٩ز، وای بەلاوە چاکتر بووە، بۆسەکان بخاتە گەڕان و جەولەو بیانکاتە سەر هێزەکانی دوژمن و نەیەڵێ بحەوێنەوەو بەخۆیاندا بچنەوە، هێزەکانی خۆیشی لە دەوروبەری (عکا) خڕبکاتەوە. واتا لەشکری ئەییوبیان. دەبوو لەلایەکەوە بەرەڤانی لە(عکا) بکاو، لەلایەکی دیکەوە گەمارۆیەك بسەپێنێ بەسەر هێزی خاچدروشماندا، کە گەمارۆی (عکا)ی دابوو، لەلای سێیەمیشەوە، دەبوو لقوپەل و دەستەی بۆسەچی، لێرەو لەوێ بنێرێتە سەر کۆمەڵانی خاچدروشمان.

بۆسەی گەورەو بەناوبانگ، ئەو بۆسەیە بوو کە لە (جمادي الاخرة)ی ساڵی (٥٨٥ك/١٨٩٠ز)دا نایانەوە، ئەوەبوو، خەبەریان هانی بۆ سەلاحەددین، کە کۆمەڵێکی زۆر لە دوژمن لە شاری (صور)ەوە دەردەچن و دەچن بۆ چیای(تبنین)[٦٢٥] بۆ گیادروونەوەو کۆکردنەوەی وشکەڵ و سووتەمەنی. سەلاحەددینیش کە ئەمەی بیست، بیری لەوە کردەوە بۆسەیەکی گەورەیان لە زەلامە نەترسەکانی لەشکرەکەی خۆی لەڕێگەیاندا بۆ بنێتەوە و لە شیوو دۆڵەکاندا حەشاریان بداو، هەندەش بن کە بتوانن شان لە شانیان بدەن و، بەشی هەندەش بکەن کە پەلاماری ئەو هێزە یەدەگەش بدەن کە بە دووی ئەو کۆمەڵە گەورەیەدا دەهاتن بۆ پاراستنیان.

ئەو لەشکرەی بۆ ئەو بۆسەیەی (تبنین) تەیارو ئامادەکرابوو، سەلاحەددین داوای لێکردن ژمارەیەکی کەمیان دەربچن و خۆیان نیشانی دوژمن بدەن و لە خشتەیان بەرن، کە گوایا ئەمان کەمن، دوژمن دانیان لێ تیژ بکاو پەلاماریان بداو ئەگەر دوژمنیش ئەوەی نەکرد، ئەوا خۆیان پەلاماری بدەن و ناچاری بکەن بێتە نەبەرد، ئەوجا خۆیان بەزیو نیشان بدەن و بەرەو دوا بۆ ناو بۆسەکە ڕابکەن و دوژمنیش دوایانکەوێ، تا بەتەواوی تێوەبگلێ. سەلاحەددین خەبەری بۆ سوپاکەی (عکا)یش نارد کە ئەگەر دوژمن بۆ یاریدەی خاچدروشمانی (تبنین) بزووت، ئەوانیش بچن چادرو دەواریان داگیر بکەن، ئەوجا سەلاحەددین و کۆمەڵێ لە سەربازەکانی بەرەو جێگای بۆسەکە کەوتنەڕێ. سەلاحەددین ئەو لەشکرەی دابەشکردوو کردی بە هەشت لق، لە هەر لقێ بیست سوارەی ئازای هەڵبژاردو فەرمانیدا خۆیان بۆ دوژمن

---

623 ـ ن، م . ص٧٢.

624 ـ النوادر، ١٠٨.

625 ـ تبنین: شارۆچکەیەکە لە چیاکانی (بني عامر) بەسەر شاری بانیاسدا دەڕوانێ و کەوتۆتە نێوان دیمشق و صورەوە .. معجم البلدان، ٢/١٤.

دەربخەن و تیربارانیان بکەن. بەپێی پیلانی بۆسەکە، ئەوجا لەبەریان هەڵێن تا دەگەنە ناو بۆسەکە، سەربازەکان، وەك سەلاحەددین چۆنی پێ گووتبون، هەموویان کرد. ئەوجا، لەشکرێکی گەورەو گرانی خاچدروشمانیان لێ ڕاپەڕی، شایەك لە پێشیانەوە بوو.[626] وەهاش دیار بوو هەواڵی ئەم بۆسەیەیان بەر گوێ کەوتبوو، لەبەرئەوە بۆ جەنگ و کوشتاری گەورە خۆیان تەیارو ئامادە کردبوو، ئیدی تێك چرژان و شەڕێکی ڕاستەقینە لەو ناوەدا هەڵایسا، چونکە هەڵبژاردەکانی، سەلاحەددین هەڵبژاردبوون، پێیان شەرم بوو ڕابکەن و هەڵێن، ساراکردن، پیلان و فڕوفێڵ بێ، یان هەرچییەك بێ، لەبەر ئەوە، غیرەت هەڵی گرتن و قسەی سوڵتانیشیان شکاندو بەو هێزە کەمەوە کەوتنە شاڵاو بردن و، شەڕ لەو گۆڕەدا، تا ئێوارە، تاریك داهات درێژەی کێشاو کەسیشیان شەڕەکەی بەجێ نەهێشت، بچێ هەواڵ بەرێ، فەڕەنگ لەو شەڕەدا، شکاو بە هەڵەداوان و شپرزەیی، دوای کوشتارێکی زۆر لە هەردوولا، گەڕانەوە. فەڕەنگەکان نزیکەی دە کەسیان لێ کوژران، موسوڵمانانیش دوو چەرخەچی و چوار عەرەبیان لێ کوژران.[627]

(العماد) دەڵێ: "دوژمن چاوی لێیان بوو، بەدوویان کەوت، بەڵام ئەمان کە گەیشتنە چیاکە نەیانتوانی لەوە زیاتر بڕۆن و لە دوژمن هەڵگەڕانەوەو شەڕێکی چاکیان کرد، تا هەموویان کوژران و ڕوویانکردە بارەگای خودا. ئەو چوارە: "زامل بن تبل و، میرجەحی بن مەنصوور، میر مطرف بن رفیع" و زەلامێکی دیکە بوون، ئەمانە هەر چواریان لە هۆزی(الربیعة) بوون."[628]

بارودۆخی ناهەمواری ئەو ماوەیە کە بەسەر سوپای ئەییوبیدا هات و، هەلومەرجی لەباری خاکی شامیش، نەخاسمە وڵاتی فەلەستین، کە پڕ بوو لەدارو دەوەن و چیاو دۆڵی زۆر، دەتگوت هەربە سرووشت بۆ بۆسەنانەوەو شەڕو کوشتار ڕسکاوە، سوپای سەلاحەددینی هاندا کە ئەمجۆرە شەڕە بگرنە بەر، هەرچەندیشە کاریگەرییەکی زۆری نەبوو. مەبەستی سەلاحەددین، هەر هەندەبوو کێشەو گرێ و گۆڵیان بۆ بنێتەوەو هەرگیز دڵنیا نەبن و تێر بەچاوی خۆیان نەخەون. ئەو جۆرە شەڕە زۆرتر وەك شەڕی پارتیزانی ئەم سەردەمە وابوو.

ئەو ڕووداوەی باسمان کرد، وادەردەخا کۆمەڵانی سارانشین (البدو) و میرانی عارەب لەسەردەمی سەلاحەددیندا ئەوانیش بۆدانانەوەی بۆسە، سەریان بەخۆیانەوە نەبوو، هەروەها، ئەم ڕووداوەش: ....

ناونیشانی "شەڕێکی عارەبان لەگەڵ دوژمندا"م کردەوەو خوێندمەوە، سەیرم کرد قسەکە قسەی (إبن شداد)ە و دەڵێ: "دوژمن بەدەرکەوتن بۆ دروێنەی گیاو لەوەڕ لە کەنار ڕووبارەکە، سوڵتانیش کۆمەڵێ عارەبی گورج و گۆڵ و لەش سووکی لەبۆسەدا بۆ دانابوون، هەر بە دیتنیان لەپڕو لەناکاو لەتیپە خاچدروشمەکە ڕاپەڕین و پەلاماریاندان و گەلێ گەلێکیان لێیان کوشت و کۆمەڵێکیشیان لێ بەدیل گرت و زۆربەشیان هێناو خستیانە بەردەستی سەلاحەددین. ئەویش خەڵاتی کردن و دڵیانی خۆش کرد".[629]

لە دۆڵێکیشدا، کۆمەڵێ عارەب ئەمجارەش بۆسەیەکیان نایەوە، هەندێ لە میرانی سەلاحەددین سەرکردایەتیان دەکرد، دووانیان لێ کوژرا. ئەم بۆسەیەش هەر بۆ ئەو خاچدرووشمانەی کە دەچوون بۆ گیاو بۆ داربڕین نرابووەوە، لەو سەری دۆڵەکەوە زەلامێکیان قیژاندی، خاچدروشمان بەینێ گوێ قوڵاغ بوون، ئەوجا بەرەو دەنگەکە جووڵان. لەوکاتەدا ژمارەیێ عوربان لە بەردەمیاندا، بەرەو بۆسەکەی خۆیان کەوتنە لۆقەو ڕاکردن، خاچدروشمانیش دوویانکەوتن و وایاندەزانی عارەبەکان لە ترساندا ڕادەکەن، تاگەیشتنە بۆسەکە، ئەوجا بۆسەچییەکان "بەیەك دەنگ لێیان خوڕین، خاچدروشمان لەترسان پاشەوپاش بەرەو دەوارو چادرەکانی خۆیان قووچاندیان و خەبەر گەیشتە برادەرانی خۆیان و بەدەنگیانەوە هاتن و شەڕ قەوما و لە هەردوولا ژمارەیێ کوژران و کۆمەڵێ سەربازی دوژمن بریندار بوون و بە دیل گیران و

---

[626] ـ سەرچاوەکان ناوی ئەم شایەیان نەگوتووە.

[627] ـ النوادر، ١٠١. مەبەست لە عەرەبو عوربان کۆمەڵێ لە سارانشینی ناوچەکەیە.

[628] ـ الفتح القسي، ٢٩٤. النوادر، ١٠١. الکامل ١١/ ٣٠ ـ ٣١. الروضتین، ٢/١٤١. مفرج الکروب، ٢/٢٨٧ ـ ٢٨٨.

[629] النوادر ، ١٠٨، الفتح القسي، ٣٦٠، مفرج الکروب، ٢/ ٢٩٤.

ولاغ ئەسپەكانیان كەوتە دەست موسوڵمانان". (إبن شداد) دەڵێ: "شەڕەكە لەبەرئەوە لەنیوەیدا پچڕا، چونكە سوڵتان چەند میرو لقێكی لەژێر فەرماندەی (سیف الدین یاركچ)دا بۆ پاراستنی بۆسەكە، لە نزیكەوە دانابوو، پێشی گوتن "ئەگەر بۆسەكە شكا، ئەوجا پەلامار بدەن"، كەچی ئەوان، سەرو دڵیان هەند گەرم بوو، نەگوێیان دا بە ئامۆژگاریەكەی سوڵتانو نەبە گەورەیی هێزی دوژمن، بێ پەروا نیشتنە سەر دوژمنو چنگ لەسەر شان هەڵیان بڕینو بەشانو ملی خوێناویەوە، كردنیان بە ناو دەوارەكانیاندا. ئەوجا سوڵتان بەدەركەوت، بزانێ چی ڕووی داو، بۆچی شەڕەكە وەهای لێهات، كابرای مێژوونووسیشی لەگەڵدا بوو، پاشان بۆسەچییان بە مژدەی سەركەوتنەوە گەڕانەوە" شەست خاچدروشمیان كوشتبوو، لە موسڵمانانیش ژمارەیێ كوژرابوونو، كە میر (أیاز المهرانیو جاولی) لەناو كوژراوەكاندا بوونو، دوو سوارچاكی ناوداریش بەدیل گیرابوون" .

ئەوجا سوڵتان بە خۆشیەوە گەڕایەوە بۆ چادرگاكەی خۆی، ئەم بۆسەیە خاچدروشمانی گەلێ دڵگران كردو تەواوێ ترسی لە دڵیان خست، بە جۆرێ كە ریشاردی شێردڵ گلەیی نارده سەر (الملك العادل)و داوای چاوپێكەوتنو كۆبوونەوەی لەگەڵدا كرد". [630]

وەنەبێ تەنها سەلاحەددین ئەم بۆسەو بۆسەنانەوەی سەروبەر نابێ، بگرە میرانی هەرێمەكانی خۆیشی لەم پیلانانەدا هاوپشكیو بەشدارییان دەكرد. بەنموونە، خەڵكی حەڵەب لە ڕەمەزانی ساڵی"٥٨٦ ك /١١٩٠ ز"دا، بۆسەیەكی گەورەیان بۆ خاچدروشمانی میرنشینی "انطاكیة"ی دراوسێیان نایەوە، چونكە ئەوان، واتە "خاچدروشمەكان"، كاتێ سەرگەورەی حەڵەب (الملك الظاهر) چووبوو بۆ "عەكا" تا لەگەڵ هێزەكانی باوكیدا بە شەڕو گەمارۆی "عكا"وە خەریك بێت[631]، لەم لاوە خاچدروشمان ئەوەیان بە هەلزانیو بە سەریەوە نەچوونو دەستدرێژیان كردبووە سەر شاری حەڵەب.

ڕوودانی بۆسە، چەند جارانیش لە گەمارۆكەی "عكا"دا ڕووی داوە، وەلێ هەر بەو شێوانەی كەباسمان كرد ڕوویانداوەو فەرقو جیاوازییەكی ئەوتۆیان نەبووە، بەلام جارێكیان سوپای ئەییوبی بۆسەیەكی ئەوتۆی گەورەیان نایەوە، مێژوونووسان ئەو شەڕە گەورەیەیان، كە لەو بۆسەیە كەوتەوە، ناویان نا "شەڕی بۆسەكە".[632] ئەوەتا (إبن شداد) كەخۆی لەو شەڕەدا بووەو بەچاوی خۆی دیویەتی، (عماد الكاتب) ئاسایی وەسفی دەكاو دەڵێ: لە(٢٢) مانگی شەووالی ساڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)دا سوڵتان هەوای بۆسەدانانێكی بۆ دوژمن كەوتە سەرو سووریش بوو لەسەری، هەر ئەو ڕۆژە كۆمەڵێ بۆسەزانی سوپای ئازاو قارەمانو سوارچاكی لێ جیاكردنەوە. ئەنجا فەرمانی دانێ شەو بكەونە ڕێو خۆیان بەكەس نیشان نەدەنو دوژمن نەزانێو بچن لەوێ لە دامێنی گردەكەی (عكا)ی گەمارۆدراو دوور لە سەربازگەكانی دوژمنەوە بۆسەیەكی گەورە بنێنەوە. ژمارەیێ لەوانەشی ڕاسپارد كەدەرچن، شەڕ بەدوژمن بفرۆشنو دوورەپەرێز تیربارانیان بكەن، بۆ ئەوەی ئەوانیش غیرەتیان بجوڵێو هێرش بێنن. ئەوەی سوڵتان داوای كرد هەموویان بەجێ هێنا، ئیدی كە تیربارانەكەیان كرد، لەلای دوژمنەوە نزیكەی دووسەد سواری خاچدروشم[633]بەسەر ئەسپی ڕەسەنو چاكەوە، بەچەكەوە، بە هەموو سازو تەدارەكی جەنگەوە بۆیان هاتنو ڕاویاننان، لەبەرئەوەش كەكەم بوون، خاچدروشمان بڕیاریاندا نەگەڕێنەوە، هەموویان بگرن. ئەوانیش هەنگاو بەهەنگاو دەكشانەوەو كەمكەمەش شەڕیاندەكرد تاگەیشتنە بۆسەكە، جا ئەوجا، خۆت بگرە، هاتم، چەكدارانی بۆسە لێیان ڕاپەڕینو بەیەك دەنگ، كورە چەك بە ڕانەكەی، پەلاماریان دانو شەڕ بە ورەی بەرزەوە بەردەوام بوو، ئەنجام خاچدروشمان تێك شكانو هەڵاتن، بەلام بۆسەچییەكان لەكۆڵیان نەبوونەوەو بەشمشێرو ڕم حەشریان پێ كردن، تا زۆرێكیان لێ كوشتنو باقیمەنی خاچدروشمان ناچار خۆیان دابەدەستەوە، ئەوانیش چەكیان كردنو خۆیانو ئەسپو ولاغیان وەپێش خۆیان داو

630 النوادر ٢٠٠، الفتح القسي، ٥٥٩ ـ ٥٦٠.

631 ـ النوادر، ١٤٣.

632 ـ النوادر، ١٥٠، الفتح القسي، ٤٤٨، الروضتين، ٢/١٨٠. مفرج الكروب، ٢/٣٤٤.

633 ـ النوادر، ١٥١، الفتح القسي، ٤٤٨، وفي الروضتين ٢/١٨٠ (البرق الشامي، گوتوویەتی: چوارسەد سوار بوونە).

بردیانن، سەرکەوتووان، خەبەرو مژدەی ئەم سەرکەوتنەیان گەیاندە سەربازگەی سەلاحەددین "لەوێش سەربازان کردیان بەشایی لۆغانو تەکبیر. سوڵتان بەرەو پیریان هات تا گەیشتە گردی (کیسان)[634] و لەویٚ بۆ پێشوازیکردنی بۆسەچییانو چەرخەچییان ڕاوەستاو کەوتە سەیرکردنی خاچدروشمە دیلەکان، کە بەرپرسێکی سوپای فەرەنسیو بەرپرسێکی خاروباریان لە ناودا بوو پاشان فەرمانیدا باڵبەست بکرێنو رەوانەی دیمەشق بکرێن."[635] سەلاحەددین لەسەر سیاسەتی بۆسەو بۆسەکاری بەردەوام بوو، تا ئەو شەڕو کوشتارە دوورو درێژەی نێوان ئەوو خاچدروشمان کۆتایی هاتو لەگەڵ (ڕیشارد)دا ئاشتبوونەوەی (الرملة)ی مۆرکرد.

**دووەم: هەڵسوڕاندنی کاروباری شەڕو ئاشتیو بەدیل گیراوان:**

**١ـ ئەنجومەنی جەنگی سوپای سەلاحەددین:**

شتێکی ئاساییە، سەرۆكو فەرماندەیەکی وەك سەلاحەددین، یاریدەدەرو هاوکاریشی دەبیٚو، لە سیاسەتی جەنگو پلانی سەربازی دانانو هەڵسوڕاندنی کاروباری دەوڵەتیشدا، یاریدەی دەدەن، ئەوانە ئەنجومەنێکیان لیٚ سازدرابوو، وەك ئەم ئەرکانی سوپایەی کە لەم سەردەمەدا هەیە. ئەو ئەنجومەنە، ئەندامێکیان سەلاحەددین خۆی بوو کە خواسایی سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکانی دەکرد. براکانیشی ئەندامی ئەنجومەنەکە بوون، بەتایبەتی (الملك العادل)، ئنجا کوڕە گەورەکانیشی، بەتایبەتییش (الملك الافضل علي)و (الملك الظاهر غازي)و برازاکانی، بەنموونە وەکو (تقی الدین عمر)و (شهاب الدین محمود الحارمي)، کە ئەکاتە خاڵی سەلاحەددین، هەروەها میرە گەورەکانو فەرماندە کۆنەکانو تازەکانیش، ئنجا (القاضي الفاضل)ی ڕاوێژکاری داناو، (بهاءالدین بن شداد)ی قازی لەشکرو (العماد الکاتب)ی مێژونووسو بەرپرسی نامەو نامەکاریی شەڕو جەنگو، (بهاءالدین قراقوش)و (سیف الدین المشطوب الهکاري)و فەرماندەی تری، بەنموونە وەك (ئەبوالهیجاء الهذباني)و (علم الدین سلیمان بن جندر)و (حسام الدین لؤلؤ)ی میری کەشتیگەلی میسرو، ئنجا خاوەن گوندو خاوەن شارو خاوەن قەڵاو قایمکاری ناوداری، بەنموونە وەك (مظفر الدین گوگبری)و (شمس الدین ابن المقدم)و (عزالدین جوردیك)و مەلا (ضیاء عیسی الهکاري)، ئەوانە هەموویان ئەندامی ئەنجومەنی جەنگیی سوپای سەلاحەددین بوون.

مادامێکی ئەوانە هەموویان بۆ خزمەتی دەوڵەتی سەلاحەددینو سوپای سەلاحەددین هەڵدەسوڕانو دەکۆشان، لەبەرئەوە یەکبەیەکیان دەیتوانی بەوپەڕی ڕاستیو بەبیٚ ڕیا ڕای خۆی بدرکێنێت. ڕاستیشت دەویٚ وەك ڕووداوو کارەساتی جەنگو شەڕیش ئەوەی دەرخست کە. مەگەر بەدەگمەن.، دەنا دەنگی هیچکام لەوانە، لە دەنگی ئەوانی دی بەرزتر نەبووەتەوەو، گفتوگۆی تەنیا بۆ خۆیو بۆ کار لەسەلاحەددین کردن قۆرخ نەکردووە، هەرچەندیشە جاروبار، لە قسەی سەلاحەددین دەردەچوون. بە نموونە کاتیٚ کە سوپای ئەییوبی کۆڵی داو نەیتوانی بەرەڤانیی لە "عەسقەلان" بکا، ئەوان بەبیٚ ڕەزامەندی سەلاحەددین کاولیان کرد، ناچار ئەویش لەگەڵیان ملی دا.

هەروەها کاتیٚ (بیت المقدس) غەزو کراو، پاش چەندین ساڵ سەلاحەددین ویستی سیستەمی بەرگریکردنی تێدا سازبدا، میرەکانی ڕازی نەبوون بچنە ناو شارەکەو، لەوە دەترسان وەك ئەوەی (عکا)یان بەسەربیٚو گەمارۆ بدرێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر ڕای سەلاحەددین بە گشتیی بەسەر ڕای ئەنجومەنەکەدا سواربوو، بەبیٚ ئەوەی کەللەشەقیو هەوای دیکتاتۆری بخاتەکار. هەمیشە ڕای ئەوانی وەردەگرتو گوێی بۆ شل دەکردن. بەڵام بەپێی باری بەرژەوەندی گشتی جارجار ڕای خۆی دەگۆڕی، بەبیٚ ئەوەی لەڕای ئەوان دەربچیٚ، سایان بە ڕای ئەوان قایل دەبوو، یانیش بۆ پاراستنی یەکێتیو یەکدەنگی ناوخۆیان زۆری لەسەر نەدەڕۆی. سەلاحەددین زۆرتر ڕاوێژی بە "الملك العادل"ی برای دەکردو بەبیٚ ئەو هیچی نەدەکرد. ئەگەر ئەو لە کۆبوونەوەی ئەنجومەندا دیارنەبایە لەدووی دەنارد، تا بزانیٚ ڕای ئەو

---

[634] تل کیسان: گردی کیسان: جێگایەکە لە لێرەواری (عکا)دایە، لە کەناراوەکانی شام. معجم البلدان، ٢/٤٣.

٨١ النوادر ١٥١ الفتح القسي، ٤٤٩. الروضتین، ٢/١٨٠. مفرج الکروب، ٢/٣٤٤ـ ٣٤٥.

چییەو چی بە باش دەزانێ، بەتایبەتیش لەسەر مەسەلە گەورەو گرانەکان.[636] ڕاستیشت دەوێ ئەم پێداگرتنو سووربوونەی سەلاحەددین لەسەر وەرگرتنی ڕای براکەی، لە مەڕ کاروباری دەوڵەتو، ئەم سەروەڕ نامە بۆنووسینەی‌و هیچ بڕیارێك نەدانەی تا وەڵامی ئەوی بۆدێو، بەکارنەخستنی هیچ بڕیارێکش تا ئەو نەڵێو، ئەو نەیکا، ئەمانە هەمووی بە گران نیشتە سەر سەلاحەددینو، هەلێکی زۆری بۆ سوودی دەوڵەتو غەزا ڕەخساوی لە کیس سەلاحەددین دا،[637] مێژوونووسێکیش گواستنەوەی (الملك العادل) لە میسرەوە بۆ حەلەب لەساڵی (٥٧٩ك/١١٨٣ز)دا بەوە لێکدەداتەوە کە سەلاحەددین حەزی کردووە براکەی هەمیشە لێی نزیك بێت چونکە بەبێ ڕاوێژی براکەی هیچ بڕیارو فرمانێ ناخاتە بەرکار[638].

وابزانم یەکەم کۆبوونەوەی گرنگ کە ئەنجومەنەکەی سەلاحەددین سازیدا.. وەك لە سەچاوەکانیشدا هاتووە. کەوتە ساڵی (٥٦٧ ك/١١٧١ ز)ەوە، لەسەر ئەوەبوو کە نورەددین خولیای چوونە میسری کەوتبووە سەر، تا سەلاحەددین لە میسر دەرپەڕێنێ. ئەوکات، سەلاحەددین جێگری نورەددین بوو لە میسر، چونکە سەلاحەددین. بەپێی قسەی (إبن الأثير)و مێژوونووسانی دیکەش کە هەر لە زمانی ئەوەوە دەیگێڕنەوە. نەیویستووە لەگەڵ نورەددیندا لە نزیك( الكرك)ەوە کۆببێتەوە، کەپێشتر بڕیاریان وابووە، لەوێ یەکتربببینن و پێکەوە کۆبوونەوە بکەن. ئەوەبوو، سەلاحەددین لەبەر نالەباریی دۆخی میسر، گەڕایەوە بۆ میسر، یان سووسەی ئەوەی کردبوو کەنورەددین لایدەداو نایەڵێ لە میسر بمێنێ. جا کاتێ ڕۆڵەکانی بنەماڵەی ئەییوبی و دۆستو لایەنگرانیان ئەم نیازخراپییەی نورەددینیان بۆ ئاشکرا بوو، کۆبوونەوەیەکیان سازدا، سەلاحەددینو (نجم الدين ايوب )ی باوکی‌و (شهاب الدين محمود بن تكش الحارمي)ی خاڵی‌و (تقي الدين عمر)ی برازای‌و کەسانی دیکەشی تێدا ئامادەبوونو، سەلاحەددین لەسەر بەر لە نورەددین گرتن کە نەتوانێ بەرەو میسر لەشکرکێشیی بکا، لەگەڵیاندا کەوتە ڕاوێژو گفتوگۆ. دیارترینی قسەکەری ئەنجومەن (تقي الدين عمر) بوو کە داوای شەڕو بەگژداچوونی نورەددینی کرد، وەلێ باوکی سەلاحەددین خەڵکەکەی هێورکردەوەو هەند بەئاوەزو ئەقڵ هاتە گوفتار، هەموویان عاجباتێیان لێ دەهات[639].

لە (ربيع الاخرى ساڵی ٥٧٥ك/١١٧٩ز)دا کە خاچدروشمان لەقەڵای قایمکاری (بيت الاحزان)[640]دا، خۆیان قایم کردبوو، کردبووشیان بە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر سوپای ئەییوبی، سەلاحەددین لەنزیك ئەو قەڵایەوە کەوتە ڕاوێژکردن لەگەڵ فەرماندەکانیدا. سەلاحەددین داوای لە دوژمن کرد، قەڵاکە بڕوخێنن‌و سەد هەزار دینار لە پاداشتدا وەربگرن، دوژمن قایل نەبوو، "سوڵتان، میرانی دۆستو برادەرانی خۆی خڕکردەوەو فەرمان بەدەستو ڕاوێژکارانیشی بانگ کرد"،[641] ئنجا مەسەلەکەی تێگەیاندن، ئەوان ڕایان وابوو پارەکەیان بۆ زیاد بکا. ئەوجا ناردیە سەر (تقي الدين عمر) لە شاری (حماه)و داوای لێکرد ڕای خۆی بڵێ، (تقي الدين عمر)یش لە وەڵامدا، گوتی: ئەو پارەیە بدەی بە سەربازەکان چاکترە، دنەیان بدە، بچن بۆ غەزاو هەوڵبدەن قەڵاکە بڕووخێنن، سوڵتان بە قسەی ئەم برازایەی خۆی کردو،

---

[636] الروضتين، ٢/٥٢. د. سعداوی، تأريخ الحربي، ص١٧٨. Lane - poole, A History of middle age, london , 1901 , p,196.

[637] الروضتين، ٢/٥٢.

[638] ـ ن، م، ص. وانظر د. سعداوی، جيش مصر، ص٣٧. نقلا عن العيني، ج١، ق١ ، ص٨.

[639] ـ الكامل، ١١/ ٣٧٢ـ ٣٧٣. التأريخ الباهر، ، ١٥٨ـ ١٥٩. وانظر الروضتين، ج١، ق٢، ص٥١٩. مفرج الكروب، ١/٢٢١ـ ٢٢٢. الذهبي، العبر، ٤/١٩٥، ١٩٦.

[640] ـ بيت الأحزان: شارۆچکەیەکە لە نێوان دیمەشقو کەناراوەدا. ئەو ناوەیان بۆیە لێناوە، گوایا ماڵی یەعقوب لەوێ بووە، کاتێ یوسفیان لێ دابڕی. فەرهەنگ ئاوەدانیان کردەوەو قەڵایان لێدروست کرد، معجم البلدان ١/٥١٩..

[641] ـ مضمار الحقائق، ٢٤.

سوپای ئەییوبی سەرکەوت و (بیت الأحزان)یان کاول کرد.[٦٤٢] ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە سەلاحەددین، گەلێ جار، بەبێ ڕاوێژکاریی هاوسەنگەرانی، بەتەنیا ملی لە هیچ ئیشێ نەدەنا، نەخاسمە ئەو ئیشە گرنگانەش کە سەلامەتیی وڵاتی مسوڵمانانی لەسەر دەوەستا. ئەنجومەنی ڕاوێژکاریی سەلاحەددین، جارێکی تریش بۆ لێکۆڵینەوەی داواکارییەکانی موسڵ کۆبوونەوەی سازدا، چونکە ئەتابەکی سەرگەورەی موسڵ، (عزالدین مسعود) لە ساڵی (٥٨١ ک/١١٨٥ ز)دا شاندێکی ئافرەتانی تەلاری شاهانەی ناردبوو، داوای دەکرد شەڕی نێوان هەردوولا بووەستێ، بەڵام ئەنجومەن لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیاری درێژەپێدانی گەمارۆی سەر موسڵی تازەکردەوە[٦٤٣].

بەناوبانگترین کۆبوونەوەی ئەم ئەنجومەنە، ئەوە بوو کە لە شەووالی ساڵی (٥٨٣ ک/ ١١٨٥ ز)دا لە نزیك شوورە بەرز و قایمکارەکەی شاری (صور) سازیدا. لەم کۆبوونەوەیەدا سەلاحەددین داوای تەگبیرو ڕاوێژی لێ کردن، چی بکەن و چی نەکەن، چونکە شارەکەی بۆ نەدەگیراو، شوورەکەی زۆر قایم بوو. پێیان گوت: "ئەم شارە قایمکارە، سێ لای دەریایەو ئاو لەهەردوو شانەوە دەورەی داوە، لە باری پانییش کەندڕکراوەو، قووڵ دەستی لێداگیراوەو کراوە بەسەنگەر ... بڕیاری ڕاستو دروستیش ئەوەیە، ئامێرو ئامرازی چاکی بۆ دەستەبەر بکرێت، مەنجەنیقی لێ بچێتە پێش و قولەو تاوەرو دەبابەی لێ دامەزرێ..."[٦٤٤]

ئەندامانی ئەنجومەن کەوتنە لێکۆڵینەوە چی بکەن باشە، بۆ کەوی کردنی ئەم شارە غەزریوە ی مل نادا بەلەشکری سەلاحەددینو، نیازی وایە هەتا هەتایە پەنجەپەنجەی لەگەڵدا بکا. ئەنجومەن بوو بە دوو گروپ، گروپێکیان، دەیانگوت: (صور) بە جێ بێڵین و بڕۆین و وازی لێ بێنین باشترە، کوژراوو بریندای زۆرمان داوە، ئەرکومەسرەفیشمان داویە لە کزیو نەماوەو لەشکریشمان جاڕسو بێزاربووە، وا زستانیش هات. لە هەمووی باشتر ئەوەیە گەمارۆکەی لەسەر لابدەینو بۆ بەهارێ بگەڕێینەوە سەری. "ئەم ڕاو تەگبیرە، میرە دەوڵەمەندەکان دەیانکرد، پێدەچێ، لەوە ترسابن سوڵتان قەرزیان لێ بکاو ئەرك و مەسرەفی لەشکرو لەشکرگاو گەمارۆکەی پێ دابین بکات، چونکە گەنجینەگەلی دەوڵەتو " بیت المال"یش درهەم و دیناری تێدا نەمابوو".[٦٤٥]

گروپی دووەم: کە بریتی بوو لە سەلاحەددینو لەخواترسانی، وەك مەلا (ضیاءالدین عیسی الهکاری)و (حسام الدين طمان)و (عزدین جوردیك النوري). کە ئیمانو ئازایەتیو خۆش ڕەوشتیی بە هەردوو دەست، توند گرتبوو.[٦٤٦] ئەمان ڕایان وابوو، درێژە بە گەمارۆکە بدەنو شارەکە تەنگەتاو بکەن، تا کۆڵ دەدا.[٦٤٧] ڕاوێژو گفتوگۆ زۆری خایاند، پاشان سەلاحەددین دیتی، ڕای زۆرینە ئەوەیە گەمارۆکە لابدرێ، چونکە مانەوەی بەبێ شەڕ، بێ مانابوو.. ناچار بارو بارگەیان لێ بەستو چۆڵیان کردو ڕۆیشتن. "سەلاحەددین لەکۆتایی شەووالی ڕێکەوتی یەکی کانوونی یەکەمدا، جێی هێشتو چوو بۆ (عکا)و سەربازانی هەموو ناردنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، بۆ زستان لە ماڵی خۆیان پشوو بدەنو، بەهارێ بگەڕێنەوە... سەلاحەددینیش، خۆیو ئەڵقەکەی لە (عکا) مانەوە..."[٦٤٨]

بەمانەدا، سەلاحەددینمان بۆ دەردەکەوێ، کە هەرچەندیشە لەگەڵ ڕای زۆرینەدا نەبووە، لێ ڕای خۆی داوەتە پاڵیان. ڕەنگە ئەوەشی لێکدابووبێتەوە، کە ئەگەر بێتو گەمارۆکە بەردەوام بێ، دوور نییە هەندێ لە میرەکان بکەونە سەرکێشیو، فەرمانەکانی بشکێنن، نەخاسمە جاڕسیش بوو بوونو بەو زستانە ساردو قوڕو قوڕاوەی کەنار دەریایە

---

642 ـ سنا البرق الشامي، ١/٣٣٣ـ ٣٣٥. الكامل، ٤٥٥ـ ٤٥٧. الروضتين، ٢/١١ـ ١٣. مفرج الكروب، ٢/٨١ـ ٨٥. البدايةو النهاية، ١١/٣٠٣ـ ٣٠٤.

643 الكامل، حوادث ٥٨١. زبدة الحلب، ٢/١٨. الروضتين، ٢/٦٤. مفرج الكروب، ٢/١٧٠ـ ١٧١.

644 ـ الفتح القسي، ١٥٧.

645 ـ الكامل، ١١/٥٥٦.

646 ـ الكامل، ١١/ ٥٥٧.

647 ـ الروضتين، ٢/١١٩.

648 ـ الكامل، ١١/٥٥٦ـ ٥٥٧. الروضتين، ٢/١٢٠.

ئازووقەشیان دابووی لەکەمیو بەشی نەدەکردن. لەگەڵ ئەوەشدا لابردنی گەمارۆی (صور)، پیاوچاکانو لە خواترساوانی سوپای سەلاحەددینی نیگەران کرد .

کاتێکیش خاچدروشمان شاری (عکا)یان لەگەمارۆدا، ئەنجومەن جارەهای جار بۆ ڕاو تەگبیر کۆدەبوونەوە. (إبن شداد) دەڵێ: سەلاحەددین لە (٢٩)ی شەعبانی (٥٨٥ك/ ڕێکەوتی (١٣)ی تشرینی دووەمی (١١٨٩)دا، میرەکانو ڕاوێژکارانی خڕکردنەوە، داوای لێ کردن گوێی لێ بگرن. (إبن شداد)یش لەگەڵیان بوو، ئەوجا گوتی: "بەناوی خواو سوپاس بۆ خوا... باش بزانن، ئەمە دوژمنی خوایەو دوژمنی ئێمەشە، وا لە وڵاتەکەمان خۆی داکوتاوە، چارمان نییە دەبێ هەڵیکشێینو خواش ئەو ئەرکەی لەسەر ئێمە فەرز کردووە. ئێوەش ئەم سوپایەمان دەبینن، بە تەمای کۆمەکی کەس نیین، لە (الملك العادل) بەو لاوە، ئەو دەمانگاتێ، ڕای تەواوی من ئەوەیە لەگەڵیان بیبڕمەوە، ئێوەش هەریەکەتان چیی پێ باشە با بیڵێ".

ئەوجا ئامادەبووان کەوتنە گفتوگۆو ڕادەربڕینو، هەریەکە لەلایەکەوە پەیڤی داو قسەی خۆی کرد، ئەنجام لەسەر ئەوە پێکهاتن کە بەرژەوەندیی لەوەدایە سوپاکەیان بکشێتە دواوە بۆ (تل الخروبة)، کە گردێکە بەسەر (عکا)دا دەڕوانێ، سوپا لەوێ چەند ڕۆژێ بمێنێتەوەو شانو باڵیان بحەسێتەوەو بێنەوە سەرخۆ، چونکە تەواوێ ماندوو و کەشەنگن، قارسو بێزارن، ئەگەر ئەم ئیشەیان بە زۆر پێ بکرێ، ئەنجامی باش نابێ، ئەمە پەنجا ڕۆژە چەك لە شانو لەسەر پشتی ئەسپ دانەبەزیون، ئەسپەکانیش لەلغاو جاڕەسو پەرێشانن، بێزارن. ئەگەر کەمێ بحەسێنەوە ورەیان تازە دەبێتەوە. (الملك العادل)یش دەگاتە جێو ئەویش ڕای خۆی دەداو لەگەڵمان دەست دەکا بەئیش. جگە لەوانە سەلاحەددین خۆیشی دڵ گران بووە، هەند زۆری لەخۆی کردووە، هەند بەچەکەوە ماندوو بووە، هەند بیرو هۆشی بە ئەندێشە بووە، پێویستی بەحەسانەوەیە. [٦٤٩]

هەروەهاش، سەلاحەددین پرسو ڕای بەبرادەرو دۆستانی کرد، کاتێ ئەڵمانەکان بە هەڵمەتێکی گەورەو بە خێراییو دەستو برد، وڵاتی ڕۆمیان داگیرکردو گەیشتنە(انطاكية)و لەساڵی(٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) یشدا بەرەو باشوور کشان، "بڕیاریان دا، چەند لەشکرێ بنێرنە سەر ئەو وڵاتەی کە هێزەکانی ئەڵمانی پێدا دێتو خۆیشی بە باقیمەنی سوپاکەیەوە بە گژ ئەم دوژمنانەدا بچێ، ئیدی ئەوە بوو، (ناصر الدین ابن تقی الدین عمر)ی سەرگەورەی (منبج)و، (عزالدین إبن المقدم)ی سەرگەورەی. کفرگاب و بعرین. و (مجد الدین بهدا مشاه)ی کوڕی سەرگەورەی. بعلبك. و، (سابق الدین عثمان)ی سەر گەورەی. شیزر. و، کەسانی دیکەش هەموویان کەوتنەڕێ". [٦٥٠]

ئیدی بەو جۆرە، کەی سەلاحەددین بەپێویستی زانیبا ئەنجومەن کۆدەبووەوە. ئەوەبوو کاتێ کە(کند هري) لە جمادي الاخرة. ی ساڵی ( ٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)دا گەیشت، [٦٥١] بۆ ئەوەش کۆبوونەوەی سازداو کاتێکیش لە مانگی شەعبانی ساڵی(٥٨٧ك/١١٩١ز)دا [٦٥٢] بەرەو ئەسقەلان کەوتنەڕێ، جارجار کۆبوونەوەی سازدەدا. نەك هەر ئەوە، بگرە لە نامەو نامەکارییشدا لەگەڵ خاچدروشمان، "پیاوماقوڵو کەسانی بە هزرو ڕای، بانگ دەکردو، بۆ چۆنیەتی وەڵامدانەوەیان پرسو ڕای پێ دەکردن" [٦٥٣]

لە شەعبانی هەمان ئەو ساڵەشدا، کە لە (أرسوف) لەبەر دوژمن هەڵاتن، سوپا، ڕوو لە (الرملة) بەرەو ئەسقەلان کەوتە ڕێ. "میرەکانی خڕکردەوەو پرسی پێکردن، چی بکاو چی نەکا، گوتیان، ئەم شارە کاول بکە، خۆدیت بەچاوی خۆت، دوێنێ چیمان بەسەرهات.. ئەگەر فەرەنگ بێنە سەر ئەسقەلانو ئێمەش بەرەڤانی لێبکەین، ئەوە، لەو بارەدا هیچ گومانی

---

[649] ـ النوادر، ١١٤. الفتح القسي، ٣٢٢ـ ٣٢٤. الروضتين، ١٤٦/٢. مفرج الكروب، ٣٠٤/٢ـ ٣٠٥.

[650] ـ النوادر، ١٢٦. الفتح القسي، ٣٩٣ـ ٣٩٤. الروضتين، ١٥٥/٢ـ ١٥٦. مفرج الكروب، ٣٢٤/٢.

[651] ـ النوادر، ١٣١. الفتح القسي، ٤١٣. الروضتين، ١٥٩/٢.

[652] ـ النوادر، ١٧٨.

[653] ـ النوادر، ٢٠٣ـ ٢٠٤.

تێدا نییە شەڕمان لەگەڵدا دەکەن، تا دەرمانکەن‌و خۆیان بێنە ناوی. جا ئەگەر هات‌و ئێمە، وەهامان کرد، ئەوە هەر هەمان هەڵەی شاری (عکا)مان بەسەردێ‌و، بەرگەی ناگرین، نەخاسمە بە گرتنی شاری (عکا)و بردنی چەکەکانمان خۆی بەهێزتر کردو، ئێمەش بەو دۆڕان‌و زیانە زۆرەوە هاتینە کزی‌و لاوازی". [654]

بێگومان ئەمە ڕایەکی ژیرانەو بە ئاوەزبوو، هەرچەندیشە سەلاحەددین، وەك. (إبن الاثیر) دەڵێ. ملی نەدەدا شارەکە وێران بکرێ، لە زمانی(إبن شداد)ەوە دەگێڕنەوە، گوتوویەتی: کاتێ دەست کرا بەتێکدانی شارەکە"سەلاحەددین گوتی: بەخوا قەسەم، پێم خۆشترە هەموو منداڵەکانم لە دەست بدەم‌و بەردێ لەم شارە بە هەدەر نەدەم، بەڵام ئەگەر خودا، بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان، ئیشەکەی بەو بارەداخستبێ، ئەوە، من چی دەتوانم بکەم‌و چیم پێ دەکرێ". [655]

ئەنجومەن دانیشتنێکی گرنگی سازدا، ئەوە، دوا دانیشتنی ئەنجومەن بوو. ئەوەبوو کارەسات‌و ڕووداوی یەك بەدوای یەکدا ڕوویان دابوو، پەیماننامەی ئاشتبوونەوەش لەگەڵ خاچدروشماندا مۆرکراو ڕیشارد شێردڵیش خاکی فەلەستینی بەجێ هێشت‌و، دوا جاریش، سەلاحەددین خۆیشی مرد. ئەم دانیشتنە گرنگە لە (١٩)ی جمادی الاخرەی ساڵی(٥٨٨ك/ حوزەیرانی ١١٩١ز)دا بەسترا، کاتێ کە خاچدروشمان سوور بوون لەسەر ئەوەی بچنە (بیت المقدس)، میرەکان لەم کۆبوونەوەیەدا ئامادەبوون. میر (ابو الهیجاء السمین) نەخۆش بوو، بە کولەمەرگی گەیشتە کۆبوونەوەکەو لە نزیك سەلاحەددینەوە لەسەر کورسییەك دانیشت.. (سیف الدین المشطوب)یش. کە تازە، لە دیلێتی بەر بووبوو، ئەویش هات. میرانی (الاسدیة)ش هەموویان ئامادە بوون، ئەوجا سەلاحەددین داوای لە(القاضي إبن شداد)ی مێژوونووس کرد کە بە وتاری (چاکەی غەزاوە) دەست پێ بکا، پاشان ماوەیەك ئەنجومەن کپ‌و بێدەنگ بوون، "هەر دەتگووت حەپەساون"، ئەوجا سەلاحەددین گوتاری خۆی دەستپێکردو گوتی: "دەبێ چاك ئەوە بزانن کە ئێوە سوپای ئیسلامن‌و هێزی ئیسلامن، خوێنی موسوڵمانان‌و ماڵ‌و موڵکی موسوڵمانان‌و ڕۆڵەکانیان بەویژدانی ئێوەوە بەستراوە. ئەم دوژمنەش لە ئێوە بەولاوە کەس نییە بەر سنگی بگرێ، خۆ ئەگەر. خوانەخواستە. بابدەنەوەو پشتیان تێ بکەن، ئەوا وڵاتەکەتان لێ بزر دەکەن. هەر خۆتان بەرتان لێگرت‌و پارەی (بیت المال)تان وەرگرت. موسوڵمانانی وڵاتانی دیکەش چاوەڕێی هیممەتی مەردانەتانن. سڵاوی خواتان لێبێ" [656]

(الأمیر المشطوب) بۆ وەڵامدانەوەی سوڵتان. هەستاو گوتی: "گەورەم، ئێمە مەملوك‌و بەندەی تۆین. هەر خۆیشت بە خێوت کردووین‌و گەورەت کردوین‌و شان‌و شەوکەتت پێ داوین‌و بەخشش‌و خەڵاتت بەسەرماندا داباراندو، دەوڵەمەندت کردین. لە کەللەو مل‌و گەردن زیاتر شك نابەین، ئەوا خستمانە ژێر دەستت. قەسەم بەخوا، کەسمان، ناگەڕێینەوەو هەتا مردن لە دووتین." ئنجا هەموویان بۆیان سەندەوە. سوڵتان گەلێ خۆشحاڵ بوو، دڵی فێنك بووەوە. [657] کەچی، میرەکان، هەندەی نەبرد، پەشیمان بوونەوەو، فەرمانی سوڵتانیان پشت گوێ خست‌و لەوە دەترسان لە قودسیش وەك دەردەکەی (عکا)یان بەسەر بێ. دیارە سەلاحەددین لە هەموو ڕووداوو کارەساتێکدا، ڕاو ڕاوێژی بە هەڤاڵانی کردووەو جارجارەش ڕای خۆی خستۆتە پاڵ ڕای ئەوان‌و، جارجارەش بە نابەدڵی‌و بە ناچاری لە گەڵیاندا ڕایکێشاوە، لەبەر بەرژەوەندی موسوڵمانان‌و لەبەر ڕەزامەندی خەڵك‌و ڕێزگرتنی میرەکانی، بەڵام هەندێ جار ئەم نەرمییە، بۆی بەگران دەوەستاو، میرگەلێ لە میرەکانی خۆی. وەك لەمەودوا دەیبینین. بەرپەرچیان دەدایەوەو لێی یاخی دەبوون.

**٢ـ پلان و شێوازەکانی شەڕو کوشتار:**

بێگومان لەشکرێ کاروباری خۆی ڕێك نەخاو، خاروباری خۆی ئامادە نەکاو پلانی پێویست بۆ ئایندەی دوورو نزیك دانەنێ، ناتوانێ بە سەر دوژمندا بداو بکەوێتە جەنگەوە. لەشکر نابێ بەشێوەی بێ نیزامی‌و کوێربەکوێری هەڵسوڕێ‌و ببێتە مایەی شڵەژان‌و لێکترازانی ڕیزەکانی خۆی . وەڵێ چ سوپای سەلاحەددین، زۆربەی میران‌و

---

654 ـ الکامل، ١٢/٧١ـ ٧٢.

655 ـ النوادر، ١٨٦، بنۆڕە: مرآة الزمان، ٨/٤١٠. الروضتین، ٢/١٩٢. وفیات الأعیان، ٧/١٩٨. مفرج الکروب، ٢/٣٦٩.

656 ـ النوادر، ٢١٦. الروضتین، ٢/١٩٨ـ ١٩٩. مفرج الکروب، ٢/٣٨٦.

657 ـ سەرچاوەکانی پێشتر ناومان بردن، سەیری ئەمەش بکە: Lane – poole. saladin p. 341. stevenson, p, 282.

سەربازەکانی، زۆرتر دڵیان هەر بەلای غەزاوە بووەو هەر بە هیوای غەزا کەللەیان گەرم بووەو هێرشیان بردووە، ئەم گیانی غەزایە، کاری لە کاری نیزام و پلان زیاتر بووە.[٦٥٨]

ئامانجی بەرزو پیرۆزی سوپای سەلاحەددین لە شەڕی خاچدروشمان ئەوە بووە کە ئەو داگیرکەرانە لە کەناراوەکانی شام، کە لەوپەڕی باکوورییەوە، لە (أنطاكية)وە داگیریان کردبوو، تا دەگاتە ئەوپەڕی باشوور، تا ئەسقەلان، دەریان بکاو لە هەندێ شوێنی ناوەوەش، بە نموونە لە (بيت المقدس)و (الكرك، الرها، حارم و طبرية)و جێگای تریش وەدەریان بنێ. موسوڵمانان، بەر لە سەلاحەددینیش هەندێ لەم جێگایانەیان ئازاد کردبوو، ئەوەبوو (عماد الدين زنگی و نورەدین مەحمود)ی کوڕی لە وچانێکی بەخۆهاتنەوەیەکدا کەمێ خۆیان ڕێك خست و دەستیان لە دوژمن وەشاندبوو، بەڵام لەسەردەمی سەلاحەددیندا، موسوڵمانان ڕێکخستنێکی پێشکەوتووتریان بەخۆیانەوە دی و، خۆیان بۆ غەزا دەکوتا.

ئامانجی ستراتیژی جەنگ، سەردەمی بنەماڵەی ئەییوبی، ئەوەبوو، ئەو خاکە ئازاد بکەن کە خاچدروشمان، لە دوادواییەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەیەمی زایینییەوە داگیریان کردبوو. جا، بۆ وەدەست هانینی ئەم ئامانجە، سوپای ئیسلام، ڕێگاو شێوازی جۆربەجۆری گرتەبەر، چ بە دەستەو یەخەو پەلامارو، چ بە لاوازکردنی باری ئابووری و دەروونی دوژمن و مۆڵ پێدانی لەو قەڵاو قایمکارانەدا کە خۆیان تێدا قایم کردبوو. لەسەردەمی سەلاحەددیندا، تاکتیکی زۆرترو جۆربەجۆریان بۆ وەگیرهێنانی دوژمن دەخستە کار. ئەم زاراوە تازەیەی(ستراتیجی Strategy)یەش، هونەری لەشکرکێشی و، دیارکردنی جێگای لەباری بەر لە شەڕو دوای شەڕو، بەسەر نەبەردەکانی شەڕدا دابەشکردنی سوپا، بەپێی گرنگی جێگاکان و، دابینکردنی پێداویستیی ماوەی دووردرێژو ڕەچاوکردنیشی لە وەختی ئاشتی و تەباییشدا، ئەمانە هەموویان دەگرێتەوە، واتا مەبەست لە ستراتیجی فەرماندەییەکی پڕ هونەری هەموو کاروباری جەنگە.

بە هونەری هێنان و بردنی هێزەکان و هاودەنگیی کاتی شەڕو، ڕێکخستنی کاتی هەڵمەت و کاتی بەرەڤانی، دەگوترا تەکتیك (Tactic)، کە دەبوو بەپێی پلانێك بەڕێوە بچی و، فەرماندەی گشتییش ئاگای لێ بێ. تەکتیك هونەری فەرماندەکردنی لەشکرە لەکاتی شەڕدا. مێژوونووسانی ئیسلام پێیان دەگوت: (تەیارو ئامادەکردن)، مەبەستیشیان لە ڕێکخستنی سوپاو بەشەکانی سوپا بوو، لەپێش شەڕو لەکاتی شەڕیشدا. ئامادەباشی (التعبئة)، واتا ڕێکخستن، یان مۆڵدانی هێزەکان و ئامادەکردنیان بۆ شەڕو فەراهەمکردنی هەموو پێداویستییەکانیان.[٦٥٩]

ئامادەباشی، سیاسەتی ڕۆژانەی ماوەکورتیش دەگرێتەوە کە بۆ لاوازکردنی دوژمن پێڕەو دەکرێ. بەنموونە، یەکەو ڕاست وەدیهانینی چەند ئامانجێکی کەم و، بەردەوام وەدەستهانینی ئەم کەمە ئامانجانە، دوژمنی پێ ماندوو دەکری و هەمیشە هەر شپرزەو لە ترسی کارەساتی ناکاودا دەبێ، واتا ئامادەباشیی چاك و بەردەوام، دوژمن دەتۆقێنێ و لە ورەی دەخا. سەلاحەددین ئەمەی باش دەزانی. لەبەرئەوە سوپای سەلاحەددین، هەمیشە ئامانجی گەورەی ڕزگارکردنی ئەو هەرێم و ناوچانە بووە کە خاچدروشمان داگیریان کردبوو، بەڵام ئامادەباشیی خۆی بەردەوام ئەنجامدەداو، لە کەلێن و کەلەبەری لاوازی دوژمنیش سوودی زۆری وەردەگرت و هەلی هەڵنەدەبوارد.

پلانی سەربازی سەلاحەددین بەتەنیا داینەدەڕشت. ئەو وێڕای ئەوەش کە فەرماندەیی سەرەکیی سوپای بەدەستەوە بوو، بەڵام ئەنجومەنە ڕاوێژکارەکەی یاریدەی دەدا. (ارمان) دەڵێ: ئەگەر فەرماندار بەردەوام مشت و مڕی لەگەڵ دوژمندا ببێ، ئەوە لەوبارەدا سەرکەوتنی زامنە. خۆ ئەگەر هات و ئەو مشتومڕەی لەگەڵ دوژمندا، نەما،[٦٦٠] ئەوە لەوبارەدا بەدووری مەزانە تێدا بچی و بشکێ. تیپی چەرخەچی، لەو مشتومڕەدا ڕۆڵێکی گەورەی دەگێڕاو هەمیشە وەك ئەڵقەیەکی پێوەندی وابوو لەگەڵ دوژمندا.

سوپای ئەییوبییان، جاروبار جۆرە کارێکیان دەکرد، کە دەتوانین ناوی بنێین تەکتیك. جۆرێ لەو فڕوفێڵ و تەکتیکەی

---

658 بنۆڕە: محمد خالد، قصة التعبئة، ص ٤٥.

659 ـ بنۆڕە: عبدالرؤوف عون، الفن الحربي، ص٢٠٦.

660 ـ ... ٢٢١ oman .Ahistory of the art of war.p.

بۆ مایەپووچکردنی دوژمن، کە لە ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٧٩ز)دا[٦٦١] لە شەڕەکەی (بیت الاحزان)دا خستیانەکار، ئەوەبوو کە سەلاحەددین فەرمانی بەسەربازەکانی دا ڕەزو باغی زەویەکانی (صفد) لە نشێوییەکانی ئوردندا، سەر لەبەر بڕنەوەو، فەرمانیشی پێدان حاصلات و بەروبوومیشیان بدروونەوە.[٦٦٢] مەبەستی ئەوەبوو، باری ئابووریی دوژمن نالەبار بکاو نەیەڵێ سوود لە میوەو ترێو دارو تەختە ببینن و لەو خەلەو دانەوێڵەیەش بێبەش بن، کە ئەوەبوو سەربازان درووییانەوە.

ئەم جۆرە ڕەوشە، زۆرجاران و بەبۆنەی جۆربەجۆرەوە ڕووی داوەتەوە، (محمد بن تقي الدين عمر الايوبي)ی مێژوونووس دەڵێ: سوڵتان چەند لەشکرێکی هەڵبژاردو، لە بەرایی ساڵی(٥٧٨ك/١١٨٢ز)دا بەرەو (الكرك) کەوتنەڕێو پاش چەند ڕۆژێك گەیشتنە جێو، سەیری کرد، فەرەنگێکی زۆرو زەبەنی لێیە، "لە نزیکیانەوە دابەزیین و تەنگەتاومان کردن، جێگامان پێ لەق کردن، تا ناچار بەدیوارەکانەوە نووسان. ئەوجا تەپمان دایە سەریان و یەخسیرمان کردن، ڕەزو باغمان بڕینەوەو ئاژەڵمان لە دێبەرو زەراعەتیان بەردا."[٦٦٣]

کە خۆیشیان بۆ شەڕە گەورەکەی (حطين) تەیارو ئامادەکردو بەرەو قەڵاکاری (الكرك) کەوتنەڕێ، هەر بەو جۆرە ترسیان لە دڵی خەڵکەکەی ناو، هەرچی لەدەوروپشتیدا بەردەستیان کەوت، هەموویان بردو ئاژەڵیان لەزەرعەتیان کردو ڕەزو مێوو داروباریان بڕین، ئەوجا بەرەو قەڵاکاری. الشوبك. ملیان ناو، ئەوەی لەوێ کردیان لێرەش کردیان.[٦٦٤] (العماد الكاتب) دەڵێ: فەرەنگەکان بە لەدەستدانی ترێو زەیتوونەکەیان گەلێ دڵگران و جەرگبڕاو بوون.[٦٦٥]

تەکتیکی ئاوشکاندن و ئاوبەستن، تینی زۆری بۆ دوژمن هێناو لە وەرەپێ بەردان و تێکشکاندنیدا ڕۆڵێکی زۆر گەورەی گێڕا. ئاشکرایشە کاتێ سوپای ئەییوبی لەشەڕەکانی (حطين)دا، دەستی بەسەرچاوگەکانی ئاودا گرت، بووە هۆکارێ لە هۆکارەکانی بەزینی دوژمن، کاتێ "ڕێگای چاوگ و سەرچاوەکانی ئاوی لێ گرتن[٦٦٦] لە تینوواندا خنکان".[٦٦٧] سوپای ئەییوبی لە ساڵی "٥٨٧ك/١١٩١ز"دا، هەندێ لەچاوگەکانی ئاوی قودسی زەهراوی کرد تا، وەك شاری (عكا)[٦٦٨] قودسیش نەکەوێتە ژێردەستی دوژمن. ئاوەکانیشیان بە ماددەی زەرنیخ زەهراوی دەکرد، یان کەلاکی ئاژەڵ و شتی پیسیان تێ دەهاویشت.[٦٦٩]

شێوازی هێرشی خێراو هەڵمەتی لەناکاو کە دوژمن لەپڕ بێ ورە بکاو نەتوانێ دەست بکاتەوە، ئەمەش پلانێ بوو لە پلانەکانی جەنگ و بە ئاشکرا لە ساڵی (٥٨٣.٥٨٤ك/١١٨٧. ١١٨٨ز)دا پێڕوکراو ئاسەوارەکانی دیارن، کاتێ کە سوپای سەلاحەددین بە سەرکەوتنەکەی شەڕی (حطين) دانەکەوت و وازی نەهێنا، دەستی کرد بەشەڕی خێراو هەڵمەتی لە پڕ، تا دوژمن نەتوانێ لە یەك شوێندا خڕببنەوەو هێزێکی گەورە دروست بکەن. پلانی سەلاحەددین ئەوەبوو دوژمن ناچار بکا، لە هەرلاییێ سەربازگەییێ بۆ خۆی دابنێ، ئەوجا ئەمیش، کامنی کەلێندراو ساکارو لاواز بوو، لەوێ لەناکاو پەلاماری دەدا.

کاتێ سەلاحەددین لە شەڕەکەی (حطين)دا سەرکەوتنی بە دەست هانی، ئەوجا، بانەو بان، یەك هێرشی لەناکاوی

---

661 ـ مضمار الحقائق ص٢٦. السلوك، ٦٩/٧. سنا البرق الشامي، ٣٣١/١.

662 ـ الروضتين، ٨/٢.

663 مضمار الخقائق، ص٩٣.

664 الكامل، ٥٣/١١. الروضتين، ٧٦/٢.

665 الفتح القسي، ص٦٠.

666 ن. م. ص٢١٧. الروضتين، ١٧٧/٢.

667 النوادر، ٧٧.

668 ن، م. ص٢١٧. الروضتين، ١٧٧/٢.

669 آثار الأول، ١٩١.

کردە سەر(عکا، صفورية، الناصرة، قيسارية، نابلوس و داروم)و هەمووشیانی داگیرکرد. کاتێکیش شاری (صور) ملی نەداو بەهۆی قەڵاو قایمکارەکانیەوە خۆی بەدەستەوە نەدا، ئەوجا سەلاحەددین، ناچار، وازی لیّ هێناو لەناوچەکانی تردا درێژەی بە شەڕەکانی داو شاری قودسی ئازادکردو هەندێ شاری کەناراوو ناوەوەشی داگیرکردو چووە ناو( هونین و، [٦٧٠] حیلەو لاذقییەو صەهیۆنیشەوە). پاشان بەرەو باکوور کشاو قەڵای (بکاس، شغر، برزية، دربساك و بغراس)ی داگیرکرد، کە هەموویان کەوتبوونە دەوروپشتی (أنطاكية)، پاشان بەشێ لەسوپاکەی دووبارە بەرەو باشوور کشاو لەدوا دوای ساڵی (٥٨٤ك/١١٨٨ز)دا قەڵای قایمکاری (الكرك)ی، کە ناوی (تاوێرەکەی بیابان)یان لیّ نابوو، داگیرکرد. دواجاریش پێش زستان و بەرلەوەی بگەڕێتەوە بۆ دیمەشق (صفدو کوکب)یشی گرت.

سەلاحەددین، دووبارە بایدایەوە سەر (صور)، کە گەیشتە شوورەی شارەکە، پیلانێکی دیکەی خستەکارو، لەگرتنی هەندێ قەڵای قایمکاردا، بۆ نموونە وەك قەڵای (برزیە)، تاقیی کردەوەو بەئاسانی هات بەدەستیەوە، ئەم پلانە پلانی کوشتاری بەنۆرەیە[٦٧١]، هێنای لەشکرەکەی کرد بەسێ گرووپ، گرووپێکیان بۆ ماوەیەك شەڕی دەکرد، پاشان ئەو دادەنیشت، گرووپی دووەم تیّ هەڵدەچوو، دوای ئەمیش ئنجا نۆرە دەهاتە سەر گرووپی سێیەم.[٦٧٢] مەبەستی سەلاحەددین لەم پلانە، ئەوەبوو، نەیەڵێ دوژمن چاو بکاتەوەو بپەرژێتە سەرخۆی، بەڵام ئەم پلانە بۆ شوورەی پتەوو بەهێزی شاری (صور) سوودی نەبوو، سەرباری دۆخی تۆبۆگرافیی کەژوکێوی سەختی ئەم شارە، کە گاڵتەی لەگەڵدا نەدەکرا.

تاکتیکێکی دیکەی سەلاحەددین ئەوەبوو، دووبەرەکیی لە ڕیزی دوژمندا دەنایەوەو لەخشتەی دەبردن و، دڵی لێك ڕەش دەکردن و، هەندێ لە فەرماندەکانیانی بەلای خۆیدا کێش دەکردو بەدۆست دەکرد. (إبن شداد) دەڵێ: جارێکیان لە (شوالی ساڵی ٥٨٧ك/١١٩١ز)دا، کۆبوونەوەیەکی سازداو، ناردیە دووی سەرگەورەی شاری (صیدا)، گویّ لەنامەو قسەکانی بگریّ. کابرا هات و کۆمەڵێ خەڵك و دۆستی خۆیشی لەگەڵدا هاتن. (إبن شداد)ی مێژوونووسیش لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە بوو. سوڵتان ڕێزو حورمەتێکی زۆری لەمیوانەکانی گرت و قسەو گفتوگۆی لەگەڵدا کردن و، بەپێی دەستووری بنەماڵەی ئەیبووبی، سفرەو خوانیان بۆ ڕازایەوە، دوای نان خواردن، بەتەنیا کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیان، پاشان بڕیاردرا کە سوڵتان لەگەڵ سەرگەورەی شاری صور (مەرکیز مۆنتفرات) ئاشت بێتەوە، کە کۆمەڵێ لەسەرگەورەکانی فەرەنگیش چوونە پاڵی، بەسەرگەورەی شاری (صیدا)یشەوە. سەلاحەددین بەمەرجیّ لەگەڵ ئەو مەرکیزەدا ئاشت بووەوە کە دوژمنایەتی خۆی دژ بەو فەرەنگانە ئاشکرا بکا کەلێیان هەڵگەڕاوەتەوە"هۆی ئەوەش ئەوەبوو کە ئەم مەرکیزە زۆر لێیان دەترسا"، سەرباری ئەوە، ناکۆکیی ژن و ژنخوازیشیان کەوتبووە ناو. هەرچی سوڵتانە، ئەوە، ئەو، وەکو (إبن شداد) دەڵیّ، هەموو شەرت وشروتێکی بۆ بەجیّ هێنا، بەتەنیا بۆ ئەوەی دوژمنایەتی نێوانیان گەرم بکا.[٦٧٣]

سەلاحەددین، بۆ لاوازکردنی ژیانی ئابووریی دوژمنیش، هەمیشە سەرگەرمی پلان بوو، بەنموونە، پێوەندیی و سەروو سەختی بازرگانیی لەگەڵ دەوڵەتۆکەگەلی شارەکانی (پیزاو جنەواو بوندوقییە)ی وڵاتی ئیتالیادا توندو تۆڵ کرد. هەر لەو ڕۆژەشەوە کەحوکمی وڵاتی میسری گرتە دەست، سەرگەرمی ئەوەبوو بازرگانیی بگەیێنێتە میسرو، لەگەڵ ئەم دەوڵەتۆکانەدا کەوتە باڵێۆزو باڵوێزکاریی و پێکهاتنی دبلۆماسی. بەداخەوە، دەقی ئەو پەیمان و ڕێککەوتنانە بزرن و نەماون.[٦٧٤] سەلاحەددین لەم دوو سەرەوە، سوودی لەم ڕێککەوتننامانە وەردەگرت:

---

[670] شارۆچکەیەکی قایمەیەو کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی (صور)ەوە. معجم البلدان.

[671] ـ الكامل، ١١/٥٥٣ـ ٥٥٤.

[672] ـ النوادر، ٩٢، الفتح القسي، ٢٤٩، الكامل، ١٢/١٥، الروضتين، ٢/١٣١، زبدة الحلب، ٣/١٠٥. مفرج الكروب، ٢/٢٦٦.

[673] ـ النوادر، بنۆڕە: الفتح القسي، ٥٦٠.

[674] Heyd, Historic di Commerce. P.396. جب ، صلاح الدين، ص١٤٥ـ ١٤٦. أرنست باركر، الحروب الصليبية، ترجمة د. الباز العريني، مطبعة لجنة البيان العربي، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٦٠، ص٢٢٩.

١. دەرامەتی دەوڵەتەکەی بەم بازرگانییە رووی لەزیادی کردو پێداویستی ئاسن‌و تەختەو مێوی بۆ فەراهەم بوو.

٢. بازرگانیی خاچدروشمانی پیێ لاواز کرد، نەخاسمە سەلاحەددین دەریای سووری کۆنترۆڵ کردبوو. بێ گومان، ئەم بازرگانییە، بووە مایەی کۆششی دووبارە بنیادنانەوەی کەشتیگەلی ئەییوبی.

لە ساڵی(٥٧١ك/ ١١٧٥ز)دا، سەلاحەددین پەیڤێکی ئاراستەی خەلیفەی عەبباسیی بەغدا کردو گوتی: "ئەو لەشکرانە خەڵکی بوندوقییەو خەڵکی پیزاو، خەڵکی جنەوەشیان تێدایە، هەر هەمووشیان، جارجارە دەبن بە داگیرکەر، زیانێکی گەورەمان لیێ دەدەن کە لە کێشماندا نییەو، ئاوری شەڕیان هەر بەردەوامە. جارجارەش دەبنە ڕاگوازو سەفەرچی، شمەك‌و کوتاڵیان دەخەنە ئۆباڵی ئێمەو بە حوکمی ئیسلام قایلن. هەندێکیان ئامێری شەڕو کوشتاریان پێیەو مەراییمان دەکاو، دەستکردە دەگمەن‌و ڕەسەنەکانی خۆیمان پێشکەش دەکا[٦٧٥]. لەگەڵ هەموویان سەرو سەختم هەیەو بەردەوامم‌و، لەگەڵیاندا ڕێك کەوتووم، چیمان دەویێ‌و ئەوان چییان پیێ ناخۆشە، ئێمە چی بە باشتر دەزانین‌و، ئەوان چی بەباشتر نازانن...". [٦٧٦] ئەم پێوەندیی‌و سەرو سەختەی نێوان میسرو شارەکانی ئیتالیا، وەنەبیێ شتێکی نویێ بووبیێ، نەخێر، لەسەردەمی حوکمی فاتمیەکانیشدا هەر هەبووە.[٦٧٧]

سەلاحەددین لە دوادوای تەمەنی ململانێی لەگەڵ خاچدروشماندا کە ریشارد شێردڵ فەرماندەیی دەکردن، گەلیێ پلانی لیێ دەگێڕنەوە کە بۆ شکست پێهێنانی خاچدروشمان لێی نەوەستاوەو کردویەتی، بەنموونە، شاری عەسقەلانی وێران کرد کە بووبوو بە کلیلی دەرگای باشوری (بيت المقدس)و کاروانەڕێی میسر. موسوڵمانان لەبەر جوانیی ئەم شارە ناویان نابوو، بووکی شام.[٦٧٨]سوڵتان بۆیە ئەم شارەی وێران کرد، چونکە سوپاکەی شارەکەی بۆ نەپارێزراو نەیتوانی بەڕەڤانیی لیێ بکات.[٦٧٩] لەوەش دەترسا، وەکو شارەکەی (عكا)ی لیێ بیێ‌و بەو جوانیی‌و ئاوەدانییە بکەوێتە دەست خاچدروشمان‌و ڕێگای میسریشی پیێ بگرن. سەلاحەددین وەهای پیێ باشتر بوو هێزی سەرەکیی سوپاکەی، بۆ پاراستنی (بيت المقدس) گل بداتەوە. لەو بارەیەوە، سەلاحەددین پرس‌و ڕای لەگەڵ (الملك العادل)ی برای‌و گەورە میران کرد، ئەوانیش هەموویان هاتنە سەر ڕای ئەو، گەورە ڕاوێژکاری سەلاحەددین (علم الدين سليمان بن جندر) دەڵیێ: فەرموو، ئەوە یافایەو دوژمن هاتۆتە ناوی‌و داگیری کردووە، ئەم شارە کەوتۆتە نیوەی ڕێگای نێوان عەسقەلان‌و قودسەوە، هەردوو شارەکەش پێکەوە بەجاریێ، ناکریێ‌و ناتوانریێ بپارێزرێن، تۆش فەرموو، کامیان زۆر بەگرنگ دەزانی توندو تۆڵ‌و قایمی بکە. [٦٨٠] ئیدی بەوجۆرە، بڕیار لەسەر وێران کردنی عەسقەلان درا.

ڕاستیشت دەویێ، ئەم شارە بە تەنیا شاریێ نەبوو کە وێران کراو، تووشی ئەم چارەنووسە ڕەشە هات، بەڵکو بڕیار درا قەڵاکەی (الرملة)یش وێران بکریێ،[٦٨١]نەخێر ئەم جارە قەڵاکاری (النطرون)یش کەموڵکی داوییەکان بوو،[٦٨٢] هەروەهاش بەشیێ لە شوورەکەی یافاو[٦٨٣] (غزة)و[٦٨٤] (اللد)[٦٨٥]یش وێران کران. (الداروم)[٦٨٦] کە کەوتووەتە ئەوپەڕی

---

675 د. الباز العريني، الشرق الأدنى في العصور لوسطى، ص٧٨.

676 ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٢١ـ ٦٢٢.

677 ـ د. صابر محمد دياب، سياسة الدولة الاسلامية، في حوض البحر المتوسط، دار الثقافة العربية للطباعة، القاهرة، ط/١ سنة ١٩٧٣. ص٢٣٠، وما بعدها.

678 ـ معجم البلدان، ٤/١٢٢، آثار البلاد، ص٢٢٢.

679 ـ النوادر، ١٨٧، الكامل، ١٢/٧١، الفتح القسي، ٥٥٠، الروضتين، ٢/١٩٢، السلوك، ١/١٠٦.

680 ـ الفتح القسي، ٥٥٠، التأريخ المنصوري ٢٠٧، مرآة الزمان ٨/٤١٠.

681 ـ النوادر، ١٨٩، الفتح القسي، ٥٥١. الكامل، ١٢/٧٢. معجم البلدان، ٣/٦٩. الروضتين، ٢/١٩٢، مفرج الكروب، ٢/٣٧١. وفيات الأعيان، ٣/١٩٩. السلوك، ١/١٠٦. النجوم ٦/٤٧. التأريخ المنصوري ص٢٠٧. شفاء القلوب، ١٧٣.

682 ـ النوادر ١٩١، الروضتين، ٢/١٩٣، وفيات الأعيان، ٧/١٩٩. مفرج الكروب، ٢/٣٧١، السلوك، ١/١٠٦.

683 ـ مرآة الزمان، ٨/٤١٠.

**باشووری کەناراوەکانی شام، سەلاحەددین وەختێ وێرانی کرد کە لەساڵی (٥٨٤ك/ ١١٨٨ن)دا کەناراوی شامی کەوتە دەست. قەڵای (سرمینیە)ش هەر بەو جۆرە، (الملك الظاهر غازي) دوای ئەوەی لە (جمادي الاخرەی ساڵی ٥٨٤ك/ ئابی ١١٨٨)دا ئەم قەڵایەی داگیرکرد، خەڵکەکەی لێ دەرکردو پاشان ڕووخاندیو، لەگەڵ زەویدا تەختی کردو ئاسەواریشی کوێرکردەوە.[٦٨٧] قەڵای (یازور)ی[٦٨٨] کەناراوەکانی (الرملة)شی ڕووخاند کە لەناوچەی فەلەستینە.[٦٨٩] پێش پەیمانی ئاشتبوونەوە لەگەڵ ڕیشارددا، شارۆچکەی[٦٩٠] (بيت جبرين)یشی کاول کرد. زامنکردنی ڕێگای نێوان میسرو شام کە بەپێ سی ڕۆژە ڕێگایە، ئەوەش پلانێکە لەپلانە ستراتیجیەکانی سەلاحەددین.[٦٩١] دیاریشە سەلاحەددین کە پێشتر جێگری نورەددین بووە لە میسرو، ئەوکات ڕێگاکانی هەمووی تاقیکردوەتەوەو، بەڕێگەی (أيلة)دا ڕۆیشتووە[٦٩٢] بۆ (الكرك)و بۆ (الشوبك)، بۆی ساغ بووەتەوە کە زەروورەتی شەڕو جەنگ وا پێویست دەکا، هەموو نیمچە دوورگەی سیناو، ڕێگاو ڕچەڕێگایەکانی لەو کۆمەڵە خەڵکانە پاك بکرێتەوە کەدەتوانن، ئەگەر بیانەوێ ڕۆڵێکی پیاوخراپانە لەسەر ئەو ڕێگایانە بگێڕن، چەتەو دزو پیاوخراپان ڕێگاکان بخەنە مەترسییەوە. لەبەرئەوە ناو دۆڵو ڕچە ڕێگاکانی لێ پاك کردنەوە. پاشان وای بە چاك زانی، قەڵاکارێ لە ناوجەرگەی سینادا دروست بکات. دیارە، هەر لە ساڵی"٥٦٦ ك/ ١١٧٠ ز"ەوە کە "أيلة"ی گرتو چووە ناوی، دەستی بە دروست کردنی ئەو قەڵایەش کردبێ.**

**سەلاحەددین زەوییەکی بەرزی قووچکەیی بۆ دامەزراندنی ئەو قەڵایە بەگەن کرد "اختار"، ئەو زەوییە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی باکووری "عين صدرالعزيز"ەوە، تەنیا یەك میل لێی دوورە، لەسەر ڕێگای "الشعري" کە ڕێگایەکە لە سویسەوە دەست پێدەکا تا دەگاتە "أيلة"، ئەم "أيلة"یەش کەوتووەتە خۆرهەڵاتی باشووری سویسەوەو پەنجاو حەوت کیلۆمەتر لێی دوورە.[٦٩٣] سەلاحەددین بەدرێژایی ڕێگای نێوان میسرو شام، قەڵاکارو خانو خانووی دروست کردو پاسەوانی بۆ دانانو، ئاسایشو ئاسوودەیی هێنایەوە ناو بیابانی سینا. سەلاحەددین، خۆیو میرەکانیشی لە چوونو هاتنی نێوان شامو میسر، هەر ئەم ڕێگایەیان دەگرتە بەرو، لەسەری ڕاهاتبوون. هەر لەم ڕێگەیەشەوە کاروانی ئازووقەی لە میسرەوە بۆ دەهاتو لە ماوەی جەنگی خاچدرووشماندا، ئەم ڕێگایەی میسر، کاروان لە دوای کاروان خاروبارو چەكو جبەخانەو سەربازی دەگەیاندە سەلاحەددین. سەلاحەددین هەردوو شاری میسرو قاهیرەی قایم کردو قەڵاکاری لێ دامەزراند، هەروەها هەموو بەندەرو دەروازەکانی وڵاتی میسر. (إبن مماتي) کە هاوسەردەمی سەلاحەددین بووە دەڵێ: (اسكندرية)و (دمياط)و (رشيد)و (عيذاب)و (تنيس)، گرنگترینی ئەو شارانە بوون کە سەلاحەددین قەڵاو قایمکاری بۆ دروست کرد.[٦٩٤]**

---

[684] ـ شفاء القلوب، ١٧٣.

[685] ـ النوادر، ١٨٩. الفتح القسي، ٥٥١. وفيات الأعيان، ١٩٩/٧. هەندێ سەرچاوە دەڵێن تەنیا کەنیسەکەی کاول کردووە: الكامل، ٧٢/١٢. الروضتين، ١٩٢/٢. شفاء القلوب، ١٧٢.

[686] معجم البلدان ٤٢٤/٢. شفاء القلوب، ١٧٣.

[687] ـ الكامل، ١٣/١٢، زبدة الحلب، ١٠٤/٣. مفرج الكروب، ٢٦٤/٢.

[688] ـ النوادر، ٢٢٨، مفرج الكروب، ٤٠٠/٢.

[689] ـ معجم البلدان، ٤٢٥/٥.

[690] ـ (بيت جبرين) دەکەوێتە نێوان (بيت المقدس)و (غزة)وە. معجم البلدان، ٥١٩/١. )

[691] ـ الروضتين، ٢٨/٢.

[692] ـ (أيلة): شارێکە لەسەر کەناراوی دەریای (قلزم) .. معجم البلدان ٢٩٢/١. ئەو شارە ئێستا بەندەری (ايلات)ە، دەکەوێتە سەر کەنداوی (العقبة) لە فەلەستین.

[693] بنۆڕە: د. سعداوي، التأريخ الحربي، ص٣٨.

[694] قوانين الدواوين، ٣٢٥.

سەلاحەددین دەیزانی کەمەترسی بۆ میسر لە باکوورەوە، خاچدروشمان دەینێنەوە. بەنموونە، (أموری) لە ساڵی (٥٦٥ك/١١٦٩ز)دا، شاری (دمیاط)ی لە وشکانی و لەدەریاشەوە گەمارۆ دابوو، لەبەرئەوە، سەلاحەددین، ئەو کارەساتەی هەر لەبیر بوو، بۆیە سووربوو لەسەر ئەوەی تا بتوانێ بەهێزی بکاو قەڵاو قایمکاری لێ دابمەزرێنێ.

سەلاحەددین، هەروەها کەناراوەکانی دەریای سووریشی قایم کرد. کاتێ لەساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز)دا بۆی ڕوون بووەوە کە خاچدروشمان بەنیازن پێی لێ ڕابکێشن و بێنە سەر ناوچەکانی ئەویش، نەخاسمە کاتێ میر (أرناط. رینودی شاتیون) ویستی کەشتییەکانی لەبەشی ڕۆژئاوای میرنشینی (الكرك)ی خۆی بخاتە گەڕ، واتا لە ناوچەکانی کەنداوی(العقبة)دا.[٦٩٥]

کەرەستەو پارچەکانی، کە ئەم میرە خاچدروشمە هێنا بوونی، دەستوبرد لێك دران و تێکهەڵکێشران و کەشتی گەلێکیان لێ دروستکردوو هەندێکیان یەکسەر دوورگەی قەڵا (دورگە فیرعون)یان داگیر کردو، هەندێکی دیکەیان هێرشیان بردە سەر بەندەرە بچووکەکانی میسر لەسەر دەریای سوور.

هەرچی ناو میسرە، ئەوە گرنگترین قەڵاو شوورەکاریێ، کەسەلاحەددین لەناوەوەی میسردا سازی دابێ. لە قاهیرە بوو، لە ساڵی(٥٦٦ك/١١٧١ز)دا دەستی پێ کردووە، لەم ساڵەدا، سەلاحەددین هەر هەندەی بۆ کرا شوورەکەی قاهیرە چاك بکاتەوەو کون و کەلەبەری بگرێ. ئەمەش بەوشەی (عمارة)دا دەردەکەوێ کەلەم دەستەواژەیەدا هاتووە:"لەم ساڵەدا سوڵتان دەستی کرد بە (عمارەتی). واتا چاك کردنەوەی. شوورەی قاهیرە، چونکە زۆری لێ ڕووخابوو، بووبوو بە ڕێبازو کەلێن و خەڵکی بە هەوەسی خۆیان لێیانەوە دەچوونە ژوورو دەهاتنەدەر. ئەرکی ئەو چاك کردنەوەیەی بە (قراقوش الخادم)[٦٩٦] سپارد.

سەلاحەددین بڕیاری بنیادنانی قەڵاکەی قاهیرەی دا. میسر، بەر لە ئەیی‌ووبییەکان، قەڵاو قایمکاری پاراستنی نەبوو، خۆ دەبوو، سەلاحەدین قەڵاو قایمکاریێ بۆ پاراستنی خۆی دروست بکاو، لە لایەنگرانی فاتمی و کۆمەڵانی ناحەز بێوەی بێ،[٦٩٧] نەخاسمە کاتێ لەمیسرەوە دەچێ بۆ شام، بۆ کوشتاری خاچدروشمان. ساڵی(٥٧٢ك/١١٧٦ز) کەگەڕایەوە بۆ میسر، بۆ تەواوکردنی قەڵاکە تێ هەڵچووەوە، بەڵام قەڵاکە لەماوەی حوکمی سەلاحەددیندا، نەهاتە تەواو بوونێ، تەنیا پەیکەری قەڵاکەو، بیرێکی بە لوولپێچ لەناو تاوێردا دابەزیو، لەقەڵاکەدا، تەواو بوو. لەو کارەدا دیلە خاچدروشمەکانیش هاوپشك بوون و[٦٩٨] بەردی هەڕەمە گچکەکانی جیزەیشیان تێدا کارکرد. سەلاحەددین، دوای ئامادەکردنی هێڵکارو نەخشەی قەڵاکە، ئەوجا فەرمانی دروستکردنی شوورەی دەوری میسرو قاهیرەی دەرکرد، چونکە ئەو شوورانەی کە هەبوون، وەك چەپەڕە شڕیان لێ هاتبوو ڕێگای کەسیان نەدەگرت و، خەڵکەکەش هێزی پاراستنی شوورەکانیان نەبوو.[٦٩٩]

ئەم شوورەیە، سێیەم شوورەیە لەدەوری قاهیرە دروستکرابێ. شوورەی یەکەم، (جوهر الصقلي) دروستی کرد، شوورەی دووەم (بدر الجمالي) دروستی کردو، هەردووکیشیان بەخشتی کاڵ دروست کراون.[٧٠٠] سەرپەرشتی دروستکردنی هەموو قەڵاو شوورەو قایمکارێکیش، لەسەردەمی سەلاحەددیندا، ئەو (بهاءالدين قراقۆشە) بووە، کە

---

[695] ـ الروضتين، ٢/٣٥. مفرج الكروب، ٢/١٢٧.

[696] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٨٨.

[697] ـ الخطط (طبعة أوفسيت) ٢/٣٠.

[698] ـ ابن جبير، ٢٥.

[699] ـ سنا البرق الشامي، ٢٣٩ـ٢٤٠. الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٨٧ـ ٦٨٨.

[700] ـ بيومى، قيام الدولة الأيوبيية، ص٢٣٧.

ناومان برد.[701]

کە هاتینە سەر باسی پلانگەلی شەڕو کوشتار، لەوێ، باسی عەردو بەردو نەبەردی شەڕو کوشتاریش دەکەین، چونکە ئەو عەردو خاکەی ئەو هەموو کوشتارو شەڕەی لەسەردا ڕووی داوە، کارێکی زۆری لە چۆنێتی ئەو پلانە سەربازییانەش کردووە کەسەلاحەددین لەگەڵ شارەزایان و ڕاوێژکارانی خۆیدا دایاندەڕشت. گەلێ جاریش ئەنجامی شەڕ بەو جێگەو زەوییەوە بەندە، کە ئەملا، یان ئەولا، بۆ پێگەو پەلاماری بەرەڤانی کردن هەڵی دەبژێرن. سەرکەوتنی فەرماندایش زۆرتر، هەر ئەو گۆڕەپانی شەڕە بۆی دەرەخسێنێ کە بە ئاوەزو بە ئەزموون، جێگەیەکی چاکی بۆ شەڕەکە بەگەن کردووەو، پەناو پێگەی قایمی بۆ لەشکرەکە تێدایەو، لە هێرش و کشانەوەشدا، پشتی بە قایمەوەیەو ئەرخاینەو، بە ئاسانیش ڕێگای ئازوقەو جبەخانەو کۆمەکی هەیە. فەرماندایی چاک ئەوەیە، نەیەڵێ ئەو جۆرە گۆڕەپانانە دەست دوژمن بکەوێ و بە پێی توانا لەو خەسڵەتە چاکانەی گۆڕەپانی شەڕ بێ بەشی بکا.

ڕاستیشت دەوێ، جێگەو زەمینەی بەردەوامی شەڕ، هەرگیز بەجۆرێ نەرەخساوە کە هەردوولا بەردەوام شەڕی لێ بکەن، چونکە شەڕ، بزووتنە، هێرشە، بەرگرییە، ئەمڕۆ لێرەیە، بۆ ئێوارە، یان سبەینێ لە جێگایەکی ترە. سەلاحەددین لەو ساڵەوە، "٥٧٠/ك/١١٧٣/ز" کە میسری بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ شام، هەموو شەڕەکانی خاچدروشمانی خستە خاکی شامەوە، ئەوانەش کە شارەزای سروشتی ئەوخاکە نەبوون، وایان دەزانی، سەلاحەددین شەڕی شڵەژاوی و بێ سەروبەری دەکاو لێی نازانێ، نەخێر سەلاحەددین شارەزای سروشتی هەموو ناوچەکانی خاکی شام بووە، لەبەرئەوە پلانێکی لە جێگایەکدا پێڕۆ کردبێ، لە گۆڕەپانێکی شەڕی دیکەدا پلانێکی دیکەی بەکارهێناوە، ئەوەی لە عەردێکدا دەگونجێ بکرێ، لە عەردێکی دیکەدا نالوێ. خۆ شەڕیش هەرگیز بەو جۆرە ئاسان نەبووە، نەخاسمە کاتێ خاچدروشمان خۆیان، کاتی شەڕو جێگای شەڕەکەیان دەسەپاند، یان ئامرازو ئامێری گەورەی شەڕیان دەهێنایە مەیدان. کە لەمەودوا باسی هەندێکیان دەکەین.. لەکاتی وادا، لەشکری ئەییوبی تووشی کێشەیەکی زۆر دەبوو، ناچار دەبوو پلان و تەگبیری خۆی بگۆڕێ.

**٣ـ وەرزی شەڕو کوشتار:**

جاڕدانی جەنگ، هەروا بەهەوەس و لەختوخۆڕایی نەدەکرا. نەخێر، گەلێ جار، چەندین گێچەڵ و بەرژەوەندو بیانوو ڕووداوەکانیان بەگورجی بەرەو جەنگ دەبرد. لە هەموو شەڕێکیشدا، بارودۆخ گرنگ بووە بۆ هەردوولای شەڕکەران. وەرزو کاتی وەها هەبووە، لەوەرزو کاتێکی دیکە، بۆ جەنگ ڕەخساوترو لەبارتر بووە. زۆرتر، لە دوادوای وەرزی زستان و داهاتنی گەرماو وەرزی بەهاردا، ئامادەباشیی جەنگ بەجێ دەهات. لەزستاندا، شەڕی قورس و گران نەدەکرا، لە تیر بارانی دووربەدوورو چالاکی چەرخەچی و بۆسەو بۆسەکاری بەولاوە. گەر سەرنجی مێژووی کات و ساتی جەنگ بدەین، دەبینین لە هەشت تاکو نۆمانگی پاش سەرماو سۆڵەی زستاندا شەڕو جەنگ ڕووی دەداو، بە داهاتنی زستان شەڕ دەڕەوییەوەو دەوەستا. بەنموونە، جەنگی (حطین) لە مانگی (تەموزی ١١٨٧ز/ ربیع الثانی ٥٨٣ك)دا ڕووی داو سەلاحەددین ئەو هاوینە گەرمەی بەهەل زانی و نەیهێشت لەدەست بچێ. گەرمای شەوو ڕۆژو کەم ئاوی و تینوێتی دوژمن، بووە هۆکارێ لەهۆکارەکانی سەرکەوتن و زاڵبوونی لەشکری ئەییوبی. هەر لەم وەرزەدا، لەشکری ئەییوبی چەندین سەرکەوتنی لە کەناراوەکاندا وەدەست هانی، لە ئەیلولی ساڵی (١١٩٠ز/ ڕەجەبی ٥٨٣ك)دا شاری (بیت المقدس)یشی کردە دەسکە گوڵی ئەو سەرکەوتنانە. (العماد) دەڵێ: هەموو چالاکی و شەڕەکانی سوپای سەلاحەددین لە وەرزی هاویندا بەجێ دەهات و، دەڵێ: "هەموو سەرکەوتن و زاڵبوونێکی ڕۆژانی، حطین و گرتنی قودس و داگیرکردنی کەناراوەکان، بە شمشێری ڕووتی دەستی سەلاحەددین، لەوەرزی تاوسان و مانگەکانی ئەم وەرزەدا، ڕەخسان".[702]

---

[701] ـ سنا البرق الشامي، ٢٩٧، الروضتين، ٢٧/٢. عبداللطيف البغدادي، الافادة والاعتبار ، ط، لندن، ١٩٦٥، ص١٠٨. مفرج الكروب، ٦٧/٢. بۆ زانینی زیاتر لە بارەی ئەو شوورەیەوە بنۆرە: مفرج الكروب ٥٢/٢. هەروەها د. عبدالرحمن زكي، قلعة صلاح الدين ٣١ـ ٥١.

[702] ـ الروضتين، ١٢١/٢.

(إبن شداد)یش دەڵێ: "سوڵتان لە بەرایی زستاندا دەستووریکی دەدا".[703]

ئەو ئاگربەستە (هدنە)ش کە لە ساڵی(٥٨٤ك/١١٨٨ز)دا، سەلاحەددین لەگەڵ سەرگەورەی (انطاکیة)دا مۆری کرد، تەنیا بۆ ماوەی هەشت مانگ بوو، لە تشرینی یەکەمەوە تا کۆتایی مایس.[704] (العماد) ئەم ئاگر بەستە، بەوە لێکدەداتەوە کە سوپای ئیسلامییش جاڕس و بێزار بووبوون و، دەیانەویست، بحەسێنەوە و پشوویەك بدەن، ماوەی ئاگر بەستەکەش "پێش وەرزی درەوو هەڵگرتنەوەی داهات و حاسلات تەواودەبێ"[705] دیارە سەربازی سوپای ئیسلام، بۆ زستان دەگەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، نەك لەبەرئەوەی کوشتار لە وەرزەدا سەخت و ستەمە، یان لەبەرئەوەی بحەسێنەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە زستان وەرزی ئامادەکردنی زەوییە بۆ کشتوکاڵ، سەربازان دەبوو لەم وەرزەدا لە سەر زەوی خۆیان بن.

ئێمە ئەگەر سەیری دەنگوباسی بزاڤی رۆژانەی سەلاحەددین بکەین کە "عماد الکاتب" و "ابن شداد" و مێژوونووسانی دیکەی ئەو سەردەمەو، دوای ئەو سەردەمەش، نووسیویانە، بۆمان دەردەکەوێ، چ شەڕو چ لەشکرکێشیی و چ هاتنی لەشکری دەورو‌بەر، هەمووی لە وەرزی زستاندا دەوەستان.

بەلام هەر بەکۆتایی هاتنی ئەم وەرزی سەرما و سۆڵەو قوڕوقوڕاوە. بەتایبەتیش لە وڵاتی شام. ئیدی لەشکر دەکەوتە چالاکی و بزاڤو خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن تەیارو ئامادە دەکردو هێزەکانی دەوروبەریشی دەگەیشتنە گۆڕەپانی جەنگ. دەگێڕنەوە کە لە (١٢)ی ربیع الثانی ٥٨٦، (واتا ناوەڕاستی مایسی ١١٩٠ز. لەبەهاردا) گەورەمیران بەخۆیان و لەشکریانەوە هاتن و گەیشتنە لای سەلاحەددین، بەنموونە وەك: (عمادالدین زنگی بن مودود بن زنگی)ی سەرگەورەی شەنگال بەخۆی و بە لەشکرێکی گەورەوە، پاش ئەو (معزالدین سنجرشاە بن غازی بن مودود)ی سەرگەورەی جەزیرەی (إبن عمر) گەیشتە لای، پاش ئەمیش (علاءالدین خرم شاه)ی کوڕی سەرگەورەی موسڵ (عزالدین مسعود إبن مودود) گەیشتە لای، ئنجا سەرگەورەی ئەربیل (زین الدین یوسف بن علی کچك)، پاشان کەشتیگەلی میسر بە خاروبارو ئازوقەو جبەخانەوە گەیشتن.[706]

بۆ ڕەمەزانی ئەو ساڵە، لە ئەیلولی (١١٩٠ز)دا، لەشکری شاری حەڵەب، لە ژێر فەرماندەیی (الملك الظاهر غازي)ی کوڕی سەلاحەددیندا. کە هەندێ لە گەورە میران و فەرماندارانی، بەنموونە، وەك (سابق الدین عثمان)ی سەرگەورەی (شیزو)و، (عزالدین ابن المقدم و حسام الدین حسین باریك و الملك الأمجد مجدالدین بهدام شاه. سەرگەورەی بعلبك)ی[707] لەتەکدا بوون گەیشتنە لای سەلاحەددین، دوای تەواوبوونی وەرزی شەڕو کوشتاریش ئیدی لەشکرو سەربازان دەگەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. (العماد) دەڵێ: "کاتێ زستانی سەخت هێرشی هێناو پایزی بەدبەختیش بۆی دەرچووو لوتکەی چیاکانیش بەفر داپیۆشی و دنیاش بووە قوڕو لیتە..."، ئەوجا میرانی سەلاحەددین داوایان لێکرد ئیزنیان بدات بچنەوە بۆ وڵاتی خۆیان پشوویەك بدەن و بحەسێنەوە، ئیدی ئەوەبوو سەرگەورەی شنگال گەڕایەوە، بەدووی ئەودا سەرگەورەی (جزیرە إبن عمر) گەڕایەوە، پاش ئەویش ئنجا کوڕی سەرگەورەی موسڵ گەڕایەوە.[708]

(إبن شداد) بەم بۆنەیەوە لە ژێر سەردێڕی (گەڕانەوەی لەشکر لەغەزاوە) دەنووسێ و دەڵێ: "کە زستان هێرشی

---

703 ـ النوادر، ١٩.

704 ـ (العماد الکاتب) ماوەی ئاگربەست بە تەقویمی شەمسی ـ میلادی، دیاردەکا، نەك بە مێژووی کۆچی، بنۆرە: "الفتح القسي، لاپەڕە ٢٦". بنۆڕە ئەمانەش: النوادر ٩٤، الکامل، ١٢/٩. الروضتین، ١٣٣/٢. دەشبینین: (ابن شدادو، ابن العدیم. زبده الحلب، ١٠٤/٣. (ابن کثیر) یش البدایة والنهایة، ٣٣٠/١٢. کەسانی دیکەش ماوەی ئاگربەستیان بە حەوت مانگ داناوە.

705 ـ الفتح القسي، ٢٦٠.

706 ـ الفتح القسي، ٢٨٥/٢٨. بنۆڕە: النوادر، ١٢١. الروضتین، ١٥١/٢.

707 ـ الفتح القسي، ٤٣٤.

708 ـ ن.م، ص ٤٥٤. مفرج الکروب، ٢٤٦/٢.

هێناو دەریا کردی بە زریانو لەوەش دڵنیا بووین کە دوژمن ئیدی لەپێگەکان ناداو لەبەر بەردەوامیو زۆری باران واز لە داگیرکاریو گەمارۆ دێنێ، ئەوجا سوڵتان لەشکرەکانی ئیزن دەدا بچنەوە بۆ وڵاتی خۆیانو پشوو بدەنو بحەسێنەوەو وڵاخەکانیشیان ماندووێتییان دەربچێ و بێنەوە سەر خۆیان "[709] هاتنی سەربازان بۆ مەیدانی شەڕو بەهاناچوونی لەشکری سەلاحەددینەوە، پاش تەواو بوونی زستانو پاشان گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی خۆیان لە سەرەتای زستاندا، ئەم هاتنو گەڕانەوەیە هەمیشەو بەردەوام ڕووی دەدایەوە .[710]

سەلاحەددین حەزی دەکرد ڕۆژانی هەینی شەڕی دووژمن بکا، چونکە جومعەی بە مژدەی سەرکەوتن دادەناو ئەم ڕۆژە لەناو موسوڵماندا پیرۆزەو ئومێدی سەرکەوتنی لێ دەکرێ، ئەمەش مانای ئەوە ناگەیێنی کە ڕۆژانی دیکەی پشت گوێ خستبێ، ئەو ڕۆژەی کە لە (ربیع الاخری ساڵی ٥٨٣ک)دا سوپای نارده شەڕەکەی (حطین)، ئەو ڕۆژە هەینی بوو، ئەمە خوایە دۆعای خوتبەخوێنان گیرا دەبێ و سەرکەوتنێکی باشتر دەزگیری دەبێ.[711] دیسان ڕۆژی هەینی بوو، کە سوپای سەلاحەددین شاری "عکا"ی داگیرکرد.[712]

غەزوکردنی قەڵاو قایمکارەکانی کەناراوەکانی باکوور، واتا، ئەوانەی دەوروبەری (أنطاکیة)، وەها ڕێکەوت "هەموویان بەڕۆژی هەینی گیران، کە بەنیشانەی قبوڵبوونی دوعای گوتارخوێنانو نوخشەی شادمانی سوڵتان لەقەڵەم دەدراو، ئەجری دووقاتی هەبوو".[713] وادیارە، ئەنجوومەنی جەنگی سەلاحەددین پلانەکانی بەجۆرێ دادەنا کە شەڕەکان بکەونە ڕۆژی هەینییەوە. مانای ئەمەش ئەوەیە، کە هەینی زیاتر دەروونی سەربازانی جۆش دەداو پتر بەرەو پیری کوشتارو مەرگەوە دەچوون. هەر ڕۆژی هەینی بوو، ڕێکەوتی (١٨ی جمادي الاولی ساڵی ٥٨٤ک/١٥ی تەمووزی ١١٨٨ز) کە موسوڵمانان قەڵاکەی کەناراوی نزیك (اللاذقیة)یان غەزو کرد.[714] شاری (اللاذقیة)شیان لە ڕۆژی هەینی (٢٥)ی هەر ئەو مانگەدا داگیرکرد. قەڵای قایمکاری (صهیون)ی ناوچەی حمص[715] لە هەینی (٢)ی (جمادی الاخره)و، قەڵای (بکاس)ی قەراخ چۆمی (عاصی)ی ناوچەی حەڵەب[716] لە هەینی (٩ی جمادي اللاخرة)و، قەڵای (الشغر)ی نزیك شاری (انطاکیة)[717] لە ڕۆژی هەینی (١٦ی جمادي الاخرة)و، (سرمانیة)ی دەڤەری حەڵەب[718] لە هەینیی (٢٣ی جمادي الاخرة/ ئابی ١١٨٨ز)دا غەزو کراون.[719]

ڕاستیشت دەوێ، نە سەرکەوتنو زاڵبوون، نە ڕاکردنو هەڵاتنو بەزین، هیچ کارێکیان بەسەر فلانە ڕۆژو فیسارە ڕۆژەوە نەبووەو نییە، بەڵام ڕۆژانی هەینی لەڕووی دەروونییەوە کاری لە سوپای سەلاحەددین دەکرد. خۆوەنەبێ تەنیا هەر لە هەینیدا سەرکەوتبن، نەخێر لە ڕۆژانی دیکەشدا سەرکەوتنیان بەخۆیانەوە دیوە. هەموو هەینییەکیش هەر سەرکەوتوو

---

709 ـ النوادر، ١٥٠ـ١٥١. الروضتین،٢/١٨٠.

710 ـ بەنموونە بنۆڕە : النوادر، ٢١١، ٢٣٠. الفتح القسي، ٤٧٢، ٤٩٥. الروضتین، ٢/٢٠٢.

711 – النوادر، ٧٥، الروضتین، ٢/٨٠. الکامل، ١١/٥٣٩.

712 – وفيات الأعيان، ١٧٥/٧. النجوم الزاهرة، ٣١/٦.

713 ـ النوادر، ٩٢. الکامل، ١٣/١٢. الفتح القسي، ٢٤٧. الروضتین، ٢/١٣٠. ابن العدیم، ٣/١٠٤.

714 ـ معجم البلدان، ٢/١٠٥.

715 ـ ن. م. ٣/٤٣٧.

716 ـ ن. م، ١/٤٧٤.

717 ـ ن.م،٣/٣٥٢.

718 ـ ن.م، ٢١٧.

719 الفتح القسي، ٢٤٦–٢٤٧. النوادر ،٩٢. الروضتین ٢/١٣٠. (کەچی دەبینین ـ القلقشندي ـ ڕۆژی سێشەمووان بە ڕۆژی تایبەتی جەنگ لەقەڵەم دەداو، ڕۆژی هەینی بە خەڵوەت و مارەبڕین دادەنێ. صبح الاعشى ٢/٣٦٧). هەرچی ابن منکلی ـ یە ئەوە ئەو دەڵێ: جەنگ لەڕۆژانی هەینیدا کەم ڕوودەدات، ئەگەر ڕووش بدات هەرگیز ناکوژێتەوە .. (مخطوط ـ التدبیرات السلطانیة ورقة/١٠)

نەبوونە، جاری واهەبووە لە هەینییدا تێکشکاون و هەڵاتوونە. ژێدەرو سەرچاوەکان باس دەکەن، دەڵێن، بەزین و ڕاکردنی سوپای سەلاحەددین لە (الرملة) لە ڕۆژی هەینیدا ڕووی دا، لە ڕۆژێکی هەینی (جمادي الاخرة)ی ساڵی (٥٧٣ك/کانوونی دووەمی ١١٧٧ز)[720]دا ئاڵاو خاچ و هێماو دروشمەکانی خاچدروشمان لە نیوەڕۆی ڕۆژی هەینیی (١٧)ی (جمادي الاخرة)ی[721] ساڵی (٥٨٧ك)دا لە سەر شوورەو بورج و تاوەرو منارەی مزگەوتەکانی هەڵدران و دەشەکانەوە.

**٤ـ هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلەکاندا :**

دیارە لە شەڕی ئاساییدا، هەندێ سەربازو جەنگاوەران، بەدیلی دەکەونە دەستی لایەنەکەی دی، ژمارەی دیلەکانیش بەپێی قەوارەی سوپا و ماوەی کەم، یان ماوەی درێژی شەڕەکە، یان بەپێی تاکتیکی پێڕۆکراو، یان بە پێی شەڕی بەربەرەڵڵا، یان شەڕی شوورەو قەڵاو قایمکار دەگۆڕێن و هەموو وەکو یەك نابێ. جاری وەهاش دەبێ، هەر هەموو جەنگاوەرەکان، بە هەموو دانیشتوانی شارە گەمارۆدراوەکەیشەوە، بەدیلی دەکەونە دەستی لەشکری سەرکەوتووی دوژمن، بەنموونە، وەك ئەو شارانەی وڵاتی شام کە گەلێ جار سوپای ئەیوبیان گرتوویانەو چوونەتە ناوی، یان وەك شاری (عکا)، کە لە ساڵی (٥٨٧ك/١١٩١ز)دا کەوتە دەست خاچدروشمان، یان وەك شەڕە بەناوبانگەکەی شاری (حطين) کە هەرچی خاچدروشمی تێدا بوو، هەموویان بەجارێ کەوتنە دەست سوپای سەلاحەددین. هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلە خاچدروشمەکاندا، لەهەموو بارێکدا، بەیەك پێودانگ و بەیەك سیستەم نەدەکراو نەدەسووڕا. ئەو هەڵسوکەوتە، جاری وەها هەبوو، بەپێی شێوازی زاڵبوون و سەرکەوتنەکە، جۆرێك بوو، جاری دیکەش بە پێی باری دەروونیی سوڵتان جۆرێکی تر بوو، نەخێر جاری وەهاش هەبوو، سوڵتان، ڕای بەرامبەر بەشێکیان جۆرێك بوو، بەرامبەر بەشێکی دیکەیان جۆرێکی تر بوو، هۆو هۆکاری دیکەش هەبوون، کە لێرەدا باسیان دەکەین.

ڕاستیشت دەوێ، کەسێ لەم مەسەلەیە بکۆڵێتەوە، سەری سووڕدەمێنێ کە چاوی بەو فەرق و جیاوازییانە دەکەوێ. هۆکاری ئەو فەرق و جیاوازییانەش ئەوەبووە، کە لە نێوان سوپای سەلاحەددین و خاچدروشماندا ڕێسا و دەستوورێك، بە فەرمیی نەبووە ئەو لایەنە دیار بکاو هەردوولا پابەند بکات، لەبەر ئەوە هەر لایەنەو خوای خۆی، دیلەکەی دەفرۆشت، یان دەیکرد بەبەندە، یان دەیخستە ژێر باری ئیش و کار، یان دەیکوشت، ئەوە کەیفی خۆی بوو، چی لێ بکردایە دەیکرد، بەڵام سەلاحەددین، هەرگیز بەلای تۆڵەسەندنەوە لە دیل و کوشتنی دیل و خوێن ڕشتنیدا، دای نەکێشاوە و حەزی پێ نەکردووە، هەرچەندیشە هەر خاچدروشمان تاوانبار بوونەو، ئەوان داگیرکەرو شەڕ فرۆش بوونەو، ئەوان لە دوور وڵاتانەوە هاتوونەتە سەر زەوی و زاری موسوڵمانان. دەگێڕنەوەو دەڵێن سەلاحەددین کوشتنی دیلی لە کوڕەکانی خۆی قەدەغە کردووە، تا فێری خوێن ڕشتن نەبن، چونکە لەوە دەترسا کە ئەگەر بەمنداڵی فێری خوێن ڕشتن بن، ئەوە کە گەورەش بوون، لەسەری دەڕۆن و، فەرق و جیاوازیش لە نێوان ئیسلام و کافردا ناکەن.[722] نەك هەر ئەوە بگرە، لەدوا نەخۆشییەکەشیدا. وەسیەتی بۆ(الملك الظاهر)ی کوڕی تەمەن بیست ساڵەی خۆی کرد، کە، نەکا، خوێن بڕێژێ.[723]

لێ مەسەلەی دیلان بڵێی بەردەوام بەو جۆرە بووبێ، نەخێر. جەنگێ خاچدروشمان ئاوریان هەڵایسان، هەند سەختو ستەم و ترسناك بوو، سوپای ئەیوبیانی ناچارکرد کە ئەمانیش ڕێگای توندوتیژیی بگرنەبەرو، مشتی ددان شکێنیان لەدەم بدەن و، جاروباریش ڕەفتاری ناشەرعیی و ناڕەوایان بەرامبەر بنوێنن.[724]

---

[720] ـ الروضتين، ج١، ق٢،ص٦٩٩. مفرج الكروب،٢/٥٨.

[721] ـ النوادر ،١٧١.الروضتين ٢/١٨٨.مفرج الكروب ٢/٣٦٠.

[722] ـ النوادر، ١٥٦. الروضتين،٢/١٨٣.

[723] ـ النوادر، ٢٣٨. Stevenson , P.207

[724] ـ قورئانی پیرۆز هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلەکاندا لەم ئایەتەدا دیاردەکا (فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنّاً بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ) (محمد: ٤) واتە: لەشەڕدا دوژمن بکوژن، تا بەسەریاندا سەردەکەون، ئەوجا دیلەکان بالّبەست بکەن، یان بە منەت بەریان بدەن، یانیش

داگیرکردنی (عکا) لەلایەن خاچدروشمانەوە، بەشی سۆزوبەزەیی تێدانەهێشتەوە، وای لە سەلاحەددین کرد ڕای خۆی بەرامبەر دیلەکانیش بگۆڕێو جۆرە هەڵسوکەوتێکی دیکەیان لەگەڵدا بکا. سەلاحەددین لە تۆڵەی هەزارەها سەربازی خۆی کە لەو شارەدا بە دیلیی کەوتنە دەست خاچدروشمانو ڕیشارد بەوپەڕی نامەردیی و دڵڕەقییەوە لەناوی بردن، ئەمیش لە تۆڵەی ئەوانەدا لەو ماوەیەدا دیلی بگرتایە دەیکوشت. کە لەمەودوا باسیان دەکەین.، ئیدی لەو ڕۆژەوە سەلاحەددین سوێندی خوارد هەر کەسێکی لەوانەی(عکا) دەست بکەوێ، بیکوژێ.[٧٢٥]

وەنەبێ، دیلی خاچدروشمانیش بەر لە تێکشکانەکەی (عکا) نەکوژرابن، یان دیلی دوای ئەو شەڕە هەر هەموویان کوژرابن. بەشێوەیەکی گشتی دیلەخاچدروشمەکان، هەر گرووپەو بەجۆرێ هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرا، بەشێکیان دەکەوتنە بەر بێگار (السخرة)، بەشێکیان لە دیمەشق دەست بەسەر دەبوون، هەبوو دەفرۆشراو، هەشبوو دەکوژران. ڕاستییەکەشی ئەوەیە، کە سەلاحەددین دەربارەی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دیلەکاندا، هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ڕەفتاری فەرماندارو سەرۆکەکانی پێش خۆیدا نەبووە. لێرەدا هەندێ پێویستیمان بەگێڕانەوەو باسکردنی ڕووداوەکانی مێژوو نییە، ئەوەندەمان بەسە بڵێین، نورەدین مەحمود، کە سەلاحەددین پێڕۆی هەمان ڕەفتاری ئەوی کردووە، دیلەکانی بەهەندێ بیانوو بۆنەوە دەکوشتن. بەنموونە، نورەددین مەحمود کە لە ڕووداوەکەی ساڵی (٥٥٢ك/١١٥٧ز)دا دیلەکانیان هێنایە بەردەستی، فەرمانیدا لەملیان دەن.[٧٢٦]

نورەددین مەحمود، گەلێ جار حەپسی دەکردن، بەتایبەتیش فەرماندە گەورەکانیان، بەنموونە وەك، (أرناط) "ڕینۆدی شاتیون" سەرگەورەی (أنطاكية)، پاشانیش سەرگەورەی (الكرك)، ئەوەبوو، نورەددین پازدە ساڵ حەپسی کرد، پاشان دوای مردنی نورەددین، میرێ لەمیرەکانی خۆی (مير كشتكين) هەستا لە ڕقی سەلاحەددین، لە حەپسی دەری هێناو بەرەڵای کرد. پاراستنی گیانی دیلەکان. نەخاسمە میرەکانیان.، بۆ ئەوەبوو، لەکاتی پێویستدا لەگەڵ دیلەکانی خۆیاندا ئاڵوگۆڕیان پێ بکەن. نورەددین مەحمود زۆر بەتەنگەوە بوو دیلی موسوڵمانان ڕزگار بکات، سا، بەئاڵوگۆڕ بێ، یان بەسەرانەو بەپارە، بەتایبەتیش دیلە مەغریبییەکان، چونکە ئەوان نە خەڵکی شام بوونو نە کەسوکاریشیان لەشامدا هەبوو، مەغریبییەکان هەژارو داماوو بێ کەس بوون.(إبن جبير) دەڵێ: دیلە مەغریبییەکان، لەشام، گیانێکیان بەوەبوو، مەلیكو حوڵەمەندانی شام، هەموو جارێ بڕێ پارەیان لە کیسەی خۆیان دادەنا بۆ کڕینەوەی دیلە مەغریبییەکانو ڕزگارکردنیان، کاتێکیش نورەددین مەحمود لەنەخۆشییەکەی چاك بووەوە، پارەی نارد بۆ کڕینەوەو ڕزگار کردنیان.[٧٢٧]

سەلاحەددینیش سووربوو لەسەر پێڕۆکردنی ئەو ڕێساو دەستوورەی نورەددینو چاوی لەنورەددین دەکرد. هەمیشە دیلە خاچدروشمە هەژارەکانیشی هەروا بە خۆڕایی بەرەڵا دەکرد، وەك ئەوەی لە گرتنی شاری (بيت المقدس)دا کردی. سەلاحەددین دیلە موسڵمانەکانی خۆیانی بە پارە دەکڕینەوەو لە ئەسارەتی دوژمن ڕزگاری دەکردن، چونکە خۆی بە بەرپرسی پاراستنی ژیانی جەنگاوەرەکان دەزانیو ئەو ئیشەشی بە ئەرکی سەرشانی خۆی دادەنا.

سەلاحەددین، بە کڕینەوەو ڕزگارکردنی سەربازە دیلەکانی خۆی لە چنگی دوژمن، هێزێکی بەندکراوی بە مردوو حسابکراوی لە چنگی دوژمن ڕزگاردەکردوو دەیکردنەوە بە گژ دوژمندا، جگە لەوە ئەو کارە کارێکی خێرو لەخوا ترسی بوو، لەبەرئەوە هەندێ لە میرەکانیشی چاویان لێ دەکردو وەکو سوڵتان ڕەفتاریان دەکرد، دەگێڕنەوە دەڵێن: (مظفرالدين كوكبري)ی سەرگەورەی (أربيل)، زاوای سەلاحەددین، ساڵی دووجاران زەلامی بە پارەی زۆرەوە دەنارد بۆ

بەسەرانە، تا جەنگەکە تەواو دەبێ. .. الطبري، مجمع البيان في تفسير القرآن، طبع ونشر دار الفكر، بيروت ١٩٥٥، ط٢، ج٢٦، ص٣٠، (الفداء) بەرەڵاکردنی دیلە بەپارەو پاداشت، یان بە دیل گۆڕینەوە.

[725] ـ الكامل، ٦٩/١٢.

[726] ـ ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق، ص٣٣٩. الروضتين، ج١، ق١، ص٢٦٩.

[727] ـ ابن جبير، ٢٨٠.

وڵاتی کەناراو (شام)، بۆ کڕینەوەو ڕزگارکردنی دیلە موسڵمانەکان لە دەستی خاچدروشمان[728] (سبط ابن الجوزي) دەڵێ: پارە و خەزنەی (أربيل) بە دیل کڕینەوە تەواو بوو، ئەم مێژوونووسە وەهای دەقەرسێنێ کە (کوکبري) نزیکەی شەست هەزار دیلی پیاوو ژنی لە جەنگی خاچدروشمان کڕیوەتەوە.[729]

لە باسی هەڵسوکەوتی چاکو مرۆڤانەی سەلاحەددین لەگەڵ دیلە خاچدروشمەکاندا، دەگێڕنەوە دوای بۆسەنانەوەکەی شەووالی ٥٨٦ك/ زستانی ١١٩٠ز، کە سەربازانی سەلاحەددین بۆ دوژمنیان نابووەوەو تێیدا سەرکەوتن، کۆمەڵێ دیلی خاچدروشمیان هێنایە ناو ئەنجومەنەکەی سەلاحەددین، کەچی سەلاحەددین لەگەڵیان کەوتە چاکیو چۆنیو، بەسۆزەوە حاڵو ئەحواڵی ژیانیانی لێ دەپرسین، سەیری کرد، یەکێ لەسەر گەورەکانیان وا لەسەرمانا دەلەرزێ، ئەویش دەستبەجێ کەوڵەکەی خۆی لەشانی کردەوەو دای بە شانی ئەودا، ئەوجا فەرمانیدا هەریەکەو کەوڵێکیان بدەنێ، پاشان خۆراکیان بۆهێنانو نانیان خوارد. ئنجا فەرمانی دا دەوارێکیان لە شان چادرەکەی خۆیەوە بۆ هەڵدەن، هەموو جارێکیش شتی پێ دەدان، ڕێزی لێ دەگرتنو جاروباریش فەرماندەرەکەیانی بانگ دەکرد، لەگەڵ خۆی نانی دەخوارد، پاشان فەرمانی دا باڵبەست بکرێنو ببردرێن بۆ دیمەشق، لەوێش ڕێگای پێ دان نامەونامەکاریی لەگەڵ برادەرانی خۆیان بکەنو پێداویستیو کەلوپەلیان لە سەربازگەکانی خۆیانەو پێ بدەن.[730]

ڕووداوێکی دیکەی هەڵسوکەوتی مرۆڤانەی سەلاحەددین ئەوەبوو، کە لە ساڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز) دا، چلو پێنج نەفەری خاچدروشمیان لەبەیروتەوە بۆ هانی، پیرێکیان تێدا بوو "خڕێی لەدەمدا نەمابوو"، سەلاحەددین بە تەرجومانی گوت لێی بپرسێ بەم تەمەنەوە بۆچی هاتۆتە ئێرە؟ کابرای پیر وەلامی دایەوە، ئەوجا سوڵتان "گەلێ گەلێ بەزەیی پێیداهاتەوەو دڵی بۆی نەرم بوو، دەستی گرت (خێری پێ کرد) و بەرەڵلای کردو فەرمانیشی دا بە سواری ئەسپ بیگەڕێننەوە بۆ ناو سەربازگەی دوژمن"،[731] بەلام سەلاحەددین لەو دیلانەی کە دڕندەییو خوێنڕێژیو پیاوخراپیی زۆریان کردبوو تۆڵەی لێ دەسەندنەوە، تاوانەکانیان هەند سەخت بوو، بە خوێن نەبوایە نەدەشۆردرایەوە، لەبەرئەوە دەیانی کوشتو بەرلە کوشتنیش ئەوەی خراپ بوایە پێیانی دەکرد. کاتێکیش (أرناط) هێرشێکی لە دەریاو لەسەر وشکانیشەوە بە نیازی داگیرکردنی شاری مەککە ڕێکخست، کەشتیگەلی ئەییوبی لێیان ڕاپەڕینو ڕاویاننان، پاشان دەستگیرو باڵبەستیان کردنو بەرەو میسر پێش خۆیاندانو دوانیشیان لێ ناردن بۆ (منى) کە لەوێ وەك قوربانی سەریان ببڕن.[732] ئەم ڕووداوە لە ساڵی (٥٧٨ك/ ١١٨٢ز) دا ڕووی داوە، وەك (إبن جبير)ی گەڕۆکیش باسی دەکا، کە لەوکاتەدا گەیشتووەتە شاری ئەسکەندەرییەو لەوێ بە چاوی خۆی دیویێتی، وا کۆمەڵێ خەڵك هاتوونو خڕبوونەتەوە بۆ سەیرکردنی دیلەکان کە پشتاو پشت سواری حوشتر کراونو بە تەپڵو شەیپوور منداڵانیان لێ گاڵ دەدەن و گاڵتەو سووکایەتییان پێ دەکەن.[733]

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەڵسوکەوتی خراپە لەگەڵ دیلە خاچدروشمەکاندا، تەنیا دوای شەڕی (عكا) نەبووە، بەڵکو ئەو دیلانەیشی گرتووەتەوە کە بەرلە داگیرکردنی ئەم شارە کەوتوونەتە دەست سوپای ئەییوبی، بە نموونە لە یەکەم پێکدادانی نێوان هەردوولادا کە لە (الرملة) بە دۆڕاندنی ئیسلام کۆتایی هات،. وەك لەوەوپێشیش باسمانکرد، سەلاحەددین لە داخانا فەرمانی دا لەسەری ئەو هەموو خاچدروشمانە بدرێ، کە لە نزیك عەسقەلانەوە بە دیل

---

728 ـ القزويني، آثار البلاد، ص٢٩٠.

729 مرآة الزمان ٦٨٢/٨.

730 النوادر، ١٥١. بنۆڕە: مفرج الكروب، ٣٤٥/٢.

731 ـ النوادر، ١٥٦.

732 ـ الكامل، ١١/ ٤٩١. ابن جبير ٣٥. مرآة الزمان، ٨/ ٣٦٩. الروضتين، ٣٧/٢. مفرج الكروب، ١٢٨/٢. السلوك، ٧٩/١. الخطط، ( ط، بولاق)، ٨٦/٢.

733 ابن جبير، ٣٤.

گیرابوون.[734]

له (ربیع الآخری ساڵی ٥٧٤ك/ ئەیلولی ١١٧٨ز)دا، شتێکی دیکەی لەو بابەتە دیسان ڕووی دایەوە، ئەوەبوو، کۆمەڵێکی فەرەنگ هێرشیان بردە سەر شاری (حماه)، میر (منکورس بن خمارتکین)ی پێشەنگی سوپای ئەییوبی لێیان هاتەدەستو پێشەنگەکانیانی بە دیل گرتو باقیمەنیانی کوشت. ئەوجا دیلەکانی هێنایە لای سوڵتان، سوڵتان فەرمانی دا لە ملیان بدرێو درانە دەست سۆفی و دەروێشەکانی ناو لەشکری ئەییوبی.[735] لە(مرج عیون)و لە بەرایی ساڵی(٥٧٥ك/هاوینی ١١٧٩ز)دا سوپا بەسەر خاچدروشماندا سەرکەوتو گەلێکی لێیان بەدیل گرت، کە ژمارەیێ گەورە فەرماندارانیشیان لە نێودا بوون. وەك: پێشەنگی (داویة)و پێشەنگی (اسبتاریة)و، سەرگەورەی (طبریة)و براکەیو، سەرگەورەی ناوچەی (الجلیل)و، (بلدوین بن بارزان)ی سەرگەورەی (الرملة)و سەرگەورەی (الجنین)و کوڕەکەی، سەرگەورەی (مرقیه)و گەورەپیاوانی دیکەش. جگە لە وانە، ژمارەیەکی زۆری سوارچاکانی قودسو عکاو بارۆنیەکانیشیان لەگەڵدا بوونو، سەرجەم نزیکەی دووسەدو حەفتا دیل دەبوون. سوڵتان فەرمانی دا ببرێن بۆ دیمەشق. ئیدی دوای نزیکەی ساڵێك، دیل بەدیل کرا، بەتایبەتیش گەورە فەرماندارانی گرتەوە.(ابن بارزان) تەنیا، بۆ خۆی، سەدو پەنجا هەزار دیناری وێنەدار(صوریە)ی داو سەرباری ئەوەش هەزار دیلی موسوڵمانیش ئازاد کران.[736]

(الفقیه ضیاء الدین عیسی الهکاري) کە لە تێکشکانەکەی ساڵی (٥٧٣ك/١١٧٧ز)ی (الرملة)دا بەدیل گیرا بوو، ئەویشیان ئازاد کرد، چونکە سەلاحەددین سووربوو لەسەر ئازادکردنیو، سەرگەورەی (الجلیل)یش بە پەنجاو پێنج هەزار دینار ئازاد کرا. هەرچی پێشەنگەکەی (الداویة)یە، واتا (أود) ئەوە، لە بەندیخانەدا مرد، خاچدروشمان داوای لاشەکەیان کردەوە، بەمەجێ ئەوانیش یەکێ لە پێشەنگە دیلەکانی سوپای ئەییوبی ئازاد بکەن.[737]

بێگومان وەرگرتنی ئەو هەموو پارەیە بە ئازادکردنی دیلە موسڵمانەکانیشەوە، زۆر باشترە لەوەی کە بێنی دیلە خاچدروشمەکان بکوژیو هیچت دەست نەکەوێ.

لەو ساڵەدا بوو کە سوپای ئەییوبی قەڵاکارەکەی (بیت الاحزان)ی کاول کردو[738] خاچدروشمێکی زۆریشی بە دیل گرت، ئەوە بوو "دیلەکانیان هێنایە لای سوڵتان. ئەوەی هەڵگەڕابووەوە ئەوەشیان کە تیرەنداز بووە، سوڵتان لە ملی دان. توانیشی زیاتر لە سەد دیل ڕزگار بکا. هەرچی دیلەکانی دیکەیە، ئەوە هەموویانی نارد بۆ دیمەشق[739]، وەکو باسیشمان کرد دیمەشق بوو بوو بە مۆڵگەو داڵدەی دیلەکان، سەرەڕای ئەوە بووشبوو بە ناوەندی بزاڤی هێزەکانی سەلاحەددین، چونکە دیمەشق نزیك بوو لە بەرەکانی شەڕو بەسانایی دیلەکان دەبردران بۆ ئەوێو ئاسانیش دەهێنرانەوە بۆ ئاڵوگۆڕ.

گەورەترین دیلی بەکۆمەڵ، ئەوەبوو لە شەڕەکەی (حطین)دا دەستگیرکران بە فەرماندەکانیشیانەوە. هەر ئەوەندەی فەرماندەکانیان لەبەرزاییەکانی (حطین)دا شکان، ئیدی موسوڵمانان بۆیان سەرکەوتنو چادرە سووری شاکەشیان خستە زەویو سەر لەبەریان بەدیل گرتنو شایەکەشیان (جي لوسینیان)و براکەیو (أرناط)ی لە ئیسلام داخ لەدڵو، سەرگەورەی جبیل، پێشەنگی (الداویة)ش، کە لە هەموو فەرەنگەکان بەشانو شەوکەتتر بوو، ئەمانە هەموویان بەدیل گیران. کۆمەڵێ لە ئەندامانی تیپی (الداویة)و (اسبتاریة)ش بە دیل گیران، بەڵام هەر لەوێ هەموویان کوشتن.[740]

---

734 الروضتین، ج١، ق٢، ص٧٠، مفرج الروب، ٥٩/٢.

735 سنا البرق الشامي، ٣٠٨/١. مفرج الکروب، ٧٠/٢- ٧١.

736 - دیناری وێنەدار (صوریە): (القلقشندي) دەڵێ: ئەم دینارە لە وڵاتی فەرەنگو ڕۆمەوە دەهێنن، کێشەکەی دیار کراوە، ڕوویەکی ڕەسمی شایەکی لەسەرەو ڕوویەکەی تری ڕەسمی (بطرسو بولس)ی لەسەرە.

737 - سنا البرق الشامي،٣٢٨/١-٣٢٩. مضمار الحقائق، ١٨/١٧. الروضتین، ٨/٢-٩. البدایة والنهایة، ٣٠٢/١٢. السلوك، ٦٨/١.

738 سنا البرق الشامي، ٣٣٣/١- ٣٣٦. مضمار الحقائق، ٢٤- ٢٥. الکامل، ٤٥٥/١١. مفرج الکروب، ٨٢/٢.

739 الروضتین، ١١/٢، مفرج الکروب، ن. ص.

740 الکامل، ٥٣٧/١١. النوادر، ٧٨.

نەك هەر ئەوە، بگرە جاریشی دا، کە هەرکەسێ زەلامێکی لە (الداوية) یان لە (اسبتاري) بۆ بهێنێ پەنجا دیناری خەلات دەکا، ئەوانیش دەستبەجێ دووسەد کەس لەو دوو تیپەیان بۆ پەلکێش کردو ئەویش فەرمانیدا، بدرێنە دەست فەقێو مەلاو سۆفییان، تا لەملیان بدەن.[741] نامەی بۆ جێگرەکەی خۆیشی لە دیمەشق، (الصفي بن القابض) نووسی، هەرکەسێکی لەم دوو تیپە بەرچاوکەوت و قایل نەبوو ببێ بە ئیسلام، لە ملی بداو بیکوژێ، جێگرەکەشی فەرمانەکانی بەجێ هێنا. (ستیڤنسن) دەڵێ: گومانی تێدا نییە، سەلاحەددین دیلی کوشتووە، بەلام نازانین بۆچی هەندە رکی لەم دوو تیپە بووە.[742] وەلێ، وەلامی پرسیاری ئەم مێژوونووسە، ئەوەیە، سەلاحەددین بۆیە لەم دوو تیپە بەرك بووە، چونکە ئەو دوو تیپە، لە موسوڵمانان زۆر پڕ بوون و داخ لە دڵی بوون و، ئازاو بەجەرگیش بوون.[743]

جگە لەوە، لەهەموو فەرەنگەکانیش بە شان و شەوکەتربوون.[744]

دوای تێکشکانی دوژمن لە (حطين)، هەموو جەنگاوەرانی خاچدروشم بەدیل گیران. ئەوجا، سەلاحەددین فەرمانی دا، دەوارێکی گەورەی بۆ هەڵدەن. لەژێر ئەو دەوارەدا، خۆیو گەورە فەرماندارانی سوپاکەی دانیشتن وچانێك بدەن و کەمێ بحەسێنەوە. سەرکردەو پێشەوا خاچدروشمەکانیش، بانگ کران دابنیشن، تینوێتی برستی لێ بڕیبوون. سوڵتان، مەلیك و جفریی، برای مەلیکی لای خۆیەوە دانان، (أرناط)یشیان لەگەڵدابوو. سەلاحەددین داوای ئاوی ساردی کرد.[745] دای بەمەلیك، مەلیك لێی خواردەوەو باقیمەنی ئاوەکەی دابە (أرناط)و ، (أرناط) ئاوەکەی نا بەسەریەوە (خواردییەوە). سوڵتان بەم بەبێ ئیزنی ئاو خواردنەوەیەی (أرناط) چاوی چووە پشتی سەریو زۆر تورە بوو، گوتی:"ئەم نەعلەتییە بە ئیزنی من ئاوی نەخواردووەتەوە، تا دەخالەتی لێ قبولْ بکەم.[746] دەستووری موسوڵمانانیش وا بووە، دیل ئەگەر نان و نمەکی کردن و ئاویانی خواردەوە، ئەوە، ئیتر دەخالەتی قبولْ کراوە، مەبەستی سوڵتانیش لەو قسەیەی ئەوەبوو کە (أرناط) هێشتا دەخالەتی قبولْ نەکراوە، با، ئاوەکەشمانی خواردبێتەوە. ئەوجا سوڵتان دەستی کرد بە قسە پێ گوتنیو تاوانەکانی دایەوە بە چاویداو غەدرو غودورەکانی یەکە بە یەکە بۆ باس کرد. ئەوجا ڕووی لە دانیشتوان کردو گوتی: دوو جاران بڕیارم دابوو دەستم بکەوێ بیکوژم، جاری یەکەمیان لەبەر ئەوە بوو کە ویستی بچێتە سەر هەردوو (حەرەمی پیرۆز)و سوکایەتی بە پێغەمبەر (ﷺ) کردووەو بەموسوڵمانانی گوتووە (دەبڕۆن بە محمد بڵێن با بەهاناتاندا بگات).[747] جاری دووەمیشیان لەسەر ئەوەی ئەو کاروانەی تالان کردووە کەلە میسرەوە دەهات، ئنجا سوڵتان ڕووی کردە (أرناط)و پێی گوت "فەرموو ئەوا من بەرەڤانی لە محمد دەکەم" پێی وت: شایەتمان بێنەو ئیسلام بە، (أرناط) قایل نەبوو، ئیدی سەلاحەددین لەسەر ئەو ڕکە قەمەکەی لەکالان هەڵکێشاو یەکسەر شانێکی داتەکاندە خوارەوەو زەلام تێی وروکان و تەواویان کردو لاشەکەیان بەکێش کردو لەدەرەوەی دەوارەکە فڕێیان دا.[748] مەلیك کە ئەوەی دی بەجاری زارەترەك بوو، تۆقی، وای دەزانی سوڵتان ئەویش بەو دەردە دەبات. بەلام سوڵتان دڵنیای کردەوەو ترسی ڕەواندەوەو گوتی: دەستوور

---

741 ـ الفتح القسي، ٨٦. الكامل.١١/٥٣٨. الروضتين، ٧٩/٢. مفرج الكروب، ١٩٦/٢.

742 ـ Steven son, P.248

743 ـ الكامل، ٢٢/١٢. الروضتين، ٧٩/٢. مفرج الكروب، ٢٧٣/٢. العليمى، الانس الجليل بتأريخ المقدس و الخليل (ط. النجف ١٣٨٨ك/١٩٦٨ن) ٣٢٢/١.

744 ـ الكامل، ٥٣٨/١١.

745 ـ الجلاب، في النوادر، ٧٨ـ

746 ـ الكامل، ١١/ ٥٣٧. النوادر، ٧٨. الفتح القسي، ٨١. مرآة الزمان، ٣٩٤/٨. الروضتين، ٧٩/٢. مفرج الكروب ١٩٤/٢. الأنس الجليل، ٣٢٢/١. شفاء القلوب، ١٢١، ابن المعبري، تأريخ الدول السريانى مجلة المشرق ، ج٤، ٥. ص٤٤٥.

747 ـ مفرج الكروب، ١٩٢/٢. زبدة الحلب، ٩٦/٣. الأنس الجليل ٣٢١/١.

748 ـ النوادر، ٧٩. الفتح القسي، ٨١. مرآة الزمان، ٣٩٤/٨. الروضتين، ٧٩/٢. مفرج الكروب، ١٩٥/٢. وفيات الأعيان، ١٧٧/٧. زبدة الحلب، ٩٦/٣. شفاء القلوب، ١٢١.

وانییه مەلیك مەلیك بكوژێ، بەڵام ئەم كابرایە زۆر پێی لێ ڕاكێشا ئەوەی بوو، خەتای خۆی بوو.[٧٤٩]

ژمارەی دیلەكانی (حطین)و ژمارەی كوژراوەكانیان هەند زۆر بوو "كەسێ كوژراوەكانی دیتبا وایدەزانی كەس بەدیل نەگیراوەو نەماوە.گەر دیلەكانی دیتباوەی دەیزانی كەس نەكوژراوەو هەموویان بەدیل گیراون."[٧٥٠] سەربازەكانی سوڵتان دیلەكانیان لە گوریسی درێژ دەبەستن. (العماد الكاتب) سوارێكی دیت، سی تا چل دیلی لەیەك گوریس بەستبوو، پێش خۆی دابوون. لەیەك جێگەشدا، سەد تا دووسەد دیلی دیت، تەنیا یەك پاسەوانیان لەگەڵدا بوو.[٧٥١]

ژمارەی دیلەكان بەسی هەزار دیل دەقەرسا.لەبەر ئەوە، دیل كەوتە بێ بازاڕی‌و نرخی لە بازاڕدا تەواوێ دای لە كزی‌و، لە بازاڕی دیمەشق نرخی دیلێك هاتە سەر سێ دینارو، خاوو خێزانێكی تەواویش، یەكجار هەڕاج دەكرا، پیاوێك‌و ژنێك‌و پێنج منداڵیان بە هەشتا دینار فرۆشران. ئیدی نرخی دیل هەند داكێشا، بەجۆرێ، دیلێكت دەكڕی بە نەعلێ.[٧٥٢]

بەڵام ئیسلامەكان خراپەیان لەگەڵیان نەدەكرد، هەروەها هیچ زەرەرێكیان لە دیلەكانی ئەو شارانەش كە سوپای ئەییوبی دەچووە ناویان، نەدەدا. لە شاری قودس، كەسێ ئەو برە پارەیەی لەسەری دانرابوو، نەدابا، ئەوە، بەدیل لە قەڵەمیان دەدا. سەلاحەددین سەرانەی لەسەر دانابوون، سەرانەی پیاوێ دە دینار بوو، سەرانەی ژنێك پێنج دینار بوو، سەرانەی هەر منداڵێكیش دوو دینار بوو.[٧٥٣] هەژارو دەوڵەمەندیش لەم سەرانەیەدا فەرق‌و جیاوازییان نەبوو.[٧٥٤] ماوەی پارەدانەكەش چل ڕۆژ بوو، ئەگەر بهاتباو، لەو ماوەیەدا سەرانەكەیان نەدابا، ئەوە، لەو بارەدا دەكران بەدیل. ڕاستیشت دەوێ، خاچپەرستی هەژارەكان نەیانتوانی پارەكە بدەن‌و، سەرانەكەیان بۆ هەڵنەسوڕا، لەبەر ئەوە هەواڵەی داڵدەكانی دیمەشقیان كردن، بەڵام فەرماندەو دەوڵەمەندانیان هەندێ لەو هەژارانەیان بە پارە بەرەڵڵا كرد. (بالیان كوڕی بارزان) هەژدە هەزار دیلی خاچپەرستی بە سی هەزار دینار ئازاد كردو، سەلاحەددین بەو برە پارەیە قایل بوو.[٧٥٥]

هەندێ لەفەرماندارانی سوپای ئەییوبییش، گەلێ جار ژمارەیێ دیلیان بەردەداو بێگارییان پێ دەكردن. جاری وەهاش هەبوو هەندێ لە میرەكان، خۆیان دەكرد بە خاوەنیان‌و داوای بەردانیان دەكرد، بەنموونە، (مظفر الدین كوكبري) سەرگەورەی (حران‌و رها) داوای لە سوڵتان كرد، پێنجسەد ئەرمەنیی بۆ بەربداو، گوتی، ئەو ئەرمەنییانە خەڵكی شاری (رها) نەو، بۆ پەرستش‌و حەج هاتوونەتە قودس‌و لەوێ بەدیل گیراون. سەلاحەددین بۆی جێ بەجێ كرد.[٧٥٦] ئەوجا نۆرە هاتە سەر (الملك العادل)، ئەو ژمارەیەكی زۆری لێ ئازادكردن.[٧٥٧]

كاتێكیش هێزەكانی سەلاحەددین گەیشتنە ئەوپەڕی باری سەركەوتن، ئیدی ڕۆژ بە ڕۆژ، شكان‌و نووشووستی بە ئاشكرا بەدی دەكرا، بەتایبەتیش لەو ڕۆژەوەی كەلە گرتنی شاری (صور)دا، بۆڕی خواردو بەزی، شاری (صور) بووبووە هێڵی نێوان دوو قۆناغ. دوا بەدوای ئەوانەش موسوڵمانان، لە (عكاو أرسۆڤ) تێكشكان‌و، لە یافاش پاشەكشەیان كرد.

---

[749] ـ النوادر، والروضتين، ومفرج الكروب، وشفاء القلوب، نفس الصفحات. الذهبي، مخطوط، تأريخ الاسلام، ق١، ج/ الأخير، ورقة ٧ب، الأنس الجليل ٣٢١/١.

[750] ـ الروضتين، ٧٨/٢. مفرج الكروب، ١٩٣/٢. الذهبي، نفس الورقة.

[751] ـ الفتح القسي، ٨٣. النوادر، ٧٧. الروضتين، ٧٨/٢. وفيات الأعيان، ١٧٦/٧. شفاء القلوب، ١٢٠، الذهبي، ورقة ٨ب.

[752] ـ الروضتين، ٨٢/٢. الذهبي، ورقة ٨/أ.

[753] ـ هەندێ سەرچاوە دەڵێن، یەك دینار بووە، النوادر ٨٢.

[754] ـ الفتح القسي، ١٢٧. الكامل، ٥٤٩/١١. الروضتين، ٩٥/٢. مفرج الكروب، ٢١٤/٢. السلوك، ٩٦/١. الانس الجليل، ٣٢٨/١. (تەنیا ـ أحمد بن أبراهيم الحنبلي ـ دەڵێ: سەرانەی پیاو دە دینار بووە. بیست دیناریش گوتراوە. ئەوەش گوتراوە كە سەرانەی ژن پێنج دینار و مێردمنداڵ یەك دیناروبەندەی ژن و منداڵێكی، یەك دینار بووە). شفاء القلوب، ١٢٨. ئەم سەرچاوەیەیان دوا سەرچاوەیەو پشتی پێ نابەسترێ.

[755] ـ الروضتين ٩٥/٢. مفرج الكروب، ٢١٥/٢.

[756] ـ الروضتين، ٩٥/٢. مفرج الكروب، ٢١٥/٢.

[757] ـ الروضتين، ن. ص.

ئەو هەموو ڕووداوانە، وای کرد سەلاحەددین هەڵسوکەوتی خۆی بەرامبەر دیلەکان بگۆڕێ، چ ئەو دیلانەی سەربازەکانی ئەیوبی دەیانڕفاندن، چ ئەو دیلانەی لەبەرەکانی شەڕدا دەگیران.

لە یادداشتە ڕۆژانەکانی (إبن شداد)دا، کە خۆی تا دواهەنگاو لەگەڵ سوپای سەلاحەددیندا بووەو ڕۆژانە دەینووسی و بە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی دادەنێین، دەڵێ: لە شەڕە بەناوبانگەکەی (عکا)دا کە لە (٢٠)ی (جمادي الاخرەی ساڵی ٥٨٦ك/ئابی ١١٩٠ز)دا، ڕووی داوەو بە شەڕی (العادلیة) بەناوبانگەو، سوپای سەلاحەددین تێیدا سەرکەوتووە، مێژوونووسەکە، واتا (إبن شداد) دەڵێ: مەگەر بەدەگمەن یەك دوژمن لەو شەڕەدا دەربازبووبێ. (إبن شداد) بەسواری وڵاخەکەیەوە، بەناو خوێناوی خاچدروشماندا ڕۆیشتووەو ویستوویەتی کوژراوەکان بژمێرێ، لەبەر زۆریی لاشەکان بۆی نەژمێردراوەو، دەڵێ: لەناو خاچدروشمەکاندا تەنیا چوار ئافرەت هەبوون، دوانیان جەنازەکانیان لەوێ کەوتبوون، دوانەکەی دی بەدیل گیرابوون، هەرچی پیاوەکانە، ئەوە، ژمارەیەکی کەمیان بەدیل گیرابوون، سوڵتان فەرمانی دا بکوژرێن.[758] دیسان لە شاری (عکا) موسوڵمانان بە سوارەو پیادەوە، لەژێر فەرماندەیی هەردوو گەورەمیران، (بهاء الدین قراقۆش)و (ابوالهیجاء لهذباني)دا، بەدەرکەوتن‌و لەپڕ پەلاماری دوژمنیان داو، تێیان کەوتن‌و گەلێکیان لێکوشتن‌و گەلێکیان لێ بەدیل گرتن. ژمارەی کوژراوان خۆی دا لە حەفتاو، لەناو دیلەکاندا فەرماندارێکی پلەبەرز هەبوو، خاچدروشمان هاتن سۆراخیان دەکرد، تا بزانن ماوە، یان کوژراوە. کاتێ موسوڵمانان بەم کابرایەیان زانی، دەستبەجێ کوشتیان‌و بە پارەو پووڵی دوژمن قایل نەبوون‌و بەزیندووی بەرەڵایان نەکرد، پاشان لاشەکەیان بۆ فڕێدان، "دوژمنان لە داخانا خۆیان لە زەویدا گەوزان‌و خۆڵیان بەسەرو گوێلاکی خۆیاندا دەکرد". ئەم ڕووداوە کاری لە بزاڤو چالاکییان کردو ورەی پێ بەردان.[759]

جارێکیان، هەردوو لایان، هەریەکەو دیلێکی ئەوی تری ئاگر تێبەرداو سووتاندی. لەکاتێکا، ئەوە ڕوویدا کە زەلامێکی زۆری دوژمن هاتبوونە گوێ ڕووبارەکەی(عکا)، لەناکاو چەرخەچییەکانی سوپای سەلاحەددین لێیان ڕاپەڕین‌و، بوو بە شەڕ، خاچدروشمان چەرخەچییەکیان بەگیر هێناو بەدیل گرتیان‌و کوشتیان، پاشان سووتاندیان. سەربازەکانی سەلاحەددینیش نەیانکردە نامەردی، دیلێکی ئەوانیان لەکن بوو، ڕایانکێشاو کوشتیان، ئەوجا. وەك ئەوان. ئاگریان تێبەرداو سووتاندیان، هەردوو مێژوونووس (العماد الکاتب)و[760] (إبن شداد)[761]، هەردوو ئاگرەکەیان چاو لێبووە کە لە هەمان کاتدا بڵێسەیان بە ئاسماندا دەچوو.

کوشتن‌و شێواندنی لاشەی دیلە ئیسلامەکان، بەلای خاچدروشمانەوە کارێکی ئاسایی بوو، خوویان پێوە گرتبوو، بەڵام هیچ دیلێکیان بەدەردی دیلەکانی (عکا) نەبردبوو، کاتێ شارەکەیان گرت، ئەوەبوو نزیکەی سێ هەزار موسوڵمانی دیلیان کوشت، هەر هەموویان لە گوریس قایم کردو، بەفەرمانی (ڕیشارد)ی شێردڵ، یەك دەست پەلاماریاندان‌و بە تیغو شمشێر کوشتیانن، چەرخەچییەکانی سوپای ئیسلامیش هەند ورەیان بەردابوو، بەچاو سەیریان دەکردن‌و هیچیان بۆنەدەکراو بەهانای کەسیانەوە نەچوون. موسوڵمانانیش خەم دایگرتن‌و. وەك إبن شداد دەڵێ. موسوڵمانیان نەهێشت، تەنیا ئەو زەلامانە نەبێ کە هێزی کارکردنیان تێدا مابوو و بۆ سوخرەکێشی لەبار بوون‌و ئیشیان پێ دەکردن.[762]

ئەم قەسابخانەیە، تینی بۆسەلاحەددین هێناو، کاری لەدەروونی خۆی‌و میرو سەربازانی کردو، خواخوای ئەوەیان بوو، هەلێکیان بۆ بڕەخسێ تۆڵەی هەڤاڵ‌و برادەرەکانیان بکەنەوە. ئیدی ئەرکی سەرشانی چەرخەچییەکان تەنها هاتە سەر ئەوەی خاچدروشمان بڕفێنن‌و بیانکوژن. ئیدی، ئەوەبوو، کاتێ لە (عکا)وە دەچوون بۆ عەسقەلان، لە مەنزڵگەی

---

758 ـ النوادر، ١٣٠.

759 ـ النوادر، ١٣٤.

760 ـ الفتح القسي، ٤٩٣.

761 ـ النوادر، ١٦٣ ـ ١٦٤.

762 ـ النوادر، ١٧٤.

چوارەمدا، چەرخەچییەکان دوو خاچدروشمیان ڕفاند، "فەرمان درا لەملیان بدرێ، دەستبەجێ کوژران‌و خەڵك بە شمشێر تێیان بەربوون"،[763] هەر هەمان ڕۆژو، لەنزیك (قیسارییە)وە، دوانی تریان هێنا "لەدەوروبەری هێزەکانی دوژمنەوە ڕفێندرابوون، ئەو دوانەشیان زۆر بە خراپیی کوشت، هەر لەسەر ئەو ڕقەی کوشتارەکەی (عکا)".[764]

پاشان خاچدروشمێکیان بەدیل گرت، بەڵام دەستبەجێ نەیانکوشت، هێنایان هەرچی نهێنیی لەشکری خاچدروشمان هەبوو، هەموویان، لەڕێگەی وەرگێڕێکەوە لێوەرگرت. پاشان "فەرمان درا لەملی بدرێ‌و لاشەکەی نەشێوێنرێ." ئنجا وەرگێڕەکەش بەو دەردە براو، دوو خاچدروشمی دیکەشیان لە سوپای دوژمن گرتبوو، ئەوانیشیان کوشت، تا ژمارەی کوژراوانی دوژمن لەو ڕۆژەدا،(٥)ی شەعبانی ٥٨٧ك، گەیشتە هەشت کوژراو.

ئیدی، چەرخەچییانی سوپای ئەییوبی، تەواوێ لەسەر ڕفاندنی خاچدروشمان ڕاهاتن‌و تێیدا قاڵ بوون، پاشانیش دەیانکوشتن، لەبەرئەوە، سەلاحەددین ژمارەی چەرخەچییەکانی پتر کرد، تا ڕۆژێکیان، چواردە فەڕەنگیان هانی، ژنێکیشیان لەگەڵ دابوو، کچی یەکێ لە سوارچاکەکانی خاچدروشمان بوو، هەر هەموویان کوشتن.[765]

هەرچەندیشە، ڕفێنراو، بە دیلی جەنگ دانانرێ، لێ سوپا حوکمی دیلی جەنگی بەسەردا دەسەپاندن. ئەم ڕەفتاری دووره تیرباران‌و دوژمن ڕفاندنە، کە سەلاحەددین بەکردەوە دژی دوژمن خستیە کارو، فەرمانی دەدا، تاك‌و تەرای دوژمن لە پشت لەشکرەکەیانەوە، یان لەکاتی دار بڕین‌و وشکەڵ کۆکردنەوەو دروێنەی لەوەڕی گیادا، بڕفێنن، ئەم ڕەفتارو کردارە تازەیە، تاکتیکێ بوو سەلاحەددین لە ناچاری دایهێناو پەیڕەوی دەکرد، چونکە سوپاکەی خۆی چەندین نسکۆی بەسەر هاتبوو. دەیویست بەمجۆرە شەڕە، دوژمن هەراسان بکاو وردە وردە ورەی پێ بەربدا. سەلاحەددین ئەم جۆرە تاکتیکەی گەلێ پێباشتر بوو لەوەی شەڕێکی ڕاستەقینەو گەورەو گران لەگەڵ دوژمندا بکا. لێ ئەم تاکتیکە تازەیە تین‌و تاوێکی ئەوتۆی بۆ دوژمن نەدەهێناو کاریگەرییەکی کەمتری هەبوو. چونکە خاچدروشمان، هەر لە گەیشتنی هەڵمەتی سێیەمیانەوە، تەواوێ بەهێز بوو بوون‌و، لەوەدا نەمابوون ڕفاندن‌و پێکدادانی لاوەکیی‌و وردە شەڕ، زیانیان پێبگەیەنێ . خۆ ڕیشارد، هەر گوێی بەم وردە شەڕە نەدەداو، خۆی پێوە خەریك نەدەکرد، ئەو لە هەلێك دەگەڕا، گورزی گەورە بوەشێنێ‌و، ئامانجە ستراتیجیەکانی، بەنموونە وەك، داگیرکردنی یافاو عەسقەلان بەدیبێنێ‌و بگا بە ئامانجی گەورەی خۆی کە داگیرکردنی قودس‌و میسریشە، چونکە پێشتر دەمی شیرین بوو بوو، کاروانەکەی میسری کە بۆ شام دەهات، تالان کردبوو، دەیزانی میسر چەند دەوڵەمەندەو چەند پڕسامانە.

لە لایەکی دیکەوە، سەلاحەددین، وای پێباشتر بوو، دیلەکان نەکوژرێ‌و، بۆ ئەنجامدانی هەندێ ئیش‌و کار، سوود لە وزەو توانستیان وەربگرێ. ئەوەبوو، کاتێ کە دەستی کرد بەبنیادنانی قەڵاو قایمکاری شاری قاهیرە، (قەڵای سەلاحەددین)، ئیشە سەخت‌و گرانەکانی بەو دیلانە کرد، بەنموونە وەك "مەڕمەڕ بڕینەوە، تاشینی تاوێرو بەردەگەورەکان‌و، هەڵکەندنی کەندڕە گەورەکەی دەوری قەڵاکە، ئەو کەندڕە، لەسەر تەقتەقە بەردان بەپاچ هەڵدەکەنرا، شتێکی عاجباتی‌و سەیر بوو. (إبن جبیر) دەڵێ: ئەو پیشەی بنیادنانە بە دیلە کافرەکان (علوج)ی ڕۆم نەکرابا، بە کەس نەدەکرا".[766] مێژوونووسێکی پاشینی میسرییش دەڵێ: "قراقۆش، لەدروستکردنی قەڵاو شوورەکەدا، پەنجا هەزار خاچدروشمی دیلی وەسەر کار خستبوو".[767]

**٤- پەیماننامەو ئاگربەستەکانی نێوان سەلاحەددین و خاچدروشمان :**

وەنەبێ تەبایی نامەکەی (الرملة) یەکەم پێکهاتنی شەڕوەستاندن بووبێ لە نێوان سەلاحەددین‌و کۆمەڵانی خاچدروشماندا، نەخێر، بەرلەوەش گەلێ جار پێکهاتن مۆرکراوە، یەکەم جار، کاتێ، سەلاحەددین لەسەرەتای پێ داکووتان‌و سەقامگیربوونیدا لە شام، لەبەرایی ساڵی (٥٧١ك/ هاوینی ١١٧٥ز)دا ئاگربەستێکی مۆرکرد. بێ گومان ئەو

---

763 ـ النوادر، ١٧٧.

764 ـ ن. م. ص.

765 ـ ن. م، ص ١٧٨ ـ ١٧٩. بنۆڕە : ١٨٣و ص ١٨٦.

766 ـ ابن جبیر، ص٢٥. بشنۆڕە: المقریزی، (الخطط، طبعة المعهد)، ٣٣٢/٤. السلوك، ٩٩/١.

767 ـ علي مبارك الخطط التوفیقیة، مطبعة دار الکتب، القاهرة ١٩٦٩. ص٧٠.

ئاگربەستە، فشاری بارودۆخی سیاسیو ئابوریو سەربازی سەپاندی، نەخاسمە سەلاحەددین تازە گەیشتبووە شامو، کێشەو گریو گۆلێکی زۆری بەرەو ڕوو بووەوە، یەکێ لەو کێشانە ئەوەبوو هەندێ لە میرەکانی نورەددین مەحموود لەگەڵیدا تەباو دۆست نەبوون، سەرو سەختیشی لەگەڵ (الملك الصالح اسماعیل کوڕی نورەددیندا) باش نەبوو، ئەتابەکەکانی موسڵیش دوژمنایەتییان دەکرد، هەروەها ئیسماعیلیەکانیش زۆر ڕقیان لێدەبووەوەو چەند جاریش هەوڵیان دا سەرونی بکەنو لەناوی ببەن.[768] خۆ باری ئابووریی وڵاتی شامیش، ئەو ساڵە، تا بڵێی خراپو نالەبار بوو، کاری لە هەردوولا کردو ناچار سەلاحەددین سیاسەتی تەبایيو بێ وەزەنیی گرتەبەر. سەرچاوەو ژێدەرانیش دەڵێن: ساڵی (٥٧١ك) لە شام، ساڵێکی نەهاتو قاتوقڕ بووە.[769]

ئەو دۆخەی باسمانکرد هەمووی، دۆخی نالەبارو تەنگانەیە سەلاحەددینیان ناچارکرد شەڕ بوەستێنێو ماوەیەك بە ئاشتی لەگەڵ خاچدروشماندا بەسەربەرێ.

کاتێکیش ئاگربەست ئیمزا کرا، سەلاحەددین فەرمانیدا لەشکرەکانی میسر بگەڕێنەوە بۆ میسر، چونکە پێویستی پێیان نەماو. وەکو گوتیشمان. دۆخی ژیانو باری ئابووریی شام بەرەو پەرێشانی دادەچوو، میسریش پێویستی بەو سەربازانەی خۆی هەبوو، وەرزی درەوو کۆکردنەوەی بەروبومیش داهاتبوو، (العماد) دەڵێ: سوڵتان لەشکرەکانی میسری ئیزن دا بچنەوە بۆ میسر، "تا دەغڵو دان هەڵدەگیرێ".[770]

ڕاستیشت دەوێ، سەلاحەددین بەم ئاگربەستو، بە ئاگربەستی دیکە، هەرگیز لە خاچدروشمان ئەرخاینو دڵنیا نەبووە، نەوەکا دوژمن لێی لابدا. لەبەر ئەوە، دوور دەیڕوانیو شەرتو شروتو بەندو بەستی ئەوتۆی لەو ڕەشنووسی ئاگربەستانەدا دەسەپاند کە دوژمن نەتوانێ لێی بدات. لەسەر ئەوەشەوە، سەلاحەددین چەکی دانەدەناو، لە دوژمنی داگیرکەر سركو بەسڵ بوو، سوپاکەشی هەمیشە لە چاوگێڕییو ئامادەباشیو خۆسازیدا دەهێشتەوەو جاروباریش لەگەڵ دوژمندا دەکەوتە تیر باران، نەوەکا هەڵێ بقۆزنەوەو، دەستێ بوەشێنن. سەلاحەددین، هەر کاتێکیش ئاگربەستی لەگەڵ دوژمندا جاڕدابێ پرسو ڕاو ڕاوێژی لەگەڵ ئەنجومەنی جەنگدا کردووە.[771]

بەڵام ئێمە هیچ شتێکمان لەبارەی دەقی ئەم ڕێکەوتننامەیە، لەلا فەراهەم نییەو نیمانە. وەڵێ دیارە کەشو هەوایەکی ئاشتییان بەخۆوە دیوە، هەرچەندیشە جاروبار ئەملا، یان ئەولا چالاکییەکی سەربازییان دەنواند. زۆرتریش، وا پێ دەچێ کەئەم پەیماننامەیە، گشتیی نەبووبێو هەموو کۆمەڵانی خاچدروشمانی نەگرتبێتەوە. پێکدادانەکەی نزیك (الرملة)، کە لە ساڵی (٥٧٣ك/١١٧٧ز)دا ڕوویداو، تەنگاوو گەمارۆدانی شاری (حماه) لەهەمان ساڵداو، وێرانکردنی (بيت الأحزان)یش، پاش دوو ساڵ لەلایەن سەلاحەددینەوە، ئەمانە هەمووی نیشانەی ئەوەن کە ئاگربەست هەموو شارێكو هەموو هێزێکی نەگرتووەتەوە.

بەڵام، تا ساڵی ٥٨٣ك/١١٨٧ز، لە نێوان سەلاحەددینو میرنشینی (أنطاكيةو طرابلس)ی سەربە خاچدروشماندا هیچ چالاکییەکی سەربازی ڕووی نەدا. ئیدی لەو ساڵەدا، سەلاحەددین ناچارکرا هێرش بباتە سەر دەڤەری (أنطاكية و طرابلس)، چونکە خاچدروشمان، بە تایبەتییش (ڕیمۆند الصنجيلی)ی سەر گەورەی تەرابلس لە پەیماننامەکەی نێوان خۆیو سەلاحەددین لایدا، ئەوەبوو چووە پاڵ (أرناطو مەلیك جي لوسینیان)و، لە دژی سەلاحەددین شەڕی جاڕداو، شەڕە گەورەکەی (حطين) قەوما. (ڕیمۆند)یش بۆیە ئەم پێکهاتنەی لەگەڵ سەلاحەددین بەست، چونکە خاچدروشمان

[768] ـ بۆ ئەم مەبەستە بنۆڕە: النوادر، ص٥٢، الكامل، ١١/ ٤٣٦ـ ٤٣٧و ٤٢٩. العماد، سنا البرق ٢١٠ـ ٢١١ء ٢١٨ـ ٢١٩. مرآة الزمان، ٣٢٩/٨و ٣٣٥. ابن العديم زبدة الحلب، ٢٨/٣. الروضتين، ج١، ق٢، ص ٦٥٨ـ ٦٦١. مفرج الكروب ٢٤/٢، ٤٤، ٤٧. السلوك، ٦١/١ـ ٦٢. مصطفي غالب، سنان راشدالدين، دار اليقظة العربية، بيروت، ١٩٦٧. ص ١٢٣و ١٢٨و ١٣٠.

[769] الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٤٣. مفرج الكروب ٣٦/٢. ابن كثير، البداية والنهاية، ٢٩١/١٢.

[770] سنا البرق ، ١٩٥/١. الكامل ٤٣٥/١١. الروضتين، ٦٤٣/١.

[771] ـ الكامل، ١٩/١٢. سيد الاهل، أيام صلاح الدين، ص١٦٠.

**لەسەر کورسی (بیت المقدس) لەناوخۆیاندا تێك چووبوون.[٧٧٢]**

**ڕیمۆند خۆی خستە سێبەری سوڵتانەوەو پێکهاتنیشی لەگەڵدا مۆرکرد، وەلێ "أرناط" وەك دیتمان بوو بە هۆکاری پیشێلکردنی پێکهاتنەکەو پاشان ڕیمۆندیش چووە پاڵی و شەڕەکەی (حطین) قەوما.**

**ئاگربەستی دووەمی ساڵی (٥٨٤ك/ ١١٨٨ز) لەگەڵ (أنطاکیة):**

**هەرچەندیشە سەلاحەددین قەڵاو قایمکارەکانی دەوروبەری میرنشینی (أنطاکیة)ی، وەك، (بغراس و دربساك، الشغر، بکاس، سرمینیه)و هی دیکەشی هەمووی داگیرکرد، وەلێ شەڕەکانی دوای شەڕەکەی (حطین) کە هەموو وڵاتی شامیشی گرتەوە، لە (أنطاکیة) وەستا. هۆی ئەم وەستاندنی شەڕەش ئەوەبوو کە ئاگربەستێ لە نێوان سەلاحەددین و (بوهیمند)ی سەرگەورەی (أنطاکیة) مۆرکرا. ئەم ئاگربەستەش کاتێ مۆرکرا کە لە (٢ی شەعبانی ٥٨٤ك/، تشرینی یەکەمی ١١٨٨ز)یدا سوپای ئەییوبی قەڵاو قایمکارەکەی (بغراس)ی باکووری (أنطاکیة)ی داگیرکردو مرخی لە خودی (أنطاکیة)ش خۆشکرد. ئەوجا سەرگەورەی ئەم شارە لە نیازی سوڵتان تێگەیشت و، ترسی ئەوەی لێ نیشت سوڵتان ئەم شارە گەورەیەشیان لێ بستێنێ و داگیری بکات. لەبەرئەوە ناردیە سەر سوڵتان و داوای ئاگربەستی لێ کردو بۆینی ئەوەش بوو، هەموو موسوڵمانە دیلەکانی ژێر دەستی خۆی ئازاد بکات، کە نزیکەی هەزار دیل دەبوون.[٧٧٣] سوڵتان لەگەڵ گەورە فەرماندارو سەرگەورەکانی ناوچەکەدا کەوتە ڕاپرسی و زۆربەیان ڕازی بوون بە ئاگربەست، نەخاسمە سوپای ئەییوبییش ئاتاجیان بە پشوو هەبوو، حەزیان بە حەسانەوەیەك ئەکرد.[٧٧٤] بەو جۆرە بەو داوای ئاگربەستە قایل بوون و، هەردوولا پێکهاتن، تا ماوەی هەشت مانگ شەڕ ڕابگرن، لە یەکی مانگی تشرینی یەکەمەوە تا کۆتایی مانگی ئایار (مایس)،[٧٧٥] بۆ ئەوەی "ئاگربەستەکە بەر لە دروێنە کۆتایی بێت و سەربازانیش لەم وەرزەدا دەحەسێنەوە".[٧٧٦]**

**سەرگەورەی (أنطاکیة)، ئەوکات، لە هەموو فەڕەنگەکان بەشان و شەکەوتتر بوو، لە هەمووشیان دەوڵەمەندترو موڵکدارتر بوو. دوای مردنی ڕیمۆند، فەڕەنگەکان (طرابلس)و هەموو دەڤەرەکانی ئەم شارەیان دا بەوو، هەرچی موڵك و ماڵێکی دیشی هەبوو دیسان هەر دایان بەو، چونکە ڕیمۆند وەچاخی کوێر بوو. ئەم ڕیمۆندە لە مەیدانی شەڕەکەی (حطین) کە ڕای کردو هەڵات، ئیدی لەو بەینەدا کوژراو تێداچوو. کاتێکیش (طرابلس) درا بە (بوهیمند) کوڕە گەورەکەی خۆی کرد بە جێگری خۆی لە حوکمی ئەو شارەدا.[٧٧٧]**

**بە پێی ئەو ئاگربەستە، دیلە موسڵمانەکان لە (أنطاکیة) بەرەڵا کران. پاشان لە سێی شەعباندا سەلاحەددین گەڕایەوە بۆ (حلب)و لەوێوە چوو بۆ دیمەشق، ئنجا بۆ بڵاوەپێ کردنی لەشکرەکانی لای ڕۆژهەڵاتی شام و ئەوەی لای (عیمادالدین زنگی)ی سەرگەورەی شەنگاڵ و خاپوورو سەربازگەی موسڵ. وەلێ ئەم ئاگربەستەش. هەروەك**

---

[772] الکامل، ١١/ ٥٢٦ ـ ٥٢٧. زبدة لحلب ٣/ ٩٣. الروضتین ٢/٧٤. مفرج الکروب ٢/١٨٤. سەرەتای ئەم تێکچوونە لەوەوە پەیدا بوو کە ڕیمۆند شاژنە (أشیفا)ی سەرگە ورەی (طبری)ی مارەکرد، ئەم ئافرەتە لە هەمانکاتدا موڵکی (بیت المقدس)ی لە جیاتی کوڕە بچکۆلەکەی پێ سپێردرابوو (توصیه)، کە ئەویش لە خاڵۆیەکی نەخۆشی وەچاخ کوێرەوە بۆی مابووەوە. کوڕە گچکە مرد، دایکە شووی کرد بەو ڕیمۆندە، ئیدی، ڕیمۆند بوو بە مەلیك، بەڵام شاژنەکە (دایکی کوڕە مردوەکە دڵی چووە زەلامێکی دیو شووی پێ کرد، ئیدی حوکمی (بیت المقدس) کەوتەدەست ئەم مێردە تازەیەی "ئەمیش داوای لە ڕیمۆند کرد چەند ساڵ حوکمی بیت المقدسی کردوەو چی لێ خواردوە بیداتەوە". بەم جۆرە بووە، ناکۆکییان و ریمۆرند لە داخانا پاڵی دا بە لای سەلاحەددینەوە.

[773] مفرج الکروب، ٢/٢٧٠.

[774] الکامل، ١٢/١٩ . الروضتین، ٢/١٣٣. شفاء القلوب، ١٥٧.

[775] مێژوونووسان بەو جۆرە، ماوەی ئاگربەستەکە بە ساڵی زایین دیار دەکەن، بنۆڕە: الکامل، ١٢/١٩. الفتح القسی، ٢٦٠. الروضتین، ٢/١٣٣. مفرج الکروب، ٢/٢٧٠. "یان بە حەوت مانگ" النوادر ، ٩٤. زبدة الحلب، ٣/ ١٠٧. البدایة والنهایة، ١٢/٣٣٠.

[776] الفتح القسي، ٢٦٠. الروضتین، ٢/١٣٣.

[777] الکامل، ١٢/١٩.

ئاگربەستەکەی پێشتر. هەموو لایەنەکانی خاچدروشمانی نەگرتەوە. لەبەرئەوە سوڵتان پاش حەوانەوەیەکی کەمتر لە چوار هەفتەو، لە بەرایی ڕەمەزاندا، دەستی بە غەزا کردەوەو لە دیمەشقەوە بەرەو (الصفد) کەوتەڕێو "هیچ گوێی نەدایە ئەوەی کە لەم مانگی ڕەمەزانەدا خەڵك بۆ لای کەسوکاری دەچێ، کەچی ئەو، وا ماڵو منداڵو کەسوکارو نیشتمانی خۆی بەجێ دێڵی".

کاتێکیش پێیانگوت: لەشکرەکانی تریش بڵاوە پێ بکا. وتی: تەمەن کورتەو مردنیش ئەمانەتی نییە، ئەوەتا هێشتا قەڵاو قایمەی (کوکب، صفدو الکرك) بەدەست فەرەنگەوەیە، ناچارین دەبێ یەکلایان بکەینەوە، چونکە کەوتوونەتە ناوەڕاستی وڵاتی ئێمەوەو، لە بەڵای خەڵکەکەی دڵنیا نابینو، گەر پشت گوێیان بخەین، پاشان پەشیمانی دادمان نادا.[778]

ڕاستیشت دەوێ، سەلاحەددین هەلی ئەوەی بۆ نەڕەخساو نەپەرژا، جارێکی تر بچێتەوە بۆ دەڤەری (أنطاكیة)، لەوەش دەترسا، سەرگەورەی ئەم شارە ئاگربەستەکە بشکێنێو هەلی سەرگەرمبوونی سوپای ئیسلام بە گەمارۆکەی (عکا)وە بقۆزێتەوەو، شەڕ بەو ناوچانە بفرۆشێ کە سوپای ئەییوبی غەزووی کردون، وەلێ ئەمە ڕووی نەدا، چونکە سەرگەورەی (انطاکیة) لە هێزەکانی ناو شاری (حلب)ی ژێر حوکمی (الملك الظاهر) دەترسا.

سەرگەورەی (أنطاکیة)و (طرابلس) لە ڕووداوەکانی مەیدانی (صورو عکاو قودس) بە تەواوی تەریكو دوورەپەرێز بوو، نەشمان بیستووە هیچ چالاکییەکی ئەوتۆی شانبەشانی خاچدروشمان نواندبێ، وەلێ سەلاحەددین کاتێ تایەفەی ئیسماعیلیو خاکی ئەم تایەفەی خستە سەر ئەو ناوچە ئیسلامییانەی کە دەیوست حوکمەکانی تەبایی نامەکەی (صلح) الرملة بییانگرێتەوە، ئەوسا، ڕیشاردی شێردڵ، لە بەرامبەر ئەوەدا، میرنشینی (أنطاکیة)ی خستەسەر ئەو ناوچانەی خاچدروشمان کە حوکمەکانی ئەو تەبایی نامەیە دەیانگرێتەوە.. لەمەودوا باسی دەکەین..

**تەبایی نامەکەی ساڵی ٥٨٧ك/ ١١٩١ی (الرملة):**

تەبایی نامەی (الرملة) بەناوبانگترینو دواترین پەیماننامەی تەبایی بوو، کە لە نێوان هەردوولادا بەسترا. لەبەرئەوەش بەناوبانگ بووە، چونکە لەپاش مۆرکردنی، ئیدی شای ئینگلیز ڕیشارد، خاکی پیرۆزی بەجێ هێشتو لە ڕێگای ڕۆژهەڵاتو ناوەندی ئەورووپاوە گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی.[779] پاشانیش زۆری پێ نەچوو سەلاحەددینیش گیانی سپارد. ئەم دووانە ناودارترین فەرمانداری بەرەکانی شەڕی خاچدروشمانو، زۆرتر زەین کێشی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بوون. ئەم تەبایی نامەیەش بووە باسی دوابەشی هەڵمەتی سێیەم. ئەو هەڵمەتەی کە گەورەترین شاکانی ئەورووپا لە حەیبەت سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی سەلاحەددین بەشدارییان تێداکرد، چونکە سەلاحەددین، سەرکەوتنی تەواوی لە (حطین و غەزوی بیت المقدسو قەلاو قایمەکانی باکوورو کەناراوەکانی فەلەستین)و ناوچەی (الغود)دا بەدەست هێنا. جگە لەوەش ئەم تەبایی نامەیە، هەموو لایەکانی هەردوو بەرەی شەڕەکانی گرتەوەو، وەك ئەو تەباییناماتە نەبوو کە لە نێوان سەلاحەددینو یەکێ لە میرنشینەکانی خاچدروشماندا مۆردەکرا.

بیرۆکەی ئەم تەبایی نامەیە لە بنەڕەتدا، لەڕۆژانی گەمارۆکەی (عکا)وە، سەری هەڵدا، وەلێ ئەو ئاشتییەی ئەوکات خاچدروشمان داوایان دەکرد، زۆر گران دەوەستا لەسەر سوپای ئەییوبیو بە داماویو ملکەچیو زەلیلبوونی موسوڵمانان تەواو دەبوو. لە سوپای ئەییوبییان داوا دەکرد دەست لە هەموو دەسکەوتەکانی خۆی هەڵبگرێو هەموو ئەو شارانەشیان کە ئازادیان کردوون بداتەوە، بێگومان موسوڵمانانیش بەمە ڕازی نەبوون. (إبن شداد) دەڵێ: (معز الدین سەنگەر شاە بن سیف الدین غازی)ی سەرگەورەی جزیرێ، بۆ سەردانەوەی وڵاتی خۆی، داوای ئیزنی لە سەلاحەددین کرد، وەلێ سوڵتان ئیجازەی پێ نەداو، پێی گووت، جارێ پەلە مەکەو سەبرکە، "چونکە دوژمن، ئەوەتا لێگا لێگا دەکاتە

---

[778] النوادر، ٩٥.

[779] Kerr The Crusade printed in Britain, 1966. P, 58.

سەرمانو داوای تەبایی دەکا"، ناشبێ سوپا بڵاوەی لێبکا تا شەڕ، یان ئاشتی یەکلادەبێتەوە،[780] بەڵام کۆششی خاچدروشمان بۆ تەبایی و ئاشتی پووچ دەرچوو، سەری نەگرتو، پاشان گۆڕانی تر سەری هەڵدا، تەباییەکەی دوورتر خستەوە.

لێ، خاچدروشمان کاتێ لە (عکا)وە بەرەو عەسقەلان کەوتنەڕێ، دووبارە داوای تەباییان کردەوە.. کاتێ گەیشتنە مەنزڵگەی هەشتەم. ڕێکەوتی ١٠ی شەعبانی ٥٨٧ك/ئەیلولی ١١٩١ز. تەتەرەکانی ڕیشارد داوایان لە چەرخەچییەکانی سوپای ئەییوبی کرد، بەرپرسێکیان پیشان بدەن، قسەی لەگەڵ بکەن. ئەوکات، پێشڕەو (مقدم)ی چەرخەچییان (علم الدین سلیمان بن جندر)بوو، چوو بۆ لای تەتەرەکانو، کە گەیشتە لایان، تێیانگەیاند، بۆ لای (الملك العادل) هاتوونە، چونکە دەیانزانی کە (الملك العادل) دەستە ڕاستی سەلاحەددینە، ئەوجا (العادل) بەرەو پیریان هات و گوتی، فەرموون چیتان دەوێ. گوتیان: "ئەم کوشتارە دەمێکە بەردەوامەو، لە هەردوو لامان زەلامگەلی قارەمان قارەمان کوژران. ئێمە بە هانای خەڵکی کەناراوەکانەوە هاتووین. وەرن لەگەڵیاندا ڕێك بکەون، ئێمەش هەریەکەو بگەڕێتەوە جێگای خۆی".[781]

سوڵتان نیازی ئەوەبوو سوود لە کەشو هەوای دانوستاندنەکە وەربگرێ، ناردی، بە (العادل) بڵێن فریوییان بداو بە قسەوە خەریکیان بکا، تا هێزەکانی خۆیان دەگەنە جێ، ئیدی (العادل) ڕۆیشت بۆلای ڕیشاردو داوای لێکرد، چی دەوێو چی ناوێ بینووسێ تا بۆی بدا بە سوڵتان، ڕیشارد گوتی: (ڕێساو دەستوور ئەوەیە، سەرلەبەری وڵاتەکە بدرێتەوە دەست خۆمانو ئێوەش چۆڵی بکەنو بچنەوە بۆ وڵاتی خۆتان".[782]

(العادل) وەڵامی ڕیشاردی دایەوە، گوتی: ستەمە ئەوەی ئەو داوای دەکا، ببێ، "ئەگەر هەموو سوارەو پیادەکانیشی لەسەر کوژرابن". ئەوەندەی گوتو، دانوستاندنی پساندو گەڕایەوە بۆ چادری براکەی، چونکە دانوستاندنەکە کەوتە گێژەنگێکی خەتەرناکەوە.[783]

لەگەڵ ئەوەشدا ڕیشارد لە دیتنی (الملك العادل) کۆڵی نەدا، نەخاسمە، ئەمیش دیاریەکی گرانبەهای، بۆ ناردبوو، دڵی پێخۆش بکا. ڕیشارد لە پاداشدا ئەسپێکی ڕەسەنو چاکی بۆ ناردبووەوە. ڕووداوەکانیش ساغیان کردەوە کە (العادل) دبلۆماسییەکی لێزانو شارەزا بووەو، بەدڵی ڕیشارددا چووەو، باقیمەنی خاچدروشمانیش خۆشییان پێی هاتووە.[784]

دانوستاندن، زۆر بەسستی دەجولا. ڕیشارد دووبارە داوای کردەوە (الملك العادل) ببینێو قسەی پێدا بنێرێ بۆ سوڵتان، کە: ئەوەتا هەردوولا پەرێشان بوونەو، وڵاتەکەش وێران بووەو، گرێ کوێرەی کێشەکەش، سێ کوچکەییە، قودس، خاچو دابەشکردنی وڵاتەکەیەو، گوتی: قودس پەرستشگامانەو بەموو لێی ناچینە دواوەو، دەستی لێ هەڵناگرین، ئەگەر تاکە نەفەرێکیشمان نەمێنێ. هەرچی وڵاتەکەیە، ئەوە، کەرتی، ئوردنی دەدرێتەوە بە خۆمان، تا دەگاتە دەریا (واتا کەناری ڕۆژئاواو هەموو خاکی فەلەستینی ئەمڕۆ)، هەرچی خاچەکەشە، ئەوە تەختەیەکەو هیچ سوودێکی بۆ ئێوە نییە، وەلێ بۆ ئێمە زۆر مەزنو بەنرخە، با، سوڵتان ئەو پیاوەتییەمان لەگەڵدا بکاو، تەبابینو، ئەم کێشمەکێشەمان لە کۆڵ بکەوێو هەناسەیەکمان بەبەردا بێتەوەو، ئیسراحەتێ بکەین.[785]

کاتێ سوڵتان لەم داواکارییانە تێگەیشت، هاوڕاوێژانی ئەنجومەنی جەنگی بانگ کرد، پرس و ڕای پێ کردن، چۆن چۆنی وەڵامی بدەنەوە. ڕای خۆی ئەوەبوو، بەبێ سێ و دوو وەڵامێکی یەکلاکەرەوەی بداتەوەو، بڵێ:"قودس هەروەك

780 النوادر، ١٤٥. الروضتين، ١٦٥/٢. مفرج الكروب، ٣٤١/٢.

781 النوادر، ١٨٢. الروضتين، ١٩١/٢. مفرج الكروب ٣٦٧/٢.

782 هەر هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرەگەل.

783 الفتح القسي، ٥٤٢. الحموي، تأريخ المنصوري، ٢٠٧. الروضتين، ١٩١/٢. مفرج الكروب، ٣٦٧/٢. الانس الجليل، ٣٧٣/١.

784 رنسيمان، ١١٥/٣ ـ ١١٦.

785 النوادر، ١٩٤. الروضتين، ١٩٣/٢. مفرج الكروب، ٣٧٣/٢.

چۆن هی ئێوەیە، هی ئێمەشە، لای ئێمە مەزنترە لەوەی وەك لای ئێوە، قودس ڕێگای میعراجی پێغەمبەرمانو خڕبوونەوەی فریشتەکانە، بەتەما نەبێ، ئێمە دەستی لێ هەڵبگرینو، ئەو قسەیە لەناو موسوڵماناندا هەر ناتوانین بیکەین. هەرچی وڵاتەکەشە، ئەوە بە ئەسڵ وڵاتی خۆمانەو، ئەم داگیرکارییەی ئێوەش شتێکی نائاساییەو لەناکاوە، چونکە موسوڵمانان ئەوکات لاوازو بێ هیممەت بوونە، هەتا شەڕیش هەر شەڕ بێ‌و بمێنێ، ناتوانن بەردێکی لێ تازە بکەنەوە. هەرچی خاچەکەشە، ئەوەش ئەگەر لەبەرژەوەندی موسوڵمانان نەبێ‌و خێرێکی بۆ ئیسلام تێدا نەبێ، ئەوە، لە دەست خۆمانی ناچوێنین". [786]

ڕاستیشت دەوێ سەلاحەددین خۆی گرانتر کردو زیاتر پێی دادەکوتا، چونکە لایەنێکی دیکەی خاچدروشمان دەیانویست دانوستانی لەگەڵدا بکەن، ئەو لایەنەش بەرەی (مرکیز کنراد مونتفرات)ی سەرگەورەی شاری (صور) بوو، ئەو پێوەندیی لەگەڵ سوڵتاندا سازداو داوای دانوستانی لێکردو داوای (صیداو بەیروت)یشی لێ کرد، بەڵێنیشی دا لە پاداشتی ئەوەدا ببێ بەدوژمنی ریشاردو هەڵکوتێتە سەریو شاری (عکا)ی لێ بستێنێ. ئەم دانوستانە، کە ماوەیەك بەرەو پێش چوو، چونکە سوڵتان دەیویست، لەجیاتی ڕیشارد، یاری بەڕیشی مەرکیز بکاو دنەی بداو بیکاتە مایەی دووبەرەکیو لێکیان بەردا. ئەوە بوو (العدل النجیب)ی بۆ دانوستان نارده لای مەرکیزو نامەیەکی پێدا نارد، داوای لێکرد گەمارۆی (عکا) بداو شارەکە داگیر بکاو، دیلە ئیسلامەکانی بەڕەڵا بکا، ئەوجا ئەمیش (سوڵتانیش) (صیداو بەیروت)ی تەسلیم بکا، بەڵام بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ (٩ی ڕەمەزانی ٥٨٧ك) نوێنەری ڕیشارد گەیشتە لای (الملك العادل)، بەنیازی ئەوەی (وتووێژی تەبایی نامەی نێوانیان دووبارە تازە بکاتەوە)، [787] مەبەستیشی ئەوە بوو نەیەڵێ سەلاحەددین دانوستان لەگەڵ کەسی دیکەدا بکا.

ڕیشارد دەیویست خۆی هەڵکێشێ‌و، وەهای دەردەخست کە جێگە پێی قایمەو، بێ خەمە، ڕاستیکەشی ئەوەبوو، ئەو سەردەمە ئنگلستان کەوتبووە دۆخێکی شڵەژاویو بێسەرو بەریو، ترسی ئەوەشی هەبوو، سەلاحەددینو مەرکیز ڕێکبکەونو بۆ ئەو (بۆ ڕیشارد)، بە خراپ وەرگەڕێ. لە لایەکی تریشەوە دەترسا، سوڵتان، سوود لە ناکۆکیی سەختی نێوان ئەوو (فیلیپ أغسطس)ی مەلیکی فەرەنسا. کە دۆستی مەرکیز بوو، وەربگرێ. [788] لەبەر هەموو ئەو شتانە، سەری دنیای لێهاتبووەوە یەك‌و، هەوڵی دەدا لەگەڵ سەلاحەددیندا دانوستاندنەکەی بگاتە ئەنجامێکی باش. ڕیشارد پرۆژەیەکی عەجیب‌و سەیری، لە قبوڵکردن بەدەری پێشکەش کرد، پێشنیازی ئەوەی تێدا کرد کە (الملك العادل) جوانای خوشکی ڕیشارد بخوازێ‌و . جوانا بێوە ژن بوو، پێشتر ژنی مەلیکی (صقلیە) بووە. ڕیشاردیش دەست لەهەموو خاکی خاچدروشمان، هەڵبگرێ، بۆ جوانای خوشکی، هەر لە شاری (عکا)وە تا دەگاتە یافاو عەسقەلان بیدا بە جواناو بیشیکات بە شاژنو، سوڵتانیش هەر خاکێکی فەلەستینی بەدەستەوەیە، بیدات بە براکەیو بیشیکات بە شاو، ئیدی سوڵتان چی لە وڵاتەکە بەدەستەوە دەمێنێ، بۆ خۆی بێ. با، پایتەختی شانشینەکەش بچێتە شاری قودس. پێویستیشە (صلیب الصلبوت) بدرێتەوە بە ڕیشاردو، هەردوولاش دیلەکانی یەکدی بەربدەن. [789]

پرۆژەکە، پێشکەش بە سەلاحەددین کرا لەبەرچاوی کۆمەڵێ لە میرانی، بەنموونە، وەك (علم الدین سلیمان بن جندرو، سابق الدین عثمان و، عزالدین ابن المقدمو، حسام الدین بشاره). سوڵتان یەکسەر موافەقەتی کرد، چونکە وای دەزانی کە ڕیشارد ڕاست ناکاو، لە گاڵتەو گەپ زیاتر هیچی تێدا نییە، بەڵام ڕای گشتیی مەسیحیەکان، دژ بەم پرۆژەیە هەڵیساو، هەندێکیان چوونە گیان جواناو "هەڕەشەیان لێکردو تۆمەتباریان کرد بە گومڕاو بێ ئاینیو پێیان گوت: ئەمە حەیاچوونە..، ئەمە بێئابڕووییەو..، ئەمە لە مەسیح، یاخی بوونە". ئەوجا جوانا ناچار وازی هێنا، پاشان ڕیشارد پۆزشی بۆ (الملك العادل) هێنایەوە لە پەشیمان بوونەوەی خوشکەکەیو داوای لێکرد دەست لە ئیسلام هەڵگرێ‌و ببێتە

---

786 النوادر، ١٩٤. الروضتين، ١٩٣/٢. مفرج الكروب، ٣٧٣/٢.

787 النوادر، ص ١٩٠.

788 لەبارەی ناکۆکی ناوەوەی خاچدروشمان، بنۆڕە: رنسیمان، ٩٩/٣.

789 النوادر، ١٩٥–١٩٦. الفتح القسي، ٥٥٥. الروضتين، ١٩٣/٢. الكامل، ٧٢/١٢.

نەسرانی.. ئەوجا (العادل) بۆی دەرکەوت کە مەسەلەکە فڕوفێڵ‌و لە خشتەبردنە. [790] وەلێ ڕیشارد بە دڵ حەزی دەکرد زاوایەکی وەهای هەبێ، چونکە، کە دیتی ئەو کارە سەری نەگرت، ئنجا داوای لێ کرد خوشکەزاکەی مارە بکات‌و، گوتی: مارەبڕینی جوانا سەری نەگرت، چونکە "لە بە شوودانی شازادەی بێوەژندا دەبێ ئیزنی پاپا وەربگیرێ، بەڵام بۆ کچ، ئەو ئیزنەی پاپای ناوێ". [791]

ڕیشارد زۆر هەوڵی دا لە ڕێگەی (العادل)ی برادەریەوە چاوی بە سوڵتان بکەوێ، بەڵام قبوڵ نەکرا، چونکە "ئەگەر مەلیکەکان کۆببنەوە، ئیدی دوای ئەو کۆبوونەوەیە، شەرمە ململانێ بکەن. وەختێ بە باشی کۆدەبنەوە کە هەموو شتێك ڕێکخرابێ‌و تەواو بووبێ". کاتێکیش ڕەتکردنەوەکەی سوڵتان گەیشتە دەستی ڕیشارد "وەڵامەکەی بە کارەسات لە قەڵەم داو، بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ هیچ ئامانجێ بەدەست بێنێ‌و هیچی بۆ ناکرێ". [792] سوڵتان هەروەها نیمچە پێکهاتنی (الاتفاق الجزئی) دیل گۆڕینەوەشی قبوڵ نەکردو، بە شاندەکەی ڕیشاردی گوت: "تەبایی نامە، گەر مۆربکەم، لەسەر هەمووی دەیکەم، ئەگەر تەباییش لەسەر هەمووی نەبێ، ئەوە باسی دیلەکانیش مەکەن". [793]

(إبن شداد) دەڵێ: مەبەستی سەلاحەددین ئەوەبوو تەبایی نامە مۆرنەکا، لەناو ئەنجومەنەکەدا لای کرد بە لامەوەو، پێی گوتم: تەبایی نامەشیان لەگەڵدا مۆربکەین، لە زوڵم‌و زۆریان دڵنیا نابین، ئەگەریش کارەساتی مەرگم بەسەربێ، ئەم هەموو لەشکرە خڕنابنەوەو فەڕەنگەکان بەهێزتر دەبن، کەواتە باشتر وایە لە غەزاو کوشتاریاندا بەردەوام بین، تا لە کەناراوەکان دەریاندەپەڕێنین، یان دەکوژرێین. [794]

وەلێ کارەساتەکانی دواتر، لە حەزو ئارەزووی سەلاحەددین گەورەتر بوون‌و ناچاریان کرد تەبایی نامە مۆر بکا، ئەمەش بەقسەی مێژوونووسەکەیدا دیارە دەڵێ: "سوڵتان ناچار کرا تەبایی نامە مۆربکا." [795]

سوڵتان داوای کرد ئەنجومەنی جەنگ کۆببێتەوەو بکەونە ڕاوپرس‌و ڕاوێژ، لەسەر ئەوە کە لەگەڵ کام لای خاچدروشماندا تەبایی نامە ببەستن. ئەو کۆبوونەوەیە کەوتە (١١)ی شەووالی ٥٨٧ك/ ١١٩١ز. هەرچی (العادل)و هەندێ لە میرەکان بوون، دەیانویست دانوستاندن لەگەڵ ڕیشارددا درێژە پێ بدەن، چونکە ڕیشارد لە فەلەستین نامێنێ‌و دەچێتەوە بۆ ئنگلستان. وەلێ، مەرکیزی سەرگەورەی (صور)، ئەو نیازی وایە بمێنێتەوەو لە خاکە داگیرکراوەکان پێ داکوتێ‌و، نەڕوا. شاندی مەرکیز هەمیشە هەر هاتوچۆی لای سوڵتانیان دەکردو، دانوستاندن لەگەڵ مەرکیزدا درێژەی کێشا، تا دوو زەلامی تایەفەی ئیسماعیلی کوشتیان. [796] کوشتنی مەرکیز لەکاتێکدا ڕوویدا کە سەلاحەددین حەزی نەدەکرد بکوژرێ، چونکە ئیشی ئەوەی پێ بوو، بیکات بە فشارێك لەسەر ڕیشاردو ناچاری بکات کەمێ لە داواکارییەکانی کەم بکاتەوە. لەم ڕووەوە، (العماد) دەڵێ: "لەم بارەدا کوژرانی مەرکیزمان پێخۆش نەبوو. هەرچەندیشە تاغوتێ بوو لە تاغوتەکانی گومڕاهی. ئەو، هەرچۆنی بووبێ، دوژمنی مەلیکی ئینگلیز بوو، کەمو زۆر ڕکابەرایی دەکردو، نامەی بۆ دەناردین، پشتی بگرین و یاریدەی بدەین‌و، موڵکی بۆ وەربگرینەوە، هەرکاتێکیش مەلیکی ئینگلیز بیستبای شاندی مەرکیز چووەتە لای سوڵتان، ئەوە، لەو بارەدا ئەو زیاتر نامەی بۆمان دەناردو زیاتر ملی بۆمان کەچ دەکردو، تەبایی نامەی دەهێنایەوە مەیدان، بەڵام بە کوژرانی مەرکیز، ئیدی ئۆخەی کردو، ئەو ترسەی نەما". [797]

---

790 مرآة الزمان، ٨/٤١٠. الروضتين، ٢/١٩٣.

791 النوادر، ٢٠٤.

792 النوادر، ٢٠١. مفرج الكروب، ٢/٣٧٤.

793 النوادر، ٢٠٢.

794 النوادر، ٢٠٣. وفيات الاعيان، ٧/١٩٩.

795 النوادر، ن.ص. بنۆڕە: الفتح القسي، ص، ٦٠٣.

796 النوادر، ٢٠٨. الفتح القسي، ٥٨٩. الروضتين، ٢/١٦٩.

797 الفتح القسي، ٥٩٠. الروضتين، ٢/١٩٦.

به کوژرانی مەرکیز، ئیدی، شاندی ڕیشارد، لەتەك (الحاج یوسف صاحب سیف الدین)دا لە ١٩ی (جمادي الاخره)ی ساڵی (٥٨٨ك/١١٩١ز)دا گەیشتو نامەیەکی ڕیشاردیان بۆ سەلاحەددین هێنا بوو، نامەکە دەڵێ: "ڕیشارد خۆشتی دەوێ و حەز بە برادەریت دەکاو نایەوێ ببێتە فیرعەون و هەموو زەوی داگیربکا، لەو باوەڕەشدا نییە کە تۆش ئەوە قبوڵ بکەی، نابێ تۆش هەموو موسوڵمانان بەکوشت بدەی و منیش نابێ هەموو فەرەنگ قڕ بکەم. ئەمەش، خوشکەزامەو ئەم وڵاتەم بەناوی ئەو کردووەو وا دامە دەست تۆ، تا خۆی و سوپاکەی لە ژێر حوکمی تۆدا بن. گەر بۆ ڕۆژهەڵاتیش بانگیان بکەی، دەستەو نەزەر لەبەردەمتا دەوەستن و فەرمانت بەجێ دێنن". پاشان، بە سوڵتان دەڵێ: کاتێ قەشەکان داوای کڵێسەیان لێت کرد، تۆ دڵت نەشکاندن و، بەرچاوت تەنگ نەبوو، ئێستا منیش داوای کڵێسایەکت لێدەکەم.... مەزرایەکیشم پێببەخشی قایلم. کە سەلاحەددین ئەم نامەیەی ڕیشاردی خوێندەوە، پیاوماقوڵ و دەم سپی و دنیادیدەی خڕکردنەوە بۆ ڕاپرسی و ڕاوێژ، داوایان لێ کرد، چ وەڵامێك بداتەوەو چی بڵێت. داوایان لێکرد، تەبایی نامەیەکی لەگەڵدا ببەستێ، "چونکە موسوڵمانان ماندوون و بێزاربوون، هەمووشیان قەرزارن و ئیدی لە وزەیاندا نەماوە". ڕای هەموویان هاتەسەر ئەوەی ئەم نامەیەی خوارەوە بنێرێ بۆ ڕیشارد:

"مادامێکی دەست پێشخەریت کردو، لەگەڵماندا هاتیتەماڵەوە، ئێمەش دەبێ چاکە بە چاکە بدەینەوە. خوارزاکەت (خوشکەزاکەت) لەلای سوڵتان وەك یەکێ لە کوڕەکانی خۆی وایە". سوڵتان دەڵێ: "پاشان خۆی (واتا خوارزاکەی) پێت دەڵێ، من چاکەی چۆنم لەگەڵ کردووە. من گەورەترین کڵێسات پێ دەبەخشم، کە ئەویش کڵێسای (القمامة)یە.[798] باقیمەنی وڵاتەکەش دابەش دەکەین، کەناراوەکان بۆ تۆ، ئەو قەڵاو قایمکارانەش لەناو چیاکاندا بەدەستمانەوەیە، ئەوانەش بۆ ئێمە. نێوانەی هەردووکیشیان نیواو نیو بەش دەکەین. عەسقەلان و پشت عەسقەلانیش وێران دەکەین، نە بۆ ئێمەبێ و نە بۆ ئێوە".[799]

پاش هەفتەیەك شاندی ڕیشارد، دیسان هاتەوەو گەیشتە ئەنجومەنی سەلاحەددین و سوپاسی ڕیشاردی پێگەیاندو گوتی:"ڕیشارد شێردڵ داوادەکات لە سوڵتان کە لە قەڵاکەی قودسدا بیست زەلامی هەبێت". هەرچی دابەشکردنی وڵاتەکەیە، ئەوە پێی ڕازییە دابەشبکرێ. وەلێ سەلاحەددین و ئەنجومەنی جەنگ، لەسەر مەسەلەی قودس ڕازی نەبوون و بە شاندەکەیان گوت: لە زیارەتکردن بەولاوە، هیچ مافێکتان لە قودسدا نییە، عەسقەلانیش پێویستە وێران بکرێ، شاندەکەی ڕیشارد لەسەرەتای ڕەجەبی (٥٨٨ك)دا، لەگەڵ حاجی یوسفی نوێنەری سوڵتاندا سەربازگەی سەلاحەددینیان بەجێ هێشت و ڕۆیشتنەوە.[800]

زۆری نەبرد، شاندەکە (پەیام بەرەکەی) ڕیشارد، جارێکی تر هاتنەوە... لە چوارەم جاردا، گوتی: ڕیشارد ڕازی نییە عەسقەلان وێران بکرێ، چونکە ئەو، لە وێرانیەوە ئاوەدانی کردۆتەوەو ئەرك و مەسرەفێکی زۆریشی لە شوورەکەیدا بە خەرج داوەو، دەڵێ:"ناتوانین، تەنیا یەك بەرد لە عەسقەلان بڕوخێنین".[801]

بە هۆی گرێ کوێرەی عەسقەلانەوە، ئەم دانوستاندنە هەرەسی هێنا، وەلێ هەر لایەنەو دەیزانی لایەنەکەی دی چی دەوێ. پاشان گەمارۆدانی یافا ڕوویدا. پاش دۆڕاندنی ئەم شارە، کە سەلاحەددین نەیتوانی داگیری بکا، ڕیشارد، ئەمجارەش کەوتەوە باسی تەبایی و داوای کۆبوونەوەی لەگەڵ هەندێ لە میرەکانی سوڵتاندا، کرد. کە پێشتر کردبوونی بە دۆست و برادەری خۆی و "هەرکاتێ حەزی لێبا، لەگەڵیان کۆدەبووەوە".[802] پاشان ڕیشارد نوێنەرێکی ناردە لای سوڵتان کە بەناوی خۆیەوە (ڕیشاردەوە) پێی بڵێ"فەڕەنگ دەستووریان ئەوەیە، ئەگەر کەسێ شارێ بدات بە کەسێکی

798 سەرچاوە عەرەبیەکان ئەو ناوەیان لە کەنیسەی قیامەت ناوە: النوادر، ٢١٩. الروضتین، ٢/٢٠٠. مفرج الکروب، ٢/٣٩١.

799 هەمان سەرچاوەو هەمان ئەو لاپەڕانە.

800 النوادر، ٢٢٠. الروضتین، ن.ص. مفرج الکروب، ٢/٣٩٢.

801 النوادر، ٢٢١.

802 النوادر، ٢٢٧.

دی، ئەوە، لەوبارەدا سوودمەندەکە دەبێ بە دەسداو خولامی ئەو کەسە. منیش داوات لێدەکەم یافاو عەسقەلانم بدەیتێ، تا لەشکری ئەم دوو شارە گوێ لە مستی خۆت بن. خۆ ئەگەر هاتوو پێویستیشت بەمن بوو، ئەوا، من بە زووترین کات دەگەمە خزمەتت".[803] واتا، ڕیشارد داوای ئەو دوو شارەی کردووە، وەك دەرەبەگێکی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا، بەبێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە ئەگەر مەلیك لەوێ نەبوو، چووبوو بۆ ئەوروپا، ئەوجا ئەو دەسڕاییە (التبعية) چۆن بەڕێوە دەچێ.[804] وەلامی سەلاحەددین ئەوەبوو کە: "ئەم دوو شارە دەکەین بە دوو بەشەوە، یەکێکیان بۆ تۆ کە یافاو پشتی یافایە، دووەمیان کە عەسقەلانو پشت عەسقەلان دەگرێتەوە، بۆ من". ئەم جارەش پەیامبەرەکە گەڕایەوە بۆلای ڕیشاردو، هاتەوە بۆ لای سەلاحەددینو سەر لە نوێ داوای عەسقەلانی کردەوەو گوتی: "ئەگەر، لەم ڕۆژانەدا مەسەلەکە تەواوبکرێ، ئەوا ڕیشارد دەڕواتەوە بۆ ولاتی خۆی، دەنا ناچار دەبێ ئەم زستانە لێرە بمێنێتەوە".[805]

سەلاحەددین پێی گوت: "ناکرێ دەست لە عەسقەلان هەلبگرم. بەسەربردنی وەرزی زستانیش لەم ولاتە، ئەوە شتێکی ناچارییەو، ولاتەکەی داگیر کردووە. دەشزانێ ئەگەر خۆی لە شارەکە نەبێ، شارەکە داگیر دەکرێ. خۆ ئەگەر نەڕواو بمێنێتەوە، ئەوە، لە کەسوکارو لە نیشتیمانەکەی، دوو مانگەڕێ بەپێ، دوور دەبێ، ئەو لاوەو گەنجە، هەڕەتی لاوێتیەتیو، کاتی ڕابواردنیەتی. هەرچی منم، ئەوە، من وام لە ناوەڕاستی ولاتی خۆمدا، کەسوکارو منداڵم وان لە دەوروپشتم، هەرچییەکم بوێ حازر بەدەستە. من بابایەکی بە تەمەنم، خۆشیو ڕابواردنم لەبەرچاو کەوتووەو تێرم لێ خواردووەو لە کۆڵ خۆم خستووە. ئەو سوپایەش کە بە زستان لای خۆمە، ئەوانە نین کە بە هاوین لە لام دەبن".[806]

هەر، لە کاتی ئەم دانوستانەدا، لەشکرەکانی دەورپشت هاتنە سەربازگەکەی سەلاحەددینەوە، بەمەش سەلاحەددین، پێگەی بەهێز بوو، ورەو غیرەتی زیاتر کەوتەجۆش.... لە پێشدا لەشکری موسڵ گەیشت، پاشان لەشکری میسر، ئنجا (الملك المنصور ابن تقي الدين عمر) گەیشتەجێ.[807]

ڕیشارد لەسەر داواکاریی تەبایيو تەبایی نامە کۆڵی نەداو سوور بوو، شاندو پەیامبەرەکانیشی، بۆ داواکردنی میوەو بەفر هەمیشە بەڕێوەبوون، "سولتان ئەو شتانەی بۆ دەناردو مەبەستیشی ئەوەبوو شاندەکان هەمیشە بێنو بچن، دەنگوباسیان لێ وەربگرێ".[808] پاشان، ڕیشارد، ناردیە سەر (الملك العادل) کە سەلاحەددینی بۆ قایل بکا، عەسقەلانی بداتێ، "من دەڕۆمو ئەو لەگەل ئەم پێرە بێ نرخەدا دەمێنێتەوەو ولاتیان لێ دەستێنێ، من لەوە زیاتر کە لە ناو فەرەنگەکاندا شانو شەوکەوتی خۆم بەرز ڕاگرم، هیچ ئاواتێکی ترم نییە. خۆ ئەگەر سولتان عەسقەلانم نەداتێ، دەبا، قەرەبووی ئەو زەرەروزیانەم بۆ بکاتەوە کە لە بنیادنانی شوورەکەیدا بۆم خەرج کردوە".[809]

کەواتە، ڕیشارد مەبەستی ئەوەبوو شانو شەوکەتی خۆی لە ناو نەتەوەکەیدا لەدەست نەدا، ئیدی بە تەنگەوە نییە، دوای خۆی، کە ولاتی ڕۆژهەلات بەجێ دێلی، موسلمانان زەویو زاری خاچپەرستەکان داگیردەکەن، یان ناکەن. درێژەکێشانی دانوستانەکەش ئەوەی سەلماند کە لایەنێك لەم دوولایەنە بڕوای بە ئاگر بەست هەبووە. هەرچی سەلاحەددینە، ئەوە، ئەو مافی خۆی بوو لەو فەرماندە خاچپەرستە دلنیا نەبێ، چونکە جارەهای جار، ئەم فەرماندەی خاچپەرستو، ئەو مەلیکی خاچپەرستە سوێندیان خواردووە کە چەك لە ڕووی سەلاحەددیندا هەلنەکێشن، کەچی هەر کە هەلێکی بۆ ڕەخسا، پەیمان دەشکێنێو پاشگەز دەبێتەوە، چونکە یاسای خاچپەرستی خۆی وەهایەو دەلێ: سوێند،

---

803 النوادر، ٢٢٨. الروضتين، ٢/٢٠٢.

804 رنسيمان ٣/١٣٦.

805 النوادر، ٢٢٨. الروضتين، ٢/٢٠٢.

806 النوادر، ٢٢٨. الروضتين، ٢/٢٠٢. مفرج الكروب، ٢/٤٠٠.

807 النوادر، ٢٣٠، الروضتين، ٢/٢٠٢.مفرج الكروب، ٢/٤٠١.

808 النوادر، ٢٣١، الروضتين، ٢/٢٠٣.

809 النوادر، ٢٣٢، الروضتين، ٢/٣٠٢. مفرج الكروب، ٢/٢٠٤.

خاچدروشم نابەستێتەوە، لە کوشتنی ئیسلامی (کافر).[810]

بەهەرحاڵ، لە درێژەی ئەم دانوستانەدا، پەیامبەرانی ڕیشارد داوایان کرد چاویان بە میر (بدرالدین دلدرم)ی فەرماندەی چەرخەچییەکان بکەوێ. ئەم سەروسەخت (علاقە)ی لەگەڵ ڕیشارددا هەبوو. سوڵتان قایل بوو کە دڵدرم بچێ بۆ لای ڕیشارد. دڵدرم گەڕایەوە، خەبەری هێنا کە "شا، وازی لە عەسقەلان هێناوەو، داوای قەرەبووش ناکاو نیازیشی لە تەبایی گرێدانەکە، پاك بووە.".[811] ئەوجا سوڵتان کاغەزێکی هێناو، سنووری شانشینی خاچدروشمانی، کە بەدەستیانەوە بمێنێ، لەسەر کاغەزەکە کێشاو، ئەم شارو دەوروبەری شارانەی تێدانووسی: (عکا، صیفا، یافاو قیسارية)و، ئەم شارانەشی :"الرملة، اللد، يبني، مجدل يابا، الناصرةو صفورية"ی لێ دەرهێناو کاغەزەکەی بە پەیامبەری خۆیدا نارد بۆ شای ئنگلیز، کە پێی بڵێ :"ئەمە سنوری ئەو ولاتەیە کە بەدەستتانەوە دەمێنێتەوە. ئەگەر لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون، ئەوا، پیرۆزبێ و، ئەوەش دەستم. با ڕیشاردیش نوێنەری بنێرێ، سوێندم بۆ بخوا، تا سبەی بەیانیش چاوەڕێ دەکەم، دەنا، ئەمە کات بەسەربردن‌و فریودانەو ئەمجارە ئیدی لێك دەپچڕێین‌و هەرکەسە لە ماڵی خۆی".[812]

وەلێ ڕیشارد، زۆری نەبرد، لە دەستبەرداربوونی قەرەبووی عەسقەلان پاشگەز بووە. ئنجا سەلاحەددین دەستی لە (الرملەو، اللد)یش بۆ هەڵگرت‌و ئەو دوو شارەشی پێدان.. "سوڵتان ئەوەی لە بەرژەوەندی موسوڵمانان کرد، خەڵکەکە پەرێشان‌و ماندوو بوون، کەم دەرامەت‌و قەرزاربوون‌و هەر کەسەش حەزی دەکرد بگەڕێتەوە بۆ شارو دەڤەری خۆی. ئەوەبوو کە نەیانتوانی (عکا) بگرن، لەوەش دەترسا، ڕۆژێ ئاتاجی پێیان بکەوێ‌و کەسیان ئامادەنەبن. لەبەر ئەوە، وای بە باش زانی، تاماوەیەك کۆیان بکاتەوە، پشوویەك بدەن‌و ئەو ناهەمواری‌و نەهامەتییەیان لەبیر بچێتەوە. سوڵتانیش بیەرژێتە سەر ئەوەی ولاتەکە ئاوەدان بکاتەوە، نەخاسمە قودس قایم بکاو بە پێی توانست پڕ چەکی بکا".[813]

سەلاحەددین، پاشان، ئەم دوو شەرتووشروتەشی لە بەندەکانی تەبایی نامەکەدا زیاد کرد:

یەکەم: عەسقەلان وێران دەکرێ‌و هەردوولا پێکەوە وێرانی دەکەن، لەوە دەترسا شارەکە بە ئاوەدانی وەربگرن‌و وێرانی نەکەن.

دووەم: "ولاتی ئیسماعیلیەکان دەبێ بە بەشێك لە ولاتی ئیسلام". خاچدروشمانیش، مەرجی هەق بە هەقیان دانا کە (أنطاكيةو طرابلس) ببن بە بەشێك لە خاکی خاچدروشمان. دابودەستووری خاچدروشمان وەهابوو، بەسەر نان خواردندا سوێند نەخۆن، ڕۆژی سێ شەممە نانیان خواردبوو، لەبەر ئەوە، سوێندخواردنەکەیان خستە بەرەبەیانی چوارشەممە، ڕێکەوتی ٢٢ی شەعبانی ساڵی ٥٨٨ك/٢ی ئەیلولی ١١٩٢ز. ئەو بەیانییە کۆمەڵی میران هاتن‌و، پاساویان بۆ نەهاتنی ڕیشارد هێنایەوە، چونکە دەستوور وەهابوو، شا سوێند ناخوا، لەبەر ئەوە "ئەم میرانە، لەسەر دەستی، شای خۆیاندا قەول‌و قەراریان کردووەو هاتوون". سوڵتان بەم پاساوەش ڕازی نەبوو. گەورە سەرۆکانی خاچدروشمان کە هاتبوون، ئەمانەبوون: کەندهری(کۆنت هنری دی شامبینی) کە ئەکا خوارزای ڕیشارد، همفری کوڕی همفری‌و، میری (أنطاكيةو، طرابلس)و، بالیان ئەبیلین ی (کوڕی بارزان)و هەردوو پێشەنگی (الاسبتاريةو، الداوية)و خاچدروشمانی دیکەش.

بۆ بەیانیی پێن جشەممە، پەیامبەرانی سوڵتانیش ئامادەبوون‌و دەستیان خستە سەر دەستی سوڵتان‌و قەول‌و قەراریان لەگەڵدا کرد بەپێی ڕێوڕەسمی بەرکار تەبایی نامەکە گرێ بدەن‌و، پێشنیازیان کرد، فەرماندە گەورەکان (الملك العادل و، الملك الافضل و، الملك الظاهرو، سيف الدين علي بن أحمد المشطوب و، بدر الدين دلدرم الياروقي و، الملك

---

[810] د. عبدالقادر اليوسف، علاقات بين الشرق والغرب، ص١١٤.

[811] النوادر، ٢٣٢. الروضتين، ٢/٢٠٣. مفرج الكروب، ٢/٤٠٣.

[812] هەمان ژێدەرو هەمان ئەو لاپەڕانە.

[813] النوادر، ٢٣٣.

المنصوري كوڕی تقی الدين عمرو، إبن المقدمو گەورە پیاوانی دیکەش)[814] سوێند بخۆن. ماوەی پێکهاتنەکە بۆ سێ ساڵ بوو،[815] یان بۆ سێ ساڵو سێ مانگ بوو،[816] یان بۆ سێ ساڵو هەشت مانگ بوو.[817] حوکمەکانیشی لەگەڵ سەرەتای مانگی ئەیلولی ڕێکەوتی ٢١ی شەعبان کەوتە بەرکار. جا ئەوجا جارچی لە جێگا گشتیی و جەنجاڵەکاندا، جاری داو دەیگوت: "وا تەبایی ڕێکخراو بەرپابوو، ترسی شەڕ نەماو هەر کەسێك دەیەوێ بێت بۆ وڵاتەکەمان با بێت، هەر کەسێکیش حەز دەکات لە وڵاتەکەی خۆمانەوە بچێت بۆ وڵاتی ئەوان با بچێت".[818]

ئا بەم جۆرە تەبایی لە نێوان هەردوولادا گرێ درا. بەبێ ئەوەی پێشەوای هەردوولا، ڕووبەڕوو یەکدی ببینن، نە بە شەڕو نە بە ئاشتی.، پاشان سوڵتان سەد دیوار بڕی نارد، شوورەی عەسقەلان برووخێننو، فەرەنگەکانی لێ دەربکەن. ئەو ڕۆژی تەبایی بوونەوەیە ڕۆژێکی پڕ ئاهەنگ بوو، خەڵکی هەردوولا لەخۆشیانا سەرمەستو دڵخۆش بوون، هەند بە کەیفو بەختیار بوون، مەگەر هەر خوا بزانێ.[819]

(إبن شداد) ئەم جارەش، با دەداتەوەو دەڵێ: سەلاحەددین ڕای لە بەرپابوونی ئەو تەباییە نەبوو، خۆی پێی گوتم: بەخودا قەسەم من ئەم تەباییەم پێخۆش نەبووە. لە هەندێ بەشی گفتوگۆی ئەم تەبایی بەستنەدا، پێی گوتم: ئەترسم تەباییان لەگەڵدا ببەستم، چونکە نازانمو دەترسم شتێکم لە دەست دەرچێو خراپەیەك ڕووبداتو دوژمنی پێ بەهێز ببێ.. من ئەم وڵاتەم بۆ هێشتنەوە، با، خۆیان باقیمەنی وڵاتەکە بستێننەوە، جا هەریەکە لەوانە دەبینی. مەبەستی لە میرەکانی خۆیەتی. وا، لەسەر قەڵاو قاییمەی خۆی دانیشتووە، وەك بەرزەکی بانان ....، پاشان گوتی: بەڵام من لەبەر بێزاربوونی سوپا ئەم تەباییەم گرێ دا، خەریك بوون بکەونە سەرپێچیو ملهوڕی، بەرژەوەندیش، مەگەر خوا بزانێ لە چیدایە. مەرگی سەلاحەددینو ئەم تەبایی بەستنە یەکیان گرتەوە. ئەگەر ئەو پێکهاتنە بکەوتبایە ڕۆژانی جەنگو کوشتار، ئەوە، ئیسلام دەکەوتە مەترسییەوە.[820] لەو شرۆڤەیەی باسکرا، دەردەکەوێ کە سەلاحەددین، چەندین هۆکار پاڵی پێوەناوە ئەم تەبایی نامەیە مۆر بکا:

هۆکاری یەکەم: دەمێك بوو، سوپاکەی هیچ سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەسەر خاچدروشماندا بەدەست نەهێنا بوو، ناچار بوو هەر بەرەڤانیی دەکردو، سەرگەرمی قایمکرنی (بيت المقدس)یش بوو.

هۆکاری دووەم: جەنگاوەرانی موسوڵمان بێزارو ماندو بوو بوون، لە نیشتمانی خۆیان بەدوورکەوتبوون. ئەمەش یەکێ بوو لە کەموکورتیەکانی سوپای ئەیوبییەکان، چونکە بە ئەسڵ، هەر لە لەشکرگەلی دەرەبەگەکان پێکهاتبوو، بۆیە سەلاحەددین ناچار بوو، تەبایی نامەی (الرملة) مۆربکا، "بەرژەوەندی میللەتەکەشی لەوەدا بەدی دەکرد، خەڵکەکە توانستیان لەبەر بڕابوو، دڵیشیان لای نیشتیمانی خۆیانو ماڵو منداڵیان بوو".[821]

کەموکورتیەکی دیکەی سوپای سەلاحەددین ئەوەبوو، کە دەبوو میرەکانی، لە کیسەی خۆیان ئەرك و مەسرەفی لق و

---

814 النوادر، ٢٣٥. الروضتين، ٢٠٣/٢. مفرج الكروب، ٤٠٤/٢. الانس الجليل، ٣٩.

815 النوادر، ٢٣٣.

816 الروضتين، ٢٠٣/٢. مفرج الكروب، ٤٠٤/٢. ابو الفداء، المختصر، ١٠٥/٥. السلوك، ١١٠/١. صلاح بن يحيى، تأريخ بيروت ص، ٢١. شفاء القلوب، ١٧٧.

٨١٦ الفتح القسي ٦٠٥. الكامل ١٢، / ٨٥. ابن العبري تاريخ مختصر الدول، ٢٢٣. الغساني، الملك الاشرف عيمادالدين ابوالعباس اسماعيل، المسجد المسبوك والجوهر المحكوك دار التراث الاسلامي للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، دارالبيان، بغداد، ١٣٩٥ھ/١٩٧٥ز، ص٢١٧ (ابن كثير) بەهەڵەدا چووەو ماوەکەی بە سی ساڵو شەش مانگ داناوە : البداية والنهاية ٣٥٠/١٢.

818 النوادر، ٢٣٥. مرآة الزمان، ٤١٩/٨. الروضتين ، ٢٠٤. وفيات الاعيان، ٢٠٠/٧. مفرج الكروب، ٤٠٥/٢. النجوم الزاهرة، ٤٨/٦. الانس الجليل، ٣٩٠.

819 النوادر، ٢٣٥. مرآة الزمان، ٤١٩/٨. النجوم الزاهرة، ٤٨/٦. الانس الجليل، ٣٩٠.

820 النوادر، ٢٣٥. الفتح القسي، ٦٠٤. الروضتين، ٢٠٤/٢. وفيات الاعيان، ٢٠٠/٧. مفرج الكروب ٤٠٥/٢. النجوم الزاهرة، ٤٨/٦.

821 النوادر، ٢٣٣.

پەلەکانی خۆیان بکێشن، کە بەشێك بوون لە سوپای گشتی و سەربازەکانیش، خۆیان پێداویستو کەلوپەل و ئازوقەی خۆیان پەیدا بکەن. لەبەر ئەوە جاروبار دەبوون بە ژێر قەرزەوە، ئەمەش بە تەواوی جاڕسو بێزاری کردبوون. [822] جا، ئا ئەمەیە کە مێژوونووسان بە "کەم خەرجی"و "قەرزاری" ناوی دەبەن. [823]

ئیدی کاتێکیش تەبایی بەرپابوو و کاروبارو ڕێسایش سەقامگیر بوو، سوڵتان فەرمانی دا، هەرکەسەو بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی. یەکەم لەشکریش کە گەڕایەوە، لەشکرەکەی هەولێر (أربیل) بوو، ئەوەبوو لە بەرایی مانگی ڕەمەزاندا بەرەو هەولێر کەوتەڕێ. دوای ئەوان، ئنجا لەشکری موسڵو شنگار، لەشکری قەڵای (کیفا)یش گەڕانەوە. ئیدی، ئا لێرەدا شەڕەکانی سەلاحەددین کۆتایی هاتو، هەڵمەتی سێیەمی خاچدروشمانیش بە کۆتا گەیشت، ئەو هەڵمەتە گەورەو گرانەی کە بە دەسکەوتێکی کەمو سوکەڵە تەواو بوو. ئەم دەسکەوتەش بریتی بوو لە شاری (عکا)و خاچدروشمان بەسەر لاشەی موسوڵمانەکاندا چوونە ناوی، خۆیشیان نزیکەی شەست هەزار خاچدروشمیان لێکوژرا. [824]

هەرچی سەلاحەددینە، لەوە دەچوو، دڵی هەواڵی مەرگی پێ دابێ و ئەوەشی دەرك کردبێ کە دوای مردنی خۆی چ ناکۆکی گەلێ ڕوودەدا. ناکۆکیی نێوان بنەماڵەکەی خۆیو میرەکانی. خوا لە دڵی نابوو، میرەکانی کاروباری جەنگ و ڕێکخستنی سوپاو کەشتیگەلی دەریا پشت گوێ دەخەن. ناکۆکی لە نێوان میرەکانو سەربازەکانیاندا، بەرپا دەبێ، بەتایبەتییش لە نێوان کوردو تورکەکاندا. [825] ڕاستیشت دەوێ، ئەم هەموو ئەندێشەو خەیاڵانەشی هاتنە دی، سوڵتان سەلاحەددین پاش نزیکەی شەش مانگ، کۆچی دوایی کرد. بەرلەوەش، لەگەڵ کەسوکارو دۆستانیدا قودسی بەجێ هێشت، تا لە دیمەشق ئارام بگرێ. لە ڕۆژی ٢٧ی سەفەری ٥٨٩ك/ڕێکەوتی (٣)ی مارتی (١١٩٣ز)دا، سەری نایەوەو بەیەکجاری ماڵئاوایی کرد.

[822] النوادر، ٢١٩. الروضتین، ٢/٢٠٠. مفرج الكروب، ٢/٣٩١.

[823] النوادر، ٢٣٣.

[824] سید امیر علي، مختصر تأریخ العرب، ص، ٣٢٠.

[825] النوادر، ٢١٧. الكامل، ١١/٥١٩. الروضتین، ٢/١٩٩.

## کەرتی چوارەم

## چەکەکانی سوپای ئەییوبیان

دەروازە:

کۆگای چەك و دروستکردنی چەك.

جۆرەکانی چەك:

یەکەم : چەکی سووك و سەڵتە زەلام .

١ـ شمشێر، خەنجەر، کارد (نیمچە شمشێر) .

٢ـ ڕم، تەور، کوتەکی ئاسن، کوتەك، گۆپاڵ.

٣ـ کەوان و جۆرەکانی:

أ. جیرەکەوان.

ب. کەوانی چەرخ.

ج. زەردەکەوان.

د. کەوانی پێ.

ه. کەوانی پێنج تیر .

و. کەوانی چوار پاڵوو.

ز. کەوانی نەوتهاوێژ.

٤ـ قۆچەقانی، بەردەقانی (المقلاع) .

دووەم: چەکی قورس :

١ـ نەوت و ئاورهاوێژەکان .

٢ـ ئامێرگەلی دەستەجەمعیی:

أ. مەنجەنیق.

ب. دەبابەو پاشکۆکانی.

سێیەم: چەکی تەنپارێز

چوارەم: پەیکوڵی ئاسن

پێنجەم: عارەبانە (گالیسکە).

**دەروازە**

لێکۆڵینەوەی چەك و جبەخانەی شەڕو جەنگی هەر قۆناغێ لە قۆناغەکانی مێژوو، وەك ئاوێنە، پلەو سەویەی سنعەتکاریی و ئاستی تەکنۆلۆجیای چەکی ئەو سەردەمەمان پیشان دەداو، هەر بەو پێیەش کانزاسازیی و دەرهێنان و تواندنەوەو پاڵاوتن و تێکەڵکردن و ئاوێتەسازیی کانزاو، بزاڤی دارتاشی و داربڕین و شتی دیکەی لەو جۆرە بابەتانەمان بۆ دەردەخا. ئەو کانزایانە، لە هەندێ جێگەدا لە مۆڵگەی نشینەی خەڵکەوە دورن لەم بارەدا، هەر لەوێ کانسازیی دەکرێن و بە پوختی دەگوازرێنەوە و دەبرێن بۆ مۆڵگەکانی سەنعەتکاریی و پیشەسازی، یان هەر لە هەمان شوێنی کانسازیکردنەکەدا، لە نزیك کانەکانیانەوە، یان لە نزیك جەنگەڵ و دارستانەکانەوە سەنعەتی جۆراوجۆریان لێ دروست دەکرێ و، ئەوی چەك بێ دەنێردرێن بۆ جەنگاوەران، یان بۆ بەرپرسی شارەکان.

هەرچی پارەدارکردن و ئەرکو مەسرەفی چەك دروستکردنە، ئەوە، ئێمە هیچی لێ نازانین. نازانین ئایا دەوڵەت ئەم ئەرك و مەسرەفەی دابین دەکرد؟، یان پارەی دەداو، لایەنی پسپۆڕیی و وەستاو شارەزا دروستیان دەکرد؟. دوو مێژوونووسی خەڵکی میسر (عثمان النابلسي)و (المقريزي) قەڵەمیان لە هەندێ لایەن و بابەتی چەك و سەنعەتی چەك وەرداوە. یەکەمیان دەڵێ: "لێرەوارو جەنگەڵ و دارستان، هەر هەمان حوکمی کانزاکان دەیانگرێتەوە، موڵکی (بيت المال)ی موسڵمانانن و موڵك و تایبەتی هیچ کەسێك نین".[٨٢٦] (المقريزي)یش گوتوویەتی: دیوانی سەلاحەددین بڕیاری دەرکردووە، دارستانەکانی میسر، بە تایبەتیش دارستانەکانی ناوچەو دەڤەری: (بهنسا، سفط، أشموتين، أسيوط، أخميم و قوص) هەموو موڵکی دەوڵەتن.[٨٢٧]

## کۆگای چەك و دروستکردنی چەك

ئەو مێژوونووسانەی مێژووی سەردەمی سەلاحەددینیان نووسیوە، هەند، گوێیان بە باسی دامودەزگای دەوڵەت و سیستەمی ئەو دامودەزگایانە نەداوە، دەربەست نەبوون. تەنیا (أبن مماتي) نەبێ. دەنا ئەم مێژوونووسانەی سەردەمی سەلاحەددین، هیچیان بە وێنەی مێژوونووسانی سەردەمی مەمالیك، بە نموونە وەك: (النويري، القلقشندي، المقريزي، ابن تغرى بردي و السيوطي) بەتەنگەوە نەبوون.

مێژوونووسانی سەردەمی سەلاحەددین، تەنیا باسی بزاڤو چالاکیی سەربازیی سەلاحەددین و سوپای سەلاحەددین و بنەماڵەو خزم و میرەکانی سەلاحەددینیان کردووە، هەر لەبەرئەوەیە کە ژێدەرو دەقێك نادۆزینەوە باسی دامودەزگاو ڕێکخستنی بزاڤی دەوڵەتی سەلاحەددین بکات. بە نموونە، باسی دیوانی سوپا، کۆگای چەك و ڕێکخستنی ئابووریی کاتی جەنگ و کاتی ئاشتی بکات، واتا باسی ئەمانەیان نەکردووە، خۆ هیچ دەوڵەتێ بەبێ دامودەزگا و دیوان، نابێ. جا، ئەگەر بشمانەوێ سوود لە کتێبەکانی پێش سەردەمی سەلاحەدین، یان پاش سەردەمی سەلاحەدین وەربگرین، ئەوە، لەو بارەشدا، دیسان سوودمەند نابین و، مەرج نییە ئەوەی کە تێشیاندا هەبێ، وەك ئەو واقیعە وەهابن کە لە سەردەمی ئەییوبییاندا لە ئارادا بووە. نەخاسمە ئێمە سەرچاوەیە ــ کەممان دەست دەکەوێ کە باسی ڕێکخستن و ڕێکخراوەکانی دەوڵەتی نوورەددین و دەوڵەتی ئەتابەکی بکا.

(أبن مماتي) دەڵێ: کۆگاکانی چەك کارمەندگەلێکیان هەبوون، ئیشیان تێدا دەکردو، پێداویستی دارو تەختەو ئاسن و چەپرەك و کەوڵ و ڕەنگ و بۆیاغیان بۆ دەهات و فەرمانیان دەدانێ چەکی جۆربەجۆریان لێ دروست بکەن.[٨٢٨]

هەرچی (القلقشندي)یە، ئەوە، ئەو دەڵێ: لە زەمانی ئێمەدا (واتا سەردەمی مەمالیك)، بە کۆگای چەکیان دەگوت

---

[826] ـ لمع القوانين المضية في دواوين الديار المصرية، ص٤٨:.

[827] ـ الخطط (طبعة بولاق) ١٩٣/٢.

[828] ـ قوانين الدواوين، تحقيق: عزيز موريال عطية، طبعة المصر ١٩٤٣، ص٣٥٤.

(سیلاح خانە)، هەموو جۆرە چەکێکیان لەوێ دادەنا.[٨٢٩]ئەوجا، یەکەیەکە ناوی چەکەکانی زەمانی مەمالیك دەڵێ. لە جێگایەکی دیکەدا پێی دەڵێ خانەی چەك (بیت السلاح)، هەروەها (زەردخانە)شی پێ دەڵێ، لەبەرئەوە هەمیشە پڕە لە زرێو زنجیرو، هەموو جۆرە چەکێکی پێویستی سوپای میسری لێ دروست دەکراو بەشی سوپاکەی دەکردو "بۆ هەموو وڵاتی شامیش دەنێردراو شارو وڵاتو قەڵاو قایمکاریشی پێ ئاوەدان دەکرانەوەو نوێ دەکرانەوە".[٨٣٠]

لە گۆکای چەکدا "وەستا گەلێ هەبوون، هەر لەوێ دەژیانو جبەخانەو چەپرەکی کۆنیان تازە دەکردەوە، بەو وەستایانەیان دەگوت (زەرەدکاش)، ئەم وشەیە (أعجمي)یە، واتا عەرەبی نییەو مانای زنجیر سازە".[٨٣١] جگە لەوە چەکیشیان دروست دەکردو دەمەزەردو زاخاودانو تیژکردنەوەو هەموو جۆرە جوانکاریەکی پێویستیشیان بۆ ئەنجام دەدا، تا چەکەکان لە مۆرەقەو ژەنگو کولیو کۆنبوون بپارێزن.[٨٣٢]

هەرچی بەرپرسی کاروباری کۆگاکەشە، ئەوە، پێیاندەگوت (بەڕێوەبەری کۆگای چەك)، فرمانی سەرشانی ئەوەبوو سەرپەرشتیی کاروباری چەکەکان بکاو، چ چەکێ، هات تۆماری بکاو چی دەرچوو، بینووسێ.[٨٣٣]

جا بەم بۆنەیەوە، کەباسی چەك دەکەین، دەڵێین: درێژەکێشانی شەڕو جەنگ لەگەڵ خاچدروشمانی داگیرکەردا کە دووچاری ناوچەکە بوو بوو، نەخاسمە تووشی وڵاتی شام بوو بوو، بووە مایەی پەیدابوونی چەکسازییەکی چالاکی شەڕو جەنگ، بەتایبەتیش کە ناوچەکە هەندێ ماددەی سەرەتاییو ماددەی خاوی تێدا فەراهەمەو کۆمەڵێ وەستاو پیشەسازی دەستڕەنگینی تێدایە، چونکە وڵاتی شام، هەر لە زووەوە، داروباری بەناوبانگ بووەو، چیاکانی جەنگەڵو دارستانی چڕی پڕ لە داری بە نموونە، وەك داری سنەوبەر[٨٣٤]، سەروو بەڕوو و داری دیکەی لەو جۆرە بابەتانەی بە زۆری تێدابووە.

وەلێ ناوچەکە ئاسنی کەمە، لەبەرئەوە کاربەدەستانی ئەم وڵاتە. بەتایبەتییش سەلاحەددین. ئەم ئاسن کەمیەیان بە ئاسنی هاوردە لە ئیتالیەوە پڕکردەوە.[٨٣٥] ئاسن لە هەندێ هەرێمی شامو موسڵدا هەبوو، (المقدسي البشاري) لە باسی شامدا دەڵێ: "لە چیاکانی بەیروتدا ئاسن هەیە".[٨٣٦] ئەو ئاسنە، وا دیارە، لە سەردەمی شەڕەکانی خاچدروشماندا، لە کانەکانیان کانسازی دەکران (دەردەهێنران)، چ لە لایەن موسوڵمانانو چ لە لایەن خاچدروشمانیشەوە. کە ئەم ناوچەیەیان داگیر کرد. سەرەڕای ئەوەی لوبنان، ناوچەی موسڵیش، جگە لە قیرو نەوتی سپی. کە بۆ ئاگربارێنەکان پێویست بوون. ئاسنی زۆریشی تێدا دەست دەکەوت.[٨٣٧]

موسڵ، ناو بەناو، پیتو بەرەکەتی خاکی خۆیو، دەستکردی پیشەسازو وەستایانی خۆی دەگەیاندە سەلاحەددین، "بەبار نەوتی سپیو قەڵغانو ڕمی بۆ دەناردو، لە هەموو شمەكو پێداویستییەکیش، کامەی زۆر قایمو زۆر دروست و زۆر نایاب بووایە، ئەوەی بۆ دەنارد".[٨٣٨]

هەرچی میسرە، ئەوە، تا بڵێی دارو تەختەی زەبەنی هەبوو، بۆ دروستکردنی کەشتی سوودی لێوەردەگیرا.

---

829 ـ صبح الأعشى، ٤٧٣/٣.

830 ـ صبح الأعشى، ١٨٣/٤.

831 ـ ن، م. ص١١/٤ـ ١٢.

832 ـ النويري، نهاية الأرب، ٢٢٨/٨، ٢٠٠/٦ وما بعده.

833 ـ صبح الأعشى، ص٣٢.

834 ـ ابن شداد ، الأعلاق الخطيرة ، طبعة المعهد الفرنسي للدراسيات العربية، دمشق ١٩٦٢، ج٢، ق٢، ص١٠١.

835 ـ Claude Cahen, Les Changements Techniques. P,118.

836 ـ المقدسي البشاري، أحسن التقاسم في معرفة الأقاليم، طبعة بريل، ليدن ١٩٠٦، ص١٨٤. ابن شداد ، الأعلاق الخطيرة ، ن، ص.

837 ـ المقدسي، ص١٤٥.

838 ـ الفتح القسي، ٣٥٠. الروضتين، ١٤٨/٢. مفرج الكروب، ٣٠٧/٢.

(القلقشندي) دەڵێ: چەك لە میسر دروست دەكراو دەنێرردرا بۆ شام.[839] ئەم مێژوونووسە باسی زەمەنی مەمالیك دەكا، بەڵام زۆر نزیكە لەوەی سەردەمی ئەیووبییەكانیش بگرێتەوە.

لە بابەتی مێژووی چەكدا، دەبینین، مێژوونووسان، بە گەرمیی باسی ناوی چەك و جۆری چەك و چۆنێتی دروستكردنی چەك دەكەن و، ئەوەش دەڵێن كام چەك و، كام چەك، بۆ یەكەمجار لە مێژوودا خراوەتە كار، كەچی بە دەگمەن باسی جێگای دروستكردنی ئەو چەكانە دەكەن. لەبەرئەوە زۆر گرانە بۆ ئێمە شوناسییەك لەوبارەیەوە وەدەست بێنین و شتێكی ئەوتۆی لێ بزانین. تەنیا شمشێر و كەمێ چەكی تر نەبێ. كە ئەوانەش لە جێگای خۆیاندا باسیان دەكەین.

وێڕای چەك لە میسر، ڕەنگە چەكی قورس لە هەندێ شاری وڵاتی شامیش دروست كرابێ، دەق و ژێدەرێكی ئەوتۆشمان، بەدەستەوە نییە. ئەم جۆرە چەكە قورسانەی بە نموونە، وەك مەنجەنیق و دەبابە، قولەو پەیژەو بەدانەو چەكی دیكەی لەو جۆرە بابەتانە، بە ئەسڵ هەر لە دارو تەختە دروست دەكران، ئەم دارو تەختەیەش لە وڵاتی شام و میسردا زۆربوون و بە ئاسانی دەست دەكەوتن، زۆر دووریشە ئەو ئامێرو ئامرازە گەورانە بە دروستكراوی و بە حازری لە جێگای دیكەوە هێنرابن، چونكە قورس و گرانن و، گواستنەوەیان زەحمەتەو ئەرك و مەسرەفێكی زۆریشیان تێدەچێ.

(أسامه بن منقذ) باسی جۆرە زینێ دەكا، كاتی خۆی لە (غزة) دروستدەكراو هەر بەو ناوەشەوە ناودەنرا".[840]

(الحسن بن عبدالله) لە باسی كەواندا، دەڵێ: ئەو كەوانەی لە دیمەشق دروست دەكرێ "لە كەوانی هەموو وڵاتێ باشترە".[841]

## جۆرەكانی چەك

ئەم چەكانە، جون، جون، دابەش دەكەین، جونی یەكەم چەكی سووكی سەڵتە زەلامە، جونی دووەم چەكی قورسی هەمووەكییە، ئنجا چەكی خۆپارێزییەو، پاشان كیمیایی.

### یەكەم : چەكی سووكی سەڵتە زەلام :

#### ١- شمشێر :

شمشێر ناوداترین چەكە، بە درێژایی مێژوو، لە هەموو شەڕو جەنگێكدا خرابێتە كار. عارەب، بەر لە ئیسلام بەكاری هێناوە، شمشێر دوای پەیدابوونی ئیسلامیش هەر مایەوەو بووە پیرۆزترین و بەكارترینی چەكی دەستیان، بوو بە چەكی دەستی سەربازان و، بە شمشێر هێرشیان دەبردە سەر دوژمن و كەلەپچەیان دەكردن و ورگ و لاتەنگەی ئەسپەكانیان پێ دەدڕین. شمشێر لە هەموو چەكێ زیاتر ناوی زۆری هەبووەو زۆرتر باس كراوەو بە شانو باڵیدا هەڵدراوە. ناوی شمشێر چەندین جاریش لە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەردا هاتووە. عارەبان هەمیشە شەیدای شمشێر بوونەو لایان سامناك بووەو ڕێزی لێ گیراوە، زیاتر لە سەد ناوی لێ نراوە، هەموو ئەو ناوانەش، نازناوو خەسڵەتەكانی بووە، شتێكیش بەو هەموو خەسڵەتەوە باس بكرێ و ناوبنرێ، مانای ئەوەیە كە زۆر خۆشەویست بووەو جێگای فەخرو شانازی بووە.[842]

شمشێر هەبووە ناوی وەستاكەی لێنراوە، هەشبووە "مۆركی جێگای لێنراوەو بە ناوی ئەو شارەوە كە لێی دروستكراوە، ناونراوە، ئەو شمشێرەی لە هیندستان دروست كرابێ و مۆركی هیندی پێوە بووبێ، ناونراوە (مهند، هندی)، ئەوەش لە یەمەن دروستكرابا، پێیاندەگوت (یەمانی) هەرچی ئەوەی (مشارف)ە كە گوندێكی عارەبەو لە

---

[839] ـ صبح الأعشى، ١٨٣/٤.

[840] ـ الأعتبار، ص٢٨.

[841] ـ آثار الأول، ص١٦٠.

[842] ـ محمد فرج، المدرسة العسكرية الاسلامية، دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٦٩، ص٢٤٤.

عوربانی عێراقەوە نزیکە، ئەوە، پێی دەگوترا (مەشریفی).[843]

شیرگەران (شیرسازان) زۆر بە ڕازاندنەوەی شمشێرەوە ماندوو دەبوون، جاری وا هەبووە گەوهەرکوتیان دەکرد، جار جارەش دەسكو مشتی شمشێریان لە زێڕ، یان لە زیو دەگرت، هەرچەندیشە، گرنگ شیرەکەیە، نەك جوانییەکەی.[844] (کورد قووڵتریشی بۆ دەچێو دەڵێ: (بەڕیش نییە، بە ئیشە).

وڵاتی هند جێگای شیرگەریو هەناردنی شمشێر بووە. ئاسنو پۆڵاشیان بۆ دەرەوە، بۆ شمشێرسازی دەنارد، وڵاتی ئیسلام دەیانهێناو، دەیاننارد بۆ دیمەشق، بۆ دروست کردنی شمشێری دیمەشقی، هەندێ دەڤەری شامیش. وەك باسمان کرد. ئاسنی تێدا هەبوو،[845] لەناوچەکانی (الفرزل، دوما، الشوير، مشقرة، حۆرانو القلمون) ئاسن دەردەهێنراو،[846] دەنێردرا بۆ شیرگەرانی دیمەشق و شمشێریان لێ دروست دەکرد، لەسەر تیغەکەی ئایەتی قورئانو شیعری دنەدانیان لێ هەڵدەکەند، تا خەڵك بیکڕێو بۆ کوشتاری دوژمن ئامادە ببێ. (د. زکی) دەڵێ: ئەم شارە، بەو شێوەیە لە سەر دروست کردنی شمشێری دیمەشقی بەردەوام بوو، تا، تەیموری لەنگ لە ساڵی (٨٠٣ك/ ١٤٠٠ز)دا، شارەکەی داگیرکردو هەندێ لە وەستای شیرگەرو کرێکاری شیرسازیو هونەرمەندو خاوەن پیشەی دیکەشی لوول داو ناردیانی بۆ شاری (سەمەرقەند)و لەوێ نیشتەجێی کردن.[847]جگە لە دیمەشق، لە قاهیرەو لە موسڵیش کارگەی شمشێرگەریو شیرسازی هەبوو.[848]

(د. زکي) بادەداتەوە سەر باسی شمشێری دیمەشقیو، وەها دەردەخا کە ناوبانگی دیمەشق بەم شمشێرگەرییە، لە سەردەمی جەنگی خاچدروشماندا، زۆری خراوەتە سەرو، ئەو ناوبانگە گەورەیەی نەبووەو، شمشێری نایاب تەنیا لە دیمەشق دروست نەکراوەو، دەڵێ: بەڵێ، دیمەشق جێگای شیرگەری بووە، بەڵام سەرچاوەو ژێدەری ئەدەبیو مێژوویو کلتووری کە هەتا ئێستا بەردەستمان کەوتووە، ناوی هیچ چەکێکی دیمەشقی تێدا نەبووەو هەتا ئەمڕۆش، نازانین، کام شمشێری جوانو نایاب، لەم هەموو شمشێرە چاکانە، لە دیمەشق دروست کراوە.[849]

بەڕای ئێمە (د. زکی) لەم ڕووەوە لە ڕۆڵی دیمەشق کەم دەکاتەوەو لە بواری شیرگەریدا هەقی خۆی پێ نادا، جگە لەوەش قسەکانی لەگەڵ پێشتریدا لەیەك ناچنو جیاوازن، بەڵام ئەگەر قسەکانی (الطرسوسي) ڕاست بن. کە دەڵێ: "شمشێر هەندێکی لە مەغریبو ئەندەلوسو وڵاتی ڕۆم دروست دەکران، هەشبوو لە وڵاتی هندو چینەوە دەهات، کە ئەمەیان شمشێری چاكو دەگمەن بوو.. وەلێ کانزای میسر، ئەو ڕەواجەی نەبوو..".[850] ئەگەر (الطرسوسي) ڕاستی کردبێ و وەهابووبێ، ئەوە ئێمەش دەخاتە سەر ئەو بڕوایەی کە شاری دیمەشق، نەك هەر لە سەردەمی تەیموری لەنگەوە، بگرە بەر لە سەلاحەددینیش، وردە وردە ناوبانگو پێگەی ڕابردووی خۆی، لە بواری شیرگەریدا داویە لە کەمی و پێ بە پێ، بەرەو پاش چووەو ئەو شۆرەتەی نەماوە. واتا وڵاتی شامو میسر لە سەردەمی سەلاحەددیندا، کە

---

[843] ـ كتاب، خزانة السلاح: دانەرەکەی نادیارە، دەستنووسێکی وێنەگیراوە لە کتێبخانەی خوێندنە باڵاکان، کۆلیژی ئاداب/٣٢٨، زانکۆی بەغدا (ژمارەی سپاردنی ١٢٣٢) پەڕەی ٠٠٢٤. صبح الأعشى ١٤٠/٢. کەچی (ياقوت الحموي) دەڵێ: (المشارف) دێهاتی نزيك حۆرانەو (بصرى)ی شامیش هەر ئەوێ کەوتووەو (شمشێری المشرفة)یش هەر لەوێ دروست دەکرێ، معجم البلدان، مادة المشارف.

[844] ـ صبح الأعشى، ١٤٠/٢.

[845] ـ المقدسي، أحسن التقاسيم، ١٨٤.

[846] ـ د. عبدالرحمن زكي، السيف في الاسلام، دار الكتاب العربي، القاهرة ١٩٥٧، ص١٠٥.

[847] ـ د. زكي، السيف، ص١٠٦. احسان هندى، الحياة العسكرية، ص٧٩.

[848] ـ د. حسين حبشي، نورالدين والصليبيون، ١٥٥.

[849] ـ د. زكی ، السيف، ص٢١١.

[850] ـ التبصرة ، ١٩/ أ.

(الطرسوسي)ی تێدا ژیاوه، پێگەیەکی ئەوتۆیان لە دروستکردنی ئەم چەکەدا نەبووە.[851] کەوابێ، شمشێر لە دەرەوە هاتووە.

(الطرسوسي) ئەوەشی گوتووە، کە سەلاحەددین، بە پەرەسەندن و چاکتربوونی شیرگەریدا گەیشتووە و دیوێتی، کە گەیشتبووە پلەیەکی بەرز و جوانکارییەکی تەواو، مادده گەلێکی زۆر "لەگەڵ ئاسنەکەیدا تێکەڵ دەکراو شمشێری وەها هەبووە موگناتیساوی کراوە، ئاسنیشی ڕاکێشاوە".[852] شمشێری وەهاش هەبووە، دەرمانی جۆربەجۆری تێکەڵ کراوەوەو ئەو دەرمانانە نمو شێی ئاسنەکەی دەمژی و وشکی دەکردەوەو کاری چاکی لە سرووشتی ئاسنەکەی دەکردو "نەیدەهێشت ژەنگ هەڵبهێنێ"، ئاسنەکەشی لە خەوش و خڵتە پاك دەکرایەوەو شەوقی پەیدا دەکردو دەبریسکایەوە.[853] ئەم مێژوونووسە، کە لە وەسفی هەموو جۆرە چەکەکاندا قاڵ بووە، دێتە سەر باسی جونەکانی شمشێر و ڕێژەی ماددەی ڕووەکی، یان کیمیاییەکانی ناو ئاسنەکانیان و جۆری ئاسنەکانیش باس دەکاو دەڵێ: شمشێری نایاب ئەوەیە، کە ئاسنەکەی پتەوو ڕەقە، کەش و هەواش کاری تێ ناکاو ڕێژەی پۆلاکەی زۆرەو خەوش و خڵتەی کەمەو "ئاسنێ ئەوەندە پاك بێ، شمشێری تیژترو بەهێزترو قایمتری لێ دروست دەکرێ و لە هەموو جۆرە شمشێرێکی دی پیرۆزتر و لایقترە".[854]

ماددەگەلی نامۆو بەگوێ ناسازو سەیرو سەمەرەی بە نموونە، وەك "أهليلج كابلي، بليلج، مغنيسيا، شابرقان، ذراريح[855] سقمونيا، سنبدو تنكار[856]" ناو دەبا کە گوایا، ئەمانەش لە دروستکردنی شمشێردا، لەگەڵ ئاسن سوودیان لێ وەردەگیرێ. هەروەها هەر بۆ ئەو مەبەستە، هەندێ شتی تریش دێنێتەوە، بە نموونە، وەك "توێکڵی هەناری ترش و، ڕەشکەو شمڵی و، مازوو، بەڕوو، هەندێ ڕووەکی دڕکاویی وەك (صبير)[857]". جگە لەوانە، کاتێکیش، کە شمشێرەکە دروست دەکرێ و تەواو دەبێ، دەڵێ: "هەندێ مادده لە ئاودان و تیژکردن و دەمەزەردکردنی شمشێرەکەدا بەکاردەهێنرێ، بە نموونە وەك: (قارچکە مارانەو لیکی داری عەوسەج و خڵتەی شەراب و کەفی دەریا و نەوشاترو شیری داری باینجانەکەرانەو (زهره) ماددەی تری لەو جۆرە بابەتانە)، کە شمشێرەکە تیژترو جوانتر دەکەن و سەرت و سەختی دەکەن، تا وەهای لێ دێ، هەموو شتێ دەقڵیشێنێ و شووشەش دەبڕێ.

بەهەرحاڵ، ئەم هەموو ماددەو دەرمان و پێکهاتانەو، ئەم باسی دوور و درێژی شمشێرگەرییە، ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە ئەم پیشەیە، پیشەیەکی چاك و پێشکەوتوو بووە. بە نموونە جوونێ لەم شمشێرانە: لە وردە ئاسن دروست دەکرێ، ئەگەر لە سەرە بزماری کۆنیش دروست بکرێ، ئەوە چاکتریشە، ئەم سەرە بزمارانە کێشی پازدە درەم ئهلیلجی کابلی و کێشی پازدە درەمیش بلیلجی دەکرێتە سەر، ئەوجا هەموو دەکرێتە تەشتێکەوەو بە خوێواوك پاك پاك دەشۆرێتەوە، ئەوجا بەو دەرمانە دەسورێ و زەهراو دەدرێ، پاشان دەکرێتە بۆتەیەکەوەو کێشی درەم و نیوێ مەگنیسیای پێوە دەکرێ و لە سەر ئاگر دەرێتە بەر مووشەدەمە، ئنجا ئاوی هێلکەی لێ دەپرژێنرێ و چەند ڕۆژێك لێی دەگەڕێن، تا بە تەواوی سارد دەبێتەوە، ئا، بەم جۆرە دەبێ بە شمشێرێکی کوشندە.[858] جۆرە شمشێرێکی دی بەوە

---

851 ـ کەچی کلۆد کاهین دەڵێ: ئەو ئاسنەی بۆ دروستکردنی چەك بەکار دەهێنرا، پێی دەگوترا (ئاسنی دیمەشق). بنۆڕە: Claude Cahen , Les Changement Te Chniques militares P,118.

852 ـ التبصرة، ورقة ١٩/أ.

853 ـ التبصرة، ورقة ٢/أ.

854 ـ ن، م، ورقە ١٩/أ.

855 ـ ذراريح: زەهرێکی کوشندەیە: المنجد، ص٢٣٤.

856 ـ لم تعثر علی معانی هذه الألفاظ (واتا مانای ئەم وشانەمان بۆ نەدۆزرایەوە).

857 ـ التبصرة، ورقة ٢/أ.

858 ـ التبصرة، ورقة ٢/ب.

دروست دەكرێ، كە سێ ڕەتڵ نەرمە ئاسن دێنن، لەگەڵ یەك ڕەتڵ شابرقاندا دەخرێتە بۆتەیەكەوەو كێشی پێنج درەم مەگنیسیای تێدەكرێ‌و مشتێكیش ئاردی توێكڵە هەناری ترشی پێوە دەكرێ، ئەوجا لە سەر ئاگر دەدرێتە بەر مووشەدەمە، تا لە قاڵبەكەیدا دەتوێتەوە، پاشان هێلكەكەی بە سەردا دەپرژێنن‌و شمشێرێكی ملپەڕێنی لێ دێتەدی.

هەرچی چۆنێتی شمشێر هەڵگرتنە، ئەوە، بەر لە سەردەمی سەلاحەددین بە ماوەیەكی كەم، گۆڕانی بە سەردا هاتبوو، زووتر دەیاننا بە شانیانەوە، بەلاّم (سیف الدین غازی بن عمادالدین زەنگی) كردی بە باو، لە پشتێنی ببەستن.[859] ڕاستیشت دەوێ، هەندێ جۆرە چەك، هەند بە زۆری بەكاردەهێنران، مێژوونووسان پێویستیان بە باسكردنی نەما، هیچ جەنگاوەرێكیش نەبوو، چەكێكی پێ نەبێ، بە تایبەتیش شمشێر، یان چەكێكی دیكەی لە جیاتی شمشێر هەڵنەگرتبێ، بە نموونە، وەك:

**٢ـ خەنجەر:**

ئەم چەكەش، تیغێكە لە شمشێری كەوانەیی (لار) دەچێ، بەلاّم بچوكترە. هەشە بچكۆلانەیە، لە گیرفاندا جێگای دەبێتەوە. خەنجەر، خواسایی بە بەر پشتێندا دەكرا، هەتا ئەمڕۆش، لە هەندێ لە وڵاتانی جیهاندا بەكاردەهێنرێ، بەلاّم كەمتر، نەخاسمە لە هەندێ وڵاتی ڕۆژهەلاّتدا، لە ناوچە شاخاوی‌و سارانشینەكاندا، كەم كەمێ دەبینرێ‌و، كەسیش نییە خەنجەری نەدیبێ‌و نەزانێ چییە. چەكێكی دیكەش هەیە، وەكو خەنجەر وایە، كەچی لە سەرچاوەو ژێدەردا بە دەگمەن باس كراوە، ئەو چەكە پێیان گوتووە، نیمچە، ئەوانەش كە باسیان كردووە بە (نمجاه) ناویان بردووە، چونكە وشەكە، وشەیەكی كوردییەو زمانیان گۆی بۆ ناكا، مەبەستیشی لە (نیمچە) نیوە شمشێرە، چونكە لە شمشێر كورتترەو خەنجەرێكی كەوانەییەو لە شمشێر دەچێ، بەلاّم بچووكترە.[860] دەڵێن سەلاحەددین، خۆیشی لەو كاردە گەورەیەی بە قەدەوە بووەو لە سەركەوتنەكەی شەڕی (حطین)دا، هەر بەو چەكە أرناط (ڕینۆ دی شاتیون)ی سەرگەورەی شاری (الكرك)ی بەدەستی خۆی كوشتووە.

**٣ـ ڕم:**

ڕم، چەكێكی نووك تیژە، ئیسلام‌و عارەبیش بەكاریان هێناوە، ڕم تێلاّیەكە، چوار تا حەوت گەز درێژە. ئاسنێكی نووك تیژ لە نووكەكەی گیراوە. دوو جۆری هەبوو، جۆرێكیان لە جۆرە قامیشێكی پتەو، كە لە وڵاتی هند شین دەبێ، دروست دەكرێ. وەكو قامیش قەفقەفە و گرێ گرێیە، بەلاّم ناوەكەی بەتاڵ نییە، پتەوە.[861]

بەو جۆرە ڕمە دەڵێن (الخطي)، چونكە لە هندستانەوە دەهێنرا بۆ شارۆچكەی (الخط) لە وڵاتی بەحرەین‌و، لەوێشەوە دەگەیشتە دەست عارەب‌و ئیسلام‌و خەڵكی دی. جۆری دووەم، لە داری توێكڵ قایمی، وەك داری بەڕوو و دارەبەن و ئەو جۆرە دارانە دروست دەكرا، پێی دەگوترا (الذوابل)[862]، واتا وشكەڵ. (إبن سیده) دەڵێ: ئەو ناوەی بۆیە لێنراوە، چونكە وشكەو توێكڵەكەشی قایمە.[863] هەرچی ئاسنە تیژەكەی نووكەكەیەتی، ئەوە پێیان دەگوت نێزە.

ڕم، سوارەكان هەڵیاندەگرت، وەلێ ڕمی پیادەكان لە هی ئەوان كورتتر بوو، دەیانگوتێ (المزراق)[864] واتا (كونكەر)، زۆر چاكیشیان بەكاردەهێنا.[865] لە جەنگی خاچدروشماندا، جۆرە ڕمێكی تر باوی سەندبوو، پێیاندەگوت، كۆنتاریان (Contarian) چونكە لە دارێ دروست دەكرا، بە یۆنانی پێی دەگوترا (كۆنتاریان).[866]

---

[859] ـ الكامل، ١٣٨/١١. أبوالفداء، المختصر، ٣١/٤. صبح الأعشى، ٣٩/٤.

[860] ـ بنۆڕە: مفرج الكروب، ١٩٥/٢. د. محمد التونجي، المعجم الذهبي، ص٥٨٣.

[861] ـ صبح الأعشى، ١٤٠/٢.

[862] ـ صبح الأعشى، ١٤٠/٢.

[863] ـ المخصص، ط/ المطبعة الكبرى الأميرية، بولاق ، مصر ، ٣١/٦.

[864] ـ التبصرة، ورقة ، ١٠٥/أ. . ابن الأزرق، بدائع السلك في طبائع الملك، منشورات وزارة الأعلام، بغداد ١٩٧٧، ج١، ص١٥٩.

[865] ـ نعمان ثابت، الجندية في الدولة العباسية، ط٢، مطبعة أسعد، ١٩٥٦، ص١٧٤.

[866] ـ مفرج الكروب، ١٨٣/١، هامش ٣. د. زكي، السلاح في الأسلام، ص٤٧.

خاچدروشمەکان، ڕمی کۆنتاریایان هەبوو، ئەوەبوو، کاتێ (العاضد)ی خەلیفەی فاتمی داوای لە نورەددین کرد، کە تورکەکان لە میسر بکێشێتەوەو سەلاحەددینی بەسەو کەسی تری ناوێ، نورەددین وەلامی دایەوە گوتی: کۆنتاریاکانی دەستی فەڕەنگ، مەگەر تەنیا تیری دەستی تورکان لە کاریان بخەن.[٨٦٧]

(الذهبي) لە کارەسات‌و ڕووداوەکانی ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٧٩ز) باس دەکاو، دەڵێ: "سەلاحەددین هێرشی بردە سەر شاری بانیاس‌و هێزەکانی پەلاماری فەڕەنگیان دا، پاشان هەواڵیان پێ گەیاند، کە لەشکرێکی فەڕەنگ وا گەیشتە بەرەوە، سەلاحەددینیش لە پڕ دای بە سەریانداو دیتی، ئەوا دە هەزار پیادەن‌و هەزار کۆنتاریایان پێیە".[٨٦٨]

قسەکانی (الطرسوسي) وەها نیشان دەدەن، کە. وەکو بڵێی. ڕمی کۆنتاریا تایبەت بووە بە فەڕەنگەکان، موسوڵمانان لەو چەکەیان نەبووەو دەڵێ: "بنو الأصفر و ڕۆمە هاوجنسەکانیان جۆرە ڕمێ بەکاردێنن لە داری (الزان) و داری (شوح)و ئەو جۆرە دارانە دروست کراوە، پێی دەڵێن کۆنتاریا، ئەم ڕمە درێژ نییە، سوارەکان لە کەڵپۆسی (قربوص)[٨٦٩] زینەکەیان قایم دەکرد، بەڵام نێزەکەی کورت‌و پانە لە دەمە پاچ‌و ئەو جۆرە شتانە دەچێ".[٨٧٠]

کتێبی زۆر لە سەر چۆنێتی بەکارهێنانی ڕم دانراوە، چ بۆ سوارە، چ بۆ پیادە[٨٧١]. (الطرسوسي) باسی چەندین جۆر ڕم دەکا، کە لە سەردەمی سەلاحەددیندا بەکارهاتووە و باو بووە[٨٧٢]و دەڵێ: چاکترین ڕم، بۆ شەڕ، ڕمی ڕەق‌و پتەوو کورتەو بڕینی کوشندەیە. ئەم جۆرە ڕمە، نێزەکەی وەك دەمە باڵتە تیژەو پانەو بچووکە. وا دیارە، جۆرە ڕمێکیش هەبووە، وەکو تیر بە تیژی دەردەپەڕی‌و ژێدار بوو "پارچەیەك لە ساقت‌و بڕکی هەندێ ڕووەکی خۆ هەڵواسی بۆ دەکرا بە ژێ"و بە گرژبوون‌و خاوبوونەوەی ئەم ژێیە، تیژتر دەردەپەڕی‌و دوورتریش دەڕۆیشت، ئەم ڕمە، مەمەیەکی بۆ کرابوو، ژێیەکەی لێ قایم دەکرا، کاتێکیش ڕم بەدەستەکە بەکاری بێنایا، "مەمەکەی بە پەنجەی دەجووڵاندو ژێیەکە بەردەبوو و تیرەکەش بە تیژی دەردەپەڕی". ئەم جۆرە ڕمە، لە دوا دوای حوکمی فاتمییەکاندا هەبوو. ئەم قسانەی (الطرسوسي) هی خۆی نییە، ئەو، لە (أبو الحسن الأبرقي الاسكندراني)ی وەرگرتووە، کە ئەم بە دەستی خۆی ئەو ڕمەی بۆ (شاور)ی وەزیری (ضرغام)ی دوا خەلیفەی فاتمییەکان دروست کردبوو، ئەو شاورەی، کە سەلاحەددین سەرونی کرد.[٨٧٣]

(الطرسوسي) ڕمێکی دیکەش باس دەکاو، دەڵێ: ڕمێکی تیر هاوێژە، ناوەکەی کلۆرە (بۆشە) و کرۆکی تێدا نەماوەو چەندین پارچەی هەیە، بەشێوەو بە شێوازی بەکارهێنانیشی لە ڕمی ساکار ناچێ‌و جیاوازە، بۆ دروست کردنیشی تێلایەکە (داری ڕمەکە) دێنن، ڕاست دەیقڵشێنن و دەیکەن بە دوو پارچەی یەکسانەوە، ئەوجا ناوەکەی دەکۆڵن‌و جوان لووسی دەکەن، تا گرێ‌و تەڵەزمی تێدا نامێنێ‌و ڕێگا لە تیرەکە نەگرێ، ئەوجا هەردوو پارچە کۆڵراوەکە، بە ڕووی ناوەوەدا جووت دەکرێن‌و "بە کەتیرەو سرێش پێکەوە دەنووسێنرێن"و چەور دەکرێن. پاشان لە درزی ژێرەوەدا، مەمەیەك چەسپ دەکرێ، سەرووی مەمەکە پانەو لەگەڵ بنکەی ناوەوەی کلۆرەکەدا تەخت دەوەستێ‌و مەمەکە دەکەوێتە دەرەوە، وەك میلی تفەنگی ئەم زەمانە، بەڵام ئەو، لە ژێیەکە قایم دەکرێ‌و، لە هەردوو لا تەنیشتی ڕمەکەوە بزمارێکیشی تێ دەخرێ، بە جۆرێ، کە بێت‌و بچێ، میلەکەش دەکەوێتە پێشی‌و بەرامبەریشی پارچە تەختەیەکی جوان نەخشێنراوەو چەسپ دەکرێ، لایەکەی دوای ژێیەکەوەی، درزێکی تێدایە توند ژێیەکە دەگرێ. لایەکەی تریشی،

---

[867] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٦٠. مفرج الكروب، ١٨٣/١. ابن الفرات، ج١، مجلد٤، ص٨٧.

[868] ـ العبر في خبر من غبر، ٢٢١/٤.

[869] ـ قربوص، یان (قربوس)، کەڵپۆزی زینەو، وشەیەکی کوردیی پەتییەو نە بە (صادە)و نە بە (سین)ە، بە کوردی بە (مشتووە بەرزە بزمارکوتەکەی پێشەوەی زینی ئەسپ دەگوترێ). وەرگێڕ.

[870] ـ التبصرة، ١٠٥/أ.

[871] ـ ابن هذيل الأندلوسي، حلية الفرسان وشعار الجعان، دار المعارف، القاهرة، ص٢٠٥ ـ ٢٠٧. آثار الأول، ص ١٦٢ـ ١٦٣. أحمد بن محمد الحموي، النفحات المسكينة في صناعة الفروسية، مطبعة التفيض، بغداد، ١٩٥٠، ص ٦٢ـ ٦٣.

[872] ـ التبصرة، ورقة ٩٦/ب ـ ١٠٦/ب.

[873] ـ التبصرة، ورقة ٩٦/ب.

قڵیشێکی تێدایە، هەر هەندەی مەمەکە بکەوێتە ناوی دەیگریۆ نایەڵێ دابەزێ[٨٧٤]و، ژێی ئەمەو ژێی کەوانەکە کەشو تووش دەوەستن. ملی مەمەکەش، کە کەوانەکەی لێ دەبەسترێ، ئەڵقەیەکی پێوە دەکرێ، بە جۆرێ، ئەگەر ژێیەکە ڕابکێشرێ، کەوانەکە بەردەبێو بە پەنجەش مەمەکە لە میلەکە لادەدرێو میلەکە دادەکەوێو ژێیەکەی بەر دەبێو مەکۆی ناو کلۆرەکە تەکان دەداو بە تیژی تیرەکەی بەردەمی دەردەپەڕێنێ.[٨٧٥]

ئەم هەموو باسو خواسی رمسازیو خەسڵەتی رمە، ئەوەمان بۆ ساغ دەکاتەوە، کە ئەم جۆرە رمو چەکانەیان بەرەو چاکتر گۆڕیوەو ئەم جوانتر کردنو چاکتر کردنەش، وای کردووە رمی تازە بابەت پەیدا ببێو ئاوێتەیەك بێت لە رمو کەوانو تیریش، واتا زەروور بووە، چەکی خێراتر و ئاسانتر بۆ کوشتنی دوژمن دابین بکەن. زهنی چاکسازان بۆ ئەو سەردەمە، گەلێ گرنگو بە نرخ بووە، بێ گومان ئەم ئامێرانە بەکردار وەکارخراون، هەرچەندیشە مێژوونووسو کارەساتو ڕووداونووسان. بەگشتی.، باسی ئەوەیان نەکردووە، ئایا جەنگاوەران کام جۆرە رمو کام جۆرە چەکیان لە کام شەڕو لە کام جەنگدا بەکارهێناوە، چونکە ئەوان بە هیچ کلۆجێ بە تەنگەوە نەبوونو گوێیان پێ نەداوە.

**چەکی سەڵتە زەلامیش**، ئەمانە بوون:

**١ـ تەور**[٨٧٦]:

تەور، چەکێکە، دەبڕێو دەپەڕێنێو دەشکێنی، لە پێکدا هەڵپرژانو شەڕی دەستەویەخەدا دەخرایەکار.[٨٧٧] تەور، کلکێکی کورتی هەیەو دەمەکەی تیژەو کەللەکەی لە مس، یان لە ئاسن دروست دەکرێ. تەور، دەمێکەو زۆر لە کۆنەوە بەکارهاتووە، وەلێ زیاتر لە سەدەکانی ناویندا باوی زۆرتر بووەو لە ڕەواجدا بووە. جگە لەوە، کە تەور بۆ کوشتار بەکارهێنراوە، تیپەکانی ڕاکێشانی ڕێگاو ڕچەش، بەناو لێڕەوارو جەنگەڵستاندا وەپێش لەشکر کەوتوونو بە تەور دارودەوەنیان بڕیووەتەوەو ڕێگەیان بۆ سوپا تەخت و خۆش کردووە. هەر لەبەرئەوەشە، کە ئەم تیپی داربڕانە وەپێش سوپا دەکەوتنو لە بەردەم لەشکرەوە دەڕۆیشتن.[٨٧٨]

هەندێ ئامێری دیکەش هەبوون، لە تەور دەچوونو هەمان سوودیان هەبوو، بە نموونە، وەك (الخطاف)[٨٧٩]و (اللَت)[٨٨٠] کە (الطرسوسي) دەڵێ: تەورێکی زۆر گەورە بووە.[٨٨١] ئەم ئامێرە، هەر لەو ماوەیەدا بەکارهێنراوە. مێژوونووسان دەڵێن: (أسدالدین شیرکۆ) دوای ئەوەی هەڵمەتی یەکەمی بۆ سەر میسر سەری نەگرت، بڕیاریدا لە میسر بکشێتەوە، سەربازو لەشکری خۆی لە (یلبیس) وەدەرهێناو خۆیشی لە دوای هەموویانەوە چاودێریی دەکردن "لیستێکی ئاسنی بەدەستەوە بوو، پاشکۆی لەشکرەکەی دەپاراست، موسوڵمانانو فەڕەنگەکانیش سەیریان دەکرد".[٨٨٢]

---

874 ـ ئەم شرۆڤەیەی (الطرسوسي) دەیکا، زۆر زەحمەتە بەر زەینی بدەی، چونکە لەلایەکەوە، قسەکانی کورتنو بێسەروبەرو ناڕەوانن، لەلایەکی دیکەشەوە، ئەو چەکانە بە سەرچوونو نموونەیەکمان دەست ناکەوێ، سەیری بکەینو لە قسەکانی ئەم مێژونووسە بگەین. هەرچی ئەو وێنەو هێڵکارانەشن، کە لە دەستنووسەکەدا هەن، ئەو سوودەی نییە و لێی تێ ناگەین. زمانەکەشی ئەوە هەر مەپرسە، تا بڵێی لاوازو دواکەوتووە. ئەم نەشازانە هەندێ چەکی دیکەشی گرتووەتەوە کە باسیان دەکا.

875 ـ التبصرة، ورقة ٩٩/ب.

876 ـ أو (التبر) بە فارسی، یانی تەور، (لەبەرئەوە بە شەکری کلۆ دەڵێن: "الطبرزد" واتا شەکری بە "طبر" شکێنرا) صبح الأعشی، ٢/١٤١.

877 ـ مفرج الکروب، ٢/٣٤٤.

878 ـ البستاني، دائرة المعارف، المجلد٩، ص٦٩٦.

879 ـ نعمان الثابت، الجندیة، ١٨٨. أحسان هندی، الحیاة العسکریة، ١١٧.

880 ـ انظر: محیط المحیط، مادة (لت)، مفرج الکروب، ١١/٣٠٠.

881 ـ التبصرة، ورقة، ١٢٠/أ.

882 ـ الکامل، ١١/٣٠٠، مفرج الکروب ١/١٤٠. الروضتین، ج١، ج٢، ص٣٣٦.

**٢ـ كوتەك و تێڵای ئاسن و گورز:**

کوتەك دارێکی سەر ئەستوورەو سەرەکەی تری، کە بە دەستەوە دەگیرێ بارێکەو جار جارەش سەرە قورسەکەی بزمارکوت دەکرێ، تا زیاتر کاریگەر بێت. کوتەك زۆرتر سوارەکان بەکاریان دەهێنا.[٨٨٣]

هەرچی تێڵایە، کە (لت)[٨٨٤]یشی پێ دەڵێن، ئەوە وەکو کوتەك وایە، بەڵام تەنیا لە ئاسن دروست دەکرێ. هەرچی (گورز)یشە ئەوە سەلکەکەی ئاسنەو کلکەکەی دارەو سەرت و قایمە.[٨٨٥]

گەلێ کەسیش دەڵێن، گورزو تێڵا، هەریەك ئامێرن،[٨٨٦] یان، گوایا، ئامێرەکە تێڵایان پێ گوتووە، پاشان ناوەکەی گۆڕاوەو بووە بە گورز.[٨٨٧]

دووژمن، خوودەی ئاسنیشی لە سەربا، ئەمان، بە تێڵاو گورز مێشکیان دەپژاند.[٨٨٨] لەبەرئەوە پێیان دەگوت (المقمعة) واتا (هەناسەبڕ)[٨٨٩] سوارچاکان لە ژێر پێیانەوە لە زینیان قایم دەکردو، کاتێکیش لەشەڕە شمشێرو شەڕە ڕم بێزار ببوونایە،[٨٩٠] دەستیان دەبرد بۆ ئەم چەکەو شەڕەکەیان پێ یەکلایی دەکردەوە، چونکە چەکێکی زۆر کوشندە بوو،[٨٩١] "هیچ کەس بەرگەی نەدەگرت و بەر هەرکەس کەوتبا، دەیپساندو هەناوی دەخست".[٨٩٢] (الطرسوسي) چەند جوونێکی دی لەم ئامێرە باس دەکاو دەڵێ: ئەوانە سەلك و ڕەنگ و ددانەکان و بزمارکوتی و دەسك و قاوغی کوشندەیان، کە جار جارە ئەڵماسیشیان لێ قایم دەکرد، جیاواز بوون.[٨٩٣]

ئەم ئامێرە لەگەڵ دەستەویەخەبوونی دوژمندا، یەکسەر بەکاردەهێنراو سوپای ئەییوبی لە شەڕەکەی لەوەڕگاکانی (عکا)دا بەکاریان هێنا. ئەوەبوو، لەو شەڕەدا، سەلاحەددین پێشەنگی سوپاکەی ناردە پێشەوەو لەو شەڕەدا چەکی گورزو تیرو ڕم کەوتەکار.[٨٩٤]

ئامێری گاڵۆك (چۆماخ)یش هەبوو،[٨٩٥] وەکو گورز وابوو.[٨٩٦] سوپای ئەییوبی ئەم ئامێرەشی لە هەندێ پێکدادانا بەکارهێنا. ئەوەتا (ابن الأثیر) کاتێ باسی داگیرکردنی قەڵا سەختەکەی (برزیە)ی ڕۆژهەڵاتی (لاذقیة) دەکا، ناوی ئەم چۆماخە دەبا، کە بە چاوی خۆی بە دەست سەلاحەددینەوە دیویەتی، کاتێ لەشکری ئیسلام لەم شەڕەدا زۆری بۆ هات و تەنگەتاو کراو قەڵاکەی زۆر هەڵەت و سەخت بوو، "سەلاحەددین بە سەر سەربازەکانی خۆیەوە دەگەڕاو دنەدنەی دەدان و (تقي الدين عمر)ی برازایشی لە تەکدابوو، هەتا نزیکی نیوەڕۆ شەڕیان کرد، ئیدی ماندووبوون و گەڕانەوە. کاتێکیش سەلاحەددین ئەمەی دی، بە چۆماخەکەی دەستی تێیان کەوت و بەرەو شەڕەکە گەڕاندنیەوە".[٨٩٧]

---

[883] ـ احسان هندي، الحياة العسكرية، ص١١٥.

[884] .R. Dozy. Supplement aux Dictionaires Arabes, Liban – Beyrouth, 1968, vo, 1.2 P523

[885] ـ التبصرة، ورقة ١٢٠/أ ، ب. احسان هندي، الحياة العسكرية، ص١١٤.

[886] ـ صبح الأعشى، ١٤٢/٢.

[887] ـ نعمان ثابت، الجندية، ص١٨٩. د. زكي، السلاح في الاسلام، ٢٦.

[888] ـ أحسان هندي، الحياة العسكرية، ص١١٤.

[889] ـ د. زكي، السلاح، ٢٦.

[890] ـ أردى شير، الألفاظ الفارسية المعربة، ص٦٠.

[891] ـ احسان هندي، ١١٤.

[892] ـ التبصرة، ١٢١/أ.

[893] ـ التبصرة، ١٢٠/أ ـ ١٢٥/أ.

[894] ـ مفرج الكروب، ٣٤٤/٢.

[895] ـ خەڵکی لە عێراق پێی دەڵێن (جماغ)و لە میسر پێی دەڵێن (بلطة).

[896] ـ مفرج الكروب، ٢٦٦/٢، هامش٣.

[897] ـ الكامل، ١٥/١٢. مفرج الكروب، ٢٦٦/٢.

**٣ـ کەوان:**

کەوان، باوترین چەکی تیرهاوێژبووەو، تا چەندین سەدەش، تیر تەنیا بە کەوان، دوور هاوێژراوە، میللەتانو کۆمەڵانی خەڵك بۆ شەڕو لە ئاشتیشدا بەکاریان خستووە. لە شەڕدا دژ بە دوژمنو لە ئاشتیشدا بۆ ڕاوکردنی ئاژەڵو باڵندە بەکاریان هێناوە. تیروکەوان لەلای عارەبی بەر لە ئیسلام باو بووە. سەردەمێکیش، کە ئەم باسەمان لە سەر نووسیووە، تورکان وەها مەشهور بوون تیرەندازەی چاکن.[898] بە نموونە، سەرچاوەکان دەڵێن: کاتێ (العاضد)ی خەلیفەی فاتمی، داوای لە نورەددین مەحمود کرد، تورکەکان لە میسر بکێشێتەوە. چونکە هەڵمەتەکەی نورەددین بۆ سەر وڵاتی میسر تەواو بوو بوو، سوپای نورەددین لە میسر جێگای خۆیان گرتبوو. نورەددین قایل نەبوو، چونکە تورکان تیرەندازی چاك بوونو گوتی: فەرەنگ تەنیا هەر لە تورکان دەترسن.[899]

کەوانی ساکارو سەرەتایی، تووڵەدارێکی نەرمو قایمو جیرە، لە هەندێ دار دەیبڕنو وەك کەوان دەیچەمێننەوەو ژێیەکی جیرو بەهێزیشی بۆ دەبەسترێ، ئەم ژێیە زۆرجاران لە چەرمی حوشتر دەبڕدراو لە کەوانەکە قایم دەکرا. کەسێ بەکاری بێنێ، ڕاست، ژێیەکەی بەرەو شانی چەپی خۆی ڕادەکێشێ، بە پێچەوانەی ئاڕاستەی تیرەکە، بە دەستی چەپیشی کلکی تیرەکە توند بە ژێیەکەوە ڕادەگرێ، هەرکە دەستی چەپی لە تیرو ژێیەکە شل کرد، تیرەکە بە تیژی دەردەپەڕێ.

تیر، لە داری گرێ گرێ مام ناوەند دروست دەکرا. عارەب، لە داری (النبع) دروستیان دەکرد، توڵەکانیان دەبڕیو، جوان لووسیان دەکردو توێکڵەکەیان دادەماڵی، ئەوجا لەبەر ئاگر بە تەواوی نەرمیان دەکردەوە.[900] تیر، خۆی دەبێ ڕێكو ڕاست بێ، دەمارلوولو قورسو سووك هاوێژ بێ، کورتیو درێژییەکەشی لەگەڵ شانو باڵی تیرزەنەکەدا بگونجێو لە باربێ.[901]

کابرای تیرزەن، گورزەیەك تیری لەگەڵ خۆی دەبرد، لە هەگبەیەکدا دەیگرتە کۆڵی، زۆرتر، ئەو هەگبەیە لە چەرم دروست دەکرا، جار جارەش، وەك سندوق لە تەختە دروست دەکرا،[902] (الجعبة)، یان (الکنانة) یان پێ دەگوت، بەکورتی واتا (تیردان).

کەوان، هەروەك خۆی نەمایەوە، ئەویش بەرە بەرە گۆڕانی بە سەردا هاتو بە شێوەی جۆر بە جۆر دروست دەکرا، ئەو بەرەو چاکترگۆڕانەی کەوان بە خۆیەوە دیتی، هیچ جۆرە چەکێکی دیکەی سەڵتە زەلام بەخۆیەوە نەیدیووە. تا وای لێ هات جۆرە تازەکانی لە کۆنەکان نەدەچوونو جیاواز بوون، کەوان، هەند پێشکەوت شانی دەدا لە شانی مەنجەنیق، بەڵام ناوەکەی هەروەك خۆی بە (کەوان) مایەوە، وەلێ، خەسڵەتو پێکهاتەکەی گۆڕا.

ئەگەر نەشڵێم هەمووی، بەڵام زۆربەی ئەم کەوانە جۆربەجۆرانە لە سەردەمی شەڕەکانی خاچدروشماندا بە کارهێنران بە تایبەتیش لە زەمەنی سەلاحەددیندا. ئەو شەڕانە، بوون بە بنەمای بەرەو چاکتر گۆڕانی چەکی دەستی ئیسلام، چونکە هەمیشە هەر لە ململانێی داگیرکاراندا بە کاردەهێنران، جاروباریش چاویان لە خاچدروشما ن دەکردو شتی تازەترو باشتریان لێوە فێردەبوونو، ئەوانیش شتی نوێو شتی چاك لە سوپای ئەیبوبییەوە فێردەبوون. هیچ گومان لەوەدا نەماوە ئەم چەکانە لە زەمەنی سەلاحەددیندا بەکارخراون، ئەوەتا (الطرسوسي) کە خۆی لەو دەمەی سەلاحەددیندا ژیاوە، نەختێ بەفراوانیش باسی دروست کردنی ئەم چەکانە دەکات:

**أ. جیرەکەوان (قسي الزيار):**

(الطرسوسي) ناونیشانە چاکەکانی ئەم چەکە هەڵدەداو دەڵێ: تیرهاوێژێکی تا بڵێی بەتەکانە، لەکەوانەکانی دی

---

[898] ـ بۆ سوارچاکیو تیرەندازەیی، تورکان بنۆڕە: رسائل جاحظ. تحقيق: د. عبدالسلام هارون، مكتبة الخانجي، القاهره ١٩٦٤، ص٤٥، الحسن بن عبدالله، آثار الاول، ١٤٦.

[899] ـ الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٦٠. مفرج الكروب، ج١، ص١٨٣. ابن الفرات، ج١، مجلد ٤، ص٨٧.

[900] ـ امين الخولي، الجندية والسلم، ص٢٧، نقلا عن ابن منكلي (الأحكام الملوكية).

[901] ـ آثار الأول، ١٦٠.

[902] ـ نهاية الأرب، ٢٣٥/٦. صبح الأعشى، ١٤٢/٢. تاج العروس ، ٣٢٣/٩.

گەورەترە، بە سۆترە، ژێیەکەی بەچەند زەلامێ ئنجا بێتەوەو، زەلامێ بە تەنیا لە کێشی کشانیدا نییە.[903]

جیرەکەوان، کەوانێکی جێگیربووی قورس و گران بووەو، وەکو کەوانەکانی دی لە سەر ڕێسای هێزی تەکانبەر کاری دەکرد. واتا هێزێکی ئەوتۆی دەویست ژێیەگەورەکەی بێنێتەوە (وەك هێنانەوەی میلی تفەنگ) پاشان دەست شلکاو ژێیەکەی بچێتەوە یەك و، بەو تەکانە گەورەیەی، کە پەیدا دەبێ، هەرچی لە سەر ژێیەکە بەندبووبێ، بە تیژی دەردەپەڕێ، ئەمەش لە سەر جیری (تزییر)[904]ی ژێیەکە وەستاوە، واتا، تا، بە هێزتر ڕابکێشرێ، تەکانی بەهێزتر دەبێ. هێنانەوەی ژێیەکە زەحمەت بووە، چونکە زۆر جیرو گەورە بووە، هەر لەبەر ئەوەشە، کە ناویاننناوە (جیرەکەوان).

تیرەکەی گەورە بووە، (٦٠ – ١٨٠سم) درێژبووە، کێشەکەشی (٣,٢) کگم بووە. خاچدروشمان، دروستکردنی ئەم جۆرە کەوانە، لە سوپای سەلاحەددینەوە فێربوون و لە شەڕەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتی کۆچی/ سەدەی سیازدەی زاییندا، واتا نزیکەی نیو سەدەش، پاش مردنی سەلاحەددین بەکاریان هێنا، نموونەی ئەو چەکەیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە بۆ ئەوروپاو، لە شەڕەکانیاندا خستیانەکارو ناوی "مەنجەنیقی تیر"[905]یان لێ نا. ئەم کەوانە هەند جیرو بەهێز بوو، دەگەیشتە هێزی ڕاکێشانی بیست زەلام و دەبوا زەلامێ ژێیەکەی بێنێتەوە (ڕابکێشێ) و بە ڕێك و پێکی و بە تیژی تیری سەر ژێیەکەی وەتەکان بهێنێ[906] و مەبەستی خۆی وەدەست بێنێ و ئامانجی خۆی بپێکێ. (الطرسوسي) دەڵێ: جیرەکەوان، خۆی کەوانێکە لە دوو لەوحە تەختەی (سندیان) دەتاشرێ، هەر لەوحەیەی شەش گەز درێژە، ئەوپەڕی پانییەکەشی بست و نیوێکەو، پانیی کەمەکەی بستێکەو کەمترینیشی نیو بستە، سەری ئەم لەوحەیە دوو (قیراط)[907]ە. واتە بە پانیی یەك پەنجەیە. ئەم دوو لەوحەیە، لە وەرزی پایزدا، بەکەتیرەو موو ناوپۆش دەکرێن، ئەوجا وەکو گورزە دەپێچرێنەوەو لێی دەگەڕێن، تا کاتی خۆی. پاشان سەیری دەکەن، ئەگەر دیتیان مووەکە تەواو بە لەوحەکەوە نووساوەو لێك هەڵناپچڕێ، ئەوجا تەختەکە بە تیغ ساف و لووس دەکەن و بەکەتیرەی گەرم سواغی دەدەن و لێی دەگەڕێن تا وشك دەبێتەوە، ئەوجا بە بربەن، دووبارە ساف دەکرێتەوە، ئەمجارەش لێی دەگەڕێن، تا بە تەواوی دڕی و زبری و ڕەق و تەقی نامێنێ. ئنجا دێنن چەوری دەکەن و شەوقی پێ هەڵدەهێنن. (الطرسوسي) دەڵێ: "ئنجا دوو ژێی لە داری سندیان بۆ دروست دەکەن و لەم سەرو ئەوسەری کەوانەکە، قایمی دەکەن، پاشان لە سەر لای سەرەوەو لای خوارەوەش، دوو سێیەك دوور لە لای ناوەند، ژێیەك لە موو و ئەبریسەم دەچنرێ، هەر کشتەکەی هەندێ قامکی دۆشاومژە ئەستوور بێت، کاتێکیش ئەم ژێیە جیرە دەچنرێ و تەواو دەبێ، چوارمێخەی لە سنگ دەدرێ، ئەوجا سنگەکان هەڵدەکێشرێن و هەردوو لەوحی کەوانەکەی لێ دادەنێن".[908] لە سەرچاوەکانی ئەو سەردەمەوە. وەکو باسی دەکەن. دیارە جیرەکەوان لە سەردەمی سەلاحەددیندا بەکارهاتووە. (العماد الکاتب) دەڵێ: "دوای غەزوکردنی قودس، (الملك العزیز عمادالدین عثمان بن صلاح الدین) کە جێگری سەلاحەددین بوو لە میسر، گەڕایەوەو کۆگای هەموو چەکەکانی لە قودس بەجێ هێشت، کە بە قەدەر چیایێ بارو بارخانەو چەك و جبەخانەی تێدا هەڵدرابووەوەو ئامێرو ئامرازو جیرەکەوانێکی زۆریشیان تێدابوون".[909]

کاتێکیش سەلاحەددین، قەڵای قایمکاری (صهیۆن)ی غەزو کرد. کەوتبووە ناوچە شاخاوییەکانی (حمص)ەوە. پێشەکی گەمارۆی دا، "سەلاحەددین کوردی شاخەوان و بەجەرگی زۆری بۆ ئەم پەلامارە هێنابوون، کە ئازاو بە جەرگ و نەترس بوون و ناوبانگیان هەموو وڵاتەکەی گرتبووەوە، بە تیروکەوانی ئاسایی و چەرخ و زمردەو کەوانی زەنبەلەك و

[903] ـ التبصرة، ورقة ٧٧/ب.

[904] ـ تزییر: من الزور، أعوجاج او میل، (واتا چەمینەوە).

[905] ـ د.سعاد ماهر، البحریة في مصر الاسلامیة، دار الکتاب العربي للطباعة والنشر، أحسان هندي، الحیاة العسکریة، ص١٢٤.

[906] ـ التبصرة، ٧٨/أ.

[907] ـ القیراط: هەر هەندەی پانیی یەك پەنجەیە، المنجد، ٦٢٠.

[908] ـ التبصرة، ورقة ٨/أ.

[909] ـ الفتح القسي، ١٤٤.

جیرەکەوان، تیرباران درێژەی کێشا".[910] ئەمانە هەموویان لەو جۆرە تیرەکەوانانە بوون، کە سوپای ئەییوبی لەو سەدەیەدا بەکاریان دەهێنا، کەوا لێرەدا یەکە یەکە باسیان دەکەین.

**ب. کەوانی چەرخ:**

کەوانی چەرخ، ئامێرێکە وەکو مەنجەنیق وایە، چونکە ئەمیش تیرو نەوت‌و بەردی پێ هەڵدەدرێت، بەڵام لە مەنجەنیق سووکترە.[911] ئەمیان لە شاخ‌و قۆچی گا دروست کراوە، نەك لە تەختە، ئەم کەوانی چەرخە لەناو شوورەکانەوە بۆ پاراستنی قەڵاو قایمکارەکانی ناو شار بەکاردەهێنرا.[912] واتا ئەم جۆرە کەوانە زیاتر، خاچدروشمان بەکاریان دەهێنا، بۆ پاراستنی خۆیان، چونکە لە سەردەمی سەلاحەددیندا، خاچدروشمان لە عەکاو هەندێ شارۆچکەی دی نەبێ. هیچ شارێکی موسڵمانانیان پێ گەمارۆ نەدراوە، بەڵام سوپای ئەییوبی گەمارۆی هەموو ئەو شارانەی دەدا کە خاچدروشمانی تێدا بوو. تەنیا شاری (أنطاکیة و طرابلس) و هەندێ شاری گچکەی تر نەبێ. دوورنییە کاتێ لە ناو شوورەکانی ئەم شارانەوە گەمارۆ دەدران، بەکاریان هێنا بێ، وەلێ بۆ هێرش هەرگیز بەکار نەدەهێنرا.

جۆرە کەوانەیەکی چەرخی دی هەبوو، لە ناو کەشتیدا بەکاریان دەهێنا، ئەمەیان لە دار دروست دەکرد، چونکە هەوای شێداری دەریاکە، شاخە گاکانی خراپ دەکردو دەیڕزاند. تیرباران بەم جۆرە ئامێرە، هەر ئەوەندە کەسی شارەزاو لێزان بووایە، تیری بە خەسار نەدەچوو.[913]

ئەم جۆرە کەوانە، زووتر لەلای مەغریبیان‌و فەرەنگیان باوبووە. پاشان لە شەڕەکانی خاچدروشماندا، موسڵمانانی ڕۆژهەڵاتیش لێیانەوە فێربوون‌و دروستیان دەکردو لە شەڕەکاندا بەکاریان دەهێنا. ئێمە پێشتر باسی (ابن الأثیر)مان کرد، کە چۆن چۆنی باسی چەکەکانی سوپای ئەییوبی کردووە، ناوی کەوانی چەرخیشی بردووە لەگەڵ ئەو چەکانەی دیکەدا، کە لە گرتنی قەڵای (صهیۆن)دا بەکاریان هێناوە.

(إبن شداد) دەڵێ: کاتێ هێزەکانی سەلاحەددین، شاری (أنطرسوس)ی کەناراویان گەمارۆدا، هێزە خاچدروشمەکان، لە ناوەوە، بە "کەوانی چەرخ، بەرگرییان لە خۆکردو هەر لە دوورەوە خەڵکیان بریندار دەکرد".[914] سوپای ئەییوبیش، بۆ غەزوی شاران‌و داگیرکردنی قەڵاو قایمکاریی دوژمن بەکاریان دەهێنا، بەنموونە وەك داگیرکردنی بەیرووت.[915] سەربازانی ئەییوبی، کاتی، کە لە (عکا)دا بەرەڤانێیان دەکرد، هێرشی سەر (عکا) هەند بەرفراوان‌و بەهێزبوو، خاچدروشمان لایەکی شوورەکەیان ڕووخاندو موسوڵمانانیش لە ناوەوە، بە کەوانی چەرخ‌و مەنجەنیق وەڵامیان دەدانەوەو نەیاندەهێشت خاچدروشمان بچنە ناو شارەکە، تا شوورەکەیان چاك کردەوە.[916] خاچدروشمان لە هێرشە سەرومڕەکەی سەر (عکا)یاندا، ئەم کەوانی چەرخەیان خستەکار، (إبن شداد) دەڵێ: "لە (٤)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) دا، دوژمن هێرشی بردە سەر شاری (عکا)و هەند زۆربوون، مەگەر خوا بیزانیایە چەند دەبوون، بەڵام خەڵکی ناو شارو جەنگاوەرە بە جەرگەکان و پیاوماقووڵ‌و ڕۆشنبیرانی ناو شارەکە، گوێیان پێ نەدان تا بە تەواوی دیتیان، وا خەریکن دەگەنە ناو شارو دەستی تەماع درێژ دەکەن‌و ئامێرەکانیان خەریکە دەگاتە شوورەو دیوارەکان، ئەوجا خەڵکێکی زۆریان خۆیان گەیاندە ناو کەندەك‌و خەندەقەکان‌و کەوتنە تیرباران‌و بەردباران و ئاگربارانیان، بە ئامێری

---

[910] ـ الکامل، ١٠/١٢. مفرج الکروب، ٢/٢٦٢.

[911] ـ احسان هندي، الحیاة العسکریة، ١٢٧. دز عبدالرحمن زکي، السلاح في الاسلام، ص١٦. Dozy, Supplemnt aux Dict, vel, I, P .182

[912] ـ الحسن بن عبدالله ، آثار الأول، ١٦٠.

[913] ـ آثار الأول ١٦٠.

[914] ـ النوادر، ص٨٨.

[915] ـ الفتح القسي، ١٠٤.

[916] ـ النوادر، ١٥٤. لە بارەی ئەم ڕووداوانەوە، بنۆڕە: الفتح القسي، ٤٥٩ ـ ٤٦٠. الروضتین، ٢/١٨١. لە بارەی بەکارهێنانی چەرخەوە، بنۆڕە: النوادر، ١٣٦. مفرج الکروب ٢/٣٣٦.

چەرخ و مەنجەنیق و چەکی تر بە یەك دەنگ هاوارو هەڕەشەیان دەکرد، تا سوپای ئەییوبی ڕاوی نان و بە سەریاندا سەرکەوت".[917]

ج. زەردەکەوان (الزنبورك):

سەرچاوەکان وەسفی ئەم جۆرە ئامێرەیان نەداوە، وەلێ دەشبینین مێژوونووسان، هەرچەندە هەندێکیان بە جۆرە تیرێکی لە قەڵەم دەدەن، بەڵام لەگەڵ کەواندا باسیان کردووەو تێکەڵ بە کەوانی دەکەن، نەك تیر. (دوزی Dozy) دەقێکی هێناوەتەوە، تێیدا دەڵێ: زنبورك تیرە، ئەو دەڵێ: "زنبورك تیرە، هەندەی پەنجە گەورە (کەڵە پەنجە) ئەستوورەو درێژییەکەشی باڵێکەو، چوار لایەو نوکەکەی ئاسنەو باڵدارە (پەڕدارە)، تا لە کاتی دەرپەڕیندا ڕێك بڕواو نەلەنگێ، لە هەر جێگایەکیش بکەوێتەوە، ئەوە شتێکی پێکاوە، یەك تیر لەم زنبورکە دوو زەلام. پاش و پێش. وەستا بن، دەسمێ، لە هەمان کاتدا، جل و بەرگ و زرێپۆشی سەربازەکەش دەسمێ و لە زەوییەکە دەچەقێ، نەك هەندە، بگرە بەردو دیواریش تێك دەدا".[918]

هەروەها (دوزی) دەڵێ: ڕەنگە ئەم وشەیە لە "زنبور" واتا زەردەواڵەی بچکۆلەوە وەرگیرابێ، چونکە ژێی ئەم چەکە. لە کاتێکدا دێتەوە یەك. دەنگێکی لێ دەلەرێتەوە، لە دەنگی باڵەکانی شەنگە سوورە (زەردەواڵە) دەچێ. د. سعداوی دەڵێ: تیری ئەم زنبورکە هەند بەسۆیە، پاپاکان قەدەغەیان کردووە.[919]

لە هەندێ سەرچاوەشدا، (زنبورك) بە جۆرە کەوانێ دانراوە، نەك بە تیر، (إبن الأثير) لەو حەکایەتەی پێشتردا، دەڵێ: "کەوانی دەستی و چەرخ و زنبورك و جیرەکەوان کەوتنەکارو تیربارانیان دەکرد، تا زۆربەی ناو قەڵاکە بریندار بوون".[920] دانەری کتێبی (آثار الأول) یش دەڵێ: ڕۆمی خاوەن سەنعەت و پیشە و خاوەن عەقڵ و ئاوەزبوون، بە پشوو بوون، خزمەتیان دەکردو لە فرۆفێڵی سیاسەتیان دەزانی و، وەستای چاکی ئامێرو ئامرازی جەنگ بوون، لە سوارچاکیدا بەختەسەر نەبوون، وەلێ لە شمشێربازیی و چرخ و زنبورك بازیدا، وەستابوون[921]. هەرچی (أبوشامە)یە، ئەوە، ئەو، چەرخ و زنبورك هاوشان پێکەوە باس دەکا،[922] کەچی (العماد الکاتب) "زنبورك و ناوك"[923] بە دوو جۆر تیر دادەنێ.[924]

بێ گومان، حاڵ وابێ، بەرەو چاکتر گۆڕانی تەکنەلۆجیای چەکسازی لە سەردەمی ئەییوبییاندا، هەر دەگەیشتە ئەو پلەوپایە پێشکەوتووەی، کە بە خۆیەوە دیتی. ئەو هەموو جۆرە ئامێری تیرهاوێژو تیربارانەش، بەڵگەی بەرەوچاکتر گۆڕانی هزری دروستکردنی کەوانگەلە. وەلێ هێزی بزوێنەرو تەکان پێ دەری ئەو هەموو جۆرە کەوانانە، هێشتا هەر لە سەر وزەو هێزی مرۆ دەوەستا، چونکە تەنیا وزەی مرۆڤ بوو، کە ژێی دەهێناوەو ڕایدەکێشاو تیری ئاڕاستە دەکرد. یەکێ لەم کەوانە باشتر گۆڕاوانە ئەوەیە، کە (الطرسوسي) لە ژێر سەردێری (سیفەتی ڕاستەك. صفة المجراة) دا باسی دەکات، لوولەیێ دێنێتە بەر زەین وەکو کەوان وایە، یان ڕوونتر بڵێین (کەوانێکی لوولەیی)یە. "ڕاستەکێ، کە بەپێی کەوانەکە نازانرێ چەندە، بەڵام درێژییەکەی دوو هێندەی درێژیی تیرەکەیە، بەجۆرێ دادەنرێ ژێیەکە لە هێنانەوەدا بیگاتێ". لەو جێگایەدا بە قفڵێکی ئاسن، یان مس دادەخرێ، بزمارێکیشی تێدەخرێ، وەکو کلیل بەرەو ژوورو بەرەو

---

917 ـ النوادر، ١٤٢. الروضتين، ٢/١٦٣.

918 ـ Dozy , Supplement aux Dict, vol, l.p 605. مفرج الكروب ٢/٢٤٤ هامش ١.

919 ـ التأريخ الحربي، ص١٩٦ هامش ٢. وەلێ د. سعداوی لەوەدا بە هەڵەدا چووە، کە دەڵێ: مێژوونوسە عەرەبەکان لە گەمارۆی (صور) دا نەبێ باسی زنبورکیان نەکردووەو لە بەکارهێنانیشیدا، تا ساڵی ٦٢٣ك ١٢٢٦ز، دواکەوتن‌و، لە وڵاتی ڕۆژهەڵاتدا لەو ساڵەوە باوی سەندووە.

920 ـ الكامل، ١١/١٢.

921 ص ١٤٦.

922 ـ الروضتين، ٢/ ١١٩.

923 ـ الفتح القسي، ١٦٣.

924 ـ بنۆڕە: لاپەڕەی ٢٨٧ لە کتێبەکە.

خوار دێتو دەچێ. ئەم بزمارە (كليلە) قفڵەكە دادەخات. ئەگەر بێتو بزمارەكە دەركەی، قفڵەكە شۆڕ دەبێتەوە و ژێیەكەی بەردەبێ، تیرەكە بەرتەكانی ژێیەكە دەكەوێو دەردەپەڕێ. ڕاستەكەكە میلێكی ئاسنی لێ قایم دەكرێ، تیرەكە هەندەی كەوانەكە بێو هەندەی ئەویش ئەستوور بێت، هەشیانە گەزێ درێژەو هەندەی ڕمێ ئەستوورە، تیرەكە لە سەر ڕاستەكەكە لەو جێگەیەدا دادەنرێ، كە بەرانبەرە بە ژێیەكە.[925]

هەرچی (إبن هذيل الأندلوسي)یە، ئەویش باسی ئەم جۆرە كەوانە دەكاو پێی دەڵێ: (كەوانی فەرەنگی)و، دەڵێ: بریتییە لە ستوونێكو تێلایەكو جەوزەیەك و كلیلێك، ستوونەكە ناو دەنێ ڕاستەك، چونكە ڕاست تیرەكەی بە سەردا دەردەپەڕێ، ئەگەر كلیلەكەشی لەلای جەوزەكەوە دەركەی، تیرێكی زۆر دەردەپەڕن.[926] هەروەها دەڵێ: ئەم جۆرە كەوانە تیرەكان دوور هەڵدەدەنو هەند بە وەستایی دروست كراوە، نیشانەكان بە چاكی دەپێكنو، هەر دەڵێی تفەنگە. ڕاستیشت دەوێ، داهێنانی ڕاستەك، بوو بە بنەمای دۆزینەوەو دروستكردنی لوولەكی تفەنگو، ئەو جۆرە كەوانانەش كە لە دوا دوای سەدەكانی ناویندا دروست كران، زۆرتر لە (چەكی ئۆتۆماتیكی سووك دەچن)[927]، كە ئەمەش بێگومان بریتییە لە بەرەو چاكتر گۆڕینی فكری سازدانی كەوانی لوولەكی. پاش دۆزینەوەی باروت..[928] خاچدروشمان لەم چەكەیان بە دەستەوەبوو، لە شەڕی دژ بە موسڵماناندا بەكاریان هێنا.[929]

**د. كەوانی پێ:**

تیرەی ئەم كەوانە بە هێزی هەردوو پێ دێتەوە، كەوان بەدەستەكە هەردوو پێی لێ گیر دەكاو خۆی بە پشتدا دێنێتەوە و تیرەكە لەگەڵ خۆیدا بەرەو پاش دێنێتەوە، لەبەرئەوە، مرۆڤ پێویستی بە پشتێنێكە، باشتر وایە لە پێستەی گا دروست كرابێو جوان خۆشە كرابێو، دوو قولاپی ئاسنی پێوەبێ، تیرەكەی لێ قایم بكرێ. كابرای تیرزەن هەردوو بنەپێی لە كەوانەكە گیر دەكاو بە پشتیشی پشتێنەكە، كە هەردوو قولاپەكەی پێوەیە، ڕادەكێشێ، تا تیرەكە دەگاتە قفڵی ناو ڕاستەكەكەو كلیلەكە دەخاتە ناوی. پاشان كەوانەكە بە دەست دەگرێو تیرەكە لە سەر ڕاستەكەكە، لە جێگای خۆی چەسپ دەكاو كلیلەكە لە قفڵەكە دەردەكات قفڵەكە دەسوڕێتەوە، چونكە وەكو خولخولۆكە وایەو بە دەوری تەوەرێكدا دەخولێتەوە، وەك بزمار لە هەردوولای ڕاستەكەكە قایم كراوە، جا ئەگەر كلیلەكەی لێ بابدا، خولخولۆكەكە دەخولێتەوەو ژێیەكە بەردەبێو تیرەكە بە تیژی پێش خۆی دەداو دەریدەپەڕێنێ.[930]

**ه. كەوانی پێنج تیر (الحسبان):**

بە قسەی (الطرسوسي)، گوایە، ئەم جۆرە كەوانە هی عارەبە، تیرگەلی بچوك بچوك، بە تیژی دەهاوێ، تیژ هاوێژیی، ئەم تیرانەش، لەبەرئەوەیە، لوولەی كەوانەكە گورزەیەك تیر دەگرێ، لە پێنج تیر كەمتر نییەو، ئەگەر ژێیەكە تەكانیان پێیدا، ئەوا هەموویان بە جارێ دەردەپەڕنو وەكو كوللە بڵاو دەبنەوە، لەبەرئەوە تیرەكان شوبهێنراون بە كوللەو كەوانەكەشی ناونراوە كەوانی (الحسبان) واتە چەندین دانە تیر.[931] ئەم جۆرە كەوانە، وەكو دوو كەوانەكەی پێشتر قفڵ و جەوزەی نەبووە. جا وەكو (الطرسوسي) دەڵێ: ئەم كەوانە لەبەرئەوەی، كە تیری خێراو تیری زۆری تێدایە، لەبەر ئەوە

---

[925] ـ التبصرة ٨١/ب.

[926] ـ ابن هذيل، حلية الفرسان، ص٢١١ـ ٢١٢.

[927] پێشی دەڵێن: (ئەربالیست Arbalest یانArbolist ) كە بریتییە لە كەوان هەڵدراو، چەكێكە بە چەكەكانی سەدەكانی ناوەند، بۆ هەڵدانی تیرو خڕكە بەرد ... بەكاریان دەهێنا. المورد، قاموس انگليزي ـ عربي، منير البعلبكي، ط/ ١١، دار العلم للملايين ١٩٧٧، بيروت، ص٥٨.

[928] ـ احسان هندي، دارالعلم للملايين، ١٩٧٧. ص١٠٥.

٩٢٨ Oman, AHistory of the Art of war in the middle Ages , Second Edition, New york, Vo١٠ p, ٣٣٠.

[930] ـ التبصرة، ورقة ٨٥/ب.

[931] ـ التبصرة، ورقة ٨٦/أ.

جەنگاوەران هەر لەمەیان بە دەستەوە بوو، ئەم کەوانەیان پێ خۆشتر بوو، ژێدەر و سەرچاوەکانی ئەم سەدەیە[932] ناوی (ناوکات)یش دەبەن، ڕەنگە مەبەستیان لە تیرە بچوکەکانی ئەم کەوانە بێت، کە گوایا بە زمانی (فارسی) تیرە بچووکەکانە.[933] کەچی (إبن منکلي) ڕێك و ڕاست بەم کەوانەیە دەڵێ: (پێنجەکان). کە بە کوردیو بە فارسیش. دەکاتە پێنج تیر، (أبن منکلی) دەڵێ: تیر بارانێ دەکا، هەر مەپرسە.. دوژمن بە سەر شوورەکاندا شۆڕدەکاتەوەو بەریاندەداتەوە". هەروەها دەڵێت: ئەم جۆرە کەوانە لە دێر زەمانەوە هەر هەبووە.[934]

**و۔ کەوانی چوار پاڵوو ( متعددة الأتجاهات ):**

ئەم کەوانە یەك کەوان نەبووە، بەڵکو چوار کەوانی چەرخ بوونە لە یەك قولەدا، چوار لا، یان پێنج یان شەش لای هەبووە، یان زیاتر، بە پێی ئارەزووی وەستاکەی. هەر لایەی کەوانێکی لێ قایم دەکرێو هەرکەوانەشی ڕاستەکێکی پێوەیەو هەر چوار ڕاستەکەکەش لە چەقی قولە (تاوەر)ەکەدا لە خاڵی ناوەڕاستدا یەکدگیر دەبنو یەك قفڵ دەیانخاتە کارو یەك کەسیشی بەسە. هەر ڕاستەکەیش سێ تیر، یان چواری تێدایە، واتا هەر چوار کەوانەکە لە جۆری پێنج تیرن، لەوانەن کە ناوکەکان دەهاون. کاتێ ئیشی پێبکەیو کەوانەکە بکەیتەوە، ئەوە گورزەیەك تیر بەهەر چوار لادا دەردەپەڕن، ئەگەر تاوەرەکەش شەش لا بێت ئەوە لەو بارەدا شەش کەوانەی بۆ ساز دەدەرێ، واتا بیستو چوار تیر دەهاوێ، دووژمنیش لە دوورەوە، وا دەزانێ تاوەرەکە ژمارەیەك زەلامی تێدایە تیر دەهاون.[935]

**ز۔ کەوانی نەوتهاوێژ:**

کەوان، تەنیا بە تیربارانو بەردبارانەوە نەوەستاوە، بەڵکو بەرەو چاکتر گۆڕاوەو کەوتە نەوتهاویشتنیش. ئەو کەوانەش، کە نەوتیان پێ دەهاویشت، وەکو کەوانی پێ وایەو ڕاستەكو قفڵو جەوزەشی هەیە، وەلێ کیتەڵەیەکی پێوەیە، نیمچە خڕ، بە وێنەی لەتە گوێزێکی هندی، یان ڕوونتر بڵێین، وەکو کەشکۆڵی دێوانان، چاڵێکی بۆ کراوە، لەو چاڵەدا جێگای دەبێتەوە،[936] پاش ئەوەی پڕ دەکرێ لە نەوت، لە چاڵەکەدا دادەنرێ، ئەم کەوانە ئەو نەوتە بەکڵپەی ئاورەوە هەڵدەدا بۆ سەر دوژمنان، "هەر شتێکی بکەوتایە ڕێ تێکی دەشکانو ئاگری تێبەردەدا". چونکە کیتەڵەکە "وەکو تیر بە تیژی لە کەوانەکە دەردەپەڕێ".[937]

دەبێ ئەوەش بڵێین، تیرەکان جگە لە پێکانو کوشتنو شتی دیکە، وەك تەتەر نامەگەلیشیان پێدا هەڵدەدان بۆ گەمارۆدراوانی ناو شوورەو قەڵاکان، جار جارە، نامەکەیان یەکسەر لە سەر تیرەکان دەنووسی. ئەگەر هێرشبەران مەبەستیان ترساندنو تۆقاندنی خەڵکی ناو شارەکەو جەنگاوەرەکان بووبایە، ئەوە لەو بارەدا، دەنگوباسی درۆیان لە سەر تیرەکان دەنووسی، یان لە سەرکاغەز دەنووسیو بە تیرەکانیانەوە دەلکاندو تیرەکانیان بە سەر دیوارو شوورەکاندا ئاوەدیو دەکرد، بەو جۆرە لە ورەیان دەخستنو دەیانخستنە سەر ڕاڕاییو دوو دڵییو خۆبەدەستەوەدان. جا ئەگەر

---

[932] ـ الفتح القسي، ١٦٣. (الطبری) لەگەڵ ڕووداوەکانی ساڵی (٢٥١ك/ ٨٦١ز)دا، باسی ئەم کەوانانە دەکاو دەڵێ: "تیرەندازان لە بەغداوە بە سواری بەلەم هاتن لەو (ناوکییانە)یان پێ بوو، لەوانەیە هەر تیرەو چەند کەسێکی لێ کوشتبن". تأریخ الرسل والملوك، طبعة إنتشارات جهان، طهران، عن طبعة دی غویە، مجلد ١٢، ج٣، ١٦٢٦.

[933] ـ هنداوي، معجم الألفاظ الفارسية، ص٣٢١. وەرگێڕ: بنچك، ناوك وشەی کوردین، هەزار ڕەحمەت لە حاجی قادری کۆیی کە دەڵێ:

کتێبو دەفتەرو ڕەشنووسو کاغەز بەکوردی گەر بنوسرایە زەمانی

مەلاو شێخو گەداو پادشامان هەتا مردن ئەما ناوونیشانی

[934] ـ التدابیرات السلطانیة، مخطوط، مصور في المجمع العلمي العراقي، ورقة ٦٢.

[935] ـ التبصرة ٨٩ب ـ ٩١ / أ.

[936] ـ التبصرة، ص٨٨ أ ـ ب.

[937] ـ ئەمەش مانای وایە ، کیتەڵەی پڕ لە نەوتیان دەهاویشتە سەر دوژمن، کە وەکو بۆمبای نەوتین وایە.

ترسیان لێ نیشتبا و لە ورە کەوتبان، ئەوە، وەڵامەکەیان دەنووسی و بە تیر، بۆیان هەڵدەدانەوەو تەسلیم دەبوون.[938]

**٤ـ قۆچەقانی. بەردەقانی (المقلاع):**

قۆچەقانی (قاڵماسن) کۆنترین چەکی بەردهاوێژە، مرۆڤ بەرلەوە، بەردی بە دەست دەهاویشت، وەلێ پاش ئەزموون و تاقیکردنەوەی دوورو درێژ، بۆی دەرکەوت، تا زیاتر قۆڵی لێ هەڵسوڕێنێت و گوڕی لێببەستێتەوە، بەردەکە تیژترو دوورتر هەڵدەدا، بەو جۆرە، سا، بە هەر جۆرێ، بۆی ڕەخسابێ، توانیی قۆچەقانی دروست بکات. قۆچەقانی پارچە چەرمێکە، یان پارچە قوماشێکە هەندەی لەپی دەستێ، یان نەختێ گەورەتر، لە ڕاستو لە چەپەوە، دوو تیلماسك، یان دوو کشتەکی لێ قایم دەکرێن و پارچە چەرمەکە دەکەوێتە ناوەڕاستو بەرد، یان ئاسن، یان پارچە قوڕقوشمی تێ دەخرێ.[939] بەکارهێنانی قۆچەقانی لەسەر بنەمای تووڕهەڵدانی مەرکەزی بەجێ دەهات، واتا بەردەکە لە پارچەکەدا دادەنراو دوو سەرە بەرەڵاکەی تیلماسکەکان بەیەك دەست دەگیران، قۆڵیان لێ با دەداو، لەپڕ یەکێ لە سەرە تیلماسکەکانیان بەردەداو بەردی تاین بە تیژی بەرەو نیشانەکە دەردەپەڕی.[940] بەو جۆرە، قۆچەقانییەکە بە دەستەوە دەمێنێتەوەو دووبارەو سێ بارە.. بەکاردەهێنرێتەوە. ژێدەرو سەرچاوەکانی ئەو سەردەمەی سەلاحەددین باسی قۆچەقانیان نەکردووە، بەڵام لامان وایە ئەم چەکەیان بەکارهێنا بێ، چونکە چەکێکی سووكو بەکاربووەو، بۆ سەڵتە زەلام شتێکی بە سوود بووە، دوژمنی لە دوورەوە ترساندووەو زیانی پێ گەیاندووە.

**دووەم: چەکی قورس:**

**١ـ نەوتو ئاورهاوێژەکان:**

چەکی جۆر بە جۆری سەڵتە زەلام، لەوانەی، کە باسمان کردن و، لە سەردەمانێکی کۆنەوە بەکاردەهێنران، چەکی تازە بابەت هاتە پاڵیو ئەم چەکە تازانە ئاگریشیان دەهاویشتە سەر دوژمن و، قەڵاو قایمکارییەکانیان ئاورباران دەکرد، ڕاستیشت دەوێ هزرو ئاوەزێ، کە ئاوری بۆ شەڕ هێنایە مەیدان، بیرۆکەیەکی نوێ نەبوو، لەوەو پێشتریش دەمێك بوو، بەر لەچەندین سەدەش هەر هەبوو. وەلێ ئەوەی تازەبوو، ئەوەبوو، شەڕەکانی خاچدروشمان، هونەرو فڕوفێڵی جەنگی گەمارۆدانی چالاکتر کردو، بە بەرەو چاکتر گۆڕینی ڕێگە و شێوازی وێرانکردن و مین نانەوەو، بەکارهێنانی مەنجەنیق و بەرانەو چەکی بە هێزی ئاورهاوێژ، سیماو ڕەوشی شەڕەکانی بە بارێکی تازەدا گۆڕی...

بەکارهێنانی ئاور بۆ شەڕ، لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتەوە هاتە ئاراوە، گوایا کابرایەکی میسری[941]، یان کابرایەکی سووریایی[942] بەناوی کالینیکۆس (Callinikos) کە لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی زاییندا، لە شاری (بعلبك) ژیاوە، ئەو، ئەم بەزمە تازەیەی داهێنابێ. خەڵکی ڕۆژهەڵات ئەم چەکە بەکارەیان لە شەڕدا بەکارهێنابوو، ئاگرەکەش لە تێکەڵە ماددەگەلێکی زوو ئاورسێنی (سريعه الألتهاب)، وەك گۆگردو نەوتو جۆرە راتنج[943]و ڕۆنێ پەیدا دەکرا، کە لە ناو

---

938 ـ عبدالرؤوف عون، الفن الحربي في صدر الأسلام، دار المعارف ، شارع كورنيش النيل، القاهرة ١٩٦١، ص١٤١.

939 ـ البستاني، دائرة المعارف، ٧٠٢/٧.

940 ـ أمين الخولي، الجندية والسلم، ص٢٨.

941 ـ دائرة المعارف ، البستاني، ٧٠٥/٩. د. سعاد ماهر، البحرية في مصر ، ٢٣١.

942 ـ جرجي زيدان، تأريخ التمدن ١٩٢/١. إحسان هندى، الحياة العسكرية، ١٥٢. أمين الخولى الجندية والسلم، ص٣٣. د. زكى السلاح في الاسلام، ص٥٩، جورج كاستلان، تأريخ الجيوش، ص٥٥. أنوين جون ديفيز، فرنسا الجريمة على ضفاف النيل، ترجمة زكي شنودة المحامي، مطبوعات كتابي، سنة الطبع بلا، ص٧٥. د.جوزيف نسيم يوسف، العدوان الصليبى على مصر، دارالكتب الجامعية، الأسكندرية الطبعة الأولى، سنة ١٩٦٩، ص١٥٧.

943 ـ (یان ڕەگی دارێ، ماددەیەکی کەتیرە زوو گڕدەگرێ، هەندێ داری وەك سنەوبەرو دارەبەنو ئرزدەری دەدەن)، مفاتح العلوم، مطبعة الشرق، القاهره ١٣٤٢، ص١٤٩.

لوولەکی مسدا، یان بە شێوەی گۆی گرتوو، یان قوماش و کەتانی بە نەوت هەڵکێشراو[944]، دەهاوێژرانە سەر دوژمن.

ئەم چەکە بەوە ناوی دەرکرد، کە چەکێکی کاریگەرەو زۆریش زیانبەخشەو لە هەواو لە ئاویشدا، هەر دەسوتێ و ناکوژێتەوە، گوایا ئاسن و بەردیش دەسووتێنێ،[945] تەنیا بە لبادێ دەکوژێتەوە، کە بە سرکەو شەب و بۆرەك[946] تەڕکرابێ، بەڵام ئاوی پێدا بکرێ، بڵێسەکەی زیاتر دەبێ، گریگی کۆن لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتەوە فێری ئەم ئاگرە بوون، پاشان لەوانەوە گەیشتە عارەبەکان و عارەب ناوی نا (ئاوری گریك)[947] هەرچی ئەو ئامێرەشە، کە ئەم نەوت و سوتێنەرانەی پێ دەهاوێژران، ئەوە، پێیان دەگوتن، نەوتوەشێن، وەلێ پاشان هەر بە تیرو مەنجەنیق ئاورەکانیان هەڵدەدا، چونکە ئەمەیان دوورتری دەهاویشت و باشتریشی دەپێکا، کابرای نەوتهاوێژیش جۆرە بەرگێکی دەپۆشی نەدەسووتا، ئەسپەکەشی بن زینی ئاودامانی هەبوو (تجافیف)[948]، لەشی دادەپۆشی و لە ئاگرو تکەی نەوتیش دەیپاراست.[949]

ئەم ئاگری گریکە، ئازارێکی زۆری خاچدروشمانی دەداو، ئەوان هیچیان لێ نەدەزانی، لەبەرئەوە، تەنیا هەر ئەییوبییان بەکاریان دەهێنا، لەم ڕووەوە (أومان) دەڵێ: ئەم ئاگری گریکە، مەگەر بە دەگمەن لە ڕۆژئاوادا بەکاربخرایە، چونکە نەیاندەزانی ئاوێتەکەی چییەو چی نییە،[950] تا ئاوابوونی ئەستێرەی ئەییوبییانیش هەر لێیان نەدەزانی. سوارچاك و نووسەری فەرەنسی (دی جوانفیل) لە کتێبی (بیرەوەرییەکانی جەنگی خاچدروشمان)دا وەسفی ئەم ئاگرەی گریکە دەکا، کە لە سەردەمی دوا مەلیکی ئەییوبییاندا لە میسر (الملك الصالح نجم الدين أيوب) لە شەڕی سێیەمی شاری (دمياط) دا، ڕێکەوتی (جمادى الأولى ساڵی ٦٤٦ك/ ٢٥ ئاب/١٢٤٨ز) سەربازانی ئەییوبی خاچدروشمانیان لە شارەکە ئاگرباران کرد، دەڵێ: ئەم ئاگرە، خاچدروشمانی لەو شارەدا بە تەواوی تۆقاند، لە زمانی (سێر ولتر کوریل Waltar de Cureil) ی هاوڕێیەوە، دەڵێ: گەورەکانم! ئێمە خەتەرێکی گەورەمان لەسەرە، چونکە، ئەگەر دوژمن، ئاگر لە تاوەرەکانمان بگرێ و ئێمەش نەجوولێین و لە جێگاکانی خۆمان بمێنینەوە، ئەوە، لەو بارەدا، مەرگ لە هەموو لایەکەوە یەخەمان دەگرێ، خۆ ئەگەر بێت و ئەم جێگایانەش چۆڵ بکەین کە داگیرمان کردوون، ئەوە لەم بارەدا، ئابڕوومان دەچێ و لە خودا زیاتریش کەس لە مەرگ ڕزگارمان ناکات. جا ئامۆژگاریم، ئەوەیە، هەرکە ئەم ئاگرەمان تێگیرا، ئێمەش هەر هەموومان کڕنووش بۆ خودا بەرین و لێی بپاڕێینەوە لەم مەترسیی مەرگە بمانپارێزێ.

وەنەبێ مەلیك (لویسی نۆیەم) لە سەربازەکانی ئازاتر بووبێ، نەخێر، ئەم لەوان زیاتر زراوی تۆقیبوو. (جوانفیل) باسی ئەم ترسنۆکییەی دەکات، دەڵێ: "ئاگرەکان کە دەگەیشتنە سەر ئۆردوگاکەمان، بڵێسەیان شەوی دەکردە ڕۆژو سەربازگەکەمان دەبووە چراخان. دوژمن ئەمشەو سێ جار ئاگربارانی کردووین، چوار جاریش، بە تیر، ئاگریان تێ گرتووین، مەلیکی گریکیش هەرچەند بیستبای ئاگرباران کراوین. هەر لە سەر پێخەفەکەی خۆی هەڵدەستایە سەرپێ و هەردوو لەپێ بۆ ئاسمان بەرزەکردەوە، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە نوێژی دەکردو دەیگوت: (خوای بە ڕەحم و میهرەبان، گەلەکەم بۆ بپارێزە..)".[951]

میرکچ (أنا كومنينا)ی کچی (الكسيوس كومينوس) ی ئیمپراتۆری بیزەنتی، کە هاوزەمەنی هەڵمەتی یەکەمی

---

[944] ـ جرجي زيدان، تأريخ التمدن الاسلامي ١٩٢/١. نعمان ثابت، الجندية، ١٤٦. عبدالرحمن زكي، السلاح، ٥٩.

[945] ـ دائرة المعارف البستاني ٧٠٥/٩.

[946] ـ الحسن بن عبدالله ، آثار الأول، ١٩٧. بۆرەك = النطرون، مفاتح العلوم ١٤٨.

[947] ـ أدوين جون ديفيز، فرنسا الجريمة، ص٧٥.

[948] ـ التجافيف، الدروع الخاصة بالوقاية من النار، (پاشان باسی دەکەین).

[949] ـ احسان هندي، الحياة العسكرية، ص١٥١. التذكرة الهروية، ص٨١. هامش ٣ للمحقق.

[950] ـ Oman. the arts of War in The middle ages,N.Y. ١٩٥٣, P. ٧٢.

[951] ـ محمد سعيد العريان، د. جمال الدين الشيال، قصة الكفاح بين العرب والأستعمار، طبعة ثانية، دار المعارف بمصر، القاهرة ١٩٦٠م، ص٨٣. احسان هندي، الحياة العسكرية، ١٥٣ـ ١٥٤. د، جوزيف نسيم يوسف، العدوان الصليبي على مصر، ص١٥٧.

خاچدروشمان بووە، کتێبێکی لە بارەی مێژووی ژیانی باوکییەوە نووسیووە، لەو کتێبەیدا دەڵێ: ئاگرەکە دەکەوتە ئاسمان و بڵێسەی دەدا، پاشان دەتگوت تۆپەڵە جەهەننەمێکەو خەڵکی بە برژان دەبرژاندو بە خۆیان و کەلوپەلیانەوە دەبوون بە خۆڵەکەوەو با دەیبرد. میرکچ لەباسی پێکهاتەی ماددەگەلی ئاگرەکەدا، هەروەک (الطرسوسي) باسی دەکاو دەڵێ: "ئەم ئاوێتە ئاگرینە دەکرێتە لوولەوەو هەڵدەدرێتە سەر دوژمن و ئاگری تێ بەردەدا، چونکە هەر ڕمب لە عەردی بدا دەتەقێتەوەو، کڵپەیەك دەکا، بەکەس ناکوژێتەوە، شەراو بڵێسەی بە هەموو لایەکدا بڵاودەبێتەوەو، دەورووپشتی خۆی دەکا بە ئاگردانێکی بە تین".[952] (جوانفیل) دەڵێ: "ئەم ئاگرە، دەگرمێنێ دەڵێی هەوری بەهارە، بە ئاسماندا دەکشێ و دێ، هەر دەڵێی عەزیایەکە لەیەك کڵپە ئاگرو بە ئاسماندا دەفڕێ و، وەك ئەستێرەیەکی گەورە چۆن ئەکشێ، ئاوا یەك پارچە هەموو ئاسمان ڕووناك دەکاتەوە، ئەو شەوە ترسناکە، سێ جار ئەم دێوو درنجە ئاگرینەیان بە سەرماندا باراند.. ئەم ئاگرە گریکییە". ئنجا دەڵێ: کاتێ سوپای ئەییوبی ئەم ئاگرەیان بە سەرماندا باراند "هەر دەتگوت دەرگای دۆزەخیان لە پڕ بە ڕووماندا کردەوەو ئاگر لە داری هەردوو تاوەرەکەمان بەربوو، بڵێسەی دەگەیشتە هەر شتێ ئەویشی دەکردە خۆڵ..".[953]

(العماد الکاتب) یش دەڵێ: سەربازانی ئەییوبی، کە بە کیتەڵە پڕ لە ماددە سووتێنەرەکان دەستیان کرد بە بۆردوومان کردنی تاوەرە دارینەکانی خاچدروشمان لەسەر شوورەکانی شاری (عکا)، خاچدروشمان "سەریان لە تەربوونی تاوەرەکان سووڕدەماو، نەیاندەزانی، کە ئەمە ئاگری لە دواوەیە".[954] کاتێکیش سەربازانی ئەییوبی، تاوەرەکانیان ئاگردا، خاچدروشمان حەپەسان.

(الطرسوسي) باسی شێوازی ئامادەکردنی ئەم ماددە سووتێنەرانە دەکاو دەڵێ: لە نەوت و گۆگردو نوورەی نەکوژاوەو ڕۆنی کەبات[955] و ڕۆنی کەتان و ئاردەکاو کەپەك و ڕۆنی داری بەلسان[956] و پیوی نەهەنگ و کەتیرەی گەوەن (السندروس)[957] و ڕۆنی ڕاتنج[958] و توێکڵی دارتوو و توێکڵە هێلکە، پێك دێت. ئەم ماددانە بە ڕێگایەکی تایبەت و هەریەکەو بە کێشی گونجاوی خۆی تێکەڵ دەکرێن، ئاوێتەیەکی لێ پەیدا دەبێ، توانستێکی زۆر گەورەی سوتاندنی هەیە، "ئنجا ڕۆ دەکرێتە ناو کوولەکەیەکی گەورەوەو گومگومە (الأنبیق)ی لێ قایم دەکرێ و (پارچە قوماشێك) ئاگر پێوە دەنێن و دەیخەنە ژێری، تا هەر هەمووی دەدڵۆپێنرێ، بە وێنەی کرداری گوڵاوگرتن. پاشان برێ نوورەی تری دەکەنە سەرو، ئنجا چواریەکی نەوتەکەی ناوی، نەوتی دیکەی تێ دەکەن، بەم جۆرە، ڕۆنێکی لێ پەیدا دەبێ بۆ ئاگرخستنەوەو سووتاندن وێنەی نییە".[959]

(الطرسوسي) دەڵێ: ئامادەکردنی ئەم ماددە سووتێنەرە، ئەرکێکی زۆر نهێنی بوو، نەیاندەهێشت دوژمن پێی بزانێ و لە ناوخۆشیاندا، لە گەورە پیاوان و پیاوماقوڵان (زانایان)[960] بەولاوە، کەسی تر ئاگای لێ نەبوو. ئنجا باسی ڕێگای دووەمی ئامادەکردنی ئەم ماددە سووتێنەرانە دەکات، دەڵێ: "کەباتێکی بچووك دێنن و توێکڵەکەی سەرەوەی

---

952 ـ دیفیز ـ فرنسا الجریمة، ص٧٥ـ ٧٦. د. جوزیف ، العدوان الصلیبي، ص١٥٦، هامش ٢.

953 ـ دیفیز ـ ص٧٧. د. جوزیف، ١٥٨.

954 ـ الفتح القسي، ص٣٧١.

955 ـ کەبات (الأترج) لە مزرەمەنییەکانە، تاڵەو خەڵکی پێی دەڵێن (الکباد)، المنجد. "وەرگێر: کورد لە گەرمیان کەباتی پێ دەڵێن".

956 ـ البلسان: دارێکە بە تۆپەڵ، وەك هێشوو، گوڵی سپی دەگرێ، ڕۆنێکی بۆن خۆشی لێی دەگیرێ لە دار بخور دەچێ، المنجد، ص٤٨. کاتی خۆی لە میسر زۆر بووە، عبداللطیف البغدادی، الأفادة والأعتبار، ط/لندن ١٩٦٥، ص٤٠.

957 ـ السندروس، لفظ یونانی نوع من الصمغ، المنجد، ٣٥٥.

958 ـ ڕاتنج، کەتیرەی جۆرە دارێکی سنەوبەرە، بنۆڕە: فرهنگ أمیر کبیر، ص٣٢٨.

959 ـ التبصرة، ١٤٠/أ ـ ب.

960 ـ ن، م، و، ١٤٠ب.

دەگرن‌و لێی دەگەڕێن، تا وشك دەبێتەوە، ئەوجا دەیگوشن‌و ڕۆنەکەی دەگرن، پاشان چەندین جار لە سەر ئاگر دەیکوڵێنن‌و ڕۆنی بەلسانی بەسەردا دەکەن، ئەوجا بەکاری دێنن، شتێکی عەجیب سەیرە".[961]

"ئنجا باسی ڕێگایەکی تری ئامادەکردنی ئاگری عەجیب سەیر دەکاو دەڵێ: کەمێ کەتیرەی گەوەن‌و کەتیرەی راتنج‌و خوێی نەوتین دەکرێن بە سەر ڕۆنی کەباتدا" و هەمووی باش تێك دەدرێن‌و لە سەر ئاگر دەکوڵێنرێن، ئەوجا بەکاردەهێنرێ، ئاگرەکەی لە کوژانەوە نایەت.[962] وەهاش دیارە، هەندێ لەم ئاگرانە، بە تیر هەڵدرابن، یان ڕۆدەکرانە ناو کیتەڵەو بە تای مەنجەنیق هەڵدەدران.[963]

گوتمان، ئەم ئاگرە بکەوتبایە سەر هەر شتێ نەدەکوژایەوە، تا لەگەڵ خۆیدا دایدەمرکاند، جاری وەهابووە، مانگێك‌و زیاتریش لە مانگێ هەر سووتاوەو نەکوژاوەتەوە، "تا، ئاوو خۆڵیشت پێ داکردبا، زیاتر کڵپەی دەسەند".[964] ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ئاگرو مادەگەلی سووتەنییان بەرەو باشتر گۆڕیوە، نەك هەر ئەوەندە، بگرە ئاویتەیەکیشیان دروست کرد، ئاگریان پێوە دەنا و دەیانهاویشتە ناو بەلەم‌و کەشتی، ئەو ئاگرە بەسەر ئاوەکەشدا دەڕۆیشت‌و نەدەکوژایەوە، گوایا موسڵمانان، هەر لە غەزاکانی سەرەتایانەوە، هەندێ ئاوێتەی سووتەنییان لە شەڕی دەریاو سەر وشکانیشدا بەکارهێناوە.

بێ گومان، ئەم جۆرە تێکەڵەو ئاوێتانەش، خۆ دەبێت تاقیگەو شتی لەو جۆرە بابەتانەی بۆ سازبدرێ‌و تیایدا ئامادەبکرێ‌و تاقی بکرێنەوەو سوودیان لێ وەربگیرێ، ئنجا ببرێنە مەیدانی شەڕ. وادیارە پێویستیان بە دۆزینەوەی مادەگەلێکیش بووە، هەموو جۆرە تەنێکی پێ سواغ بدەن‌و لە سووتان بیپارێزن. لەبەر ئەوە لبادەی ژێر زینی ئەسپیان، بە ئاوێتەیەك سواغ داوە، کە تێکەڵێك بووە لە تەڵق‌و کەتیرەو گەچ‌و سپێنەی هێلکەو ماددەگەلی دیکەی لەو جۆرە بابەتانە. ئەم ماددانە هەموویان پێکەوە دەکوترێن‌و دەبێژرێنەوەو بە سرکەی تراو دەشێلرێ، وەك هەویر، ئەوجا بن زینی ئەسپی پێ چەور دەکەن، ئیدی ئاگر ناگرێ و ناسووتێ، بە تایبەتیش ئەو بەشانەی، کە بەرسنگ‌و پاشکۆو کەفەڵی ئەسپەکە دادەپۆشی. هەروەها پەستەك‌و کوڵەباڵ‌و تەقیلەی سەری سوارەکەشی پێ چەور دەکرێ[965].

سەنعەتی سووتەنیی زوو ئاگرسێن بەم جۆرە پێش بکەوێ و لە کیتەڵە بکرێ‌و بپەسترێ‌و وەتای مەنجەنیق بخرێ و دوژمنی پێ بۆردومان بکرێ، کەواتە، ئەو وەستایانە جۆرە بۆمبایەکی سەرەتاییان پەی پێ بردووە، یان، بابڵێین کیتەڵەی نەوت "کە پڕدەکرا لە نەوت‌و دەهاوێژرایە سەر شوورەو قەڵاکان".[966]

نەوت لە هەندێ شوێن، بۆ نموونە وەك کەناراوی دەریای قلزم (دەریای سوور) لە میسر دەردەهێنرا، وەك (القلقشندي) دەڵێ: ڕۆنەکەی کەمێ لەسەر شاخەکەوە دەچۆڕاو! بەرەو خوار شۆڕدەبووەوەو لە دەفرو ئامانی تایبەت دەکرا، کە پێشینان هەر بۆ ئەم نەوتەیان ئەفراندبوو، عارەبان دەهاتن‌و باریان دەکردو دەیانبرد بۆ کۆگاکانی چەکی سوڵتان.[967] هەرچەندیشە (القلقشندي) باسی ماوەی پاشتر دەکا، وەلێ دوور نییە نەوت پێشتریش لەم ناوچەیەدا هەر دەرهێنرابێ. هەروەها لە ناوچەی موسڵیش نەوت دەردەهێنرا. ئەوەتا سەرچاوەو ژێدەران دەڵێن: (الملك عزالدين مسعود بن مردود) سەرگەورەی موسڵ، لە ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز) دا، چەندین بار نەوت‌و هەندێ چەکی نایاب و دەگمەنیشی نارد بۆ سەلاحەددین، وەك بەشێك لەو خاروبارو کۆمەکەی، کە هەموو جارێ بە سەلاحەددینی پێشکەش دەکرد.[968]

---

[961] - ن، م، و، ١٤٠ أ.

[962] - ن، م، و، ١٤١ب.

[963] - التبصرة، ١٤٢/أ، ب (چوارده ڕێگەی تر بۆ ئامادەکردنی ئاگر هەبووە. پێویست ناکات زۆر لە سەریان بدوێین).

[964] - ن. م. و. ١٤٨ب.

[965] ن. م. و. ١٤٦أ —ب.

[966] - صبح الأعشى، ١٤٥/٢.

[967] - ن، م، ٢٨٤/٣.

[968] - الفتح القسي، ٣٥٠. الروضتين ١٤٨/٢. مفرج الكروب، ٣٠٧/٢.

نەوتی پەتی، بە تەنیا بەکارنەدەهێنرا، وەستاو پیشەسازانی کەرەستەی جەنگ، ئاوێتەی ئەوتۆیان لەگەڵ نەوت تێکەڵ دەکرد، بە تینترو کوشندەتر دەبوو، لەبەر ئەوە چەندین جۆر نەوت، بە نموونە، وەك نەوتی سپیو نەوتی شینو ڕەشو خوێی نەوت هەبوون.[969] هەندە نەوتێکیش هەبوو، هیچ لەم نەوتەی ژێر زەوییەی تێدا نەبوو، جیاوازبوو، ئەم جۆرە نەوتە لە کەباتە تاڵەکە دروست دەکرا، کە بە زۆری لە بەندەری ئەسکەندەرییە زەرعەت دەکرا. ئەم کەباتەیان دەهێنا، توێکڵی سەرەوەیان لێ دادەماڵیو لێی دەگەڕان، تا وشك دەبووەوە، ئەوجا ڕۆنەکەیان دەگوشیو لە سەر ئاگر گەرمیان دەکردو ماددەگەلی دیکەی بە نموونە وەك ڕۆنی بەلسانیان تێ دەکرد.[970]

لەشکری ئەیوبیان، ئاگریان لە گەلێ جۆر شەڕدا بەکاردەهێنا، بۆ ئاگربارانی شارو قەڵاکارێ، کە خاچدروشمان داگیریان کردبوون. هەروەها کاتێکیش کە بەرگرییان لە شاری (عکا)ی خۆیان دەکرد. مەنجەنیقو تاوەرەکانی دوژمنیان دەسووتاند. هەر بە ئاگرباران دەبابە مەزنەکەی کوڕەکەی مەلیکی ئەڵمانیان سووتاند "کە بە هەزارەها خەڵك چووبوونە ژێریو کەللەیەکی مەزنو ملێکی زۆر بەرزو درێژی هەبوو".[971]

سەربازانی ئەیوبی، بەو گیراوەو پێکهاتانەی کە (إبن عريف النحاسين الدمشقي) ئامادەی کردبوون، هەر سێ تاوەرە ترسناکەکەی دوژمنیان، کە لە (٢٨ی ربيع الأولى ٥٨٦ك/١١٩٠ن)دا، بە سەر شوورەکانی (عکا)وە دایانمەزراندبوو، ئاگرداو هەرسێکیان سووتاند. ئەوەبوو (إبن العريف) دەفرەکانی نەوتی ئامادەکردو دایانی بە سەرپەرشتانی مەنجەنیقو داوای لێ کردن، یەکێکیان بهاونە سەر تاوەرێکی دوژمن، ئەوانیش هاویشتیانو بەشی سەرەوەی تاوەرەکانی پێکا، "فەرەنگەکانیش لە تەڕبوونی تاوەرەکە سەریان سوڕ مابوو، نەیاندەزانی کە ئەم تەڕبوونە ئاگری بە دواوەیە". پاشان کیتەڵەیەکی دیکەیان گرتە چینی ناوەڕاستی تاوەرەکە، ئنجا کیتەڵەی سێیەمیان دا لە چینی خوارەوەی تاوەرەکە. پاشان ئاگربارانیانکردنو تاوەرەکە خوارو ژووری ئاگری تێ بەربوو، کەسیش نەیتوانی لە تاوەرەکە دەربازببێ، حەفتا فەرەنگی تێدابوو، هەر هەموویان سووتان. وەلێ کۆمەڵێ فەرەنگ بە هاواریانەوە چوون، لە تاوەرەکەیان دەربهێنن "ئەوانیش بە خۆیانو بە شمشێرو قەڵغانیانەوە ئاگریان تێبەربوو و دۆزەخیان لێ هاتەوە یەك". پاشان (إبن العريف) بایدایەوە سەر تاوەری دووەم، ئنجا سێیەمو یەك لە دوای یەکیانی ئاگردا، مەنجەنیقو سەنگەرەکانی نزیك ئەو تاوەرانەش سووتان".[972]

هەرچی بارووتە، ئەوە، لە سەردەمی سەلاحەددیندا بەکارنەهێنرا، تا کۆتایی سەدەی حەوتەمی کۆچی (سەدەی سیانزەی زایین)، جاروبار باسی خوێی بارووتو ماددەی دیکە دەکرا، بە نموونە، لە کتێبی (الفروسية والمناصب الحربية)یی (حسن الرماح)دا، کە لەو ماوەیەدا داینابوو، باسی بارووت هاتووە.[973] هەروەها لە کتێبی (التعريف بالمصطلح الشريف)دا باسی بەکارهێنانی بارووت هاتووە.[974]

**٢ـ ئامێرگەلی دەسەجەمعی:**

مەبەستمان لەو چەکە مەزنو قورسانەیە، کە بە تەنیا زەلامێ ناکەونە گەڕو ناجووڵێن، چونکە گرانو بە زەحمەت دەگوازرێنەوە، بە پێچەوانەی چەکی سووکی سەڵتە زەلام، کە تەنیا یەك کەسی بەسە. چەکی، یان ئامێرگەلی دەسەجەمعییش، کە سوپای ئەیوبیان لە سەردەمی سەلاحەددیندا بەکاریان هێنابێ، ئەمانەن:

---

969 ـ د. سعداوي، التأريخ الحربي، ص٢٢٣. نقلا عن مخطوط فهرست الكتب، ص٧٧ـ ٧٨.

970 ـ التبصرة، ١٤١/ أ.

971 ـ مرآة الزمان، ٤٠٤/٨.

972 ـ الفتح القسي، ٣٧. وانظر النوادر، ١٢١. مرآة الزمان، ٤٠٢/٨. البداية والنهاية، ٣٣٥/١٢. الذهبي، مخطوط (تأريخ الأسلام) الجزء الأخير، ورقة ٢٢/أ.

973 ـ فليب حتي، تأريخ العرب، ص٧٥٦.

974 ـ العمري، التعريف بالمصطلح الشريف، ص٢٠٨.

**أ- مه نجه‌نیق:**

مه‌نزڵو پێگه‌ی ئه‌م چه‌که‌، له‌ ڕیزی چه‌که‌ ده‌سه‌جه‌معییه‌کاندا، هه‌روه‌کو پێگه‌و بایه‌خی شمشێره‌ له‌ ڕیزی سه‌ڵته‌زه‌لامدا( الفردية)، چونکه‌ ئه‌م مه‌نجه‌نیقه‌ زۆر گرنگ بووه‌ "له‌ هه‌موو ئامێره‌کان به‌ تینترو کوشنده‌تر بووه‌".[975] ئه‌م ئامێره‌ له‌ سه‌رده‌می فینیقیه‌کانیشدا، له‌ دێرزه‌مانه‌وه‌، هه‌ر هه‌بووه‌و بۆ بۆردوومان به‌کارهێنراوه‌. یۆنانییه‌کان، له‌وانه‌وه‌ فێری بوون و به‌ هۆی ئه‌مانیشه‌وه‌ (واتا یۆنانییه‌کانه‌وه‌) به‌ هه‌رێمو ناوچه‌کانی تردا بڵاوبۆته‌وه‌و باوی سه‌ند، ئنجا که‌وته‌ ده‌ست فارسه‌کانیش و پاش ئه‌وانیش (عاره‌به‌ موسڵمانه‌کان) فێری بوون، (سه‌لمانی فارسی) که‌ یه‌کێ بوو له‌ یارانی پێغه‌مبه‌ر (درووودی خوایان له‌سه‌ر بێ)، ئه‌و زه‌ینی ئیسلامی خستووه‌ته‌وه‌ سه‌ر سوودی ئه‌م ئامێره‌، پاشان ناچاریش بووه‌ به‌ ده‌ستی خۆی بۆیان دروست بکاو، به‌حازریی بیخاته‌ به‌رده‌ستیان، ئه‌وه‌بوو له‌ گه‌مارۆی شاری (الطائف) له‌ ساڵی (٨ك/ ٦٢٩ز)دا به‌کاریان هێنا.[976]

هه‌رچه‌ندیشه‌، هه‌ندێ سه‌رچاوه‌ ده‌ڵێن، موسڵمانه‌کان، له‌ بیزه‌نتینییه‌کانه‌وه‌ یه‌کسه‌ر فێری مه‌نجه‌نیق بوونه‌، نه‌ك له‌ فارسه‌کانه‌وه‌،[977] وه‌ڵێ ئامێره‌که‌، ئه‌وه‌تا ناوی خۆی به‌خۆیه‌وه‌تی و وشه‌ی مه‌نجه‌نیق وشه‌یه‌کی فارسییه‌و عه‌ره‌ب له‌وانه‌وه‌ فێری بوون، نه‌ك له‌ بیزه‌نته‌کانه‌وه‌.

به‌هه‌رحاڵ، ئه‌م مه‌نجه‌نیقه‌ له‌ شه‌ڕی شاره‌کاندا، که‌ جه‌نگی شووره‌و گه‌مارۆی پێ ده‌گوترا، خراوه‌ته‌ کار، چونکه‌ ئه‌م ئامێره‌ بۆ به‌ردبارانی شووره‌ی شاره‌کان به‌کارده‌هێنراو "مادده‌ی تریشیان پێ ده‌هاویشت"[978]. ئه‌م به‌رده‌بارانه‌ش، یه‌ك له‌ دوای یه‌ك مۆڵه‌تی نه‌ده‌دا، تا کون و که‌لێن و که‌له‌به‌ریان ده‌خسته‌ شووره‌و تاوه‌ره‌کانه‌وه‌، ده‌یانڕوخاندن و هێرشبه‌ران لێوه‌ی به‌ژوورده‌که‌وتن. جگه‌ له‌ به‌رد، ئه‌م ئامێره‌ سووته‌مه‌نیشی ده‌هاویشت و ئاگریشی ده‌خسته‌وه‌، به‌ نموونه‌، وه‌ك تۆپی قورسی شه‌ڕی ئه‌م سه‌رده‌مه‌.[979] ده‌شتوانین، کاولکاری ئاورخستنه‌وه‌و وێرانکاریگه‌ڵێ که‌ مه‌نجه‌نیق له‌ شووره‌و قه‌ڵاو قایمکاری، چ هی سوپای ئه‌ییوبی، چ هی خاچدروشماندا ده‌یخسته‌وه‌، که‌مو زۆر بهێنینه‌وه‌ به‌ر زه‌ین، وه‌کو ئه‌وه‌ی که‌ (أسامة بن منقذ) باسی هێزو توانستی مه‌نجه‌نیقێکی ڕۆمیان ده‌کا، بهێنینه‌ به‌رچاو، ئه‌و ده‌ڵێ: خاچدروشمان، شووره‌کانی شاری شیزه‌ریان دایه‌به‌رو کوتایان (واتا ئه‌و شاره‌ی، که‌ بنه‌ماڵه‌ی ئه‌م نووسه‌ره‌ی خاوه‌نی کتێبی (الأعتبار)ه‌، حوکمیان ده‌کرد)، (أسامه‌) ده‌ڵێ: "کاتێ ڕۆمیان گه‌یشتنه‌ نزیك شاری شیزه‌ر (٥٣٢ك/ ١١٣٨ز) مه‌نجه‌نیقی مه‌زن مه‌زنیان لێ خسته‌ کار، که‌ له‌گه‌ل خۆیاندا هێنابوویان، شتی قورس و گرانی تێ ده‌گرتین، به‌ردی وه‌های بۆمان ده‌هاویشت، هه‌رگیز به‌ تیری ئاسایی نه‌ده‌هاوێژرا، هه‌ر به‌رده‌ی بیست، تا بیست و پێنج ڕه‌تڵ[980] ده‌بوو، جارێکیان، به‌ردێ له‌و به‌ردانه‌، به‌رماڵی دۆستێکی (أسامه‌) که‌وت، هه‌ر به‌و ته‌نیا به‌رده‌، سه‌روژێری کرد".[981] له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا، هه‌ندێ له‌وانه‌ی هه‌واداری زانینی هونه‌ری جه‌نگی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ن،[982] ده‌ڵێن، زۆر سه‌رچاوه‌و ژێده‌ره‌ جۆر به‌جۆره‌کان، نه‌یانتوانیوه‌ وێنه‌یه‌کی ڕوون و ڕه‌وانی ئه‌م چه‌که‌ بخه‌نه‌ به‌رچاوی خوێنه‌ران، چونکه‌ ئه‌و سه‌رچاوانه‌ به‌ ئاودامانی

---

[975] ـ آثار الأول، ص١٩١.

[976] ـ الكامل، ٢/٢٦٦. محمد فرج، السلام والحرب في الأسلام، دار الفكر العربي بالقاهرة، ١٩٦٠، ص٩٣.

[977] ـ Von kremer, The Orient Under The Caliphs, p.327. Oman , A Histoy of The art of war , P, 21.

[978] ـ الجواليقي، المعرب من الكلام الأعجمي على حروف المعجم، مطبعة (أوفسيت طهران) ١٩٦٦، ص٣٠٦. الجوهري، الصحاح، ١٤٥٥/٤. ابن قتيبة، المعارف، ص٥٥٤. وفيات الأعيان، ٤٥/٧. تأريخ العروس، ٣٠٧/٩. صبح الأعشى، ١٤٤/٢. أدي شير، الألفاظ الفارسية، المعربة ١٤٦. (د. صلاح حسين العبيدي، مجلة سومر، مجلد ٣٢، ص١٢٢ لسنة ١٩٧٦. مجلة آفاق عربية، العدد ٥. السنة الرابعة ١٩٧٩، ص٧٢. مجلة كلية الآداب، العدد ٢٥، شباط ١٩٧٩، ص٥٩٥).

[979] ـ عبدالرؤوف عون، الفن الحربي، ص١٥٦.

[980] ـ ڕه‌تڵ: له‌ (٤٠٠گم) زیاتره‌.

[981] ـ أسامة بن منقذ، الأعتبار، ص١١٣.

[982] ـ Clande Cahen, Les Changement techigues militaires,P.119. و عبدالرؤوف عون، الفن الحربي، ١٥٦ـ ١٥٧.

وەسفیان نەکردووەو نەشیانگوتووە چۆن چۆنی ئیشی پێدەکرێ و بۆردومان دەکاو خەڵکی چۆن چۆنی خۆیانی لێ بپارێزن.

ڕاستیشت دەوێ، مەنجەنیق لە بیرۆکەی بەرەو چاکتر گۆڕینی بەرد بە دەست هەڵدان و بیرۆکەی قۆچەقانییەوە هاتووەتە ئاراوە، واتا کاتێ زەلامێکی بەردهاوێژ ویستی بەردێکی گەورەتر بە تیژییەکی خێراتر بۆ ماوەیەکی دوورتر بهاوێژێ، بە زهنی خۆی گەیشتە ئەوەی دەزگایەك دروست بکا، ئەم هەموو خەسڵەتە باشەو تازانەی هەبێت، ئیدی، بەو جۆرە، مەنجەنیق داهێنرا.

شێوەی سادەو ساکاری مەنجەنیق، خۆی بنکەیەکی تەختەی چوارگۆشە، یان لاکێشەیی هەیە، لە ناوەڕاستییەوە ستوونێکی داری پتەوو قایم داکوتراوە، لە سەرەوە باڵێکی (قۆڵیکی) پێوەیە، بۆ سەرەوەو بۆ خوارەوەش دەجوڵێ، سەرێکی ئەم باڵە دەفرێکی نیمچە گۆیی پێوەیە، قەوارەکەی بە پێی قەوارەو قەبەیی مەنجەنیقەکە دەگۆڕێت، بەرد، یان ئاسن، یان کیتەڵەو لوولە نەوتی تێ دەکرێ، سەرەکەی دیکەی قورساییەکی پێدا شۆڕ دەبێتەوە بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی. ئەم مەنجەنیقە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەکارهێنرا، پاشان، هەند چاکترکارییو دەستکاریی تێدا کرا، بوو بە دەزگایەکی زەحمەتو ئالۆز، پێ دەچێ بە ناوبانگترین و کۆنترین کەسێ بە درێژی باسی مەنجەنیقەکانی کردبێ (الطرسوسي) بێت. پاش ئەویش، کتێب دانەرانی دیکەی بە نموونە، وەك ، (الحسن بن عبدالله) ی خاوەنی کتێبی (آثار الأول)و (أرنبغا الزردکاش) ی دانەری کتێبی (الأنیق فی المجانیق) و کەسانی دیکەش باسیان کردووە.

(الطرسوسي) دەڵێ: مەنجەنیق جۆراوجۆرن، مەنجەنیق هەیە عەرەب دروستی کردووە، ئەمە لە هەموویان وەستایانەترو پتەوتر دروستکراوە، هەرچی تورکیەکەیەتی، ئەوە هەرزانترەو ساناترە، مەنجەنیقی فەرەنگیش هەیە، ئنجا باسی تەختەو کەرەسەکانی دەکات، کە لێیان دروست دەکرێ، بە نموونە، وەك داری جراسیاو ئرزو جۆرە داری قایم و ڕەقو قەفو گرێ، کورت دەکا.[٩٨٣]

باڵی مەنجەنیقەکە، بە گوریسی ئەستوورو قایم بە کلکەی بنکەکەوەی دەبەستراو بەرەوپاش ڕایدەکێشا. کاتی ئیشی پێ کردنیشی، مەنجەنیقەوانەکە، گوریسەکە لە ستوونەکە لول دەداو باڵەکەی بەرەوپاش ڕادەکێشێو ژێیەکەی پشتەوەی، تا کۆتاییەکەی دەکشێ، ئەوجا، تای باڵەکە پڕ دەکرێ لەو شتانەی دەهاوێژرێن و ئیدی لە پر گوریسەکە بە یەکجار دەکرێتەوەو ژێیەکە بۆ لای خۆی، زۆر بە تیژی کێشی دەکاو، باڵەکەش، بە توندی بەو دیوارە تەختەکەی بەردەمی دەکەوێو، بە شێوەیەکی زۆر بەهێز هەرچی تێدابێ، دەیهاوێ.[٩٨٤]

با، دەقی ئەو وەسفەش پێشکەش بکەین، کە (الحسن بن عبدالله) بۆ مەنجەنیقی لولپێچ و مەنجەنیقی بازنەیی هێناویەتییەوەو، دەڵێ: "سەنگ و قورسایی قوڕقوشمی تێدایە، ئەگەر زەلام بیخولێنێتەوە، تیرەکە بەرزدەکاتەوە. ئەگەر بەریش بدرێ، دەیهاوێو زەلامی زۆریشی ناوێ، لەوانەشە کەوانی گەورەو ژێداری بۆ دابنرێو مشتەکانیشیان (قبضائها) بەرەو زەوی لە بنکەی مەنجەنیقەکە ببەسترێن. ژێیەکانیشیان بە گوریس بە ئەڵقەی مەنجەنیقەکەوە دەبەسترێنو بەڕاستەیەك دەجولێنرێتو زۆر بە تیژی دەردەپەڕێ، خۆ ئەگەر حەزیش بکەن، ئەوا کیتەڵەی نەوتو ئەو جۆرە بابەتانەی پێ هەڵدەدەن، ئەگەر هاتو سووك بوو، ئەوە لەو بارەدا، بە قوڕقوشمو بەرد قورسی دەکەن، ئەگەر نەوتو ئاگریش بوو، ئەوە لەو بارەدا، تایەکی زنجیرو گوریسێکی زنجیرداری بۆ دادەنێن.[٩٨٥]

ڕاستیشت دەوێ، ئەم کتێبنووسە، ویستویەتی مەنجەنیق بە ڕوونو ڕەوانی باس بکات، وەلێ بۆی نەهاتو نەیتوانیو نەیپێکا، چونکە دەستەواژەکانی دووبارە دەکاتەوەو زۆر بە کورتی دەیاندا بە دەستەوە[٩٨٦] و زۆرتر بەلای سەجعو ئاوازدا لادەدا.

---

983 ـ التبصرة، ورقة ١٢٧ب.

984 ـ عبدالرؤوف عون، الفن الحربي، ص١٦٠.

985 ـ آثار الأول، ١٩١.

986 ـ عبدالرؤوف عون، ص١٥٧. د.سعاد ماهر، البحرية في مصر الأسلامية، ص٢٢٥.

وەستایانی مەنجەنیق، لە دروستکردنیدا هونەرێکی زۆریان تێیدا بە خەرج داوەو لە بەرەو چاکتر گۆڕینیدا، پشوویان نەداوە، بە تایبەتیش مەنجەنیقی ئاگرهاوێژ، تا، لە سەردەمی مەملوکەکانی میسرو شامیشدا، گەیشتە ئەوپەڕی چاکی و نایابی و دەستکردێکی تەواوکارو ئامێرێکی نیشانشکێنی بێ وێنە، تا، وای لێهات، مەنجەنیقوانەکان، دووریی هەدەفەکانیان دەزانی و بۆ دیارکردن و پێکانی نیشانەکان، ڕێساو بەندو بەستی گۆشەو گۆشەکارییان دانا. لە کتێبی (الأنيق في المجانيق)دا لەم ڕووەوە هاتووە، دەڵێ: "ئەگەر دەتەوێ بەردەکە دوور هەڵدەی، دەیخەیتە مەنجەنیقەکەوەو بۆ کوێ بتەوێ دەیهاوی، ئەگەر دەتەوێ دوورتر هەڵیدەی، ئەوا پەنجەی مەنجەنیقەکە بە ڕۆن چەور بکە، ئەگەر هاویشتت و بە ئامانجیش گەیشتی و، حەزدەکەی لەوەش دوورتری هەڵدەی، ئەوا، لە بەینی ئەڵقەی باڵەکانی هاوێژەرو لەبەینی پەنجە ئاسنەکەدا، پارچەیەك (مەشاق) دابنێ و پێی بهاوە، خۆ ئەگەر ئەم جارەش، ئارەزووت بەجێ هات، ئەوە باشتر، خۆئەگەر ویستت ئەمجارەش دورتری بهاوی، ئەوا نانەڕەقێ بەسەری پەتەکەوە ببەستەو بیکە بە پەنجەی مەنجەنیقەکەوە، بەوە، دەگەیتە ئامانجی خۆت، دواتریش دیسان بۆ ئەوەی دوورتریش بهاوی، نانەڕەقێکی تری تێبخە!".[987] ... (الزردكاش) ئەرك و فرمانی دیکەش، بۆ سەرپەرشتی مەنجەنیق دەستنیشان دەکا، تا بتوانێ دوورترو دوورتریش بهاوێژێ و سیازدە هەنگاوی بۆ دادەنێ، کە پێویستە یەك لە دوای یەك بەجێیان بهێنێ، هەر بەو پێیەش بۆ نزیك هاویشتن، دەڵێ: ئەگەر نزیکی دەهاوی، بەردەکە دابنێ و بیهاوە، ئەگەریش نزیکترت دەوێ، ئەوە، دووسێیەکی پەنجەکەی چەور بکەو بیهاوە، دەیگاتێ. نەخێر، ئەگەر، لەمەش، نزیکتری دەهاوی، ئەوە، بێنە، باڵێکی ئەستوورتری بۆ دابنێ، بۆ لەوەش نزیکتر، دیسان باڵی ئەستوورتری دەوێ. گەر لەمەش نزیکتر دەهاوی، ئەوە دەبێ، بەردەکەی ڕەتڵ دوای ڕەتڵ قورستر بکەی، تا دەگاتە سەد ڕەتڵ. بۆ هاویشتنی لەوە نزیکتریش، بە جۆرێکی تر، دەبێ ڕەتڵ بە ڕەتڵ سووکی بکەی، تا سەد ڕەتڵ".[988]

وادیارە، مەنجەنیقسازی لە سەردەمی سەلاحەددیندا، گەیشتووەتە سەویەو ئاستێکی وەستایی و وردەکاری، چونکە لەم سەردەمەدا، هەموو جۆرە چەکێکی باشترو گۆڕاوو ئاسایی تاقی کرانەوە.[989]

(الطرسوسي) یش، وەسفی جۆرەها مەنجەنیقی کردووەو یەکە یەکە شرۆڤەی کردوون، بە نموونە باسی مەنجەنیقی عارەبکردی کردووەو گووتویەتی لە داری چاك دروست دەکرێ و بەشێوەی سێگۆشەی دوولایەکسان سازدەدرێ و بنکەکەی دەکەوێتە ژێر دوولایەکسانەکەوەو کورتترەو لە لوتکەی سێگۆشەکەدا ئامێرێك بۆ هاوسەنگکردنی هەردوو تایەکەی قایم دەکرێ، کە ئەو بە (گورگە) ناوی دەبا، بنمیچێکی تەختەی لێ قایم دەکرێ، سەربازەکان لە تیری دووژمن دەپارێزێ. پەتێك بە درێژی گەزێ، لە یەکێ لە دوو تایەکە، قایم دەبەسترێ، تایەکەی دی، بەردی تێ دەکرێ و بە هاوێژەرێکی ئاسنەوە، قایم دەکرێ و تیرەکەی دەکەوێتە پێش، کاتێ تایەکە بەر دەدرێ، بەردەکەی ناوی دەردەپەڕێ.[990]

پاشان ئەم کتێبنووسە، دێتە سەر باسی مەنجەنیقی فارسی و مەنجەنیقی تورکییشی پێ دەڵێ، دەڵێ: ئەم مەنجەنیقە بەلاری دادەنرێ و بنکەیەکی بۆ دەکرێ لای سەرەوەی دەگرێ، ئەوجا لە زەوی دەچەقێنرێ و لەسەر لوتکەی ستوونەکەوە، گورگەکەی لێ قایم دەکرێ.[991] باسی مەنجەنیقێکی دیکەی فارسی دەکاو دەڵێ: (الشيخ أبوالحسن بن الأبرقي الأسكندري) باسی بۆم کردووە، کە (الطرسوسي) خۆی هەموو زانستێکی مەنجەنیقی هەر لەو وەرگرتووە، گوایا، ئەو پێی گوتووە، گوتوویەتی: ئەم جۆرە مەنجەنیقە پەنجا ڕەتڵ ڕادەکیشێ و هەرخۆی کەوانی چەرخ (سووکەڵە)ی تێدایە، یەك زەلام ڕای دەکێشێ، کاتێکیش زەلامەکە تیرەکەی ڕادەکێشێ، هەموو کشتکەکان کە ژێی کەوانەکەن دەگەنە قفڵەکەی، زەلامەکەش تای بەردەکە لە ئەڵقەیەکدا. کە بە بنکەکەیەوە قایم کراوەو تیرەکەشی

---

[987] ـ د. سعاد ماهر، البحرية، ص٢٢٦. نقلا عن (الانيق في المجانيق) ورقة ١٢.

[988] ـ د.سعاد ماهر، البحرية، نقلا عن مخطوط (الأنيق في المجانيق) ورقة ١٣.

[989] ـ Parry and Yapp War, technolog and Socity in the Middle East. P.103.

[990] ـ التبصرة ١٩١ب.

[991] ـ ن، م، و، ١٩٢ب.

ڕاگرتووە. ، گیردەدا، کە کەوانەکە بگرێو تیرەکە بهاوێ، بەردەکەش دەردەپەڕێ.[992]

دانەری (التبصرة)یش، باسی جۆرە مەنجەنیقێ دەکا، ناوی دەنێ مەنجەنیقی فەرەنگی.[993] پێدەچێ موسوڵمانان لە خاچدروشمەکانەوە فێری بووبن، بەمەشدا دەردەکەوێ، کە هەردوو هێزی ئەییوبی و خاچدروشمان بە هۆی کۆمەڵی شتی کاریگەرەوە سوودیشیان بۆ فێربوونی ئەم چەکانە لەیەکدی وەرگرتبێ.

وەکو باسیشمان کرد، مەنجەنیق لە شەڕی شوورەو گەمارۆی شاراندا، یەکەم چەك بووەو بەبێ ئەم چەکە ئەو جۆرە شەڕانە نەکراوە، ئێمە ناشزانین مەنجەنیق لە کوێ دروست کراوە، ڕەنگە لە شارەکان دروست کرابێ، چونکە توانستی ئەو هونەرە لە شارەکاندا فەراهەمە، دوای دروستکردنیشی دەبوایە هەڵی بوەشێنن و باری بکەنو بیبەن بۆ بەرەی جەنگو لەوێ لێکی قایم بکەنەوە، ئەوە بۆ مەنجەنیقی گەورە، هەرچی مەنجەنیقی گچکەیە، کە (العرادة)یان ناوناوە، ئەوەیان پێ دەچێ هەروا بە ساغی باریان کردبێ.

خاچدروشمان باروبارخانەو چەکی قورسیشیان بە عارەبانە دەگواستەوەو، ئامێری جەنگی بە نموونە، وەك دەبابەشیان[994] لێ باردەکرد. دیارە مەنجەنیقەکانیشیان هەر بەو عارەبانانە هاوردووەو بردووە، بەڵام هیچ باسێکمان لەبارەی ئیسلامەوە، کە عارەبانەیان بووبێ، دەست نەکەوتووە. لەبەرئەوە پارچەکانی مەنجەنیقیان بە وڵاغی بەرز هێناوەو بردووە.[995] بەڵام لەبەر خراپیی ڕێگاوبانی ئەو سەردەمە، هاتوچۆ، بە وڵاغو بە عەرەبانەش هەر زەحمەت و ناهەموار بووەو جاددەی قیرتاوو ڕێگای ڕێكو ڕاست نەبووەو، لەسەر ئاوەڕۆو ڕووبارەکانیش پێڵو پرد نەبووە. ئەم مەنجەنیقەش هەند وێراناوەرو کاولکار بووە، کە ناچار بیریان لەوە کردەوە زەرەر و زیانی کەم بکەنەوە، بۆ ئەمەش هاتنە سەر بیرۆکەی ئەوەی بە دەوری شوورەکاندا کەندەك لێ بدەنو ئاوی بکەنە سەر تا پڕ دەبێ، بۆ ئەوەی مەنجەنیق نەگاتە شوورەکان، خۆ ئەگەر هێرشبەران بتوانن کەندەکەکە پڕ بکەنەوە، ئەوە، لەوبارەدا بەرەڤانیکەرانی ناو شارەکە، لە هەیوانو ڕاڕەوو پەنجەرەی قەڵاو قایمکارەکانی خۆیانەوە، مەنجەنیقەوانەکانیان تیرباران دەکرد، لەبەرئەوە، فەرمانداری هێرشبەران دەهات، سەربازگەلی زرێپۆشی بە قەڵغانەوە پێش مەنجەنیقەکە دەدا، ئەوان مەنجەنیقەوانو کۆمەڵی هێرشبەرانیان دەپاراست، جاری وەهاش هەبوو، هێرشبەران مەنجەنیقەکەیان دەنایە سەرعارەبانەو پەردەی کەتانەکۆنی ئەستووریان بۆ هەڵدەواسی، ئیدی تیربارانەکە ئەو توندوتیژییەی خاو دەبووەوەو زیانێکی ئەوتۆی لێ نەدەکەوتەوە.[996]

شێوازێکی دیکەی لە مەنجەنیق پاراستنی شوورەکان ئەوەبوو دەهاتن بە داری چنار، سەری شوورەکەیان دادەپۆشی، کە بەردی مەنجەنیقەکان کاری تێ نەکەن، چونکە بەردی مەنجەنیق کە دەردەپەڕێ، شولاوگە دەبەستێ، هەروەکو گوللەی هاوەن، واتا ڕێك و ڕاست ناڕوا، بە هێڵێکی چەماوەی وەك کەوان بەردەبێتەوە، جا، بەر دارەکان دەکەوتو دیواری ژێردارەکان (شوورەکە) بێ زیان دەبوو. جاری وەهاش دەبوو، گوێسەبانەیان، بە گۆشەیەکی لار بە دیوی دەرەوەی شوورەکەدا دروست دەکردو ڕایەخو لبادو گلێمو بەڕەو پاتاڵیان پێدا هەڵدەواسین، یان تۆڕی قایمیان بە گوریسی ئەستوور پێدا شۆڕ دەکردەوە، ئەگەر بەرد، بۆ دیوارەکە هەڵدرابا، لەبەر ئەو بەربەستانە لە دیوارەکە (شوورەکە) نەدەکەوتو بەریشی بکەوتایە، ئەو تیژیی و هێزەی نەدەما و کاری لە دیوارەکە نەدەکرد.[997]

جۆرە مەنجەنیقێکی دی هەبوو (العرادة) یان ناونابوو، بۆ بەردبارانو تیرباران بەکاریان دەهێنا، لە تۆپی بچووك دەچێ، کە سەنگەری دوژمن تۆپباران دەکا.[998] سەرچاوەکان باسی ناکەن، کە لەو سەردەمەدا بە دەست ئەییوبیانەوە

---

[992] ـ التبصرة، ورقة ١٢٨ب.

[993] ـ ن، م، ورقة ١٢٨ب.

[994] ـ الفتح القسي، ٤٨٧.

[995] ـ نعمان ثابت، ص١٥٨. عبدالرؤوف، الفن الحربي، ١٦١.

[996] ـ Clande Cahen, Les changement,P,119.

[997] ـ آثار الأول ١٩٤، الفن الحربي، ١٦٢.

[998] ـ عبدالرؤوف، الفن الحربي، ١٦٧.

دیترابێ، دوور نییه بەکاریشیان هێنابێ و ناویشیان نەبردبێ، یانیش هەر بە مەنجەنیقێکی بچوک لە قەڵەمیان دابێ.

**ب. دەبابەو پاشکۆکانی:**

ئەمەش ئامێرێکی هێرشبەری دەسەجەمعیی دیکەیە، وەلێ لە مەنجەنیق کۆنترەو دێرینترە، دەڵێن خەڵکی میسری دێرین و ئاشوورو یۆنان و ڕۆمان و فارس و عارەبی موسوڵمانیش بەکاریان هێناوە. عارەبان لە ساڵی (٨ك/ ٦٢٩ز)دا، شاری (طائف)یان پێ گەمارۆداوە[999].

دەبابە، هەیتوهووتی لە مەنجەنیق کەمترە، وەك مەنجەنیقیش بەهێزو توانا نییەو کەمتریش بەکاردەهات، چونکە دەبابە تەنیا بۆ شەڕی شوورەکان بەکاردەهێنرا، کاتێکیش مەنجەنیق داهێنرا، ئیدی لەگەڵ دەبابەدا، هاوشان، دەکەوتنە کار، چونکە، چۆن تۆپی ئەم زەمانە هاوشان لەگەڵ دەبابەدا پێکەوە کاردەکەن، ئاوەهاش دەبابەی ئەو زەمانە کۆمەکی بە مەنجەنیق دەکرد.

ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ، کە سوپای ئەییوبییان، هەرکە کەوتنە پەلاماری شوورەو قەڵای خاچدروشمان، لەوساوە، ئەم چەکەیان بەکارهێناوە، نەخاسمە لە ساڵی (٥٨٣ك/ ١١٨٧ز) ەوە، هەر بەو جۆرەش خاچدروشمان ئەم چەکەیان لە گەمارۆی شاری (عکا) دا خستەکار.[1000]

دەبابە ئامێرێك بوو، دەبزووت و دەڕۆیشت، لە داری ئەستوور دروست دەکراو، بە پێستەو لبادی بە سرکە ئاودراو، دەپێچراو دا دەپۆشرا، تا ئاگر کاری تێ نەکا، ئنجا دەخرایە سەر چەرخەو پێچکەی بازنەیی، تا بە ئاسانی بجوڵێ و بێت و بچێ.[1001] کاتێکیش دەگەیشتە نزیك شوورەکان، ئیدی جەنگاوەرەکان بە سەردەکەوتن، یان خۆیان دەکوتایە ناوی و بە ئامێرەکانی دەستیان (بە پیك و نوێڵ) دەکەوتنە وێزەی شوورەکان و کەلەبەرو دەلاقەیان تێ دەخست و دەیانڕووخاندن. سەربازانی ئەییوبیی، دەکەوتنە سەر دەبابەکەو بە شوورەکاندا هەڵدەگڕان و سەردەکەوتن، وەکو قوللەو پەیژە، سوودیان لێ وەردەگرتن، لە سەر شوورەکانیشەوە، سەربازانی دوژمنیان لە ناو قەڵاو شارە گەمارۆدراوەکاندا، دەدایە بەر ڕم و تیر.

(إبن شداد) وەسفی دەبابە بە گشتی دەکاو، دەڵێ: "ئامێرێکی مەزن و تۆقێنەرە، جەنگاوەری زۆر دەچنە ناوی، لەوحەی ئاسنی تێ گیراوە، لە ژێریشەوە چەرخەی بۆ کراوە، لەناوەوە پاڵی پێوە دەنێن و دەڕوات، تا نزیك دەبێتەوە لە شوورەکە، ئەوجا لە ناوەوە سەربازەکان بە پاڵ، بەرەوپاش و بەرەوپێش، چەرخەو بێچکەکان دەهێنن و دەبەن، بەو جۆرە دەبابەی تایەن، دیوارەکە وەك بەران بەر قۆچان دەدا، تا لێکی دەترازێنێ. ملێکی قایمی بۆ کراوە لە ئاسن، کەللەیەکی بە سەرەوەیە وەك کەللەی بەران، هەر لەبەرئەوەشە ناویانناوە، (بەرانە). جا بەو قۆچ لێدانە دووبارە و سێ بارە، دەیداتە بەر قۆچ تا دەیڕوخێنێ".[1002] واتا کەس لە دواوە پاڵی پێوە نەدەنا، لەناوەوە بە پاڵ چەرخەو پێچەکەکانیان پاڵ پێوە دەناو بەرەو دواو بەرەو پێش دەیانئاژۆت. ئەم بەرانەیە، پاشکۆیەکە لە پاشکۆ گرنگەکانی دەبابە، بە کورتی ئەرکی گرنگی دەبابە ئەو قۆچ لێدانە بووە. جاری وایش هەبووە، زنجیرێکی ئاسنیان لە ناوەوەو لە سەرەوە لێ قایم دەکردو زنجیرەکە شۆڕ دەبووەوە، لە سەری خوارەوەی دارێکی گەورەی لە ئاسن گیراوی پێوە شۆڕدەبووەوە، وەکو سەرە خولخولۆکە وەهابوو، کە زنجیرەکەیان ڕاکێشابا کەللەی بەکرەکە دەچووە ناو تاوەرەکەوە، ئەوجا زنجیرەکەیان بەردەداو کەللەکە دەردەپەڕی و چەندین جاران بە خێرایی بەر دیوارەکە دەکەوت و کون و کەلەبەریان تێ دەخست.[1003]

خواسایی، هەندێ سەرباز وەپێش دەبابەکە دەکەوتن و وەك پاسەوان سەرپەرشتیارانی ناو دەبابەکەیان دەپاراست، سەربازانی دیکەش، بەم دیوو ئەو دیویدا، دەڕۆیشتن و، بزووتن و پێشکەوتنی دەبابەکەیان ئاسانتر دەکرد، گەر کەندو

---

[999] ـ الطبري، تأريخ الرسل والملوك، مطبعة الاستقامة، ١٩٣٩. ج٢، ص٣٥٤. الكامل ٢/٢٦٦.

[1000] ـ النوادر، ص١٤٠، بنۆڕە: الروضتين، ١٩٢/٢. مفرج الكروب، ٣٣٤/٢. ابن الفرات، ج١، مجلد ٤، ص٢٢٧.

[1001] ـ آثار الأول، ١٩٢.

[1002] ـ النوادر، ص١٤٠، بنۆڕە: الروضتين، ١٦٢/٢. مفرج الكروب، ٣٣٤/٢. ابن الفرات، ج١، مجلد ٤، ص٢٢٧.

[1003] ـ امين الخولي، الجندية والسلم، ص٣٢.

کەندرێکی بهاتایە پێش، یان پڕیان دەکردەوە، یان دارەڕایان دەکرد، تا دەبابەکە وەك پێڵو پرد بە سەریدا تێبپەڕێ.[1004]

دەبابە چەندین ناویان لێ ناوە، جۆرێك هەبووە (الدراجة)یان پێ گوتووە، (إبن منظور) گوتوویەتی: "ئەمە ئەو دەبابەیەیە، کە زەلام دەچێتە ناوی لە کاتی شەڕدا".[1005] تاوەر (البرج)یشیان پێ گوتووە، کە گوایا دەزگایەکە لە دار دروست کراوەو لە ئاسن و پێستە گیراوەو هەر بەو شێوازانەش دەڕوا، کە باسمان کرد، لە شوورەو دیواران نزیك دەکرایەوەو بە هاویشتنی تیرو بەردو شتی دیکە دەیڕوخاندو خۆی بە ژووردا دەکرد، ئەمیش لە سەر چەرخەو پێچکەو ئاسنو تەختە دەجولاو، بریتیش بووە لە چەند نهۆمێکی یەك لە سەر یەك، سەرچاوەو ژێدەرانیش دەڵێن: خاچدروشمان سێ قوللە (تاوەر) ی لە ئاسنو دار دروستکراویان لە نزیك شوورەکانی شاری (عکا) نابووەوە، کە لە پێستەی بە سرکە ئاودراو گیرابوون تا نەسووتێ، هەر تاوەرەی جێگای پێنج سەد جەنگاوەری تێدا دەبووەوەو، لەسەر چەرخەو پێچکە دادەنران، بۆ هەر لایێ ویستبان، روویان لەوێ دەکرد.[1006] هەندێ لە مێژوونووسان (دەبابە)و (ضبر)یان بە یەك ئامێر لە قەڵەم داوە.[1007] کەچی شرۆڤەکەی دەڵێ، نەخێر (ضبر) پاشکۆیەکی دەبابە بووەو، هێرشبەران کە لە شوورەو دەرگاکان نزیك دەبوونەوە، ئەوجا دەیانخستەکارو خۆیشیان بە پارچە چەرمێکی (پێستەیەکی) گەورەو ئەستوور دادەپۆشی، وەکو چادرێ، یان وەکو زرێیەکی دەسەجەمعی بۆ ئەوەی تیریان بەرنەکەوێ. خاوەنی (تاج العروس) دەڵێ: (الضبر) تەختەی لە چەرم گیراوەو، لە قەڵاو قایمکاران نزیك دەبێتەوەو ژێرەکەی پڕە لە زەلام بۆ شەڕ ئامادەن.[1008] ئەم پارچە چەرمە ناوی دیکەشیان لێ ناوە، بە نموونە وەك (القفع)[1009] و (الستارة)[1010] و (الجفتا).[1011] (الطرسوسي) باسی ئەم پەردەو پۆشاکە دەکاو کەچی ناوەکەشی نالێ.[1012] (دوزی)یش دەڵێ: (الجفتا) پەرژینێکە وەکو سەنگەر (Palissade)[1013] وایە. لە (المعجم الوسیط)یشدا هەروەها لە فەرهەنگی (المورد) یشدا هاتووە کە (Palissade) پەرژینێکە لە سنگە دار پێکهاتووە.

وا دیارە ئەم (الجفتا)یە سەنگەرێکی گەرۆك بووە بە وێنەی پەردەو بەربەستێك سەربازان لە پشتەوەی خۆیان حەشارداوەو، لەوێوە دوژمنیان تیرباران کردووە.[1014] دەبابە، خاچدروشمانیش لە گەمارۆکەی (عکا)دا، بەکاریان هێنا، لەوەدا (سبط إبن الجوزي) دەڵێ: "کوڕەکەی (فریدریك باربارۆسا)ی شای ئەڵمانەکان، دەبابەیەکی زۆر مەزنی سازدا، هەزاران زەلام دەچوونە ژێری، کەللەیەکی گەورەی بە ملێکی درێژەوە بۆ دروست کردبوو، قۆچی لە شوورە دابا، دەیرووخاندو بەناو دەکەوت". بەڵام ئەییوبییەکان ئەم دەبابە مەزنەیان ئاگرداو سووتاندییان.[1015] هەرچەندیشە لەوەسفی مەزنی ئەم دەبابەیەدا زۆری ناوەتەسەر.

مێژوونووسان باسی دەبابەیەکی دیکەی خاچدروشمان دەکەن، دەڵێن هەند گەورەو مەزن بووە دێوێك بووە بۆ خۆی،

---

1004 ـ آثار الاول ١٩٢.

1005 ـ لسان العرب، ٢/٢٦٦.

1006 ـ البداية والنهاية، ٣٣٥/١٢. ابن الوردي ١٤٦/٢.

1007 ـ د. حسن إبراهيم حسن، تاريخ الاسلام السياسي، مطبعة السنة المحمدية، القاهرة ١٩٦٧، ج١، ص١٨٣. إحسان هندي، الحياة العسكرية، ١٤٣. عبدالرحمن زكي، السلاح في الاسلام، ٣٨.

1008 ـ تأريخ العروس، ٣٤٧/٣. والافصاح في فقه اللغة ، مطبعة المدني، القاهرة، ط٢، ١٩٦٤، ج١، ص٦١٧.

1009 ـ الافصاح في فقه اللغة، ج١، ص١٦١٤. وەرگێر: (القفع : زەمیلەی بێ دەسکە لە گەڵای دارخورما دروست دەکرێ).

1010 ـ عبدالرحمن زكي، السلاح في الاسلام، ص٣١. إحسان هندي، الحياة العسكرية، ١٤٢.

1011 ـ بنۆڕە: الفتح القسي، ١٠٥. مفرج الكروب، ٢٥٨/٢.

1012 ـ التبصرة، ١٣٤ب.

1013 ـ Dozy, Supplement eux, Dict, Vol.1.P,200.

1014 ـ بنۆڕە: الكامل، ٨/١٢، ١٥/١٢. الفتح القسي، ص١٠٥.

1015 ـ مرآة الزمان ٤٠٤/٨.

ئەییوبیانی ناو شاری (عكا) بە جارێ لێی تۆقیبوون، چونكە پێشتر دەبابەی هەند گەورەیان نەدیتبوو، دەبابە، دەبابە نەبوو، بەڵای خوا بوو، ئەم دەبابەیە چوار نهۆمی لە سەریەك هەبوو. (العماد الكاتب)یش باسی دەكاو دەڵێ: "بە هەیبەتو بە پۆشاك بووەو لە دارو قوڕقوشم و ئاسنو مس دروست كراوە". ئنجا (العماد) دەڵێ: "شێری دڕندەو گورگەلی بۆریان لە نهۆمەكاندا دادەنا، وڵاتەكەی بە جارێ تووشی بەڵاو كارەسات دەكرد. ئەم دەبابەیە لە بنەوە چەرخەی بۆ كرابوو، هۆو هۆكاری مەرگاوەری لێ قایم كرابوو، ترسو تۆقینی لە دڵی خەڵكی نابوو".[1016] خاچدروشمان ئەم دەبابەیەیان گەیاندە نزیك شوورە قایمكارەكانی شاری (عكا)و تەنیا پێنج گەزی مابوو بگاتە دیوارەكە، ئەوجا خەڵكی ناو شار ترسیان لێ نیشتو زۆریان ورەیان بەرداو هاتنە سەر ئەوەی دەخالەت ببەنو شارەكە وەدەستەوە بدەن، وەلێ ئەییوبییان دەمارگرتنیو بەم سەرشۆڕییە ڕازی نەبوونو پێیان داكوتا لە شارەكەدا بەرەڤانی بكەنو ماڵ بە ماڵ بەرگریی بكەنو بستێكی بە دەستەوە نەدەن، بڕیاریشیاندا ئەم دەبابەیە بسووتێنن. ئەوجا كەوتنە نەوتبارانی دەبابەكە، شەو ڕۆژ بێووچان و سەرومڕ لەسەری بەردەوام بوون، تا دەبابەكەیان ئاور تێبەردا، "بڵێسەیەكی گەیشتە ئاسمانو دایان لە ئەڵلاهو ئەكبەر".[1017] (العماد) دەڵێ: "بە ئاگرەكەی، ئاسمان بووە چراخانو دووكەڵیش دنیای داپۆشی، سەركەوتنی ئێمەش لە ناو دووكەڵەكەیدا دەدرەوشایەوەو تێنو گوڕی بە مەرەكەبو ئووچەكانمان دەداو، كڵپەو بڵێسەی ئاوری ئەم دەبابەیە، ژەنگی دەغڵی دڵو دەروونمانی بە جارێ ڕامالی.."[1018] بەمەدا دەردەكەوێ، كە ئەم دەبابەیە، بۆ ڕووخاندنی شوورەو كاول كردنی شارەكان چەندێ كاریگەر بووە.

بەرانەی دەبابەكەیان لە كۆڵەكەیەكی ئەستووری دە مەتر درێژ، یان درێژتر، قایم دەكردو شۆڕدەبووەوە، بە زنجیری ئاسن، یان بە گوریسی زۆر ئەستوور دەبەستراو لە دوو جێگەوە ڕایدەگرت. ئەگەر سەربازەكان دەرگایەك، یان شوورەیەكیان نیازبوایە بیڕووخێنن، دەبابەكەیان لێ نزیك دەكردەوەو لە ناو دەبابەكەوە سەلكی بەرانەكەیان وەك دیلانێ دەهێناو دەبرد، دەیاندا لە شوورەكە، یان لە دەرگاكەو، ئەم لێدانەش بەردەوام دەبوو، تا بەردەكانی دەترازاند، ئەوجا كەلێنو كەلەبەریان تێ دەخست، یان دەرگاكەیان هەر بەو جۆرە لێك دەترازاندو دەیانشكاندو بە ژوور دەكەوتن.[1019]

خاچدروشمان بۆ گرتنی شاری (عكا)، بەرانەی سەیرو تۆقێنەریان دروست كرد، (العماد) باسی بەرانەیەك دەكا، خاچدروشمان بە سەر دەبابەیەكی مەزنەوە ڕایانگرتبوو، دەڵێ: "فەرەنگ كەوتنەوە بنیادنانەوەی دەبابەیەكی مەزن، بەوپەڕی فڕوفێڵو كینە لە دڵییەوە، لە سەرەوەی كەللەیەكی گەورەی پێوەبوو، پێیاندەگوت بەرانە، دوو شاخی پێوە بوون، دوو ڕم درێژ بوون، گەورەو ئەستوور بوون، قۆچی لە هەر شوورەیەك دابا لێكی هەڵدەوەشان".[1020] دەبابەكە پتەوو قایم بوو "خۆیو بەرانەكەشیان بە دیرەگی ئاسن سەرگرتبوو، ئامرازی توندوتۆڵیان بۆ سازدابوو، كەللەی بەرانەیان لە ئاسنو لە مس گرتبوو، ئنجا بەشتی ئاگربڕی دیكە دایانپۆشیبوو، ڕێگای ئاگریان لێ بڕیبوو، نەیاندەهێشت بشكێو لەكار بكەوێ".[1021] جگە لە بەرانە، دەبابە پاشكۆی دیكەشی هەبوو. تێڵایەكی "ئاسنی نووكتیژ (سفود)[1022] هەبوو، بە وێنەی گاسن، قورسو تیژ، ئەمە لە شوورە دەدراو وورده ورده دەیكۆڵیو كونی دەكرد، وەلێ بەرانە خڕو بازنەیی بوو، شوورەكەی دەترازانو هەڵیدەتەكان..".[1023]

---

1016 ـ الفتح القسي، ٤٨٧. بنۆڕە: النوادر، وەسفی ئەم دەبابەیە دەكا. ص١٦٢.

1017 ـ مفرج الكروب ٣٥٢/٢. ابن الفرات، ج٢، مجلد٤، ص٨.

1018 ـ الفتح القسي، ٤٨٧.

1019 ـ جرجي زيدان/ تأريخ التمدن، ١٩٠/١. نعمان الثابت، الجندية، ١٨٥.

1020 ـ الفتح القسي، ٤٣٢. الروضتين، ١٦٤/٢.

1021 ـ هەمان دوو سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

1022 ـ (سنوود) لە لاپەڕە ١٤١ی (النوادر)دا ببینە. "سفود" یش لە الروضتين ١٦٢/٢. مفرج الكروب ٣٣٤/٢.

1023 ـ النوادر، ١٤١، الروضتين، ١٦٢/٢. مفرج الكروب، ٣٣٤/٢.

لەو شەڕەشدا، کە لە (٤)ی ڕەمەزانی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) دا قەوما، ئەییوبییان دوژمنیان ڕاونا، "هێرشیان بردە سەر بەرانەکەیان، نەوتیان پێداکردو ئاگریان پێوەناو سووتانیان، جەنگاوەرانی ناو ئەم دەبابەیە هەڵاتن‌و ڕایان کرد، ئاگری تایەن، دزەی کرد بۆ سفوودەکەو ئەویش ئاگری سەند، ئەوجا قارەمانانی ئەییوبیی قولاپیان لە بەرانەکە گیرکردو بە زنجیری ئاسن کێشیان کردو گەیاندیانە ناو شارو بە ئاو ساردیان کردەوە. ئنجا (ابن شداد) دەڵێ: لە ناو شارەوە هەواڵیان پێ گەیاندین، کە ئاسنەکەیان لە تەرازوو داوە، سەد قەنتاری شام بووە". پاشان کەللەی بەرانەکەیان نارد بۆ سوڵتان سەلاحەددین‌و نایانە بەردەستی مێژوونووسی ناوبراو، ئەویش سەیری کردووەو ئەمدیوو ئەودیوی کردووەو دەڵێ: وەکو گاسنی گێرەو جەنجەڕەو دەیخەنە قۆچ دان‌و شوورەی پێ دەڕوخێنن، ئەو ڕۆژانەی ئەو سەردەمە، لە هەموو ڕۆژێکی ئەییوبیان خۆشتربووە.[١٠٢٤]

دەبابە پەیژەیشی هەبووە، گەمارۆدەران پێیدا وەسەر شوورەکان دەکەوتن‌و کەلەبەریان لە دیواری قەڵاکان دەخست، پێشتر پەیژەکە لە گوریس دروست دەکراو قولاپەکەیان لە بەردەکانی شوورەکە گیردەکردو پیایدا هەڵدەگژان، پاشان لە دارو ئاسن دروستیان دەکرد، جاروباریش پێچکەو چەرخەو خولخولۆکەیان بۆ دروست دەکردو، بە ئاسن ئەم لاو ئەولایان پێ دەکرد.[١٠٢٥] ئەم پەیژانە بە فەرمانی سەلاحەددین لە شەڕی خاچدروشماندا بە کارهێنران.[١٠٢٦]

**سێیەم: چەکگەلی تەنپارێز:**

ئەو چەکانەن، کە دەتوانین ناویشیان بنێین چەکی بەرەڤانی، ئەوانەن، کە بۆ پاراستنی لەش بەکاردێن‌و لە چەکی دوژمن دەمانپارێزن. ئەم جۆرە چەکانە، لەپاش دروستکردنی چەکی هێرشبەری بەکارهێنراون، چونکە چەکی خۆپارێزی بۆ کەمکردنەوەی مەترسیی چەکی هێرشبەری دێتە مەیدان. بەڵام ئەگەر بێت‌و بەگشتی بنۆڕینە هەموو جۆرە چەکەکان، دەبینین، کە هەر هەموویان بۆ هێرش‌و بۆ خۆپاراستن بەکاردێن. ئەو چەکانەش کە ناوی چەکی خۆپارێزیمان لێ ناوە، دەتوانرێ بۆ هێرشیش بخرێنەکار، بەڵام بە پلەی یەکەم هەر بە چەکی خۆپارێزیی لە قەڵەم دەدرێن‌و، هەر ئەوەشن گرنگترین جونەکانی ئەم چەکانەش، ئەمانەن:

**١ـ قەڵغان:**

ئامرازێکە، لەشی مرۆڤ لە تیرو نووکەنێزەو ڕمو داهێنانەوەی شمشێرو خەنجەرو، پەڵ‌و بەرد دەپارێزێ. قەڵغان پێشتر لە دارو تەختە دروست دەکرا، پاشان لە ئاسن. هەرچی ئەو جۆرەیە، کە لە پێستە دروست دەکرا، ئەوە پێیاندەگووت (الدرقة)[١٠٢٧] کە ئەکاتە پێستەی ڕووت، جار جارەش، ڕیزەدارێ، یان ڕیزەقامیشیان شان بەشان وەکو چیغ بە بەن‌و دەزوو لێك دەتەنی.[١٠٢٨] قەڵغان بەشێوەی جۆر بە جۆری بە نموونە، وەك: پان، لاکێشەیی، ناوچاڵ‌و، گومبەد ئاسایش دروست دەکرا. ئەم جۆرە گومبەد ئاسایە، خاوەنەکەی لە ڕمو نووکەنێزە نەدەپاراست، چونکە نووکە ڕمەکە دەچووە ناوی و کوناودەری دەکردو قەڵغانبەدەستەکەی دەکوشت، بۆ گلدانەوەی تیر لە باربوو، چونکە سەری قەڵغانەکە کەللەی سوارەکەی دەپاراست‌و، لەشی قەڵغانەکەش، لەشی سوارەکەی دەپاراست، هەرچی قەڵغانە پانەکانە ئەوانە بۆ گلدانەوەی ڕم[١٠٢٩]، لە بار و بە سوود بوون.

---

[1024] ـ النوادر، ١٤٢. الروضتين، ١٦٣/٢. (سەرنج لەوەش بدە، سەرچاوەو ژێدەرە ئیسلامییەکان، بە تایبەتیش ئەوانەی ئەو سەردەمانە، کە باسی چەکو ئامێرو جبەخانەکانی جەنگی خاچدروشمان دەکەن، مەبەستیان لەوانەی خاچدروشمانەو باسی ئەوان دەکەن، نەك باسی ئەو چەکانەی، کە سوپای ئەییوبی بەکاری هێناوە، بە تایبەتیش چەکی قورس).

[1025] ـ احسان هندي، الحياة العسكرية، ص١٤٩.

[1026] ـ النوادر، ١٤١. الروضتين، ١٦٢/٢. مفرج الكروب، ٣٥٣/٢.

[1027] ـ ابن هذيل الاندلسي، حلية الفرسان، ص٢٣١. صبح الاعشى، ١٤٣/٢.

[1028] ـ آثار الأول ١٦١، نعمان ثابت، الجندية، ١٧٩. جرجي زيدان، ١٨٦/١.

[1029] ـ صبح الأعشى، ن، ص. التبصرة، ١٠٩/أ. لە مۆزەخانەی حەربیی دیمەشق ، هەموو ئەو قەڵغانانەی هەن، خڕی سینی ئاسان.

قەڵغانی گەورە، بێ گومان سوارەی تەنگاو دەکردو، باڵی چەپی لەکاردەخست، کە قەڵغانەکەی پێ دەگرت، وەلێ ئەم جۆرە قەڵغانە گەورەیە، زۆرتر بۆ پیادەکان لەبارتر بوو. سوارەکان دەبوو قەڵغانی بچووکو سووک هەڵبگرن، تا بتوانن ساناتر بجووڵێنو بەکاری بێنن. ئەو قەڵغانەی کە سوپای ئەییوبیی و عارەبان بەکاریان دەهێنا، بەتایبەت لە شەڕەکانی خاچدروشماندا، جۆرێکی پانی سینی ئاسا بوو.[1030] قەڵغانسازانی ئەییوبی و عارەبان لە دروست کردنی ئەم جۆرە قەڵغانەدا، وەستایی و دەستڕەنگینییەکی چاکیان هەبوو، ئایەت و قسەی نەستەق و هۆنراوەو شیعریشیان لە سەر هەڵدەکەند.[1031]

خواساییشە، ئەییوبیان و خاچدروشمان، هەندە سەروسەختی دوژمنانەو پێکدادانیان لە نێواندا بووبێ، لەچەکو جبەخانەی یەکدیش فێردەبنو، یەکێ لەو چەکانەش قەڵغانە. بە نموونە جەنگاوەری ئەییوبی، قەڵغانی تارگا (Targa)ی بەکاردەهێنا، ئەم قەڵغانە جۆرە قەڵغانێکی فەرەنگ و ڕۆمە، کە زۆر خۆیان پێوە هەڵدەکیشاو بە وێنەو ڕەنگو ڕۆن و بۆیاخ دەیانڕازاندەوە، ئەم قەڵغانی تارگایە، لاکێشەیی بووەو، بە تەواویی تەنی پیادەو سوارەی لە چەکی دوژمن پاراستووە. (دۆزی) دەڵێ: ئەسڵی تارگا لاتینیە.[1032] بەڵام مێژوونووسانی موسوڵمان لە وەسفی قەڵغانەکانی خاچدروشماندا، ئەم تارگایە، بە (الطوارق) نادەبەن. (العماد) دەڵێ: "خاچدروشمان سەنگەری خۆیان بەرنەدەداو، لە کەندەکی خۆیان نەدەترازانو هەمیشە خۆیان دابووە پاڵ تارگاکانیان". (العماد) لە جێگایەکی دیکەدا، دەڵێ: خاچدروشمان پەنایان بۆ شوورەو کەندەکان بردبوو، خۆشیان وەپاڵ تارگاکان دابوو. ئەییوبیانیش ئەم جۆری قەڵغانی تارگایەیان، لە هەندێ شەڕدا بەکارهێنا، (إبن الأثير) دەڵێ: کاتێ سوپای سەلاحەددین، لە (جمادی الآخر ساڵی ٥٨٤ك/ ١١٨٨ز)دا، پەلاماری قەڵای قایمکاری (بەرزییە)یان دا، ئەم تارگایەشیان بەکارهێنا.[1033] جۆرێکی دیکەش هەبوو پێیان دەگوت (الجنة)، ئەم وشەیە، هەر خۆی مانای قەڵغانە، بە هەر شتێك دەگوترا، لەش بپارێزێ، بە نموونە وەك زرێو قەڵغان.[1034]

(الطرسوسي) لە وەسفی (الجنة)دا، دەڵێ: وەك تارگا وایە، وەلێ پاشڵەکانی تیژ نییە، بەڵکو بڕدراوەو قوت کراوەتەوە، تا قوت لە سەر زەوی بوەستێ، لەو قەڵغانانەیە، کە زەلام کاتێ بۆ شەڕ دەچێ، بەرسنگی خۆی پێ دەپارێزێو، وەك قەڵایەکی قایمکار ڕیزی جەنگاوەران لە تیر دەپارێزێ، ئنجا دەڵێ: ئەو قەڵغانە هیچ چەکێ کاری لێناکاو جیرەکەوانیش زەفەری پێ نابا.[1035]

ئەو جۆرە (جنة)یە، هێلکەیی و لاکێشەیشی هەبوو، هەندەش گەورەبوو، جار جارە، وەك دەسەبەرە برینداریان پێ هەڵدەگرت.[1036] واتا بۆ کاتی پێویست دەیانکرد بە دەسەبەرە. جار جارەش، ناوی ئەم تارگاو جنەیانە لە هەندێ سەرچاوەو ژێدەری عەرەبیدا دەبینین.[1037]

ئامرازی دیکەی پاراستنی تەنی جەنگاوەر هەبوون، لەبەردەکران، سەرو سنگو پشتو قۆڵو بازوو و هەردوو ئەژنۆشی دەگرتەوە، بۆ شەڕو، خۆپارێزی لە چەکی دوژمن. نەخاسمە چەکی دەستەویەخەی بە نموونە، وەك شمشێر و ڕم و تیر، دەکرایە بەر. نەك هەر ئەوەندە، بگرە خەممخۆرانی چەك، فڕوفێڵیان بۆ خۆپاراستن لە ئاگرو سووتانیش دۆزیبووەوە بەرگی وەهایان لەبەردەکرد، لە دیوی دەرەوەو لە دیوی ناوەوەش، بە ماددەگەلێ سواغ دەدران، لە نەوشاترو

[1030] ـ زیدان، ١٨٧/١. د. زكي، السلاح في الاسلام، ص١٦. احسان هندي، الحياة العسكرية، ص٦٩.
[1031] ـ التبصرة، ورقة ١٠٩ب.
[1032] ـ دوزی، هامش٣. مفرج الكروب، ٢٧٩/٢. ئێمەش بە دووری نازانین کە (طارقة) عەرەبییەکە لەم تارگایەوە وەرگیرابێ.
[1033] ـ الكامل، ٧/١٢و ١٥/١٢.
[1034] ـ النويري، نهاية الأرب، ٢٣٩/٦.
[1035] ـ التبصرة ورقة ١١٠/أ.
[1036] ـ احسان هندي، الحياة العسكرية، ص٧١.
[1037] ـ النوادر، ٢٢٦. الكامل، ١٥/١٢. الروضتين، ٢٠/٢.

شەبی میسریو یەمەنیو ماددەی دیکە دەگیرایەوە. بەو جۆرە، ئەگەر جەنگاوەر، جلەکانی ئاگری گرتبا، ئاگرەکە نەدەگەیشتە لەشی، چونکە لە ژێرەوە لبادی پارێزەری لەبەردابوو[1038]. ئەم لبادەش، هەروەك ئەو (بن زینه)یە، کە لەوەپێش باسمان کردو بۆ پاراستنی لەشی ئەسپەکان بەکاریان دەهێنا.

بەڕای ئێمە، دروستکردنی ئامرازی لەشپاراستن، کە لە کانزا دروست بکرێ، ئەرکو مەسرەفی زۆری دەوێ، کۆششو وەختیشی دەوێ، لەبەرئەوە، تەنیا فەرماندارو میرەکانی لەشکر لەبەریان دەکرد، هەروەها ئەوانەش کە فرمانی نهێنیو گرنگیان پێ دەسپێردرا. نەدەتوانرا ئەم جۆرە بەرگانە بۆ هەموو جەنگاوەرەکان فەراهەم بکەن، چونکە لەو سەردەمەدا بە کانزاکردنی ئاسنو پاڵاوتنی ئاسنی تواوەو قاڵب دروستکردنو، بڕینو لێك قایمکردنی پارچەکانی، کە پڕ بە بەربیێو شانو قۆڵێو کەللەو بازوو بگرێتەوە، کارێکی زۆر زەحمەت بووە، نەخاسمە، کە بە شێوازێکی سەرەتایی دەکرا. جا ئێستا با، باسی ئەو کڵاوە ئاسنینە بکەین، کە وەك کڵاو، لە سەر دەنرا:

## ٢ـ بەرگی لەشپارێز:

### أـ کڵاوزرێو خودە:

سەرچاوەو ژێدەران باسی دوو جۆری کڵاوی جەنگ دەکەن، سەربازان لەسەریان دەنا، یەکەمیان کڵاوزرێ (المغفرة)یە، ئەمە کڵاوێکە پڕ بە سەر، وەکو تۆڕ لە زریزەی ئاسن دەچنرێ[1039] و لە هەردوو لاجانگو لەپشت ملیشەوە، وەکو کلێتە شۆڕ دەبێتەوەو دایاندەپۆشێو لەگەڵ پەستەکێکی زرێدا (الجوشن) یەکدەگرێتەوە.[1040] جەنگاوەرەکە، لەسەر کڵاوزرێکەوە کڵاوێکی دیکەی ئاسن لەسەر دەکا لە خودە دەچێ، پێیاندەگوت (البیضة)[1041]، ئنجا لە سەر خودەکەشەوە، مێزەری دەبەست، یان کڵاوێکی لەسەر دەنا.[1042]

### ب. پەستەکی زرێدار (الجوشن):

باقیمەنی لەشی جەنگاوەر، پەستەکێکی درێژ دایدەپۆشی، ئەوەیش، ئەڵقە ئەڵقەی وەك زریزە، دەچنراو لەبەردەکرا، وەکو تۆڕ وەهابوو، جەنگاوەرە سوارەکان، لە هەندێ لەشکردا دەیاندا بە شانیاندا، بەوەشیان دەگوت (جەوشەن)[1043] جاروباریش ئەڵقەکانی بەجووت ئەڵقەیی دەچنران، پێیان دەگوت (زرێی دوو توێ)، ئەمەیان قایمترو چاکتر بوو.

زرێ، خواسایی یەك پارچە بوو، لەملەوە، لەشی دادەپۆشی، تا هەردوو ئەژنۆ، هەشبوو لە ئەژنۆش شۆڕتر بوو، کەمو زۆر لەو کراسە دەچوو، کە سوارچاکان لەبەریان دەکردو بە ئینگلیزی (ئۆڤەر ئۆڵ Over all)[1044]ی پێدەڵێن. لە ژێر ئەو زرێیەشەوە کراسێکی دروشمدار (غلالة)یان لەبەر دەکرد، زۆرتر لە کەتانی ئەستوور، یان لە زرێیەکی تەنکتر دروست دەکرا، پێیاندەگوت، تەریبدراو (الشلیل).[1045]

پێویست بەوە ناکا، باسی هەموو جۆرە زرێو تۆڕی ئاودامانی لە زریزەچنراو و کڵاوزرێو ئەو جۆرە ئامرازانە بکەینو ناوەکانیان بڵێین، کە کتێبگەلی زمانەوانی بە زۆری باسیانی کردووە، چونکە لە سەردەمی سەلاحەددینذا بەو شرۆڤەو وەسفو ناوانەوە بەکارنەدەهێنران، لەبەرئەوە، بەباشترمان زانی تەنیا باسی ئەوانەیان بکەین، کە لە زەمەنی

---

1038 ـ أمين الخولي، الجندية والسلم، ص٤٤. لە دەستنووسی (الأحكام الملوكية)ی (ابن منكلی) لاپەڕەی ٢٩ وەرگیراوە.

1039 ـ ابن سيدة، المخصص، المكتب البخاري، بيروت، مجلد السفر السادس، ص٧٢. تاج العروس ٤٥١/٤. والأفصاح في فقه اللغة، ط٢، ح١، ص٦١٥.

1040 ـ تاج العروس، ن، ص، صبح الأعشى ١٤٢/٢.

1041 ـ صبح الأعشى، ن، ص. ابن هذيل، حلية الفرسان، ٢٣٠.

1042 ـ تاج العروس، ٤٥١/٤.

1043 ـ ابن منقذ، الأعتبار، ٥٢. تاج العروس، ١٦١/٩. أدي شير، الألفاظ الفارسية المعربة، ٤٩٠. محمد فرج، السلام والحرب، ٩٢. هنداوى، المعجم الفارسي، ١١٣.

1044 ـ عبدالرؤوف عون، الفن الحربي، ص٥١.

1045 ـ ابن سيدة، المخصص، مجلد٢، السفر السادس، ص٧٠. الافصاح في فقه اللغة، ٦١٥/١.

سەلاحەددیندا هەبوون، یان زۆرتر، لەوە دەچێ بووبن.

سەنعەتو دروستکردنی زرێ، یان بە کوردی، زرێسازی لە کاتی حوکمی بنەماڵەی ئەییوبییاندا، گەیشتبووە ئەوپەڕی چاکیو نایابی.[1046] (الطرسوسي) کە باسی زرێسازی دەکا، دەڵێ: پەستەکی زرێ، جاروبار لە پارچە ئاسنی بچووك بچووكو، جار جارەش لە مووی، یان لە پێستە دروست دەکرا، جاری واش هەبوو تێکەڵ دەکرانو لەگەڵ ماددەی تردا دەشێلرانو پەستەکی وەهای لێ دروست دەکرا، تیر نەیدەبڕیو، شمشێریش لەبەریدا دەشکا، یان دەچەمایەوە.[1047] پاشان (الطرسوسي) دێتە سەر باسی گیراوەیەکی هەویر، کە لە ئاردی هەندێ ماددەی، وەك جگەر، یان خوێنو ماددەی دیکە تێکەڵ دەکرێنو هەڵدەشێلرێن، پاشانیش وشك دەکرێتەوە[1048].

بە جۆرێکی دیکەش ماددەکان ئامادە دەکران، پێستی حوشترەمێیان دەهێناو، لەشیردا دەیانفیسان، ئنجا سووریان دەکردەوە، تا کورکەکەی (مووەکەی) هەڵدەوەریو سپی هەڵدەگەڕاو لادەبرا. ئەوجا پەستەکیان لێ دروست دەکرد و بەینێ لێی دەگەڕان. ئەوجا، جۆرە شووشەیەکیان دەهێناو زۆر بە وردی دەیانکوتاو لەگەڵ هاڕراوەی مسو ماددەی تردا تێکەڵیان دەکرد، لەهەریەکە لەمانە، نەختێکیان دەهێناو بە کەتیرەوە دەیانشێلا، ئەوجا پێستە خۆشەکراوەکەیان جارێ، دووجار، سێ جار، چوار جاریان پێسواغ دەداو لێیان دەگەڕان، تا وشك دەبوونەوە، ئەوجا لە ڕۆنو بۆیاخ هەڵدەکێشران[1049].

بەڵام لەبەرکردنی ئەم زرێیانە کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵێ بۆ خۆپاراستن چاك بوو، سوودی هەبوو، وەلێ کەموکورتییەکەی لە بەکارهێنانیدا بە دەردەکەوت، ئەم کەموکورتییەشی چارەسەر نەدەکران، بە نموونە، قورسایی ئەم پەستەكو کراسە زرێپۆشانە دەکەوتە سەر هەردووشانو، هەردوو سەرقۆڵەکەشی هەند گرانو قورس دەبوون، زەلام نەیدەتوانی بە سانایيو بەهێز شمشێرەکەی دەستی داوەشێنێو بە ئەزموونیش دەرکەوت کە لۆچەکانی زریزەکە ڕێگا لە باڵو باسکی دەگرنو نایەڵن بە هەوەسی خۆی بیانجوڵێنێ.

ڕمو شمشێرو تەورو تەوراس، زنجیرو زرێکەیان لە شەڕدا، جار جارە لێك دەترازاندو لەگەڵ نووکە نێزەدا دەچەقینە لەشی کابرای برینداری زیاتر دەیگەیاندە شەرای مەرگ. لەبەرئەوە، بە زەرووریان زانی لەبن زرێکەوە، پۆشاکێکی لباد، یان ناواخندار لەبەر بکەن، وەلێ ئەمەش دیسان شانو باڵی سەربازانی شەتەك دەداو نەیدەتوانی بەباشی بیانجووڵێنێ، چونکە هەر بە جارێ، دەبووە زەلامێ لە زرێو ئاسن، قورستریش دەبوو، نەشیدەتوانی ببزوێو ئاوڕبداتەوەو لابکاتەوە.[1050]

لەشپارێزە لە قوماشو پێستە دروستکراوەکان، پوولەکەی کانزایان تێ دەگیراو، چەکسازان بەرە بەرەو ڕۆژ بە ڕۆژ، شارەزایيو وەستاییان لەم پیشەیەدا زیاتر دەبوو. وەکو (الطرسوسي) دەڵێ: گەیشتنە ئەوە کە لەشپارێزی گەورەترو چاکترو سووکتر دروست بکەن.

سەرچاوەو ژێدەرانیش، کە باسی ئەم زرێو (الكزاغند)ە، دەکەن، دەڵێن: بەرگێکە، بە ئاوریشم ناوپۆش کراوە، بۆ ڕۆژانی جەنگو شەڕ لەبەر دەکرێ[1051]. وەکو نیوە پاڵتۆ وەهابوو[1052]، لە شەڕەکانی خاچدروشماندا لەبەردەکرا، لەو

---

1046 ـ عبدالرحمن زكي، السلاح في الأسلام، ص٢٧.

1047 ـ التبصرة، ورقة ١١٦ب.

1048 ـ التبصرة، ورقة ١١٨أ.

1049 ـ التبصرة، ورقة ١١٩ب.

1050 ـ هامرتن، تأريخ العلم، ٣٢٥/٥.

1051 ـ محمد التونجي، المعجم الذهبي، ص٤٤٦.

1052 ـ (یانیش چاکەت "ساقۆ")یە. jacauetto هەروەك لە فەرهەنگەکەی (دۆزی)دا هاتووە .Dozy, vol ٢, p, ٤٧٦ یان surcoat کە پاڵتۆیەکە سوارچاکان لەسەر زرێوە دەیپۆشن). المورد، ص٩٣٢. مفرج الكروب ٤٤/٢. هامش (٥).

سەرکراسانە دەچوو، کە لە سەر جل و بەرگەوە، بۆ شەڕ لەبەر دەکرا[١٠٥٣].

وادیارە، سوارەو پیادەش، لە سەردەمی سەلاحەددیندا (الکبورة)و (القباء)یان لەبەردەکرد، کە بە مانای (سەرکراس) دێن. (إبن شداد)یش گوتوویەتی: "پیادەکان کەبوورەی ئەستووریان لەبەردابوو"[١٠٥٤].

سەلاحەددینیش، خۆی هەمیشە لە شەڕی دەستەویەخەدا کلاوزریو ئەم (الکزاغندە)ی لەبەردابووە[١٠٥٥]. (إبن الأثیر) دەڵێ: چەند زەلامێکی تیرەی ئیسماعیلی لە ساڵی (٥٧١ك/ ١١٧٥ز)دا، لە شەڕەکەی قەڵای (ئەعزاز)ی نزیك شاری حەڵەبدا، پەلاماری سەلاحەددینیان داو بە چەقۆ بەربوونە شان و ملی "باش بوو، خۆشبەختانە سەلاحەددین لە ژێر کڵێتەیەکەوە کلاوزەڕ (کلاوزرێی)ی پۆشیبوو، سەلاحەددین دەستی کابرای ئسماعیلی توند گرت، بەلام کابرا، بە چەقۆ، هەر لە شان و ملی سەلاحەددینی دەدا، وەلێ سەلاحەددین لەم (کزاغندە)ی لەبەردابوو، چەقۆیەکان بەر یەخەی کزاغندەکەی دەکەوتن و دەیانبڕی، بەلام زرێییەکەی ژێرەوەی، ڕێگای لە نووکە چەقۆکان دەگرت و نەدەگەیشتنە سەر گۆشتی ملی، دیارە هێشتا نەسیبی لە ژیاندا مابوو".[١٠٥٦]

ئەم ڕووداوو بەسەرهاتە تاڵە (کە لە سەرەتای کۆششی سەربازییدا، لەشام بەسەری هات) کارێکی وایکرد، کە تا مردن ئەو کزاغندەیە لەبەربکاو فرێی نەدا، (إبن شداد) دەڵێ: "لە ساڵی (٥٨٩ك/ ١١٩٣ز)دا، ڕۆژەکەی، ڕۆژێکی زستان بوو، لە خزمەتی سەلاحەددیندا بووین، بەرلە مردنی بە ماوەیەکی کەم، لە ڕێگا "سەرنجمدا، کزاغندەکەی لەبەرنەکردبوو، کە ئەو بەبێ کزاغندەکەی بەڕێ نەدەکەوت، منیش خۆم پێ ڕانەگیراو، خێرا کەوتمە تەنیشتی و پێم گوت نەدەبوو ئەو کەمتەرخەمییە بکەی، ئەویش هەروەکو لە خەو ڕاپەڕێ. کە دیاربوو لە بیری چووبوو. داوای کزاغندەکەی کردو بۆیان هێنا.."[١٠٥٧].

**ج. بن زین، یان ژێر زرێ (التجفاف):**

وشەی بن زین یان ژێر زرێ، بە ئەسڵ (تەن پەنا)[١٠٥٨]ی فارسییەو لە عەرەبیدا بووەتە (التجفاف)، لە کتێبگەلی زمانەوانی و باسی چەك و ژێدەرەکانی ئەو سەردەمەدا هاتووە. (تەن پەنا)ش واتا لەشپارێز، بەرگێ بوو، سوارەکەش لەبەری دەکردو بە بەر ئەسپەکەشیدا دەکرد[١٠٥٩]. ئەم بەرگە ئاگرپڕ بوو، نەدەسووتاو نەیدەهێشت ئاگرەکە بەر لەش بکەوێ. (إبن شداد) دەڵێ: "ئەم ژێر زرێ، یان بن زینە بریتی بوو لە پۆشاکێ، بە تایبەتی جەنگاوەرانی سوارە لەبەریان دەکردو لە باسی ژمارەی سوپای هەڵمەتێکی خاچدروشماندا، دەڵێ: ژمارەیان "چل و دوو هەزار ژێر زرێ پۆشبوون و، پیادەکانیشیان لە ژماردن نەدەهاتن".[١٠٦٠]

هەرچی (إبن منكلي)یە، ئەوە، ئەو دەڵێ: بەرگێکەو لەشی ئەسپی پێ دادەپۆشن.[١٠٦١] ئەمەش (الطرسوسي) ڕوونی

---

[1053] ـ الجوالیقي، المعرب، ص٢٥٢.. وەرگێڕ: (بەڕای من (الکزاغند) پەستەکە، یان هەر (خەزاخنە) کوردییەکەیە، واتا دۆشەکڵەی سووك، کە بە (خەز) واتا بە وردەو پارچە قوماش ناواخن دەکرێ. ئەم پاڵتۆو (surcoat)و چی‌و چییەش، هەر (فەرەنجییەکەی خۆمانە)، چونکە فەرەنجی (سووکە، سفتە، تیغ نایبڕێ‌و پێخەفیشەو بۆ هاوین فێنکەو بۆ زستان گەرمە). تۆ بڵێی ئەو هەموو فەرماندەو سەرەك هۆزو میرو سەربازە کوردانە نەیانزانبێ فەرەنجی‌و پەستەك‌و کوڵەباڵ چییەو؟ ئەمانەیان نەبووبێ؟ کە فەرەنجی‌و لباد ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر ڕەچەڵەکی میللەتی کورد).

[1054] ـ النوادر، ١٧٩. الروضتین، ٢/١٩٠. مفرج الکروب ٢/٣٦٥.

[1055] ـ مرآة الزمان، ٨/٣٣٤.

[1056] ـ الکامل، ١١/٤٢٩. سنا البرق الشامي، ١/٢١٠-٢١١. زبدة الحلب، ٣/٢٩. مفرج الکروب، ٢/٤٤- ٤٥.

[1057] ـ النوادر، ٢٤٢- ٢٤٣. مفرج الکروب، ٢/٤١٥.

[1058] ـ الجوالیقي، المعرب ١٩١. أدي شیر، الالفاظ الفارسیة، ص٣٤.

[1059] ـ الافصاح في فقه اللغة، ط٢، القاهرة، ج١، ص٦١٣.

[1060] ـ النوادر، ١٢٦.

[1061] ـ مخطوط، (التدبیرات السلطانیة)، ورقة ٦٣.

دەکاتەوەو، دەڵێ: "ژێر زینەو لە لباد دروست دەکرێ‌و بە سواغی ئاگربڕ سواغ دەدرێ‌و لەبەر ئەسپی دەکەن".[1062] (الطرسوسي) ئنجا دێتە سەر شرۆڤەی گرتنەوەی ئەو ماددەو سواغانەی، کە جل‌و بەرگی پێ سواغ دەدەرێ‌و دەڵێ: لە کەتیرەو گەچ‌و ئاردو سپێنەی هێلکەو شتی دیکە پێك دێت، ئەمانە بە "سرکەی تراوی زۆر ئاو، کە ترشییەکەی پەڕیبێ، جوان جوان هەڵدەشێلرێن، ئەوجا دەدرێن لەبن زین‌و ژێر زرێ‌و پێی سواغ دەدرێن". جا، ئەوجا، دەڵێ: "دەکرێ بە جلی ئەسپ، کە بەرسنگ‌و پاشڵ و کەفەڵی بگرێتەوە، هەرچی جەنگاوەرەکەیە، ئەوە، ئەو بەرگێ لەبەردەکا لە گەڵای دارخورما دروست کراوەو بە لباد ناوپۆشکراوەو شەڕواڵیش لەبەردەکاو، هەمووشیان بەو سواغە سواغ دەدرێن، هەروەها کڵێتەکەی سەریشی، کە ئەویش لە لباد دروست کراوە، هەر بەو جۆرە سواغ دەدرێ".[1063]

**چوارەم: پەیکوڵی ئاسن (المثلثات):**

هەرچەندە، ئەم چەکە گرنگە، وەلێ لە کتێبانەدا، کە باسی ڕووداوەکانی سەردەمی سەلاحەددین دەکەن، باسی بەکارهێنانی ئەم چەکەمان، بەرچاو نەکەوت، کە لەشکری ئەیبوبی، یان خاچدروشمان بەکاریان هێنابێ، بەلام ئێمە، ناچێتە ئەقڵمان بەکاریان نەهێنابێ، چونکە ئەم چەکە بۆ پێکدادانی نێوان دوو هێزی دوژمن بە یەك‌و لێك نزیك گەلێ بە بایەخە، نەخاسمە، کە چەرخەچییەکانی سوپای سەلاحەددین هەمیشە لە چالاکیی‌و بزاڤدا بوون، ئەوەش لەولاوە بووەستێ، ئەوەتا (الطرسوسي) کە هاوچەرخی سەلاحەددین بووە، بەم چەکەدا هەڵدەڵێ‌و وەسفی پڕوەزنیی دەکاو دەڵێ: چەکێکی زۆرچاك‌و جوان‌و کاریگەرو خێراکوژیشە.[1064] جگە لەو، ئەوەتا (الهروي)یش، کە ئەمیش هاودەمی سەلاحەددین بووە، ئەمیش باسی دەکاو، داوا لە سوپای ئەیبوبی دەکا، کە "پەیکوڵ بە دەوری سەنگەرو پێگە نزیکەکاندا بلاوبکەنەوە". تا دوژمن نەتوانێ لێیان نزیك ببێتەوە.[1065]

ئەسڵی پەیکوڵیش، بە شێوەزاری گەرمیانی خۆمان، کە بە عەرەبی (الحسك)ی پێ دەڵێن، ڕووەکێکی هەردانە، لەسەر بنجی خۆی بڕك دەهاوێ، بەرەکەی دڕکێکی بە سوێیەو هەندەی ماشەسپییەك دەبێ‌و، بە کەوڵ‌و خوریی ئاژەڵ‌و کورکی حوشترەوە دەنووسێ[1066]، شەش، حەوت نووکی تیژی هەیەو ڕەقە.[1067] زەلام بە پێخاوسی بە سەریدا بڕوا، کوڵەوار دەبێ. سوپای سەلاحەددین، بە پێی پێداویستی جەنگ، هەستان، پەیکوڵی وەك ئەم پەیکوڵەیان نەختێ گەورەتریش لەئاسن دروست کرد، بە شێوەی سێ سووچی نووك تیژ، یان شەش سووچی نووك تیژ دەیانتاشی‌و، لەسەر ڕێگای سوارەی دوژمن دەیاندانەوە، تا بچەقنە ژێر سمی ئەسپەکانیان و کوڵەواریان بکەن‌و نەتوانن هەنگاو بنێن.[1068]

پەیکوڵە شەش نووکەکانیشیان بە جۆرێ دادەنا، سێ نووکی لە زەوییەکە دەچەقێ‌و سێ نووکەکەی تری بەدەرەوە دەمانەوە.[1069] سوپای سەلاحەددین لە سێ بارودۆخدا ئەم پەیکوڵە ئاسنانەیان لەسەر زەوی دەنایەوە:

یەکەم: لە حاڵەتی بەرەڤانیدا: بۆ ئەوەیان دەنایەوە تا دوژمن بەگیربێنن‌و هێرشی بووەستێن‌و سمی ئەسپەکانیان کوڵەوار بکەن. لەم بارەدا، زەوی‌و زاری دەوروبەری پێگەکانی خۆیان بەم جۆرە پەیکوڵە دادەپۆشی‌و تەنیا ئەو ڕچە ڕێگایانەیان دەهێشتەوە. کە هەر خۆیان پێیان دەزانی. تا بتوانن ئەگەر بۆیان لووا، لەو ڕێگایانەوە، دژە هێرشی خۆیان

---

1062 ـ التبصرة، ورقة ١٤٥ب.

1063 ـ ن، م، ورقة ١٤٦/ب.

1064 ـ التبصرة، ٧٨/أ.

1065 ـ التذكرة، ص ١١٣.

1066 ـ تاج العروس، ١١٩/٧.

1067 ـ لسان العرب، ١٩٤/١٠. الافصاح في فقه اللغة، ج١، ص٦١٧.

1068 ـ آثار الأول، ١٩٤. الشيخ أحمد رضا، متن اللغة، مطبعة دار مكتبة الحياة، بيروت ١٩٥٨، ٨٨/٢. أدي شير، الالفاظ الفارسية المعربة، ص٥١. إحسان هندي، الحياة العسكرية، ص١٥٤ـ ١٥٥.

1069 ـ التبصرة، ١٧٨/ أ. أمين الخولي، الجندية والسلم، ص٤٢.

دەست پێ بکەن.. هەر لەبەر ئەوەشە، کە (الخوارزمي)دەڵێ: هەر میرێ لە فڕوفێڵو پیلانکاریی دوژمن دەترسێ، با ڕێگاو دەوروبەری خۆی پەیکوڵڕێژبکا.[1070]

دووەم: حاڵەتی دووەمی بریتی بوو لە بۆسەنانەوە و دەم شیرینکردنو دەست بەزاخاکردنی دوژمن. لەمبارەدا، بەدرۆ، شەڕێکی سووکەڵەیان لەگەڵ دوژمن دەکردو، هەڵدەهاتن، دوژمنیش بەمە دەخەڵەتاو هێرشی دەبردو دوویاندەکەوت، بەڵام ئەوان بەدەم هەڵاتنەکەوە، هەموو ڕێگەوبانەکانیان بەم پەیکوڵە دادەپۆشی، کە سوارەی دوژمنیش دەگەیشتە ئەوێ، ئیدی، پەیکوڵ لە سمی ئەسپەکانیان دەچەقیو نەیاندەتوانی نە بەرەو پێش بڕۆن، نە بەرەو پاش بگەڕێنەوە، ئیدی بۆسەچییەکان گەمارۆیان دەدانو تیربارانیان دەکردنو لەناویان دەبردن. ئەم حاڵەتەیان هەر لە بۆمباڕێژکردنو مینڕێژکردنی شەڕی نوێی ئەم سەردەمە دەچوو.

سێیەم: لە پشووی وەستانی شەڕی ڕۆژانەدا، دەچوونە ناو سەربازگەکانیانو ئەو ڕێگاو جێگایانەیان، کە شکیان بردایە، دوژمن شەبەیخوونی لێوە دەکا، بەم پەیکوڵە دایاندەپۆشی. سەربازانی ئەییوبیی لەم پیشەیەدا قاڵ بوو بوونو ئەزموونی زۆریشیان تێدا بەسەربردبوو.[1071] لەم ئیشەدا زۆریان بەلاوە زەروور بوو نووکەکانی پەیکوڵەکە بە بڕبەند تیژ بکەنو بە زەهر زاخاوی بدەن، چونکە ئەم پەیکوڵە، وەك الطرسوسي دەڵێ: زەهراو درابا مەرگی دەخستەوە.[1072]

**پێنجەم: عارەبانە:**

شتێکی دیکە هەیە، شایانی باسکردنە، لەشەڕدا بەکاردەهێنرا، وەلێ تەنیا لە لای خاچدروشمان دەبینراو هەر ئەوان بەکاریان دەخست، ئەوەش، عەرەبانەیە. هەرچەندە ئەم ئامێرە زۆر کۆنەو نەتەوەگەلی پێش ئیسلامیش، بە نموونە وەك میسریو ئاشووریو فارسو ڕۆمو نەتەوەگەلی دیکەش بەکاریان دەهێنا، بەڵام لە مێژووی شەڕەکانی ئیسلامو لەلای ئەییوبییەکانیش نەبووەو بەکارنەهێنراوە. ئەمەش پشکنینو لێکۆڵینەوەی گەرەکە. ئەمە لە لایەك، لەلایەکی دیکەوە، عەرەبانە، هەرچەندە لەشەڕدا بەکارنەهێنراوە، بەڵام خاچدروشمەکان، لە بوارێکی کەمدا، بۆ مەبەستی دیکە بەکاریان دەهێنا. (إبن شداد) دەڵێ: خاچدروشمان سەربازە کوژراوەکانی خۆیان لە مەیدانی جەنگەوە بە عەرەبانە دەگواستەوە.[1073] هەروەها دەڵێ: خاچدروشمان هەرسێ تاوەرە مەزنەکەیان. کە دەتگوت چیایە. بە عەرەبانە گواستەوە بۆ گەمارۆدانەکەی شاری (عکا) . بێ گومان ئەو عەرەبانەیەی، کە ئەم تاوەرانەی گواستەوە، تا بڵێی عەرەبانەی مەزنو گەورە بووە. ئەم مێژوونووسە دەڵێ: هەر تاوەرەی "زیاتر لە پێنج سەد سەربازی دەگرتو لە سەربانەکەشیەوە جێگای مەنجەنیقێکی گەورە دەبووەوە، ئەوەش ترسێکی ئەوتۆی خستە دڵی مسوڵمانانەوە، کە لە باسکردن نایەتو جەنگاوەرانی بەجارێ زارەترەك کرد".[1074] کاتێکیش، خاچدروشمان بەرەو جەنگ دەچوون، ئاڵای خۆیان بەسەر عەرەبانەوە هەڵدەدا "لەسەر عەرەبانەکەیان دەچەقاندو، عەرەبانەی تایبەتیش هێستر ڕایدەکێشاو، جەنگاوەرانیش بە دەوروپشتیدا پاسەوانیان لێ دەکرد".[1075]

---

1070 ـ الخوارزمي، مفيد العلوم ومبيد العلوم، ص٣١٨. عبدالرؤوف عون، الفن الحربي، ص١٩٧.

1071 ـ احسان هندي، الحياة العسكرية، ص١٦٩. نعمان ثابت، الجندية، ص١٥٦.

1072 ـ التبصرة، ٧٨/أ.

1073 ـ النوادر، ١١٣. الروضتين، ١٤٦/٢.

1074 ـ النوادر، ١٢٠، الروضتين، ١٥٣/٢.

1075 ـ النوادر، ٤٩. الروضتين، ١٧٩/٢.

## کەرتی پێنجەم

## هێزی دەریایی ئەییوبیان

**دەسپێك:**

**١ـ چاکسازییەکانی سەلاحەددین لە بواری هێزی دەریاییدا.**

**٢ـ مەڵبەندەکانی کەشتیسازی لە میسر.**

**٣ـ جۆرەکانی کەشتیو کەمیی هێزی دەریای دەوڵەتی ئەییوبی.**

**أـ ئەسپەڵگر. ب. قەلەڕەش (شێنی). ج. البطسة (البطشة). د. حەڕڕافە. ه. (المسطح). وـ بارهەڵگر.**

**زـ بەرکۆش. ح. شەلەندی. گ. ئەعزازی. ی. عەشیری.**

**٤ـ ئامرازەکانی کەشتیگەل و چەکی بەرڤانی.**

**أـ کەمەند (الکلالیب). ب. گورز. ج. سەنگەری تەختە. دـ بڕە.**

**٥ـ بزاڤو کەشتیگەلی سوپای ئەییوبیانو، قۆناغەکانی:**

**أـ قۆناغی دەسپێك.**

**ب. قۆناغی بەهێزبوونی کەشتیگەلی ئەییوبیان لە میسر.**

**ج. قۆناغی دوای شەڕی (حطین) تا مۆرکردنی تەبایی نامەکەی (الرملة).**

دەسپێك:

**١ـ چاكسازییەكانی سەلاحەددین لە بواری هێزی دەریاییدا**

بۆ ئەوەی نمایشێكی بێ كەلێن و پڕ بە پێستی سوپای ئەییوبیان بدەینە بەر زەین و وەبەرچاو بخەین، بە زەرووری دەزانین، باسی هێزی دەریایی ئەییوبییەكان بكەین، چونكە ئەم هێزە بە كۆڵەكەو پشتەی ڕاگرتنی ئەو سوپایە لە قەڵەم دەدرێ. ئەم هێزە دەرياييەی سەلاحەددین، لە سەردەمی فاتمییەكانیشدا هەبووەو، لەوانەوە ماوەتەوە، بەڵام سەلاحەددین، لەسەری ڕۆیشتو بەرەو چاكتری گۆڕی.. كەناراوەكانی میسرو شام، كە پێشتر لە ژێر ڕكێفی فاتمییەكاندا بووە، بەم هێزە پارێزراوەو ئەم كەشتیگەلە، لە كەناراوو بەندەرەكاندا بەرەڤانییان كردووە[1076]. كاتێكیش دەوڵەتەكەی سەلاحەددین، ئەم بەرەڤانییەی كەوتە ئەستۆ، هێزی دەریایی میسر تا بڵێی كز بوو بوو و پاش كەوتبوو، نەخاسمە لە كەناراوەكانی شام، چونكە لەوێ خاچدروشمان دەستیان بەسەر (عەسقەلانو، صورو عكا)دا گرتبوو. لەدوا دوای، ڕۆژانی فاتمییەكانیشدا، ژمارەی ئەم كەشتیگەلە گەیشتبووە تەنیا "هەشتا (شێنی)و دە پانە كەشتیو دە باربەر"[1077]. ئەم هێزە حاڵی زۆر شڕبوو بوو. ئەوەبوو، كە پێشتریش خاچدروشمان بۆ چوارەم جار، لەژێر فەرماندەی (أموری)ی شایاندا، لە سەردەمی شاوری وەزیردا، بەرەو میسر هێرشیان برد، (شاور) فەرمانیدا، ئاور لە حەوزی كەشتییەكان بەردەن. بەو جۆرە هەمووی سووتاو (عەبدەكان)یش بەدەم تالانەوە ئەوانەشیان ڕاماڵیو بردیان.[1078] ئەم قسەیەی (المقریزي)، گەر بێتو ڕاست بێ، ئەوە مانای وایە، كە سەلاحەددین بۆ بنیادنانەوەی كەشتیگەلی ئەییوبی لە میسر لە سفرەوە دەستی پێ كردووە.[1079] بەو جۆرە سەلاحەددین بۆ زیندووكردنەوەی كەشتیگەلی میسر، كۆمەڵێ كاری چاكسازیی بە ئەنجام گەیاند، ئەمانەن:

یەكەم: لێڕەوارو جەنگەڵستانی میسری كرد بە موڵكی دەوڵەت، بە تایبەتیش دارستانەكانی ناوچەی (بهنسا، سفط، ئەشمۆنین، ئەسیوط، ئەخمیمو قوص). بە قسەی (المقریزي) تەنیا دارێ بە سەد دینار دەفرۆشرا.[1080] بە فەرمانی میری، كەس بۆی نەبوو دەست لەم دارانە بدا. ئەم قەدەغەكردنەش، تا دوا دوای، دەوڵەتی ئەییوبی لە میسر، درێژەی كێشا، هەرچەندیشە، كەشتیگەلیش پشت گوێ خرا، بەم بۆنەیەوە (عثمان بن إبراهیم النابلسي) كە لە میسر، لە سەردەمی دەوڵەتی ئەییوبیدا ژیاوە، دەڵێ: "دەوەنو دارستان، وەك كانزاكان، لە خەڵك قەدەغەن، چونكە سەر بە (بیت المال)ی موسڵمانانەو هی هیچ كەسێ نییە".[1081] ئەم یاسایە، هەموو ئەو شمەكە زەروورانەشی گرتەوە، كە دەوڵەت لە دەرەوەی دەیهێنان، بە تایبەتیش ئاسنو تەختە، كە بۆ سەنعەتی كەشتی پێویستن، دەوڵەتی ئەییوبی پێوەندیو پەیماننامەگەلی لەگەڵ دەوڵەتگەلی شارەكانی ئیتالیادا هەبوو، بە پێی ئەو پەیماننامانە پێداویستی ئاسنو داری لەو دەوڵەتانەوە دەهێنا.[1082] بەڵی یاسای دارستان، ئاسنو دارو تەختەشی گرتەوە، ئەوەتا، ئەو مێژوونووسە نابلسییە، كە لە میسر ژیاوە دەڵێ: هەر تەختەو دارو ئاسنو قوڕقشمێ، لە ڕێگای دەریاوە بگاتە وڵاتی میسر، ئەوە دیوان بە قازانجێكی كەم

---

[1076] ـ ابن القلانسي، ذيل تأريخ دمشق، ص١٧٩ـ ١٨٠. صبح الأعشى، ٥١٩/٣. د.عبدالعزيز سالم، تأريخ البحرية الاسلامية ط/ جامعة بيروت العربية، ١٩٧٢، ص١٤١.

[1077] ـ الخطط (ط/بولاق) ١٩٣/٢. أسماعيل سرهنك، حقائق الاخبار عن دول البحار، المطبعة الاميرية ببولاق، مصر ١٣١٤هـ، ج٢، ص٢٦. د. محمد حسنين ربيع، النظم المالية، ص١٦٠. (القلقشندي)ش دەڵێ: شێنییەكان لە حەفتاو پێنج شێنی زیاتر بوون). صبح الأعشى ٥١٩/٣.

[1078] ـ الخطط، ن، ص، سرهنك، ن،م ، ص.

[1079] ـ محمد یاسین الحموي، تأریخ الأسطول العربي، مطبعة الترقي، دمشق ١٩٤٥، ص١٣٦.

[1080] ـ الخطط، ١٩٣/٢.

[1081] ـ لمع القوانین المضیة في دواوین الدیار المصریة، ص٤٨. Claude Cahen, Les Changements technoques,P,118.

[1082] ـ Heyd Histoire de Commerce Vol. 1, PP. 396-397. د.الباز العریني، الشرق الأدنی في العصور الوسطی، ص١٧٥.

دەیکڕێو بۆ دروستکردنی کەشتیو بارهەڵگرو بینایەو کۆگای چەك بەکاریان دەهێنێ.[1083]

لە ئەسکەندەرییە دیوانێك هەبوو پێی دەگوترا "بازرگانخانە"ی سوڵتانی، ئیشو کاری تەنیا ئەوەبوو، شمەکی ئاوەردەی پێویست بۆ کاروباری سەربازیو سوپای دەوڵەت بکڕێ، بەتایبەتیش ئەو شمەکانەیان دەکڕی بۆ دروستکردنی کەشتی لە بارێ. سەرپەرشتانی ئەم بازرگانخانەیە، بەو پێنجیەکەی بە سەر بازرگانەکاندا سەپێنرابوو، ئەم شمەکانەیان دەکڕی.[1084]

سەلاحەددین، جگە لەوەی سوودی لەو بازرگانییە، بۆ بنیادنانی کەشتیگەلەکەی وەردەگرت، لەلایەکی دیکەوە، سوودێکی زۆریشی لە داری سنەوبەرو لێڕەوارەکانی ئرزی چیاکانی لوبنانیش وەردەگرت، هەروەها لە کانزای ئاسنیش، کە لە چیاکانی نزیك شاری بەیروت دەردەهێنرا.[1085] ئەگەر ئەم قسانە ڕاست بن، ئەوە مانای ئەوەیە، کە پاش ساڵی (٥٨٣ك/ ١١٨٧ز) واتا دوای ئەوەی، کە ئەم ناوچانە کەوتونەتەوە دەست سەلاحەددینی ئەیووبی، ئنجا ڕوویانداوە، واتا ئەو ناوچانە بە دەست خاچدروشمانەوە نەمابوون.

دووەم: سەلاحەددین، دیوانێکی تایبەتی تەنیا بۆ کاروباری کەشتیگەل سازدابوو، پێی دەگوترا "دیوانی کەشتیگەل" بۆ ئەرکو مەسرەفی ئەم دیوانەش، هەموو خەراجی (الفیومو دەوروبەری الفیوم)و خەراجی زەویو زاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواشی تەرخان کردبوو. ئەوانەی ڕۆژهەڵات (بهتین، الأمیریة، والمنیا)ی دەگرتەوە، ئەوانەی ڕۆژئاواش ناوچەکانی (سفط، نهیا، وسیم)و باخ و باخاتی دەرەوەی شاری قاهیرەی دەگرتەوە. جگە لەوانە، داهاتی (النطرون)یشی خستە سەر، کە ساڵانە هەشت هەزار دیناربوو. هەموو ساڵێکیش زیاتر لە پەنجا هەزار دینار زەکاتی وڵاتی میسرو کرێی هەموو کەشتیو بەلەمەکانی دیوانیشی بۆ تەرخان کرد.[1086]

سەلاحەددین، پلەی بژێویو گوزەرانی سەربازانی دەریاو کارمەندانی کەشتیسازیی بەرەو بەرزتر برد، تا بارودۆخی ژیانیان باشتر ببێو، لاوانیش زیاتر بچنە ڕیزی هێزی دەریاییو لە کەشتیگەلی میسردا ببن بە کارمەندو بە سەرباز، بڕیاریشیدا، کە دیناری کەشتیگەل لە (٢/١و ٨/١) ەوە، زیاد بکرێ بۆ (٢/١و ٤/١)، واتا بە ڕێژەی (١٧,٥) لە بەهای دیناری پێشتر، زیادیکرد.[1087]

چوارەم: سەلاحەددین، فەرماندەگەلی گەورەو گرنگی لەسەر کەشتیگەلەکەی دانا، هەرچەندە سەرچاوەو ژێدەران، لەناوی فەرماندەی ناوداری بە نموونە وەك (حسام الدین لؤلؤ). کە لە شەڕەکەی دژ بە (أرناط) ناوبانگی دەرکرد.و لەناوی فەرماندەگەلی بە نموونە وەك (یعقوب الحلبیو، جمال الدین محمد بن أرککز، بدران الفارسي و، محمد بن اسحاقو عبدالسلام المغربی) و چەند کەسانێکی تر، بەو لاوە، ناوی کەسی دیکە ناهێنن، کە لە ساڵەکانی بەرایی دەوڵەتی ئەییوبیدا، لە بەڕێوەبردنی کاروباری گەشتیگەلو دەریاوانیی ئەم دەوڵەتەدا ڕۆڵیان هەبووبێ، بەڵام لە ساڵەکانی دواییدا، (الملك العادل)ی برای، کرد بە بەرپرسی گشتیی دەزگای کەشتیگەلو دەریاوانیی، ئەمەش، ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە سەلاحەددین بایەخێکی تەواوی بە دیوانی کەشتیگەلەکەی داوە، کاتێکیش (الملك العادل) ئەم پۆستەی وەرگرت، (صفي الدین عبدالله بن علی بن شکر)[1088]ی بە جێگری خۆی دانا، کە سەرپەرشتی هەڵسوڕاندنی کەشتیگەلەکە بکات. سەلاحەددین، دەسەلاتی زۆریشیدا بە بەرپرسی کەشتیگەلەکەو، تا بتوانێ ئەرکو فرمانی هێزی دەریایی، ڕایی بکات. سەلاحەددین، کە لە ساڵی (٥٧٢ك/ ١١٧٦ز)دا کەشتیگەلەکەی بە تەواوەتی تەیارو ئامادەکرد، ئەوجا، بۆ شارەکانی دیکەی نووسیو گوتی: "فەرمان، فەرمانی بەرپرسی کەشتیگەلەو، دەتوانێ زەلامو سەربازانی خۆی، هەرشتێکیشی پێویست بێ، لەگەڵ خۆی بیانباتو، فەرمانیشی پێ دا، کە دەریا بەجێ نەهێڵێو هەمیشە

---

1083 ـ لمع القوانین المضیة، ص٤٥.

1084 ـ ابن مماتي، قوانین الدواوین، ص٣٢٧.

1085 ـ المقدسي، أحسن التقاسیم، ١٨٤. ابن شداد ، الأعلاق الخطیرة، ج٢، ق٢، ص١٠١.

1086 ـ المقریزي، الخطط، ١٩٣/٢. السلوك، ٧٣/١ .

1087 الخطط، ١٩٤/٢. السلوك، ٤٥/١.

1088 ـ الخطط (طبعة المعهد) ج٣، ق٢، ص٢١١.

ئاگادار بێ". [1089]

پێنجەم: سەلاحەددین بایەخی دا بە قایمکردنی زارك و دەرك (ثغور)و بەندەرەکانی میسرو، ئەم لایەنەشی بەگرنگ داناو هەر کاتە ناکاتێکیش تاوەرو قولەکانی چاك دەکردنەوەو دەستی پێیاندا دەهێناو کەندەك و خەندەقی بە دەوریاندا لێ دەدا، بۆ ئەم مەبەستانەش پارەی زۆری تەرخان کردو، کارمەندی لێوەشاوەی بە نموونە وەك (بەهائەددین قراقوش)ی لە سەر دامەزراندو، تازەکردنەوەو بنیادنانی گەلێ دامودەزگای سوپاو سەربازیی وەئەستۆی ناو[1090]، جار جارەش، سەلاحەددین خۆی سەری لەو ئیش و کاری تازەکردنەوەو چاککردنەوەو بنیادنان و قایمکارییانە دەداو، سەرپەرشتی دەکردن، بە تایبەتیش لە ئەسکەندەرییەو تەنیس و (دمیاط)و بەندەرەکانی گوێی دەریای ناوەڕاست. کاتێکیش لە یەکەم سەردانی وڵاتی شام گەڕایەوە، لە (شعبانی ٥٧٢ك/ ١١٧٦ز) دا، هەردوو کوڕەکەی (الملك الأفضل علي و، الملك العزيز عثمان)و (العماد الكاتب)یشی لەگەڵ خۆیدا بردو "ڕێگای دمیاطی گرتەبەرو، لەوێ، لەو زارکە چاوی بە ئامادەبووان کەوت و سەریشی لە کۆمەککارو یەدەگانی ئیش و کارەکان دا". [1091] سەلاحەددین، لە ساڵی ٥٧٧ك/ ١١٨١ز)دا، کاروباری جەنگ و جەنگاوەرانی بۆ سەر هەردوو تاوەرەکەی ڕووکاری دەریای شاری (دمیاط) ڕێك خست و، فەرمانیشی دا کەشتییەکان بە زنجیرەکانەوە ببەسترێن، تا جەنگاوەران بتوانن بەرەڤانی لێبکەن و بەر لە دوژمن بگرن و دوژمن نەتوانێ لە نێوان ئەو دوو تاوەرەوە دزە بکات. لە هەمان ئەو ساڵەدا، فەرمانیشی دا شوورەی شاری (دمیاط) چاك بکرێتەوەو کون و درزو کەلەبەرەکانیشی بگرن. [1092] پاش بەینێکیش، ئنجا سەلاحەددین فەرمانیدا بە هەڵکەندنی کەندەکی لای شاری (دمیاط)و پێلێکیش (پردێکیش) بەلای زنجیری تاوەرەکەدا دروست بکرێ. [1093] ئەوجا شاری دمیاطی بەجێ هێشت و ڕووی کردە بەندەری ئەسکەندەرییە. (العماد)ی مێژوونووس کە لە خزمەتیدا بووە، دەڵێ: "دیتمان، هەموو کەلێن و کەلەبەرەکانی شوورەی دەوری شارەکە، بە فەرمانی پێشتری سەلاحەددین چاك و تازە کرابوونەوەو شوێنەواری مایەی فەخری شارەکەش، بەجوانی مابوون و، سەلاحەددین فەرمانیشیدا زارك و دەرکەکان بە یەکجارەکی تەواو بکرێ و کەشتیگەلەکەش چاك بکرێنەوە، ئنجا شارەکەی بەجێ هێشت". [1094]

ئەم چوونە بۆ ئەسکەندەرییە، ئەوە، سەرلێدانی دووەمی بوو. سەردانی یەکەمیشی ئەوەبوو، کە لە ساڵی (٥٦٦ك/ ١١٧٠ز) دا، بۆ دەست پێ کردنی چاککردنەوەو تازەکردنەوەی شوورەکەی سەری لێ دابوو، واتا لە ماوەی خەلافەتەکەی (العاضد) دابوو، کە ئەو کات سەلاحەددین وەزیری ئەو خەلیفەیە بوو. (العماد الكاتب) دەڵێ: سەلاحەددین، لە شەعبانی ئەو ساڵەدا بوو، کە سەری لەم شارەدا، "بۆ ئەوەی چاوی بە شارەکە بکەوێ و کاروباری ڕێك بخا، ئەوەش یەکەم جار بوو، ئەم شارە ببینێ، لەم سەردانەیدا، خێروبێرێکی زۆری بە خەڵکەکەی گەیاندو فەرمانیشی دا قووللەو تاوەرو شوورەی شارەکە چاك بکرێنەوە". [1095] سەلاحەددین، لە ساڵی (٥٧٧ك/ ١١٨١ز) دا بۆ دڵنیایی لە تازەبوونەوەی شوورەو بنیادنان و چاککردنەوەی شتەکانی دی، بۆ سێیەم جارو (دوایین جار) سەری لەم شارەداو، فەرمانی دا ئەوەی تەواو نەکراوە، تەواو بکرێ. [1096]

سەلاحەددین لەو سەردانەیدا، فەرمانی دا بە (فخرالدين قراجا) ئەو چوارسەد کۆڵەکەو دینگە ڕۆمانییەی دەوری

---

1089 الروضتين، ج١ ق٢، ص٦٩٠.

1090 وفيات الاعيان ٩١/٤.

1091 العماد، سنا البرق الشامي، ٢٤١/١. الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٨٩.

1092 الخطط (طبعة المعهد الفرنسي) ج٥، ص٤٣.

1093 ـ السلوك، ١١١/١.

1094 الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٨٩.

1095 سنا البرق الشامي، ١٠٩/١. الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٨٦.

1096 الروضتين، ٢٤/٢.

سارییەکان، هەمووی بشکێنێ‌و لەسەر کەناری دەریاکە ڕیزیان بکا، تا ڕێگا لە کەشتییەکانی دوژمن بگرێ، کە نەگەنە کەشتیگاکان‌و، قورسایی شەپۆلەکانی دەریاش لەسەر شوورەکەی ئەسکەندەرییە سووك بکەن‌و تەکانی ئاوو شەپۆل نەیانڕووخێنێ.[1097] پاشانیش لە ساڵی (٥٨٨ك/ ١١٩٢ز) دا، لە زارکی تەنیس، کە دەکەوێتە نێوان (الفرما)و (دمیاط)ەوە،[1098] فەرمانی دا "شاری تەنیس چۆڵ بکرێ‌و خەڵکەکەی بگوزارێنەوە بۆ (دمیاط)و ئافرەت‌و منداڵی تێدا نەهێشت‌و جەنگاوەرانیشی لە شارەکە دوورخستەوە، کەسی تێدا نەما".[1099] وادیارە، ئەم ئیشەی سەلاحەددین لەم شارەدا کردی، لەبەرئەوە بوو، کە ئەم زارکە توانای هیچ بەرەڤانییەکی نەبوو، لەم بەشە کەنارەی میسردا بیکات‌و، لەم کاتەدا کەشتیگەلی ئەییوبیان بەرامبەر بە کەشتیگەلی خاچدروشمان، گەلێ بێ هێزبوو، نەخاسمە دوای گەیشتنی ئۆردوگای هەڵمەتی سێیەم‌و لێدانی یەك لە دوای یەکی سوپای ئەییوبی. هەر لەبەرئەوەش بوو، کە سەلاحەددین کەوتە کرداری بەرگری‌و ڕووخاندنی قەڵاو زارکەکان، تا دەست دوژمن نەکەون‌و دوژمن سوودیان لێ نەبینێ‌و، هەروەها نەیکات بە مۆڵگەی هێزو، هێرشیان، لێوە بۆ سەر جێگا گرنگەکانی بە نموونە وەك میسر و (بیت المقدس) بەرپا نەکا. ئەم سیاسەتەش هەر ئەو سیاسەتە بوو، کە لە (دمیاط)یش ڕووی دایەوە. کە ئەوەبوو باسمان کرد. هەمان ساڵ فەرمانی دا کەندەك بە دەوری شاری (دمیاط)دا لێ بدرێ‌و پردێکیش لەلای زنجیری تاوەرەکەوە دروست بکرێ.[1100] لە باشووری فەلەستینیش. ئەوەبوو کە باسمان کرد. فەرمانیدا هەندێ شارو قەڵاو قایمکاران تێکومەکان بدرێن.

شەشەم: سەلاحەددین، دنەی خەڵکەکەی دەدا بچنە ڕیزی هێزەکانی دەریاو، لەدەرەوەی میسریشەوە کادێرگەلی قاڵ‌و لێزان‌و شارەزای بۆ هاورد. بەهۆی سیاسەتی دەمشیرین کردنیشەوە، کە دەزگای دیوانی هێزی دەریایی پێڕۆی دەکردو بەهاندانی ئیسلام‌و غەزاوە گەلێ کەس ڕوویان تێ کرد، تا گەیشتە ئەوە "بە سەربازو کارمەندانی کەشتیگەلیان دەوت غەزاچییەکانی ڕێگای خواو، خەڵك دەچوونە لایان داوای دوعای خێریان لێ دەکردن".[1101] سەلاحەددین خۆیشی بوو بوو بە ڕابەرێکی خەبات‌و غەزا. (ابن شداد)ی مێژوونووسی سەلاحەددین. کە بەلای زۆری دەریایی بەسەرهاتووە. دەڵێ: کە سەلاحەددین ڕۆژێکیان لە دوای گفتوگۆی نێوان هەردووکیان پێی گوتووە: "نیازم وایە، کە خوا سەری خستم‌و باقیمەنی ئەم کەناراوانەم ئازاد کرد، وڵاتەکە دابەش بکەم‌و، وەسییەت بکەم، ئەوجا ماڵاوایی لێ بکەم‌و ئەم دەریایە بدەمە بەرو ڕوو لە دورگەکانیان بکەم‌و دویانکەوم، تا تۆوی کافر لە سەر ئەم زەمینە دەبڕمەوە، یان دەمرم".[1102] ڕاستیشت دەوێ، مەغرییبەکان، لە هەمووکەسێ پتر، بەدەم سەلاحەددینەوە چوون‌و خۆیان لە هێزی دەریاوانیدا ناونووس کردو، سەلاحەددینیش لە دامەزراندن‌و ئەرکو فرمانی کەشتیگەلەکەی میسردا، هەر پشتی بەوان بەستبوو، تا گەیشتە ئەوەی وەك (المقریزي) دەڵێ: ئەو مەغرییبیانە هەر خۆیان بەرپرس بوون‌و لەبەر شارەزایی‌و لێزانینی کاروباری دەریا، هەمووی هەر بە دەست خۆیانەوە بوو.[1103] ئاشکراشە، کە سەرکارخستنی مەغرییبیان لە سوپای میسردا کارێکی تازە نەبوو، ئەوەبوو باسمان کرد، کە مەغرییبییەکان لە دوامەزراندنی سوپای فاتمییەکاندا هاوپشك‌و بەشداربوون‌و، یەکەم کەس بوون کە فاتمیەکان پشتیان پێ دەبەستن. بەهەرحاڵ، کەشتیگەلی ئەییوبی، هێشتا هەر پێداویستی زۆری بەکارمەندی هونەرمەندو شارەزا هەبوو و دەریاوانیان کەم بوو، بە پێچەوانەی خاچدروشمان. کە دواتر باسیان دەکەین..

---

1097 عبداللطیف البغدادي، كتاب "الأفادة والاعتبار" ط/ لندن ١٩٦٥، ص١٣٠.

1098 معجم البلدان، ٥١/٢.

1099 السلوك، ١١١/١.

1100 ـ السلوك، ١١١/١.

1101 الخطط، ١٩٤/٢.

1102 النوادر، ٢٢. الروضتین ٢٢٢/٢.

1103 الخطط، ١٨٩/٢. ابن جبیر، ص٣٥. سید علی الحریری، كتاب الأخبار السنیة في الحروب الصلیبیة، ص١٣٥.

## ٢ـ مەڵبەندەکانی کەشتیسازی لە میسر:

سەرچاوەو ژێدەران بەڕوونی باسی ناکەن، مەڵبەندی دروستکردنی کەشتی لە میسری ئەییوبیدا چۆن بووەو لە کوێ بووە، تەنیا ئەوە نەبێ، کە لە شاری میسر هەبوو، پێیاندەگوت (خانەی کەشتیسازیی الفسطاط) ئەم کارگەیە، لە ساڵی (٣٢٤ك/ ٩٣٥ز)ەوە لە حوکمی (محمد بن طفج الأخشيد)ەوە مۆڵگەی دروستکردنی کەشتی بووە. ئەم کارگەیە هەر مایەوەو لەسەردەمی فاتمییان‌و ئەییوبییان‌و مەمالیکیشدا کەشتی لێ دروست دەکرا. (المقريزي) دەڵێ: سوڵتانی ئەییوبی، فەرمانی دا لەم کارگەیەدا، پارچەکانی کەشتی‌و بەلەم دروست بکرێ، ئیدی ئەم پارچانە، بە پشتی حوشتر لە قاهیرەوە بە پاسەوانیی لەشکرێکی گەورە دەبران بۆ کەنداوی (العقبة) بۆ لێدانی قەڵای (ايلة)کە خاچدروشمانی تێدابوون. سەڵاحەددین، لەسەردەمی وەزارەتەکەی خۆیدا، ساڵی (٥٦٦ك/ ١١٧٠ز)دا، پەلاماری ئەم قەڵایەی دا، کە پارچەگەلی کەشتییەکانیشی گەیشتنەجێ، ئەوجا لێکیان بەستن‌و دایانبەزاندنە سەر دەریاکەو پڕیان کردن لە جەنگاوەرو چەک‌و ڕوویانکردە (ايلة) و خاچدروشمانیان بەزاندو ئەو شارەیان پێ چۆڵ کردن‌و دەریان کردن.[1104]

ئەم خانەی کەشتیسازییە، بەردەوام کەشتیی بۆ سوپای سەڵاحەددین دروست دەکرد، لەوێشەوە، ئەم هەموو کەشتیگەلە دەنێردران، تا بەرەڤانی لە دەریای سوورو دەریای ناوەڕاست بکەن‌و ڕێگا لە کەشتیگەلی خاچدروشمان بگرن‌و پێگەکانیان لە کەناراوەکاندا کاول بکەن. هەرلەوێشەوە لەشکر نێردرایە سەر وڵاتی یەمەن‌و ئەم کەشتییانە ئامێری جەنگییان لێ باردەکردو پڕیشیان دەکردن لە سەرباز، پاشان بە ڕووباری (نيل)دا دەبران بۆ زارك‌و بەندەرەکانی (ئەسکەندەرییە، دمياط و تنيس) کە لەو جێگایانەوە بەرەڤانی بکەن‌و کەناراوەکانی میسر بپارێزن.[1105]

مەڵبەندی دیکەش بۆ دروستکردنی کەشتی هەبووە، ئەمەیان، تەنها (المقريزي) باسی لێوە دەکا، دەڵێ: لە کەناری ڕووباری نیل، لە قاهیرە (المعز لدين الله)ی فاتمی، مۆڵگەی کەشتیسازیی لە (المقس) بنیادنا، ئەم مۆڵگەیە لەساڵی (٣٨٦ك/ ٩٩٦ز) ئاوری تێدا کەوتەوەو بە کەشتیگەل‌و باروبارخانەو چەکەوە یەك پارچە سووتا، تەنیا شەش بەلەمی بەتاڵی لێ مایەوە، ئیدی ئەم کارگەیە پشتگوێ خراو کەس نە لە سەردەمی فاتمیی‌و، نە لە سەردەمی ئەییوبیشدا بە لایدا نەچوون.[1106]

مەڵبەندێکی دیکەی پیشەسازیی کەشتی هەبوو، پێیاندەگوت خانەی کەشتیسازیی جەزیرە، واتا جەزیرەی میسر، کە ئەمڕۆ بە (الروضة) ناسراوە، ئەم خانەیە، یەکەم خانەی کەشتیسازییە، کە لە سەردەمی ئیسلامدا، لە میسر لە ساڵی (٥٤ك/ ٦٧٤ز)دا دامەزرا. میر (أحمد بن طولون) ئەم خانەیەی تازە کردەوەو، لە سەردەمی فاتمییەکاندا بە ناوی باخەکەی (الوزير الأفضل شاهنشاه)ی کوڕی (بدر الجمالي)ی میری لەشکرەوە، ناونرا (خانەی کەشتیسازیی الروضة). (الوزير الأفضل) ئەو باخی (الروضة)یەی لە ساڵی (٤٩٠ك/ ١٠٩٦ز)دا، لە باکووری جەزیرەی میسر ئاوەدان کردبووەوە، لەم خانەیەدا، بە تایبەتی دوو جۆرە کەشتی دروست دەکران، بە یەکێکیان دەگوترا (الحراقة)و بەوی دی (الشلندي) یان دەگوت.[1107] بەڵام ئەم کارگەیە، لەسەردەمی ئەییوبییەکاندا ئەو بایەخەی جارانی نەما، چونکە سەردەمی ئەییوبیان کەشتیسازی هەمووی لە (الفسطاط)ی شاری میسر خڕبووەوە. ڕاستیشت دەوێ کەشتیسازی لە وڵاتی میسر لە شاری قاهیرەو شاری میسردا گردبوو بووەوە، چونکە بە ئاسانی‌و بە ڕێگای ئاوی نیلدا لە ناوەوەی میسرەوە، کەشتی دەگوازرایەوە بۆ کەنار دەریاکان، لەبەرئەوە لە میسر پێویستی نەدەکرد، وەك وڵاتی شام و ئەفریقیای باکوورو

---

[1104] الخطط (طبعة بولاق) ١/١٨٥.

[1105] الخطط، ٢/١٨٩.

[1106] ـ (د. أحمد مختار العبادي) دەڵێ: "المقس" زارکێکی گرنگی شاری قاهیرە بوو، هەروەك خۆی مایەوەو خانەی کەشتیسازیەکەشی، تا سەرەتای سەردەمی ئەییوبییەکانیش بەردەوام بوو، بەڵام پاشان ئاوی نیل لە کەناراوی (المقس) بەلای ڕۆژئاوادا لای داو لە شوورەکەی قاهیرەش دوورکەوتەوەو ناوچەکە پڕ بوو لە لم، بنۆڕە: تأريخ البحرية الاسلامية في مصر والشام، ص٢٢٢.

[1107] ـ الخطط، ٢/١٩٦. السلوك، ١/٣٠١. الحاشية رقم/١.

ئەندەلوس، كارگەگەلی كەشتی لە كەنار دەریاكان دابمەزرێنن.

**٣- جۆرەكانی كەشتیو بەلەمی هێزی دەریای دەوڵەتی ئەییوبی:**

هێزی دەریای دەوڵەتی ئەییوبی، لەسەردەمی سەلاحەددیندا، چەندین جۆر كەشتی و بەلەمی بەكارهێنا. هەر هەمووشیان لەقەوارەو شێوەو ناوو مەبەستی بەكارهێنانیاندا، لە یەكتری نەدەچوونو لێك جیاوازبوون. ڕاستیشت دەوێ، (إبن مماتي) كە لە سەردەمی سەلاحەددیندا، كارمەندێك بووە لە كارمەندانی دیوانی میسری ئەییوبی، ئەو دیارترینی كەسانێ بووە، باسی كەشتیو كەشتیگەلی ئەم سەردەمەی كردبێ، لێ زۆر بە كورتی باسی كردووە، دیاریشە، كە ئەو كابرایە مەبەستی لە نووسینەكانی شتێكی ترەو مەبەستی نەبووە، باسی كەشتیو مەشتی بكات. ئەو كەشتییانەش كە بە ڕاستەقینە لە ڕۆژانی سەلاحەددیندا بە كارهاتووە[1108]، ئەمانەن:

**أ. ئەسپەڵگر: (الطريدة):**

ئەمە تایبەت بوو بە ئەسپ هەڵگرتن، مانای ئەوەیە، كە كەشتییەكی هەند گەورە بوو، دەیتوانی چل ئەسپ هەڵبگرێ[1109]، جۆرە بەلەمێكی ڕاونەر (الطرادة)[1110]یش هەبوو سووك و خێراو بچكۆلە، بەوێنەی باخیرەی ئەم زەمانە، كە ئەمیش هەر (طردة)ی پێ دەڵێن. خەڵكی (صقليه)و خاچدروشمانیش ئەم ئەسپەڵگرەیان بۆ هەڵگرتنو گواستنەوەی ئەسپ بەكاردەهێنا. دەڵێن كەشتیگەلێكی صقلیا لە ساڵی (٥٦٩ك. ٥٧٠ك/ ١١٧٣ز) دا، هەڵمەتی هێنایە سەر ئەسكەندەرییە، سیو شەش ئەسپەڵگریان لەگەڵدابوو، پڕبوون لە ئەسپ.[1111]

**ب. قەلەڕەش (الشيني):**

ئەمەش لە كەشتییە گەورەكانەو زۆرتر بۆ هەڵگرتنی جەنگاوەران بەكاردەهات، هەندەش گەورەبوو، نزیكەی سەدو چل سەوڵبەدەستی لەسەربوو، لەبەرئەوەش ناویان لێنا قەلەڕەش،[1112] چونكە بەنەوتی ڕەش سواغ دەدرا. ئەم كەشتییە، جگە لە جەنگاوەران تاوەرو قەڵای قایمكاریشی بە سەرەوە دادەمەزران بۆ مەبەستی بەرەڤانیو هێرشیش.[1113] جگە لەوە مەنجەنیقی نەوتهاوێژیشی بەسەرەوە بوو. ئەوەتا، لەم پێداهەڵدانەدا، هۆزانڤان (عبدالجبار أبوبكر الصقلي) كە بە (إبن حمديس) ناسراوە، بەشانو باڵی میرێ لە میرەكاندا هەڵدەڵێو باسی ئەم كەشتییەش دەكاو، بەو میرە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| كەڵەكو كەشتیو قایەغو گەمی | كردووتن بەشار بێ زیادو كەمی |
| دوژمن لە ترسی نەوت بارانی تۆ | هەڵات بەجێی هێشت ئاڵاو پەرچەمی |
| كەشتیت بە قولەو بورجو قەڵاوە | وەك دێون بەسەر هەورو هەڵاوە |
| سنووریان لە بۆ دوژمن داناوە | دەستبەجێ دەبێ بكشێنە دواوە[1114] |

كەشتیگەلی ئەییوبیان بە ئاگرهاوێژەكانیان دوور بە دوور كەشتیگەلی دوژمنیان ئاورباران دەكردو دەیانسووتان. بەنموونە وەك ئەوەی لە دوادوای ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)دا ڕووی دا، ئەوەبوو لەو ساڵەدا، كەشتیگەلی ئەییوبیان "بە (شینییە) چاكەكانیانەوە، بەكیتەڵەی نەوت شینییەكانی فەرەنگیان ئاگردا.. بەسەرنشینو بەسەربازەوە هەموویان نوقمی دەریای بێ پەی كرد.[1115]

---

[1108] د. (سعاد ماهر) لە كتێبی (البحرية في مصر الإسلامية)كەی خۆیدا دەڵێ: ژمارەی گەمیەكان ١٥٧ جۆربوون (لاپەڕە ٣٢٨– ٣٧٣).

[1109] ابن مماتي، قوانين الدواوين، ص٣٣٩.

[1110] تاج العروس، ماده (طرد) .. (الطرادة) گەمیو كەشتیی دوژمنی ڕاودەنا.

[1111] سنا البرق الشامي ١/١٧٠. الكامل، ١١/٤١٢.

[1112] ابن مماتي، قوانين الدواوين، ٣٤٠.

[1113] مفرج الكروب، ٢/١٣، هامش١. د. ماهر، البحرية في مصر الاسلامية، ٣٥٢.

[1114] ديوان ابن حمديس، تصحيح وتقديم: د. احسان عباس، دار صادر، دار بيروت، ١٩٦٠، ص٥١٣.

[1115] الفتح القسي، ٤٦٣.

ج. البطسة يان (البطشة):

ئەمە جۆرە گەمییەکی گەورەی کەشتیگەلی ئەییوبییە، ئەگەر لە هەموو کەشتییەکان گەورەتر نەبێ، بچووکتر نەبووەو نزیکەی چل پەردەبای هەبووەو (٧٠٠) جەنگاوەر تێیدا جێگای دەبووەوە.[1116] ئەم جۆرە گەمییە لە جەنگەکانی نێوان ئەییوبیان‌و خاچدروشماندا ڕۆڵێکی گەورەی هەبووەو پڕیاندەکرد لە سەربازو جەنگاوەرو خاروبارو چەك‌و باروبارخانەی جەنگ‌و گەمارۆ، بەسەر پشتی ئەم گەمییە زەلامەوە، بورج‌و تاوەری وەهایان دادەمەزران لە قەلا دەچوون‌و وەك قەلاو قایمکار وابوون.[1117] بە پێی قسەی سەرچاوەکان، جەنگاوەرانی کەشتیگەلی ئەییوبیان، (بطسة)یەکی خاچدروشمانیان وەگیرهێناو گرتیان، بەرپرسی شاری بەیروت دەستی پێداهێنایەوەو بە تەواوی چاکی کردەوەو بە فەرمانی سوڵتان سەلاحەددین لە مانگی ڕەجەبی ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)دا، ئازووقەو خاروباری لە بەیرووتەوە پێدانارد بۆ شاری (عكا) و چوارسەد تەغار گەنم‌و خۆراکی جۆر بەجۆرو مەڕو پەزی لێ بار کرد.[1118] سەرچاوەکانیش دەڵێن: خاچدروشمان، (بطسة)یەکیان هەبووە هەند گەورە بووە (١٧٠٠) زەلامی هەڵدەگرت.[1119]

د. (الحراقة):

ئەم جۆرە گەمییە، بۆ باربردن‌و جار جاریش بۆ سەفاو سەیران، لە ڕووبارەکانی بە نموونە، وەك ڕووباری نیل‌و دیجلەو شەتتولعەرەبدا بەکاردەهات. (الأمین)ی خەلیفەی عەبباسی پێنج جۆر لەم گەمییەی هەبوون لەناو ڕووباری دیجلەدا، بەشێوەی گیانلەبەرو دەعبا بۆیان دروست کردبوون بە نموونە، وەك: شێرو شاهێن‌و مارو فیل‌و ئەسپ.[1120] پاشان، بەرە بەرە ئەم (الحراقة) یە، بەرەو چاکتر گۆڕاو وەهایان لێ کرد بۆ جەنگ‌و کوشتاریش بەکاردەهات. گەمییەکی مام ناوەندە، نزیکەی سەد جەنگاوەر دەگرێ. ئەم جۆرە گەمییەش هەر لە ڕیزەکانی گەشتیگەلی جەنگدابوون،[1121] لێ وەکو کەشتییە جەنگییەکان بایەخدار نەبوو، ڕەنگیشە لەبەر ئەو بچووکییەی ئەو بایەخەی نەبووبێ، وا دیارە ئەم جۆرە کەشتییە خاچدروشمانیش بەکاریان هێناوە، چونکە دەڵێن: کاتێ کەشتیگەلی ئەییوبیان (بطسة)یەکی لە بەیروتەوە بۆ (عكا) ناردووەو کەل‌وپەل‌و ئازووقەی پێ بووە. (حراقە)و شینیگەلی خاچدروشمان ڕێگایان لێ گرتووە،[1122] وادەردەکەوێ، بۆیەکیشە (حراقە)یان پێ گوتووە، چونکە ئاورهاوێژی بەسەرەوە بوو، کەشتیگەلی دوژمنی ئاورباران دەکرد.[1123]

ه. (المسطح):

گەمییەکی گەورەیە، لە (البطسة) دەچێ.[1124] مێژوونووسان دەڵێن: "کەشتیگەلی ئەییوبی لە میسر، چەندین گەمی و کەشتیی فەرەنگیان دەستگیر کرد، (مسطح) یێکیان تێدابوو، دەڵێن پێنج سەد زەلام، بگرە زیاتریشی تێدابوو"[1125]. هەرچی (إبن مماتي)یە، ئەوە، ئەو لە باسی کەشتیگەلی ئەییوبییدا، ناوی دەبا، بەلام تەنیا هەر ئەوەندەی گوتووە، دەڵێ: "مسطح بە مەعناکەیدا دیارە چییە".[1126] ڕەنگیشە ویستبێتی بڵێ، (مسطح) لە (شلندی) دەچێ، واتا گەمییەکی دوو

---

[1116] الفتح القسي، ٤٨٦. الكامل، ١٢/٦٥.

[1117] أمين الخولى، الجندية والسلم، ص٩٢.

[1118] الفتح القسي، ٤١٧. النوادر، ١٣٥. الروضتين، ٢/١٦٠. مفرج الكروب، ٢/٣٣٠ ـ ٣٣١. شفاء القلوب، ١٦٨.

[1119] الكامل، ١١/٤٨٢. السلوك، ١/٧٧. الروضتين، ٢/٢٧.

[1120] الكامل، ٦/٢٩٤. القلقشندي، مآثر الأنافة في معالم الخلافة، ١/٢٠٥.

[1121] قوانين الدواوين، ٣٤٠.

[1122] النوادر، ١٣٥. الروضتين ٢/١٦٠ـ ١٦١.

[1123] أمين الخولي، الجندية والسلم، ص٩٢. جهادية القرةغولى، التنظيمات الأدراية والعسكرية، ص٢٦٦.

[1124] د. سعاد، البحرية في مصر الاسلامية، ص٣٦٨.

[1125] مفرج الكروب، ٢/٣٧٤.

[1126] قوانين الدواوين، ص٣٤٠.

نهۆمە، لە نهۆمی سەرەوە جەنگاوەران بۆ شەڕ دادەمەزرێن‌و لە نهۆمی خوارەوەش کەشتییەوانان سەوڵ لێ دەدەن.[1127]

**و. بارهەڵگر (الهمالة):**

ئەمەیان گەمییەکە لە گەمیەکانی کەشتیگەلی ئەیوبییەکان، دەغڵ باردەکاو[1128] دەیبا. جگە لەوە، پێداویستی دیکەی، بە نموونە وەك ئازووقەو کەلوپەل‌و خۆراکیش[1129] بۆ لەشکرو سەربازانی دەریاش دەبات. بە قسەی مێژوونووسانی دواتریش، ئەم ناوە، واتا (الحمالة) بەو گەمییانەش گوتراوە، کە شتی دیکەی بە نموونە، وەك ئەسپ‌و سەربازو شتی قورسی دیکەی باردەکرد.[1130]

**ز. بەرکوش:**

لە گەمییە بچووکەکانە، بە تایبەتی بۆ بارکردنی ئاوی خواردنەوە بەکاریان دەهێنا.[1131] وەلێ لە قسەکانی (العماد)و (إبن شداد)و مێژوونووسانی دیکەدا هاتووە، کە ئەم بەرکوشە، بۆ هەڵگرتنی سەربازان‌و هێنان‌و بردنی خەڵکیش بەکارهاتووە. ئەم دوو مێژونووسە دەڵێن: سوڵتان سەلاحەددین دالّدەی ژمارەیێکی زۆری لە فەرەنگەکان دابوو، دەخالەتی لێ قبووڵ کردبوون، چونکە برسی‌و لێقەوماوو هەژاربوون، ئەوان پێشنیازیان کرد، کە سوڵتان ڕێگەیان بدات، بچن گەمی‌و بەلەمی خاچدروشمان ڕاوبکەن‌و گوتیان: "ئێمە فێری ئەم جۆرە بەرکوشەین، بەسواری ئەم گەمییە دەتوانین دەریا تەی بکەین‌و دوژمن وەگیربێنین‌و تالانی بکەین، چیشمان دەستکەوت، بەشەریکی لەگەڵ سەربازانی ئەییوبیدا دابەشی دەکەین". سوڵتانیش قایل بوو و ڕێگای پێ دان‌و بەرکوشێکیشی خستە بەردەستیان. ئەوانیش لێی نەوەستان‌و سواری بەرکوشەکە بوون‌و دەریایان دایە بەرو ملیان لێ نا، زۆریشی نەبرد، چەند گەمییەکی بازرگانانی دوژمنیان گرت.[1132] وەك (العماد)یش دەڵێ: بەرکوش بیست‌و پێنج زەلامی دەگرت.[1133]

**ح. (الشلندي):**

ئەم شەلەندییە، گەمییەکی جەنگیی گەورە بووەو، چەك‌و جەنگاوەرانی گواستووەتەوە.[1134] شەلەندی، لە شینی‌و حەراقە کەمتر نەبووە، بەلاّم جیاوازیی لەوانی تر، ئەم سەرگیراوبووەو سەربازو جەنگاوەران لە سەربانەکەیەوە دوژمنیان تیرباران دەکردو سەوڵبەدەستانیش لە بنەوە سەوڵیان لێ دەدا، واتا هەر بە دوو نهۆم لەقەڵەم دەدرێ.[1135] بەلاّم لە دەقی نووسینەکانی ئەو کایەیەدا، بەڵگەیەکی ئەوتۆمان نەدۆزییەوە، بەکارهێنانی گەمیەکی بەم ناوەمان پێ بسەلمێنێ.

**ط. (الأعزازي):**

ئەم گەمییەش، بە وێنەی گەمیەکەی پێشتر، هەرچەندیشە (إبن مماتي) لە باسی کەشتیگەلی ئەییوبیاندا ناوی دێنێ‌و دەڵێ خۆراکیان لێ بار دەکرد،[1136] بەلاّم هیچ بەڵگەیەکمان دەست نەکەوت، بوون‌و بەکارهێنانی ئەعزازیمان پێبسەلمێنێ.

---

1127 ن، م، ص.

1128 ن، م، ص٣٣٩ ـ ٣٤٠.

1129 د. سعاد، البحرية في مصر، ٣٤٠. د. جهادية القرەغولي، التنظيمات الأدارية، ص٢٧٢. عبدالفتاح عيادة، سفن الأسطول الأسلامي، ص٧.

1130 الظاهري، زبدة كشف الممالیك، ص١٣٩ـ ١٤٠. صالح بن يحيى، تأريخ بيروت ٢٢٠ـ ٢٢١.

1131 قوانين الدواوين، ص٣٤٠. د. سعاد، البحرية الاسلامية، ٣٣١.

1132 النوادر، ١٥٤. الفتح القسي، ٤٦٠. الروضتين، ١٨١ـ ١٨٢. مفرج الكروب، ٣٤٧/٢.

1133 الفتح القسي، ٤٦٠.

1134 د. سعاد، البحرية في مصر الاسلامية، ص٣٥٢.

1135 قوانين الدواوين، ص٣٤٠.

1136 ن، م، ص. د. سعاد ص٣٢٩.

ی. عەشیری:

یەکێ لە هاوسەردەمانی سەلاحەددین دەڵێ: گەمی عەششاری لە زەمەنی سەلاحەددیندا بەکارهێنراوەو[1137] گەمییەکی گەورەیەو "بە تەختەداری ئەستوورو قایم، بانی گیراوەو، دوو نهۆم بووەو بە بیست سەوڵیش بەسەر پشتی دەریادا خشپەی دەکرد"[1138].

٤ـ ئامرازەکانی کەشتیگەل:

بە چاکی دەزانین، باسی هەندێ ئامرازی تایبەت بە کەشتیگەل بکەین کە تەنیا لە جەنگی دەریادا بەکاردەهێنران، جگە لە چەکی جۆر بە جۆر کە لە شەڕەکاندا دەخرانەکار، هەندێ ئامرازیش، کە تەواوکارو پاشکۆی کەشتیگەلەکە بوون، لە شەڕدا دەخرانەکار. هەرچەندیشە، ئێمە لە کتێبگەلی مێژووی هاوچەرخی سەلاحەددیندا، باسی بەکارهێنانی ئەم ئامرازانەمان بەرچاو نەکەوت، بەڵام ئەم ئامرازانە هەبوون و بەکاریش هێنراون، چونکە بەبێ ئەم ئامرازانە، گەمی و کەشتیی شەڕیان بۆ نەدەکرا. هەندێ لەم ئامرازانەش، ئەمانەن:

أـ کەمەند (الکلالیب):

جۆرە کەمەندێکە وەك قولاپ بەسەری زنجیرگەلێکەوە بەستراوە، هەڵدەدرایە سەر گەمیی دوژمن، لێی گیر دەبوو و رایدەگرت. ئەوجا ڕایاندەکێشا بۆ لای خۆیان و نزیکیان دەکردەوەو، تەختە و داری پان و درێژیان دەخستە سەری و بەسەریاندا دەپەڕینەوە بۆ ناو گەمیەکەی دوژمن و دەیاندا بە سەریاندا.[1139] (ابن القلانسي) دەڵێ: موسوڵمانانی خەڵکی شاری (صور) کاتێ لە ساڵی (٥٠٥ك/ ١١١١ز)دا، فەرەنگەکان گەمارۆیان دابوون، کەمەندیان لە فەرەنگ خستەکار. کاتێکیش فەرەنگ تەنگەی گەمارۆکەی بەهێزتر کردو بەرانەو بورج و قولەکانیان بەشوورەی شارەکەوە نووسان، ئەوجا سەربازانی دەریا، کەمەندیان دروست کردو لە گوریسی ئەستوورو قایمیان بەست و هەڵیاندایە سەر بەرانەی دوژمن و بەکێشیان کرد.[1140]

ب. گورز (الباسلیقات):

زنجیری ئاسنەو سەرەکەی تۆپێکی ئاسنی پێوەیەو، لەسەر پشتی کەشتی و گەمی شەڕیان پێ دەکرد.[1141]

ج. سەنگەری تەختە (التوابیت):

سندوقی تەختەی سەربەتاڵەو لەسەر گەمیەکان دایاندەناو زەلام سەردەکەوتن و دەچوونە ناویەوە، سەبەتەیەك خڕگە بەردیان لەگەڵ خۆیاندا سەردەخست و بە تەنیشت سندووقەکەدا هەڵیاندەواسی و سەریان دادەنەواندو دەکەوتنە بەردبارانی دوژمن و لەناو ئەو سەنگەرە تەختەیەدا، دیار نەدەبوون و دوژمن نەیانیدەدی.[1142]

هەر لە ناو ئەو سەنگەرە تەختانەوە، کیتەڵە نەوت و گەچ و قسڵی هاڕاوەیان لە دوژمن دەگرت و چاویان دەهێنانە گڵ و ئازار. (الحسن بن عبدالله) دەڵێ: لە کاتی شەڕدا مەنجەڵی پڕ لە مارو دوپشك و مەنجەڵی پڕ لە سابوونی شلیشیان دەهاویشتە ناو گەمیی دوژمن و، دوژمنیش پێی دەخلیسکاو دەکەوت و، دەکەوتەبەر تیرباران،[1143] ناچار دەبوون خۆیان بە دەستەوەو بدەن و شەڕ رابگرن.

---

1137 عبدللطيف البغدادي، كتاب الافادة والاعتبار، طبعة لندن ١٩٦٥، ص١٨٦.

1138 د. سعاد، البحرية في مصر الأسلامية، ص ٣٥٦.

1139 الحسن بن عبدالله، آثار الاول، ص١٩٧. د. فتحي عثمان، الحدود الاسلامية البيزنطية، ٣٧٥/٢. احسان هندي، الحياة العسكرية، ١٨٩. أمين الخولي، الجندية والسلم، ص٩٧.

1140 ذيل تأريخ دمشق، ١٧٩.

1141 الحسن، آثار الأول، ١٩٦. د. فتحي عثمان، الحدود الاسلامية، ٣٧٤/٢. أمين الخولي، الجندية والسلم، ٩٧. د. سعاد، البحرية في مصر الاسلامية ص٢٠٣. احسان هندي، الحياة العسكرية، ص١٨٩.

1142 الحسن، ١٩٦. أمين الخولي، ٩٧. د. سعاد ٢٠٣. احسان هندي، ١٨٨. د. فتحي عثمان، ٣٧٤/٢. د. عبدالعزيز سالم، ص١٤٢.

1143 آثار الاول، ١٩٦. احسان هندي، ١٨٨ـ ١٨٩. د. سعاد، ٢٠٣. عبدالرؤوف عون، الفن الحربي، ص٢٦٦. أمين الخولي، ص٩٨.

**د. بڕە ( اللجام ):**

ئامێرێکی ئاسنی درێژی نووکتیژە، لە خوارەوەی کلۆرە وەکو نووکەڕم وایەو، بنەکەی (سەری خوارەوەی) دەچێتە ناو دارێکی ناوبۆشی ئەستوورەوە، کە ڕوو لە پێش وەك ڕم لە پێشەوەی گەمیەکە قایم کراوە، پێی دەڵێن دەمە شمشێر، بڕەکەش بە وێنەی نووکەڕم، یان (وەك بڕەی یەکانە) ڕووەو پێش دەرپەڕیوەو بنەکەشی لە ناو دارەکەدا قایم کراوە. ئەم بڕەیە لەهەر گەمیەك بدات کونی دەکات. گەمیەك ئەم بڕەیەی هەبوایە لە گەمیو کەشتیی دوژمن نزیك دەبووەوەو لە لاتەنیشتەوە خۆی لێ دەداو کونی دەکردو پڕ دەبوو لە ئاو، ئەوانیش ناچار دەخالەتیان دەبردو خۆیان بەدەستەوە دەدا.[1144] ڕاستیشت دەویٚ گەمیی هەردوو سوپاکە، لەم جۆرە بڕەو ئامرازانەیان هەبوو، لەبەر ئەوە، دەبوایە ئامێری دیکەی دژ بەم ئامێرانەیان هەبیٚو کەشتییەکانی خۆیانی پیٚ بپارێزن. جا، ئەوەبوو، بۆ خۆپاراستن لە کەمەندەکان، تەوری گەورەیان بەکاردەهێنا، لە زنجیری کەمەندەکەیان دەداو یەکسەر دەیشکاندو لە کاری دەخست.[1145] بۆ خۆپاراستنیش لە کیتەڵە نەوت و ئاگر، لبادی بە سرکەو ئاو تەڕکراویان بە دەوری گەمیەکەی خۆیاندا هەڵدەخست، کە ئاگر ناگریٚ و ناسووتیٚ. جارجارەش سرکەو شەبو بۆرەکیان تێکەڵ دەکردو ناوگەمیو کەشتییان پیٚ سواغ دەدا، یانیش قوڕیان لە گڵو بۆرەك دەگرتەوەو بۆ سواغی ئاگربڕ بەکاریان دەهێنا.[1146]

فڕوفێڵێکی دیکەی کوشتاری سەردەریاو خۆشاردنەوەو شوێنەونی لە دوژمن (Comoufeage) کە بەکاریان دەهێنا، ئەوەبوو، دەهاتن جێگا بەرزەکانی قولەو تاوەرەکانی ناو کەشتیەکەیان بە ڕەنگی شینی ئاوی بۆیاخ دەکرد، ئیدی لە دوورەوە وەکو ئاوەکە وابوو، نەدەبینرا، بەو جۆرە لە پڕێکا وەك گورگ دەکەوتنە پەلامارو هێرش و سەریان لە گەمیی دوژمن دەشێواند.[1147] جگە لەو فڕوفێڵانەش دووربینیی ئەوەشیان دەکرد، کە بە شەو لەناو گەمیەکاندا چرا دانەگیرسێننو ئاگر نەکەنەوەو گیانلەبەری ئەوتۆیان پیٚ نەبی بحیلێنیٚ، یان بقۆڕێنیٚ، یان بقووقێنیٚ، بە نموونە وەك ئەسپو مانگاو کەڵەشێر، نەوەکا دوژمنیان لیٚ بەئاگا بهێنیٚ.[1148]

**٥- بزاڤو چالاکیی کەشتیگەلی سوپای ئەیوبیيان:**

دەوڵەتی نوورەددین مەحمود کەشتیگەلی نەبوو، چونکە دەریای بەدەستەوە نەمابوو، هەموو کەناراوەکانی شامیش، لە باکوورییەوە تا باشووری کەوتبووە ژێر ڕکێفی خاچدروشمانەوە. هەرچی وڵاتی میسرە، ئەوە، لە ژێر حوکمی فاتمییەکاندا بوو، کە هەلیش بۆ سەلاحەددین ڕەخسا، دوای مردنی شێرکۆی مامیو پاش لە ناوبردنی دوایین خەلیفەی فاتمی، کە حوکمی میسری کەوتە دەست، دیتی کەشتیگەلی وڵاتی میسر، تا بڵێی خراپە. وەك باسمانکرد.[1149] خاچدروشمانیش، لەولاوە ئەم هەلی لاوازبوونە لە پڕەی کەشتیگەلی میسریان قۆستەوە، بە تایبەتیش کە لە میسردا کۆمەڵە خەڵکیٚ هەبوون کەوتبوونە دژایەتی کردنی ئەم حوکمە کۆرپەیەی سەلاحەددین. بەو جۆرە خاچدروشمان لەگەڵ ڕۆمە بێزەنتیەکاندا پەیمانێکیان بەستو بڕیاریاندا بە جووتە پەلاماری زارکی (دمياط) بدەن. پاش هێرشی زۆری بیٚ وچانیش، ئنجا، سەلاحەددین بۆی ڕوون بووەوە، کە میسر پێداویستی بە کەشتیگەلێکی بەهێز هەیە کە بەر لەم هێرشانە بگریٚو وڵاتەکەی بپارێزیٚ.[1150]

وڵاتێکی وەك وڵاتی میسریش بەبیٚ کەشتیگەلێکی بەهێز نەیدەوتوانی بەسەربەخۆییو ئاسوودەیی گوزەران بکات،

---

1144 الحسن، ١٩٧. نعمان الثابت، ١٧٦. احسان هندي، ١٨٨. د. سعاد ص ٢٠٣ـ ٢٠٤. عبدالرؤوف عون، ص٢٦٧.

1145 آثار الأول ، ١٩٧. د. سعاد، ٢٠٤. احسان هندي، ١٩٠. أمين الخولي، ٩٩. عبدالرؤوف عون، ص٢٦٧.

1146 ـ الحسن: ن، ص. عبدالرؤوف عون، ن، ص. احسان هندي، ن، ص. أمين الخولي، ن، ص (ن، ص= واتا هەمان لاپەڕە).

1147 الحسن: ١٩٦. عبدالرؤوف عون، ٢٦٧ـ ٢٦٨. احسان هندي ن، ص. أمين الخولي، ن ص. د. فتحي عثمان.

1148 الحسن: ن، ص. محمد فرج. الأسلام والحرب، ص٩٥. أمين الخولي، ص١٠٠. إحسان هندي، ن، ص. د. فتحي عثمان، ن،م، ص. الحدود الاسلامية البيزنطية، ٣٧٥/٢.

1149 الخط، ١٩٤/٢.

1150 د. العريني، الشرق الأدنى في العصور الوسطى، ص١٧٥.

لەبەرئەوە، فەرمانڕەوای نوێی میسر، ئەو چاکسازییانەی بە ئەنجام گەیاند. کەباسمانکرد ئەوەبوو، هێزی کەشتیگەلی سەرلەنوێ، ڕێکوپێك کردەوە، کردی بە دیوانێکی سەربەخۆو خستییە ژێر ڕکێفی براکەی خۆیەوەو دەسەلاتیشی پێدا، چیی پێویست بێ وەریبگرێو، لە گەنجو لاوانیش چەندی پێ زەروور بێ بیانخاتە ژێر چەك. بەو پێیە، دەوڵەت بوو بە خاوەنی کەشتیگەلو. بەیارمەتی هێزەکانی سەربەژ. ئیدی لە ساڵی (٥٦٥ك/ ١١٦٨. ١١٦٩ز)ەوە دەستی کرد بە بەرەڤانی لە زارك و بەندەرەکاندا، کەشتیگەل کەوتە فراژووکردن و ڕۆژە بەڕۆژ بەرەو چاکتر گۆڕاو هەر بە داهاتنی ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٧٩ز) یش، دووقات زیادی کردو "قەلەڕەشەکان. شینییەکان. گەیشتنە شەست دانەو ئەسپەڵگرەکانیش بوون بە بیست" ئەوجا، شینیی تایبەت ملی ذا لە دەریا و خۆی کرد بە کەناراوەکانی ڕۆمداو زارك و بەندەری فەرەنگی بەجاری هەراسان کردو هەزار (علج)ی بە دیلیو باڵبەستەیی هێناو، گەورەکانیشیانی کوشتن".[1151] دەشتوانین بڵێین کەشتیگەلی دەوڵەتی ئەییوبی سێ قۆناغی بەخۆیەوە دیووە:

**أ- قۆناغی دەستپێك:**

لەم قۆناغەدا، کە قۆناغی ئامادەکردن و دانانی بناغەی کەشتیگەلی میسری ئەیوبییە، سەلاحەددین ئەو چاکسازییەی بۆ ئەوە بەجێ هێنا، تا هێزێکی دەریایی پێك بهێنێ بتوانێ بەشێ لە پلانی جەنگی ئایندەی ئازادکردنی ولاتانی عەرەبی ئیسلام بگرێتە ئەستۆو بەشداریی تێدا بکاو، هەر هیچ نەبێ لانی کەم بتوانێ زارك و بەندەرەکانی میسر بپارێزێو سوپای میسریش. کە تا ئەو ساتە بە جەنگی پاراستنی ئەم زارك و بەندەرانەوە ماندوو بوو بوو. پشوویەك بداو باری گرانی سەرشانی کەمێ سووك ببێ، ئەم قۆناغە دەتوانین بڵێین لە ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٨٠ز)دا، لەو کاتەوەی کەشتیگەلی ئەییوبیی، لە دەریای ناوەڕاستدا دەستی بە بزاڤو چالاکی کرد، تەواو بوو، بەلام نازانین سەلاحەددین کەی بناغەی هێزی دەریایی داناوەو جێی گومانیشە هاوکات لەگەڵ وەرگرتنی حوکمی میسرو ڕامالینی دۆستانی حوکمی فاتمیدا، دایمەزراندبێ. گومانی تێدانییە، خاچدروشم و بیزەنتی و صقلییەکان، نەیانتوانی پێگەیەك، بۆ خۆیان لە میسردا وەدەست بهێنن.[1152] وەلێ ئەو سەرکەوتنەی، کە سەلاحەددین لە ساڵی (٥٦٥ك/ ١١٦٨ز) دا، لە (دمیاط) و لە ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٣ز) دا، لە ئەسکەندەرییە بەدەستی هێنا، بە سەرکەوتنی هێزی دەریایی میسر لە قەڵەم نادرێن، چونکە هیچ کوشتارێکی دەریایی لە نێوانیاندا ڕوویندا، هێرشی دەریایی خاچدروشمان بۆ شاری (دمیاط) تووشی بەرەڤانیی هێزی سەر زەویی میسرو هێزەکانی (العاضد)ی خەلیفەو هێزی نورەددین مەحمودیش بووەوە، چونکە نورەددین مەحمود، لەشکر لە دوای لەشکری بۆ میسر هەر بەڕێوەبوو. هەرچەندیشە، داگیرکارانی خاچدروشم و صقلییەکان پەنجاو پێنج ڕۆژ، توانییان بە زەبرو هەموو جۆرە چەکێکی گەمارۆو هێرش لە شاری (دمیاط) دا بمێننەوە، بەلام پاشان لەبەر سەختی بەرگریکارانی سوپای ئەییوبییو ئیسلام ناچار شارەکەیان بەجێ هێشت و کشانەوە، "بە سەرشۆڕییو زیانێکی زۆرەوە هەلاتن، مەنجەنیقەکانیان ئاگردراو ئامرازو ئامێریان بە تالان براو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو شارەکەشیان دا بە دەستەوە".[1153] ئەمەی لێرەدا ڕووی دا، لە ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٣ز)یشدا، لە ئەسکەندەرییە بەسەریان هاتەوە، کە ئەوەبوو لە جێگایەکی دیکەشدا باسمان کرد.

لە ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٨٠ز)دا: "فەرەنگەکانی عەسقەلان بە سواری دە حەڕاقەوە"[1154] هاتنە سەر شاری (تنیس) بە تەمای ئەوە، کە پێگەیەکیان لەوێ دەستکەوێ، یان بەرلەوەی سەلاحەددین بەرپەرچیان بداتەوە، ئەوان دەست پێشبخەن و شارەکە کاول بکەن، بەلام ئەمەشیان بۆ نەچووە سەرو تێیدا سەرنەکەوتن. "سەلاحەددین، لە شوورەو قەلاو قایمکاری ئەم شارە دلنیانەبوو و پشتی پێ نەدەبەست، ئەوەبوو لە ساڵی (٥٧٧ك/ ١١٨٢ز)دا، ناردی قەلاکەی چاك

---

[1151] الروضتين، ١١/٢.

[1152] الكامل، ٣٥١/١١. الباهر، ١٤٣. النوادر، ٤٢- ٤٣. الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٥٦. مفرج الكروب، ١٧٩/١- ١٨٠.

[1153] سنا البرق، ٨٧/١. الكامل، ٣٥٢/١١. الباهر، ١٤٤. الروضتين، ج١، ق٢، ص٤٥٧. مفرج الكروب، ١٨٣/١. الذهبي، العبر، ١٨٩/٤. د. حسن حبشي، نورالدين والصليبيون، ١٣٤- ١٣٦.

[1154] الخطط، (ط/ المعهد الفرنسي) ج٣، ق٢، ص٢١٢.

کردەوەو ئامێرەکانی تازەکردنەوە، بۆ دڵنیایی خەڵکی شارەکە، چونکە خەڵکەکەی ترسیان دەبەرنیشتبوو، نەیاندەوێرا تیایدا بمێنن". [1155]

**ب. قۆناغی بەهێزبوونی کەشتیگەلی ئەییوبیان لە میسر:**

ئەم قۆناغە لە ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٨٠ز)یەوە، دەست پێ دەکا، لە بەرایی ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٣ز)دا، تەواو دەبێ، واتا چوار ساڵی خایاند. لەو ماوەیەدا، کەشتیگەلی ئەییوبیان چەندین هێرشی بردەسەر کەشتیگەلی خاچدروشمان و بەرپەرچی گەلێ ڕەفتاری دوژمنانەی دایەوە، چونکە کەشتیگەلەکەی دوو هەند زیادی کردو هەوای خەباتی ڕێگای ڕزگارکردنی وڵاتەکەشی دای لە پەرەسەندن. [1156]

یەکەم پێکدادانی سەرکەوتووانەی کەشتیگەلی ئەییوبی، ئەو جەنگە دەریاییە بوو، کە لە ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٨٠ز)دا، لەگەڵ دوژمندا کردی‌و، سەرکەوتنی تێدا بەدەست هێناو (البطسة)یەکی خاچدروشمانیان دەستکەوت‌و "بە هەزار دیلەوە هێنایان". هاوکات لەگەڵ ئەم دەستوەشانەدا، سوپای ئەییوبی لە شەڕی (بيت الأحزان)دا. کە لەمەبەر باسمانکرد. کوتەکێکی جەرگبڕی دیکەی وەشاند "ئاڵای سەرکەوتن شەکایەوەو بەڕۆ دەریا وەك یەکی لێ هات". [1157] ..

ئەم دوو سەرکەوتنەی لەشکری ئەییوبییە، هەروا بەڕێکەوت‌و لابەلایی نەبوو، بەڵکو سەلاحەددین زوو زوو دەستی دەوەشاندو سەردەکەوت‌و بەدوویدا دەچوو، بە جۆرێ، خاچدروشمان پێدا ڕانەدەگەیشتن، چونکە سەلاحەددین تەنیا هەر بە شکاندنی دوژمن‌و وێرانکردنی (بيت الأحزان) هێرشی سەر (صورو صيداو بيروت)ەوە نەوەستا، بەڵکو فەرمانیشی بە کەشتیگەلەکەی دا، کە دووبارە لە زارك‌و بەندەرەکانی میسر بەدەرکەون‌و هێرش بۆ سەر (عكا) بەرن، ئەو شارەی کە (القاضي الفاضل) بە (قوستەنتینییەی شام) ناوی دەبات. [1158] لەو هێرشەشدا، چەندین گەمیی‌و کەشتیی خاچدروشمانیان بە دیل گرت دوای ئەوەی "بە وێرانکردن‌و تێکشکاندن‌و قۆچلێدان کەوتنە ناویان"، ئەم جۆرە زاڵبوون‌و سەرکەوتنانەش، کەشتیگەلی ئیسلام لە هیچ دەورو زەمانێکدا " نە لە گەرمەی دەسەڵاتی ئیسلام‌و نە لە زەبوونیی کفریشدا". بە خۆیەوە نەدیبوو. [1159]

لە ساڵی (٥٧٨ك/ ١١٨٢ز)یشدا، دوای زیادکردن‌و تەواوکردنی ژمارەی زەرووری سوپاکەی‌و سازدانی جبەخانەو باروبارخانەی لەشکرەکانی. وەك لەوەو پێش باسمانکرد. [1160]، ئەوجا سەلاحەددین پلانێکی دانا کە لەبەڕۆ لە دەریاشەوە، بکەوێتە پەلامارو شاری بەیروت داگیربکا، ئەم پلانەی زۆر بە جوانی خستەبەرکار، وەلێ هێزی پارێزگاری بەیروتی خاچدروشمان، بەری لە هێرشی سوپای سەلاحەددین گرت‌و هێزێکی دیکەی خاچدروشمانیش لە گەرمەی شەڕەکەدا گەیشتە بەیروت‌و پلانەکەی سەلاحەددین سەری نەگرت‌و بە ئامانج نەگەیشت. [1161]

مەبەستی سەلاحەددین لە گرتنی شاری بەیرووت، ئەوەبوو، میرنشینی (طرابلس و أنطاكيا) لە شانشینی (بيت المقدس) دابڕێکاو جیایان بکاتەوە، تا هیچیان نەتوانن بە دەنگ هیچیانەوە بچن‌و، جێگایەکیش لەسەر کەناراوەکانی شام بۆ داڵدەی کەشتیگەلی ئەییوبیی وەدەست بێنێ و پێداویستی خۆی‌و خاروبارو ئازووقەی تێدا دەست بکەوێ‌و بەیرووت بکا بە مەنزڵگەیەك، وچانی تێدابگرێ‌و بحەوێتەوەو هەموو جارێ ناچار نەبێ بگەڕێتەوە بۆ میسر. ڕاستیشت

---

[1155] الخطط، ن، م، ص.

[1156] الروضتين، ٩/٢. البداية والنهاية، ٣٠٢/١٢. السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، مطبعة عيسى البابى الحلبي، القاهرة، ١٩٧٠، ج٧، ص٣٦٦. سيد على الحريرى، كتاب الاخبار السنية في الحروب الصليبية، المطبعة العمومية، مصر، ١٣١٧ك، ص١٣٣.

[1157] ن. ص.

[1158] الروضتين، ١٤/٢.

[1159] ن، م، ص.

[1160] المقريزي، الخطط (ط/ بولاق) ، ٨٦/١. السلوك، ٧٥/١. سيد علي الحريري، كتاب الأخبار السنية، ص١٣٦.

[1161] مضمار الحقائق، ٩٧. الكامل، ٤٨٤/١١. الروضتين، ٩٢/٢. سيد علي الحريري، الأخبار السنية، ص١٣٩.

دەوێ دۆڕاندنی ئەم هێرشەی سەر بەیرووت لەبەرئەوە بوو، کە هەردوو هێزە هێرشبەرەکەی بەژو دەریا، پێکەوەو لەیەك ئان‌و ساتدا، دەستی پێ نەکردو کەشتیگەلەکە دەستپێشخەریی کردو بەرلەوەی سەلاحەددین، بەخۆی‌و لەشکرەکەیەوە، لە دیمەشقەوە بگاتە شاری بەیرووت، کەشتیگەلەکەی لە دەریاوە گەیشتە شارەکەو گەمارۆی دا.

بەم سەرنەکەوتن‌و دۆڕانەشەوە، هێشتا کەشتیگەلی ئەییوبیا ن لە نزیك شاری (دمیاط)ەوە، سەرکەوتنێکی لابەلاو چاوەڕواننەکراویان، دەزگیربوو، ئەوەبوو، کاتێ سەلاحەدین گەمارۆی بەیرووتی دابوو، مژدەیەکی بۆ هات، کە گەمیەکی گەورەی جۆری (البطسة) لە گەشتیگەلی خاچدروشمان لە شاری (ئەپۆلیا)ی ئیتالیاوە بەرەو (بیت المقدس) هاتووە، هەزارو شەش سەدو حەفتاو شەش (١٦٧٦) کەسی تێدایەو لە کەناراوی شاری (دمیاط) لای داوەو سوپای ئەییوبیان دەستیان بەسەریدا گرتووەو ئیدی مەپرسە کرا بە شایی‌و لۆغان.[1162]

ڕاستیشت دەوێ، سەرکەوتنی گەورە و بەناوبانگی سەلاحەددین لەو ساڵەدا، ئەوەیانە، کە کەشتیگەلی ئەییوبیان لە دەریای قلیزم (دەریای سور) دا، بەدەستی هێنا. ئەوەبوو لە شەعبانی ساڵی (٥٧٨ك/ پایزی ١١٨٢ز)دا میری خاچدروشمان (أرناط رینۆ دی شاتیون) لەو کاتەدا، کە سەلاحەددین گەمارۆی شاری موسڵی دابوو، ئەو (أرناط)ە، ئەم هەلەی قۆستەوەو پڕۆژەو پیلانێکی گەورەو گرانی دانا بۆ وەدی هێنانی چەندین ئامانج‌و ئاواتی گەورە، گرنگەکانیان ئەمانەن:

یەکەم: هەموو دەریای سوور بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، بۆ ئەوەش، وای دانابوو (إیلة)ی سەر کەنداوی (العقبة)و (عیذاب)ی سەر کەناراوی باشووری میسر. کە بەسەر ئەم دەریایەدا دەڕوانێ[1163]و شاری (جدە)و (رابغ)و سەر کەناراوی دورگەی عەرەب،[1164] ئەمانە هەمووی بگرێ، ئەوجا بەرەو باشوور داکشێ‌و شاری (عدن)یش داگیر بکا، بەو جۆرە هەموو دەریای سوور بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو خاچدروشمان لەم ڕێگایەوە زارك‌و بەندەرە بازرگانییەکان کۆنترۆڵ بکەن‌و بشگەنە ڕێگا ئاوییەکانی بازرگانیی هندستانیش. مێژوونووسان دەڵێن: یەکێ لە ئامانجەکانی ئەم پیلان‌و هەڵمەتە، ئەوەبوو، "قەڵای (ایلة) داگیر بکا کە دەکەوێتە سەرە ڕێگاکانی دەریا حیجاز، پاشانیش مل لەو دەریایە بنێن، کە لە کەنارەکانیەوە دەبن بە دراوسێ".[1165]

دووەم: وایشی داناوە پێوەندیی نێوان حەرەمەین‌و باقیمەنی هەرێمەکانی وڵاتی موسوڵمانان، چ لە بەژو چ لە دەریاوە ببڕێ‌و موسوڵمانانی پێ پەست بکاو بیانتۆقێنێ، نەك هەر ئەوە، بەڵکو نیازیشیان وابوو بگەنە شاری (مەدینەی مونەوەرەش)و تەرمی پێغەمبەریش لە گۆڕ دەربێنن‌و[1166] "جەستەی پیرۆزیشی ببەن لە وڵاتی خۆیان دووبارە بە خاکی بسپێرنەوەو موسوڵمانانیش بە سەرانە نەبێ نەتوانن زیارەتی بکەن".[1167]

سێیەم: (أرناط) بە تەمای ئەوەبوو، پاشانیشی مەسیحیی حەبەشە، بەلای خۆیدا ڕاکێشێتە جەنگی

---

1162 الکامل، ٤٨٢/١١. الأیوبي، مضمار الحقائق، ٦٧. الروضتین، ٧٢/٢. البدایة والنهایة، ٢١٠/١٢. السلوك، ٧٧/١.

1163 عیذاب: شارێکەو زارکی میسرە، لەسەر کەناراوی دەریای قلزم‌و لەنگەرگای ئەو گەمیانەیە کە لە عەدەنەوە دێن: معجم البلدان، ١٧١/٤. ئەم لەنگەرگایە لە هەموو لەنگەرگاکانی دی جەنجاڵترە، چونکە کەشتی‌و گەمیگەلێکی زۆری هندستان‌و یەمەنیش کردوویانە بە مەنزڵگەو لێی دەمێننەوەو دەڕۆن‌و کەشتییەکانی حاجیانیش هەر بەو جۆرە، بنۆڕە: د. سعداوی، التأریخ الحربی، ص١٤١. (ابن جبیر)ی گەڕۆکیش لە ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٣ز) دا، سەری لەم شارە داوەو، کاروانەکانی لەبەر زۆری‌و جەنجاڵی بۆ نەبژێرراوە، خەڵکەکەشی بە کەشتیسازی و چاککردنەوەی گەمی‌و کەشتیی حاجییەکانەوە گوزەران دەکەن.

1164 الکامل، ٤٩/١١. الروضتین، ٣٧/٢.

1165 الروضتین ٣٧/٢. مفرج الکروب ١٣٠/٢.

1166 ابن جبیر، ص٣٤.

1167 الخطط (ط/ بولاق)، ٨٦/٢.

خاچدروشمان[1168] و بۆ بەرکارخستنی پرۆژەو پیلانە دەریاییەکەی، کەوتە چالاکیو جموجوڵ و فەرمانی دا لێرەوارو جەنگەڵستانەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی ببڕنەوەو دارخورماکانی (عەریش)یش هەمووی سەرلەبەر دابێنن، ئەوجا کەوتە گەمی دروستکردنو لە ئاوی دەریای خامۆشاندا (البحر المیت)دا تاقیی کردنەوە.[1169] جگە لەوە، فەرمانیشیدا بە مەسیحیانی عەسقەلان، ئەوانیش کەشتیو گەمی دیکە دروست بکەن، ئەنجام پێنج کەشتیی گەورەو گەمیەکی زۆرو زەبەنی مام ناوەندو بچووك ئامادەکران. ئەوجا، زەلامەکانی هەموویان لێك هەڵوەشاندو بە پشتی حوشترگەلی عارەبی بیابانگەڕان. بەکرێو بە پارە[1170] گوازرانەوە بۆ کەناراوەکانی کەنداوی عەقەبە.

پاشان (أرناط) لەشکرێکی سەربەژی سازداو بەرەو شاری (تبوك) بەرێی خست، کە نەیەڵێ لە شامو میسرەوە، هیچ کۆمەکێکی سەربازیی بگاتە کاربەدەستی (ایلە)و، کەس بەدەنگیەوە نەیەت. (أرناط) ڕێگای دەریای گرتەبەرو گەیشتە (أیلە)، شارەکە، هەر زوو، دوای بەرەڤانییەکی زۆر کەم ملی بۆ کەچ کرد، وەڵێ هێزەکانی (أرناط) دوورگەی قەڵاکە (دوورگەی فیرعەون)یان بۆ داگیر نەکرا، کە لە (ایلە)وە زۆر نزیکە. (أرناط)، دوو کەشتیی بە دیارەوە دانا، کە لە قەڵاکەش بدەنو نەشهێڵن خەڵکەکەی ئاویان دەست بکەوێ. (إبن الأثیر) دەڵێ: "خەڵکەکەی زۆر تەنگەتاو بوونو پەرێشان کران".[1171] باقیمەنی کەشتیگەلەکەیشی ڕوو لە ئەفریقا، کەوتنە پەلاماری کەناراوەکانو لە ڕێگاش چییان دیتبا شاڵاویان بۆ دەبرد، تا گەیشتنە (عیذاب)، لەوێش کەشتییەکی زۆری بازرگانیی لێ بوون، کە پڕبوون لە شمەکی نایاب، لە یەمەنو[1172] هندستانو عەدەنەوە هاتبوون، دەستیان بە سەر ئەوانەشدا گرت.

موسوڵمانان، کە بە چاوی خۆیان بینییان وا کەشتیگەلی خاچدروشمان بەناو دەریای سووردا جرتوفرت، دێتو دەچێ، هەر بە جارێ زارەترەك بوونو تۆقین، چونکە بەرلەوە، "نە فەرەنگی بازرگانو نە فەرەنگی جەنگاوەریان لەو دەریایەدا نەدیتبوو".[1173] خاچدروشمان کارەساتی زۆر گەورەو ناشرینیان نایەوە، نزیکەی شازدە کەشتیی و بەلەمی موسوڵمانانیان سووتاندو، گەمییەکیشیان بەحەجاجەکانەوە بردو ئازووقەیەکی زۆریشیان ئاگر تێ بەردا کە بۆ مەکەو مەدینە ئامادەکرابوو. ئەوە لەولاوە بووەستێ، لەناو دەریاو لەسەر بەژیش، ئەوە، بە کوشتنو بەدیلگرتنو، بە ئەشکەنجەدانی خەڵکەوە سەرگەرم بوونو فوویان لە دۆ نەدەکردو، هیچ نەبوو سڵی لێ بکەنەوەو لێی بپرنگێنەوە.[1174]

ئنجا، لە (عیذاب)ەوە، خاچدروشمان ڕوویان کردە کەناراوەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سوور (بۆ خاکی حیجاز)و لە هەردوو بەندەرەکەی مەدینەی منەوەرەدا (الحوراءو ینبع) هەر کەشتیەکیان دیتبا، لەوێ لەنگەری گرتووە، سووكو باریك ئاوریان تێ بەردەداو ئەوجا بەرەو باشوور، گەیشتنە (رابغ)ی بەندەری مەککەو لەو ناوە کەشتییەکی پڕ لە حەجاجیان نوقمی دەریاکە کرد، کە بەرێوەبوون بچن بۆ (جدە).[1175]

ئەوکات سەڵاحەددین لە موسڵ بوو، نامەیەکی لە پارێزگاری قەڵای (ایلە)وە بەدەست گەیشت، سەرلەبەری ڕووداو کارەساتەکانی بۆ باس کردبوو. سەڵاحەددین تەتەری ناردە لای (الملك العادل سیف الدین أبوبکر)ی برای، کە جێگری خۆیشی بوو لە میسر، داوای لێ کرد، خێراو دەستبەجێ بەرپەرچی دوژمنان بداتەوەو تۆڵەیان لێ بکاتەوە، دیاربوو،

---

[1168] د. سعداوي، التأريخ الحربي، ص١٤٤.

[1169] رنسيمان، ٧٠٦/٢.

[1170] ابن جبير، ٣٤. الروضتين، ٣٧/٢. Lane- poole saladin.p.176.

[1171] الكامل، ٤٩٠/١١. الروضتين، ٣٥/٢. السلوك، ٧٩/١. الخطط، ٨٦/٢.

[1172] ابن جبير، ص٣٤٠.

[1173] الكامل، ٤٩٠/١١. ابن خلدون، ٦٥٥/٥.

[1174] الروضتين، ٣٥/٢. مفرج الكروب، ١٢٧/٢. السلوك، ٧٩/١.

[1175] مێژوونووسانی خاچدروشم ئەم ڕەفتارەی (أرناط)یان ڕسوا کرد، بنۆڕە: Henry, Treece, The Crusades, N.Y. ١٩٦٢. ١١٩P.

(الملك العادل)یش بەرلەوەی فەرمانی سەلاحەددینی پێ بگا، خۆی بۆ ئەو فرمانە سازدابوو.[1176] فەرمانی دا بە (الحاجب حسام الدين لؤلؤ)ی فەرمانداری کەشتیگەل، کە دەست بکات بە بزاڤی سەربازی. ئەمیش کەشتیگەلێکی چاکی لە شاری میسرو لە شاری ئەسکەندەرییە پێکەوەنا، پاشان هەڵیانوەشاندو پارچەکانی لە حوشترگەل بارکردو، هەمووی گەیاندە کەناراوی کەنداوی سوێس، کاروانەکەش جەنگاوەرانی مەغریبی پاسەوانییان دەکرد، تا گەیشتەجێ، لەوێ دایانگرتن‌و هەموویان تێهەڵکیش کردەوەو ئامادەیان کرد.

(الحاجب حسام الدين لؤلؤ) ئەم کەشتیگەلەی کرد بە دوو گروپ. یەکەمیان ڕووی لە قەڵای (ایله) کردو هەمو گەمیەکانی دوژمنی گرت‌و زۆربەی سەرنشینەکانی کوشتن، بەڵام بەشێکیان هەڵاتن‌و لە دۆڵ‌و کەن‌و کەندڕی ناوچەکەدا خۆیان بزرکرد، وەلێ (الحاجب) پیاوەکانی نادرە سەریان‌و دوویانکەوتن‌و دۆزینیاننەوەو کردیانن بە کۆتری کۆلارە خواردوو.[1177] گروپی دووەم گەیشتنە (عيذاب)و دوژمنیان تێدا نەدی، بەڵام بەرامبەر بە (الحوراء) گەمیەکیان دی لەنگەری گرتبوو، هێرشیان کردە سەر گەمیەکەو ئەوەی نەکوژرا گرتیان‌و دیل گەیشتە سەدو حەفتا دیل‌و موسڵمانە دیلەکانیشیان ڕزگارکرد، پاشان گەمیەکانیشیان بە بارەوە برد.[1178]

(الحاجب) بە خۆی‌و کەشتیگەلە زاڵبووەکەیەوە، گەڕایەوە بۆ میسرو، دیلەکانیشی بەکۆت‌و زنجیرەوە لەگەڵ خۆی هێنان‌و ڕۆژی (١)ی ذي الحجة ٥٧٨ك/ ٢٧ی مارتی ١١٨٣ز) گەیشتە ئەسکەندەرییەو کردیان بە ڕۆژی شادی. بەڕێکەوتیش هەر ئەو ڕۆژە (إبن جبير)ی گەڕۆکی ناوداریش، گەیشتە ئەو شارەو سەیری کرد، وا حەشاماتێکی زۆر خڕبوونەتەوە، سەیری دیلەکان دەکەن کە پشتاوپشت سواری حوشتر کراون‌و "بەدەهۆڵ‌و زوڕناش دەورە دراون".[1179] (الملك العادل) فەرمانی دا "لە ملیان بدرێت‌و تەنانەت یەك چاویشیان نەمێنی، ببینێ‌و یەك کەسیشیان بە ساغی دەرنەچێ هیچ شتێ دەربارەی ڕێگای دەریاکە بزانێ".[1180] پاشان سۆفی‌و مەلاو دینداران هەموویان سەربڕین.[1181]

لە نامەکەی (القاضي الفاضل)دا، کە بۆ دیوانی خەلیفەی بەغدای نووسیوە، هاتووە، دەڵێ: "لە کوشتنی ئەو کافرانە، گەڕانەوە نەبوو، شەریعەتیش هیچ هەلێکی بۆ مانەوەیان نەهێشتەوە، بۆ مانەوەی تەنانەت یەك کەسیشیان هیچ مەسڵەحەتێکمان نەدی، دەبا بکوژرێن، تا جۆرە کەسانی وەك ئەوان ئەو کارانە نەکەن، بە ڕاستی شتێکی گرنگ‌و گەورە بوو، ئیسلام تا ئێستا شتی وای نەکردووە".[1182]

وەختەکەی وەختی حەج بوو، موسوڵمانان هەندێ لەو دیلانەیان وەك مەڕ پێش خۆیاندان، بردیانن بۆ (مينا) "تا لەوێ وەك قوربانی سەریان ببڕن".[1183] ئەم کوتەکەی سەلاحەددین لە خاچدروشمانیدا، کوتەکێکی جەرگبڕبوو، هێرش‌و پەلاماردانی زارك‌و بەندەرەکانی خاکی ئەییوبیانی لێ کردن بە زەهری مار. بەوەش ناوبانگی سەلاحەددین زیاتر بڵاوبووەوەو مەنزڵ‌و پێگەی لە ناو موسوڵماناندا، تا دەهات پیرۆزترو پتەوتر دەبوو، نەك هەر ئەو، بەڵکو شۆرەتی (الحاجب حسام الدين لؤلؤ)ی فەرماندەی کەشتیگەلەکەشی زیاتر گەشایەوەو دای لە زیادی.[1184]

هەرچی (أرناط)ی سەرکاری ئەم هەڵمەتەش بوو، ئەوە، ئەو، خۆی لە دیلی دەربازکردو بەهەر جۆرێ بێت، خۆی گەیاندە قەڵا قایمکارەکەی (الكرك)و، وەك گورگی بریندار، برینەکانی خۆی دەلستەوەو[1185] بیری لە پلانی دیکە

---

1176 الكامل، ٤٩٠/١١. مرآة الزمان، ٣٦٩/٨. الروضتين، ٣٥/٢. مفرج الكروب، ١٢٨/٢.

1177 الكامل، ٤٩٠/١١. الروضتين، ٣٧/٢. مفرج الكروب، ٧٨/٢.

1178 مرآة الزمان، ٣٦٩/٨. الروضتين، ن، ص. السلوك، ٧٩/١. الأخبار السنية، ص١٤٠.

1179 ابن جبير ص٣٤.

1180 الروضتين، ٣٦/٢.

1181 الخطط (ط/ بولاق)، ٨٦/٢.

1182 الروضتين، ٣٦/٢.

1183 الكامل، ٤٩١/١١. الروضتين، ٣٥/٢. مفرج الكروب، ١٢٨/٢. السلوك، ٧٩/١. ابن الوردي، ١٣١/٢. ابن خلدون، ٦٥٦/٥. الخطط، ٨٦/٢.

1184 الفتح القسي، ٣٤١. الروضتين، ١٤٨/٢. الخطط، (ط/ بولاق) ٨٦/٢.

1185 هارولد لامب، شعلة الاسلام، ص٩٦.

دەکردەوە، بەڵام سەڵاحەددین ڕایگەیاند، کە ئەو دەستدرێژییەی سەر حەرەمەینی بەسەرەوە ناچێ و بۆ کوشتنی (أرناط) لێ بڕاو خۆی بۆ تەرخان کرد.[1186] ئیدی لەوە بەدواش بڕای بڕ، نە (أرناط)و نە هیچ فەرماندەیەکی فەرەنگ، نەدەوێران بیر لە تاقیکردنەوەیەکی تر لە دەریای سووردا بکەنەوە. دوا بزاڤی سەڵاحەددین لە دەریادا، ئەوەبوو کە لە ساڵی (٥٧٩ك/ مایسی ١١٨٣ز)دا، کەشتیگەلەکەی لە دەریای ناوەڕاست بەردا، بچن بۆ گەمیی دوژمن بگەڕێن، خواوڕاست گەمییەکی دوژمنیان تووش بوو، سێ سەدو حەفتاو پێنج (٣٧٥) جەنگاوەری چەکداری بەسەرەوە بوو،[1187] بارو بارخانەو چەکیان بارکردبوو، بەڕێوەبوون، بچن بۆ کەناراوە داگیرکراوەکانی شام.

جەنگاوەرانی ئەییوبیی لێیان هاتنە دەستو شەڕ هەڵایسا، شەڕ درێژەی کێشاو هیچ لایان ورەیان بەرنەدا، سەرەنجام ئەییوبیان بەسەریاندا زاڵبوون، ئەوەی نەکوژراو مایەوە، بە دیل گرتیان و بە خۆیانو تاڵانو دەستکەوتێکی زۆرەوە، ڕاپێچیان کردن بۆ میسر. هەرچەندیشە، ئەم قۆناغە قۆناغی بەهێزبوونی کەشتیگەلی ئەییوبیان بوو، بەڵام سەرکەوتنێکی گەورەی لە دەریادا، وەك سەرکەوتنە گەورەکانی سوپای سەر بە ژی بەدەستنەهێنا، وەلێ سنوورێکی بۆ هەڵپەی ناو دەریای خاچدروشمان داناو وەستاندیان، دوای ئەم ڕووداوەش، کە باسمان کرد، ئیدی ماوەیەکی کڕ و بێ دەنگی باڵی بە سەر ناوچەکەدا کێشا، ساڵی ٥٧٩ك. ٥٨٠ك. ٥٨١ ك. ٥٨٢ك، واتا لە ١١٨٣. ١١٨٦ز، درێژەی کێشاو، کەشتیگەلی ئەییوبیی لەو ماوەیەدا هیچ بزاڤو چالاکییەکی ئەوتۆی نەنواند. دوای ئەو ماوەیە، کە چوار ساڵی خایاند، ئنجا سوپای ئەییوبیی سەرکەوتنە گەورەکەی شاری (حطین)ی بەدەست هێنا.

**ج. قۆناغی دوای شەڕی (حطین) تا پێکهاتنەوەکەی (تەبایی نامەکەی) (الرملة) ٥٨٣ـ ٥٨٨ك / ١١٨٧ـ ١١٩٢ز:**

سوپای سەڵاحەددین، پاش سەرکەوتنە گەورەکەی (حطین)، لە هەموو لایەکەوە، درێژەی بە چالاکیی جەنگ داو زارك و بەندەرەکانی باکووری کەناراوەکانی شام و فەلەستین و قۆڵتەکەی ئوردونی ئازادکرد. بەڵام چالاکیی کەشتیگەلەکەی لە دەریادا هەروەك خۆی مایەوەو گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ، کە جارو بار، کەمێ باری قورس و گرانی سەرشانی لەشکرەکانی سەربەژی سووك دەکرد لە داگیرکردن و سەندنەوەی شارەکانی گوێی دەریادا.

خۆ کەشتیگەلی ئەییوبیی زۆر لاواز نەبوو، بەڵام کەشتیگەلی خاچدروشمان هەند بەهێزبوو، کۆنترۆڵی دەریاکانی کردبوو. سەڵاحەددین خۆیشی ئەو فەرق و جیاوازییەی دەزانی. هەر لەبەر ئەوەش بوو، شەڕی بە کەشتیگەلەکەی نەدەکردو ترسی ئەوەشی هەبوو، دوژمن لەولاوە پەلاماری کەناراوەکانی میسر بدات، بۆیە هێزی کەشتیگەلی لە کەناراوەکانی شام خڕنەکردەوە.

هەرچی هێزی سەربەژە، ئەوە ئەو بە داگیرکردن و سەندنەوەی قەڵاو قایمکارەکانی ناوەوە نەدەوەستا، بگرە شارەکانی کەنار دەریایشی دەگرت، بە نموونە، وەك شاری عەکاو بەیرووت و عەسقەلان و شاری دیکەش.

کەشتیگەلەکەشی کەم و زۆر، کۆمەکی بە سوپاکەی دەکرد، بە نموونە، سوپای سەڵاحەددین لە (صور) تەنگەتاوکراو ناچار کرا لە سێ بەرەدا بجەنگێ، بەرەی شوورەی شارەکەو بەرەی باکووری شارەکەو بەرەی باشووری شارەکە، خاچدروشمانیش لە ناو گەمیەکانی خۆیانەوە. لە نزیك ئەو دوو قۆڵەوەی کە موسوڵمانان بە کوشتاری خەڵکی شارەکەوە خەریك بوون. کەوتنە تیربارانیان و جێگای موسوڵمانانیش هەند تەنگ بوو، تیر لەم قۆڵ بۆ ئەو قۆڵ دەیسمین و هەندەیان لێ کوژراو بریندار بوون، کە نەتوانن لەوە زیاتر لە شارەکە نزیك ببنەوە.[1188]

سەڵاحەددینیش، کە تازە (عکا)ی گرتبوو، شینییەکانی لە ئاوەکانی ئەو شارەدا بوون، ناردی لە دوویان و هاتن، بە شەڕەکەدا گەیشتن، ئیدی، بە پشتی ئەوان سەربازانی ئەییوبی لە شوورەی شارەکە نزیك بوونەوەو لە دەریاو بەژیشەوە

---

[1186] الكامل، ٥٢٨/١١. مرآة الزمان، ٣٨٩/٨. مفرج الكروب، ١٨٥/٢. ابن شداد ، الأعلاق الخطيرة، ج٢، ق٢، ص٧٢. ابن الوردي ١٣٧/٢.

[1187] الروضتين، ٤٧/٢. الأيوبي، مضمار الحقائق، ص٥٠. السلوك ١٨٠/١.. دەشلێن (٣٠٠) سێ سەد جەنگاوەر بوون: الكامل ٤٩٥/١١. مفرج الكروب ١٣٩/٢.

[1188] الكامل، ٥٥٤/١١.

شاریان تەنگەتاو کردو دوژمنیان بەگیرهێنا. حاڵیش وەهابێ، شار هەر دەگیرێ. ئەم نموونەیە، ئەوە دەردەخات، ئەو ئەرکەی بە کەشتیگەلەکە سپێردرا، گرنگییەکی گەورەو گرانی هەبوو، چونکە لەلایەکەوە ئەرکی سەرشانی ئەوەبوو، بەندەرەکە گەمارۆ بدا، لەلایەکی ترەوە، نەیەڵێ کۆمەك بگات بە شارەکە، لەبەرئەوە پاسەوانانی ناو شارەکە ورەیان بەرداو لەوە زیاتر بەرگەیان نەگرت.[1189]

بەڵام، موسڵمانان ئەرکی خۆیان دواخستو پاسەوانەکانیان دەبوو ئاگاداربوونایە، گەمیی دوژمن لە شارەکە نزیك نەبێتەوە. پاسەوانەکان دیتیان وا پێنج گەمیی کەشتیگەلی خۆیان پاسەوانی دەکەنو نایەڵن هیچ خاچدروشمێ بچێتە ناو شارەکە، یان لە شارەکە دەربچێ، ئیدی وایانزانی هەموو شتێك تەواو بووەو لە خەم ڕەخسیوە، لەبەرئەوە کەوتنە دڵنیاییو بەرەبەیان بە کەماڵی ئیسراحەت لێی خەوتن. ئەوجا، زەلامگەلی هێزی دەریای خاچدروشمان، کە ئەو هەلەیان بۆ هەڵکەوت دزەیان کردو لەناکاو پەلاماریاندانو "ئەوەی ویستیان کوشتیان، ئەوەشی نەیانکوشت بردیان بۆ ناو شارەکەو سەربازانی سوپای ئیسلامیش لە دەرەوەی دەریاکەوە تەماشایان دەکردن". لەو شەڕەدا، (عبدالسلام المغربي) فەرماندەی کەشتیگەلی ئەیپوبیی بوو، کە (إبن الأثیر) وەسفی دەکاو دەڵێ: کابرایەکی بە جەرگەو لە پیشەکەیدا لێزانە[1190]. لەو شەڕەدا (بدران الفارسی)یشی لەگەڵدا بووە.[1191]

هەندێ لە پاسەوانەکانی ناو کەشتیگەلی موسوڵمانان، کە لە خەودا بەدیل گیرابوون، ڕایان کردو خۆیان هەڵدا بۆ ناو دەریاکە، لەوانەش بەشێکیان بە مەلەوانی ڕزگار بوونو ئەوانی تر خنکان. هەرچی پێنج شینییەکەشە، ئەوە، سوڵتان فەرمانی دانێ ڕوو لە بەیرووت بکەن. "چونکە سوودی لێ وەرنەگرتن". لێ گەمیی خاچدروشمان دوویانکەوتن، جەنگاوەرو دەریاوانەکانی ئیسلام، لەناو شینییەکانەوە دابەزینە سەر وشکانییو خۆیان ڕزگارکردو شینییەکانیان بەجێ هێشت، بەڵام سەلاحەددین نەیهێشت، گەمییەکان بکەونە دەست خاچدروشمانو فەرمانی دا بە سەربازەکانی خۆی، زوو بگەنە سەریانو کونیان بکەن. ئەوجا "گەڕایەوەو لەسەر وشکانییەوە پەلاماری شاری (صور)ی دایەوە".[1192] بێ گومان، "ئەو نەهامەتییەش سوڵتانی پەستو خەفەت بار کردو کافرەکانیش پێی دڵشاد بوون".[1193]

بەو جۆرە، کەشتیگەلی ئەیپوبیان لە بەشداری شەڕی ڕزگارکردنی شارێکی کەناراوەکەدا، بۆی نەهاتو شکا. ئەم کەشتیگەلەش ئەمە یەکەم شەڕی بوو، پاش ئەوەش دووبارەی نەکردەوەو بۆ غەزای شاری دیکە نەدەچوو، بەڵام دەبینین کاتێ خاچدروشمان گەمارۆی شاری (عکا)یانداو، درێژەی کێشا، ئەم کەشتیگەلە بە هانای شارەکەوە چوو و جبەخانەو ئازووقەو جەنگاوەرانیشی پێ دەگەیاند، بەڵام بە شێوەیەکی هەمیشەیی سەرنەدەکەوت. بەو کەموکوڕییەشەوە، چالاکییو بزاڤی بەردەوامی هەر هەبوو. تا ئەو ساتەش کە خاچدروشمان شارەکەیان داگیرکرد. لە نیوەی مانگی (ذی القعدەی ساڵی ٥٨٥ك/ نوا دوای ساڵی ١١٨٩ز)دا، پەنجا گەمی لە کەشتیگەلی میسر بە فەرمانی سەلاحەددین لە ژێر فەرماندەیی (الحاجب حسام الدین لؤلؤ)دا، گەیشتنە ئاوەکانی شاری (عکا)، بەڵام لە ڕێگا کەشتیگەلی خاچدروشمان ڕێگەیان لێگرتنو شەڕ قەوما، وەلێ زۆری نەخایانو گەمیەکانی سەلاحەددین سەرکەوتنو گەمیەکانی خاچدروشمانیان تەرتەو وەرتەکردو، دوو گەمی گەورەشیان بە کەلوپەلو خۆراكو دەغڵودانو سەربازەوە دەستگیرکرد.[1194]

کەشتیگەلی ئەیپوبیان، بەرەو (عکا) کەوتەوە ڕێو، باروبارخانەی ئازوقەو کەلوپەلو زەلامی ئازا ئازاو بەجەرگو چاو

---

1189 - د. عبدالعزیز سالم. تأریخ البحریة الاسلامیة، ص١٨٤.

1190 **الکامل**، ١١/ ٥٥٤.

1191 النوادر، ٨٤. الروضتین، ١١٩/٢. مفرج الکروب، ٢٤٤/٢.

1192 الکامل، ٥٥٥/١١. مفرج الکروب ٢٤٤/٢- ٢٤٥. لەبارەی ئەم ڕووداوەوە، بنۆڕە: الفتح القسي، ١٦٠- ١٦٣. الروضتین، ١١٩/٢. مرآة الزمان، ٤٠٠/٨. البدایة والنهایة، ٣٢٧/١٢.

1193 الفتح القسي ١٦١.

1194 الروضتین، ١٤٨/٢. البدایة والنهایة، ٣٣٣/١٢.

نەترسیان داگرت "نزیکەی دە هەزار جەنگاوەر دەبوون"[1195]. ئەمانە هێزو توانستیان بە دڵی خەڵکەکەیدا هێنایەوەو ئومێدی سەرکەوتنیان زیاتر لەلا تازەکردنەوە.

ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی موسوڵمانان، مانای ئەوە نییە، کە ئیدی ڕێگای نێوان زارك‌و بەندەرەکانی میسر، تا دەگاتەوە (عکا) کەوتبێتە ژێر ڕکێفی کەشتیگەلی ئەییوبیی. ئەم سەرکەوتنە زۆرتر لەبەر ئەوە بوو، کە کەشتیگەلی ئەییوبیان زۆر گەورەو زەبەن بوو و، کەشتیگەلی خاچدروشمانیش بە پێچەوانەوە، لەو جێگایەدا کەم‌و بێ هێز بوو. ڕاستیشت دەوێ کەشتیگەلی خاچدروشمان، تا دوای لە دەستدانی زۆربەی شارە کەناراوەکانی شامیش، دەریای ناوەڕاست‌و کەناراوەکانی شامیشیان هەر لە ژێر ڕکێفدا بووە، چونکە ژمارەی گەمیەکانی خاچدروشمان لە ژمارەی کەشتی‌و گەمیی ئەییوبیان گەلێ زۆرتر بوو. بە نموونە لە بەرایی گەمارۆدانەکەی شاری (عکا)دا، پێنج سەدو پەنجاو چوار کەشتی‌و گەمییان خڕ کردەوە، لەوانە (٥٠٠) کەشتیان ئەسکەندیناڤی‌و، (٥٤) یشیان لە پیزاو جەنەوەو بوندقیەوە هاتبوون. ئەم هێزە، زۆر لە هێزە دەریاییەکانی سەلاحەددین زیاتر بوو[1196].

سەلاحەددین، خۆیشی دانی بەم دەستبالاّییە دەریاییەی خاچدروشماندا ناوە، ئەوەتا لە نامەیەکدا، کە بۆ برایەکەی خۆی. کە لە یەمەن بوو. دەنووسێ‌و دەڵێ: "کافرەکان ئێستا بەسەر شاری (عکا)دا دەڕوانن‌و لە شارەکە دەدەن، لە دەریاشەوە هەند گەمییان بۆ دێ لە ژمارەی شەپۆلەکان زیاترن، مەلیکەکانی کفریش کەوتوونەتە گەلەکۆمەو لە هەر تیپێ گروپێکیان بۆ دەنێرن. هەتا موسوڵمانانیش، لە سەر بەژ، یەکێکیان لێ دەکوژن، دەریا هەزار کەسیان لە جیاتی ئەو کوژراوە بۆ دەنێرێ"[1197].

بەو زۆریی‌و دەستبالاّییەشەوە، کەچی کەشتیگەلی خاچدروشمان، هێشتا نەیتوانی هێرشێکی ڕامالّ‌و بنبڕ بکاتە سەر کەشتیگەلی سەلاحەددین‌و شەڕی دەریای لەگەڵدا یەکلابکاتەوە، ئەوەش، کە لە نێوان هەردوو لادا ڕووی دا، دوورە پێکدادانی کەم بوون[1198] و، جار جارەش کەشتیگەلی ئەییوبیی سەردەکەوتن‌و گرەویان دەبردەوە.

ڕاستیشت دەوێ، گرنگترینی ئەو بزاڤانەش، ئەوەبوو، کە کەشتیگەلی ئەییوبیان لە (جمادی الأولی)ی (٥٨٦ك/ حوزەیرانی ١١٩٠ز)دا، سەرلەنوێ بە فەرمانی سوڵتان بەرەو شاری (عکا) کشا، بەلاّم خاچدروشمان لێنەگەڕان کاری خۆیان ئەنجام بدەن. هەستان کەشتیگەلێکیان سازداو بەرەو کەشتیگەلەکەی سەلاحەددین بەرێیان خست. سوڵتانیش بۆ ئەوەی کەشتیگەلەکەی خۆی بپارێزێ هەستا، شەڕەکەی خستە سەر بەژان‌و گواستییەوە بۆ سەر وشکانی‌و هێرشی کردە سەر ئەو خاچدروشمانەی (عکا)یان گەمارۆدا بوو، بەلاّم خاچدروشمان لەسەر بەژو لەسەر دەریاش هاتنە دەست‌و "هەردوو کەشتیگەلەکە لە ناو دەریاو هەر دوو لەشکرەکەش لەسەر بەژان پێکدا هەڵپڕژان"[1199]. بەو جۆرە، ئەو ڕۆژە وەك دەڵێن بووە ڕۆژی حەشرو (ابن الأثیر) دەڵێ: مێژوو شتی وەهای نەدیوە. پێکدادانەکەی سەر دەریا، بەوە کۆتایی هات، کەشتیگەلی ئەییوبیان گەیشتە (عکا)و، هەرلایەنەش گەمیەکی لە لایەنی بەرامبەر بەدەستهێناو، فەڕەنگیش "ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا"[1200].

لەمەوە دەردەکەوێ، میسر بەردەوام پێداویستی شاری (عکا)ی دابین دەکرد، وەلێ سەلاحەددین جار جارە، پشتی بە بەیرووت‌و حەیفا دەبەست، چونکە ئەم دووشارە لە (عکا)وە نزیك بوون‌و زووتر فریای دەکەوتن. (عکا) ئاتاجی ئازووقەو خۆراك بوو، گەمارۆی دەوری شارەکەش بەهێز بوو، خەڵکەکەی تەنگەتاو کردبوو، لەبەرئەوە سەرپەرشتانی

---

[1195] الکامل، ٤١/١٢. الروضتین، ن، ص. مفرج الکروب، ٣٠٥/٢. السلوك، ١٠٢/١. الفتح القسي، ٣٤٠ـ ٣٤١.

[1196] Crousset, Histoire des Croisades, Paris, 1935,Vol, 111, P.23.

[1197] صبح الأعشی ١٢٧/٧ـ ١٢٨.

[1198] الفتح القسي، ٣٨٧ـ ٣٨٨. مفرج الکروب، ٣١٢/٢. السلوك، ١٠٤/١، ١٠٧.

[1199] النوادر، ١٢٢. الکامل، ٤٧/١٢. الفتح القسي، ٣٨٥. الروضتین، ١٥٤/٢.

[1200] الفتح القسي، ن، ص. الروضتین، ن، ص.

کەشتیگەلی ئەییوبیی ناچار بوون فڕوفێڵ بگرنەبەر، تا خۆراك و کەلوپەلی پێ بگەیەنن. "کاتێکیش دەنگوباسی تەواوبوون و لەناوچوونی ئازووقەی شارەکە بڵاوبووەو خەڵکەکەش داوای کۆمەکیان کرد، سەلاحەددین نامەیەکی بۆ (عزالدين أسامه)[1201]ی والیی بەیرووت نووسی، ئەو (بطسة)یەی کە لە خاچدروشمانیان سەندبوون، پڕی بکات لە کەلوپەل و خۆراك و چەك و سەبازی زۆریشی لەگەڵدا بنێرێ و بیگەیەننە (عکا)"... (أسامه)ش، بۆ شوێنەوونی و لە خشتەبردنی خاچدروشمان، هەندێ بەرازی خستنە ناو (بطسة) کەوەو خاچێکی لەسەر بەرزکردەوەو بەرگی خاچدروشمانی لەبەر سەربازانی کردو وەك ئەوروپییەکان سەروقژی تاشین و داواشی لێ کردن هەندێ لەو فەرەنگە پەناهێندانەش لەگەڵ خۆیاندا سوار بکەن، تا ئەگەر هات و سەربازانی دوژمن ڕێگایان لێ گرتن، بە زمانی ئەوان قسەیان لەگەڵدا بکەن.[1202] ئا، بەم فڕوفێڵە سەربازانی کەشتیگەلی سەلاحەددین خۆراکیان گەیاندە شاری (عکا) "ئای لەو خۆشییە! ئەوە نەبوایە خەڵکی شارەکە لە برسان پەرێشان دەبوون"[1203].

هەرچی (بطسه)کەی میسرە، کە دواکەوت و سەلاحەددین فەرمانی دابوو پڕ بکرێ لە خۆراك و بنێردرێ بۆ (عکا)، ئەویش گەیشتە بەرەوەو پڕیان کرد لە خاروبارو کەلوپەل و خۆراك و پێداویستی تر بۆ (عکا) هەندەشیان لێ بار کرد، بەدرێژایی ئەو زستانە بیانخواردایە تەواو نەدەبوو[1204].

(بطسه)کە بەرەو شارەکە کەوتە ڕێ، وەڵێ کە لە شارەکە نزیك بووەوە، کەشتیگەلی خاچدروشمان ڕێگایان لێ گرتو بوو بە شەڕ، ئۆردوگای سەلاحەددینیش لە کەنار دەریاکەوە چاویان لێی بوو، هاوارو تەکبیر بەرز بوەوەو مسوڵمانان سەریان لێ ڕووت کردو لە خوا دەپاڕانەوە، ، سوڵتانیش غەمگین، وەك دایکێ کۆرپەی لەباوەش ڕفێنرابێ سەیری دەکردو لەخوا دەپاڕایەوە، (بطسة)کە بەدەم شەڕەوە، وردە وردە هەر دەڕۆیشت، تا گەیشتە بەندەرەکەو خەڵکی عەکا وەك بارانێ لە وشکەساڵدا باریبێ، ئاوەها بووژانەوە. بەم جۆرە کەشتیگەلی ئەییوبیان پەیوەندییان لەگەڵ شارەکەدا نەبڕی و بەو هەموو مەترسیی و زەحمەتەشەوە، ئازووقەیان بەشارەکە گەیاند.

کاتێکیش، خاچدروشمان دیتیان، کە زۆر زەحمەتە کۆمەکی سەلاحەددین لە شارەکە ببڕن، ئەوجا هەوڵیاندا لەنگەرگای باشوری بەندەرەکە بسووتێنن، کە پێیان دەگووت (برج الذبان) "تاوەرێکی بەرزبوو لە ناو دەریاکەدا، لەسەر تاوێرێکی بەرز دروست کرابوو، لەوێوە بەندەرەکە دەپارێزرا، ئیدی ئەگەر گەمی، لەوە تێپەڕیبا، ترسی دوژمنی نەدەما"[1205]. خاچدروشمان دەیانویست ئەو جێگایە بگرن، بۆ ئەوەی ئەڵقەیەکی گەمارۆی دەوری شارەکە، لە دەریاو لەسەر بەژیشەوە، شەتەك بدەن و نەیەڵن هیچی بۆ بچێ، کە ئەوەشیان بۆ نەکرا، ئەوجا ویستیان تاوەرەکە ئاگر تێبەردەن، بۆ ئەمەش سێ گەمیی گەورە گەورە (بطسة)یان سازدا، لەسەر لوولەکی یەکەمیان، سووتەمەنی و نەوتیان داناو ڕوویان لە تاوەرەکە کردو ڕۆیشتن، بەو نیازەی، ئەگەر گەمیەکەیان گەیاندە تاوەرەکەو پێوەی نووسا، ئەوجا ئاگر بە لوولەکەکەوە بنێن و بە تاوەرەکەوەی بنووسێنن، تا ئەوەش ئاگر بگرێ و هەر جەنگاوەرێکی تێدا بێ، ئەوانیش بسووتێن، لە (بطسة)ی دووەمدا سووتەمەنی زۆریان دانا تا بیهاونە سەر تاوەرەکە. هەرچی (بطسة)ی سێیەمە، ئەوە، ئەویان وەك ژێرخان لێ کرد، تا جەنگاوەرەکانیان لە بنەوە خۆیان بشارنەوەو تیری سەربازانی ئەییوبییان نەگاتێ و هیچ چەکیکی دیکەش زیانیان لێ نەدا.[1206]

ئەوجا (بطسة)ی یەکەم بەرەوپێش تەکانی دا، ئاگریشیان لە سووتەنیی سەر لولەکەکەی بەرداو نەوتیشیان بەسەردا

---

[1201] الفتح القسي، ص ٤١٧.

[1202] ن، م، ص، ابن العديم. زبدة الحلب، ١١٨/٣. البداية والنهاية، ٣٣٧/١٢.

[1203] النوادر، ١٣٥. الكامل ٥٣/١٢. الفتح القسي، ٤١٨. مرآة الزمان، ٤٠٤/٨. الروضتين، ١٦٠- ١٦١. مفرج الكروب، ٣٣٠/٢- ٣٣١. شفاء القلوب، ١٦٨.

[1204] النودار، ١٣٨. الروضتين، ١٦١/٢.

[1205] النوادر، ١٣٨. الفتح القسي، ٤٢٩. الروضتين، ١٦٢/٢. مفرج الكروب، ٣٣٦/٢.

[1206] النوادر، ١٣٩، الروضتين، ١٦٣/٢. زبدة الحلب، ١١٦/٣. مفرج الكروب، ٣٣٦/٢.

کرد، بەڵام بایەکە بەرەو تاوەرەکە هەڵی نەکردبوو، ڕووی لە بطسەکە بو، خواوڕاسان (بطسة) ئاگری گرت، چەندی هەوڵیان دا بۆیان نەکوژایەوە، هەرچی تێدابوون، هەموویان مردن‌و لەناوچوون. هەرچی (بطسة)ی دووەمە کە سووتەنیی تێدابوو ئەوەیان، جەنگاوەرانی سەلاحەددین چوونە بانی‌و داگیریان کرد. هەرچی (بطسة)ی سێیەمە، ئەوە دەریاوانەکان ترسیان لێ نیشت‌و ویستیان لە کوێوە هاتوون، بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ، بەڵام ئەوانەی لە ژێر خانەکەیدا بوون، نەیانتوانی بەدەرکەون، "بە تەواوی شڵەژان‌و پێکدادەهاتن، لەبەرئەوە وەرگەڕاو قڵپ بووەوەو کەسی تێدا دەرنەچوون، های لەو ڕۆژە، چ ڕۆژێ بوو!". [1207]

بەڵێ، کەشوهەوای سرووشت، تاوەرەکەی لە سووتان‌و کەوتن پاراست، بەڵام شارەکەی لە چنگی خاچدروشمان نەپاراست، خاچدروشمان وازیان نەهێناو سەرومڕو بێوچان بۆ داگیرکردنی شارەکە، لە بزاڤو چالاکیدا بوون‌و، مسوڵمانانیش بەریان لێ گرتبوون، ئەنجام جاچدروشمان زۆریان هێناو شارەکەیان گرت. بە دۆڕاندنی شارەکەش، کەشتیگەلی ئەییوبیی، ئیدی لە ئاوەکانی ڕۆژهەلاتی دەریای ناویندا، ئەو ڕۆڵەی نەماو تەنیا بەرەڤانی کردنی لە زارك‌و بەندەرەکانی میسر بۆمایەوە.

کەشتیگەلی خاچدروشمان، بە تەواویی باڵی بەسەر ئەو ئاوانەدا کشاند، لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی هیچ هێرشێ بکاتە سەر ئەو شارانەی سەر کەنار، کە سوپای ئەییوبی لێیانی سەندبووەوە، هەروەك ئەوان، کەشتیگەلی ئەییوبییش، نەیتوانی لە ئازادکردنی شارەکانی کەنار دەریادا هاوبەشی بکا. سوپاو کۆمەك لە ئەورووپاوە تەنیا بەدەریادا بۆ خاچدروشمان دەهات، لەبەرئەوە کەشتیگەلی ئەوان ڕۆڵێکی زۆر گرنگی دەگێڕاو، سەرومڕ هێزی تازەو خۆراکی تازەو وزەی نوێی بە ئۆردوگاکانی خۆیان دەگەیاند. هەڵمەتی سێیەمی خاچدروشمان، کە ریشارد شێردڵی شای بەریتانیاو، فلیپ ئۆغستزی شای فەڕەنسا، بە جووتە فەرماندەییان دەکردو بۆ وەستاندنی بزاڤی سەلاحەددین هاتبوون، هەڵمەتی دەریایی بوو، سەرەنجامیش داگیرکردنی شاری (عکا)ی لێ کەوتەوەو، پێکهاتنەوەکەی. تەبایی نامەکەی. (الرملة) مۆرکرا، لەگەڵ ئەوەشدا هێزی دەریایی سەلاحەددین ڕۆڵی گرنگی گێڕاوەو لاپەڕەیەکی پاکی لە مێژووی ئەییوبییاندا تۆمارکردووەو سەربازەکانی ئەوپەڕی ئازایەتی‌و بوێرییان نواندووە، بە نموونە، لە دوا دوای ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩١ز)دا، پێکدادانێکی دەریایی لە نێوان (شینی)یەکانی ئەییوبی‌و (شینی)یەکانی خاچدروشماندا ڕووی دا، دەریاوانانی ئەییوبیی کەمبوون، بەڵام ورەیان بەرنەداو هەندێ گەمیی دوژمنیان بە سەرنشینەکانیانەوە سووتاند، لە گەڕانەوەدا (شینی)یەکیان دواکەوت، کە میر (جمال الدین محمد- بن أرككز-) فەرماندەیی دەکرد، گەمیەکانی دوژمن دەورەیانداو خۆی‌و سەربازەکانی، تا دوا هەناسە شەڕیان کرد، پاشان دەخالەتیان پێ دا، کە خۆی بەدەستەوە بدات‌و ئەمیش سەیری کرد هیچ چارێکی نەماوە، پێی گوتن: بە دەستی فەرماندەی گەورەتان نەبێ، دەستم بە دەستی کەس نادەم. کابرای فەرماندە هاتە بەردەمی‌و (إبن أرككز) بە توندی دەستی لە ملی گیرکردو بەرەڵای نەکرد، تا بە جووتە کەوتنە ناو دەریاکەو بەری نەدا، تا لەگەڵ خۆیدا خنکاندی. [1208]

قارەمانێتییەکی بێ وێنەی پیاوانی هێزی دەریای ئەییوبی ئەوەبوو، کە یەعقوب ناوێکی خەڵکی شاری حەڵەب نواندی، ئەو لەسەر فەرمانی سوڵتان، فەرماندەیی ئەو (بطسة) گەورەیەی دەکرد، کە خەڵکی بەیرووت، باریان کردبوو لە کەلوپەل‌و ئازووقەو پێداویستی دیکە، تا بگاتە دەستی خەڵکی شاری (عکا). یەعقوبیش پڕی کرد لە چەك‌و سەربازی دەریاوان‌و بەرەو (عکا) گەوتەڕێ‌و نزیکەی حەوت سەد جەنگاوەری تێدابوو. بەرلەوەی بگەنە شارەکە، تووشی کەشتیگەلێکی گەورەی خاچدروشمان بوون، لە چل (شینی) پێك هاتبوو[1209]، (ڕیتشارد شێردڵ) خۆی فەرماندەیی

[1207] النوادر، ١٣٩. الفتح القسي، ٤٢٨. الروضتين، ١٦٣/٢. زبدة الحلب، ١١٧/٣. مفرج الكروب، ٣٣٦/٢.

[1208] الفتح القسي، ٤٦٣- ٤٦٤. الروضتين، ١٨٢/٢. مفرج الكروب، ٣٤٨/٢.

[1209] لە کتێبی (زبدة الحلب)دا، ١١٨/٣، دەڵێ: لە بیست‌و یەك گەمیی پێکهاتبوون.

دەكرد[1210]. شێردڵ، فەرمانیدا بە گروپەكانی خۆی دەورەی بدەن، كوشتارێكی سەخت دەستی پێ كردو دوو ڕۆژی خایاند[1211]، لەو شەڕەدا ئەیبوبیان، سێ گەمیی خاچدروشمانیان نوقمی ژێر ئاو كردو (شینی)یەكیشیان ئاگردا و ژمارەیەكیشیان لێ كوشتن.[1212]

وەلێ موسوڵمانان، نەیانتوانی لەوە زیاتر درێژە بە شەڕ بدەن و زانییان ئیدی كۆتاییان هاتووەو هیچیان بە دەستەوە نەماوە، لەوە زیاتر كە خۆیان بەدەستەوە بدەن، ئەوجا پێشەنگەكەیان ڕاپەڕی و گوتی: "بەخوا قەسەم بە سەربەرزیی نەبێ، نابێ بكوژرێین و هیچیشیان لەم (بطسة)یە پێ نادەین".[1213]

بەو قسەیە هەموویان گەرم بوون و كەوتنە كونكردنی (بطسة)كە تا پڕ بوو لە ئاوو هەموویان بن ئاو كەوتن و خنكان، بەڵام خاچدروشمان ئەوەی بۆیان دەرهات، دەریان هێناو بردیانە ناو گەمیەكانی خۆیان، چەند كەسێكیشیان بە زیندوویی دەرهێناو پارچە پارچەیان كردن، ئەوسا زەلامیان نارد بۆ (عكا)و ئەوەی ڕووی دابوو بە ناو خەڵكەكەدا جاڕیان دا بۆ ئەوەی ورە بە جەنگاوەرەكانی ناو شارەكە بەربدەن. بێ گومان خەڵكەكە بەم هەواڵە گەلێ نیگەران و تەعزیە باربوون[1214]. لەم ڕووەوە (عماد الكاتب) دەڵێ: "ئەمە یەكەم ڕووداوە، نەهامەتیی تری بەدواوە بێ و خەمو خەفەتی دیكەی لێ بكەوێتەوە"[1215]. واتا هۆیەكە لە هۆكارەكانی كزبوونی بەرەڤانی لە (عكا)دا، چونكە ئەم شارە "بێكەس بوو، پێویستی بە پیاوگەلێ هەبوو"[1216].

كەشتیگەلی ئەیبوبیان، پاشان دوای سەلاحەددین، كەوتە بێ هێزیی و خاچدروشمان بە هەلیان زانی، هەندێ زارك و بەندەری كەناراوی شامیان گرتەوە، لە ساڵی (٥٩٣ك/ ١١٩٧ز)دا، هێرشیان بردە سەر شاری بەیرووت و داگیریان كرد، (عزالدین أسامە)ی شار بەدەست، بەرەڤانیی بۆ نەكراو بەبێ شەڕ شارەكەی دا بەدەستەوە. ئەم ڕووداوەش ئەیبوبیان و هەموو موسوڵمانانی پەست كردو (عزالدین) بوو بە بنێشتە خۆشەی سەرزمان، هەبوو دەیگوت ترساو خۆی لێ نەدا، هەش بوو دەیگووت، پشتی تێ كرد، تا شانی خۆی نەشكێ، كەسانێكیش دەیانگوت: پیاوەكانی ترسان و نەچوون، بانگیشی كردبان هەر نەدەچوون، كابرایەكیش ئەم بەیتانەی خوارەوەی بۆ دانا:

| | |
|---|---|
| قەڵا چۆڵكە شەڕی ناوێ | قەڵا قابیلە بە پیاوێ |
| سەرشۆڕنەكا، خاك نەفرۆشێ | نەیكاتە باو لە ناكاوێ |
| سەرت شۆڕبێ سەلامەتی | سەر لە تالوكە مەهاوێ[1217] |

بێ گومان بە مردنی سەلاحەددین، دۆخەكە شێویاو ئەم خوێڕێتیی و بێ سەروبەرییەش سەری هەڵدا، تا وای لێهات "كەشتیگەل پشت گوێ خراو لە كاتی زۆر زەرووردا نەبا وەك (المقريزي) دەڵێ: كەس بیری لێ نەدەكردەوە"[1218].

ئەم مێژوونووسە، باسی باوردۆخی سەربازانی هێزی دەریایی. دوای سەلاحەددین. دەكاو دەڵێ: "ئەگەر زۆر زەروور بوایە كەشتیگەلێ سازو ئامادە بكرێ، دەبوا كۆڵان بە كۆڵا ن بە دووی زەلامدا گەڕابان و بیانگرتبان، بە ڕۆژ بە زنجیر

---

[1210] الفتح القسي، ٤٨٦. النوادر، ١٦١. الكامل، ٦٥/١٢. الروضتين، ١٨٤/٢. مفرج الكروب، ٣٥١/٢.

[1211] زبدة الحلب، ٣/ ١١٨.

[1212] الروضتين، ١٨٤/٢. مفرج الكروب، ٣٥١/٢.

[1213] النوادر، ١٦١.

[1214] النوادر، ١٦٢. الروضتين، ١٨٥/٢. مفرج الكروب، ٣٥١/٢. (تەنیا (ابن العديم) دەڵێ: زەلامەكانی ناو (بطسة)كە تەنیا دوو زەلامیان لێ ڕزگاركران، فەرەنگ لە ئاوەكە دەریان هێنان و سواری گەمیەكانی خۆیانیان كردن، گوایا ئەوان باسی ڕووداوەكەیان كردووەو لەدەمی ئەوانەوە هەواڵەكە بڵاوبووەتەوە". زبدة الحلب ١٩٩/٣.

[1215] الفتح القسي، ٤٨٦.

[1216] الكامل، ١٢/ ٦٥.

[1217] الروضتين، ٢٣٣/٢.

[1218] الخطط، ١٩٤/٢.

ببەسترابانەوەو بەشەویش لە زیندان بهاوێژرابان نەوەکا ڕابکەن‌و هەڵبێن، هیچیشیان لە نەختێ نان‌و شتی وا نەبێ پێ نەدەدان‌و جاری وەهاش دەبوو، وەك دیلی جەنگ، چەندین ڕۆژ بە برسێتی دەمانەوەو هیچیان پێ نەدەدرا، گەیشتە ئەوە، کەسێ جوێنی بە کەسێ دابا، پێی دەگوت: سەربازی کەشتیگەل. خۆ لە میسر زەلامێکت بانگ کردباو بتگوتبا ( هۆ.. کەشتیگەلی) ئەوە زۆر زۆر تووڕە دەبوو و چاوی دەچووە پشتی سەری، بەڵام لە زەمەنی سەلاحەددیندا، کە هێشتا خۆی لە ژیاندا مابوو، ئەوانەی لە کەشتیگەلدا خزمەتیان دەکرد، خەڵکی پێیاندەگوتن: غەزوکاری ڕێگای خودا، یان دژ بە دوژمنی خوداو، خەڵکی داوایان لێ دەکردن، دوعای خێریان بۆ بکەن". [١٢١٩]

ئەو قسەیە، کە بەو جۆرە وەسفی دۆخی کەشتیگەلی موسوڵمانان دەکات‌و باسی گوزەران‌و حورمەتی جەنگاوەرانی هێزی دەریا دەکات، ئەوە، بۆ خۆی، شاباشی سەلاحەددینەو ڕۆڵی پڕ بایەخ‌و دڵسۆزیی سەلاحەددین بۆ جەنگاوەران ڕوون دەکاتەوەو دەیسەلمێنێ، کە سەلاحەددین، دژ بە خاچدروشمە داگیرکارەکان، بەوپەڕی لە خۆبووردەیی و توانستەوە، چ لە سەر بەژو چ لە دەریا، گیانفیدا بووەو درێغی نەکردووە.

[1219] ن، م، ص.

## کەرتی شەشەم

## باسی جەنگ و شەڕەکان

## بە ناوبانگترین جەنگەکانی سەلاحەددین

**دەسپێك :**

**یەکەم : شەڕگەلی شوورەکان**

**١ـ گەمارۆکەی ئەسکەندەرییە.**

**٢ـ قایمکاری ( الكرك )و گەمارۆدانی یەك لە دوای یەکی ( الكرك ).**

**٣ـ گەمارۆی ( بيت الأحزان ).**

**٤ـ گەمارۆدان و گرتنی شاری ( عكا ) لەلایەن سوپای ئەییوبیانەوە.**

**٥ـ گەمارۆدان و گرتنی ( بيت المقدس ).**

**٦ـ گەمارۆ بە ناوبانگەکەی شاری ( صور ).**

**دووەم : شەڕی بەربڵاو :**

**١ـ شەڕی ( الرملة ).**

**٢ـ شەڕی ( حطين ).**

پاش شرۆڤەکردنی دۆخ و لایەنە جۆربەجۆرەکانی سوپای سەلاحەددینو پاش باسی ڕێکخراوەکانو بنیچە تیۆرییەکانی پلانگەلو جموجوولەکانی ئەم سوپایە، ئنجا دەمانەوێ باسی بارودۆخی لەشکرکێشیو بزاڤو چالاکییەکانی مەیدانداریی ئەم سوپایە بکەین، واتا دەمانەوێ، باسی کاتی شەڕو نەبەردیی هێرشو بەرەڤانیی ئەم سوپایە بکەین. لەبەرئەوەش، کە مەسەلەو بابەتی شەڕو جەنگەکان دووروودرێژە، ئەوەمان بە باشزانی بە دوو بەش باسی بکەینو گەمارۆ ناودارەکەی شاری (عکا)ش بکەین بە سەرەتای بەشی حەوتەم (دوابەشی ئەم کتێبە)، چونکە ئەم گەمارۆدانی شاری عەکایە بوو بە ڕووداوێکی گەورەو گران، کە سوپای سەلاحەددینی بە سەختی تێدا شکا، دوای ئەوەی دوو ساڵی ڕەبەقی لە تەمەنی ئەم سوپایە خایان.

## بە ناوبانگترین جەنگەکانی سەلاحەددین:

### دەسپێك:

سەلاحەددین، توانیی هەموو شارو قەلاکانی شامو جزیرەش، کە پێشتر لە ژێر دەستی میرەکانی نورەددین مەحموددا بوون، بخاتە ژێر دەستی خۆی، تەنیا حەلەبو ئەتابەکییەکەی موسڵ نەبێ، کە حەلەب، تا ساڵی ٥٧٩ك/ ١١٨٣ز، بە دەست (الملك الصالح اسماعیل بن نورالدین)ەوە مایەوەو لەو ساڵەدا کەوتە ژێر دەستی سەلاحەددین. موسڵیش بە دەست وەرەسەکانی زەنگییەوە مایەوە، تا لە ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز)دا، ئەویش کەوتە ژێر حوکمی سەلاحەددینەوە، واتا سەلاحەددین، توانیی لە ماوەی دە ساڵدا، هەر لە ساڵی (٥٧٠ك/ ١١٧٤ز) ەوە، کە میسری بەجێ هێشت، پاش مردنی نورەددین مەحمود لە ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٣ز)دا، بەرەی ئیسلامیی میسرو شام، وە ژێر ئالای خۆی بێنێ.

لەم ماوەیەدا، سەلاحەددین لە نێوان میسرو شامدا، دەهاتو دەچوو، لە چەند شەڕێکی گۆڕەپانو شەڕی شوورەکاندا دوورە پێکدادانی لەگەڵ گروپەکانی خاچدروشماندا دەکرد. جابەر لەوەی باسی ئەو شەڕانە بکەین، واچاکە فەرقو جیاوازیی نێوان قەلاو قایمکاران دەربخەین، قەلا، خۆی شارە، شوورەیان بە دەوردا دەکێشاو قولەیان لێرەو لەوێ لەسەر شوورەکان قووت دەکردەوەو کەندەکیان بە دەوردا لێ دەداو دەیانکرد بە شارێکی قایمکراوی سەختی ئەوتۆ، لە ڕچەو ڕێگای بە پاسەوان تەنراوەوە نەبوایە، کەس ڕێگا دیکەی نەبوو بچێتە ناوی.[1220]

هەرچی قایمکارە، ئەوە، بینای دیارو ئەستووری بەرزی پڕ لە سەنگەرە، لە ناوچە شاخاویو سەختەکاندا بۆ ڕێگابڕینو داخستنی دەربەندەکان دروستیان دەکردو لە جێگا ستراتیجییەکانی تریشدا، کە پاراستنیان زەرروورە دروستیان دەکرد، بۆ ئەوەی نەکەونە دەست دوژمن، یەکێ لە قایمکارە بە ناوبانگەکانی وڵاتی شام، قایمکارەکەی (المراقب)ی باکووری شامە، کە دەکەوێتە نزیك شاری (طرسوس). قایمکاریی (الكرك) کە لەبەر سەختیی و قایمی ناویان نابوو تاوێری بیابان، ئەوە، گەورەترین قایمکاری خرستیانەکان بوو[1221]و، (إبن الأثیر) کە وەسفی دەکا، بە قایمکاری مەزنو پەناگەی سەخت ناوی دەبا.[1222] قایمکاریی (برزیە)ش بە ترۆپکی چیایەکی بەرزەوە داڕیژرابوو، بە قسەی (یاقوت) لە هەموو وڵاتی فەڕەنگدا بە جێگەیەکیان گوتبا سەختە. ـت: پەکو لەو سەختییەی، دەڵێی قایمکارییەکەی (برزیە)یە.[1223] خۆ (حصن الأكراد) واتا قایمکارەکەی کور ـە هەر مەپرسە، تا بڵێی سەختو یاخی و قایم بوو، لەسەر چیاکەی بەرامبەر شاری (حمص)[1224] دروست کرابوو.. جگە لەوانە قایمکاری دیکەش هەبوون.

ئەوەی ئێمە لێرەدا پێمان گرنگ بێت، زۆربەی شەڕو جەنگەکانی سەلاحەددین شەڕی شوورەی شارەکان بوو،

---

[1220] طه الهاشمي، الجغرافية العسكرية، ص٢٣٢.

[1221] ابن جبیر، ٢٦٠.

[1222] الكامل، ٥٠٢/١١.

[1223] معجم البلدان، ٣٨٣/١.

[1224] معجم البلدان، ٢٦٤/٢.

سوپاكەشی لە هێرشدا بوو، لە زۆربەیاندا سەركەوتو هەندێكیشیانی بە دەستەوە نەهات. لێرەدا بە زەروورییی نازانین باسی شەڕی هەموو شوورەكان بكەین، كە شارەكان بە دەست خاچدروشمانەوە بووە، هەروەها بە زەروریشی نازانین باسی شەڕی هەموو ئەو شارانەش بكەین، كە خاچدروشمان لە فەلەستین‌و میسر گەمارۆیان دابوون، بەڵكو لێرەدا تەنها چەند نموونەیەكیان لیّ دەهێنینەوە بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەو وەبەرچاوهێنانەوەی شێوە گشتییەكانیان.

خەسڵەتی گرنگ‌و بەرچاوی ئەم جۆرە جەنگە ئەوەیە، كە گەمارۆدانی شوورەی شار، گەمارۆدەران لە بزاڤ دەخاو سوپاكەیان لە جێی خۆی دەچەقێ‌و زۆریشی پێناچێ بێزار دەبن، وەك ئەوەی لە گەمارۆكەی شاری (صور)دا ڕووی دا، جگە لەوە، زەوییەكەش بە پاشەڕۆی ئەسپ‌و پاشماوەی سەربازان پیس دەبێ، نەخاسمە لەو زەمانەدا خزمەتی تەندروستی لە ئۆردوگاكاندا هەر ناویشی نەبوو، چ جای ئەوەش لە كاتی شەڕدا. بەوەش، نەخۆشیی‌و ناساغیی بە هۆی بۆگەنبوونی زەوی‌و تێكچوونی بۆنی هەواكەوە، لەناو سەربازو وڵاغەكانیشدا بڵاودەبووەوە. هیچ سوپایەكیش لە سوپاكانی ئەو سەردەمە (سەدەكانی ناوین) نەیدەتوانی لە جێگایەكدا درێژە بە گەمارۆ بدات‌و تووشی نەخۆشی‌و برسێتی‌و ڕاكردن‌و هەڵاتنی سەربازەكانیش نەبێت، بە نموونە، وەك ئەوەی لە (عكا) ڕووی دا. هەر لەبەرئەوەشە، كە ئەگەر شارێكی گەمارۆدراو درێژە بە بەرەڤانی داباو، زۆر بە جەرگانە ڕێگای لە گەمارۆدەران گرتبا، ئەو لەو بارەدا، كاتێ بە ناچاری شارەكەیان بە دەستەوە بدابا، تۆڵەی گەورەو گرانیان لیّ دەكرایەوە،[١٢٢٥] وەك ئەوەی لە (عكا) ڕووی دا، كە ئەوەبوو (ریشارد) چووە ناو شارەكەو بەبێ بەزەیی تۆڵەی دیلەكانی كردەوە، هەرچەندیشە، ئەم تۆڵەكردنەوەیە، لە خۆبەدەستەوەدانی شارە قایمەكاندا، بوو بوو بە باو، بەڵام بە پێچەوانەوە، سەڵاحەددین لە غەزای شارەكاندا، لە سەر یاسایەكی عادیلانەی لیّ بووردن‌و بەخشین دەڕۆیشت‌و مرۆڤایەتییانە ڕەفتاری دەكردو ڕەحم‌و بەزەیی لەگەڵ خەڵكەكەدا هەبوو.

هەر لەبەر ئەوەشە، كە شارەكانی ژێر دەستی خاچدروشمان شەڕێكی ئەوتۆیان نەدەكردو زووتر خۆیان دەدا بە دەست سوپای سەڵاحەددینەوە، چونكە خەڵكی ناو شارەكەو جەنگاوەرەكانیشیان دڵنیابوون، ئەگەر خۆ بەدەستەوە بدەن، سەڵاحەددین تۆڵەیان لیّ ناسەنێتەوە، ئەو ڕەفتارەی ڕەحم و بەزەیی‌و لیّ بوردەییەش، كە سەڵاحەددین لەگرتنی شاری (بيت المقدس)دا بەرامبەر بە خاچدروشمان نواندی، بەڵگەی ئەم قسەیەن، بە پێچەوانەی ئەوە، كە لە ساڵی (٤٩١ك/ ١٠٩٧ز)دا، ڕووی دا. ئەوەبوو لەو ساڵەدا، واتا بەر لە نەوەدو دوو ساڵ، ئەسپی سوارچاكانی خاچدروشمان بەناو خوێناوی موسڵمانانی خەڵكی شارەكەدا چوونە ژوورەوە.

(الهروي). كە هاوسەردەمی سەڵاحەددینەو لە حەڵەب لە سەردەمی (الملك الظاهر غازي)دا ژیاوە.، لە (التذكرة)كەی خۆیدا، بەشێكی تەواوی بۆ باسی چۆنێتیی گەمارۆدانی قایمكارو شێوازی شەڕەكانی دەوروبەری قایمكارو، فروفێڵی لێدان‌و داگیركردنی قایمكارو چۆنێتیی گەمارۆدانی شوورەو شارەكان، تەرخان كردووەو، بەپێی ئەزموون‌و بەسەرهاتەكانی سەڵاحەددینیش، هەستاوە لە كتێبەكەیدا هەر لەو بەشەیدا، ژمارەیەك ڕێنماییمان لەو ڕووەوە دەداتێ‌و دەڵێ: پێویستە لەسەر فەرماندارەكە دڵ‌و سۆزو زەینی خەڵكی ناو قایمكارو سەربازو گەورە پیاوانی ناو قایمكارەكە، بۆ لای خۆی ڕابكێشێ‌و بەرلەوەش كە گەمارۆیان بدا، هەرچی ئەوان داوای دەكەن، بۆیان فەراهەم بكا.[١٢٢٦]

ئێمە وا دەبینین سەڵاحەددین بە كردار، سیاسەتی بەرامبەر بە قایمكارەكان پێڕۆ كردبێ، ئەم جۆرە سیاسەتەش سوودی زۆری هەبووە، بەبێ شەڕو بەبیّ بگرەو بەردە، هەندێ لە قایمكارەكان زوو خۆیان دەدا بە دەستەوە، چونكە جەنگاوەرەكانی سوور لێیان عایەن بوو، بەڵێنەكانی خۆی دێنێتەجێ‌و ڕەفتاری باشیان لەگەڵدا دەكات‌و دەست بۆ سەرو ماڵیان نابا.

(الهروي) ڕێنمایی فەرماندەی گەمارۆدەر دەكاو دەڵێ: پێویستە سیخوڕی هەبێ‌و، لەڕێی سیخوڕەكانییەوە

---

[1225] هامرتن، تأريخ العالم، ٥/٣٤٤ـ ٣٤٥.

[1226] التذكرة الهروية، ص١٢.

بارودۆخی شارە گەمارۆدراوەکە بزانێ و، بزانێ ئازووقەو خۆراکیان چەندەو بڕی چەکی جەنگاوەرەکانیان چەندە، کە ئەمانەی زانی و لەوەش دڵنیابوو، کە بارودۆخی شارەکە ئەوەی بە بەرەوە نییە بتوانێ بۆ ماوەی درێژ بەرەڤانی بکات، ئەوسا "با ئەو هەلە لەکیس نەداو ڕوو لە شارەکە بکاتو ئۆردوگای تێدا بخاو، پەلە بکا، لە پڕو لەناکاویش هەڵمەت بەرێ و بێزار نەبێ، چونکە گەر بێزار ببێ، پێی دەشکێ و سارد دەبێتەوەو هێزی لەکزی دەدا. هەروەك ئەوەی لە ساڵی (٥٨٣ك)دا، لەلای شاری (صور) ڕوویدا.". (الهروي) لە سەری دەڕواو دەڵێ: "فەرماندەی گەمارۆدەر، پێویستە لەسەری نامە بۆ گەورەو پێشەنگەکانی ناو قایمکارەکە بنووسێ و پێداویستیان بۆ زامن بکا.. وەهایان پیشان بدا، کە لە لای هەندێکیانەوە نامەی بۆ هاتووەو داوای دەکەن بگاتە هانایان. نابێ ناوی کەسیشیان بهێنێ و، هەر بە نهێنی بهێڵێتەوە... تا لە یەکتریی بکەونە گومان".[١٢٢٧]

وامان پێ باشە، لە باسی شوورەکاندا، شەڕەکان، بە پێی زنجیرەی مێژوویان باس بکەین، وا دەست دەکەین بە باسی بەرچاوترین و زەقترینی شەڕەکانی سوپای ئەییوبیان، سا، شەڕی بەرەڤانی بووبێ، یان شەڕی هێرشبەری.[١٢٢٨]

**یەکەم: شەڕی شوورەکان:**

**١ـ گەمارۆکەی ئەسکەندەرییە :**

ئەم شەڕە، بەرچاوترین شەڕی سەلاحەددین بوو لە میسر، ئەم بەندەرە، لە دوا دوای ڕۆژەکانی ساڵی (٥٦٩ك/ کۆتایی تەمموزی ١١٧٤ز)دا، کەوتە بەر هێرشی (صقلیە)کانو سەلاحەددین کەوتە بەرەڤانی. ئەم هێرشە بەو ئامانجە کرا، دەوڵەتی کۆرپەی سەلاحەددین، بە کۆمەکی فاتمییە پیلانگێڕەکانی دۆستانو لایەنگرانی شاعیری ناسراو (عمارة الیمنی)[١٢٢٩] برووخێنن. پیلانگێڕان ئاشکرابوونو گیرانو بەرەو پەتی سێدارە ڕەوانەکران، وەڵێ هەواڵی دۆزینەوەی پیلانەکە نەگەیشتبووە هێرشبەرانی (صقلی)، لەبەرئەوە بەردەوام بوون. ئەم هەڵمەتە زۆر گەورە بوو، مێژوونووسان دەڵێن: سی هەزار (٣٠٠٠٠) جەنگاوەری تێدا هاوپشك بووە، هەزارو پێنج سەدیان سوارەبوونەو پێنج سەد (ترکبولی)[١٢٣٠]یشیان تێدابووەو بەسواری دووسەد (شینیی) هاتبوونو، سی و شەش ئەسپەڵگریشیان لەگەڵدابووە، پڕبوون لە ئەسپ. شەش گەمیشیان پڕکردبوو لە دارو تەختەی گەورەی ئامێری گەمارۆدان، چل گەمیی پڕ لە زەلامو ئازووقەو خۆراکیشیان لە خزمەتا بووەو، هەرچی پێداویستی شەڕو گەمارۆی بە نموونە وەك تاوەری هێرشو، دەبابەو مەنجەنیق، هەموویان پێ بووەو وەستاو خزمەتکارو مەیتەر (بەخێوکەری ئەسپ)ی بە نموونە، وەك وەستای کەشتیسازی و مەیتەری سوارەکانو سەڵتە زەلامیشیان گەیشتووەتە پەنجا هەزار زەلام.[١٢٣١] (صقلیە)کان ئەم هەموو شمەکانەیان داگرتو خستیانەکار. ڕاستیشت دەوێ، ئەو خڕکەبەردە ڕەشانەی، کە لە دوورگەی (صقلیە)وە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویانو بەمەنجەنیق لە شوورەکانی ئەسکەندەرییەیان دەگرت، تەواوێ خەڵکی شارەکەی زارەترەك کردبوو، "برادەرانمان لە گەورەیی و هێزی کاولکاریی ئەو بەردە ڕەشانە، سەرسام بوون"[١٢٣٢].

بەڵام لەشکری ئەییوبیانو خەڵکی ئەسکەندەرییە، قارەمانانە لێیان هاتنە دەستو دەبابەکانی نزیك شوورەکەیان ئاگرداو سووتانیانن "خۆشیان ڕاگرتو شەڕێکی چاکیان کرد". سەلاحەددینیش ئەوکات لە ئەسکەندەرییە نەبوو،

---

[1227] التذکرة، ص١٠٤.

[1228] لەناو ئەمانەدا باسی گەمارۆ دۆڕاوەکەی (یافا) ناکەین، ئەو باسەمان خستە جێگایەکی دی.

[1229] الکامل، ١١/٣٩٨ـ ٣٩٩. الروضتین، ج١، ق٢، ص٥٦١. مفرج الکروب، ١/٢٤٣ـ ٢٤٤. ابن الوردي، ٢/١١٧.

[1230] ترکبولی: وشەیەکی یۆنانییە، واتا (بەچکە تورك)، بێزەنتییەکان بە تیپێکی سوپاکەی خۆیان دەگوت (ترکبولی)، ئەو تیپە لە گرنگیدا نەدەگیشتە تیپی سوارەکان. ئەمانە لە نەوەی باوکێکی تورکو دایکێکی یۆنانین. لە شەڕیشدا، شەڕی گرتو فڕتو خێرایان بەکارهێناوە، ناویان لە شەڕەکانی شامیشدا هاتووە، بنۆڕە: النوادر، ١٤٧، ٢٢٤. مضمار الحقائق، ١٥٢. مفرج الکروب، ٢/١٤٩.

[1231] سنا البرق، ص١٧١. الکامل، ١١/٤١٤. النوادر، ٤٨ـ ٤٩. الروضتین، ج١، ق٢، ص٥٩٩. مفرج الکروب، ٢/١٣. النویري، الالمام، ١/١٦٤ـ ١٦٥.

[1232] سناالبرق، ١٧٢. الروضتین، ١/٥٩٩. مفرج الکروب، ٢/١٤٢. السلوك، ١/٥٧. النویري، الالمام، ١/١٦٦.

کاتێکیش بە پەلە خۆی گەیاندە شەڕەکە "جەنگاوەرەکان، هەر بەگەیشتنی سەلاحەددین، ماندوویان حەسایەوەو ئێشی زامو برینیان نەماو هەریەکەشیان وای دەزانی، سەلاحەددین لەگەڵ خۆیەتیو بەجۆرێکیش کوشتاری دەکرد، وای دەزانی سەلاحەددین چاوی تەنیا هەر لە ئەوە".[1233] خاچدروشمانیش لە چەکدانان بەولاوە هیچ چاری دیکەیان نەماو "ئەوی کوژرا، کوژرا، ئەویشی نەکوژرا چەك کراو بەدیل گیرا"[1234].

ئا بەو جۆرە، سوپای سەلاحەددین و بوێرانو نەترسانی ئەسکەندەرییە کوتەکی پشتشکێنیان لە هەوادارانی داگیرکردنی میسر سرەواند، ئیدی ببڕای بڕ، تا سەلاحەددین لە ژیاندا مابوو، جارێکی دی، بیریان لەو بەزمە نەکردەوە، ئەوان ئەو فکرەیان هەر لەسەردا کەمو زۆر مابوو، ئەوەبوو، چارەکە سەدەیەکیش بەسەر مردنی سەلاحەددیندا تێپەڕی، ئنجا دووبارەیان کردەوە.

**٢ـ قایمکاری (الکرك)و گەمارۆدانی یەك لە دوای یەکی (الکرك):**

(الکرك) کەوتە دەست میری خاچدروشم (ڕیجنالد). ڕینۆدی شاتیۆن.، کە سەرچاوە عەرەبییەکان بە (أرناط) ناوی دەبەن. ئەم کابرایە لەوەو پێش لە ساڵی (٥٥٥ك/ ١١٦٠ز) دا، لە لایەن نوورەددین مەحمودەوە گیراو بۆ ماوەی پازدە ساڵ بەدیلی مایەوە، ئەو کاتە گیرا کە هێشتا حوکمی (أنطاکیە)ی دەکرد. پاشان (سعدالدين كمشتكين) و حوکمبەدەستانی موسڵو حەڵەب، لە ساڵی (٥٧١ك/ ١١٧٥ز)[1235]دا، لە ڕکی سەلاحەددین. کە ناحەزبوون. لە بەندیخانە ئازادیان کرد. (أرناط) یەکسەر، چوو بۆ (الکرك)و بێوەژنە حوکم بەدەستەکەی ئەو شارەی مارەکرد، کە پێشتر ژنی میرێکی خاچدروشمان بوو، ئیدی، بەرە بەرە، خۆی کرد بە حوکم بەدەستی شارەکە. (أرناط) خەڵك دەیناسی، کە زۆر ڕکی لە موسڵمانان بووە، نەخاسمە، کە ماوەیەکی دوورودرێژیش لە بەندیخانەی موسوڵماناندا مابووەوە. جگە لەوەش، ئەم کابرایە لەو سوارچاکانە نەبوو، مانای شەرەف بزانێو ئاکاری سوارچاکی بفامێو پێوەی پابەندبێ، کابرا، لە بۆ دزیو تاڵانو چەپاوڵو دەستدرێژیی بەولاوە بە کەڵکی هیچی دیکە نەدەهات[1236]. مێژوونووسێکی ئەوروپایی[1237] باسی دەکاو دەڵێ: "نموونەی سوارچاکێکی جەردەو دزە، لە زەمەنێکدا پڕ بووە لە چاوچنۆکیی و بێوەفاییو نەمەکبەحەرامی و سەرونکردنو لەپشتەوەکوشتنو دڕندەیی و دەمارگیریی کوێرانە، پازدە ساڵی ڕەبەقی دیلیو ئەسیری لە حەڵەب، نەیتوانی ڕەفتاری چەوتی ڕاست بکاتەوە، یان نەختێ باشتری بکا". (أرناط) لە هەموو پێشەواو پێشەنگەکانی دیکەی لاتین سەرکێشترو ترساوەرترو غەددارترو شەڕانیتر بوو.[1238]"خەڵك دەیانناسی، دەیانزانی کاتێ بەڕێگادا بڕۆیشتابا ڕووی کرژو مۆن دەکرد، خەڵك لێی دەترسان، بڕواو ئیمانی بە زۆربەی زۆری شتەکان نەبوو، هەند سەختو دڵڕەقیش بووە، بە تەنگ هیچ شتێکەوە نەبووەو گوێی بەمردنیش نەداوە.. بە شمشێر زەلامی سەردەبڕی، لێ بڕابا، جەردە هەی جەردە، ڕێگای لە خەڵکی دەگرتو چەتەیەك بوو بۆ خۆی".[1239]

وەنەبێ سەلاحەددینش، لە ڕکی ڕەفتاری بێ شەرمیی ئەم (أرناط)ە، چەندین جار (الکرك)ی گەمارۆدابێ، نەخێر لەبەرئەوە نەبووە، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو، کە (الکرك) قایمکارێکی سەختەو جێگایەکی گرنگیشی لەسەر ڕێگای نێوان میسرو شامدا هەیە، ئەمە، سەرباری ئەوەی کە (أرناط)، چ لەسەر بەژ، چ لە دەریای سووردا، چاوی لە زێدەڕۆیی و پێ درێژکردن بڕیبوو، هەوڵی داگیرکردنی (ایلە)ی سەر کەنداوی دابوو، ئەمانە هەمووی لەولاوە بوەستێ، کابرا بە تەمابوو

---

1233 الکامل، ٤١٣/١١. أحمد بن زيني دحلان، الفتوحات الاسلامية، ط/ مؤسسة لحلبي، القاهرة، ١٩٨٦، ج١، ص٤٤٤.

1234 الکامل، ٤١٤/١١.

1235 الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٥١.

1236 د. عاشور، الحركة الصليبية، ٧٨٥/٢.

1237 King , The kninghts Hospitallers, P.111.

1238 فيليب حتي، تأريخ العرب، ص٧٣٧.

1239 هارۆڵد لامب، شعلة الاسلام، ص٩٤.

حەرەمەینیش داگیربکاو هەموو جیهانی ئیسلامی تۆقاندبوو.[1240]

جا، لەبەر جێگەی گرنگو ستراتیجی (الكرك)، نوورەددینو پاش ئەویش سەلاحەددین، هەر بە تەمای بوونو بەرلەوەش (أرناط) ببێ بە خاوەنیو سەرگەورەی شارەکە، سوپای ئیسلام چاوی لێ نەتروکاندووە. نورەددین چەند جاران ویستی داگیری بکاو خۆی بۆ سازدا، بەلام بۆی نەلوا، پاشان لەگەڵ سەلاحەددین. کە جێگری بوو لە میسر. دووبارە هەوڵیاندا شارەکە بگرنە دەست، وەلێ بارودۆخ نالەبارهات، نەکراو پرۆژەکەیان تەواو نەکرد. پاشان نورەددین مردو سەلاحەددین بڕیاریدا، لەسەر ئەم ئیشە بەردەوام بێو وازی لێ نەهێنا، ئنجا لە ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٣ز)دا، سەلاحەددین بە سوپای شام گەمارۆی داو (الملك العادل)ی برایشی بە سوپای میسرەوە هاتە یاریدەی، بەلام ئامرازو ئامێری گەمارۆیان کەم بوو، بەشی ئەو کارە گەورەیەی نەدەکرد، هەرچەندیشە بە حەوت مەنجەنیق شەو ڕۆژ بێ وچان بەردەبارانیان دەکرد، ئەمجارەش گەمارۆکە سەری نەگرتو بە ئەنجام نەگەیشت.[1241]

دواجاریش لە ساڵی (٥٨٠ك/ ١١٨٤ز)دا، تەکانێکی تری بۆدا، ئەم جارەشیان بەدەردی جارەکانی تر چوو و هیچی لێ پەیدا نەبوو، هەرچەندیشە هێزێکی میسری بە فەرماندەیی (تقی الدين عمر)و هێزێکی ولاتی جزیرەش بە فەرماندەی (نورالدين محمد بن قره أرسلان)[1242] لەگەڵیدا بەشدارییان کردو هێزێکی تری حەڵەبیش بە فەرماندەیی (الملك العادل) گەیشتەجێ و، ئەم هێزانە بە هەموویان ئەم قەلاو قایمکارە مەزنەیان گەمارۆداو تەنگەتاویان کردو، سەلاحەددینیش فەرمانی دا ئنجا مەنجەنیقەکان ببەنە دەوری شارو لە نزیکەوە بەردبارانی بکەن، وەلێ کوشتار تا دەهات گەرمتر دەبوو، بەلام سەربازانی سەلاحەددین گوێیان پێ نەداو مەنجەنیقەکانیان گەیاندە دەوری شارەکەو هەموو دەوروبەری شارەکەیان داگیر کرد، بەلام قەلای قایمکار هێشتا ملی نەدا، لە نێوان پشتێنەی شارو قەلاکەدا کەندەکێ لێ درابوو، تابلێی قووڵ بوو، شەست گەزیش پان بوو، سەلاحەددین فەرمانی دا بەگڵو بەرد پڕی بکەنەوە، بەلام لەبەر چڕی تیرباران، کەس نەیتوانی لێی نزیك ببێتەوە، ئەوجا سەلاحەددین فەرمانی دا، کە بە خشتو دار کەپرێ دروست بکەنو بەژێریدا بڕۆنو بگەنە کەندەکە، ئەوەشیان کردو بەژێر کەپرەکەدا ڕۆیشتنو دەستیان کرد بە پڕکردنەوەی، مەنجەنیقەکانی خۆشیان شەوڕۆژ لەبەردبارانی قەلاکە بەردەوام بوون، ناچار خاچپەرستان داوای فریادڕەسیان لە فەرماندەی بەرزتری خۆیان کرد، تا لەم گەمارۆیە ڕزگاریان بکەن، ئەوجا سوپای ئەییوبیانیش ناچاربوون، دیسانەوە گەمارۆکە هەڵگرن. بەو جۆرە ئەم گەمارۆیەش سەری نەگرتو هێزەکەیان کشانەوەو بەرەو نابلس کەوتەڕێو، لەوێشەوە بۆ دیمەشق[1243]. بەلام سەلاحەددین وازی لە (الكرك) هەر نەهێنا تا داگیری کرد، ئەوەبوو، کە لە ساڵی (٥٨٤ك/ ١١٨٨ز)دا، لەشکری لە ژێر فەرماندەی (مير سعدالدين كمشبه) ناردەوە سەریو ئەم فەرماندارە، ئەمجارە، دەستی لە گەمارۆ بەرنەداو درێژەی پێ دا، تا ئازووقەو خۆراکی شارەکە کەوتە قاتو قڕیو "خەڵکەکە کەوتنە ولاغ خواردنو هەند سەبریان کرد، سەبریان لێ بڕا". ئیدی ناچار نامەیان بۆ (الملك العادل) نووسی. کە ئەوکات لە (تبنين) دادەنیشت. داوای دەخالەتیان کرد، ئەویش دەخالەتەکەی قبوڵ کرد.[1244] هەرچی خودی (أرناط)یشە، ئەوە، سەلاحەددین بە دەستی خۆی لە شەڕەکەی (حطين)دا کوشتی، بەو جۆرە ئەو نەزرەشی بەجێ هێنا کە لەوەپێش کردبووی.[1245]

**٣ـ گەمارۆی (بيت الأحزان):**

پێشتر گوتمان (بيت الأحزان) کەوتووەتە نێوان شاری دیمەشقو کەناری دەریاکەوە، خاچپەرستان لەوێ خۆیان قایم کردبوو. سوپای سەلاحەددین ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٧٩ز)دا، بۆی کشانو گەمارۆیان دا، ئەوجا مەنجەنیقگەلێکیان. کە

---

1240 ابن جبیر، ٣٤ـ ٣٥. مفرج الكروب، ٢/١٠٢. (لە بابەتێکی پێشتردا باسی ئەوەمان کردووە).

1241 الكامل، ١١/٥٠٢. ابن العديم ٣/٧٤.

1242 مضمار الحقائق، ١٨٨. الكامل، ١١/٥٠٦.

1243 الكامل، ١١/٥٠٧. زبدة الحلب، ٣/٧٨. النوادر، ٦٦. الروضتين، ٢/٥٤ـ ٥٥. مفرج الكروب، ٢/١٥٧. السلوك، ١/٨٤.

1244 الكامل، ١٢/٢٠ـ ٢١. الفتح القسي، ٢٦٦. الروضتين، ٢/١٣٤. زبدة الحلب، ٣/١٠٧.

1245 الكامل، ١١/٥٢٨. النوادر، ٧٨. الفتح القسي، ٨١.

له دارەکانی ڕەزو باغی (صفد) دروست کردبوو. لیّ دابەستو شەڕ گەرم بوو، هەندیّ لە سەربازان لە دیواری ڕووکاری (باشورة)[1246]ی قەلاّکە بەسەرکەوتنو کردیانە شەڕی دەستەویەخەو، ئەم دیوو ئەو دیوی ڕووکارەکەیان کۆنترۆڵ کرد. بەلاّم کە شەو داهاتو دنیا تاریك بوو، موسوڵمانان ترسی ئەوەیان لیّ نیشت خاچدروشمان دەرگاکانی قەلاّکە بکەنەوەو لە ناکاو پەلاماریان بدەن، کەچی خاچدروشمان شەو کڕو بیّ دەنگ بوون، وەلیّ لە پشت دەرگاکانەوە (لەناوەوە) ئاگریان کردەوە، تا لە شەڕی موسوڵمانان دڵنیابن، گوتیان، "تەنیا کونی تاوەرەکە ماوەتەوە".

کە بەیانی بووەوە، سەلاّحەددین لاتەنیشتەکانی تاوەرەکەی بەسەر میرەکاندا دابەش کرد، (عزالدین فرخشا)ی برازای، بەری لای قیبلەی وەرگرت، سوڵتان، خۆی بەری لای باکووری وەرگرتو تەنیشتەکانی تری دا بە (ناصر الدین محمد بن شیرکۆ)ی ئامۆزای و، (تقي الدين عمر)و[1247] میرەکانی دیکەی سوپا. تاوەرەکە گەلیّ پتەوو سەخت بوو، چەندی کردیانو کۆشایان بۆیان کون نەکرا، ئەوجا کونەکەیان قووڵترو فراوانترکردو ئاگریان دا. دوو ڕۆژ چاوەڕێیان کرد، تاوەرەکە هەند پانو پتەوبوو، نەکەوت. ئەوجا سوڵتان فەرمانی دا، ئاگرەکەیان کوژاندەوەو دەستیان بە کونکردن کردەوە. بۆ کوژاندنەوەو قەمراندنی ئاورەکەش، سوڵتان گوتی: "هەرکەسیّ کوندەیەك ئاو بهێنیّ دیناریّکی دەدەمیّ"، ئیدی خەڵك شانیان پێوەناو، پڕیان کرد لە کوندە ئاوو بەسەر ئاگرەکەیاندا کرد تا ڤەمراندیان، ئنجا کونکردن درێژەی کێشا، تا تاوەرو قەلاّکەش ڕووخاو سەربازان خۆیان پێداکردو وەژوورکەوتن "بەکوشتنو بە دیلگرتن تێیانکەوتنو سەد پارچە چەکی ئاسنینیان گرتو هێنایانو دیلەکانیان بردەنە لای سوڵتان، ئەوی گومڕاو ئەوی تیرەنداز بوو، لە ملی درا. زۆربەی دیلەکانیش بە دەستی سەربازە تەوعیەکان کوژران"[1248]. هەرچی دیلە موسوڵمانەکانی لای خاچدروشمانیشە، ئەوانیش ئازادکران، "ئەم شەڕە دوو هەفتەی خایان".[1249]

خراپیش نییە، باسێکی ئەندازەو پێوەرەکانی ئەم قەلاّو قایمکارە بکەینو،. کەمو زۆر. تێبینییەك لە سەر ئەم جۆرە قایمکارانە وەربگرین کە خاچدروشمان لە سەر خاکی موسوڵمانان بنیادیان ناوە. لە نووسراوێکی (القاضي الفاضل)دا، کە بۆ خەلیفەی عەبباسیی نووسی، وەسفی ئەم قەلاّیەی کردووە، دەڵیّ: "پانایی دیوارەکەی لە دە گەز زیاترە[1250]و درێژیی هەر بەردیّ لە بەردەکانیشی حەوت گەزەو بیست هەزار بەردی وەهای تێدا کارکراوەو نێوان بەردەکانیش بە گەچ سواغ دراوەو قایم کراوە، شوورەکەشی جووتە دیوارەو نێوان ئەم دوو دیوارەش بە بەردی چیم (الصم) پڕ کراوەتەوە"[1251].

**٤ـ گەمارۆدانو گرتنی (عکا) لە لایەن سوپای ئەیوبیانەوە:**

جێگەی (عکا): عکا، کەوتووەتە جێگایەکی ستراتجییەوە لەسەر کەناراوی شامو فەلەستین، بەتایبەتیش جێگاکەی بۆ پاشانشینی (بيت المقدس) زۆر گرنگ بوو. بەسەر نیمچە دوورگەیەکی بچووکیشدا دەڕوانیّ، بەرەو خوار دەکشیّ، تا ناو شاری حەیفاو دەریای ناوەڕاستیش لە باشوورو لە خۆرئاواشەوە سنووری داوە، لە دووریشەوە سەیری بکەی، هەردەڵێی لەپ و مشتێکی کەناراوەکەیە قوت بووەتەوە.[1252]

لە ڕووکاری دەریاکەوە، شوورەیەکی قایمو پتەوی هەیەو، بەربەستێکی شەپۆلیش بە درێژی دەڕواو بەرەو باشووری خۆرهەلاّت بادەداتەوەو دەگاتە تاوێرێکی گەورە، تاوەرێکی بەسەرەوەیە، بە (برج الذبان) بەناوبانگ بوو، بەندەرەکە

---

1246 الباشورة: دیواری ڕووکاری دەرەوەی قەلاّکەیە، کاتی شەڕ، سەربازان لە پشتەوەی خۆیان حەشار دەدەن. مفرج الكروب، ٨١/٢. (هامش/ ١).

1247 مضمار الحقائق ٢٧ـ ٢٨. سنا البرق الشامي، ٣٣٤/١ـ ٣٣٥. الروضتين، ١١/٢. مفرج الكروب، ٨١/٢.

1248 سنا البرق، ٣٣٦/١. الروضتين، ١١/٢. مفرج الكروب ٨١/٢.

1249 مضمار الحقائق، ٣٠. الروضتين، ١١/٢. البداية والنهاية، ١٢/ ٣٠٣. السلوك ٦٨/١.

1250 له (الكامل)دا ١١/ ٤٥٧، (هاتووە، دەڵی: نۆ گەزی بوخاری بووە، کە هەر گەزێکی ئەکاتە گەزو نیوێك).

1251 الروضتين، ١٠٣/٢. مفرج الكروب، ٨٤/٢ـ ٨٥. البداية والنهاية، ٣٠٤/١٢.

1252 هارۆڵد لامپ، شعله الاسلام، ص١٧١.

کەوتووەتە پشت ئەو بەربەستەوەو لە باکوورو ڕۆژهەڵاتیشەوە دوو شوورەی مەزن، شارەکە دەپارێزن و بەگۆشەیەکی وەستاو لە نزیك قەڵاکارێکی بچووکدا یەك دەگرنەوە. ئەم قەڵاکارە بچووکەش بە (البرج الملعون) بەناوبانگ بوو. لەلای باکووری ڕۆژهەڵاتەوەو لە هەرسەرێکی هەردوو شوورەکەشەوە، نزیك بە کەناراوەکە، هەر لەسەر وشکانییەکە، دوو دەرگا هەن، شارەکەش لە ڕووکاری دەریاوە، دەرگایەکی زۆر گەورەی هەیە، بەلای بەندەرەکەدا دەکرێتەوەو دەرگایەکی دیکەش بەسەر لەنگەرگای گەمیەکاندا دەڕوانێ[1253].

سەلاحەددین، دوای سەرکەوتنەکەی (حطین) و گرتنی ئەم ناوچەیەش خووی پێوە گرتبوو، هاموشۆی دەکردو سەری لێ دەداو خولیای ئەوەبوو چارەسەری ئەو کاولکارییە بکات، کە لە شەڕو کوشتاری ئەو ناوەدا کەوتبووەوە، تا بوو بە قەڵاو قایمکارێکی سەختو، تیپێ پاسەوانی بەهێزی بەدیارەوە دانراو خاروباری زۆری بۆ فەراهەم کراو هەندەش بەهێزکرا، توانیی نزیکەی دووساڵ پەنجە پەنجە لەگەڵ خاچدروشمان بکا. ڕاستیشت دەوێ (عکا) هەر لە مێژەوە قایمو بەهێزکرابوو، ئەوەبوو کاتێ (ابن طۆلۆن)ی حوکمڕانی میسر لە ساڵی (٢٥٤. ٢٧٠ك/ ٨٦٨. ٨٨٣ز)دا، سەری لە شاری (صور) داو چاوی بە شوورە قایمە خڕەکەی کەوت، ئەوجا کەوتە سەر هەوەسی ئەوە، شوورەیەکی وەها بۆ (عکا)یش بنیاد بنێ[1254].

کاتێکیش (ناصر خسرو) لە ساڵی (٤٣٨ك/ ١٠٤٧ز)دا، گەیشتە (عکا) قەڵایەکی تێدا بەرچاوکەوت "تابڵێی قایم، هەردوو لای ڕۆژئاواو باشووری، بەسەر دەریاکەدا دەڕوانن و، ئەمەی دواییمیان بەندەرێکی لەسەرە، هەردوو دیوارەکەشی کشاونەتە ناو دەریاکەو دەرگایەکی تێدایە پەنجا گەز درێژەو هەردوو دیوارەکەش زنجیریان لە نێواندا بەستراوە، ئەگەر گەمیەکیان ڕێ دابا بچێتە ناو بەندەرەکە، زنجیرەکەیان شل دەکردو دەکەوتە بن ئاوەکەو گەمیەکە بەسەریدا تێپەڕدەبوو، پاشانیش زنجیرەکەیان وەك خۆی توند دەکردەوە تا دوژمن نەتوانێ بیگاتێ و زیانی لێ بدا،[1255] واتا هەروەك ئەوەی زارکی (دمیاط)ی میسر. (إبن جبیر) ئەم شارەی بە شاری (قوستەنتینیە) چواندووەو دەڵێ: بنکەی شارەکانی فەرەنگە لە شام و قەرارگاو لەنگەرگەی گەمیە بەرزەکانەو بەندەری هەموو کەشتییەکانە، شەقامەکانی زۆر جەنجاڵەو لەهەموو لایەکەوە بازرگانانی موسڵمان و کرستیانی تێ دا یەك دەگرن و خڕدەبنەوە. ئەم گەڕۆکە لە (جمادی الآخر)ی ساڵی (٥٨٠ك/ دوا دوای هاوینی ١١٨٤ز) دا، سەری لەم شارەداوە، کە هێشتا هەربەدەست خاچدروشمانەوە بووە، واتا سێ ساڵ بەرلەوەی سەلاحەددین ئازادی بکا، لەبەرئەوەیە، کە دەڵێ: "ئاگری کوفر و زوڵمی لێ هەڵدەسێ و لە هەموولایەکەوە گۆشتی بەرازە دەکولێ و پرە لە خاچ"[1256].

پاش (حطین) سەلاحەددین لە خاچدروشمان نەوەستاو هێزە سەرکەوتووەکانی خۆی بەرەو شاری (عکا) خستەڕێ، ئەم کارەش، نیشانەیەکە لە نیشانەکانی زیرەکی و قاڵبوونی سەربازیو دووربینیی ئەم پیاوە، چونکە یەکەم جار بە داگیرکردنی شارگەلی کەناراوەکانەوە دەستی پێ کردو دەیویست خاچدروشمان لەو بنکە سەربازییە گرنگانە دابڕێ، کە بە ئاسانیی پێوەندییان لەگەڵ ئەوروپادا ئاسان دەکرد، هەروەها دەیوست لەوڵاتی شامیشدا، دەنگیان بەهیچ لایەکدا نەگاو، لەناو گەمارۆدا، وەك دیل داماوبن و بە ئاسانیی شار بە شارو قەڵا بە قەڵایان لەوڵاتی شامدا ئازاد بکا. ئەمە جگە لەوەی، کە بە گرتنی شاری (عکا)و زارك و بەندەرەکانی دیکەی شام، پێوەندیو هاتوچۆی نێوان هەردوو هەرێمی میسرو شامی دەوڵەتەکەی خێراترو نزیکترو چاکتر دەبوو.[1257] لەبەرئەوە ماوەی دوو مانگ و نیوی یەکسەر پاش (حطین) بە رزگارکردنی ئەم شارانەوە بە سەربرد، ئەوەشی پێ چاکتر بوو لە (عکا)وە دەست پێ بکا، ئەم شارە

---

[1253] رنسیمان، ٣/٥٤– ٥٥.

[1254] معجم البلدان، ١٤٣/٤. القزويني، آثار البلاد، ٢٢٣.

[1255] سفرنامە، ص٥١.

[1256] ابن جبیر، ص٢٧٦.

[1257] د. عاشور، الحركة الصليبية ٨١٣/٢.

مێژوونووسان وەسفی دەکەن و دەڵێن: "عکا دایکی شارەکانەو خوشکی شاری ئێرەمە".[1258]

ڕاستیشت دەوێ، ئەم شارە هەند بێ خەمو بەختیار نەبوو، زەلامی زۆری شارەکە چوو بوون بۆ شەڕی (حطین)و زۆریان لێ کوژرابوون و گەلێکیشیان بەدیل گیرابوون. بەلام (الضجیل الثالث جوسلین دی کورتنای) کە حوکمڕانی شارەکە بوو، لەگەڵ چەند فەرمانداریێکی دیکەی بە نموونە، وەك (ڕیمۆند)ی سەرگەورەی (طرابلس). کە لە مەیدانی شەڕەکە ڕایکردبوو. توانیبوویان ڕزگاریان ببێ، بەلام ڕیمۆند، برادەرەکانی هەند تانەو تەشەریان لێ دا، لەخەفەتا مرد. هەروەها (بالیان بن بیرزان. یان بارزانی دووەم)یش ڕزگاری بوو، پاشان خۆی گەیاندە قودس و، لەوێ ڕابەرایەتی خاچدروشمە بەرهەڵستارەکانی دژ بە سوپای ئەییوبی گرتە دەست.

هەرچی (جوسلین)ە، ئەوە، ئەو نەیتوانی بەر بە سوپابگرێ و، بەوە قایل بوو شارەکە تەسلیم بە سەلاحەددین بکا، بەمەرجێ سەروماڵی مەسیحییەکانی شارەکە بپارێزێ. سەلاحەددین ئەو مەرجەی قبوڵ کردو، لە بەرایی (جمادی الأولی)ی ساڵی ٥٨٣ك/ دەی تەمموزی (١١٨٧ز)دا شاری (عکا)ی گرتە دەست، بە ئومێدی ئەوەش بوو بازرگانە مەسیحییەکان قایل بکا، لە شارەکەدا بمێننەوە، بەلام لەبەر ترسی دواڕۆژ نەمانەوەو بە خۆیان و بە بارو بارگەی گواستەنییان، شاریان بەجێ هێشت و ڕۆیشتن.[1259]

بەلام کۆگاگەلی گەورە گەورەی پڕ لە شمەکی بازرگانی و ئاوریشم و کانزاو چەك، کە ئەو بازرگانانە جێیان هێشت هەند زۆر بوون "لە ژماردن نەدەهاتن"[1260] چونکە (عکا) هەر جێگاو پێگەی بازرگان بووە.[1261] ئەو شمەکانە هەر هەمووی بەسەر میر لەشکرەکاندا دابەشکران، بەتایبەتیش (الملك الأفضل نورالدین علی)ی کوڕی سوڵتانی گەورە، کە حوکمی شارەکەی گرتە دەست.[1262]

**٥- گەمارۆدان و گرتنی (بیت المقدس)**

غەزای (بیت المقدس) ڕووداوێکە لە شەڕە شوورە شکێنە گرنگەو زەینڕاکێشەکانی مێژووی جەنگەکانی خاچدروشمان، کە لە سەردەمی سەلاحەددین ڕووی دا، چونکە ئەم شارە، بەلای موسڵمانانەوە شارێکی پیرۆزەو یەکەمی دوو قیبلەکەیەو حەرەمی سێیەمیشەو (میعراجی) پێغەمبەریشی تێدایە، لەبەرئەوە بە سەندنەوەی ئەم شارە، موسوڵمانان زۆر کەیفخۆش بوون.

ئەنجامی سەرکەوتنەکەی (حطین) ئەوەبوو، ژمارەیەکی زۆر لە چاکترین جەنگاوەرانی خاچدروشمان کوژران و زۆرێکیش بە دیل گیران و ئەو ژمارە کەمەشیان کە مانەوە، بۆی دەرچوون و نەگیران. ئەوەش بوو بە هۆی ئەوەی، کە ژمارەی سوارچاکانی جەنگاوەریان زۆرکەم ببێتەوە، بە تایبەتیش لەوانە شانشینی (بیت المقدس)، کە شەڕەکەی (حطین)یشی تێدا هەلایساو (جی لوسینیان)ی شایان، بەدیل گیراو، ناوو ناوبانگی شانشینەکەو دەسەلاتی شایەکەشیان لەکەداربوو "خاچدروشمان هەند بە زۆری کوژران و بریندداربوون، ئەو کەسەی کوژراوەکانی دیتبا، دەیگوت کەسیان بەدیل نەگیراوە، ئەو کەسەشی سەیری دیلەکانی کردبا، دەیگوت کەس نەکوژراوە".[1263]

(إبن الأثیر)ی مێژوونووس، دوای ساڵێ لەو سەرکەوتنە گەورەیە، بە (حطین)دا تێپەڕی، "دیتی ئەو مەیدانە پڕە لە ئێسك و پروسکی خاچدروشمان، هەر لە دوورەوە بەدی دەکران، هەندێکیان لەسەریەك کۆمەڵ کرابوون، هەندێکیشیان تاك و تەرا بوون، ئەمە جگە لەوانەش کە لافاو ڕایماڵیبوون، یان دڕندەی ئەو هەردوو بەردە بردبوونی".[1264]

---

1258 الروضتین، ٢/٨٩. الذهبي، مخطوط، تأريخ الاسلام، ورقة ٩/ أ.

1259 الكامل، ١١/٥٣٠.

1260 الكامل، ١١/ ٥٣٩. النوادر، ٧٩. الروضتین، ٢/٨٦.

1261 النوادر، ٧٩. الروضتین، ن. ص.

1262 الكامل، ١١/٥٣٩. مرآة الزمان، ٨/٣١٤.

1263 الكامل، ١١/٥٣٦. الروضتین، ٢/٧٨. مفرج الكروب، ٢/١٩٣.

1264 الكامل، ١١/٥٣٧.

ئەمە، هەمووی ئەو زەرەرو زیانە گەورەیەمان بۆ دەردەخات، کە لە خاچدروشمان درا. ئەو شارانەشیان. کە هەتا ئیستا داگیریان کردووە. ئیوە چۆڵە، وەلێ ئەوان زیاتر لەوە دەترسان (بیت المقدس)یان لە دەست دەرچێ. یەکێ لەو میرانەی لە (حطین) بە سەلامەتی مانەوە، میر بالیانی دووەم (بالیان ابن بیرزان) بوو (کە سەرچاوە عەرەبییەکان بەو ناوەوە ناوی دەبەن). ئەم بالیانە سەرگەورەی (الرملە)بوو، "پلەو پایەی لەلای خاچدروشمان وەك پلەو پایەی شا وەها بوو"[1265]. بالیان، شاژن (ماریا کومتین)ی مارە کردبوو، کە بێوەژنی لە پاش بەجێماوی شا (أموری یەکەم) بوو. بالیان، کە دیل بوو لای سەلاحەددین، تکای کرد ئیزنی بدا، بچێ بۆ قودس و خێزانەکەشی بهێنێ و بگەڕێتەوە، سەلاحەددینیش قایل بوو، بەمەرجێ لەیەك شەو زیاتر لە قودس نەمێنێتەوە، بالیانیش بەو مەرجە قایل بوو، بەلام هەرکە گەیشتە قودس، دیتی قودس لە بارودۆخێکی خراپدایەو خاچدروشمانی شارەکە لە خەفەتی قڕبوونی جەنگاوەرەکانیان لە (حطین) هەموو بە جارێ ورەیان بەرداوەو داتەپیون. بەلام هەندێ سوارچاکی پێشکەوتوویان هاتبوونە شارەکەو پاشانیش خەڵکێکی زۆری تێدا کۆبوونەوەو گەیشتنە شەست هەزار کەس[1266]. هەر هەموو شیان مردنیان پێ خۆشتر بوو لەوەی، کە موسڵمانان قودس وەربگرن و لەوانی بستێنن، حەزیشیان دەکرد بە سەرو بە ماڵ و منداڵەوە، خۆیان لە ڕێگەی قودسدا بەخت بکەن. لەبەرئەوە تا بۆیان کرابێ و لە دەستیان هاتبێ، بۆ قایمکردنی قودس، کەوتنەکۆشش و درێغییان نەکرد، لە شوورەکان بەسەرکەوتن، بە هێزی باسك و چەکی ئاسن خۆیان تەیارو ئامادەکردو، هەمووی بە جارێ بڕیاریان دا وزەو توانستی خۆیان بۆ پاراستنی شارەکە تەرخان بکەن و بەعەزمو جەزمەوە خەباتی بۆ بکەن، ئنجا مەنجەنیقی زۆریان سەرخستە سەر شوورەکان، بۆ ئەوەی نەیەڵن کەس سەرکەوێ و نزیکی بکەوێتەوە[1267]. هەند ئیشی قایمکارییان بە سەر شوورەکانەوە کردبوو، کاتێ ئەییوبییان بەسەرکەوتن، زەلامگەلی ئەوتۆیان چاوپێکەوت، سەریان سووڕدەما. خاچدروشمان بەرەڤانییەکی قارەمانانەیان لەم شارە کردو میرێکیشیان لە میرانی ئەییوبییان کوشت "کۆمەڵێ جەنگاوەریشی لەگەڵدا بوون، ئەوانیش کوژران، موسوڵمانانگەلێ بۆی بە پەرۆش بوون و کوژرانی ئەو میرەیان بە کارەساتی گەورە لەقەڵەم دا". بەلام سوپای سەلاحەددین نەوەستاو بەرەو ئامانجی خۆی هەر بەرەو پێش تەکانی دەدا، تا وەدەستی هێنا.

سەلاحەددین و میرەکانی بە شوێن جێگایەکدا دەگەڕان، لەبارێ، ئۆردوگای لەسەر سازبدەن، هەستان تا پێنج ڕۆژی ڕەبەق، بۆ ئەو مەبەستە هەموو دەوروبەری شارەکەیان خستە ژێرپێ، تا سەرەنجام لە باکووری شوورەکەوە جێگایەکیان بەرامبەر دەرگای (عمودا) و کڵێسەی سەهیۆن، بەگەن کردو لە (٢٠)ی ڕەجەبی ساڵی ٥٨٣ك/ ١١٨٧ن)دا، ئۆردوگای بۆ ئەوێ گواستەوەو لێی دامەزراو هەرکە شەویش داهات دەستیان کرد بە نانەوەی مەنجەنیق و[1268] بۆ سبەی بەیانی زوو سوپای سەلاحەددین دەستی کرد بە بەردهاویشتن و ئاگرباران. وەلێ خاچدروشمان دەستەوەستان نەبوون، ئەوانیش مەنجەنیقیان بردە سەر شوورەکان و خستیانەکارو، بەگەرمیی کەوتنە شەڕەوەو "هەر گرووپێکیش ئەوەی بە قەرزی ئەستۆی خۆی دەزانی و بە ئەرکێکی پێویستی خۆی دەزانی و هیچ مەبەستی لە سوڵتان و لەبەرخاتری سوڵتان نەبوو، بەڵکو قەدەغەش دەکران هەر دەچوون و گوێیان لەکەس نەدەگرت و دوانەدەکەوتن و هەر دەچوون"[1269]. لە هەردوولا، هەندێ لە جەنگاوەران کوژران، یەکێ لەو کوژراوانە میر (عزالدین عیسی بن مالك)ی کوڕی سەرداری قەلای (جعبر) بوو، بە مردنی ئەویش موسڵمانان تەواو نیگەران و پەرێشان بوون، هەندەش تووڕەبوون، هەر هەموویان، یەك دەست و یەك دڵ، کەوتنە پەلامارو فەڕەنگیان لە سەنگەرەکان ڕاماڵی، تا گەیشتنە کەندەکەکەو بە شوورەی شارەکەوە نووسان و

---

1265 الكامل، ٥٤٦/١١. مفرج الكروب، ٢١١/٢.

1266 النجوم الزاهرة، ٣٦/٦. الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ٩/ب. السلوك، ٩٦/١. شفا القلوب، ١٢٨. العليمي، الأنس الجليل، ٣٢٨/١.

1267 الكامل، ٥٤٧/١١.

1268 النوادر، ٨١. الكامل ٥٤٦/١١. الروضتين ٩٢/٢. النجوم الزاهرة، ٣٦/٦. شفاء القلوب، ١٢٨.

1269 الكامل، ن، ص. مفرج الكروب، ٢١٢/٢.

کەوتنە کونکردنی، تیرەندازانیش لە پشتەوە دەیانپاراستن، مەنجەنیقەکانیش لێگا لێگا دەیکوتاو خاچدروشمانی لە شوورەکە دەرەتان.

گەورە خاچدروشمان، کاتێ کوشتارەکەیان بەم توندییە دیت‌و خەریکە لەناوبچن، کۆبوونەوەیەکیان لەناوخۆدا سازدا بۆ تەگبیرو ڕاوێژ، پاشان هاتنە سەر ئەوە داوای دەخالەت بکەن‌و قودس بەدەستەوە بدەن. ئنجا شاندیان بۆ لای سەلاحەددین نارد دەخالەت بکەن، بەڵام سوڵتان قایل نەبوو، چونکە هەندەی نەمابوو بە زۆری شمشێر بچێتە ناو شارەکە، گوتی: "هەر ئەوەتان لەگەڵدا دەکەم، کە ساڵی چوارسەدو نەوەدو یەك شارەکەتان گرت‌و لەگەڵ خەڵکەکەیدا بە کوشتن‌و تاڵان‌و گرتن‌و بردنی ئافرەتان، کردتان. سزای خراپەش هەر خراپەیە". [1270] شاندەکە دەست لە گونان درێژتر گەڕایەوە بۆ لای (بالیان بن بیزان)، ئەمیش لە داوای دەخالەت زیاتر هیچی پێ نەکراو داوای کرد چاوی بە سەلاحەددین بکەوێ، داواکە قبوڵ کرا. کاتێ گەیشتە لای سەلاحەددین کەوتە پاڕانەوەو داوای لێ بووردن و شەفەقەتی لێکرد، بەڵام هیچ سوودی نەبوو، کە نائومێدیش بوو، ئنجا گوتی:"سوڵتانم، ئێمە لەم شارەدا خەڵکێکی زۆرین، بۆیەکیشە لە کوشتار ساردبوونەتەوەو داوای دەخالەت دەکەن، وا دەزانن.وەك خەڵکی دیکە.لەمانیش دەبووری"[1271].

بەم کردارو ڕەفتارە جوان‌و مرۆدۆستییەی سەلاحەددیندا، وا دەردەکەوێ کە ئەم سیاسەتە نەرم‌و بە سۆزو لێ بووردەییەی بەرامبەر بە خاچدروشمان‌و، ئەم داڵدەدان‌و دەخالەت قبووڵکردنەی، ئەم ڕەحم‌و دڵفراوانییەی لەگەڵ خەڵکی ئەو شارو قەڵاو قایمکارانەدا کە سوپاکەی گەمارۆیانی دابوو، ئەم ئاکارو ڕەفتارە چاکانەی لەگەڵ دوژمنانیدا کردی، بوو بە هۆی ساردکردنەوەی ڕك‌و قینەی جەنگاوەرانی خاچدروشم‌و قەناعەتی پێ هێنان، ئەگەر داوای داڵدەو ئەمانەت بکەن‌و دەخالەتی بۆ ببەن، ئەو لێیان قبووڵ دەکاو لێیان خۆش دەبێ. (بالیان) درێژەی بە قسەکانی داو گوتی: "جەنگاوەرانی خاچدروشم حەز بە مردن ناکەن‌و دەیانەوێ بژین، خۆ ئەگەر بشزانین، کە لە مەرگ زیاتر هیچ چارەیەکی تر نییە، دەسا بە خودا قەسەم، ئەگەر وابێ، ئەوە، بەر لە هەموو شتێ منداڵەکانی خۆمان بەدەستی خۆمان دەکوژین، ئنجا ژن‌و ئافرەتی خۆمان لە ناو دەبەین‌و ماڵ‌و موڵکمان دەسووتێنین‌و نایەڵین لە دیناریکەوە تا درهەمێکتان پێ ببڕێ، ناشیەڵین نە پیاوێکمان‌و نە ژنێکمان بە دیل ببەن، کە ئەوانەش هەمووی تەواو بکەن، ئنجا (الصخرة)و (المسجد الأقصی)یش کاول دەکەین، ئەوجا دەگەڕاینەوە سەر ئیسلامە بە دیلگیراوەکان‌و دەمانکوشتن،. کە پێنج هەزار دیلمان لایە. و هەموو ئاژەڵ‌و وڵاغی خۆشمان دەکوشت، پاش ئەمانە، وەك دڕندە تێتان دەکەوتین‌و شەڕێکی مان‌و نەمانمان دژتان بەرپادەکرد، سەوزو وشکی پێوە سووتابا، ئیدی ئەوکات کەسمان خوێنی بزر نەدەبوو، یان بە سەربەرزیی دەماینەوە، یانیش مردنێکی مەردانە دەمردین". [1272]

دوای ئەمە، سەلاحەددین ئەنجومەنی جەنگی خڕکردەوە، تا ڕاو ڕاوێژی خۆیان لەسەر داواکاریی (بالیان) بکەن‌و بڕیاری بە ئاوەزو لەباری بۆ بدەن. ئەنجومەنیش بەگشتی بڕیاریاندا داڵدە بدرێن‌و دەخالەتیان قبووڵ بکرێ، بەمەرجێ کامیان لە شارەکەدا بمێنێتەوە، ئەوە، بەدیل لەقەڵەم بدرێ، کامیشیان لە شارەکە بەدەرکەوێ، چ داراو چ نەدار، دەبێ دە دینار بدات، ژنیش دەبێ پێنج دینار بداو منداڵیش دوو دینار. سەلاحەددین بەرامبەر بە شارو قەڵاکانی دیکەش، هەر هەمان ڕێساو ڕەفتاری نواندو هەمان ئەو بڕە پارانەی بە سەردا سەپاندن[1273]، بۆ پارە دانەکەش چل ڕۆژ مۆڵەتی دەدان‌و ئەگەر لەو ماوەیەش ترازابا، دەکران بە بەندە (عەبد). سەرەنجام بەوەی کە پارە نەبوو، یان نەیدا، بە هەموویان گەیشتنە شازدە هەزار، بە پیاوو ژن‌و منداڵەوە، هەموویان بە دیل گیران[1274] و ڕۆژی هەیینی ٢٧ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٥٨٣ك/

1270 الكامل، ٥٤٨/١١. مفرج الكروب، ٢١٣/٢. ابن العبري، تأريخ المختصر الدول، ص٢٢١.

1271 الكامل، ن، ص.

1272 الكامل، ٥٤٩/١١. مفرج الكروب، ٢١٤/٢. ابن العبري، تأريخ الدولة السرياني ، مجلة المشرق، ٤، ٥، ص٤٤٦.

1273 النوادر ٩١.

1274 الكامل، ٥٤٩/١١ ـ ٥٥٠. الفتح القسي ١٢٧. الروضتين ٩٥/٢. العليمي، الأنس الجليل ٣٢٨/١.

١١٨٧ز، شارەكە درا بە سەلاحەددین، وا رێكەوت ئەو شەوە یادی شەوی (میعراج)بوو، بۆیە موسڵمانان زۆریان پێ خۆشبوو[١٢٧٥]. ئیدی بەو بۆنەیەوە، سەلاحەددین لەمسەر بۆ ئەو سەر شوورەكانی قودسی بە ئالای زەرد ڕازاندەوەو بووبە ڕۆژێكی پرشنگداری مێژووی سەلاحەددین.

ئا بەم جۆرە، سەلاحەددین لە ڕووكاری (حطین) و لەسەر دەروازەكانی قودس، بەو شێوەیەش كە خۆی دەیەوێ، تۆڵەی هەموو ئەو موسڵمانانەی كردەوە، كە لە شەڕەكانی پێشتری خاچدروشماندا كوژرابوون و سووكایەتییان دەرهەق كرابوو، كردیشی بە دەرسێكی مێژوو، كە فەرمانداری جوامێر چۆن چۆنی ئاهەنگ دەگێڕێ و ئەوەشی بە بەڵگەوە سەلماند كە وڵاتی ڕۆژهەڵاتیش خاوەن هێزو نازی خۆیەتی.[١٢٧٦]

ڕاستیشت دەوێ، ئەوەی لە غەزای قودسدا ڕووی دا، لە غەزای شارەكانی دیكەشدا هەر بەو جۆرە بوو، تەنیا جیاوازییەكی كەم نەبێ، كە ئەویش بە پێی بەرەڤانیی ئەم شارەكە، یان ئەو شارەكە ڕووی دابا.. سەلاحەددین، ئنجا كەوتە قایمكردنی قودس، تا جارێكی دی، دوژمن بۆی داگیرنەكرێتەوە، بە تایبەتیش دوای ئەو نەكسەیەی كە بە هۆی داگیركردنی شاری (عكا)و ڕووخاندنی (بیت المقدس)ەوە، بە سەر سوپای سەلاحەددیندا هات، ئەوەبوو كاتێ خاچدروشمان (عكا)یان داگیركرد، لایەكی (بیت المقدیس)یشیان ڕووخاند، چونكە لە (عكا)وە نزیكەو (عكا)یش بەشێكە لە (بیت المقدس). ئەمەش كاری كردە سەر ورەی خەڵكی شارەكە، چونكە لەوە دەترسان ئەوەی ریشارد شێردڵ بە سەر (عكا)ی هێنا، شارەكەی ئەوانیش وەها لێ بكا، بەڵام باشبوو هێزی میر (حسام الدین أبو الهیجاء السمین) لە میسرەوە گەیشتە ناوچەكەو خەڵكەكە ورەیان بەرزبووەوەو هۆشێكیان بە بەردا هاتەوە[١٢٧٧]. كاتێكیش سەلاحەددین هاتە شارەكە فەرمانی دا قایمكار بكرێ و شوورەكانی چاك بكرێتەوەو جێگا ڕزیوو كۆنەكانی تازە بكرێنەوە، ئەوجا كەندەكی بەدەوردا لێ دا، هەر تاوەرەشی سپارد بە میرێ چاكی بكاتەوەو هەموو میرەكان لەم بنیادنان و قایمكردن و شوورە تازەكردنەوەیەدا بەشدارییان كرد. (الملك الأفضل)ی كوڕی، لە لای دەرگای (عمودا) وە تا دەرگای (الرحمة)ی بەركەوت. (عزالدین مسعود)ی ئەتابەگیش لە موسڵەوە كۆمەڵێ وەستای گەجسازیی پسپۆڕو كۆمەڵێ بەردتاشی چاكی بۆ نارد. ئەمانە لەوێ تاوەرێكیان بونیادناو لەم كارەدا میرگەلی دیكەش كۆمەكیان پێكردن[١٢٧٨].

سەلاحەددین خۆیشی بە هێسترەكەی خۆی بەردی دەكێشاو بەردەكانیشی لە جێگای دوورەوە دەهێنا، بەو جۆرە بوو بە ڕابەر، خەڵكەكە خۆشیان دەویست و چاویان لێ دەكرد، بە تایبەتیش سەربازەكانی، "ئیشكەرو كرێكاری لەخۆی خڕكردەوە، ئەو ئیشەی بە چەند ڕۆژ تەواو ببوایە، ئەوان بە ڕۆژێ تەواویان دەكرد"[١٢٧٩]. تا شارەكەیان هەندێ قایمو سەخت كرد، ریشادر، زەفەری پێ نەبردو بۆی نەگیرا، هەركە بەمەیزانی وەسفی سەختی و قایمی شارەكەیان بۆ كرد، گوتی: "تا سەلاحەددین زیندوو بێ و ئەیبوبیان و موسوڵمانان یەك بن، ئەم شارە گەمارۆ نادرێ"[١٢٨٠].

**٦. گەمارۆ بەناوبانگەكەی شاری (صور):**

چیرۆكی هاتنی (مەركیز كۆنراد مۆنتفرات) بۆ شاری (صور)، پاش ئەوەی كە سەلاحەددین شاری قودس و (عكا)ی گرت، هەروەكو چیرۆكی هاتنی (بالیان) بۆ قودس وایە، وەلێ ئەو كاریگەرییەی لە هاتن و گەیشتنی (مەركیز) كەوتەوە، گەلێ قووڵتر و بە تینتر بوو لەو كاریگەرییەی لە هاتنی (بالیان) كەوتەوە. مەركیزی فەرمانداز، كاتێ گەیشتە شاری

---

1275 الكامل، ن. ص. النوادر، ٨٢. الفتح القسي، ن. ص. ابن العبري، تأريخ المختصر الدول،٢٢١.مفرج الكروب، ٢١٥/٢. السلوك، ٩٦/١. شفاء القلوب، ١٢٩. العليمي، الأنس الجليل، ٣٣٠/١.

1276 رنسيمان، تأريخ الحروب الصليبية، ٧٦٥/٢.

1277 الكامل، ٧٤/١٢. الفتح القسي، ٥٦٢.

1278 الكامل، ٧٤/١٢.الفتح القسي، ٥٦٤.

1279 الكامل، ٧٤/١٢.

1280 ن. م. ص٧٥.

(صور)، جەنگاوەرەکانی ئەو شارە ورەیان بەردابوو و هیچ ئومێدێکیان نەمابوو، تا خەریك بوون نامە بۆ سەلاّحەددین بنووسن‌و دەخالەتی بۆ ببەن‌و داوای داڵدەی لێ بکەن[1281] بەلاّم کە مەرکیز گەیشتە شارەکە، نەیهێشت ئەو کارە بکەن‌و، گیان‌و ورەی بە بەردا هێنانەوە، پاراستنی شارەکەشی بۆ زامن کردن‌و هەر سەروەت‌و سامانێکیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابووی بۆی بەخت کردن، بەمەرجێ شارەکەو دەوروپشتی شارەکە تەنیا بۆ خۆی بێت‌و بەشی کەسی پێوە نەمێنێ. خەڵکی شارەکە قبووڵیان کردو بەم مەرجەی قایل بوون، ئەویش ئەم بەڵێن‌و بەڵێنکارییەی پێ مۆرکردن. ئەوجا دەستی کرد بە ڕێکخستنی میکانیزمی بەرەڤانیی و قایمکردنی شارەکەو قوللەو سەنگەری چاك کردەوەو شوورەکانی بەهێزکردو وەهای لێ کرد زیاتر بەرگە بگرێ[1282]. پاشان کەندەکی لە ڕووکاری ڕۆژهەلاّتی شارەکە لێ دا، کە تەنیا لەو ڕووکارەوە شارەکە بە کەناراوەکە دەگەیی، ئەو کەندەکە لە دەریاوە. بە وشکانیدا. دەگەیشتەوە دەریاو شارەکە وەکو دوورگەی لێ هات‌و هەر دەتگوت گەمیەکەو لەناو ئاودا وەستاوە، کەس نەیدەتوانی بیگاتێ‌و لێی نزیك بێتەوە[1283].

ڕاستیشت دەوێ، خاچدروشمان بەر لەم ڕووداوە شاری (صور)یان قایمکرد. (إبن جبير) کە لە ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٤ز)دا، بۆ ئەمشارە هات، وەها وەسفی دەکاو دەڵێ: "شارێکە بۆ سەختی‌و قایمی نموونەیەو دەسدایی‌و گەدایی کەس ناکات‌و مل بۆ کەس شۆڕ ناکات، فەرەنگ بۆ ئەوە ئامادەیان کرد ببێ بە داڵدەی ڕۆژی لێقەومانیان‌و کردیان بە کاروانسەرای سەرسەلامەتیی خۆیان". (إبن جبير) لەسەری دەڕواو دەڵێ:"هەرچی سەختی‌و قایمییەکەیەتی ئەوە سەرسوڕهینە، چونکە دوو دەرگای لە سەر بەژ هەیەو دەرگایەکیش لەسەر دەریا، تەنیا لەیەك لاوە نەبێ، دەنا دەریا دەورەی هەموو شارەکەی داوە، ئەوەی لە بەژەوە بۆی بچێ، دەبێ لە سێ تا چوار دەرگاوە تێپەڕ ببێ، ئەم لاو ئەولای دەرگاکانیش دیواری بەرزن. هەرچی دەرگای سەر دەریاکەیە، ئەوەیان دەکەوێتە نێوان دوو تاوەرەوەو دەچێتەوە سەر بەندەرەکە، شاری سەر دەریای عەجیبسەیری وەها قەت نەبووەو نەبیستراوە. شوورەی شارەکە لە سێ لاوە دەورەی داوەو، لەلای چوارەمەوە، بە دیوارێکی گەچ گیراوە. کەشتییەکانی بەژێر شوورەکەدا دەڕۆن‌و لەوێ لەنگەر دەگرن. زنجیرێکی گەورەو ئەستوور لەمسەر بۆ ئەوسەر هەردوو تاوەرەکەی وەك تەناف پێکەوە بەستووەو، تا بە ئاسمانەوە بێ، هیچ گەمیەك ناتوانێ نەبچێ‌و نەدەرچێ. بایەخی چاك‌و لەباری ئەم بەندەرە، تا بڵێی سەیرو سەمەرەیە"[1284]. ئەم گەڕۆکە خۆی چووەتە ناو شاری (صور)ەوەو پازدە ڕۆژی لەوێ بەسەر بردووە، کە هێشتا شارەکە بەدەست خاچدروشمانەوە بووە.

هەرچی (القزويني)یە، ئەوە، ئەو بە کورتی باسی دەکات‌و لەبارەی شوورەکەیەوە دەڵێ: "بەشێوەیەکی سەیر دەوری بەندەرەکەی داوە"[1285]. هەموو لایەکی، دەریا دەورەی داوە، لای چوارەمی نەبێ کە دەرگای تێدایە[1286]، پێگەی شارەکە لە سەر وشکانی زۆر قایمەو سێ لاکەی تری دەریایە، زەمینەشی بەرزەو ڕێگای سەر وشکانییەکەشی ئەم دیوو ئەو دیوی دەریایە، بە پانیی ڕێگاکە، کەندەکێکی تێدایەو بە هەوەسی خۆیان قووڵیان کردووەو دەستیان لێ داگرتووە[1287]. لەبەرئەوە کەس بە شێوازی شەڕی کۆن‌و ڕێگای گەمارۆی دواکەوتوو نەیدەتوانی بەسەر شارێکی وەك ئەم شارە

---

1281 ن، م. ٥٤٤/١١.

1282 ن، م. ٥٥٣. مفرج الكروب، ٢٠٩/٢.

1283 مرآة الزمان، ٤٠٠/٨. الكامل، ٥٥٣/١١. الروضتين، ١١٩/٢. شفاء القلوب،١٥١.

1284 رحلة ابن جبير، ٢٧٨. رحلة بنيامين، المطبعة الشرقية، بغداد، ١٩٥٤، ص٩١ ـ ٩٢. الحميرى، الروض المعطار في خبر الأقطار، تحقيق، د. إحسان عباس، مكتبة لبنان، بيروت ١٩٧٥، ص٣٦٩.. (ئەم شارە بۆ ماوەی حەوت مانگ قارەمانانە وەستاو ڕێگای بە ئەسکەندەر نەدا لێی بچێتە پێش. بەرلەوەش ڕێگای بە داگیرکەرانی عێراقی دێرین نەدا بچنە ناوی). د. فيليب حتي، صانعوا التأريخ العربي، طبعة دار الثقافة، بيروت ١٩٦٩، ص١٨٧.

1285 آثار البلاد، ٢١٧.

1286 معجم البلدان، ٤٣٣/٣.

1287 الفتح القسي، ١٥٧.

قایمکراوەدا زەفەربێنێ و سەرکەوێ، چونکە باری تۆبۆگرافیای شارەکە تا بڵێی سەخت و یاخیی بوو، نەخاسمە پڕیش بوو لە خاچدروشمان و لە جەنگاوەرەکانیان، چونکە سەلاحەددین کە شارەکانی دەگرت، ڕێگای بە خەڵکەکە دەدا، کۆچ بکەن و بڕۆن بۆ (صور)و دەخالەتیشی لێیان قبووڵ دەکرد. لەم بارەیەوە (العماد) دەڵی: "شاری (صور) هەموو ئەوانەی لە خۆ گرتبوو، کە لە قودس و شارەکانی کەناراوەکانەوە ڕەویان دەکرد"[1288]. بێ گومان، ئەو خەڵکە لەبەر قایمیی شارەکە ڕوویان تێ دەکرد، پاشتریش شارەکەیان پتر قایمکرد، تا وای لێهات، "دەرگاکانی دادەخران، هەمووڵایەکی پڕ بووبوون لە پەنابەرو، گرووپ گرووپ بەیەکدا چووبوون و قوللە و تاوەرەکانیشی پڕ بووبوون"[1289].

مێژوونوسان دەڵێن: خواسایی شەڕو کوشتار لەسەر باسکەکە ڕووی دەدا، ئەو باسکە، لە پەدەستەکەو وشکانییەکەی بەیەك دەگەیاند، "چونکە شارەکە لەناو دەریاکەدا لە لەپی دەستی مرۆڤ دەچوو، باسکەکەش دەگاتە بەڕۆ بە وشکانییەوە نووساوە، دەریاکەش هەردوو تەنیشتی باسکەکەی گرتووە"[1290]. کوشتاریش کە بقەومایە لەو جێگا تەسکەدا دەقەوما، ئەمەش هۆیەك بوو لە هۆیەکانی بەزینی موسڵمانان و سەرنەکەوتنیان.

سەلاحەددین، لە شاری (عکا)وە بەخۆی و سوپاکەیەوە کەوتەڕێ و بۆ ڕۆژی نۆی ڕەمەزانی ساڵی ٥٨٣ك/ ١١٨٧ز، گەیشتەجێ و "چەندین ڕۆژ مایەوە، ئەوە، هەر بیری دەکردەوەو تەکبیری دەکردو پرسیاری لە خەڵك دەکردو ڕاوێژی پێ دەکردن" کەچی بکاو چی نەکا.

(سیف الدین المشطوب) سەرکردەی داواکارانی گرتنی (صور) بوو. ئەو دنەی سەلاحەددینی دەدا، هێرش بباو شارەکە بگرێ "هەناسەیەك وچانی نەدەداو پەلەی لێ دەکردو دەیگوت: چاوەڕوانی خراپە، هەل بە تەکان دەقۆزێتەوە، نەك بە مانەوەو چاوەڕێ کردن". سوڵتانیش بە قسەی کردو سوپای سەربەرزی خۆی تەیارو ئامادەکرد و پشتی بە خودا بەست و بە خۆی و ئۆردوگاکەیەوە گەیشتە شاری (صور)، دووریێك لە شوورەکەیەوە سەربازگەی سازداو، یاریو کۆمەکیشی بۆ هات، ئەوجا "ئامرازو ئامێری گەمارۆی لێ دامەزراندو، مەنجەنیقی گەورەو گچەکەشی بە زۆری دەسەبەرکرد". ئەوجا، لەشارەکە چووە پێش و لە بیست و دووی مانگدا بە سوپایەکەوە. کە دەتگوت گەلە شێرەو بەناو بێشەو جەنگەڵدا هەڵمەت دەبا.، دەوری شاری گرت و[1291] جەنگاوەران دەستیان کرد بە کوتانی شوورەکان و مەنجەنیقیان لێ خستەکار و کەوتنە بەردباران، دەبابەکانیش لە پێگەکانی خۆیانەوە، ئاوربارین و چەرخیان خستەگەڕو کڵپەی ئاگرەکانیان لە ئاسمانەوە، وەك هەڵۆ، لەسەر چنگ و بەسەر شارەکەدا دادەبەزین. شەڕەکە درێژەی کێشاو گەمارۆکە تەنگتر کرایەوە[1292] هەموو جۆرە چەکێکیان خستەکار، بە تایبەتیش ئامێری ئاگرهاویشتن و بەردهەڵدان[1293].

سەلاحەددین (مارکیز مونتفرات)ی باوکی (کۆنراد)ی فەرماندارەکەی (صور)ی لە دیمەشقەوە لەگەڵ خۆی هێنابوو، هێنای بەرامبەر بە شوورەی شارەکە ڕایگرت تا کوڕەکەی ببینێ، هەڕەشەی ئەوەشی لێ کرد، گەر شارەکە بە دەستەوەنەدا، ئەوا باوکی دەکوژرێ. بەڵام (کۆنراد) ئەو سۆزی باوکایەتییەی نەبوو، باوك و فرزەندی کاری تێ نەدەکرد. گرنگ بە لای کۆنرادەوە باوکی نەبوو، بەڵکو بەجێ هێنانی ئەرکی سەرشانی خۆی و پاراستنی شارەکەی بوو، چونکە ئەو، خۆی بە سوارچاکێکی خرستیان دادەنا.. وەك ڕنیسمان دەڵێ.[1294] چۆن شارێکی پڕ لە خاچدروشم و جەنجاڵی قایمکار دەگۆڕێتەوە بە کابرایەکی بە تەمەنی پیرو پەککەوتەی وەکو باوکی؟! لەبەرئەوە گوێی بە هەڕەشەی

---

1288 ن، م، ١٥٤. مرآة الزمان، ٣٩٨/٨.

1289 الفتح القسي، ١٥٦.

1290 الكامل، ١١/ ٥٥٤. ابن العبري ٢٢١.

1291 الفتح القسي، ١٥٤.

1292 ن. م. ص ١٥٨.

1293 الكامل، ١١/٥٥٤.

1294 رنسيمان، تأريخ الحروب الصليبية، ٧٦٣/٢.

**سەلاحەددین نەدەدا، نەخاسمە دەشیزانی سەلاحەددین زۆر بەزەیی بە پیرو ئیفتادەدا دێتەوەو ئازاری دیل نادا، واتا پشت ئەستوور بوو لەوەی، کە سەلاحەددین باوکی ناکوژێ.**

**سەلاحەددین، ناچار بوو پلانی بە نۆرە لە شەڕەکەدا بخاتە کار، تا هەر کۆمەڵەی بۆ ماوەیەك شەڕ بکات، کە ماندووش بوو، کۆمەڵێکی دی جێگای دەگرێتەوەو "شەڕەکەش پچڕ پچڕ نابێ، بەردەوامیش دەبێ". سەلاحەددین، کەس و کارەکانی خۆیشی لەو شەڕەدا نۆرە بە نۆرەیان دەکردو هەر کۆمەڵەو خزمێکی نزیکی خۆی فەرماندەیی دەکرد، بەنموونە، وەك (الأفضل علي)ی کوڕی و (الظاهر غازي)ی کوڕی و (الناصر بن أيوب)ی برای و (تقي الدين عمر)[1295]ی برازای. وەلێ ئەم شێوازە شەڕەو بەکارهێنانی چەکی قورسەش، هیچی بۆ نەکراو کاری لەشارەکە نەکردو شارەکە بەدەست خاچدروشمانەوە مایەوە، هۆی ئەوەش جگە لە سەختیی و قایمیی شارەکەو، زۆریی بەرگریکاران و تەنگی جێگای شەڕەکە، ئەوەش بوو، وەك. العمادو إبن الأثير. دەڵێن. سەربازانی سوپای سەلاحەددین، بە غەزای ئاسان و سەرکەوتنی خێرا ڕاهاتبوون، واتا، شەڕێ سەخت و بەکێش بێ، بۆ سوپای سەلاحەددین زەحمەتە لە سەری بڕوات. ئەم شەڕەی بۆیە پێ زەحمەت بوو، چونکە شەڕەکە سەخت بوو، درێژەی دەکێشا، لەبەرئەوە کە ماندوو دەبوون، بە هەوەسی خۆیان شەڕیاندەکردو خەڵکی دەیناسین کە شارێکیان گرتبا، ئەوە ئەو شارەیان بە دەستوبردی گرتووەو شەڕی درێژخایەنیان تێدا نەکردووە. ئەم شەڕەش کە درێژەی کێشاو شارنەگیرا، ئیدی ئەمانیش وەستان و حەوسەڵەی درێژە پێدانیان نەماو بێزار بوون[1296]. (إبن الأثير) دەڵێ: کە جەنگاوەرەکان دیتیان مەسەلەی گرتنی (صور) بە کێشە، بێزار بوون و داوای وازهێنانیان کرد.[1297]**

**ڕاستیشت دەوێ، ڕاهاتن لە سەر غەزای ئاسان. وەك ئەم دوو مێژوونووسە باسی دەکەن. ئەگەر بۆ هەندێ شار بوو بێ و لوا بێ، بۆ زۆربەی زۆری قەڵاو قایمکارەکان و شارە قایمەکان نەبووەو نەلواوە، واتا ئەوانەی کە سوپای سەلاحەددین، تا گرتیان تاڵاوێکی زۆریان بە قوڕگدا کراو. خوێنێکی زۆریشیان لە پێناویدا بەخت کرد. خۆ جەنگاوەران و فەرماندەکانی سوپای سەلاحەددین قەتو قەت درێغییان نەکردووە، بگرە لە گرتنی ئەو شارانەشدا، کە لەوپەڕی سەختیی و قایمیدا بوون. بەڵگەی ئەم قسەیەش ئەم شەڕی (صور)ە، کە دوو مانگ گەمارۆیان دا. هەروەها هەر بە نموونە، قەڵاو قایمکاریی (برزية) کە بەنووکی شاخێکی سەخت و سەرکەشەوە دروست کرا بوو. ئەم قەڵایە، چ موسوڵمان و چ فەرەنگ بە نموونەی قەڵای قایمکار ناویان دەبرد[1298]، سوپای ئەیوبیان لە گرتنی (برزية)دا دەماخیان سووتاو ئارەق و خوێنێکی زۆریان بەخشی و لە گرتنیدا هەموو جۆرە چەکێکیشیان بەکارهێنا[1299]. جگە لەوانە، پلانی شەڕی بە نۆرەشیان پەیڕەو کرد[1300] تا گرتیان و چوونە ناوی.**

**ئەم (إبن الأثير)ەی کە سوپای سەلاحەددین بەکەمتەرخەم و پشتسارد لە قەڵەم دەداو دەڵێ: لەبەرئەوەیە فێری شەڕی قورس نەبووە، بە شەڕی ئاسان ئاشنایە، کەچی هەر خۆی لە باسی گرتنی (برزيه)دا، دەڵێ: سوپای سەلاحەددین لە گرتنی (برزية)دا شەڕێکی قارەمانانەیان کرد، دنیاش زۆر گەرم بوو، خەڵکەکە پەرێشان بوون، کەچی سەلاحەددین بە چەکەوە، بەسەریاندا دەگەڕاو دەستخۆشی لێ دەکردن و هانی دەدان. نەك هەر خۆی، (تقي الدين)ی برازایشی هەر بەو جۆرە.[1301] تا سەرەنجام توانییان قەڵاکە بگرن و بچنە ناوی "قەڵایەکی سەرکەش بوو، بە ئاسمانەوە، لەبەر بەرزی،**

---

[1295] الكامل، ١١/٥٥٤.

[1296] الفتح القسي، ١٥٩.

[1297] الكامل،١١/٥٥٥.

[1298] معجم البلدان، ٣٨٣/١. النوادر، ٩٢. الفتح القسي، ٢٤٨. (سەیرێکی لێکۆڵینەوەکەی خۆشمان کە لە ژێر سەردێڕی "مسؤلية صلاح الدين في فشل حصار صور" دا نوسیومانە) بکە. المجلة العربية للعلوم الانسانية، المجلد ٧، العدد ٢٦، ١٩٨٧، مجلة كلية الآداب جامعة الكويت.

[1299] الكامل، ١٢/١٥.

[1300] النوادر، ٩٢. الفتح القسي، ٢٤٩. الكامل، ١٢/١٥. الروضتين، ١٣١/٢. ابن العديم، ١٠٥/٣.مفرج الكروب، ٢٦٥/٢.

[1301] الكامل، ١٢/١٥.

بەباشی نەدەبینرا"[1302].

لەبەرئەوە دەتوانین بە ئاسانی قسەکانی (إبن الأثیر) بەرووی خۆیدا بدەینەوە، هەرچەندیشە باقیمەنی قەڵاکانی دیکە، وەك قەڵاکەی (برزیة) نەبوون. بەڵێ سوپای ئەیوبییان هەندێ لە شارو قەڵاکانیشی بە سانایی گرتووە. بەڕای ئێمەش کشانەوەی سوپای سەلاحەددین لە (صور) کارێکی ئاقڵانە بوو، چونکە سەربازانی ئەییوبیی، نەیانتوانی شارەکە بگرن. (إبن الأثیر) یش، کە بەتوندیی دەرهەق سەلاحەددین دەدوێ، ئۆباڵی دۆڕاندنی شەڕەکە دەخاتە ئەستۆی سەلاحەددین، کەچی ئەوەبوو، پێش کەمێ، خستییە ئەستۆی سوپاکەی‌و دەڵێ: خەتای کەس نەبوو، خەتای سەلاحەددین نەبێ، چونکە ئەو شارەکەی پڕکرد لە سەربازانی فەڕەنگ‌و لە (عکا)و لە عەسقەلان‌و لە قودسەوە زەلامی زۆر و کۆمەکی دارایی بێ حسابی بۆ نارد. سەلاحەددین دەخالەتی لێ قبووڵ دەکردن‌و لە (صور) داڵدەی دەدان. هەرچی سوارچاکانی فەڕەنگی کەناراوەکە هەبوون‌و سەرسەلامەت دەرچوون، بە خۆیان‌و سەروەت‌و سامانی خۆیان‌و سامانی بازرگانەکانیشەوە نێردران بۆ (صور)"[1303].

من وای بۆ دەچم، ئەگەر سەلاحەددین قورسایی خۆی بخستبایە سەر (صور)و سوور ببوایە لەسەر گرتنی شارەکە، ئەوە لەو بارەشدا نەیدەتوانی شارەکە بگرێ، هەر وەهاش دەرچوو کە دەڵێم. ئەوسا هەلی غەزووی شارەکانی سەرکەناراوو شارەکانی ناوەوەشی لەدەست دەچوو، کە سەرکەوتنی یەك لە دوا یەکی تێدا بەدەست هات. سەلاحەددین لە سەر (صور) پێی داگرتبا، هەڵمەتی سێیەمی خاچدروشمان، لەوێ دەریدەپەڕاند، وەك چۆن لە (عکا) دوای سێ ساڵ دەریپەڕاند، کە (عکا) بەدەست موسڵمانکانەوە بوو و حوکمی خاچدروشمانی بەسەرەوە نەبوو. واتە ئەگەر سەلاحەددین، هەر بە دەوری (صور)دا سوپاکەی خۆی مۆڵ دابا، ئەوە نەیدەتوانی‌و بۆی نەدەکراو نەدەپەرژا ئەو شارانە بگرێ، کە گرتنی. لەبەرئەوە سەلاحەددین نەیویست دەستی لە بن هەمانەکە دەرچێ، لەبەرخاتری شاری (صور)و، نەیهێشت هەموو شتێ ببێ بە قوربانی (صور)، بەڵکو ناچار بوو ئەم شارە. بەو گرنگییەشی. بکا بە قوربانی غەزاکان‌و دەستخستنی شارەکانی تر. ڕاستیشت دەوێ، ئەوەی. لەبری. (صور) دەستی کەوت، دەستکەوتگەلی زۆر گرنگ بوون.

بەهەرحاڵ کارئاسانی کردنی سەلاحەددین بۆ شارە گیراوەکان‌و ڕێ پێدانی خاچدروشمەکان، بەو زۆرییە لە (صور) جێگای خۆیان قایم بکەن‌و، ڕەگی لێ داکوتن، بووە هۆیەك لە هۆیەکانی بەهێزتربوونی شارەکەو سەختتر بوونی خۆڕاگری و بەرەڤانیی خاچدروشمان‌و کۆڵنەدانیان، سەرەنجامیش، هەڵەیەکەو کراو لەسەر ئەم فەرماندارە هاتە تۆمارکردنێ.

خۆ دەبێ پرسیارێکیش بکەین، بڵێین، باشە، ئەدی سەلاحەددین ئەو هەموو دیلە زۆر و زەبەنەی خاچدروشمانی چی لێ کردبا؟ ئایا دەبوو، هەر دیلێ کەوتبایە دەست لەشکرەکانی بیکوشتبا؟ یان بە دیلی گلیان بداتەوە؟. جا کەوابێ، دەشبوو داڵدەو خانەو خۆراك‌و کەلوپەلیش بۆ هەموویان دابین بکا، کە ئەمەش دارایی‌و خەرجێکی زۆری دەویست. ڕاستییەکەشی ئەوەیە، سەلاحەددین بیرو هزری لای ئەوەبوو شارگەلی موسڵمانان ئازاد بکات‌و حوکمی خاچدروشمانی تێدا نەهیڵێ، وەلێ بە دروستی هزرو ئاوەزی بەلای ئەوە نەبووە، ئەمانەی بەرەو شاری (صور) دەریان دەکاو لەوێ مۆڵ دەبن، چ کێشەیەکی بۆ ئایندە لێ دەکەوێتەوەو، ڕەنگە نیازی ئەوانەشی نەزانیبێ، کە ئەو شارە دەکەن بە مۆڵگەو پێگەی خۆقایمکردن‌و پاشانیش کێشەی بۆ پەیدا دەکەن. قایمکارییێ خاچدروشمان لەو شارە ئەنجامیان دا، کارێکی وای کرد، پەنجە پەنجە لەگەڵ سوپای سەلاحەددیندا بکاو خۆی ڕابگرێ‌و زیاتریش پێی لێ ڕابکێشێ.

جگە لەوەش شاری (صور) پشتی والایەو دەریایە، لە دەریاوە، زۆر بە ئاسانیی ئازووقەو بارو بارخانەی لە ئەوروپاو (قبرص)و میرنشینە کرستیانەکانی دیکەوە بۆ دەهات. بەڵێ کۆمەك بۆ سوپای ئەییوبیانیش دەچوو، لەسەر وشکانییەوە

---

1302 الفتح القسي، ٢٤٨.

1303 الکامل، ١١/٥٥٥ـ ٥٥٦. الروضتين، ١١٩/٢. مفرج الکروب، ٢/٢٤٥.

به دەستیان دەگەیشت، بەڵام ئەو کۆمەکەی گەمیەکان لە (عکا)و بەیروتو جبیلەوە بۆیان دەهێنان، کەشتییەکانی خاچدروشمان نەیاندەهێشت بگاتەجێ.[1304]

لەم بارەیەوە، سەلاحەددین، لە نامەیەکدا، کە بۆ (سیف الأسلام)ی برای نووسیوە، باسی (صور) دەکاو دەڵێ: "ئەگەر دەریا پشتی قایم نەکردباو کۆمەکی پێ نەکردبا، گەمیی بێ شوماری بۆ نەهاتبا، ئەوە، لغاوم دەکردو دامدەمرکاندەوە".[1305] لەگەڵ ئەوەشدا، سەلاحەددین، هاوڕای ئەو کەسانە نەبوو، کە داوای کشانەوەیان دەکرد. بە نموونە، (إبن الأثير) دەڵێ: ئەوانەی داوای کشانەوەیان دەکرد، میرو داراو دەوڵەمەندەکانو ئەوانەش بوون کە کۆمەکی دارایيو ماڵیان بە سوپا دەکرد، چونکە لەوە دەترسان، ئەگەر سەلاحەددین لەوێ ئۆردوگا هەڵبداو سەربازگەی لێ دامەزرێنێ، داوای قەرز لەوان بکا، بۆ ئەرکو مەسرەفی سوپا.[1306] سەلاحەددین هاوڕای پیاوچاکانو لە خواترسانی بە نموونە، وەك (ضياء الدين عيسى الهكاري، عزالدين جورديكو حسام الدين طمان)[1307] بوو. واتا سەلاحەددین دەیەویست تا ماوەیەکی دیکەش، دەوری شارەکە بە سوپای خۆی بتەنێو بیری لەوە کردەوە، لە داراو میرانی دەوڵەمەند، قەرز بۆ ئەرك و مەسرەفی گەمارۆدان وەربگرێ، بەڵام ئەو میرو دەوڵەمەندانە، وازیان نەهێناو هەر داوای لادانی گەمارۆیان دەکرد. ئەوەتا (العماد) دەڵێ: "سەلاحەددین، بگەیشتایەتە سەرئێسقانی، تیژتر دەبوو، دەماربیگرتبا، توندتر دەبوو، بەدڵیش شتێکی کردبا چاکتری دەکرد، بە دنەدان ڕایدەگرتنو دنەی دەدان خۆڕاگرین، بە چاوتێریو دەست بە خێری یەکی دەخستن و بەهێزی دەکردنو هێزی پێ پەیدا دەکردنو پێی دەگوتن: خودا فەرمانی پێمان داوە، سەبر بگرین، سەبریش بەبێ سەرومری نایەتەدی، دە کەواتە سەبر بگرن، سەردەکەونو سەرفراز دەبن، لەسەر سەبریش بڕۆن، غەزاتان بە دەستەوە دێو دەرگای شارانتان بۆ دەکرێتەوە".[1308] بەڵام پاشان "بەنا بەدڵی"[1309] بە بڕیاری ئەنجومەنی جەنگەکەی قایل بوو و موافەقەتی کردو دڵی نەهات لە ڕووی بڕیارو ئیرادەیاندا بووەستێ، ئیدی ئەوەبوو فەرمانی دا ئامرازو ئامێرگەلی گەمارۆیان هەڵوەشاندەوەو پێچایانەوە، ئەوەیشیان بۆ بارنەکرا سووتاندیانن، لە دوادوای مانگی (شوالی ٥٨٣ك/ بەرابی ساڵی ١١٨٨ز) دا، شاری (صور)ی جێ هێشتو ڕووی کردە (عکا)و ڕێگای بە میرەکانی دا هەریەکەو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، بەمەرجێ دوای زستان بگەڕێنەوە بۆ مەیدان.[1310]

بەڵێ، ئەم نەکسەیەی پاش هەردوو سەرکەوتنەکەی (حطين)و (القدس) سوپای ئەیوبیانی سارد نەکردەوەو ورەی بەرنەدان، ئەم سوپایە، سەرباری ئەوەش، لە غەزای قەڵاکارو شارەکانی بن دەستی خاچدروشمان لە ڕەوشی خۆی نەوەستا. قەڵاو قایمکارو شارگەلی دیکەی ئازاد کرد، کە زۆرر گرنگ بوون. بە نموونە وەك: (صفد، كوكب، الكرك، برزيەو صهيۆن)و هی دیکەش. دەبێ ئەوەش بزانین، ئەم شکستەی لە نزیك شوورەکانی (صور)دا ڕووی دا، بووە بادانەوەیەك لە مێژووی سوپای ئەیووبیاندا کە لەمەولا دەیبینین.[1311]

---

[1304] الفتح القسي، ١٦١. النوادر، ٨٤. الكامل، ١١/ ٥٥٤ـ ٥٥٥. الروضتين، ٢/١١٩. ابن العبري، ٢٢١. مرآة الزمان، ٨/٤٠٠. النجوم الزاهرة، ٦/٣٨. (دەربارەی تەگبیرو فرۆفێڵی خاچدروشمان بۆ لەناوبردنی کەشتیگەلی ئەیوبیان، بنۆڕە: كلارى روبرت، فتح القسطنطينية على يد الصليبيين، ط/ ١٩٦٤. ص٧٤ـ ٧٦).

[1305] صبح الأعشى، ج٧، ص٢٤، ٣٤١.

[1306] الكامل، ١١/٥٥٦.

[1307] الروضتين، ٢/١١٩. مفرج الكروب، ٢/٢٤٥ـ ٢٤٦.

[1308] الفتح القسي، ١٥٩. الروضتين، ٢/١١٩. مفرج الكروب، ٢/٢٤٦.

[1309] البداية والنهاية، ١٢/٣٢٧.

[1310] الكامل، ١١/٥٥٦. الفتح القسي، ١٧٥. زبدة الحلب، ٣/١٠٠. الروضتين، ٢/١٢٠. مفرج الكروب، ٢/٢٤٦. السلوك، ١/٩٧.

[1311] Pool- saladin, p.241 د. سعداوي، التأريخ الحربي، ١٩٨. د. عبدالقادر اليوسف، علاقات بين الشرق والغرب، ص١٤٣. قدرى قلعجي، صلاح الدين الأيوبي، قصة الصراع بين الشرق والغرب، دار الكاتب العربي، مطابع شركة المطابع الحديثة، بيروت، ١٩٦٦، ص٣٦٠.

ڕاستیشت دەویٚ، شکستی لە کیسچوونی شاری (صور) ڕووداویٚکی ترسناك بوو، چونکە ئیدی ئەم شارە بووە مۆڵگەی خڕبوونەوەی جەنگاوەرانی خاچدروشم، کە لە بەرەکانی دیکەی جەنگەوە هەڵدەهاتن‌و خۆیان دەدزییەوە،[1312] هەروەها بۆ ئەو خاچدروشمە تازانەش کە لە ئەورووپاوە دەهاتن. لە هەموویشی خراپتر، ئەوەبوو کە شاری (صور) کرا بە گورگەل‌و لە گیانی (عکا) بەردرا، لەگەڵ ئەو هەموو خەبات‌و خۆفیداکارییەش کە سوپای سەلاحەددین نواندی، بەلاّم لە نزیك شوورەکانی (صور)ەوە، لاپەڕەیەکی نویٚ لە میٚژووی سوپای سەلاحەددین دەستی پیٚ کرد، لە لاپەڕەکانی پیٚشتری نەدەچوو.[1313]

**دووەم: شەڕی بەربلاّو:**

چەند فەرق‌و جیاوازییەك لە نیٚوان ئەم جۆرە شەڕەو ئەو شەڕەدا هەیە، کە ناومان نا شەڕی شوورە، یان شەڕی قەلاّو قایمکاران، وەلیٚ ئیٚمە نامانەویٚ دریٚژە بە شرۆڤەی ئەم فەرق‌و جیاوازییە بدەین‌و خالّ بە خالّ‌و یەکە یەکە ویٚکچوون‌و جیاوازییان باس بکەین. لە شەڕی بەربلاّودا، جەنگاوەرانی هەردوو لایەن ڕووبەڕوو دەوەستان‌و یەکسەر دەستەو یەخە و ئامبازی یەکتر دەبوون‌و، شیٚوازی کوشتاریش (تاکتیکی شەڕ)ی لایەنیٚکیان لە هی لایەنەکەی دی جیاواز بوو. جەنگاوەرانی شەڕی بەربلاّو. نەخاسمە فەرماندەکانیان. دەبوو زۆر ئازاو بەجەرگ بوونایە، تا لە ڕووی دوژمندا بتوانن بووەستن‌و خۆڕابگرن‌و بیبەزیٚنن، چونکە جاری وا هەیە، فەرمانداریٚ لە مەیداندا ڕادەکاو هەڵدیٚ، یان دەکوژریٚ، ئەوە دەبیٚتە هۆی ڕاکردن‌و هەلاّتنی هەموو لەشکرەکەی. جا، لەبەرئەوە، میرگەلی بە تواناو بویٚرو بە جەرگ و بە ئازایی ناسراویان دەکرد بە فەرمانداری سوپاو لەشکرو قۆڵ‌و بەشە جۆراو جۆرەکانی، تا لە کاتی پیٚکهەڵپرژاندا، خۆڕابگرن‌و گەرمتر بن.

کوشتاری بەربلاّو، ماوەکەشی کورت بوو، ئەنجامەکەشی لەسەر چەن بنەماییٚ دەوەستا کە زووتر و بە خیٚرایی کاریگەرییەکانیان دەبینران، زۆر خیٚراتر لە کاریگەریی بنەماکانی شوورەشەڕ. شەڕو گەمارۆی شوورە، ڕەنگە چەندین مانگ دریٚژە بکیٚشیٚ، لەوانەیە شوورەی شارەکە بەرزو پتەوو قایم بیٚ‌و، لەوانەشە خەڵکەکەشی، پیٚشەکی بۆ دابینکردنی کەلوپەل‌و ئازووقەو پیٚداویستی یەدەگ دەست پیٚشخەرییان کردبیٚ‌و لە هیچیان کەم نەبیٚ، هەروەکو ئەوەی لە (صور)و لە (عکا) ڕووی دا. جگە لەوانە، قەوارەی سوپاو چەك‌و ئامیٚری شەڕو باروبارخانەی زۆروزەبەنیش، گرەوی شەڕی بەربلاّو دەباتەوە. ئەو لایەنەی زۆرترەو گەورەترەو پڕچەکترە. بە گشتی. بەسەر لەشکری کەمترو بچووکترو کەم چەکتردا سەردەکەویٚ. ئەمەش مانای ئەوە نییە، کە هەمیشە هەروا بووەو هەرواش دەبیٚ، نەخیٚر، میٚژوو پیٚچەوانەی ئەمەشی دیوە. چەندین جاربووە لەشکریٚکی کەم لەشکریٚکی زۆری ڕاوناوەو چەندین جاران لەشکریٚکی برسیی‌و کەم چەك، لەشکریٚکی تیٚرو پڕچەکی بەزاندووە، بە نموونە، وەك شەڕەکانی بەرایی ئیسلام (کم من فئة قلیلة غلبت فئة کثیرة).[1314] ئیسلام، لە شوورە شەڕەکانیشدا، مەسەلەی قەوارەی لەشکرو گەورەیی شاری گەمارۆدراوو قایمیی شورەکانیشی ڕەچاو کردووە.

ڕاستیشست دەویٚ، وشەی شەڕی بەربلاّو، هەموو ئەو شەڕانە دەگریٚتەوە، کە لە دەرەوەی قەلاّکارو لە دەرەوەی شارەکاندا، لە نیٚوان سوپای سەلاحەددین‌و خاچدروشماندا ڕوویان دا، بەلاّم لیٚرەدا باسی کەمەپیٚکدادان‌و ورە شەڕەکان ناکەین، کە چەرخەچییەکان ئەنجامیان دەداو لەمەوبەر هەندیٚکیانمان باس کرد. لیٚرەدا باسی گەورەترین و بەرچاوترینی ئەو جەنگە ڕیٚکوپیٚك‌و بە نیزامانە دەکەین، کە جەنگی پیٚ دەڵیٚن‌و کاری لە هەردوو لایەنی براوەو

---

[1312] مرآة الزمان، ٨/٣٩٨.

[1313] پاش یەك سەدە لە ڕووداوەکانی ئەم میٚژووە (صور) کەوتە دەست موسوڵمانان‌و بومەلەرزەش زۆری لیٚ ویٚران کرو خاچدروشمانیش بە هۆی ململانێی بەردەوامی نیٚوان شارەکانی کەناری دەریاو کەشتیگەلی بوندقیەو جینەوەوە، کەوتنە لاوازی، کاتیٚکیش لە ساڵی (٦٩٢ك/ ١٢٩١ز)دا، (عکا)یش کەوتە دەست موسوڵمانان، ئیدی (صور)و هەندیٚ شاری دیکەش بە دەست خاچدروشمانەوە نەما. بنۆڕە: هۆنگمان، Honlgmann، دائرة المعارف الاسلامیة، ط/ سنة ١٩٣٣. ج١٤، ص٣٧.

[1314] القرآن الکریم، سورة البقرة، الآیة ٢٤٩.

دۆڕاویش دەکرد. لەبەرئەوە تەنیا، باسی هەردوو شەڕەکەی (الرملةو حطين)[١٣١٥] دەکەین:

**١ـ شەڕی (الرملة):**

ئەم شەڕە، بوو بە ئەزموونێکی تاڵو تفت بۆ سەلاحەددین، سەلاحەددین لەو شەڕەوە فێربوو، کە هەڵە دەکات ئەگەر بەرەی موسڵمان یەك نەخاو پەلاماری دوژمن بدات. واتا ئەگەر بێتو ئەم بەرەیە بێنێتە دی، ئەوا هێزێکی زۆرو چڕو پڕی بۆ دێتە مەیدان، دەتوانێ لەخۆ ببووریٚو هێزی داگیرکاری دوژمن تێك بشکێنێو لە ناوچەیەکی گەورەترو بەربڵاوتریشدا بڵاوببنەوە.

هەرچەندە سەلاحەددین، هەر لە ساڵی (٥٧٠ك/ ١١٧٤ز) ەوە، کە هاتە دیمەشق، بەشێکی گەورەی وڵاتی شامی خستەسەر دەوڵەتەکەی میسری خۆیو، پاشانیش (حمصو حماةو حارم)یشی خستەسەر، بەڵام هێشتا بەشێکی زۆری بەرافراوانی مابوو، نەکەوتبووە ژێر دەستی.

سەلاحەددین، پاش ئەوەی لە ساڵی (٥٧٢ك/ ١١٧٦ز) دا، گەڕایەوە بۆ میسر، بڕیاری دا، لەشکرێ بکاتە سەر خاچدروشمان. ئەوەبوو لە مانگی (جمادى الاولى)ی ٥٧٣ك/ تشرینی دووەمی ١١٧٧دا، بە بیست هەزار جەنگاوەرەوە،[١٣١٦] لە قاهیرەوە کەوتەڕێو لەشاری (بلبيس) کە دە قۆناغ لە شاری میسرەوە دوورە، لەسەر ڕێگای شام[١٣١٧] خێوەتگای هەڵدا، پاشان، لەوێوە ڕووی کردە ناوچەکانی باشووری فەلەستینو گەیشتە عەسقەلان کە خاچدروشمانی تێدابوون، لەوێ ژمارەیێ خاچدروشمی بەدیل گرتو فەرمانی لەملدانیانی دا.[١٣١٨]

سەلاحەددین، هیچ بەرەڤانییەکی ئەوتۆی لەدوژمن نەدی، لەبەرئەوە، سەربازەکانی گوندەکانیان دایەبەرو کەوتنە کۆکردنەوەی دەسکەوت. پاشان هەندێکیانی خڕکردەوەو ڕوویکردە شاری (الرملة)ی نزیك بە کەناراوەکە، کە ئەو سەردەمە لە هەموو شارەکانی فەلەستین گەورەتر بوو.[١٣١٩] لە ڕێگا ڕووباری (تل الصافية) کەوتە ڕێیان. کاتێ سەربازەکانی بە قەراغ ڕووبارەکەدا بڵاوبوونەوە بۆ بوار دەگەڕان بیپەڕنەوە، لەپڕو لە ناکاو هێزێکی دوژمن، پەلاماری دان. وادیارە خاچدروشمان شوێن پێیان هەڵگرتبوونو دووربەدوور دوویان کەوتبوون، بۆیە ئەو هەلەیان قۆستەوەو بە فەرماندەی (أرناط)ی میری ناودارو یاریدەی (بلدوین)ی سێیەمی شای (بيت المقدس)[١٣٢٠] کەوتنە پەلامار. سەلاحەدینیش لەوساتەدا تەنیا چەند میرێكو چەند سەربازێکی کەمی لەگەڵ بوون، چونکە هەموویان بڵاوەیان لێ کردبوو، ئەوداڵی دەستکەوتو چەپاوڵ بوون.[١٣٢١] ئیدی شەڕ قەوماو سەربازانی سەلاحەددین خڕبوونەوەو لەگەڵ دوژمندا تێك هەڵپڕژان. هەندێ لە سەربازانو خزمانی سەلاحەددین شەڕێکی مەردانەیان کرد، بە تایبەتیش (تقي الدين عمر)و ئەحمەدی کوڕیو (ضياءالدين عيسى الهكاري)و (ظهير الدين)ی برای، کە ئەم دوانەی دواییان بە دیلی کەوتنە دەست خاچدروشمانو تا ماوەی دوو ساڵیش بەدیلی مانەوە، پاشان سەلاحەددین، شەست هەزار دیناری دلو (عیسا)[١٣٢٢]ی سەرفراز کردو وەریگرتەوە. (تقي الدين عمر) لە دوژمن چووە پێشو لەبەرچاوی مامی ژمارەیێ لە خاچدروشمانی کوشت. پاشانیش ئەحمەدی کوڕی لێیان چووە پێشو ئەویش بوێریيو چاوقایمییەکی تەواوی نواندو، ژمارەیێ لە خاچدروشمانی کوشتو بە سەلامەتی گەڕایەوە، پاشانیش باوکی فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە سەریانو گوتی: "ئەحمەد بگەڕێرەوە بۆ شەڕ، گەڕانەوەت باشترە". ئەحمەد گەڕایەوە سەریانو شەڕی کرد، تا کوژراو

---

[١٣١٥] لە جێگایەکی دیکەدا باسی شەڕەکەی (ئەرسوف) دەکەین کە سوپای ئەییوبیانی تێدا شکستی هێنا.

[١٣١٦] مرآة الزمان، ٣٤٣/٨.

[١٣١٧] معجم البلدان، ٤٧٩/١.

[١٣١٨] مفرج الكروب، ٥٩/٢.

[١٣١٩] یاقوت وەسفی دەکاو دەڵێ: شارێکی گەورەی فەلەستینەو پێشتر شارۆچکە بووە. معجم البلدان، ٦٩/٣.

[١٣٢٠] کاستلان، تأريخ الجيوش، ص٥٩.

[١٣٢١] الكامل، ٤٤٢/١١. أحمد بن زيني دحلان، الفتوحات الاسلامية، ج١، ص٤٤٥.

[١٣٢٢] الكامل، ٤٤٣/١١. مفرج الكروب، ٦١/٢. أبو الفداء، المختصر، ٨١/٥. أحمد بن زيني، الفتوحات، ٤٤٦/١.

شەهید بوو.[1323]

بەڵام ئەییوبیان لە بەردەمی خاچدروشماندا خۆیان بۆ ڕانەگیرا. سەلاحەددین باسی ئەو تێکشکانەی کردو ڕوونی کردەوە، کە ئەو نەکسەیە بە هۆی جێگاگۆڕکێی سەربازان و قۆڵەکانی سوپاوە ڕووی داوەو گوتی: "کاتێ دوژمن گەیشتە بن دەستیان، ئەوجا هەندێ لە سەربازەکان جێگای خۆیان بەجێ هیشتو لە قۆڵی ڕاستەوە چوون بۆ قۆڵی لای چەپو ئەوانەی قۆڵی چەپیش چوون بۆ ناوجەرگەی (دڵی) سوپاکە، بەو جۆرە، گردەکەی (الرملة) کەوتە پشت سەریان، کە دەبوو هەر لە پێشیانەوە بمایە. جا لەو کاتەدا، کە ئەمان بەم پلانی جێگۆڕکێیەوە خەریك بوون، دوژمن بە هەلی زانیو هێرشی کردە سەریان".[1324] و سوپای ئیسلام شکا، هۆکارەکانی شکانەکەش ئەمانەن:

١. سەربازانی ئەییوبیان هێشتا پرشو بڵاوبوونو پێش ئەوەش کە خۆیان ڕێك بخەن، خاچدروشمان هەلیان قۆستەوەو لەناکاو پەلاماریان دان.

٢. ئەم پەلامارە کتوپڕە، ڕیزەکانو قۆڵەکانی سوپای ئەییوبیانی تێك داو ئاڵۆزیی تێدا پەیدا کرد. فەرماندەکانی سوپاکەش بڵاوبوونەوەو کەوتنە شمشێربازی، ئەمەش بۆ ئەم حاڵەتە هیچ سوودێکی نەبوو.

٣. سەلاحەددین خۆی لە سوپاکە بزر بوو، شەڕکەرانیش وایان دەزانی کوژراوە.

٤. سوپای ئەییوبیان لە ڕێگاکانی ئازووقەوە دووڕکەوتبوونەوەو ئاوو خۆراکیان لێ بڕابوو.[1325]

زەرەرو زیانی سوپای سەلاحەددین، لەم شەڕەدا زۆر گەورەو کوشندەبوو، ئەمەش بە قسەی مێژوونووساندا دەردەکەوێ کە دەڵێن: "ئەم تێکشکانە لە لاوازییەوە کەوتەوە، مەگەر خودا لە شەڕەکەی (حطین)دا تۆڵەی بۆ کردبنەوە".[1326] (کاستلان)یش، ئەم شەڕە بە گەورەترین سەرکەوتنی خاچدروشمان دادەنێ، هەرچەندیشە سوارەی خاچدروشمان لە پێنج سەد سوار زیاتر نەبوونو تەنیاش هەشتا سوارەی (داویە)[1327]کۆمەکیان پێ دەکردن. لەم شەڕەدا زۆربەی ئەوانەی لە تەك سەلاحەددیندا بوون کوژران، یان بریندار بوون، یان بەدیل گیران،[1328] بەڵام ئەوەی سەیرە، سەلاحەددین خۆی دەربازبووو لە شەڕەکە بە سەلامەتی دەرچوو، دوای شکستو هەڵاتنی سوپاکەی، زەلامێکی خاچدروشم کەوتە دووی سەلاحەددینو هەندەی نەمابوو بگاتە سەری، خواوڕاسان، زەلامەکە لەبەردەمیدا کوژرا، ئەوجا "خاچدروشمان گەلەکۆمەیان لێ کرد، ئەویش ڕای دەکردو خۆش خۆش، هەڵوەستەیەکی بۆ دەکرد، تا سەربازەکانی خۆی پێی بگەیەن، تا دنیا تاریك بوو و شەو داکەوت، بەوشەوە تاریکە ڕێگای چۆڵەوانی گرتەبەرو بە چەند سەربازێکی کەمەوە ڕووی لە میسر کردو لە ڕێگا تووشی ماندووبوونێکی زۆر هاتنو لەبێ ئاویی و لە برسانا تەواوێ کەشەنگو شەکەت بوون، وڵاغیان هەند ماندووبوون هەموویان پسان.[1329] سەلاحەددین لەو بیابانە هاتوونەهاتەدا، لە چاو بزربوو، لەبەرئەوە برادەرەکانی ترسیان لێ نیشتو بە تەواوی پەشۆکان.

(القاضي الفاضل) کە لە تەکیدا بوو، دەیزانی سەلاحەدین برادەرانی خۆی جێ ناهێڵێو لێیان جیانابێتەوە، دەیزانی کە لە برادەران دابڕاوەو لەو بیابانەدا ڕەنگە ڕێگای بزرکردبێ، لەبەرئەوە چەند زەلامێکی جیاکردەوەو گەڕانەوە سەرێو بەو بیابانەدا هەریەکەو بەلایەکدا ڕۆیشتنو بەدوویدا گەڕان تا دۆزییانەوە، چەند قومە ئاوێكو هەندێ خۆراکیان دەرخوارد دا، پاشان دیسان ڕێگایان گرتەوە بەر، تا لە نیوەی مانگی (جمادي الآخر)ی ساڵی ٥٧٣ك/ کانوونی یەکەمی

---

1323 سنا البرق الشامي، ٢٥٦/١. الكامل، ٤٤٢/١١. الروضتين، ج١، ق٢، ص٧٠٠.

1324 النوادر، ٥٣. الروضتين، ٧٠٣/١. مفرج الكروب، ٥٩/٢.

1325 مرآة الزمان، ٣٤٣/٨. مفرج الكروب، ٦٠/٢ـ ٦١.

1326 النوادر، ٥٣. مرآة الزمان ٣٤٣/٨. الروضتين، ج١، ق٢، ص٧٠٣. مفرج الكروب، ٦٠/٢. وفيات الأعيان، ١٦٨/٧. النجوم الزاهرة ٢٧/٦.

1327 تأريخ الجيوش، ص ٥٩.

1328 الكامل، ٤٤٣/١١.

1329 مرآة الزمان ٣٤٣/٨. مفرج الكروب، ٦٠/٢. أبو الفداء، المختصر ٨٠/٥. السلوك، ٦٤/١.

(١١٧٥ز)دا، کاروانیان گەیشتە شاری قاهیرە.[1330]

بەڵام بەر لە سەڵاحەددین، هەواڵی سەر سەلامەتیی بە وڵاغی بەرزەی دوورەگی تیژڕەو[1331]دا (هێستر) گەیشتە میسرو ئەوانەی بە تەمابوون لێی هەڵگەڕێنەوەو یاخی بن، بە تایبەتیش دەستەودایەرەی فاتمییەکان، دەستێکیان کەوتە ئەم لاو، دەستێکیان کەوتە ئەولا. سەڵاحەددین ماوەو سەلامەتە، تازە کێ دەتوانێ یاخی بێ. هەر کە گەیشتە قاهیرەش، کۆتری نامەبەر کارتی مژدە و پیرۆزبایی گەیاندە هەموو ناوچەو هەرێمەکانی میسر، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، بەو هەموو پیاوەتیی و ئازایەتیی و عەدالەتییو خۆبەخت کردنەشەوە، کەچی بەم شکستەی سامو هەیبەتی لێقەومانێکی سەختی بەسەردا هات.[1332]

**٢ـ شەڕی (حطين):**

سەڵاحەددین، پاش ئەوەی شامو جزیرەو میسری لەیەك بەرەدا ڕێکخست، ئەوجا هەلو مەرجو دەرفەتی بەرپاکردنی جەنگی دژ بە خاچدروشمان بۆ فەراهەم بوو و، بەرە بەرەش زەینو زهنی فەرماندارانو میرەکانیشی بەرەو ئەو ئاواتە ئاراستە کرد، بە جۆرێ کە ئیدی تەواوێ، بۆ وەدی هانینی ئاواتی خۆی، خۆی تەرخان کرد کە بە درێژایی فەرمانڕانیی خۆی خەباتی بۆ دەکرد، بەڵام نەیویست دەست پێشخەریی بکاو جەنگ لەگەڵ خاچدروشماندا بەرپا بکا، چونکە ڕێکەوتننامەیەکی ئاگربەستی لەگەڵ میر (ڕیمۆند)ی سێیەمی سەرگەورەی (طرابلس)ی مێردی (ئەشیفا)ی خاوەنی (طبرية)[1333]دا هەبوو، کە ئەم ڕیمۆندە لە هەمان کاتدا میراتگری شانشینی (بيت المقدس) بوو، بەڵام کۆمەڵێ لە خاچدروشمان پشتیوانییان لە ڕیمۆند کرد، لەبەرئەوە "فەرەنگ یەکدەنگ نەبوونو لە ناوخۆدا ئاڵۆزیی و چەند بەرەکیان تێکەوتبوو".[1334]

(جی لوسینیان)ی شای (بيت المقدس) لە ڕیمۆند بە گومان بوو، وای دەزانی کە لەگەڵ سەڵاحەددیندا پیلانێکیان بەدەستەوەیە، سەڵاحەددینیش پێویست بوو پەلە نەکاو دان بە خۆدا بگرێ تا دوژمن، خۆی، پۆت دەشکێنێ و ئاگربەستەکە پێشێل دەکاو شەڕ دەنێتەوە. وەلێ هەند درێژەی نەکێشا، ئەوەبوو (أرناط) کەوتە چەتەیی و ڕێگری، کاروانێکی میسری تاڵان کردو دەستی بەسەردا گرت، سەڵاحەددینیش چاوەڕێی هەلێکی وای دەکرد تا ئاگربەستەکە پووچەڵ ببێتەوە، ئیدی دەستبەجێ ناردی لە دووی هێزەکانی لە میسرو حەڵەبو موسڵو جزیرەو دیاربەکرو جێگاکانی دیکەش، کە هەموویان بۆ غەزا ئامادەبن. سەڵاحەددین، خۆیشی لە بەراییساڵی ٥٨٣ك/ ١٣ی ئاداری (١١٨٧ز)دا،[1335]لە دیمەشقەوە دەستی پێ کردو داوای لە (الملك الأفضل) کرد کە بە خۆیو لەشکرەکانیەوە، لەسەر ئاوەکەی نزیك دیمەشقەوە سەربازگەی لێ هەڵدا، تا لە شکرەکەیان هەمووی لەوێ کۆببنەوە،[1336] خۆیشی بەرەو باشوور بۆ پاراستنی حاجیان لە فروفێڵی (أرناط) کەوتەڕێ.[1337] وا چاوەڕوان دەکرا کە هێرش بکاتە سەر (الكرك)، کەچی فەرمانی دا بە کوڕەکەی کە هێزێکی چەند هەزار کەسی، بنێرێتە سەر (عكا)و هێرشی بۆ ببات. ئەم هێزەش دەبوا بەسەر خاکی هەرێمی (طبرية)دا تێپەڕێ، سەڵاحەددین، داوای لە ڕیمۆند کرد ڕێگا بە هێزەکانی بدات تێپەڕێ. ڕیمۆند، شەرمو

---

[1330] الكامل، ٤٤٣/١١، مفرج الكروب، ٦٢/٢.

[1331] سنا البرق الشامي، ٢٦٠/١.

[1332] رنسيمان ٦٧٣/٢. Stevenson, p.200

[1333] هۆی ئاگربەستەکەش ئەوەبوو، ناکۆکی کەوتبووە نێوان ڕیمۆندو نێوان (جی لوسینیان) ی مێردی شاژنی (بيت المقدس)، لەبەرئەوەی ڕیمۆند بەلای سەڵاحەددیندا دایشکاند. بۆ زێدەزانینی ئەم ناکۆکییەش، بنۆڕە: الكامل، ٥٢٦/١١، ٥٢٧.

[1334] الكامل، ٥٢٧/١١. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، في مجلة الشرق، السنة ٤٧، ج٤، ٥. لسنة ١٩٥٣. ص٤٤٣.

[1335] النوادر، ٧٤. مفرج الكروب، ١٨٦/٢. ابن خلدون، مجلد، ٥، ق٣، ص٦٦٨.

[1336] الفتح القسي، ٥٩. مرآة الزمان ٣٩٢/٨. الروضتين، ٧٦/٢. مفرج الكروب ١٨٦/٢.

[1337] الكامل، ٥٣٢/١١. زبدة الحلب، ٩٣/٣، ١١٨ـ ١١٩.

ڕووزەردی دایگرت، بەڵام ناچاریش بوو ڕێگا بە هێزەکانی سەلاحەددین بدات تێپەڕن، چونکە لەگەڵ سەلاحەددیندا جۆرە هاوپەیمانییەکی هەبوو، بەلام ڕێنمایی شارەکانی هەرێمەکەی کرد، بە تایبەتیش شاری (الناصرة)و (طبرية)، کە دەرگای شار بۆ سوپای ئەییوبیان نەکەنەوە. لێرەدا خاچدروشمان بۆیان دەرکەوت کە ئەم دووبەرەکییەی ناوخۆیان مەترسییەکی گەورەی لێ دەکرێو ئەنجامی ترسناکی لێ دەکەوێتەوە، لەبەرئەوە دەستبەجێ، ڕیمۆند لەگەڵ (جی)دا ڕێککەوتەوەو دەستی لە ئاگربەستەکە کێشایەوەو پەشیمان بووەوەو ڕایگەیاند، کە ئامادەیە شان بەشان لەگەڵ خاچدروشماندا بکەوێتە شەڕی ئەییوبیانو کەوتەوە دوژمنایەتی سەلاحەددین.[1338]

کە ئەم هەواڵە گەیشتە سەلاحەددین، ئەویش ئیدی بە مافی خۆی زانی ڕێکەوتننامەکە پشتگوێ بخات. کاتێکیش خاچدروشمان بەمەیان زانی، خڕبوونەوەو خۆیان بۆ هەڵمەتو هێرش ئامادەکرد.

هەرچی سەلاحەددینە، ئەوە، ئەو، لە دەوروبەری (الكرك)ەوە بەرەو (عشترا)[1339]کەوتەڕێو لەوێ ئۆردوگای خۆی سازداو هەموو لەشکرەکانیشی گەیشتنە ئەوێ. پاشان ئەم هەموو لەشکرگەلە بەرەو زارکی (الاقحوانة) ی باشووری (طبرية) کەوتەڕێو لەوێ بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ مانەوە. سەلاحەددین، لە ماوەی ئەو پێنج ڕۆژەدا، سوپاکەی خۆی بۆ شەڕی یەکلایی ئامادەکردو تاماوەیەکیش مایەوەو کەوتە سووسەی دوژمن، تا بزانێ نیازی چییە. پاشان هەر میرەو جێگاو پێگەی بۆ دەستنیشان کردو فەرمانی دانێ، بەرەو ڕۆژئاوا بکەونەڕێو بگەنە گوندی (الصنبرة)[1340]ی ناو زورگەکانی دەوری ناوچەی نزیك بە دەریاچەی (طبرية).

ئەم جێگەیەی کە سەلاحەددین بەگەنی کرد هێزەکانی لێ دامەزرێنێو ئۆردوگای لێ هەڵبدا، جێگایەکی ترسناك بوو، چونکە دەریاچەکە کەوتە پشت ئۆردوگاکەوە، ئەمەش لە ڕوانگەی ستراتیجی سەربازیی و شەڕەوە، زۆر ترسناك بوو و بە گران دەنیشتە سەری، چونکە ڕێگای کشانەوەو ڕاکردنی لە خۆی بڕی. بەلام. لەلایەکی دیکەوە. سوودیشی هەبوو، چونکە ڕێگای ئاوەکانی ڕووباری ئوردون و کانیاوەکانی ناو ئەو شیوەڵو دۆڵو زورگەی. کە هەمووی دەچوونەوە سەر ڕووباری ئوردون.، لە دوژمن بڕیو خاچدروشمان بۆ نەختێ ئاو دەبوو وەناو زورگەکان کەون کە هەمووی ئۆردوگای سەلاحەددینی لێ دامەزرابوو.[1341]دەربارەی هەڵبژاردنی ئەم جێگە خەتەرناکەش، (أبو شامە) دەڵێ: "موسوڵمانان دەیانزانی کە ڕووباری ئوردون کەوتووەتە پشتەوەیانو وڵاتو شاری قەومەکەش کەوتووەتە ژێر دەستیان، خوا نەبێ کەس ڕزگاریان ناکا"[1342].

لە گوندی (الصنبرة)وە سەلاحەددین چەرخەچییەکانی نارد، تا دەنگوباسی سوپای دوژمنی بۆ کۆ بکەنەوە، تا بزانێ ژمارەیان چەندەو بارگەو چەكو ئازووقەو ئاویان چەندەو، بۆ کوێ دەچن و لە کوێوە دێنو نیازیان چییە. جا لەسەر ئەم زانیارییانە، لەگەڵ میرو فەرماندارەکانیدا کەوتە پلان دانان، لەم پلانانەشەوە توانستو لێهاتوویی سەلاحەددین بەدەرکەوت. ئەو حەزی دەکرد جەنگێکی یەکلاییان لەگەڵدا بکاو بنەبڕیان بکا، بەڵام ڕەفتارێکی ئەوتۆی دەنواند کە ئەوان دەست پێ بکەنو بەرەو ڕووی بێن. دوژمن بەڕێوەبوو، دەهات، تا بە تەواوی کەشەنگو ماندووبوو، بەڵام سوپاکەی سەلاحەددین لە جێی خۆی دایکوتابوو، لە ئیسراحەتدا بوو[1343]و ئامادەبوو، لە هەر کاتێکا دوژمن بگەیشتابا، ئەمان دەستبەکاربوون. بەلام سەلاحەددین نەیدەویست هەموو هێزەکانی لە گوندی(الصنبرة) گل بداتەوە، لەبەرئەوە، نیوەی هێشتەوەو بە نیوەکەیتری هەڵیکوتایە سەر خودی شاری (طبرية)و شار خۆیدا بە دەستەوە. تەنیا قەڵاکەی نەبێ.، خاوەن قەڵا. کە ئافرەتیش بوو.. درێژەی دا بە بەرەڤانیو خۆی بە دەستەوە نەداو زەلامی نارده لای ڕیمۆندی

---

1338 الكامل، ٥٣٠/١١. شفاء القلوب، ١١٨ـ ١١٩.

1339 عشترا: جێگایەکە لە حۆران، سەر بەدیمەشقە، معجم البلدان، ١٢٥/٤.

1340 الصنبرة: جێگایەکە لە ئوردون لە (طبرية)وە سێ میل دوورە.. معجم البلدان ٤٢٥/٣.

1341 السرساوي، لە مێژووە جوانەکانی سەربازی .. ص٣٣ـ ٣٤.

1342 الروضتين، ٨١/٢. وفيات الأعيان، ١٧٥/٧. النجوم الزاهرة، ٣٢/٦.

1343 د. سعيد عاشور، الحركة الصليبية، ج٢، ص٤، ٨.

**مێردیو barودۆخەکەی تێگەیاند.**

ڕۆژێکی چارەنووسساز تەیارو ئامادەکردبوو. لەبەرئەوە، سەلاحەددین، هەرکە بیستی وا خاچدروشمان بەرەو لای ئەو کەوتوونەتە ڕێ، وەك گوڵ گەشایەوەو بەدەنگێکی بەرز گوتی: "وا مەرامتان هات دی، ئەوەی خۆزگەمان بۆ دەخواست وا ڕوی دا، ئەوەی بە ئاواتییەوە بووین واهات". [1350] ئەوجا ماوەی پێنج میلێ بەلای ڕۆژئاوای (طبرية)دا، هێزەکانی وەپێش داو لەوێ ئۆردوگای لێ خست، بەلام هەندێ زەلامیشی بە دیار قەلاکەی (طبرية)وە جێ هێشت. [1351] بۆ ئۆردوگاکەشی، دامێنی زورگەکانی لای شانی گوندی (حطين)ی بەگەن کرد، کە جێگایەکی ئاودارەو دەورووپشتی دارستانەو وەك جێگای گوندی (صفوريه) وەهایە. ڕاستیشت دەوێ، سەلاحەددین ئەم جێگایەی هەروا بە ڕێکەوت و لە خۆڕایی هەڵنەبژارد، نەخێر، ئەو لەوێوە دەیتوانی ڕێگای ڕاستەوخۆی (طبرية) ببڕێ و دەستیش بەسەر ئەو ڕچەو ڕێگایانەشدا بگرێ کە بە قەراغی ڕۆژهەلاتیدا دەگەیشتە (طبرية)و لە ئاوی دەریاچەکە کۆتاییان دەهات. [1352]

ئنجا، هەردوولا، بەلەشکرسازییەکی تۆکمەوە، خۆیان بۆ جەنگێکی بەربلاو ئامادەکرد، هەردوولاشیان دەیانزانی کە ئەم جەنگەی بەتەمان جەنگێکی چارەنووسساز دەبێ و لەشکرکێشیش، بەم گرنگییە سازبدرێ و جەنگێکیش بەم گەورەییە بقەومێ، بێ گومان ئەو لایەنە دەیباتەوە، کە لەفەرماندەی بالاوە یەکن و ڕیزەکانیان زەبتن و جەنگاوەرەکانیشی بە پێی توانست تا کۆتایی شەڕەکە خۆڕاگرو ورە بەرز دەبن و چەکەکانیشیان بە شێوەیەکی ئاقلانەو شارەزایانە دەخەنە کارو، لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کارێکی وا بکەن کە دوژمن ناچار بکەن بێتە پێش و دەست بە شەڕ بکا.

خۆ، ئەگەر، هێرش کردن بە حسابی دانەرانی پلانی شەڕ، بە باشترین جۆری بەرەڤانی لەقەڵەم درابێ، ئەوا، لێرەداو لەبارودۆخ و هەلومەرجی ئەم دوو هێزەدا، ئەو لایەیان چاك دەکا، کە بتوانێ لایەنی بەرامبەر بخاتە هێرش و بۆ لای خۆی ببزوێنێ، سەلاحەددین ئەمەی دەزانی و زۆر بە ئاقلانەش خستییە بەرکار، کەچی، خۆی، یەکەم جار لە پێشەوە هێرشی کردە سەر (طبرية).

ئەم تاکتیکە نایابەی سەلاحەددین، دەریخست کە فەرماندارێکی ئاقڵ و قاڵ و پڕئەزموونە. بەڵێ، خاچدروشمانیش نیزایان وابوو، بەرەڤانی بکەن و هێرش نەکەن و سەلاحەددین ناچار بکەن بکەوێتە هێرش و پەلامارو بەرەو لای خۆیان سوپاکەی ڕاکێشن و مسوڵمانانیش تووڕە بکەن تا هێرش بەرن، بەلام، باش بوو لەناوخۆیاندا. کە لە (طبرية) چی بکەن و چی نەکەن. تێك چوون و ئاژاوەیان تێکەوت، کە قەلاکەشی هێشتا هەر بەرەڤانی دەکرد و خۆی بەدەستەوە نەدابوو. هەرچی سوپاکەی سەلاحەددینە، ئەوە، ئەوان هیچ کێشەیەکیان لە نێواندا نەبوو، یەك فەرماندەو یەك ئامانجیان هەبوو، ئیدی سەلاحەددین، دەستبەجێ هەلی میرژنی گەمارۆدراوی خستەکارو دوژمنی خستە سەر دڵەڕاوکێی سەلامەتیی ئەو ئافرەتەو ناچاری کرد، دەست بکا بە پەلاماردان و هێرش.

سەلاحەددین، سوپای تەیارو ئامادەکرد، ڕۆژی نمایشیش بەسەر ڕیزو باڵەکانیدا گەڕاو ڕێکیانی خستن. وەك (العماد)یش دەڵێ، بۆ هەر میرەو ئەرکوئیشی بۆ دیارکردو بۆ هەر پلەدارێك پلەی خۆی تێگەیاندو، بۆ هەر بۆسەیەکیش جێگای لەباری دەستنیشان کردو، بۆ هەر مشتێکیش شمشێری یەمەنیی شایانی پێداو بۆ هەر تیرئەندازێکیش سەنگەری خۆی پیشان داو ... کە میر نابێ چ لە قۆلی ڕاست چ لە قۆلی چەپ جێگای خۆی بگۆڕێ و چەرخەچییان نابێ کەموکورتییان هەبێ و [1353] لە هەموو کەلێن و کەلەبەرێکەوە خڕی کردنەوە. بەلام دەربارەی قەوارەی ئەم سوپایە، (العماد) گوتی: "سوپای وەها جێگیرو گەورەم نەدیوە". [1354] لێ لە کتێبی (الفتح القسي)یەکەی خۆیدا، هەرچەندە خۆی لەگەڵ

---

[1350] الفتح القسي، ٧٧. الروضتين، ٧٦/٢.

[1351] النوادر، ٧٦. مفرج الكروب، ١٨٩/٢.

[1352] د. الباز العريني، الشرق الأوسط، ٨٣١/١.

[1353] الفتح القسي، ٦٩-٧٠.

[1354] الفتح القسي، ٦٤. الروضتين، ٧٦/٢.

**سوپاکەدا بووە،[1355] کەچی لەو کتێبەدا باسی قەوارەی سوپاکەی نەکردوە. بەڵام مێژوونووسانی دیکە باسیان کردووەو ژمارەی سوارەکانیان بە دوازدە هەزار سوارە خەمڵاندووە.[1356] ئەمە، جگە لە پیادەو سەربازی تەوعی.[1357] خۆ، وەنەبێ سوپای خاچدروشمان ژمارەو چەکی، لەم سوپایەی ئەییوبیان کەمتر بوو[1358] بێ، ئەگەر زیاتریش نەبووبێ[1359].**

**مێژوونووسانی ئیسلام، ژمارەی سەربازانی خاچدروشمانیان، بە سوارەو پیادەوە، بە نزیکەی پەنجا هەزار کەس قەرساندووە.[1360] یان بە نزیکەی چل هەزار زەلام قەرساندووە.[1361] هەندێکیشیان بە زیاتریشیان داناوە.[1362]**

**لە بەرەبەیانی ڕۆژی (٢٤)ی (ربیع الثانی)ی ٥٨٣ك/ تەمموزی (١١٨٧ز)دا، کە خاچدروشمان بەرەو (حطین) کشان، ئەو ڕۆژە، گەرما تاوی سەندو بایەکەیشی خست، خاچدروشمان بەسەر زۆرگو گردە ڕووتەنەکاندا تەکانیان دەدا، ڕیمۆندی سەرگەورەی (طبریة)ش لەبەرئەوەی مێردی میرژنی شارەکەیە، خۆی فەرماندەیی سوپاکەی کرد، هەرچی مەلیك (جی لوسینیان)یشە، ئەوە، ئەو فەرماندەی ناوجەرگەی سوپاکەی وەرگرتو (أرناط)و (بالیان أبلین)ی کوڕی (بیرزان)یش، پێکەوە لەگەڵ قەشە سوارچاکەکانی (داویە)و (أسبتاریە)دا، پاشکۆی سوپاکەیان پێ سپێردرا.[1363] گوندی (صفوریە)ش لە دوو ڕێگەوە دەچووەوە سەر (طبریة)و ڕێگا چاکەکەیان ئەوەبوو کە ڕوو لە باکووری ڕۆژهەڵات دەڕۆیشتو بە ناو زۆرگەکانی (الجلیل)دا تێدەپەڕیو پاشان دەشکایەوە بۆ سەر دەریاچەکە. ئەوە ئەو ڕێگەیە بوو، کە خاچدروشمان یەکسەر ملیان لێ نا. هەرچی ڕێگەکەی دیکەیە، ئەوەیان بەرەو پێڵەکەی (پردەکە)ی لای گوندی (الصنبرة) دەکشا. ئیدی لەم جێگایەوە، لاڕێیەکی لێ جیادەبووەوە بە درێژایی کەناری دەریاچەکەدا بەرەو باکوور[1364] دەڕۆیشت.**

**بەو جۆرە، سەلاحەددین کاتو ساتو جێگەو ڕێگەی شەڕی دەستەویەخەی بەسەر دوژمندا دەسەپاندو دوژمنی کێش دەکرد بۆ شەڕو هێرشو لەو پلانەدا دەستی باڵای هەبوو ڕاستیشت دەوێ، ئەگەر خاچدروشمان لە (صفوریة) بمانایەو هێرشیان نەکردبا، ئەنجامەکەی وەها نەدەبوو و حاڵیان بەو حاڵە نەدەگەیی. خاچدروشمان، بەرلەوەش، جارێکیان سەلاحەددین پلانێکی وەهای بۆ نابوونەوە، کە ناچاریان بکا بۆ هێرشو پەلامار، کە لە (جمادی الآخرة)ی ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٣ز) دا، لە غەزاکەی بیسانی (عین جالوت)دا[1365] پێڕەوی کرد. ئەمەش مانای ئەوەیە کە سەلاحەددین پێش ئەم شەڕەی (حطین) ئەم جۆرە تاکتیكو پلانەی هەر هەبووەو دەشیزانی کە خاچدروشمان سەرەڕای ئازایەتی. کە**

---

[1355] (ئەمە ـ ابن شداد ـ یش دەگرێتەوە).

[1356] الکامل / ٥٣١/١١. زبدة الحلب، ٩٢/٣. الروضتین، ٧٦/٢. مفرج الکروب، ١٨٧/٢. البدایة والنهایة، ٣٢٠/١٢. السلوك، ٩٣/١. الذهبي، مخطوط تأریخ الاسلام، ق١، ورقة ٧ب . شفاء القلوب، ١١٩.

[1357] (لەبەشی یەکەمدا باسی ئەوەمان کرد).

[1358] أرنست بارکر، الحروب الصلیبیة، ٢٣٢.

[1359] رنسیمان ٧٣٦/٢. الباز العریني، الشرق الاوسط ٨٢٩/١.

[1360] الفتح القسي، ٧٤. الروضتین، ٧٦/٢. مفرج الکروب، ١٨٩/٢. البدایة والنهایة، ٣٢٠/١٢.

[1361] الیافعي، مرآة الجنان وعبرة الیقظان، ط/٢، منشورات مؤسسة الأعلمي للمطبوعات، ١٩٧٠، ج٣، ص٤٢٤.

[1362] الذهبي، ن، م، و.

[1363] رنیسمان، ٧٣٧/٢. د. عاشور، مصر والشام في عهد الأیوبیین والممالیك، ٣٣/٣٤. الباز العریني، الشرق الأوسط، ٨٣١/١.

[1364] الباز العریني، ن، م، ص.

[1365] الکامل، ٥٠١/١١. النوادر، ٦٢. زبدة الحلب، ٧٢/٣. الروضتین، ٥٠/٢. مفرج الکروب، ١٤٨/٢ـ ١٥٠.

سەرچاوەکانی ئیسلامی دانیان پێداناوە.[١٣٦٦] بەڵام دەمێ بوو، ڕاهاتبوون کە لە گوندە قایمکارەکاندا نەبێ، شەڕناکەن، بە مەرجێکیش. وەك (العماد) دەڵێ. ڕزگار بوونیان زامن بێتو[١٣٦٧] پشتیان بە قایمەوە بێت.

کەواتە، فریودانی دوژمن، کە خۆی لەم ڕۆژە گەرمەو بەم بێ ئاوییەو لەم دووردەستیی خۆاکەدا، شەڕێکی بەربڵاو دەست پێ بکا، بوو بە بنەمایەکی گەورەی ئەنجامی شەڕەکەو لە قازانجی سوپای سەلاحەددین هاتە کۆتایی. سەرباری ئەوەش، سەربازان پشتیان لە ژێر ئاسنی داخی خودەو چەكو قەڵغاندا چەمابووەوەو زمانیان لە تینوێتیدا وشك بووبوو و لەشیان هەر ئەوەبوو لەبەر تینی ئەو خۆرەتاوەدا ئاگری نەدەسەند.[١٣٦٨]

خاچدروشمان، کە بەم تێوەگلاوییە ڕێگایان گرتبووە بەر، کەوتبوونە بەر تیرابانی بۆسەچیو چەرخەچییەکانی ئەیوبییانو هەندێکیان لێ کوشتنو ئەسپو وڵاغی زۆریشیان لێ کوژران، بەمەش خاچدروشمان زیاتر شڵەژان.[١٣٦٩] بەهەرحاڵ گەیشتنە زەمینەی شەڕو ماندوێتییو تینوێتیی برستی لێ بڕیبوون، نەیاندتوانی بە باشی ڕووبەڕووی سوپای ئەییوبیان ببنەوەو شەڕبکەن. وەلێ شەڕەکە قەوما، چونکە (مەنکۆرس)[١٣٧٠] کە سوارەیەك بوو لە سوارچاکانی سەلاحەددین، پەلاماری دانو شەڕێکی جوامێرانەی لەگەڵیاندا دەست پێ کرد، خەڵکی سەرسام کرد، بەڵام خاچدروشمان بەگەلەکۆمە لێی ئاڵان تا کوشتیان، ئەوجا ئەییوبیان هاتنە جۆشو بەیەك تەکان خاچدروشمانیان لەق کرد،[١٣٧١] وەلێ ئەو ڕۆژە، بەبێ ئەنجام کۆتایی هات، هەرچەندیشە خاچدروشمان نیشانەی کزییو برسێتییو تینوێتییان زۆر پێوە دەبینرا.

خاچدروشمان بە زەرووریان زانی، شەو، لە بانە (هضبة)کەی (حطين) لە نزیك گوندی (لوبيه) بەسەرببەرن، ئەمە خوایە، بۆ سبەی بەیانی ئاویان دەست بکەوێ. کە سەلاحەددینیش ڕێگای سەر ئاوەکانی گرتبوو، ڕێگاکەی دەریاچەی (طبرية)شی ئەم دیوو ئەو دیو گەمارۆ دابوو، ناچار ئەو شەوەش، کەشەنگو بەدەمی وشك، بە ئاخو ئۆف تا بەیانی مانەوە، بەڵام شەو چ شەو، تا بڵێی سەختو گرانو بە ئەزموون. بە درێژایی ئەو شەوە، دەنگی موسڵمانان لە دەشتەکەی (حطين)ەوە دەهاتە گوێیان "کە بە هەڵلاو بگرو تەکبیرەوە دەیانبردە سەر. هەندێ لە سەربازانی خاچدروشمان، ئەو شەوە، دزەیان کرد، بۆ سەر کانیاوەکانی دەوروبەری گوندەکەی (حطين) لە ناوی دۆڵی (الحمام)دا، بەڵام موسڵمانان لە بۆسەدا بوون، بەرلەوەی بگەنە سەر کانییەکان، کوژران".[١٣٧٢] ئەییوبیان چالاکییەکی ژیرانەی گرنگیشیان ئەنجام دا، مەسەلەکەی یەکلایی کردەوەو بەتێکشکانو هەڵاتنی خاچدروشمان کۆتایی هات، ئەویش، ئەوەبوو کە ئاگریان لە قرچەو هەژگو پەرێزی ئەو بانەی (حطين) بەردا، ئەم کارە، کۆمەڵێ لە سەربازانی تەوعی لە ژێر فەرماندەیی میر (مظفر الدين كوكبرى) دا، بە ئەنجامیان گەیاند. ئاور بەرە بەرە تەشەنەی کردو کڵپەو تینو تاوی بەگژ دوژمندا هەڵگەڕاو دنیاش گەرم بوو و وەرزەکەشی هاوین بوو، بەو جۆرە گەرمیی ئاگرو گەرمای هاوین، ناوچەکەیان کرد بە دۆزەخو سەربازانی دوژمن و ئەسپو ئاژاڵیان بەیەکجاریی ژیانیان لێ تاڵ بوو و گوزەرانیان نەما، ئەوە تینوێتیی و ژانی زامو برینو

---

[1366] هەر بە نموونە : (أسامة بن منقذ) کە خۆی هاوزەمەنی سەلاحەددینە، دەڵێ: فەرەنگ خەسڵەتی ئازایەتی و جەنگاوەرێتییان هەیە، (الأعتبار، ص١٣٢) کەچی لە جێگایەکی تردا دەڵێ: جوامێرنینو بێ غیرەتن، بەڵام ئازاو بەجەرگن! (ن، م، ص١٣٧). الكامل، ١١/٣٥٣ـ ٣٥٤. النوادر، ص١٦٧، ٢٢٣، ٢٢٤. الروضتين، ٢/١٨٦.

[1367] الروضتين ٢/٢٨.

[1368] محمد سعيد العريان، قصة الكفاح، ص٣٧. فيليب حتي، تأريخ السورية، ص٢٣٧.

[1369] الكامل، ١١/٥٣٥.

[1370] الروضتين، ٢/٧٧.

[1371] الكامل، ١١/٣٥٣.

[1372] الكامل، ١١/٥٣٥. مفرج الكروب، ٢/١٩٠.

کێشەی شەڕیش لەولاوە بووەستێ.[1373]

ڕیمۆند ئومێد بڕبوو، ئاوی دەست نەکەوت، ئیدی خۆی پێ ڕانەگیراو هێرشی کردە سەر ئەییوبییان لەو قۆڵەوەی (تقي الدين عمر) فەرمانداری دەکرد. ئەمیش ڕێگای بۆ چۆڵ کرد، تا خۆی و گرووپەکەشی لە گەمارۆکە وەدەرکەون، ڕیمۆندو گرووپەکەی لە گەمارۆکە دەرباز بوون و وایاندەزانی سەرکەوتنیان بە دەست هێناوە، کەچی هەرئەوەندەی زانی گەمارۆکە وەك خۆی لێ هاتەوەو کەلێنی تێدا نەما. بەڕاستی ئەو فەرماندارە ئەییوبییە پلانزان و بەهرەدارێکی زیت و زیرەك بوو.[1374] ڕیمۆند یەك ڕێگای بۆ مایەوە، ئەویش ئەوە بوو، خۆی دەرباز بکات و ڕا بکات، بەو جۆرە شەڕی بەجێ هێشت و خۆی گەیاندە شاری (صور)و لەوێشەوە بۆ (طرابلس)ی میرنشینی خۆی، ئیدی، لەوێ بە خەم و خەفەت و ئازاری نەخۆشییەوە گیانی لە دەست دا، چونکە بوو بووە بنێشتە خۆشەی سەر زمانی خەڵك و دەیانگوت توخوا جاوەرە سەیرکە! ئەو کابرایە لەو تەنگانەیەدا، پشتی لە مەسەلەکە کردو خیانەتی کردو هەڵات، (وليم بۆرل)ی سەرۆکی تایەفەی (أسبتاری)یش، بەدووی ئەودا قووچانی و ڕای کرد. پاش ئەویش (باليان بن بيرزان)یش تێی تەقاندو هەڵات، کە سەرگەورەی (يبنى)[1375] بوو. ئنجا، دوای ئەوان رينۆڵد میری (صيدا)و، ڕیمۆندی گچکە، کوڕی سەرگەورەی (أنطاكية)ش[1376] هەڵاتن و بۆی دەرچوون.

ڕاستیشت دەوێ، ئەو نیگەرانیی و ماندووبوونەی بەرلە هەڵایسانی شەڕەکە، بەسەر خاچدروشماندا هات، بووە هۆی تێکچوون و ئاڵۆزیی لە ناویانداو ڕاکردنی میرەکان لەگەڵ ڕیمۆنددا. ئەو تێکچوونەش لە کاتی پێکدادانەکانیشدا هەر بەردەوام بوو. ئەو سەربازانەش کە مانەوە، ناچار بە گردەکەدا هەڵدەگەڕان و سەرکەوتن، بەڵکو ئەمە خوایە ڕزگار بن، مەبەستیشیان وا دیارە، تەنها هەر ئەوە نەبوو کە لە شەڕەکە ڕابکەن، بەڵکو سەرگردەکەش بۆ ئەوە لەبار بوو، لەو بەرزییەوە تیربارانی سەربازانی سەلاحەددین بکەن. سوارەکانیشیان کە چەکی قورسی ئاسن بێزاری کردبوون، بە شیرزەیی کشانەوە داوە، پاشان لە دەوری مەلیك و خاچی پیرۆزیان خڕبوونەوە. داتەپین و ورەبەردانی پیادەکانیشیان بەهۆیەکی گرنگی بێ هێزبوونی خاچدروشمان دادەنرێ، چونکە سوارەکانیان پشتیان بە پیادەکان دەبەست و ناوبانگی ئازایەتیی سوارچاکانی خاچدروشمان لە سایەی پیادەکانەوە پەیدابوو[1377].

سا، بەهەرحاڵ، مەلیك (جی)و گرووپەکەی وای بۆچوون، کە مەگەر بە شەڕ لە مەرگ ڕزگار بن، هیچ ڕێگاو چارەیەکی تریان نەماوە، لەبەرئەوە، ئازایانە ملیان لێ ناو کەوتنە پەلاماری ئەییوبییان.[1378] بەڵام سەربازانی سەلاحەددین. وەك (إبن الأثير) دەڵێ. وەك بازنەی دەوری مەچەك دەوریان گرتبوون، مەلیك (جی)یش هەر گاڵی خاچدروشمانی دەداو داوای لێ دەکردن بۆ پێشەوە بڕۆن و هێرش بکەن، ئەوانیش دەیانگوت: هێرشی چی، ئێمە لە تینووانا وا ئاگر لە هەناومان بەربووەو ئەم خۆرە گەرمەش، بەجارێ چاومانی کوێر کردووەو ئەم لمەی ژێر پێشمان وەك ژیل بنەپێمانی سوتاندووە.[1379] مەلیك دەستێکی کەوتە ئەم لاو دەستێکی کەوتە ئەولا، گوتی، دەباشە بچن دەوارەکانتان لە جێگایەکی بەرز هەڵدەن، سەلاحەددین فەرمانی دا شوێن پێیان هەڵبگرن و دوویانکەون.[1380] زۆری نەبرد تێکچڕژان و ئەییوبیان

---

1373 الكامل، ۱۱/٥٣٥. مفرج الكروب، ۲/۱۹۰. النوادر، ۷۷. مرآة الزمان ۸/۳۹۳. زبدة الحلب، ۳/۹٤. الروضتين، ۲/۷۷. البداية والنهاية، ۱۲/۳۲۱. الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ۸/أ. Stevenson , The Crusades, p.247.

1374 الكامل، ۱۱/٥٣٥. النوادر، ۷۷. الفتح القسي، ۷۹. الروضتين، ۲/۷۷. مفرج الكروب، ۲/۱۹۰. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، ج٤، ٥، ص٤٤٤.

1375 يبنى، بليد قرب الرملة، معجم البلدان، ٥/٤٢٨.

1376 الروضتين، ۲/۷۷.

1377 Lane – pool, Saladin. PP, 8210 – 2118.

1378 الفتح القسي، ۷۹ـ ۱۱/٥٣٥.

1379 قدرى قلعجي، صلاح الدين، ص۳۲.

1380 الكامل، ۱۱/٥٣٥. مفرج الكروب، ۲/۱۹۱.

خاچە گەورەکەیان لە دەست سەندن، بەو پارچە تەختەیەشەوە کە حەزرەتی عیسای پێدا هەڵواسرا. ئەم خاچ لێ سەندنەش لە هەموو کۆستێ گەورەتر بوو بۆ خاچدروشمان.[١٣٨١]

بەسەر گردەکەوە، نزیکەی سەدو پەنجا سوارچاك لەگەڵ مەلیکەکاندا مانەوە، بەڵام شەڕەکە تا دەهات، گەرمتر دەبوو، پاشان ئەییوبیان شانیان پیادا کردو خۆیان گەیاندە خێوەتگاکە، کە بریتی بوو لە تەنیا دەوارێ بۆ مەلیك هەڵدرابوو، ئەو دەوارەشیان گرت. (ابن الأثیر) بە کورتی باسی دوا ڕووداوەکانی شەڕی (حطین) بە زمانی (الملك الأفضل نورالدین علی)ی کوڕی سەلاحەددینەوە، دەیگێڕێتەوە کە لەو شەڕەدا لەگەڵ باوکیدا بووەو هەرشتێکی دیبێ تۆماری کردووەو باسی لایەنی هەستو دەروونی باوکیشی دەکا لەو کاتەدا، کە تازە خاچدروشمەکان لە گردەکەوە دەهاتنە خوارەوەو خۆیان بە دەستەوە نەدا، (ألأفضل) دەڵێ: لەو کایەیەدا لە تەنیشت باوکمەوە وەستابووم، کاتێ مەلیکی فەڕەنگ لەگەڵ ئەو سوارچاکانەدا بەسەر گردەکەوە بوون، پەلامارێکی نەبەردانەی موسڵمانانی نزیك خۆیان دا، تا موسوڵمانانیان گەیاندە لای باوکم، ئەوجا چاوم هەڵبڕی و سەیرێکی باوکم کرد، دیتم ماتومەلوولەو ڕەنگی هەڵبزکاوە، ئنجا ڕیشی خۆی گرتو بەدەنگی بەرز گوتی: "ئەرێ وەڵڵا شەیتان درۆی کرد"، سەربازەکان گەڕانەوە گیان فەڕەنگەکانو تا سەرەوەی گردەکە هەڵیانبڕینەوە. منیش کە ئەمەم دی، لە خۆشیانا هاوارم کرد: ڕاومان نان!، ئەم جارەش، فەڕەنگەکان هێرشیان هێنایەوەو سەربازەکانمانیان ڕامالّی تا گەیاندنیانەوە لای باوکم. باوکم ئەوەی کرد کە یەکەم جار کردی. سەربازەکانمان لێیان گەڕانەوەو هەڵیانبڕینەوە بۆ سەرگردەکەو منیش دیسان هاوارم کرد گوتم: "ئەرێ وەڵڵا ڕاومان نان". باوکم ڕووی تێ کردم، گوتی: بێ دەنگ بە! تا ئەو دەوارە نەڕووخێ نایانبەزێنین. باوکم لەم قسانەدا بوو، دەوارەکە ڕما، ئەوجا لە ئەسپەکەی دابەزی و ڕکعەتێ نوێژی کردو لە خۆشیانا فرمێسك بە چاوەکانیا هاتە خوارەوە.

دەوارەکە ڕما، لەبەرئەوە بوو کە زۆر کەشەنگو ماندوو بوو بوون، بڕستیان لێ بڕابوو، گەلێکیش تینوو بوون. کە دیتیشیان هیچ ڕێگای ڕزگاری نییەو تروسکەی تێدا نەماوە، هەر هەموویان بەجارێ لە ئەسپەکانیان دابەزینو لەسەر زەوییەکە لێی دانیشتن. ئەوجا سەربازانی ئەییوبی بۆیان سەرکەوتنو دەوارەکەی شایان خستو سەرلەبەریان بەدیل گرتن.[١٣٨٢](دەرباس الکوردي) هەڵی کوتایە سەر مەلیکەکەیانو گرتی. هەرچی (أرناط)ە، ئەوە ئیبراهیم غولام (الامیر المهراني الکوردي) دەستگیری کرد.[١٣٨٣]لەناو دیلەکاندا پێشڕەوی (الروایة)و (الاسبتاریة) و خاوەن سەرگەورەی جبیلو بەیرووتو (صیدا)ش دەبینرانو هەر هەمووشیان هەواڵەی دیمەشق کران، بەڵام (أرناط)، ئەوە سەلاحەددین پێشتر نەزری کردبوو بیکوژێ، لەبەرئەوە بە دەستی خۆی کوشتی. هەرچی مەلیك (جی) بوو، ئەوە سەلاحەددین سەرفرازی کردو ئەویش پەیمانی دا بە سەلاحەددین، کە تێهەڵنەچێتەوەو بۆ ئیسلامکوژی نەیەتەوە، بەڵام وا دەرنەچوو، کابرا زۆری نەبرد پەیمانی شکاندو تێهەڵچووەوە.

ئیدی، ئا لێرەوە، لە (حطین)ەوە، سوپای ئەییوبیان سەردەمێکی نوێی دەست پێ کردو پاش ئەو سەرکەوتنە گەورەیە، کەوتە ئازادکردنی ژمارەیێکی زۆر لە قەڵاو قایمکارو شارەکانی ژێر دەستی خاچدروشمان. لێرەش لە (حطین) زەرەرو زیانێکی پشتشکێنی بە خاچدروشمان گەیاند، چونکە خاچدروشمان چاکترینو ئازاترینی سوارچاكو زۆرترین جەنگاوەریان لەم مەیدانەدا گردکردبووەوە، قەڵاو شارەکانی تریان بە نیوەچۆڵی بەجێ هێشتبوو و هەموو هێزەکانیان بۆ ئێرە هێنابوو. سەلاحەددین نەیهێشت ئەم هەلەشی لە دەست بچێو بە پێی حەدیسێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ: "من فتح له باب خیر فلینتهزه، فانه لایعلم متی یغلق دونه".[١٣٨٤] واتا: "کەسێ دەرگایەکی خێری بۆ کرایەوە، هەلێکەو لە کیسی خۆی نەدا، چونکە نازانێ کەی لێی دادەخرێ". ئیدی بە پێی ئەو حەدیسە، هەلی

---

[1381] الکامل، ٥٣٦/١١.

[1382] الکامل، ٥٣٧/١١. مفرج الکروب، ١٩٢/٢.

[1383] مرآة الزمان، ٣٩٣/٨. الذهبي، مخطوط تأریخ الاسلام، ورقة ٨/أ.

[1384] النوادر، ص٨١.

نیوەچۆڵیی قەڵاو شارەکانی خاچدروشمانی قۆستەوەو کەوتە پەلاماردانیان.

لێرەدا، کە باسی (حطین) بە کۆتایی دێنین. دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەم سەرکەوتنە پرشنگدارەی سەلاحەددین لەم شەڕەدا، نەك تەنیا هەر لە سایەی ئازایەتی سەربازەکانیو بە هۆی وەستاییو ئەو ستراتیجە دروستەوە بووبێ کە خۆی پلانی بۆ دادەڕشت، بەڵکو هەڵەو کەودەنیو لێنەزانینی دوژمنەکانیشی زیاتر کارسازییان لەم سەرکەوتنە گەورەیەدا بۆ ئاسان کرد. خاچدروشمان دووربین نەبوونو، وەك نێچیر دووی دامو داوی سەلاحەددینی نێچیروان کەوتبوون. سەلاحەددین کە نەخشەی ئەم ستراتیجەی دەکێشا، دەشیزانی چۆن چۆنی هەل لە هەڵەی دوژمن بڕەخسێنێ و بەسەریەوە نەچێ، چونکە بەهەل قۆستنەوەی هەڵەی دوژمن بە بەشێك لەو ستراتیجە لە قەڵەم دەدرێ کە فەرماندەکانی سوپا دایدەنێن.

## کەرتی حەوتەم

## ڕووداوە لەشکریەکانی

### ماوەی نێوان گەمارۆکەی ( عکا )و گەمارۆی شاری ( یافا )

**یەکەم: ( عکا )و گەمارۆ درێژخایەنەکەی ئەم شارە:**

**١- هەڵمەتەکەی ڕیشارد شێردڵ.**

**٢- چۆکدادانی ( خۆبەدەستەوەدانی ) شاری ( عکا )و هۆکارەکانی**

**دووەم: ڕووداوەکانی پاش کایەی ( عکا ):**

**١- لەشکرکێشی بەرەو عەسقەلان.**

**٢- شەڕەکەی ئەرسۆفو تێکشکانی سوپای سەلاحەددین.**

**٣- وێرانبوونی عەسقەلان.**

**٤- ڕێکخستنی کاری بەرەڤانی لە شاری قودس.**

**٥- خۆخڕکردنەوەی ڕیشارد بۆ داگیرکردنی قودس.**

**٦- گەمارۆ سەرنەگرتووەکەی یافا.**

## ڕووداوە لەشکرکاریەکانی

### ماوەی نێوان گەمارۆکەی (عکا)و گەمارۆی شاری یافا

### یەکەم: (عکا)و گەمارۆ درێژخایەنەکەی ئەم شارە:

شادومانیی سەلاحەددین بەگرتنی ئەم شارە لە دووسالێ پتری نەکێشا، چونکە هەر زوو خاچدروشمان بەخۆکەوتن و ڕیزەکانیان ڕێك خستەوەو بەرەو شارەکە بەخێرایی کەوتنە ڕێ و خۆیان بۆ تەکانی داگیرکردنی (عکا) سازو تەیارکرد، نەخاسمە سەلاحەددین گرتنی شاری (صور)ی بەدەستەوە نەهات‌و شکستی تێداهێنا. سەلاحەددین بەرامبەر بە خاچدروشمان سستیی لێ دەرکەوت‌و نەیکرد، بەر لەوان دەستپێشخەری بکاو لەشکر بۆ (عکا) بەڕێ بخاو بەرلەوان بگاتە شارەکەو نەیەڵێ ئەوان گەمارۆی بدەن. چەند ڕۆژێکیش خۆی دواخست، ئنجا لە ڕێگەی بەرفراوانی (طبرية)وە بەرەو (عکا) کەوتەڕێ، کە ئەم ڕێگەیە زۆر دوورە. بەڵام خاچدروشمان لەو زووترو خێراتر کەوتنەخۆ.

خاچدروشمان مەلیك (جی لوسینیان) فەرمانداریان بوو. (جی) کاتێ سەلاحەددین لە شەڕەکەی (حطين) گرتی‌و پاشانیش ئازادی کرد، ئیدی وردە وردە ورەی تازە بووەوەو ناوبانگی دەرکردەوەو بووەوە بە خاوەن پێگەو شان‌و، گرووپێ سوارچاك‌و سەربازی تەوعی لە دەوری خڕ بوونەوە، ئنجا پێش هەموو شتێك بەرەو (صور) کەوتە ڕێ، بەڵام ئەم شارە پێی قایل نەبوون و بە فەرمانی سەرداری شارەکە (کۆنراد دی مونتفرات) نەفرەتیان لێ کرد، چونکە کۆنراد، لەوە دەترسا (لوسینیان)ی مەلیکی (بيت المقدس) لەسەر ئەو کارە، لەسەرداریی شاری (صور)ی بخاو دەری بکا. لەبەرئەوە (جی) ناچار بایدایەوەو ڕووی کردە شاری (عکا). لەوێ (پیزییەکان)یش کەلە (صور) بوون، ئەوانیش کەوتنە پاڵی‌و، بوو بە خاوەنی هێزێکی نزیکەی هەزار چەکداری سوارەو پیادە.

ئێمە، لێرەدا، دەتوانین مێژووی خەباتی سوپای سەلاحەددین بکەین بەدوو قۆناغ، کە بەرایی ساڵی (٥٨٥ك/١١٨٩ز) لێکیان جیا بکاتەوە. قۆناغی یەکەم ئەو کایەیە بوو کە سەلاحەددین ڕیزەکانی لەشکری ڕێك دەخست‌و خاکی (عەرەبی) ئازاد دەکردو هێرشی دەکردە سەر ئەو شارو قەڵایانەی خاچدروشمان داگیریان کردبوون.

هەرچی قۆناغی دووەمە، ئەوە، کایەی بەرەڤانی کردنە دژ بەو هێرشانەی کە دوژمن، دوای ئەو هەموو دۆڕاندن‌و سەرشۆڕبوونانەی، دەستی بە تازەکردنەوەیانی کرد. هەروەها لەم کایەیەدا، قەڵاکان چاك کرانەوەو قایمتر کران‌و هەندێکیشیان وێران کران تا دوژمن نەتوانێ سوودیان لێ وەربگرێ‌و هێرشیان لێوە بهێنێ، بەتایبەتیش دژ بە میسرو (بيت المقدس).

ئەم دابەشکردنە، هەر لەو ساڵەوە بەدەرکەوت کە کۆششی سوپای ئەییوبیان، بۆ جەنگ گەیشتە ئەوپەڕی توانای، لەکاتێکدا خاچدروشمان دەستیان کرد بەڕێکخستنەوەی ڕیزەکانیان کە هاوزەمان لەگەڵ هەڵمەتی سێیەمی خاچدروشماندا یەکی گرتەوە، کە بە ترسناکترینی هەڵمەتەکانی پێشین‌و پاشینیش لە قەڵەم دەدرێ. بەڵێ لەم هەڵمەتەدا، گەورەترین‌و ناودارترینی شاکانی ئەوروپا بەشداربوون، بەنم[illegible]دریك باربارۆسای (ڕیش سوور)ی شای ئەڵمانیاو، فیلیپ ئۆگستۆسی شای فەڕەنساو، ولیەمی دووەمی ش[illegible]لیە)و پاشانیش شای ئینگلستان ڕیشارد شێردڵ.[1385] ئەمە، هەمووی لە کاتێکدا بوو، کە سوپای سەلاحەددین. بە پێچەوانەی پێشتری. تەنانەت توانای زاڵ بوونی بەسەر باقیمەنی ئەو خاچدروشمانەشدا نەمابوو، کە لە وڵاتەکەدا مابوونەوە، بە تایبەتیش ئەوانەی شاری (صور) کە مەرکیز کۆنراد دی مۆنتفرات فەرمانڕەیی دەکردن، هەروەها ئەوانەی میرنشینی (طرابلس)یش، کە بە سەلامەتیی کەیانی خۆیەوە مایەوە. تەنها شاری جبیلی سەر بەم میرنشینەی[1386] لێدەرچێ کە سەلاحەددین داگیری

---

[1385] لە سەرچاوە هاوچەرخە عەرەبییەکاندا بە شای (الانكتار) یان (الانكتێر) ناسراوە، واتا شای (ئینگلستان). (العماد)یش بە (لیجرت) ناوی دەبا. الفتح القسي، ٤٧٧.

[1386] الروضتين، ١٣٧/٢.

کرد.

هەرچە (انطاکیة)یە ئەوە، سەلاحەددین ئاگربەستێکی بۆ ماوەی هەشت مانگ لەگەڵ مەلیکی ئەم شارە (بوهیمند)ی سێیەمدا مۆرکرد، دوای ئەوەی قەڵا گرنگەکانی بە نموونە وەك (بکاس، شغر، سرمینیە، بغراس و درسباك)ی لێ دابڕی، وەلێ ماوەی ئاگربەستەکە تەواو بوو، ئیدی (أنطاکیة) دەیتوانی لێگەڕێ و بچێتەوە پاڵ ڕیزەکانی تری خاچدروشمان.

ئەم هەموو کێشەو شکستییانە کارێکی وەهایان کرد، سەلاحەددین ئیدی هەر بەکاری بەرەڤانیی و بەرگرییەوە خەریك بێ و واز لە پلانی هێرش بهێنێ و لەوە دەترسا زیانی گەورەتریان لێ بکەوێ. بەلام نەشی دەتوانی تەنیا بەرگریی لە (عکا) بکاو، خۆی بۆ ئەم شارە تەرخان بکا، بەڵکو ناچاربوو سوپاکەی بە هەموو لایەکی ولاتەکەدا دابەش بکا. جگە لەو هێزەی کە بۆ ئەم شارەی ناردبوو، بەشێکیش لەگەڵ (الملك الأفضل نورالدین علی)ی کوڕی لە (حمص) ئۆردوگای لێ هەڵدا بوو، تا نەیەڵێ کاری دوژمنانە ڕووبداو نەیەڵێ ئاوری جەنگ لای (طرابلس)ەوە هەڵسێ. بەشێکی دیکەی سوپاکەی بەدیار (صور)ەوە بوو، نەوەکا مەرکیز کونراد، کارێکی دوژمنانە لە دژی موسڵمانان ئەنجام بدا. بەشی سێیەمی سوپاکەی لە بەندەرەکانی میسر هەڵیاندابوو، نەخاسم لە (دمیاط و أسکندریة)، نەوەکا کەشتیگەلی خاچدروشمان لە دەریاوە هێز لەوێ دابگرن. بەشی چوارەم بەرامبەر بە(أنطاکیة) هەڵی دابوو، تا حەڵەب و ناوچەی حەڵەب لەهێرش و کاری دوژمنانەی (بوهیمند) بپارێزێ، نەخاسمە ماوەی ئاگربەستەکەش تەواو بوو بوو.[١٣٨٧]

سەلاحەددین، لە خۆڕایی نەبوو کە زۆرتر بایەخی بە بەرەڤانیی و بەرگریی دەدا، بەڵکو دەیزانی کە خاچدروشمان ڕیزەکانی خۆیان یەکخستووەو هێزەکانیان پتر بوون و زیادی کردووە، کەچی ئەو یاری و کۆمەکەی، کە بۆ سوپای سەلاحەددین لە میرنشینی موسڵ و دیاربەکرو شنگال و جێگاکانی دیکەوە دەهات، بە ئامادەبوونی (تقي الدین عمرو، مظفرالدین کوکبری) یشەوە، کە دوو فەرماندەی بەناوبانگی شەڕەکەی (حطین) بوون، هێشتا بەشی نەدەکرد و پێداویستی سەلاحەددینی پێ فەراهەم نەدەبوو، چونکە بە ژمارە کەم بوون و وەك خاچدروشمانیش سەرگەرم و لەخۆبوردە نەبوون.

هێزی خاچدروشمان، بە گەیشتنیان بە (عکا) دەستەجێ ناوچەکانی دەوروپشتی شارەکەیان کۆنترۆڵ کردو خۆیان تێدا قایم کرد "کە دابەزین ئیدی لە دەریاوە تا دەریا ملیان لێناو موسڵمانان هیچ ڕێگەیەکیان بەدەستەوە نەما بگەنە شارەکە"[١٣٨٨] یان وەکو (ابن شداد) دەڵێت: "ئەڵقەیەکیان بە دەوری شارەکەدا دروست کرد، کەس نەیدەتوانی بچێ و کەسیش نەیدەتوانی دەرچێ".[١٣٨٩]

خاچدروشمان، ئۆردوگاو سەربازگەی خۆیان لە بن شوورەکانی شارەکەدا هەڵنەدا، نەخێر، ئەمجارە لە شوورەکانیش دوورکەوتنەوەو چوون لەناو زۆرگەکانی نزیك شاردا خێوەت و دەواریان هەڵدا، بەوەش دانەکەوتن، کەندەکیشیان بە دەوری خێوەتگاکانیشدا لێ داو ئاویشیان شکاندە سەری، تا پڕ بوو. بەو جۆرە ئۆردوگای خاچدروشمان لە لایەکەوە بە کەندەك و لەلاکەی تریەوە بە شوورەکان دەورە دراو تەنیا لە ڕێگای دەریاوە پەیوەندییان بە دەرەوە دەکرد.[١٣٩٠] پاش ئەوە، بەربەستێکیشیان بە گڵ و قوڕ لە پشت کەندەکەکەوە دروست کرد. دیارە، ئەم نەختە جێگەیە لە چارەی نووسرا بوو شەڕێکی وەك ئەوەی (واتەرلو)[١٣٩١] گەورەتریشی تێدا هەڵایسێ. ئیدی پێویستی بەوە دەکرد سوپای سەلاحەددین، خاچدروشمانی گەمارۆدەری عەکا لە پشت کەندەکەکەوە گەمارۆ بدات، واتە گەمارۆ لە سەر گەمارۆ، چونکە سەلاحەددین لەوە زیاتری نەدەتوانی بکا. هەر ئەوەندەی بۆ کرا لە سەر گردی (کیسان)ی لای ڕۆژهەلاتی (عکا)و لە ناو

---

1387 الکامل ٣٦/١٢ . الروضتین ١٣٦/٢. شفاء القلوب،١٦١. Stevenson The Crusades, pp.٢٦ ٢٦١-

1388 الکامل ٣٤/١٢. الروضتین ١٤٧/٢. البدایةو النهایة ٣٣٣/١٢. ابن الوردي ٤٤/٢. السلوك، ١٠٢/١.

1389 النوادر، ص١٠٥.

1390 الکامل، ٣٤/١٢. النوادر، ١٠٥. الروضتین، ١٤٢/٢.

1391 هارولد لامب، شعلة الاسلام، ١٥٥.

دارستانەکانیدا ئۆردوگای لیٚ هەڵبداو[١٣٩٢] قۆڵی لای ڕاستی لەشکرەکەشی درێژ دەبووەوە تا گردی (العیاضیة)و قۆڵی لای چەپیشی تا ڕووبارەکە. هەرچی شتی قورس‌و گرانیشە، ئەوە لە (صفوریە)ی نێوان (عکا)و (طبریە) دایانگرتن، هەرچی کۆمەك‌و باربوو جبەخانەو ئازووقەشە، ئەوە بە ئاسانی بە ڕێی وشکانیدا دەگەیشتە سەلاحەددین، بەلام بۆ ناوشارەکە زۆر گران‌و، بە دەگمەنیش ئەگەر کەمیٚ بگەیشتایە، دەنا شارەکە گەمارۆدرا بوو، هیچی پیٚ نەدەگەیشت، بەلام بۆ خاچدروشمان، ئەوە، ئەوان پشتیان بەدەریاوە بوو، هەموو شتێکیان بە ئاسانی لە دەریاوە بۆ دەهات.

بە ڕاستی دەریا گەورترین دۆستی خاچدروشمان بوو، چونکە دەریا هێزو خۆراك‌و پۆشاك‌و چەك‌و هەموو پێداویستییەکی دیکەی لە وڵاتانی خۆیانەوە بۆ دەهێنان، کاتێکیش سوپای ئەییوبیان لە ڕەجەبی (٥٨٥ك/ ئابی (١١٨٩ز)دا بۆیان دابەزی، نەیتوانی بگاتە سەریان‌و نەشیتوانی بگاتە (عکا)، تا مانگی ڕەجەب بە سەرچوو، پاشان لە بەرایی شەعباندا دیسانەوە لەگەڵیاندا کەوتەوە شەڕ، بەلام بە مەرامی کاری خۆی نەگەیشت. هێزەکانی سەلاحەددین هەروا بەئامادەباشیی مانەوە، پاشان وەك (ابن الاثیر) دەڵیٚ: کوشتار بە ئاگرو ئاسن، بوو بە ڕیشیانەوەو بە دەوریاندا خولی خوارد، تا کەوتە نیوەڕۆ هەردوولایان سەبریان گرت‌و چاوەڕێیان کرد، ئەوەی ئەم حاڵەتەی دیتبا، سەری سوڕدەما.[١٣٩٣]

هەرکە بوو بە نیوەڕۆ (تقي الدین عمر) شالاوێکی دڕندانەی بۆ بردن (تقی الدین) فەرماندارییی قۆڵی ڕاستی سوپاکەی دەکردو کەوتە لە خشتە بردنی داویەکان. سەلاحەددین، بەشیٚ لە هێزی ناوجەرگەی سوپاکەی نارد بۆ یاریدەدانی قۆڵی ڕاست. بەوەش هێزی ناو جەرگەی سوپاکە کز بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، قۆڵی چەپ کە سەلاحەددین خۆی فەرمانداریی دەکرد هێرشەکەی دوژمنی تێك شکاندو (تقی الدین)یش بە هێرشیٚ دوژمنی لە بن شوورەکان ڕاماڵی‌و هێزەکانی خۆی لە جێگاکانی دوژمن داناو توانی هێزەکانی بگەیەنێتە ناو شارەکەش، لەو هێزانە بوون کە هەمیشە بۆ کوشتار ئامادە بوون. ئەم هێزانە دڕیان بە دوژمن داو چوونە ناو شارەکە، میر (حسام الدین أبو الهیجاء السمین) فەرمانداری دەکردن، کە یەکێکە لە سەرلەشکرە ناودارو ئازاو بە جەرگەکان، لە کوردە داناو ئازاکانی ناو شاری ئەربیل (هەولێر)ە".[١٣٩٤] ئەم فەرماندارە کوردە نەترسە، ئازوقەو خاروبارو چەکیشی بردە ناو شار. خۆ ئەگەر ئەییوبیان لەسەر هێرشی خۆیان بەردەوام بوونایە، ئەوە، سەرکەوتنی تەواویان بە دەست دەهێنا، چونکە "کوتەکی یەکەم حسابە" بەلام موسوڵمانان، حسابیان بۆ دوژمن نەکردو ئەو سەرکەوتنەیان پیٚ بەس بوو، ئیدی پاڵیان لیٚ دایەوەو دەستیان لە کوشتارەکە هەڵگرت‌و گوتیان "بابمێنیٚ بۆ سبەینیٚ، سبەی پەلاماریان دەدەین‌و کاریان تەواو دەکەین"[١٣٩٥].

لەنێوان هەردوو لادا، پێکدادان ڕۆژانە هەر ڕووی دەدا. ئێمە نامانەویٚ ئەو هەموو ڕووداوانە بگێڕینەوەو باسیان بکەین. ئەوەی بە لامانەوە گرنگە ئەو ڕووداوانەیە کە پێوەندیی بە پلانەکانی سوپاو ئامێرگەلی شەڕی هەردوو لاو ژمارەی کوژراوەکانیانەوە هەیەو هەندێکیشیانمان پێشتر باس کرد. ئنجا دێینە سەر باسی ڕووداوە گرنگەکانی ئەم گەمارۆ درێژخایەنە، کە بە گەورەترین ڕووداوو شەڕی سەردەمی خاچدروشمان لە قەڵەم دەدریٚ‌و دیارترین‌و زەقترین کۆششە جەنگییەکانی سەدەکانی ناوینە[١٣٩٦]. ئەم جەنگە گەرم‌و گەورەیە، نزیکەی دوو ساڵی خایاند (٦٨٥ ڕۆژ)، هەر لە (٢٧)ی ئابی (١١٨٩ز)یەوە تا (١٥) تەمموزی (١١٩١ز) بە ساڵی کۆچیش تا (١٧)ی (جمادی الآخرة)ی (٥٨٧) ك درێژەی کێشا. لەم جەنگەدا، هەموو توانست‌و هزرو ئاوەزی شەڕو لەشکرکاریی هەردوولا ڕووبەڕوو وەستان‌و گەورەترین‌و ناودارترین فەرماندارو میرانی شارەکانی خاچدروشمان بەشدارییان تێدا کرد. ڕێگەو شێوازی تازە لە کوشتاردا بەرکارخران‌و سیستەمی پۆستەو تەتەرو سیخوڕیش گەیشتە پلەیەکی نویٚ. بە هەزارانی تێدا کوژران‌و بریندار بوون، بە فەرماندە بەناوبانگەکانیشەوە. ژمارەیەکی زۆریش لە برسانناو لەبەر پیسبوونی هەواو پیسبوونی ئاو گیانیان لە

---

1392 معجم البلدان ٤٣/٢. النوادر، ١٠٤.

1393 الکامل، ٣٥/١٢.

1394 ن. م. ص. ن، ابن الوردي، ١٤٥/٢.

1395 ن، م، ن، ص. النوادر، ١٠٦ـ ١٠٧. الروضتين ١٤٣/٢.

1396 فليب حتي، تأريخ العرب، ص٧٤٠. تأريخ سورية، ٢٣٩.

دەست دا. گەلێکیش بە ناساغیی و نەخۆشی سەریان نایەوە. سەلاحەددین، خۆیشی نەخۆش کەوت و لە مردن گەڕایەوە.[1397] ڕیشاردی شێردڵیش نەخۆش کەوت. زۆریش لە فەرماندارەکانی سەلاحەددین کوژران، یان مردن، بە نموونە وەك (ظهیر الدین)ی برای مەلا (ضیاء الدین عیسی)ی هەکاری والیی قودس،[1398] میر (مجلي ابن مروان)، (الحاجب) خەلیلی هەکاری و،[1399] (شێخ جمال الدین ابو علی بن رواحة)و میر (نصیر الحمیدی)،[1400] پێشەنگی کشتیگەلی میسر (یعقوب الحلبی)،[1401] و میر (حسام الدین طمان)ی سەرگەورەی (الرقة) [1402] کە بە نەخۆشی مرد، سەرگەورەی هەولێر [1403] (زین الدین یوسف)و، مەلا (ضیاء الدین عیسی)ی هەکاری لەمەنزڵگەی خەڕوبەو [1404](حسام الدین سنقر الخلاطي)و میر (عزالدین موسك ابن جکو)ی خاڵۆزای سەلاحەددین.[1405]

سوپا و لەشکرگەلی ئیسلام، ئەوانەی لەم داستانە سەربازییەدا بەهاوکۆمەکی بەشدارییان کرد، بە پلەی یەکەم ئەو تیپانە بوون کە لە میسرەوە هاتن، ئەمانە لە شەڕەکانی دەریادا، چ دژ بە کەشتیگەلی خاچدروشمان کە هەمیشە بەسەر دەریای ناوەڕاستەوە بوون، چ بە گەیاندنی ئازووقەو سەربازان بۆ خەڵکی شاری (عکا)ی گەمارۆدراو، هەرلە مەیداندا بوون، بە تایبەتیش کاتێ کە بارودۆخی شارەکە کەوتە تەنگانەوە، لەشکرگەلی میسر چەندین جار (عکا) یان ڕزگار کردو چەکیان بە دەستی خەڵکەکەی گەیاندو کۆمەکی سەربازیی پێ دەکردن و زەلامی شەڕکەریشی بۆ دابین دەکردن.[1406]

لەشکرگەلی شارەکانی شامیش لە گەمارۆکەدا بەشدار بوون. باری گرانی شەڕەکانی سەربەڕۆ وشکانی کەوتبووە سەرشانی ئەوان، نەخاسمە لەشکری دیمەشق و حەڵەب و حەما. هەروەها لەشکرگەلی شارەکانی جزیرێ بە نموونە، وەك دیاربەکرو حەڕان و جزیرەی (ابن عمر)و شنگاڵ و لەشکری شاری هەولێر (اربیل)و لەشکری گەورەی ئەتابەکی موسڵ کە لە ساڵی (٥٨١ك /١١٨٥ز)ەوە زەلام و جبەخانەو نەوتی سپی بۆ سەلاحەددین دەنارد،[1407] هەر لەشکرەو بە جۆرێ بەشدارییان کرد، جگە لەوانە سەربازی تەوعی لە هەموو لایەکی وڵاتانی ئیسلامەوە، بە نموونە، وەك عێراق و مەغریب و لە وڵاتی عەجەمیشەوە[1408] ئامادەییان هەبوو.

ڕاستیشت دەوێ، گرنگترین ڕووداوی خوێناویی ئەو گەمارۆیە، ئەوە بوو، کە لە هاوینی ساڵی ٥٨٥ك/ ئەیلولی ساڵی (١١٨٩ز)دا ڕووی دا، ئەوە بوو لە (٢)ی شەعباندا، سەلاحەددین گرووپێ زەلامی ئازاو بە جەرگی ئەییوبیانی بەرەو باکوری شارەکە ناردە ناوەوە، تا ڕێگا بۆ ناو شار لە دوژمن پاك بکەنەوەو لەشکر لێوەی بچێتە ناو شار. شەڕ لە نێوان ئەو گرووپەو خاچدروشماندا دەستی پێ کردو ئەییوبیان مەیدانی شەڕەکەیان کۆنترۆڵ کرد، ژمارەیێکیش لە خاچدروشمانیان کوشت و ئەوەی نە کوژراگەڕایەوە بۆ ناو دەوارەکان، لێ ئەییوبیان دوویان کەوتن و چەرخەچییەکانی سوپای ئەییوبی ڕێگەیان لێ گرتن و نەیانهێشت لە سەربازگەکە بێنە دەرەوە. بەو جۆرە ڕێگاکە کرایەوەو ئەییوبیان ئازووقەو جبەخانەیان گەیاندە خەڵکی شارەکە. سوڵتان خۆیشی چووە ناو شارەکەو سەرکەوتە سەر شوورەکان و

---

1397 الكامل، ١٢/٣٩–٤٠.

1398 النوادر، ١١٣.

1399 الكامل، ١٢/٣٧.

1400 الفتح القسي، ٢٦٤.

1401 النوادر، ١٦١. الفتح القسي، ٤٨٦. الروضتين،٢/١٨٤. مفرج الكروب، ٢/٣٥١.

1402 الفتح القسي، ص ٣٠٥. مفرج الكروب، ٢/٢٩٤. السلوك، ١/١٠٣.

1403 الفتح القسي، ٤٣٨. الروضتين، ٢/١٦٤.

1404 النوادر، ١١٦. الفتح القسي،٢٣٦. الروضتين، ٢/١٥٠. السلوك ،١/١٠٣.

1405 الروضتين ، ٢/١٤٩. السلوك، ١/١٠٣.

1406 الفتح القسي، ٣٤٠و٤٩٥. الروضتين، ٢/١٤٨و ٢/١٨٦. الكامل، ١٢/٤١.

1407 ن. م،٣٥٠. الروضتين، ٢/١٤٨. مفرج الكروب، ٢/٣٠٧.

1408 الكامل، ١٢/٢٩.

لەوێوە چاوی گڕدا بەناو ئۆردوگاو سەربازگەکانی دوژمندا، تا بزانێ قەوارەو ژمارەیان چەندە.[١٤٠٩] مێژوونووس قازی (ابن شداد)یش لەگەڵیاندا چوونە ناو شارەکەو لەگەڵ سوڵتاندا بەسەر شوورەکان کەوت. ئەم ڕێگاکردنەوەیە یەك حەفتەی کێشا.[١٤١٠]

وا بەتەمابوون سوڵتان سەلاحەددین ڕێنمانی بدات بە بەرەڤانیکاران لە شارەکەو ئامۆژگارییان بکا، چی بکەنو چی نەکەنو هاودەنگیو هاودەستییەك لەنێوان هێزی ناو شارو هێزی دەرەوەی شاردا سازبدات، تا بەشێوەیەکی ڕێكو پێك لە ڕووی دوژمندا بووەستنو هێزو کۆششیان بکەن بە یەك، وەلێ سەلاحەددین ئەم دەرفەتەی لە دەست داو هەلەکەی نەقۆستەوەو گەمارۆی دوژمنی نەدا، لە جیاتی ئەوە میرەکانی کۆبوونەوەو بە ئاڵوگۆڕی ڕاو بیروبۆچوونەوە خۆیان خەریك کردو هیچ بایەخێکیان بۆ دوژمن دانەناو گرنگییان پێ نەدا. گرووپێکیان وایان پێ باش بوو "سفیدەی بەیان ڕایان دەماڵێنو، مەرگیان بە دیاری بۆ دەبەین". نەخێر، دەستەیەکی دیکەیان دەیانگوت: باشتر وایە هێزی موسوڵمانان هەمووی بە جارێ بڕژێنە ناو شارو لەناو شاردا پەلاماری دوژمن بدەن. گرووپی سێیەم وایان بەچاك دەزانی لێیان گەڕێنو وازیان لێ بهێنن، ناچار خۆیان بێزار دەبنو گەمارۆکە دەکەنەوەو دەڕۆن.... "ئەگەر کەوتنە بەر چاو، ئێمەش لێیان ڕادەپەڕین". جگە لەم ڕاو بۆچوونە جیاوازانە، گرووپێکیش هەبوون ترسی خۆیان ئاشکرا دەکردو لە دوژمن دەترسانو بە گومان بوون موسوڵمانان دەرەقەتیان بێنو دەیانگوت، با چاوەڕێ بکەین، تا هێزمان لە میسرو جێگاکانی دیکەوە بە دەنگەوە دێنو، هەروەها دەیانگوت:"دوژمن هەند زۆرن هەر دەڵێی شارەمێروولەن، دەڵێی لمن .. لم، تاریکن وەك تاریکایی شەو".[١٤١١]

هەرچی سوڵتانە، ئەوە، خۆی ڕای وابوو "گەمارۆی دەوری دوژمن فراوانتر بکرێت، تا ماوەیەکی تریش لە (عكا) دووربخرێنەوە، ئنجا فەرمانی دا قورسایی لە (صفوريه)وە بگوازرێتەوە بۆ گردەکەی (العياضية)ی بەرامبەر بە (عكا)[١٤١٢] تا لەوێوە بەسەر شارەکەشو بەسەر ئۆردوگای دوژمنیشدا بنوارێو حەواڵە بێ.[١٤١٣]

سوڵتان، چەندین جار ئەم گردو ئەو گردی دەکرد، تا لە هەموو ئەو بەرزاییانەوە بەسەر هێزەکانی دوژمندا حەواڵە بێو سەرنجیان لێ بدا. جگە لەوەش، سوڵتان، کاتێ کە هەواکە پیس دەبوو، سەنگەرەکانی بەسەر دەکردەوە، چونکە بۆگەنی نەخۆشیی لێ کەوتبووەوەو بگرە سوڵتان خۆیشی تووشی شپرزەیی دەروون بوو بوو.[١٤١٤] سەلاحەددین، لەسەر ئەم جێگۆڕکێیە تووشی ڕەخنە بووبوو،[١٤١٥] چونکە، کاتێ گواستیەوە بۆ (خەڕوبە)و بۆ جێگایانی دیکە، خاچدروشمان ئیدی دڵنیا دەبوونو ترسیان دەڕەوییەوە.

دوو حەفتە بەسەر ڕێگا کردنەوەکەی (عكا)دا تێپەڕی، لەو ماوەیەدا خاچدروشمان بۆ بەگژداچوونەوەی موسوڵمانان خۆیان تەیارو ئامادە دەکرد، تا خۆیان بڕیار دەربکەنو دەست پێشخەریی بکەن. ئەوە بوو لە (٢١)ی شەعباندا چەند گرووپێکیان، بزووتنەوەیەکیان دەست پێ کرد "کە هەرگیز شتی وایان نەکردبوو" وەك (ابن شداد) دەڵێ، بزووتنەوەکەشیان ئەوەبوو، خۆیان بەشێوەی ڕیز ڕیزو قۆڵ قۆڵ ڕێك خستو بۆ هەڵمەت خۆیان ئامادەکردو، مەلیکەکەشیان بەشداربوو. مەلیك لەبەر سنگی لەشکرەکەوە دەڕۆیشتو چوار زەلام لە بەردەمیەوە ئنجیلێکیان خستبووە ناوەڕاستی پارچەیەك قوماشی سەوزەوەو هەریەکەو چمکێکیان بە دەست گرتبوو، لە بەردەمی مەلیکەوە دەڕۆشتن. سوپای سەلاحەددین کە ئەمەیان دی، خۆیان بۆ لێدانی ئەم بزووتنەوەیە ئامادەکردو وەك ئەوان خۆیان ڕێك

---

[1409] النوادر، ١٠٦. الفتح القسي، ٣٠٠. الروضتين، ١٤٤/٢. مفرج الكروب، ٢٩٣/٢.

[1410] النوادر، ١٠٨.

[1411] الفتح القسي، ٣٠١/٣٠٢.

[1412] گردێکە لە هەندێ سەرچاوەدا بە (تل المصلبة) ناوبراوە. الفتح القسي، ٣٠٥.

[1413] النوادر، ١٠٨. الفتح القسي، ٣٠٥. مفرج الكروب، ٢٩٤/٢.

[1414] الفتح القسي، ٣٢٥. ابن الوردي، ١٤٥/٢. البداية والنهاية، ٣٣٣/١٢.

[1415] مفرج الكروب، ٣٠٣/٢. البداية والنهاية، ن.ص. الدواداري، ١٠٢/٧. شفاء القلوب، ١٦٢.

خستو قۆڵی ڕاستیان بەرامبەر بە قۆڵی چەپی دوژمنو قۆڵی چەپیان بەرامبەر بە قۆڵی ڕاستی دوژمن دانا – خواسایی لە شەڕدا هەر بەو جۆرە دادەنرا، بەڵام سوپای خاچدروشمان هەند گەورەو زەبەن بوو، سەرێکی گەیشتبووە ڕووبارەکەی باشووری (عکا)و سەرێکی لە باکووری شارەکەوە گەیشتبووە دەریاکەو هەموو لوتکەو پاڵو زورگەکانی دەوری شاریان بە جارێ داپۆشیبوو.

سەلاحەددین، دەمارگرتیو یەکسەر فەرمانی بە جاڕچی دا بانگەوازی ئامادەباشی بەناو سوپادا هەڵدا، بانگەوازەکەش ئەمەیە:" ئیسلام هاوارە، لەشکری مووەحیدین هاوارە ئامادە بن". بەڕاستی کەوتبوونە دۆخێکی خەتەرناکەوە، تا مێژوونووسان ناوی ئەم شەڕەیان نا "شەڕە مەزنەکە"[1416] یان "جەنگی گەورە".[1417]

ڕاستیشت دەوێ، دوژمن هەلی بۆ ڕەخسابوو، دەیزانی سەلاحەددین کەوتووەتە تەنگانەوەو داماوە، چونکە لەشکرەکانی میسر لە مەیدانی شەڕەکەدا نەبوونو نەهاتبوون، مۆڵەتی ئاگربەستەکەشی، کە لەگەڵ (انطاكية)دا مۆری کردبوو، وا تەواوبوو، خۆ هەل لەمە چاکتر بۆ خاچدروشمان ناڕەخسێ، لەبەرئەوە جەنگیان بەرپاکردو "لە سەربازگەو ئۆردوگاکانیانەوە وەك کوللە دابارین"و[1418] تاویان دایە قۆڵی ڕاستی لەشکری سەلاحەددین کە (تقي الدين عمر) فەرماندەیی دەکرد. کاتێ سەلاحەددین، ئەمەی دی، دەستبەجێ لەناو جەرگەو بەرسنگی لەشکرەوە. کە خۆی فەرماندیی دەکرد. زەلامی جەنگاوەری زۆری بۆ نارد یارمەتی بدەن. بەرسنگی لەشکر، کە لەشکری دیاربەکرو لەشکرەکانی هەندێ لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی تێدابوو، کە ئەو زەلامە جەنگاوەرانەی لێوە دەرچوون، خۆی کەم بووەوەو دای لە کزی. لەبەر ئەوە خاچدروشمان هێرشیان کردە سەریو هەندێ زەلامو فەرماندەیان لیٚ کوشتن، میر (مجلي بن مروان)و (ظهير الدين)ی برای مەلا (عیسی)و سەرکار (حاجب) خەلیلی هەکاریو کوڕگەلی دلێرو ئازای دیکەش لەو کوژراوانە بوونو گەلێکی تریشیان هەڵاتنو لە لەشکری شنگاڵ زیاتر، کەس لە هێزی بەرسنگی لەشکردا نەما بەر لە خاچدروشمان بگرێ. "لەشکری شنگاڵیش خاوەن ئەزموونی جەنگ بوون".[1419] ئنجا خاچدروشمان دەرفەتیان هێناو هێرشیان کردە سەر چادرگاکەی سەلاحەددین لەسەر گردەکە. تا گەیشتنە سەرەوەش، هەرکەسێکیان پیٚ گەیشتبا دەیانکوشتو دەستیان کرد بە تاڵانو چەپاوڵ. یەکێ لەوانەی لەوێ کوشتیان شێخ (جمال الدين ابو علي بن رواحة الحموي)بوو. بەڵام چادرگاکەی سەلاحەددینیان نەدۆزیەوە، ناچار، گەڕانەوە دواوە، نەوەکا ڕێگای ئازووقەیان لیٚ ببەسترێ. زۆری نەبرد، موسوڵمانان لە قۆڵی چەپەوە خڕبونەوەو هێرشێکیان کردە سەر دوژمن و بەرسنگی سوپاکەش لەژێر فەرماندەی خودی سەلاحەددیندا، وەك ئەوان هێرشیان کردوو بوو بە شەڕەخەنجەروو شەڕەمشت "لە هەموو لایەکەوە کەوتنە بەر شمشێری خواو کەسیان بە سەلامەتی دەرباز نەبوو"[1420] یان کوژرا یان بە دیل گیرا. یەکێ لە دیلەکان کە پێشەنگی داویەکان بوو و، سەلاحەددین پێشتریش بەدیلی گرتبوو بەڕەڵای کردبوو، ئەم جارەیان بەری نەداو کوشتی. ژمارەی کوژراوانی خاچدروشم بە هەزاران دەقەرسان، ڕەنگە زۆریشیان نابێتەسەری.

"ابن شداد"بە نزیکەی حەوت هەزاری قەرساند.[1421] کابرایەکی موسڵمانی دی کوژراوەکانی ژمارد، گوتی:"کوژراوانی قۆڵی چەپ چوار هەزارو سەدو... ئەوەندە کەسن، بەڵام پێداڕانەگەیشت کوژراوانی قۆڵی ڕاستو کوژراوانی بەرسنگی لەشکر "ناوجەرگەی لەشکر" بژمێرێ، لەبەر ئەوە وازی هێناو ئەوانەی حساب نەکرد، کابرایەکی دی ئەوانەشی حیساب کرد.[1422] "ابن الأثير "بە" نزیکەی دە هەزار کوژراوی لە قەڵەم دان".[1423] هەرچی"العماد"ە ئەوە

---

[1416] النوادر، ۱۰۹. الروضتين، ۲/۱٤٤.

[1417] الفتح القسي، ۳۰۸. الكامل، ۱۲/۳٦. مفرج الكروب، ۲/۲۹٤.

[1418] الكامل، ۱۲/۳٦.

[1419] الفتح القسي، ۳۱٥–۳۱٦.

[1420] الكامل، ۱۲/۳۸. الفتح القسي، ۳۱۱. الروضتين، ۲/۱٤٥.

[1421] النوادر، ۱۱۳. الروضتين، ۲/۱٤٥.مفرج الكروب، ۲/۲۹۹.

[1422] النوادر، ۱۱۳.

ئەو بە "پێنج هەزار کوژراویان دائەنی".[١٤٢٤] پاشان سەلاحەددین فەرمانی دا هەموو لاشەی کوژراوەکان بدەن بە دەم دەریاوە،"فڕێیاندەنە ئەو جێگیەی خاچدروشمان ئاوی لێ دەخۆنەوە"[١٤٢٥] لە ناو دیلەکاندا سێ ئافرەتی فەرەنگ هەبوون، بەسەر پشتی ئەسپەوە دەجەنگان، کاتێ بە دیل گیران و چەك کران ئەوسا دەرکەوت کە ئافرەتن .[١٤٢٦]

لەم شەڕەدا دەرکەوت کە کەموزۆر هاوسەنگییەك لەنێوان هەردوو سوپاکەدا هەیە، خاچدروشمان نەیانتوانی خۆیان بەناوشاردا بکەن و، جەنگاوەرانی (عکا)ش خۆیان ڕاگرت وبەریان لە خاچدروشمان گرت هەروەها سەلاحەددینیش نەیتوانی ڕایان بماڵێ بۆیە هەر لایەنەو جێگای خۆی قایم کردوکەوتە چاوەڕێ بزانێ چی ڕوودەداو چ دەقەومێ. ئێمە وای بۆ دەچین، خاچدروشمان لە خۆیان بایی بوون و هیچ گومانیشیان لەسەرکەوتنی خۆیان نەبوو. لەبەرئەوە دەربایست نەبون و نەدەترسان لە گەمارۆدان هەرچەندیشە تەواوێ دووربین بوون و پلانی ئەوەشیان دانابووکەهێزەکانی سەلاحەددین نەتوانن توخنیان بکەون[١٤٢٧]

ڕاستیشت دەوێ ئەو ماوە دورو درێژە کەخۆیان ڕاگرت لەبەر ئەوەبوو کەپشتیان بەدەریاکە قایم بوو،بە دەریادا هەموو پێداویستییەکیان بۆ دەهات. نەخاسمە هێزی دەریایی خاچدروشمان لەوەی ئەییوبیان دەستبالاترو بەهێزتربوو، "دەریا کۆمەکی پێ دەگەیاندن، بەڕێش دەستی نەدەنا بە ڕویانەوەو، بەرگی نەهامەتی و کەساسییان هەمیشە بەبەر شارەکەدا کردبوو".[١٤٢٨] دەوڵەتۆکەگەلی شارەکانی (بیزا، بوندوقیەو جەنەوا) لە ئیتالیا، بێ ووچان شمەکی زەرورییان بۆ دەناردن. خاچدروشمانی گەمارۆدەری (عکا) هەمیشە بە تەمای کۆمەکی تازە بوون لە ئەوروپای ڕۆژئاواوە بۆیان بێتهەرچی سەلاحەددینە، ئەوە ئەو، نەیتوانی شەڕێکی یەکلاکەرەوەو چارەنووسساز لەگەڵ خاچدروشمان هەڵایسێنێ چونکە میرەکانی سوپاکەی ڕاڕابوون و لەسەر چۆنێتی بەگژداچونەوەی دوژمن یەك ڕا نەبوون، ئەوەبوو. وەکو باسمان کرد. هەریەکەو ڕایەکی هەبوو، هەر کەللەیەو لە ئاوازێکی لێ دەدا. ڕاستیشت دەوێ، ئەو ڕایەی زۆرینەی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری جەنگ پێیان باش بوو ئەوەبوو کە شاری (عکا) کەلێنێروو قایم بکەن و، بەردەوامیش خاروباری لەسەر ووشکانییەوە پێ بگەیێنن و ڕێگاوبانی بۆ چاك بکەن یان بە کەشتی گەلی میسردا بۆی بنێرن، یان یەکسەر لە بەیرووتەوە بۆی ڕەوانەبکەن و، ناوبەناویش جەنگاوەرانی ناو شارەکە بگۆڕن و زەلامی ئازاو جەنگاوەری نوێیان بخەنەجێ و، پشوو بەوانە بدەن کە ماندوودەبن یان بێزاردەبن یان هەمیشە بێداروو ئێشکچی و پاسەوانن و برسیان لێ براوە.[١٤٢٩] وا پێدەچێ ئەنجومەن دەیویست هەمان ئەو پلانە بخاتە بەرکار کە خاچدروشمانی شاری (صور) وەختێ سەلاحەددین گەمارۆی دان. بەکاریان هێنا، ئەوەبوو لە ڕووی گەمارۆکەدا خۆیان ڕاگرت تا سوپاکەی سەلاحەددین بێزار بوون و ناچار لێی کشانەوەو (صور) بە دەست خاچدروشمانەوە مایەوە. بەڵام گەمارۆدرانی شاری (عکا) واتا خاچدروشمەکان، وادریارە بە سەبرترو بە حەوسەڵەتر بوون. ئەمە جگە لەوەی کە جێگەی (صور)و تەنگەبەری زەویەکەشی، گرتنی شارەکەی گرانترکرد، لە کاتێکدا گەمارۆدەرانی شاری (عکا) جێگەکەیان بۆ گەمارۆدانی شارەکە زۆر لە باربوو، بە ئازادی دەهاتن و دەچوون و، بەئاسانی ئازووقەیان بە دەست دەگەیشت و "بۆ هەڵمەت ئامادەبوون و، ددانیان بە خۆیانا گرتبوو، لە سەبر بێزار نەبوون و کەسیش نەیدەتوانی بچێتە ناویان و کەسیش نەیدەتوانی بدا بەسەریانا".[١٤٣٠]

---

1423 الكامل، ٣٨/١٢.

1424 الفتح القسي، ٣١٤. الروضتين، ١٤٧/٢.

1425 الكامل، ٣٨/١٢. الفتح القسي، ٣٢٠. الروضتين، ١٤٧/٢. مفرج الكروب، ٣٠٢/٢.

١٤٢٦ الكامل/١٢/٣٨.

1427 الكامل/١٢/٣٤.الروضتين،١٤٧/٢.البدايةوالنهاية،٣٣٣/١٢.السلوك،١٠٢/١.

1428 الفتح القسي، ٣١٦.

1429 النوادر، ١٥٢–١٥٣. لە بارەی ئاڵوگۆڕکردنی سەربازەکانی ناو شارەکەوە، بنۆڕە: الفتح القسي، ٤٥٨. الكامل، ٥٥/١٢. الروضتين، ١٨١/٢. ابن خلدون، ٧٠٥/٥. شفاء القلوب، ١٦٩.

1430 الروضتين ١٤٨/٢.

ئەم هەڵوێستە، یان ڕوونتر بڵێین ئەم (جووتە گەمارۆیە) تا ماوەیەکی زۆری خایان بگرە پاش گەیشتنی هەڵمەتی سێیەمی خاچدروشمانیش هەر مابوو، وەلێ دیاربوو، تای تەرازووی خاچدروشمان قورستربوو.

ڕاستیشت دەوێ درێژەکێشانی گەمارۆی (عکا)و، نا ئومێدی خاچدروشمان لە هەڵمەتە مەزنەکەی ئەڵمانو[1431] خنکانی ئیمپراتۆر فیردریك لە نزیك شاری (طرسوس) لە کەناراوی ئاسیای بچووك،[1432] هەروەها تێکچوونو پرشو بڵاو بوونەوەی هەڵمەتەکەو، مردنی کوڕەکەی ئیمپراتۆریش لە کۆتایی ساڵی ٥٨٦ك/سەرەتای ساڵی (١١٩١ز)دا،[1433] ئەم ڕووداوو هۆکارانە کارێکی وایان کرد خاچدروشمان لە هەموو گاڤێ پتر پێویستسان بە هاتنی هێزی پشتیوان ببێ، کە ئەوەبوو لە ژێر فەرماندەیی مەلیکی فەرەنساو مەلیکی ئینگلستاندا گەیشتنە لایان تا لە ململانێ پڕ لە تاڵاوو چارەنوسسازەکەی کەناراوی باکوری فەلەستیندا بەشدار بن.[1434]

وادیارە زستانی ساڵی ٥٨٦ك-٥٨٧ك/١١٩١-١١٩١ز زستانێکی سەختو گران بوو بۆ خاچدروشمان، نەك تەنیا لەبەر ئەنجامە ناخۆشو گرانەکانی هەڵمەتە ئەڵمانیەکە، بەڵکو برسێتیش لە ئۆردوگاکەیاندا بڵاوبووەوەو ئازوقەشیان لەسەر ووشکانیەوە ئیتر وەستاو، بۆیان نە دەهاتو، بە درێژایی ئەو زستانەش، کەمێ نەبێ، کە بەشی خۆراکی نەدەکردن، دەنا هیچ ئازوقەیەکیان بۆ نەگەیشتووەتە کەناراوی (عکا) کە لە ژێر دەستی خۆیاندا بوو، لەبەر ئەوە هەندێ جەنگاوەریان لە برسانا مردن، بەڵکو هەندێ لە گەورەکانیشیان لە برسانا مردن،[1435] سەرباری ئەوانەش گەلێ لەو زەلامانەش مردن کە دەمێك بوو لەو جێگا تەنگەدا مابوونەوە. لە هەمان کاتدا، بە پێچەوانەوە، ئۆردوگاکانی سەلاحەددین بە ئازادییەکی زیاترەوە ئەم گردوو ئەو گردیان دەکر. (العماد) باسی دۆخی نا هەمواری دوژمن دەکاو دەڵێ:"نرخی هەموو شتێ بەرز بووەوە لای فەڕنگو، نرخی دەغڵو خەلە ئاگری سەندو، نەخۆشی دایماڵینو پەتایان تێکەوتو بەلا یەخەی گرتنو گرانی ملی چەماندن، زەرەرو زیان پێچی پی خواردن برسێتی بڵاو بوبوەوەو زیادی کرد ئنجا لە هێرش کەوتن، زەویو زاریان شۆرەکات دایپۆشی ترس کۆڵی پێدانو هەڵهاتن، نەهاتی پەشۆکانیانیو ئاڵۆزی کردن"[1436] تا وای لێ هات کێوجێ گەنم گەیشتە زیاتر لە سەد دیناری (صوری)و هێلکەیەك بە شەش دینارو ڕیخۆڵەی بارگیر گەیشتە دە دینار.[1437] ئیدی ناچار بوون هەندێکیان دەخالەتیان هێناو بوون بە ئیسلام.[1438] ئەسپێکی زۆریشیان سەربڕیو خواردیانو بە گژووگیاشەوە نەوەستانو ئێسقانیشیان کراندەوەو ئێسقانی بێ گۆشتیشیان کرۆشت. ئنجا گەورە پیاوانی کڵێسە وویستیان جۆرە پیتاکێ بۆ کەم بەشو هەژاران خڕ کەنەوە وەلێ چاو چنۆکی بازرگانەکانی شاری پیزای ئیتاڵیا کە دەستیان بەسەر هەموو بازرگانی ئازوقەدا گرتبوو نەیهێشت ئەو پڕۆژە خێرخوازییەی کڵێسە سەر بگرێ.[1439]

بەڵام سەلاحەددین نەیتوانی ئەو بارودۆخەش کە ڕەخسا بکا بە دەرفەتێكو لەو کاتەدا سودی لێ ببینێ کە ژمارەیەکی

---

[1431] مێژوونوسان ژمارەی جەنگاوەرانی هەڵمەتە ئەڵمانییەکەیان بە نزیکەی دوو سەد هەزار جەنگاوەر قەرساند، .. النوادر، ١١٥، ١٣٧، . الروضتين، ٢/١٥٠ ـ ١٥١. مفرج الكروب ٢/٣١٧. هەندێکیشیان بە سێ سەد هەزار جەنگاوەریان خەملاند. : الفتح القسي ٣٣٠. هەندێکی دیکەیان بە شەش سەد هەزاریان داناٌ، شفاء القلوب ١٦٣.

[1432] الفتح القسي ٣٩١. النوادر ١٢٣ـ ١٢٤. الكامل، ٤٩/١٢. زبدة الحلب ١١٤/٣. ابن الوردي، ١٤٦/٢. بۆ پتر زانینیش بنۆڕە: رنسيمان، ٣/ ٣٩ـ ٤٠.

[1433] النوادر ١٥٤. الروضتين، ١٨١/٢.

[1434] رنسيمان، ٤٣/٣.

[1435] رنسيمان، ٦٨/٣. هارۆلد لامب شعلة الاسلام ١٩٥.

[1436] الفتح القسى ص٤٣٩.

[1437] د. سعداوي التأريخ الحربي، ص٢٤٦.

[1438] الفتح القسي، ٤٣٩ـ ٤٤٠. الكامل، ٥٤/١٢. الروضتين ١٨١/٢. البداية والنهاية ٣٤١/١٢. هارولد لامب شعلة الاسلام ص١٩٦.

[1439] رنسيمان التأريخ الحروب الصليبية، ج٣، ص٧٠.

زۆری لەشکرەکانی توشی ماندوێتیو کەشەنگی بووبوونو، هەندێکیشیانی ئیزن دا بڕۆن ئەو زستانە بۆ خۆیان بحەسێنەوە بە مەرجێ دوای زستان بگەڕێنەوە بۆ ئۆردوگاکانی خۆیان. ژمارەیە لە میرەکانیشی خۆیان کرد بە بازرگانو برسێتی خاچدروشمانیان کرد بە هەلێکو خۆراکو خەلەو دانەوێڵەیان لە ناوچە ئیسلامیەکاندا قۆرخ کردوو بە گران دەیان فرۆشتەوە. لەو میرانەی ئەم ڕەفتارەی دەنواند "عزالدین ئسامەی پارێزگاری بەیروتو (سیف الدین علی بن أحمد المشطوب)"بوون. ئەمانە خۆراکو ئازوقەیان لە بەیرووتو (صیدا)و عەسقەلانەوە باردەکردوو دەیان برد.[1440] جا ئەگەر تەماعو چاوچنۆکی ئەم میرە موسوڵمانانە نەبوایە، خاچدروشمان زیاتر تەنگەتاوو پەرێشانتر دەبوون تەنیا چەند مانگێکی پێ چوو زۆر درێژەی نەکێشا، ئیدی کەشتیو گەمی خاچدروشمان بە باری قورسی گەنمەوە گەیشتنە جێو باریان داگرتە سەر ووشکانی، بەتایبەتیش دوای نیشتنەوەی زریانو ڕەشەباکانی زستانو داهاتنی بەهار. ئەم کەشتیو گەمیە گەنم هەڵگرانە بوون بە مایەی شادیو پێشوازی گەرمی خاچدروشمان نەك هەر لەبەر گەنمەکە بەڵکوو لەبەر ئەوەش کە مژدەیەکی خۆشیان بۆیان هێنابوو، کە وا مەلیکی فەرەنساو مەلیکی ئینگلستان بەڕێوەنو گەیشتوونەتە ئاوەکانی ڕۆژهەلات.

هەرچی سەلاحەددینە ئەوە لێگا لێگا دلوای لەو هێزە ئیسلامیانە دەکرد کە لە شەڕی خاچدروشماندا بەشدار نەبوون تا کۆمەکی پێ بکەنو پێکەوە بتوانن دوژمنی داگیرکەر لە وولات وەدەرنێن، چونکە ئازادکردنی ئەم خاکە داگیرکراوانە، بەتەنیا نا کەوێتە ئەستۆی بەرپرسانو سوپای ئەییوبیان، بەڵکو ئەمە ئەرکێکی نیشتیمان پەروەرییەو دەبێ بە هاوبەشیو بە یەك دەست هەموو موسوڵمانان بچنە مەیدان، جا ئەو موسوڵمانانە دووربن یان نزیك بن، نەخاسمە گروپێ لە خاچدروشمان پێشتر بە فەرماندەیی (أرناط)، تا چاوی تەماعی بڕکا. دوور دەیروانی کە هەردوو حەرەمی پیرۆز داگیربکاو نەیەڵێ موسوڵمانان بۆ حەج بچن ئەوە بوو کە سەلاحەددین چاو ترسانی کرد. هەروەها دوژمن بەتەمای داگیرکردنی قودسەو، ئەوروپای ڕۆژئاواش ئەم هەڵمەتە تازەیەی لەبەر ئەوە سازدا کە موسوڵمانان (بیت المقدس) یان ئازاد کرد. ئامانجی سەرەکیی ئەم هەڵمەتەش ئەوەیە قودس لە موسوڵمانان بستێننەوەو ئەییوبیانی لێ دەربکەن. لەبەر ئەوە سەلاحەددین داوای لە گشت فەرمانڕانە ئیسلامەکان کرد کە ئەو بەرپرسێتیە ڕەچاو بکەنو لەو مەترسیە تێ بگەن ئەوە بوو پێوەندی بە (الناصر لدین الله)ی خەلیفەی عەبباسیو (یعقوب بن یوسف بن عبد المؤمن)ی مەلیکی مەغریبەوە کرد.

ڕاستیشت دەوێ سەلاحەددین بەردەوام لەگەڵ خەلیفەی عەبباسیدا هەر پێوەندیی هەبووە، بەڵگەی ئەوەش ئەو هەموو نامانەیە کە بە خامەی (القاضي الفاضل)و (العماد الکاتب) بۆ بەغدای دەناردوو قمەو شاندانەشن کە هەمیشە لە نێوان هەردوولادا بەڕێوە بوون. خۆ سەلاحەددین خۆی بە دەستدا (أتباع)ی خەلیفە لە قەڵەم دەدا.[1441] ئەوە بوو خەلیفە (المستضيء) بە دەنگ سەلاحەددینەوە دەچوو و، سەڵتەنەتی میسرو شامی پێبەخشیو نازناوی بەرزی لێ دەناو دیاریو شتی بەنرخو خەلاتی بۆ دەنارد.[1442] ئەو خەلیفەیە تا مردیش سەروو سەختو پێوەندی لەگەڵ سەلاحەددیندا کۆك بوو[1443]. بەلام شتێ ڕووی دا پێوەندی سەلاحەددینی لەگەڵ خەلیفەی نوێ (الناصر لدین الله)دا لێڵ کرد. ئێمە نامانەوێ شرۆڤەی پێوەندیەکانی نێوان هەردوولا درێژە پێبدەین، چونکە نامانەوێ لە باسەکەی خۆمان دەربچین، بەلام هەر ئەوەندە دەڵێین دەوڵەتی خەلیفە :دەیتوانی کارئاسانیەکی ئەوتۆ بنوێنێ، هیچ نەبێ نەختێ باری گرانو لێ قەومانی موسوڵمانانی شام، نەخاسمە فەلەستین سوکتر بکاو دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکا.

---

1440 الکامل، ١٢/٥٥، ابن خلدون، ٥/٧٠٤.

1441 مضمار الحقائق، ص٦٤.

1442 سنا البرقی الشامي، ١/١٩٢. الکامل، ١١/٤٢٢. السلوك ١/٦٠ز

1443 بۆ زێدە زانین بنۆڕە کتێبی: درید عبدالقادر نوری (سیاسة صلاح الدین) ص٣٩٢، ٣٩٦. هەروەها کتێبی د. القزاز (الحیاة في العراق في العصر العباسي الاخیر) ٥١٢ه / ٦٥٦ه. مطبعة القضاء النجف. ص٢٦٥-٢٦٨.

ئاسەواری ئەم پێوەندییە شلۆقە لە گەمارۆکەی "عکا"دا دەبینین، ئەوە بوو لە پایزی ساڵی "٥٨٥ك/١١٨٩ ز"دا سەلاحەددین داوای کۆمەکی لە خەلیفە کردو، قازی "بهاءالدين ابن شداد"ی مێژوونوس و ڕاویژ کاری خۆی نارد بۆ بەغدا، بەلام خەلیفە مەسەلەکەی بە دڵ و بە گیان وەرنەگرت و هەندەی بە تەنگەوە نەبووو، بەو گرنگییەی تێ نەنۆڕی تەنیا دوو بار نەوت و پێنج نەوتهاوێژی بۆ سەلاحەددین نارد. هەروەها ئیزن نامەیەکیشی بە ئیمزای خۆی بۆ نارد کە بیست هەزار دینار، لەسەر حسابی خەلیفە، لە بازرگانەکانی شام قەرز بکات و بۆ غەزای خەرج بکات،[١٤٤٤] خۆ سەلاحەددینیش نەدەبوو دیارییەکە وەرنەگرێ، بەلام "بۆ ئیزننامەکە، داوای لێبوردنی کرد کە خۆی بخاتە ژێر ئەو بارە قورسەوە"و[١٤٤٥] بە تەتەری خەلیفەی گوت: "ئەوەی هەمەو ئەوەشی کە دەیخۆم لە سایەی میری موسوڵمانانەوەیە، بەو سۆزەشی بوژامەوە کە لە منی پرسیوەتەوە، ئەمە خوایە سەرکەوم بۆ گەیشتن بە ئاوات و خۆشم ناخەمە ژێر باری قەرزەوە"[١٤٤٦] ئەو کۆمەکەشی کە خەلیفەی بەغدا بۆ سەلاحەددینی ناردبێ لەم مەسەلە گرنگ و چارەنووسسازەدا، تەنیا ئەو دیارییەیە کە باسمان کرد، ئەمەش وای لە (القاضي) کرد تێبینیەکی تفت و تاڵ لەم ڕووەوە تۆمار بکا، ئەوەتا دەڵێ: "ئەم نامەیەی بەغدا، نامەیەکی ساردو لەڕو وشکە، بێ سەرو بەرو بێ مانایە، بێ پێوەندییەو بێ بەرو بوومە، بێ سوودە سەیرە ئێمە داوای زێڕی گەرم دەکەین، کەچی کابرا، ئاسنی ساردمان بۆ دەکوتێ"[١٤٤٧]

هەروەها سەلاحەددین چەندین نامەی بۆ شای مەغریبیش نارد، کە ناومان برد، بە تایبەتیش کاتێ گەمارۆی شاری (عکا) توندتر کرا. سەیر ئەوەیە مێژونوسانی بە نموونە وەك (العماد، إبن شداد و إبن الأثير کەسانی دیکەش) باسی ئەم نامەو نامەکارییانەیان نەکردووە. کەچی (أبو شامة، الذهبي و القلقشندي)[١٤٤٨] باسیان کردووە (أبو شامة) ئەو نامەیەی کە بە خەتی (القاضي الفاضل)ی ڕاوێژکاری سەلاحەددین نوسراوە لە هەندێ شێخی بێ گومان و باوەڕ پێ کراوەوە بە دەستکەوتووە، کە سوڵتان فەرمانی داوە بە (شمس الدين بن نجم الدين بن مرشد الكناني)[١٤٤٩] تا بچێ بۆ مەغریب و داوای کۆمەك و یارمەتی لە مەلیك (يعقوب بن يوسف بن عبدالمؤمن) (ت٥٩٥ ك/١١٩٩ ز) بکات.

سەلاحەددین، کۆمەڵێ نامەی بۆ ئەم مەلیکەی مەغریب نارد، بەو حسابەی بەوە ناوی دەرکردبوو کە سوورە لەسەر چاکەو بەرژەوەندی موسوڵمانانی ڕۆژهەلات و موسوڵمانانی ئەندەلوس و باکووری ئەفریقاو پیاوێکی زۆر بە دینە.[١٤٥٠] بەلام ئەم مەلیکە نەیویست هیچ کۆمەکێ بە سەلاحەددین بکاو لە تەنگانە ڕزگاری بکا، بەبیانوویەکی پڕووپوچ گوایا سوڵتان "لەو نامەیەیدا، پێی نەگووتوە. میری ئیمانداران. بەڵکو پێی گووتوە. میری موسوڵمانان. ئەویش لەبەر شانی گران بووەو پێی ناخۆشبووە، لەبەر ئەوەیە کە وەلامی سەلاحەددینی نەداوەتەوەو هیچ کۆمەکیشی پێ

---

[1444] النوادر ١١٩. الفتح القسي ٣٦٥. الروضتين ١٥٢/٢.

[1445] ن. م. ن . ص.

[1446] الفتح القسي، ٣٦٥.

[1447] الروضتين ١٧٦/٢. د. القزاز: دەڵێ: خەڵك بەزەیی بە هەڵوێستی خەلیفەدا دەهاتەوە، چونکە عەقڵی پێ نەدەشکا، بزانێ کە خاچدروشمان ترسناکن و زەرەریان بۆ وڵاتەکە هەیە. خەلیفە هەوڵیشی نەدا دەنگی موسڵمانان لە ناوچەکەدا بکا بە یەك و پاڵ پشتی لە هێزەکانی ئەییوبیان بکا، کە بەریان بە دوژمن گرتووە". بنۆڕە کتێبەکەی (الحياة السياسية في العراق في العصر العباسي الأخير) ٥١٢- ٦٥٦ هـ، ص١٠٠. بنۆڕە: لێکۆڵینەوەکەی خۆشمان (رسائل صلاح الدين- الفحوى والمغزى)، بە زمانی کوردی لە گۆڤاری مەتین دهۆك ژمارە ٥٤ی ساڵی ١٩٩٦دا بلاوکراوتەوە ، ٢٠- ٣١.

[1448] بگرە ئەبو شامەش دەڵێ: بیستم کاتێ فەرەنگ (عکا) یان تەنگاو کرد، سەلاحەددین ناردییە سەر شای مەغریب داوای لێ کرد، لەوێوە ڕێگای دەریا لە خاچدروشمان بگرێ و نەیەڵی شمەکیان بۆ بێ منیش بە دووی ڕاستییەکەیدا دەگەڕام بزانم مەسەلەکە چۆن بووە، چونکە (العادل) و (القاضي) مەبەستی لە ـ ابن شداد ـ ە لە کتێبەکانی خۆیاندا باسیان نەکردووە (الروضتين، ١٧٠/٢).

[1449] برازای (أسامة بن منقذ الكناني)ی خاوەن کتێبی بە ناوبانگی (الأعتبار)ە.

[1450] سەیری ژیاننامەکەی بکە لە : وفيات الأعيان ٣/٧- ١٩. ذيل الروضتين، ١٦. النجوم الزاهره ١٥٣/٦.

نەکردووە"[1451] بەڵام، بە ڕای ئێمە، لەبەرئەوە وەڵامی سەلاحەددینی نەداوەتەوە، چونکە بارودۆخی دەوڵەتەکەی واتا (دەوڵەتی تەوحیدیی مەهدییەی مەغریب) کە بە بەرەڤانی کردن و پاراستنی موسوڵمانانی ئەندەلوسەوە، دوژمنایەتیی و کێشەی لەگەڵ ئیسپانیادا بە توندی هەبووە، لەبەر ئەوە، نە پەرژاوەتە سەر سەلاحەددین و کۆمەکی پێ نەکردووە. بەڵێ، ململانێی لەگەڵ ئیسپانیەکاندا گەیشتبووە ڕادەیەك کە جارێکیان مەلیك خۆی هەڵمەتی بردو بە شەڕ ئەو جێگایانەی سەندەوە، کە لە ئەندەلوسدا ئیسپانەکان داگیریان کردبوو، پاشان گەڕایەوە بۆ مەڕاکیش، ئنجا هەر لە هەمان ئەو ساڵەدا (٥٨٦ك/١١٩٠ز) کە سەلاحەددین داوای کۆمەکی لێ کردبوو، دیسان خۆی "لەشکری سازداو (ئەشلب)ی لە ڕۆژئاوای ئەندەلوس گەمارۆداو وەری گرتەوە".[1452]

سەلاحەددین لە نووسینی ئەو نامانەدا، بۆ ئەو مەلیکە، گەلێ نازناوی ڕێزو فەخریی و شانازیی بۆ بەکار دەهێنا تەنیا بۆ ئەوەی دڵی خۆشکاو نەرم ببێ و لەو لێقەومانەیدا یاریدەی بدا، بەڵام هەمووی بێ هوودە بوو. سەلاحەددین، لەو نامانەدا، کە ئیمزای دەکرد، تەنیا ناوی ڕووت و پەتیی بێ نازناوی خۆی دەنووسیی و بە ڕستەی بێ فیزیی و کەساسیی "موحتاجی ڕەحمەتی خوادا، یوسفی کوڕی ئەیوب".[1453] کۆتایی بە نامەکان دەهێناو لەگەڵ ئەو نامانەشدا بڕێ دیاری گرانبەهایشی بۆ دەنارد.[1454]

وادیارە نوسینی ئەم نامانە لە ساڵە (٥٨٥ك/١١٨٩ز)ەوە دەستی پێ کردووەو[1455] تا ساڵی ٥٨٨ك/ ١١٩٢ز درێژەی کێشاوە، واتا تا ئەو ساڵەی کە نوێنەرەکەی سەلاحەددین لە مانگی (محرم)دا شاری مەڕاکیشی بەجێ هێشتو، لە( ٢٨)ی (جمادی الاخر)ی هەمان ساڵدا گەیشتەوە شاری ئەسکەندەرییە.[1456] سا بەهەرحاڵ سەلاحەددین یاریی و کۆمەکی نە لە خەلیفەی بەغداو، نە لە مەلیکی مووەحدینی مەغریبەوە بە دەست نەگەیشت و کۆمەکییان پێ نەکرد. تەنها لەو جێگایانەوە نەبێ کە باسمان کردن، هیچ لایەنێك ئاوڕی لێ نەدانەوە. ئەوانەش کە بە دەنگیەوە دەهاتن هەموویان ناوچەگەلی ژێر دسەڵاتی دەوڵەتی ئەییوبی بوون، یان ناوچەی سەر بەو دەوڵەتە بوون و بگرە ناوچە گەلێکی ناوخودی ئەم دەوڵەتەش، هەبوون، بە هیچ جۆرێ بەشدارییان لە شەڕی خاچدروشماندا نەکرد، بە نمونە وەك یەمەن و، وڵاتی بەرقە (لیبیا).

سەرەڕای ئەوەش هەندێ گرووپی ئیسلامی ململانێی لەگەڵ گرووپی ئیسلامی دیکەدا هەبوو، دەهاتن داوای کۆمەکییان لە سەلاحەددین دەکرد،[1457] ئەوەبوو سەلاحەددین لە ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز)دا "کە خۆی بە کێشەی غەزاوە، سەری دونیای لێ هاتبووەوە یەك، [1458] داوای لێبوردنی لێ کردن".

### ١- هەڵمەتی ڕیشارد شێردڵ:

کەشتییەکانی ئەم هەڵمەتەی ڕیشارد، ئێوارەی ڕۆژی (١٥)ی (جمادی الاولی)ی ساڵی (٥٨٧ك/ ٦ی حوزەیرانی ١١٩١ز) گەیشتنە سەر بە ژی شام و باروبارخانەیان لە نزیك شاری (صور)ەوە داگرت. ڕیشارد، نەیتوانی لەم شارە دابەزێ، چونکە هێزی پاراستنی (صور) بە فەرمانی مارکیز کۆنراد دی مۆنتفات و لەسەر فەرمانی (فیلیپ أغسطس)ی

---

1451 وفيات الأعيان، ١٢/٧. ذيل الروضتين، ص١٦.

1452 ن. م. ٧- ٤.

1453 الروضتين، ١٧١/٢.

1454 ن. م. ص١٧٣.

1455 صبح الأعشى، ٥٢٦/٦.

1456 الروضتين، ١٧٤/٢. بۆ ئەم نامەو نامەکارییەش بنۆڕە: مفرج الكروب ٣٦١/٢. البدايةو النهاية ٣٣٩/٢. بنۆڕە: لێکۆڵینەوەکەی خۆم (چۆنیەتی پێوەندیی و هۆکارەکانی پێوەندی کردنی سەلاحەددین لەگەل المنصور الموحدی) بەعەرەبی مجلة جامعة الملك سعود، كليه الآداب المجلد الثاني سنة ١٩٩٠، ص٣٠٣- ٣٢٦.

1457 الفتح القسي، ٢٣٤- ٢٣٥.

1458 ن، م، ص٢٣٥.

شای فەرەنسا. نەیانهێشت بچێتە ناو شارەکەو ڕێگەیان نەدا. فیلیپ، خۆی پێش چەند ڕۆژێك گەیشتبووە وڵاتی ڕۆژهەڵات. ڕیشارد، ناچار ڕێگای دەریای گرتەوەبەرو ڕووی کردە شاری (عکا)و بە بیستو پێنج کەشتیەوە گەیشتە (عکا).[1459] ئەم شارە کە دەمێکی دوورو درێژ بوو، خاچدروشمان گەمارۆیان دابوو، هیچیشیان بۆ نەدەکراو نەیان دەوێرا بچنە ناوی، بەم دابەزینەی ڕیشارد، ئومێدیان تازە بووەوەو وورەیان بەرز بوەوەو لەخۆشی هاتنی ڕیشارد، کردیان بە موشەك هەڵدان‌و نەقارە لێدان‌و شایی لۆغان لەناو ئۆردوگاو سەربازگەی خۆیاندا.[1460]

ئێمە لێرەدا نامانەوێ باسی گۆڕانکارییە سیاسیەکان بکەین کە لە مەیدانی شەڕدا ڕوویان دا، بەڵام دەتوانین بڵێین هەردوو ئەم هەڵمەتە ئینگلیزی‌و فەڕەنسیە. سەرەڕای ململانێی نێوان هەردوو مەلیکەکە کە ڕوداوەکانی دواتر پەردەیان لەسەریان لادا[1461] برا لە پشت برا بوون، لە هەڵمەتی سێیەمی خاچدروشماندا، هەرچەندیشە کە ئامانجی هەردوولایان جیاوازبوو و وێڕای ئەوەش کە لە شێوەو شێوازی بەرەنگاربوونەوەی سەلاحەددیندا دیسان یەك ڕا نەبوون‌و هەریەکەیان پلان‌و ستراتیجی جیاوازی خۆی هەبوو. بەهەر حاڵ، ناوبانگی ڕیشارد شێردڵ، هەند بە دەنگو بڵاوبوو، ناوبانگی مەلیکی فەرەنسای ناحەزی بە جارێ داپۆشیبوو، نەك هەر لە سەرچاوەکانی خاچدروشماندا، بەڵکو لەسەرچاوە عەرەبییەکانیشدا هەروەها بوو.[1462]

هەر کە ڕیشارد ڕووی لە (عکا) کرد، دەستبەجێ ئەییوبیان دەستیان کرد بە ئامادەباشی شەڕ لە دەریاو لە بەژیشدا. سەلاحەددین فەرمانی دا گەمی‌و کەشتیی گەورەگەورە پڕ بکرێن لە جبەخانەو ئازووقەو بە حەوسەد جەنگاوەرەوە ئامادەبن. ئەوجا لە بەیرووتەوە بەرەو (عکا) بەڕێ کەوتن بۆ شەڕی ئەم داگیرکارە تازانە، بەڵام ئەم هێزە نەیتوانی هیچ بکا. کاتێکیش ئەم جەنگاوەرانە نائومێد بوون‌و ورەیان بەرداو ڕێگای ڕزگاربوونیان نەما، ئیدی پێشەنگەکەیان (یعقوب الحلبی) فەرمانی دا بە زەلامەکانی بنکی کەشتیەکانیان کوون بکەن‌و نووقمیان بکەن، تا جەنگاوەرو بارو بارخانەکانیان نەکەونە ژێر دەستی ڕیشارد. بەو جۆرە کەشتییەکان بە بارو بارخانەوە نوقمی بن دەریا بوون.[1463] کاتێکیش ڕیشارد گەیشتە ناوچەی (عکا) فەرمانی دا بە هێزەکانی، ئامێرەکانی گەمارۆ دابگرن‌و ڕوویان لە شوورەکانی شارەکە بکەن. ئیدی حەوت مەنجەنیق[1464] و چەند دەبابەو قۆچ هاوێژیان لێ دامەزراندو،[1465] زەرەرێکی زۆریان بە شوورەکانی شارەکە گەیاند، بەڵام نەیانتوانی شارەکە بگرن‌و بچنە ناوی. جا لەبەر گەیشتنی ئەم هێزانەو پتر بوونی ترسی بارودۆخی لەشکرو لەشکرکاری، سەلاحەددین ناچار بوو جێگای خۆی بگۆڕێ لە (شفرعم)ەوە بۆ گردی (خەڕوبە) تا لەگەڵ هێزە تایبەتەکانی خۆیدا بکەونە نزیك هێزەکانی خاچدروشمان‌و، خۆیشی یەکسەر سەرپەرشتی دۆخەکە بکاو بزانێ دوژمن لە پشت ئەو دیوارو کەندەکانەوەی بۆ شاردنەوەی خۆیان لە هێزەکانی سەلاحەددین دروستیان کردوون. چ دەکەن‌و بە تەمای چین، بەڵام ئەوەی سەلاحەددین کردی، ڕێگای کشانی دوژمنی بەرەو شارەکە نەگرت‌و دوژمن بەردەوام بۆ ناو

---

[1459] النوادر، ١٦١. الفتح القسي، ٤٨٤. الکامل، ٦٥/١٢.

[1460] النوادر، ١٦١، الفتح القسي، ٤٨٤،

[1461] رنسیمان، ٩٧/٣.

[1462] ابن الاثیر لە وەسفکردنی ریشارد دا دەڵێ: تاکە پیاوی سەردەمی خۆیەتی لە ئازایەتی‌و فێڵبازی‌و کۆڵنەدان‌و وورە بەرزیدا موسڵمانەکان تاقیان کردووەتەوە کە کابرایەکی بلیمەتەو وێنەی نییە"، کامل ٦٥/١٢. ابن شدادیش لە وەسف کردنیدا دەڵێ": شەڕانییە زۆر ئازایە، ورە بەرزە، قارەمانێتی زۆری نواندووەو بۆ جەنگ بەجەرگە." پاشان لەگەڵ (فلیب)ی مەلیکی فەرنسادا بەراوردی دەکاو دەڵێ: لە موڵك‌و روتبەدا ناگاتە فلیب بەلام لەو داراترەو لەو ئازاترە، .. النوادر ١٥٧.

[1463] الکامل، ٦٥/١٢. النوادر، ١٦١. الفتح القسي، ٤٨٦. الروضتین ١٨٤/٢. الحموي التاریخ المنصوري ص٢٠٠.مفرج الکروب ٣٥١/٢. ابن الفرك ج٢، مجلة ٤، ص٧.

[1464] النوادر ١٥٨، الفتح ٤٧٨ـ ٤٧٩. الروضتین ١٨٤/٢. مفرج الکروب ٣٥٠/٢.

[1465] الکامل، ٦٥/١٢.

شار دەکشا، ئیدی خەڵکی ناوشار بە جارێ تەنگەتاو بوون و هەواڵیان نارد بۆ سەلاحەددین چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە، بەلام سەلاحەددین هیچی بۆ نەکراو نەیتوانی دوژمن بداتە دواوە.[١٤٦٦]

وادیارە مەبەستی هەردوو لایان، لەم شەڕە، ئەوەبوو یەکتری تاقی بکەنەوە، هەردوولایەو بزانێ هێزی لاکەی دی چەندە، هەرچی سەلاحەددینە دەیویست بە ڕیشارد بسەلمێنێ کە سوپای ئەییوبیان هێشتا هەر بەهێزەو دەشتوانێ خۆی سازبداو ڕووبەڕوویان ببێ، هەرچی ڕیشاردە، ئەوە ئەو، دەیویست خۆی تاقی بکاتەوە، بزانێ ئایا توانای ئەوەی هەیە، حەزو ئارەزووی خۆی، بەزۆری چەك بەسەر سەلاحەددیندا بسەپێنێ یان نا. دەشیویست شکست بە مسوڵمانان بێنێ و لەشکریان بشکێنێ و بە زۆری شمشێر سەلاحەددین ناچار بکات لەگەڵیدا دابنیشێ و بکەونە دانوستاندن بەو مەرجانە کە خۆی دایدەنێ.

ڕاستیشت دەوێ، بارودۆخی سوپاو بارودۆخی سیاسیی، بۆ ڕیشارد زۆر لەباربوو، کابرا دەستبالابوو، خۆیشی هەستی پێ دەکردو دەیزانی کە دەستی لەسەرەوەیە، لەبەر ئەوە ئەو دەرفەتەی لە دەست نەداو بەسەریەوە نەچوو.

بەڕای ئێمە، ئەو غەڵەبەو سەرکەوتنەی ڕیشارد لە (عەکا) بە دەستی هێنا وەنەبێ تەنیا لەبەر ئەوەبووبێ کە خاچدروشمان بەهێزبوون و لێزان بوون و هەڵمەتی سێیەمیان زۆر گەورەو گرنگ بووە، یان ڕیشارد، خۆی زەلامێکی ئازاو بەجەرگ بووەو فەرماندەیەکی بلیمەت و سەرکەوتوو بووە، بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو کە سوپای موسڵمانیش ئەحواڵی باش نەبوو، لەبەر ئەوە، فەرماندارانی هەڵمەتی سێیەم، لەوە زیاتر کە ئەم هەلە لە دەست نەدەن و بەخێزایی مەسەلەکە یەکلا بکەنەوە، بیریان لە هیچی دی نەکردەوەو دەستی خۆیان لە کاتی خۆیدا وەشاندو شاری عەکا چۆکی دادا.

خاچدروشمان بۆ گرتنی شارەکە، پێشەکی کەوتنە تەنگەتاوکردنی شارو پڕکردنەوەی کەندەکەکە، لە پڕکردنەوەی کەندەکەکەشدا ڕەفتاری سەیریان پێڕۆ دەکرد، کە لاکی ولاغو لاشەی مردووەکانی خۆشیان تێ فڕێ دا، بێ غیرەتییان گەیشتە ڕاددەیەك بریندارەکانی خۆیشیان تێ فڕێدا. (ابن شداد) دەڵێ: خاچدروشمان بڕیاریاندا "ئەگەر کەسێکیان برینەکەی سەخت بوو، ڕاست فڕێی دەنە ناوی".[١٤٦٧] سوپای سەلاحەددین، ناچار کەوتنە جۆماڵ و پاککردنەوەی کەندەکەکەو خۆیان دابەش کرد بەسێ بەش: "بەشی یەکەم دەچوونە ناو کەندەکەکەو لاشەی مردووەکان و کەلاکی ولاغەکانیان پارچە پارچەو لەت لەت دەکرد، تا سووك بن و بە ئاسانی بیبەنە دەرەوە. بەشی دووەم ئەم کەلەلاو پارچانەیان دەبردو دەیانهاویشتە ناو دەریاکەوە. هەرچی بەشی سێیەمە، ئەوە، ئەوان پارێزگاریی بەشی دووەمیان دەکرد، تا بە تەواوی ماندوو بوون و بڕستیان لێ بڕا".[١٤٦٨]

هێرشی خاچدروشمان بۆ سەر عەکا، بە گەیشتنی ڕیشارد، کەوتە بارێکی ترو لە (١٩)ی (جمادی الاولی)وە ژمارەی هەڵمەت و هێرشەکانیان ڕووی لە زیادی کردو لەم ڕۆژەدا: "هێرشێکی گەورەیان دەست پێ کردو زۆر بە توندی شارەکەیان وەگیر هێناو تەنگەتاوو[١٤٦٩] کەنەفت و لاواز کرد. پاشان شەڕیان وەستاند، دوای چوار ڕۆژ تێ هەڵچوونەوە، لە (٢٣)ی (جمادی الاولی/ ١٤ی حوزەیران)دا، دووبارە دەستیان کردەوە بە شەڕو شارەکەیان پتر تەنگەتاو کردو کوشتارێکی گەورەو گران لە نێوان هەردوو لادا هەڵایسا. ئنجا سەلاحەددین بۆ سووککردنی باری سەرشانی بەرەڤانیکەرانی ناو شارەکە، هێرشێکی کردە سەر چادرگای خاچدروشمان و ناچاری کردن بکشێنەوە. ئنجا خاچدروشمان وەك (ابن شداد) دەڵێ: یەك دەست و یەك دڵ، هێرشیان کردە سەر موسڵمانان، وەلێ موسوڵمانان زۆر ئازاو قارەمانانە بەرامبەریان وەستان و کوشتار دەستی پێ کردو موسوڵمانان مەردانە پێیان داکوتاو ورەیان بەرنەداو

---

1466 ن. م. ص

1467 النوادر، ص ١٦٠.

1468 النوادر، ص ١٦٠. الروضتین ٢/ ١٨٤.

1469 الروضتین، ٢/ ١٨٤.

لەگەڵیاندا تێك چرژان".[1470] لە (٢٨)ی مانگیشدا، شەڕێکی تر قەوما، ئەوەبوو لەو ڕۆژەدا، دوژمن بە سوارەو بە پیادەیەوە، لە شان دەریاکەوە، لە باکووری شارەوە، پەلاماری موسوڵمانانیان دا، کاتی سوڵتان پێی زانی، خۆی هاویشتە سەر پشتی ئەسپ‌و کوڕگەل سواربوون‌و شەڕ دەستی پێ کردەوە، پاشان هەردوولا وەستان.[1471] بۆ ڕۆژی دواتر، کوشتار دیسان هەڵایساوە.

ڕاستیشت دەوێ، خۆڕاگریی سوپای سەلاحەددین‌و کۆڵنەدانی لەم شەڕانەدا کارێکی وای کرد، ڕیشارد، داوای دانوستاندن بکات‌و بە ئاشکرا حەزو ئارەزووی خۆی بۆ کۆبوونەوەو دانیشتن لەگەڵ سەلاحەددیندا بانگداو ئەوەبوو نوێنەرێکی ناردە ناو ئۆردوگای سەلاحەددینەوەو تەرجومانێکی لەگەڵدا نارد، ڕیشارد، سووربوو لەسەر دیتنی فەرمانداری گەورەی ئەییوبییان، لێ سەلاحەددین بە سرك‌و سڵییەوە وەلامی ڕیشاردی دایەوە، چونکە لێی دڵنیا نەبوو، گوتی: دوو مەلیکی دوژمن بەیەك، باش نییە کۆببنەوە تا ئاگربەست لە نێوانیاندا مۆر نەکرێ‌و، گوتیشی: "مەلیکەکان لەسەر ڕێساو بنەمایێ نەبێ کۆنابنەوەو کە کۆیشبوونەوە ئیدی جوان نییە شەڕ بکەنەوە، چونکە بەڵێن‌و نان‌و نمەکیان دەکەوێتە نێوان. خۆ ڕیشارد ئەگەر ئەوەی دەوێ‌و بەوە قایلە، ئەوە چارنییەو دەبێ ڕێسایەکی بۆ دابنێ، خۆ دەشبێ تەرجومانێکمان لە بەیندا هەبێ جێگای بڕوابێ‌و لێی بەگومان نەبین، کاممان قسەمان کرد، بە تەواوی دروستی لەوی دیکەمانی بگەیێنێ، کەواتە با ئەو تەرجومانە بکەوێتە نێوانمان‌و قسەکان بێنێ‌و بەرێ، جا ئەگەر ئەم ڕێسایە جێگیر بوو، ئەوە ئەو کات کۆدەبینەوە".[1472] لەگەڵ ئەوەشدا، سەلاحەددین ئامادەیی خۆی نیشاندا کە براکەی لەگەڵ ڕیشارد کۆببێتەوە. کە لەمەودا باسی دەکەین. ئیدی ئەوەبوو، بۆ سێ ڕۆژ بڕیاری ئاگربەست درا.

مەلیکی ئنگلستان‌و فەڕەنسا لەناکاو، نەخۆش کەوتن، ڕیشارد زۆرتر پەرێشان بوو، ناردی بۆ لای سەلاحەددین کە نەختێ میوە (فیقی)و بەفری بۆ بنێرێ. مێژوونووسان دەڵێن: ڕیشارد کە لە نەخۆشییەکەی هەستایەوە، ئنجا داوای مریشك‌و باڵندەی لێ کرد، گوایا کۆلارەو باڵندەڕاوکەرەکانی لەبرسانا بڕستیان لێ بڕاوە، تا ئەو مریشك‌و گۆشتانەیان بداتێ، ببوژێنەوە. کەچی تومەزە بۆ خۆی بووە، دیارە کەسێکیش تازە لە نەخۆشی هەستێتەوە، نەوسن دەبێ.[1473] ڕیشارد، "مەبەستی ئەوەبوو نیازو ڕازەکە سارد بکاتەوەو ئەییوبیان فریو بداو کاتیان لە دەست بداو خۆیشیان لەولاوە گەماۆری شارەکەیان قایمتردەکردو مەنجەنیقەکانیشیان بۆردومانی بەردەوامیان دەکرد".[1474] هەر لەو کاتانەدا سەلاحەددین، کۆمەکی نوێی لە کۆتایی (جمادی الاولی)ی ٥٨٧ك/ حوزەیرانی (١١٩١ز)دا، پێ گەیشت‌و هێزی شنگاڵ گەیشتە لای بۆ خەڕووبە، پاشان هێزێك لە میسرەوە گەیشتە لای، هەروەها لە موسڵیشەوە. سوڵتان هەر هێزەو بە جیا، بەخێرهاتنیانی کرد،[1475] وەلێ سوودیان نەبوو، شارەکە بڕستی لێ بڕابوو، خەڵکەکەی تاسابوون‌و مەنجەنیقەکانی دوژمن بەشێکی گرنگی شوورەی شاریان ڕماندبوو و، هەندەی باڵای زەلامێکیان لێ ڕووخاندبوو.[1476]

شوورەکوتان بە مەنجەنیق درێژەی کێشا تا شوورەکان ناوەناوە لێك ترازان‌و دیوارەکان ئەو پتەویەی جارانیان نەماو خەڵکی شارەکەش لەبەر کارکردن‌و ئێشکگرتنی شەوگاران. کە خۆشیان ژمارەیان کەم بوو. تەواو ماندوو بوون‌و بڕستیان لێ بڕاو، هەندێکیشان نە بەشەو خەویان هەبوو، نە بەڕۆژ.

لە (٧)ی (جمادی الآخرة)دا نامەیەك لە خەڵکی شارەوە هات، نووسیبوویان: حاڵمان هەند پەرێشان بووە، لە

1470 النوادر، ١٦٣. الفتح القسي، ٤٩٠.

1471 النوادر، ١٦٣، الفتح القسي، ٤٩١.

1472 النوادر، ١٦٣.

1473 النوادر، ص ١٦٥. ابن الفرات، مجلد ٤، ج٢، ص١١، البداية والنهاية، ٣٤٣/١٢.

1474 مفرج الكروب، ٣٥٥/٢. ابن الفرات، مجلد ٤، ج٢، ص١١.

1475 النوادر، ص ١٦٥. الفتح القسي، ٤٩٥. الروضتين ١٨٦/٢.

1476 النوادر، ص ١٦٥. الفتح القسي، ٤٩٧.

خۆبەدەستەوەدان بەولاوە هیچ چارێکمان نییە، ئێمە تا سبەینێش چاوەڕێ دەکەین، ئەگەر شتێکمان بۆ نەکەن و بە دەنگمانەوە نەیەن، ئەوا، دەخالەت دەبەین و شار وەدەستەوە دەدەین و سەردەرکەو ماڵ پرسیار، تەنیا سەرمان ڕزگاری بێ هیچی دیمان ناوێ.[1477] ئەم خەبەرە ناخۆشە. وەك ابن شداد دەڵێ. لە هەموو خەبەرێ گرانتربوو، بوو بە ژان و چووە دڵی مسوڵمانانەوە، چونکە هەرچی چەکی کەناراوو چەکی شاری قودس و دیمەشق و حەڵەب و میسرو، وڵاتانی ئیسلام هەیە، هەمووی لەو شارەدا دانرابوو، جگە لەوەش گەورەمیران و قارەمانانی سوپا، بەنموونە وەك (سیف الدین المشطوب، بهاء الدین قراقوش)و[1478] جەنگاوەرانی ناوداری دیکە لەو شارەبوون.

(سیف الدین المشطوب) بەخۆی چووە لای مەلیك (فیلیپ أغسطس)و دەخالەتی بۆ بردو پێی گوت: "ئێمە شاری زۆری ئێوەمان گرت، دەمانڕووخاند، ئنجا دەچووینە ناوی کە دەخالەتیشیان بۆمان دەهێنا قبوڵمان دەکردو داڵدەمان دەدانێ و ڕێزیشمان لێ دەگرتن. وا ئێستا ئێمە شارەکەتان بەدەستەوە دەدەین، دەخالەتمان قبوڵ بکەو ژیانمان بپارێزە. مەلیکی خاچدروشم لە وەڵامدا گاڵتەو سووکایەتی پێ کرد، (المشطوب)یش لە وەڵامدا، وەك ئەو دڕێغی لێ نەکردو پێشی گوت: ئێمە شارەکە بە دەستەوە نادەین، مەگەر هەموومان بکوژرێین، کەسیشمان ناکوژرێ تا پەنجا کەستان لی نەکوژێ، بەتایبەتیش لە گەورەکانتان، ئەمەی گوت و بەجێی هێشت".[1479]

بەڵام هەندێ لە میرەکان توانییان لە شار دەربچن و ڕابکەن، بەنموونە، وەك (أرسل، حسام الدین تمرتاش بن جاولی الکبیر، سنقر الوشاقی الأسدي و عبدالقادر الحلبی) ئەمانە، پاشان گیران و سەلاحەددین سزای قورسی بەسەریاندا سەپاند، چونکە سەلاحددین هەروا دەستەوێستان نەوەستابوو، نەخێر، ئەو بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر خاچدروشمان، بەڵام لەشکرەکانی نائومێدیان کرد، ئەوەبوو پێیانگوت: ئەم هێرشە هەموو موسڵمانان دەخاتە مەترسییەوەو هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نییە، هەرچەندیشە هەندێ لە فەرماندارە ئازاو بەجەرگەکانی، بە نموونە وەك (الجناح)ی برای (سیف الدین المشطوب)و گروپێ لە میرەکان، وەك (عزالدین جوردیك النوري، صارم الدین قایماز النجمي) هێرشیان کردە سەر خاچدروشمان تا گەیشتنە شوورەکانیان و کوشتارێکی توندو تیژیان لەگەڵدا کردن و[1480] توانییان تا ماوەیەك بیانوەستێنن. بەڕووداوەکانیشدا وادیاربوو، لەوە دەچوو دووبارە دانوستاندن دەست پێ بکاتەوە، چونکە نوێنەرانی ڕیشارد هاتنە لای سەلاحەددین و داوای ئیزنیان لێ کرد هەندێ میوەو بەفر بکڕن و گوتیشیان کە بۆ وتووێژی پێکهاتنەوەش ئامادەبن، بەڵام سەلاحەددین زۆرتر سەرگەمی ئەوەبوو هەر هێزو ئازووقەیەك بۆی بلوێ و بۆی بکرێ بینێرێتە ناو شاری (عکا)، چونکە جەنگاوەرانی ناو شارەکە لەوەدەچوو کە هێشتا هەر بە تەمای سەلاحەددینن کارێکی وەها بکا دوژمن لە شوورەکان دوور بخاتەوە، ئەوەبوو لە (١٢)ی (جمادي الآخرة)ی ٥٨٧ك/ ٧ی تەمموزی (١١٩١ز)دا، مەلەوانێ لە شارەکەوە هات، نامەیەکی لە خەڵکی شارەوە هێنابوو نووسیبوویان "ئێمە قەول و قەرارمان لەگەڵ مەرگدا کردووە، هەتا ئێستاش لە شەڕداین تا دەکوژرێین، تا گیانیشمان لەبەردا مابێ، شار بەدەستەوە نادەین، ئێوەش کارێکی وەها بکەن دوژمن نەپەرژێتە سەر ئێمەو شەڕیان لە کۆڵمان بکەنەوە. ئێمە، ئەوە بڕیارێکەو لێی پاشگەز نابینەوە، نەکەن ملی بۆ شۆڕ بکەن، بۆیان نەرم نەبن. هەرچی ئێمەین، ئەوە بەسەرچووین و ڕابووردین".[1481]

**٢ـ چۆکدادانی (عکا)و هۆکارەکانی:**

خاچدروشمان لەسەر هێرشی خۆیان سووربوون و بەردەوام بوون، کەلێنی تازەو تازەتریان دەخستە شوورەکان و کەلێن و کەلەبەرە کۆنەکانیان گەورەتر دەکرد، سووتەنییان تێ دەئاخنی و ئاگریان دەداو حاڵی شارەکە بەرەو خراپتر

1477 النوادر، ص ١٦٧. الروضتين، ١٨٦/٢. مفرج الكروب، ٣٥٥/٢.

1478 النوادر، ص ١٦٧. شفاء القلوب، ١٧٠.

1479 النوادر، ص١٦٨. الفتح القسي،، ٥٠٥. الكامل، ٦٦/١٢. الروضتين، ١٦٨/٢ ـ ١٨٧. مفرج الكروب، ٣٥٦/٢ ـ ٣٥٧. البداية والنهاية، ٣٤٣/١٢.

1480 النوادر، ١٦٨. الروضتين، ١٨٧/٢. مفرج الكروب، ٣٥٨/٢.

1481 النوادر، ١٦٩ ـ ١٧٠. الروضتين، ١٨٧/٢ ـ ١٨٨. مفرج الكروب، ٣٥٩/٢. البداية والنهاية، ٣٤٤/١٢.

دەچوو. میرانی شارەکە، دوانامەیان بە کابرای مەلەواندا بۆ سەلاحەددین ڕەوانە کردو نووسیبوویان کە خەڵکی شارەکە بە تەواوی تەنگەتاو بوون، هیچ دەروەدەروونێکیان نەماوەو لێشیان عایەنە گەر دوژمن شارەکە بگرێ، یەکە یەکە لە ملیان دەدا، لەبەر ئەوە لەگەڵ فەرەنگدا وێك هاتوون شارەکەی بدەنێ و پێنج سەد دیلی هەرەمەکی بۆ بەردەن و خۆشیان سەد دیل هەڵبژێرن تا ئەمان بۆیان بەربدەن، (صلیبی صلبوت)یشیان بدەنێ، بەمەرجێ ئەوانیش ڕێگا بدەنە موسڵمانان خۆیان خۆراك و ئازووقەو خاووخێزان و ماڵ و منداڵیان بە سەلامەتی لە شارەکە دەربچن، ڕێساو دەستووریش لە نێوان موسڵمانان و فەرەنگدا پێشتریش هەروا بووە.[١٤٨٢] سەلاحەددین کە ناوەڕۆکی ئەم تەبایی نامەیەی خوێندەوە، تووڕەبوو و پێی قایل نەبوو. ئەوەبوو دەستبەجێ، ئەندامانی ئەنجومەنەکەی خڕ کردنەوەو لەگەڵیاندا کەوتە ڕاوێژو تەگبیر کە لەم وەختە ناسکەدا چ بکەن و چ نەکەن. "پاشان بڕیاریدا، هەر ئەو شەوە نامەیەك بۆ خەڵکی (عکا) بەکابرای مەلەواندا بنێرێ و بنووسێ: نەکەن". بەڵام خاچدروشمان لەو خێراتر کەوتنە خۆو، چاوەڕێی وەڵامیان نەکردو هێرشیان کردە سەر شارەکەو زۆری نەبرد ئاڵاو خاچ و دروشمگەلیان بەسەر ماڵە بەرزەکانەوە دەستی بەشەکانەوە کردو، بۆ ڕۆژی هەینی ١٧ی (جمادي الآخرة)ی ساڵی ٥٨٧ك/ ١٢ی تەمووزی (١١٩١ز) لەسەر شوورەکانیش ئاگریان کردەوە، موسوڵمانانیش لە هاوارو باوکەڕۆو گریان، زیاتر هیچیان بۆ نەمایەوەو هەر "انا لله وانا اليه راجعون"یان دەگوت و دەگوتەوە.[١٤٨٣]

ئەوجا سوڵتان بە دڵێکی پڕ لە جەخارەوە، فەرمانی دا باروبارخانە بگوازێتەوە بۆ جێگەکەی جارانی لە (شفرعم)، ئیدی هیچ بیانوویەك بۆ گەمارۆو مانەوەی هێزەکانی لەو جێگایەدا نەماو، چاوەڕوانی ئەوەبوو بزانێ چیتر ڕوودەداو چی دەقەومێ. لەوەدەچێ، سەلاحەددین دڵی لێی دابوو کە خاچدروشمان دەیانەوێ پیلانێکی لێ بکەن، ئەویش خۆی بۆ ئامادەکردن، (ابن شداد) لەم ڕووەوە دەڵێ: سوڵتان (جریدە)یەکی بۆ دانان. واتا دەستەیێ سەرباز، بەڵکو ئەمە خوایە خاچدروشمان، لەبەر لێنەزانین و نەشارەزایی. بۆی بێن و هێرش بکەنە سەری و ئەویش دەرفەت بێنێ و تۆڵەیان لێ بکاتەوەو، خوداش کێ سەرخا، سەری دەخا، بەڵام دوژمن نەخەڵەتا.[١٤٨٤]

ئنجا سوڵتان داوای لە خاچدروشمان کرد، ماوەی بەکارخستنی شەرتوشرووتی تەبایی نامەکەی پێ بڵێن چەندە، بەتایبەتیش بەندەکانی دارایی و ئاڵوگۆڕی دیلەکان، وەڵامیان دایەوە کە سێ (تێرم)ە.[١٤٨٥] پاشان خاچدروشمان نوێنەرێکیان نارد تا بەچاوی خۆی (صلب الصلبوت)ە، ببینێ و لێی دڵنیا بێ کە ئەمە خاچە ئەسڵەکەیە.[١٤٨٦] ئیدی نوێنەران لە نێوانیاندا دەهاتن و دەچوون بۆ بەکارخستنی شەرتووشرووتی تەبایی نامەکەی نێوانیان. سەلاحەددین، هەرچی ئەوان داوایان کردبوو، لە دیل و لە دارایی تایبەت بە تێرم (مانگی) یەکەم و خاچ و سەد هەزار دینارو هەزارو پێنج سەد دیل، هەرهەمووی بۆ زامن کردن و ئامادەی کرد. خاچدروشمانیش نوێنەری خۆیان نارد تا دڵنیابن لەوەی کە سەلاحەددین شەرتوو شرووتی تەبایی نامەکەی بەجێ گەیاندووە یان نا، هەموویان بە چاوی خۆ دیت، تەنیا ئەو دیلانە نەبێ کە داوای ئازادکردنیان کرابوو، چونکە پێشتر خاچدروشمان، لیستی ناوی ئەو دیلانەیان کە مەبەستیان بوو ئازاد بکرێن نەیاندابوو بە سەلاحەددین. وادیارە خاچدروشمان لە بیانوو دەگەڕان و لەسەر ئەرێیە بەندبوون، واتا دەیانویست

---

[1482] النوادر، ١٧٠. الفتح القسي، ٥١٣. الكامل، ١٢/٦٧. الروضتين، ٢/١٨٨. مفرج الكروب، ٢/٣٥٩ ـ ٣٦٠. الدوداري، الدر المطلوب، ص ١٠٧. شفاء القلوب، ١٧٠. Stevenson, The Crusaders p. 270 – Lane – pooL Saladin, p.302.

[1483] النوادر، ١٧١. مرآة الزمان ٨/٤٠٨. مفرج الكروب، ٢/٣٦٠. الروضتين ٢/١٨٨ ـ الذهبي، مخطوط (تأريخ الاسلام، ورقة ٦٢٧ـ أ).

[1484] النوادر، ١٧٢. الروضتين ٢/١٨٨.

[1485] لەسەرچاوە عەرەبییەکاندا بەم تەورە هاتووە (النوادر، ١٧٣. الفتح، ٥٢٧. الروضتين، ٢/١٨٩): مەبەست لە (term)ە، ئینگلیزییەکەیە کە مانای (ماوەـ کات، کایە) دەبەخشێ، واتا چەند دەخایێنێ بە مانگی عەرەبی بنۆڕە (قاموس المورد)، ئینگلیزی ـ عەرەبی/ ژمارەی چاپ/ ٧، لاپەڕەی ٩٥٩.

[1486] مفرج الكروب، ٢/٣٦٣.

گەڕ بە مسوڵمانان بکەن‌و شتێك بکەن، بەڵگەو شەرتووشرووتی تەبایی نامەکە لە ملی خۆیان داماڵن. بەوجۆرە "مەسەلەکەیان بە پشتدا دەخست‌و وەختیان بە فیڕۆ دەدا، تا تێرمی یەکەم بەسەرچوو".[1487] پاشان سەلاحەددین داوای جێبەجێکردنی قەول‌و قەرارەکانی ئەوانی لێ کردن، ئەوان قایل نەبوون هیچی بۆ بەجێ بێنن، ئەوجا سەلاحەددین بە تەواوی بۆی ساغ بووەوە کە ئەوان خەنجەر لە پشتەوە دەوەشێنن.[1488] ئەمیش خاچ‌و پارەکەی گلدایەوەو نەیدانێ. ڕیشاردیش لە خوای دەویست، کەوتە قەسابکاری لەناو شاری (عکا)داو، فەرمانی دا سێ هەزار موسڵمانی ئەو شارە باڵبەست بکەن‌و بەکوتەك‌و شمشێر هەموویان بکوژن‌و کەسیان لێ نەهێشتنەوە، تەنیا ئەوانەیان نەبێ کە بتوانن خزمەتی خاچدروشمان بکەن‌و سوخرەیان بۆ بکێشن. موسڵمانان ماتەمینییەکی تەواو دایگرتن.[1489] سەلاحەددین لەگەڵ ئەو خەڵکەدا دەستی بە گریان کردو کەوتە ڕیش ڕنینەوەی خۆی. سەلاحەددین عادەتی بوو، کە زۆر غەمبار دەبوو ڕیشی خۆی دەڕنیەوە. پاشان فەرمانی دا، ئەو دیلانەی لە دیمەشقەوە بۆ ئاڵوگۆڕ هێنابوونی، هەموویان ببەنەوە بۆ جێگای خۆیان‌و ئەوەی خاچدروشمان کردیان، ئەم نەیکردو تۆڵەی لەیەك دیل نەسەندەوە. وا پێدەچێ ڕیشارد بۆیەکە ئەو هەموو دیلەی کوشتن، تا بۆ دواڕۆژ سەلاحەددین سوودیان لێ نەبینێ‌و، دیارە پەلەی ئەوەشی بوو هێرشێکی گەورە بۆ سەر قودس، یان عەسقەلان دەست پێ بکا. بۆیە بەم نامەردییە ئەو هەموو دیلەی کوشت.[1490] بەرەڤانیی موسڵمانان لە (عکا) دوو ساڵ درێژەی کێشا، وەلێ چۆکدادانی ئەم شارە چەندین هۆکاری هەبوو، گەورەترینیان:

یەکەم: هێزی تازە لە ئەورووپاوە گەیشت‌و بەوەش تای تەرازووی خاچدروشمان قورستر بوو. هەرچەندیشە زۆریان لێ دەکوژرا، بەلام کۆمەکی دەریا کۆتایی نەدەهات، تاوای لێ هات هەند زۆربوون، لە ژماردن نەدەهاتن، چونکە لە هەموو میللەتانی ئەورووپاوە دەهاتن‌و[1491] لەم هەڵمەتە گەورەیەی خاچدروشماندا هاوپشك دەبوون. میرانی ئەورووپا هەموو خاروبارو ئامێرو ئامرازیان بۆ دەستەبەر دەکردن‌و شارەکانی ئیتالیاش کۆمەکیان پێ دەکردن‌و لەشکرو جبەخانەیان بە دەریادا بۆ دەگوازتنەوەو نەشیدەهێشت کەشتی‌و گەمیی ئەییووبیان ئازووقەو چەك‌و جبەخانە ببەن بۆ شارە گەمارۆدراوەکەو ئەوان لە دەریادا دەستیان بالابوو، هەموو شتێکیان بۆ دەکرا.[1492]

دووەم: خاچدروشمان لە کوشتارەکەی شاری (عکا)دا جۆرەهای جۆر چەك‌و جبەخانەی بابەتی کۆن‌و هی نوێی چاکترکراویان، چ بۆ هێرش‌و ڕووخاندنی شوورەکانی شارەکەو چ بۆ خۆپاراستن لە پشت ئەو دیوارو کەندەکانەوە کە لە ترسی هێزەکانی سەلاحەددین دروستیان کردبوو بەکار دەهێناو دوای مانەوەیەکی دوورو درێژ لە نێوان شوورەکان‌و هێزە گەمارۆ دەرەکەی ئەییووبییاندا، ئنجا توانییان کەلێن‌و کەلەبەر بخەنە شوورەکانەوە، لە نامەیەکی دەستنووسی (القاضي الفاضل)دا کە سەلاحەددین ناردی بۆ خەلیفەی عەبباسی لە بەغدا تێیدا نووسیی: "خاچدروشمان، جارێ بە قولەو تاوەر کوشتاریان تێ خستین‌و جارێ بە مەنجەنیق، پاشەکییەکیش بە دەبابەو بەدوایدا بە بەرانەو تاوێکیش بە مارپێچ (اللولب)و ڕۆژێ بە سمینی شوورەو شەویش بە هێرشی پەل‌ولق‌و، جوونێ بە پڕکردنەوەی کەندەکان‌و ساتێ

---

1487 النوادر، ١٧٣. الفتح، ٥٢٧. الروضتين، ١٨٩/٢.

1488 الكامل، ٦٨/١٢.

1489 النوادر، ١٧٤. الفتح، ٥٢٨. الحموي، التأريخ المنصوري، ٢٠٠. مرآة الزمان، ٤٠٨/٨. الروضتين، ١٨٩/٢. مفرج الكروب، ٣٦٤/٢. ابن العبري، تأريخ مختصر الدول، ص ٢٢٢. البداية والنهاية ٣٤٥/١٢. الدر المطلوب، ١٠٧. شفاء القلوب، ١٧١. ابن الوردي ١٤٨/٢. السلوك ١٠٥/١. الذهبي، مخطوط تأريخ الاسلام، ورقة ٢٧/أ. ابن العبري، تأريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، ج ٤، ٥ لسنة ١٩٥٣، ص ٤٥٥ ـ ٤٥٦.

1490 Stevenson, The Crusaders p, 273

1491 الروضتين، ١٨٥/٢.

1492 الفتح القسي، ٤٨٦. الروضتين ١٨٤/٢.

به هەڵپساردنی پەیژەو، کەڕەتێ بەشەبەیخوونو هێرشی ڕووناکیو زۆرجاریش بە هێرشی کەشتیو گەمی".[1493]
زەلامەکانی ڕیشارد دەیانتوانی بە ئامێرێ کە دروستیان کردبوو، (پشیلە)یان پێ دەگوت، سەرکەونە سەر شوورەکانو مەنجەنیقەکانیشیان بەردی گەورە گەورەی دەهاویشتە سەر شوورەکانو لێکیاندەترازانو، بشکەوتایەتە ناو شارەکە، سەرلەبەری شارەکەی دەهەژاند.[1494]

سێیەم: موسڵمانان بە هۆی گەمارۆی درێژخایەنی سەربەژو سەردەریاوە گەلێ گەلێ ماندوو بوون، بەمەش زۆر بێزار دەبوون. خۆ سەلاحەددین جاروبار ئالوگۆڕی لە نێوان جەنگاوەرەکاندا دەکردو هێزی نوێی بۆ جێگرتنەوەی هێزە کۆنە ماندووەکان دەنارد، بەلام نەیتوانی لەسەر ئەوەش هەتا سەر بڕوات، نەخاسمە کاتێ خاچدروشمان گەمارۆی شارەکەیان توندو بەهێزتر کرد. ئەو گەمارۆیەش کە سەلاحەددین لە پشتەوەی خاچدروشمانەوە. سەپاندبوویو جاروباریش. بەتایبەتیش لە سەرەتای[1495] گەمارۆی شارەکە لەلایەن خاچدروشمانەوە سەرکەوتنی ناو بەناوی بەسەر خاچدروشماندا وەدەست دەهێنا، بەلام سوودێکی ئەوتۆیان نەبوو، سەرەنجامیش تووشی ساردبوونەوەو کەمتەرخەمی هاتنو لەوەش زیاتر لەباردانەبوو. میرەکانیش لە سەلاحەددین زیز بوونو لێی بێزار بوون، ئیدی ئەم بێزارییە وردە وردە خوویان پێوە گرت تا بێزاری بوو بە عادەتو نەریتو بوو بە ڕەخنەو پێی لێ ڕاکێشا تا بوو بە بەرهەڵستکاری، نەخاسمە لە دوا قۆناغی جەنگەکەدا، کاتێ (عکا) چۆکی بۆ دوژمن داداو بوو بە بەڵگەی لاوازبوونی فەرمانداریێتیی سەربازیی سەلاحەددین.[1496]

چوارەم: ململانێی درێژخایەنی سەلاحەددین لەگەڵ خاچدروشمانو چۆکدادانی شاری (عکا) پێگەی چرووکو لاوازیی ماددی لە سوپای سەلاحەددیندا ئاشکرا کردو پەردەی لە ڕووی کزیی دارایی ئەم سوپایە هەڵماڵی. هەموو دەزانین سەلاحەددین گرنگییەکی تەواوی بە هەڵسوڕاندنی کاروباری دارایی نەداو هیچیشی بۆ ڕۆژی ڕەش پاشەکەوت نەکرد، ئەو چاوتێریو دەستبلاوی خەرجە زۆرەش کە دەیکرد، دۆخی غەزاو شەڕ وەهای سەپاندبوو "سوڵتان دارایی میسری کرد بە قوربانی غەزاو گرتنی شامو، دارایی شامیشی کرد بە قوربانی غەزاو داگیرکردنی جزیرێو دارایی هەرهەمووشیانی لە داگیرکردنی کەناراودا بەخەرج دا".[1497]

زۆری نەخایەند، سەلاحەددین سەیری کرد خەزنەی خاڵییەو زۆریش پێویستی بە پارە هەیە بۆ ئەرکو مەسرەفی چەکو ئازووقەو ئالفو کەلوپەو جبەخانەو مووچەو خەلاتی سەربازەکانی. هەروەها نەشیتوانی باری قورسی هەژاریو بێ پارەیی لەشکرەکانی دەوروبەری (عکا)یش کەمێ سووک بکا کە دەستیانکردبوو بە قەرزکردن. ئەسپو هێستری ماندوو و چەکو چەپرەکی شڕیشی بۆ نوێ نەکرانەوە، ئەسپەکانیان "غەزا پەکی خستبوون.. جبەخانەیان نەمابوو، بزربووبوو، کەرتو پەرت بووبوو.. هەرچی تیرە، ئەوە هەر باسی مەکە، هەمووی لە ناوچووبوو، کێلانەکانیان خاڵیو بەتاڵ بوون".[1498] (العماد) ئنجا دەڵێ: "لەم ساڵانەدا پێویستیان بە بارو بارخانەی زۆر هەبوو.. نە سەنعەتکاران تەواویان کردو نەکرێکاریش باری کرد."[1499]

ئەنجام (عکا) چۆکی داداو گیرا، بەلام زێرەڤانیەکانی مەردانە وەستانو ڕووبەڕووی ئەو هێرشە یەك لەسەر یەکانە بوونەوە کە خاچدروشمانی کۆنو نوێی هەڵمەتی سێیەمیش لە ژێر فەرماندەی گەورەترین شای ئەو سەردەمەدا دەیانکردە سەر شارەکە. زێرەڤانیەکانو جەنگەوارەوانی ئەییوبیانیش لە عەکا، بە فەرماندەی میرە ئازاو بوێرەکانی بە

---

1493 الروضتين ٢/١٨٥.

1494 فليب حتي، صانعو التأريخ العربي، دار الثقافة، ١٩٦٩، ص ١٩٠.

1495 Oman, AHistory of the art war in the Middle ages.

1496 جب، صلاح الدين، ص ٢٠٠.

1497 أبو شامة على لسان القاضي الفاضل، الروضتين، ٢/١٧٧.

1498 الفتح القسي، ٥٥٣.

نموونه، وەك (المشطوب و بهاءالدين قراقوش) قارەمانێتیەکی کەموێنەیان پیشان دا، سەر لێی سوڕ دەما.

هەرچی سوپاکەی سەلاحەددینیشە کە بە خۆی فەرماندەیی دەکرد، ئەوە ئەرکی سەرشانی گەلێ قورس و گران بوو، نەك تەنیا لەبەر ترسناکی و گرنگیی ئەو جێگەیەی کە لێی هەڵیدابوو، یان لەبەر مەزنی و بەهێزیی دوژمن، بەڵکو لەبەر ئەوەی سوپایەکی چەکدار بۆ ئەو ماوە دوورو درێژە لەو جێگەیەدا بمێنێتەوە، بۆ ئەو سەردەمە، شتێکی خەتەرناك بوو، چونکە هەموویان بێزار بوون و مەسەلەی مانەوەیان یەك ڕۆژو دوو ڕۆژ نەبوو.

بەرهەحاڵ، سەرکەوتنی خاچدروشمان لە شەڕی (عکا)دا، سەرکەوتنێکی بنبڕنەبوو، چونکە بە مانەوەی خاچدروشمان بۆ ماوەی دوو ساڵ، هەرچەندە شارەکەشیان گرت، بەڵام نەیانتوانی سوپای سەلاحەددین بە تەواوی لەکار بخەن و تێك وەمەکانی بدەن، نەشیانتوانی ئەو زەرەرو زیانەی لەدوای شەڕەکەی (حطين)دا بوویان تۆڵەی بکەنەوەو بیسەنەنەوە.[1500]

## دووەم: دوای کارەساتی (عکا):

چۆکدادانی شاری (عکا) بە کاریگەری، دۆخ و گوزەرانی موسڵمانانی لەق کرد. هەرچەندیشە ئەم جەزرەبەیە بنبڕو ڕیشەکێش نەبوو، وەلێ موسڵمانانی گەلێ کەم ورەو لاواز کرد، بە جۆرێ، کە ئیدی کەوتنە بەرەڤانی و بەرگرییەکی بێ سوود، بە نموونە گەلێ قەلاو قایمکاریان ڕماندو وێران کرد تا نەکەونە دەست دوژمن و نەکرێ بە مۆڵگەو بنکەی هێرش بۆ سەر شارەکانی دیکەی موسڵمانان.. بەڵێ ڕاستە، لەو کاتەوەی کە گەمارۆی شاری (صور) سەری نەگرت، ئیدی ئەو نشوستییە، بوو بە سەرەتای لێژبوونەوەی ڕەوشی ئیسلامیی، بەڵام ئەم نشوستییە لە شرۆڤەو لێکدانەوەی دواییدا، لەڕیزی نسکۆکانی سوپای سەلاحەددیندا دادەنرێ، نەك لە ڕیزی سەرکەوتنەکانی خاچدروشماندا، واتا ڕووداوەکەی (صور) تەنیا بەوە لەقەڵەم دەدرێ، کە موسڵمانان لە گەمارۆی شارێك لە شارەکاندا شکستیان هێناو سەرنەکەوتن، بەڵام کارەساتەکەی (عکا) بەوە لەقەڵەم دەدرێ کە بەرگریکارو بەرەڤانیکاران بەزین و هێرشبەرانی خاچدروشم زاڵ بوون و سەرکەوتن. جگە لەوەش ئەو سێ هەزار دیلەش کە ڕیشارد کوشتنی، سوپای سەلاحەددینی کەم هێز کرد. سوپای سەلاحەددین بەو قەسابخانەیە ژمارەیێکی گرنگی لە میرو سەربازی شارەزاو بە ئەزموونی لە دەستچوون و چەك و جبەخانەو ئامێرێکی زۆریشی کەوتە دەست خاچدروشمان و ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆریشی خستە دڵ و دەروونی مسوڵمانانەوە. کە دواتر باسی دەکەین.. گەورەترین مەترسیی نسکۆی (عکا) ئەوەبوو، خاچدروشمان قەناعەتیان هێنا کە سەلاحەددین ئەو فەرماندەیە نییە هەرگیز نەبەزێ و نەشکێ، نەخێر، بەڵکو لەوانەیە بشبەزێت و بشدۆڕێت و خاچدروشمان حەزکەن قودسیش دەسەننەوە.

سەلاحەددینیش لە خولیای ئەوەدا بوو بە جەنگاوەرانی سوپاکەی و بە دوژمنیش بسەلمێنێ، کە ئەگەر جارێ بەزیبێ، ئەوە خۆ نەمردووەو ماوەو هێشتا بەهێزیشە. ڕاستیشت دەوێ، خۆی لەبەر نەخۆشی و لەبەر بەساڵاچوویی، ئەو بزاڤو چالاکییەی جارانی نەمابوو و، ئەو گوڕو تینەی ڕۆژانی گەنجی و لاوێتییەی لەدەست دابوو.[1501]

### ١ـ لەشکرکێشی بەرەو عەسقەلان:

---

[1499] الفتح القسي، ٥٥٣.

[1500] د. زكي النقاش، العلاقات الاجتماعية والاقتصادية بين العرب والافرنج خلال الحروب الصليبية، منشورات دار الكتاب اللبناني، بيروت ١٩٥٨، ص ٣٣. د. احمد مختار العبادي، تأريخ البحرية الاسلامية في مصر والشام. مطبوعات جامعة بيروت العربية ١٩٧٢، ص ٢٩٢. د. سعيد عاشور، الحركة الصليبية، ج٢، ص ٩٠٢.

[1501] (ابن شداد) لەم سۆنگەیەوە دەڵێ: "ئەگەر سوڵتان بەو جۆرە نەخۆش نەباو باری دەروونی تێکنەچوویا، ئەو تاقمە بێ ئارەق دەرنەدەچوون، بەڵام وا، خۆی نەخۆش و ناساغەو ناتوانێ یەکسەر بە دەستی خۆی کارەکە هەڵسووڕێنێ ... بۆیە بە هەناسەیەکی ساردەوە گوتی: (اقتلاني ومالكا ـ واقتلا مالكا معي) واتا: (منو مالك هەردووکمان پێکەوە بکوژن، مالکیشم لە تەکدا بکوژن)، بە کورتی گوتوویەتی (خوا ئەکا دوژمنی خودا لەناو دەچێ، قیری سیا، منیشی لەگەڵدا بکوژن)". النوادر، ١٥٠. الروضتين ٢/ ١٨٠.

سەلاحەددین لەوە دەترسا ریشارد لەشکر بەرەو عەسقەلان بباو دایگری بکاو بیکا بە بنکەو بارەگای سەربازیو ڕێگای پێوەندیو هاتوچۆی نێوان سەلاحەددین لەلایەکەوەو، قودسو میسر لەلایەکی ترەوە ببڕێ، چونکە میسر چاوگەی گەورەی هێزو کۆمەك بوو بۆ سەلاحەددین. ئەوەی سوڵتان لێی دەترسا، ڕوویداو هاتە دی، ئەوەبوو ریشارد لەشکرکێشییەکی بەرەو بەشەکانی باشووری فەلەستینو سەروبەرناو ڕێکی خست. ریشارد ئەم پلانەی بە جۆرێ دانا، کەناراوو کەناراو پێدا بڕواو لەشکری لێ دامەزرێنێ، تا دەگاتە یافاو عەسقەلانو لەوێ بنکەیەکی قایمکار دامەزرێنێ، پاشان بە ڕێگا ڕۆمانییە کۆنەکەدا،[1502] لەشکر بەرەو قودسیش بەڕێ بخات.

بەم کارەی ریشاردا دەردەکەوێ کە ئەم مەلیکە، لە دانانی پلانی ستراتیجیدا بلیمەتێکی کەموێنە بووە، چونکە ڕێگایەکی ئەوتۆی بە سوپاکەی گرتە بەر، تا گەیشتنە (أرسوف)یش خۆیان لە قەرەی سوپای سەلاحەددین نەداو نەیهێشت لە هیچ شەڕێکی بەرفراواندا لووت بەلووت ببنەوە. سوپای ریشارد شان بەشانی کەشتیگەلەکەی کە کەوتبووە لای ڕاستیەوەو لە دەریاوە دەیپاراستن. بەرەو باشووری فەلەستین ملی نا. جگە لەوەش ئەو کەشتیگەلە لە ئازووقەو سەربازو جبەخانەشی پێ دەدان. تەنیا ئەوەندە هەیە، ئەو ڕێگا کەناراوییە بەناو گردو زورگانێگی نزمی لمیندا دەیبردن پڕبوو لە دارستانی چڕو درەختو گیانلەبەری دڕەندەو جانەوەرو ماری بەزەهر. وەرزەکەشی بەڕێکەوت وەرزی هاوینی ساڵی ١١٩١/ ڕۆژی یەکی شەعبانی ٥٨٧ك بوو.[1503] بەڵام سەلاحەددین فەرمانی دا بە سوپای ئەیبوبی، کەنارەو کەنار، دوورو نزیك دوویان کەونو شوێن پێیان هەڵبگرن. سوپای خاچدروشمان بەسێ تابوور دەڕۆشتن. تابووری یەکەم لە زورگەکانی ناوەوە نزیکتربوو، ئەم تابوورە لە سوپای موسڵمانانەوە نزیکبوو و هەر هەمووشی سەربازی پیادەبوون و شان بەشان بەڕیز دەڕۆشتن. هەرچی ئەو لقانەن کە لە دەرەوەی ئەم ڕیزانە دەڕۆیشتن، جار جار بەر تیری ئەییوبیان دەکەوتن، بەڵام خاچدروشمان بەرپەرچیان دەدانەوەو وەك ئەوان تیریان تێدەگرتنەوەو زرێپۆشیش بوون.[1504]

تابووری دووەم هەموویان سووارە بوون. ئەم تابوورە هێزی ڕاستەقینەی سوپاکە بوون، ئەمانە دووربوون، تیری سەربازانی ئەییوبییان نەدەگەیشتێ، چونکە پیادەکانیان بۆ بووبوون بە سوپەرو لە دەریاکەشەوە نزیك بوون. دوورتر لە سوپای ئەییوبییەوە. تابووری سێیەم بەخۆیو عەرەبانەو کەلوپەلو باروبارخانەیەوە دەڕۆیشتن، نەخۆشەکانیشیان سوار کردبوون. زەلامی ئەم تابوورە دەیانتوانی ناوە.. ناوە وچانێ بگرنو ماندویان بحەسێتەوە، چونکە تاقمێکیان لەسەربازە پیادەکان ناوە ناوە لەگەڵیاندا دەگۆڕیو دەهاتنە جێگای ئەمان.[1505] عەرەبانەیەکی گەورەشیان وەپێش خۆیان دابوو، ئاڵایەکی گەورەو گرانی منارەئاسایان توند لێ ڕاگرتبوو.[1506]

هەردوو سوپاکە (سوپای خاچدروشمانو سوپای ئەییوبییان) هەژدە ڕۆژی ڕەبەق بەڕێوەبوون. (ابن شداد) بە دوورو درێژی باسی ئەم لەشکرکێشیو ڕەوتە سەربازییە دەکاو لە هەر مەنزڵگایەکیشدا چی ڕوویدابێ، دەیگێڕێتەوەو، دەڵێ: یازدە مەنزڵگایان هاتە ڕێ، لەسەرەتای مانگی شەعبانەوە دەستی پێ کردووەو لە (١٨)ی شەعباندا بە کۆتایی گەیشتووە، کە لەو ڕۆژەدا سوڵتان سەلاحەددین گەیشتە (یبنی) لە نزیك شاری (الرملة)وە، بەوەش کایەی یەکەمی ئەم ڕێپێوانە بڕستبڕو بەکێشە تەواو بوو.[1507]

---

[1502] Lane – poole, Saladin. P. 308

[1503] Stevenson, The Crusaders. P. 275. Lane – poole, Saladin. P. 308. Oman, AHistory of The art, .Vol.1. p. 309

[1504] سرهنگ، حقائق الاخبار، ٧٩/٣. د. سعداوي، التأريخ الحربي، ٢٢٦. النوادر، ص ١٧٩. مفرج الكروب، ٣٦٥/٢. مرآة الزمان ٤٠٨/٨ ـ ٤٠٩.

[1505] النوادر، ص ١٧٩. مفرج الكروب، ٣٦٥/٢.

[1506] النوادر، ص ١٧٩. الروضتين، ١٩٠/٢.

[1507] النوادر، ص ١٧٥ ـ ١٨٦.

ڕیشارد بڕیاری دابوو سوپاکەی لەسەرەخۆ بجوولێ، چونکە هاوینەکەی زۆر گەرم بوو، ڕۆژی هەشت میل تا دەمیل ڕێگایان دەبڕیو، لەو ڕۆژانەشدا کە ئالۆگۆڕ لەگەڵ پیادەکاندا دەکرا، لێ دەگەڕا سوپاکە وچان بداو بحەسێتەوە.[1508]

(ابن شداد) سەری سوڕدەمێنێ لە مکوڕیو ماندوونەزانیو گیان لەلاهەرزانیی سوپای خاچدروشمان کە لە ئیشی قورسو گراندا بێباکنو کوڵ نادەنو دەڵێ: "تۆ، وەرە، سەیری ئەو میللەتە بکە، خۆ زەحمەت هەر نازانن مانای چییە، بڕوانە چەند بە پشوو و بە سەبرن".[1509]

لەو ناوچانەی ئەم لەشکرانەی پێدا تێپەڕ دەبوون، لێرەو لەوێ، برسێتی سەری هەڵدابوو، بە تایبەتیش لە مەنزڵگەی سێیەمی نزیك (مجدل یابا) کە یەك ڕەتڵ جۆ گەیشتبووە دوو درهەمو نیو. هەرچی نانە، ئەوە هەر باسی مەکە، چونکە بنبڕبوو، بۆ دەرمان دەست نەدەکەوت.[1510] "میللەت تووشی نەهاتیو برسێتیی بوو، نەخۆراك، نە پۆشاك، بگرە جۆی پاشاخوڕی وڵاغیش دەست نەدەکەوت".[1511] بەڵام ئەوەی باش بوو، ئەم نەهاتیو تەنگانەیە درێژەی نەکێشاو بەرەبەرە، نرخ دابەزیو زۆری نەبرد، نان بە زۆری کەوتە بەردەستو ڕەتڵی نان بوو بە نیو درهەم.[1512] چەرخەچییەکانی سوپای سەلاحەددین، ناوە ناوە خۆیان لەسەربازانی خاچدروشم دەداو، لێیان دەفڕاندنو دەیانکوشتنو تۆڵەی قەسابخانەکەی شاری (عکا)یان دەکردەوە کە ڕیشارد لەناوی بردن،[1513] چونکە سەلاحەددین سوێندی خواردبوو، هەر خاچدروشمێکی دەستکەوێ لە جیاتی ئەوانەی (عکا) دەیانکوژێتەوە.[1514]

مێژوونووسێ لە مێژوونووسانی خاچدروشم، باسی تەکتیکی هێرشی خێرا خێرای موسڵمانان دەکا، کە چۆن چۆنی هێرشیان دەکردە سەر دوژمنەکانی خۆیانو تەنگەتاویان دەکردنو ئەگەر خاچدروشمان بەرپەرچیان بدابانەوە، بە سواری ئەسپە سووكو خێراکانیان ڕایان دەکردو، دەڵێ: "ئەییوبییەکان هەر دەتگوت پەڕەسێلکەن، هەند خێرا خێرا هێرشیان دەبردو دەستوبرد دەگەڕانەوە بۆ جێگاکانی خۆیانو سووکەڵەبوون، وەنەبێ زرێو زنجیریشیان لە تەوقی سەرەوە تا کەڵەموستی پێ لەبەردا بووبێ، بەڵام کە دەیکەنە (کر وفر) واتا دەستوەشاندنو هەڵاتن، ئەوە، لەو بارەدا وەك مێش دوژمن بێزار دەکەن".[1515]

سەلاحەددین کە شەڕی بە دوژمن دەفرۆشت، مەبەستی ئەوەبوو خاچدروشمان بەرپەرچی سوپاکەی بدەنەوەو ڕایانکێشێتە مەیدانی شەڕەوە، ئەوجا ناچاریان بکا لە کەناراوەکە لابدەنو سەربازانی سوپای ئەییوبی دەرفەتیان بۆ هەڵکەوێو خۆیان بکەن بەناو ڕیزەکانی دوژمندا، بەڵام ڕیشارد. کورد وتەنی. زۆر ڕای کردبوو، ئەم فڕوفێڵانەی هەمووی دەزانیو داوای لە سەربازەکانی خۆی کرد لەڕێ لانەدەنو زەبتی خۆیان تێك نەدەنو بەدووی شەڕفرۆشیی ئەییوبیاندا نەچن، بەو جۆرە هیچ دەرفەتێکی بۆ سەلاحەددین نەهێشتەوە. کە سەلاحەددین زۆر حەزی بەو دەرفەتانە بوو.[1516]

**٢ـ شەڕی (أرسوف)و شکستی سەلاحەددین:**

هەواڵ گەیشتە سەلاحەددین کە دوژمن کەوتووەتەڕێ بەرەو جەنگەڵستانی ئەرسوف، ئەمیش کەوتەخۆ بۆ لێدانیانو دەستی بە لەشکرکێشی کردو بەرەو دارستانەکە کەوتەڕێ بە ئومێدی ئەوە کە بیانشڵەژێنێ. چەرخەچیی ناردن هەواڵی

---

1508 .Oman, AHistory of the art. I. p. 309

1509 النوادر، ١٨٠. الروضتين ٢/١٩٠.

1510 النوادر، ١٧٧.

1511 النوادر، ١٧٧.

1512 النوادر، ص ١٨١.

1513 النوادر، ص ١٧٧ ـ ١٧٨. الكامل ١٢/٧٠.

1514 الكامل ١٢/٧٠.

1515 : Oman Vol.I.P. 309. عن مؤلف: Itsineraium

1516 النوادر، ١٨٣. Oman Vol. I. P. ٣٠٩

تازەی دوژمنی بۆ بێنن، لە نێوان چەرخەچی و گیادوورەکانی دوژمندا شەڕ قەوما، لە هەردوولا بریندار بوون.[1517] کە ڕیشارد نیازی سەلاحەددینی بۆ دەرکەوت، ئەوجا ناردی کۆمەکی لە (عکا)ەوە بۆ بێ. کۆمەکی (عکا) گەیشتە لایان، لە مەنزڵگەی (نهر القصب)، پڕ هەشت (بطسیة) واتا هەشت کەشتیی گەورە زەلام و ئازووقەیان بۆ هات.[1518] کوشتار لە نێوانیاندا هەر بەدەوام بوو، بەڵام سەلاحەددین پەلەی بوو زوو بگاتە دارستانەکەی ئەرسۆف کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شارەکە، لێ ڕیشارد هەوڵی دا کێشەی نێوان هەردوولایان بە ئاشتی چارەسەر بکا، بۆ ئەوەش لە ١٢ی شەعبان/ ٥ی ئەیلولدا لەگەڵ (الملك العادل)دا کۆبووەوە، بەڵام (العادل) بە شەرتوشرووتی سەخت و گرانی شای ئینگلیز قایل نەبوو و دایە دواوە، چونکە ئەو داوای لێ کرد کە موسڵمانان هەموو ئەو جێگایانەی لە مەملەکەتی (بيت المقدس) گرتوویانە دەستی لێ هەڵبگرن.[1519] هەرچی سەلاحەددینە، ئەوە، ئەو بە ئومێدی ئەوەبوو لەڕێی دانوستاندنەکەوە دوژمن تەفرە بدات، تا لەشکرەکانی لە دەوری خڕ دەبنەوە، بەتایبەتیش ئەو لەشکرانەی کە بەڕێوەبوون، ئەوەبوو بە براکەی گوت: ئەگەر بۆت دەکرێ نەختێ درێژە بە وتووێژەکەت لە گەڵیاندا بدە، تا تورکمانەکانیش دەگەنە لامان، زۆر دوور نین، نزیك بوونەتەوە.[1520] کە گەیشتن، ئیدی سوڵتان سوپای بۆ شەڕ ئامادەکردو (الملك الافضل)ی کوڕی (علاء الدين خرمشاه ابن عزالدين مسعود)ی سەرگەورەی موسڵ و (سيف الدين أياز كوش و، عزالدين جورديك)و کەسانی دیکەشی کردن بە فەرماندارانی هەموو قۆڵەکان. ئەوجا کەوتە چاوەڕێکردنی هەواڵی دوژمن. براکەشی کە تازە لای ڕیشارد گەڕابووەوەو دانوستاندنەکەی بەجێ هێشتبوو، ڕیشارد داوای چی کردبوو، چیی گوتبوو، هەمووی لەنووکەوە بۆ گێڕایەوە. هەرچی ڕیشاردە، ئەوە، ئەو بۆ جێگایەکی لەبار دەگەڕا بۆ سوپاکەی، جێگایەکی بەگەن کردو لەوێ ئۆردووگای لێ خست، پێی دەڵێن (بركە). وادیارە سەلاحەددین ناوچەی ئەرسۆفی بۆ شەڕەکە بەگەن کرد، چونکە جێگایەکی بەرفراوان و پان و بەرین بوو، هەرچەندیشە دارستانەکەشی لێوە نزیك بوو و لە دەریاکەوە بیگرە بە درێژایی دوو میل زەویی داپۆشیبوو.[1521] بەڵام زەویی ڕووتەنی بۆ نەبەرد لە باری هەند بەرین بوو بۆ تاودانی وڵاغ و شەڕی سوارەو جریتبازی گەلێ لەباربوو.

سپیدەی چواردەی شەعبان/ حەوتی ئەیلول، خەبەریان دا بە سەلاحەددین کەوا دوژمن بەرەو شاری ئەرسۆف کەوتەڕێ و گەیشتە جێگایەکی نزیك بە دارستانەکە، دەسبەجێ خۆی هاویشتە سەر پشتی ئەسپەکەی و لقەکانی ڕێك خست و پێشەنگی سوپاکەیشی، لەبەرەوە، دەستیان کرد بە تیربارانی خاچدروشمان و لەلای باکوور و ڕۆژهەڵاتیانەوە گەمارۆشیان دان و کەوتنە تەنگەتاوکردنیان، ئەوجا جەنگاوەرانی موسڵمان لێیان چوونە پێش و "تەماعێکی گەورەیان وەبەرنان تا بەرایی پیادەکانیان گەیشتە ناو ڕەزو باخەکانی ئەرسۆف".[1522] ئەوجا خاچدروشمان زۆر بە توندی لێیان هاتنە دەست و ڕەوشی ڕووداوەکەیان بە باری بەرژەوەندی خۆیاندا گۆڕی.

(ابن شداد) دەڵێ: کە چاوی لێ بووە "سوارچاکانی خاچدروشم لە ناوەڕاستی پیادەکاندا کۆڕیان بەستووەو ڕمەکانیان لێ سندوون و بەیەك دەنگ داویانە لە نەعرەتەو یەك دڵ و یەکدەست لە هەموو لایەکەوە کەوتوونەتە پەلامارو گرووپێکیان هێرشی کردووەتە سەر قۆڵی ڕاست و گرووپێکیان هێرشی بردووەتە سەر قۆڵی چەپ و گرووپێکیشیان ڕێك و ڕاست دڕیان بە دڵ و ناوجەرگەی سوپا داوەو سەربازەکانیان وەك چۆلەکەی واشە لێدراو پەرەوازە کردووە".[1523]

ئا، بەم جۆرە دوژمن لە پێگەی بەرەڤانییەوە بایدایەوەو کەوتە تەکان و هێرش. ئەم گۆڕانە بەلای مسوڵمانانەوە شتێکی

---

1517 النوادر، ص ١٨١.

1518 النوادر، ص ١٨١. الروضتين، ٢/١٩٠.

1519 النوادر، ص ١٨٢. مفرج الكروب، ٢/٣٦٧.

1520 النوادر، ص ١٨٢.

1521 رنسيمان ٢/١٠٩. Oman, AHistory of the art, Vol. P. 312.

1522 النوادر، ص ١٨٣.

1523 ن. م. ص.

سەیر بوو، بەتەمای نەبوون و ئەمەیان لە دوژمن چاوەڕێ نەدەکرد، بەمەش ڕیزەکانی سوپای موسڵمانان لێك ترازاو شێویاو سەرەنجام ژمارەییێکیان خۆیان دەرباز کردو هەڵاتن.[١٥٢٤]

(ابن شداد) بەرێکەوت، لەو شەڕەدا لە ناوجەرگەی سوپاکەدا بوو، دەڵێ: "ناوجەرگەی سوپا ڕاکردنێکی پیس ڕایکرد"، ئەویش ناچار خۆی گەیاندووەتە قۆڵی چەپی سوپاکەو بە گەیشتنی ئەو، قۆڵی چەپیش زۆر خراپ تێکشکا، ئنجا کابرای مێژوونووس بایداوەتەوە بۆ قۆڵی ڕاست و سەیری کردووە جەنگاوەرانی ئەو قۆڵەش هەموویان هەڵاتوون و کەسی لێ نەماوە، لەبەر ئەوە، ناچار بووە خۆی گەیاندووەتە "لقەکەی سوڵتان، کە گوایا لە هەموو لقەکانی دی خراپتر بوو. وەك خۆی دەڵێ. ئەو لقە خواسایی هەروا خراپ بوو، ئنجا دەڵێ: هاتمە ناو لقەکەی سوڵتان، دیتم حەڤدە جەنگاوەری تێدا ماوە"و سوڵتان هەوڵی دەدا سەربازەکانی ڕانەکەن، تا توانیی هەندێ زەلامیان لە دەوری خۆی خڕ بکاتەوە، ئەوجا شەڕەکە، وەستاو دوژمن لەو بەریانەوە لەسەر گردەکان وەستان، پاشان کشانەوەو چۆڵیان کرد. سوڵتان سەلاحەددین، بەم ڕووداوە، گەلێ غەمگین و خەفەتبار بوو، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە قازیی لەشکرو (ابن شداد)یش سەرەخۆشییان لێ کردو دڵیاندایەوە، وەڵامی نەدانەوە، هەندێ لە میرو سەربازەکانیشی کوژرابوون. بەنموونە وەك میر (شکار موسك)و (قایماز العالی)و (أبعوش).[١٥٢٥] لە موسڵمانان سیو دوو میرو پتر لە حەفتا هەزار سەرباز کوژرابوون.[١٥٢٦]

شەڕی ئەرسوف، یەکەم شەڕێکی بەرفراوانە لە نێوان ئەم دوو سوپایەدا ڕوویدابێ لە پاش (حطین)و یەکەم بەزینیشە کە دوای لەکیسچوونی (عکا) بەسەر موسڵماناندا هاتووە. لە گەرمەی پێکدادانەکەشدا خاچدروشمان نەیاندەزانی کە خۆیان سەرکەوتوون. خۆ ئەگەر ئەوەیان زانیبا، ئەوە، شوێن پێی موسڵمانەکانیان، لەناو دارستانەکەدا هەڵدەگرت و نەیاندەهێشت شتاقیان دەرچن.[١٥٢٧]

بەڵام کە موسڵمانان لە ناو دارستانەکەدا بڵاوبوونەوە، خاچدروشمان وایاندەزانی ئەمە فڕوفێڵ و بۆسەیەو پیلانە دەینێنەوە، وەلێ کاتێ پێیانزانی مەسەلەکە وانییە، تازە کار لەکار ترازابوو، دەرفەتێ بوو، نەیانزانی بیقۆزنەوە. ئەمەش کەموزۆر مانای وایە کە سەرکەوتنێکی بنبڕیان بەدەست نەهێنا. بەهەرحاڵ سەرکەوتنێکی دڵخۆشکەر بوو بۆ خاچدروشمان.[١٥٢٨] زەرەرو زیانیشیان هەند کەم بوو سەری وەسووڕ دەهێنا، هەرچەندیشە لەناو کوژراوەکانیاندا سوارچاکێکیان لاشەکەی کەوتبوو، پازدە لاشەی ئیسلامی بەدەورو پشتیدا کەلەلا کردبوو.[١٥٢٩] ئەمەش مانای وایە کە سوارچاکێکی بەزەبرو زەنگ و دلێر بووەو پێش ئەوەی بیکوژن، پازدە سەربازی ئیسلامی کوشتووە.

گرنگیی ئەم شەڕە، بۆ خاچدروشمان، ئەوەی دەرخست کە سەلاحەددینیش لە شەڕێکی کراوەو بەرفراواندا دەبەزێ. خاچدروشمان بەم سەرکەوتنە تەواوێ سەرگەرمو مەست بوون کە تۆڵەی (حطین)یان کردووەتەوە، چونکە هێشتا بەسەرهات و ئاسەواری ئەو دۆڕاندنە گەورەیەیان هەر لە دڵدا مابوو. ئەم سەرکەوتنەی ئەرسوف، ئەوەشی سەلماند کە لە دوای چۆکدادانی (عکا)و خۆڕاگرییەکەی (صور) لەوساوە، ئیدی ئەستێرەی بەختی خاچدروشمان کەوتووەتە گەشەو ئومێدی داگیرکردنی قودسیشیان زیاتر بووژایەوە. ڕیشاردیش ناوی دەرکردو ناوبانگی گەیشتە پۆپە.[١٥٣٠]

---

1524 .Oman, AHistory of the art, Vol. P. 315

1525 النوادر ١٨٥.

1526 .Oman, Vol, I. P. 316 (بێگومان ئەم ژمارەیە زۆری خراوەتە سەرو، سەرچاوە عەرەبییەکانیش باسی ژمارەی کوژراوەکان ناکەن).

1527 الکامل، ٧٠/١٢.

1528 النوادر، ١٨٤. الفتح القسي، ٥٤٤ ـ ٥٤٥. الکامل ٧٠/١٢. الروضتین ١٩١/٢. مفرج الکروب ٣٩٦٨/٢.

1529 هارولد لامب، شعلة الاسلام، ٢٣٦. .Oman, Vol. I. P. 317

1530 رنسیمان، ١١١/٣. د. العریني، الشرق الاوسط ٩٦٥/١.

**٣- وێرانکردنی عەسقەلان:**

**پاش تێکشکاندنی سوپای سەلاحەددین لە ئەرسوف، ریشارد، ئنجا بەرەو یافا ملی ناو یافای بەبێ شەڕو بەرگری داگیر کرد "چونکە موسڵمان لەم شارەدا نەبوو". تا بەرەڤانی بکەن،. وەك ابن الأثير دەڵێ..[1531] ریشارد بەگرتنی شارەکە ئیدی کەوتەوە دروستکردنەوەی قەڵاو قایمکارەکانی. هەرچی سەلاحەددینە، ئەوە، ئەو بەرەو (الرملة) ڕۆیشتو بە گەیشتنی دەستبەجێ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی جەنگی سازداو کەوتە ڕاوێژو تەگبیرو لێی پرسین چ بکا باشە. میر (علم الدين سلێمان بن جندر) وەڵامی دایەوە کە عەسقەلان چۆڵ بکرێ و وێران بکرێ باشترە،[1532] چونکە دوژمن دوای (عکا)و (یافا) بە تەمای عەسقەلانەو پاش عەسقەلانیش ئنجا نۆرە دێتە سەر قودس. ریشارد، خۆی لە یافایەو یافاش کەوتووەتە نێوان قودس و عەسقەلانەوەو ئێمەش هەردوو شارەکەمان پێکەوە بۆ ناپارێزرێ.[1533]**

**ئەم جۆرە بیروبۆچوونەی چووبووە مێشکی هەندێ لە میرەکانی سەلاحەددینەوە، نیشانەی ئەوەیە کە بە تەواوی ترسی خاچدروشمانیان لێ نیشتبوو، پاشانیش باری دەروونیشیان کزبووبوو، ئەومیرانەی داوای وێرانکردنی عەسقەلانیان دەکرد دەیانگوت، عەسقلان مەگەر بە سی هەزار جەنگاوەر،[1534] یان بە بیست هەزار[1535] جەنگاوەر، ئنجا بتوانین بەرگری تێدا بکەین، بە سەلاحەددینیشیان گوت: خۆت بەچاوی خۆت دیت دوێنێ چیمان بەسەر هات. خۆ ئەگەر فەرەنگ بێتە سەر عەسقەلانو ئێمەش بەرەنگاریان ببینەوە، ئەوە، بێ گومان ئەوانیش لێمان دەدەنو پێمان چۆڵ دەکەنو دێنە ناوی، جا ئەگەر وای لێ بێ، ئەوە لەو بارەدا بە دەردەکەی شاری (عکا)مان دەبەنو هەمان پەتپەتیمان بەسەر دەهێننەوەو تێدادەچین. دوژمن بە داگیرکردنی شاری (عکا)و بردنی ئەو هەموو چەکو جبەخانەیەمان، تەواوێ خۆی بەهێزکردووەو ئێمەش بەو هەموو زیانەی لە (عکا) لێمانکەوت، تەواوێ بێ هێزبووین و وەکو جاران نەماوین. زۆریشی پێ ناچێت تازەی دەکەینەوە.[1536] سەلاحەددین ئەم ڕایەی ڕەت کردەوەو داوای لە چەند میرێکی خۆی کرد بچنە عەسقەلانەوەو بەرەڤانیی تێدا ڕێك بخەن، بەڵام میرەکان بە قسەیان نەکردو بگرە بە تووڕەییش وەڵامیان دایەوە. کە پێشتر بەو توندییە قسەیان لەڕوویدا نەکردبوو. وا لە ئێستا بەدواوە لێیان دەردەکەوێ. (العماد)و (ابن الأثير) دەگێڕنەوە، دەڵێن: میرەکان پێیان گوتووە، ئەگەر دەتەوێ شارەکە بپارێزی، فەرموو خۆیشت لەگەڵماندا وەرە، یان کوڕێکی گەورەت لە تەکماندا بنێرە، دەنا کەسمان ناچێتە ناو شار، تا وەك خەڵکی شاری (عکا) نائومێد نەبین.[1537]**

**سەلاحەددین میرەکانی پێ قایل نەکرا، لەبەر ئەوە، خەمو پەژارەیەکی زۆر دایگرتو شەویش تا بەیانی پێوەی تلایەوە. (ابن شداد) دەڵێ: "ئەو شەوە هەر دەتلایەوە، خەو نەچووە چاوی، تاریكو ڕوونێ بانگی کردم، چوومە لای، (الملك الافضل)ی کوڕیشی بانگ کردو پرسو ڕای پێ کرد..". پاشان گوتی: "سوێند بێ بە خودا، هەموو منداڵەکانم لە دەست بچێ، پێم خۆشترە لەوەی تەنیا یەك بەرد لە عەسقەلان بترازێنم، بەڵام ئەگەر خودا ئەوەی نووسیبێ و بۆ پاراستنی بەرژەوەندی موسڵمانانی بە چاك زانیبێ، ئەوا دەسەڵاتم نییەو هیچم بۆ ناکرێ".[1538]**

**پاشان، ناچاربوو، هاتەوە سەر ڕای میرەکانی و بە وێرانکردنی عەسقەلان قایل بوو. ئەوجا فەرمانی دا بەسەرگەورەی شارەکە دەست بکات بە ڕماندنی. والی (سەرگەورە)ی عەسقەلان لە بەرەبەیانی ١٩ی شەعبانی (٥٨٧ك ١٢ی ئەیلولی ١١٩١ز)دا، پاچو پێمەڕی لێ خستە کارو خەڵکەکەی لێ خڕ کردەوەو شوورەی شارەکەی بەسەریاندا دابەش کردو هەر**

---

1531 (هەمان سەرچاوەو هەمان دوو لاپەڕەکە).

1532 الكامل، ٧٠/١٢. النوادر ١٨٦. الروضتين، ١٩٢/٢. شفاء القلوب، ١٧٢.

1533 الفتح القسي، ٥٥٠. الروضتين، ١٩١/٢. مفرج الكروب، ٣٦٩/٢.

1534 (هەمان سەرچاوەگەلو هەمان لاپەڕەی پێشتر). مرآة الزمان، ٤١٠/٨.

1535 الروضتين، ١٩٣/٢.

1536 الفتح القسي، ٥٥٠.

1537 الفتح القسي، ٥٥٠. الكامل، ٧١/١٢. الروضتين، ١٩٢/٢. شفاء القلوب، ١٧٢.

1538 النوادر، ١٨٦. مرآة الزمان ٤١٠/٨. الروضتين ١٩٢/٢. مفرج الكروب ٣٦٩/٢. وفيات الأعيان ١٩٨/٧. النجوم الزاهرة، ٤٦/٦.

میرو تایەفەیەك، بەشێ لە شوورەکەی بەرەو ڕووکردنەوەو خۆی و کوڕەکەشی، تێهەڵچوون و کەوتنە کاولکردنی شارەکە. ئەوجا ناردیە لای (العادل)ی برای، لە شارۆچکەی (یبنی)ی نزیك بە (الرملة)و یافا، داوای لێ کرد کە: "خاچدروشمان تەفرە بداو لە تەکیاندا درێژە بە وتووێژی پێکهاتن بدا، تا ئێمە لێرەوە شارەکە کاول دەکەین". [1539].

خەڵکی بەم ئیشەی کە دەیکەن گەلێکیان پێ ناخۆش بوو، دەنگە دەنگ و گریانیان تێ کەوت، چونکە عەسقەلانیان لەلا خۆشەویست بوو، شارێکی دڵگیرو جوان بوو، شوورەکانی قایم بوون و شارێك بوو، خەڵك حەزیان دەکرد تێیدا بژین و، هەند ڕازاوەو جوان بوو، پێیان دەگوت (بوکی شام). [1540]

دوای وێرانکردنی، ئنجا ئاگریان تێبەرداو خەڵکەکەی میسرو شام دەربەدەر بوون [1541]. ئەم ڕووخاندن و سووتاندنە تا بەرایی ڕەمەزانی ٥٨٧ك کۆتایی ئەیلولی ١١٩١ز، درێژەی کێشا. [1542] سوپا لە وێرانکردنی عەسقەلان بووەوە نەبووەوە، یەکسەر ڕۆیشت بۆ (یبنی) کە بارەگای (العادل)ی لێ بوو، پاشان چوو بۆ (الرملة). [1543]

هەرچی ڕیشاردە، ئەوە، ئەو بە قایمکردنی یافاوە سەرگەرم بوو و مەترسیی هێرشی سەر (بیت المقدس)ی نەگرتە بەر، چونکە لەوە دەترسا کە ئەگەر بچێتە ئەو شارە، ڕەنگە سوپای سەلاحەددین پشتی لێ بگرێ و ڕێگای بەرەو دەریای نەمێنێ. ئاقڵ و دانا ئەوەبوو، یافا قایم بکاو بە تەواوەتی لێی دڵنیابێ، بەر لەوەی مل لە ڕێگای نەهات بنێ، چونکە ئەگەر بێت و خاچدروشمان (بیت المقدس) بگرن و پاشان بە ناچاری بەجێی بهێڵن، ئەوە بۆیان دەبێتە نەنگی و ناوبانگیان دەشکێ و [1544]. کوردی خۆمان گوتەنی. دەبێتە (سوار بوون عەیبێك و دابەزین دوو عەیب).

لەگەڵ ئەوەشدا، چاوەڕوانی و بە پشتاخستن درێژە کێشا، لەبەر ئەوە سەلاحەددین دەرفەتی بۆ ڕەخسا ئامرازو پێداویست بۆ قایم کردنی ئەم شارە پیرۆزە دەستەبەر بکاو تەگبیری پاراستن و بەرەڤانیکردن ساز بدا. لە کاتێکدا کە خاچدروشمان، سەرگەرمی خۆشگوزەرانی و ڕابواردن بوون لە یافا، سەلاحەددین لەولاوە، لە قودس، ڕیزەکانی سوپاکەی ڕێك دەخست و خۆی بۆ کایەیەکی دی ئامادە دەکرد.

هەندەی سەلاحەددین کاولکردنی شاری عەسقەلانی بە گرنگ گرتبوو، هەندەش ڕیشارد ئاوەدانکردن و قایمکردنی شاری یافای بەلاوە گرنگ بوو، چونکە ئەم فەرماندارە خاچدروشمە لێی عایەن بوو، کە ئەگەر لە یافادا پێی دانەکوتێ و قایمی نەکا، ئەوا (بیت المقدس)ی بۆ ناگیرێ.

**٤ـ تەگبیری پاراستنی قودس:**

سەلاحەددین دواکەوت، لە کۆتایی (ذي القعدة)ی (٥٨٧ك)دا گەڕایەوە بۆ قودس، بەڵام (الملك العادل)ی نارد، تا سەیرێکی بارودۆخی شارەکە بکات و لە ئاوەدانبوون و دامەزراوەکانی دڵنیابێ. [1545] سەلاحەددین وای پێ چاکتربوو، لەو جێگایانەی کە سوپا وێرانی کردبوون، ئۆردوگا دابنێ، واتا لە نزیك (الرملة)وە. مەبەستیشی ئەوەبوو، لە دوژمنەوە نزیك بێ و لە قودسیشەوە نزیك بێ، تا ئەگەر دوژمن ویستی هێرش بکاتە سەر قودس، ئەوبەری لێ بگرێ و لە مەیدانێکی بەرفراواندا بەگژیدا بچێ.

لە (٦)ی شەووالدا، سەلاحەددین "لەگەڵ میرگەل و دەستەودایەرەی میرەکانی دەوڵەتەکەیدا کۆبووەوەو کەوتە پرس و ڕا کە ئەگەر دوژمن بۆیان هات چی بکەن. چونکە هەواڵی ئەوە هەبوو کە دوژمن دەیەوێ بێتە سەریان. هەموویان ڕایان

---

1539 النوادر، ١٨٨.

1540 معجم البلدان، ١٢٢/٤. آثار البلاد، ص ٢٢٢.

1541 النوادر، ١٨٧. النجوم الزهرة، ٤٦/٦.

1542 النوادر، ١٨٨. السلوك ١٠٦/١. وفيات الاعيان ١٨٩/٧.

1543 النوادر، ١٨٩. الروضتين ١٩٢/٢. مفرج الكروب ٣٧٠/٢.

1544 Kerr, the Crusades designed, P. 55

1545 النوادر، ص ١٩٢.

وابوو که له جێگای خۆیان بمێنن، ئەگەر فەرەنگ هاتە سەریان ئەمانیش لێی ڕاپەڕن و ڕێگایان نەدەن"[١٥٤٦].

لەو کاتەدا، دوو خاچپەرەستی. سەر بە سەلاحەددین. هاتنە ئۆردوگاکەی پێیانگوت کە دوژمن بەنیازە دوو سبەی بۆیان وەدەرکەوێ، پاشان موسڵمانێکی دیلیش کە لە بەندیخانە هەڵهاتبوو، ئەویش گەیشتە لای سەلاحەددین و هەمان هەواڵی بۆ هێنا. ئەوجا سەلاحەددین دەستی کرد بە قایمکردنی قودس و ناردی لە هەموو لایەکەوە زەلام بێن بۆ قودس و ئیشی قایمکاریی تێدا بکەن، سوڵتانیش بەخۆی و بە کوڕەکانی و بە میرگەل و قازی و زاناو مەلایانەوە[١٥٤٧] کەوتنە ئیش کردن و لە موسڵیشەوە نزیکەی پەنجا وەستای بەردتاش هاتن و کەوتنە قایمکردنی شوورەگەل و کەندەکەی قودس[١٥٤٨].

کاتێکیش ئەم ئیشەی تەواو کرد، ئنجا فەرمانی دا، جاڕچی جاڕبدا کە سوپا خۆی ئامادە بکات. بەم جۆرە ئاڵاکانیان هەڵکردو بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی دوژمن حازربوون. لەم کاتە ناسکەدا، ناودارترینی فەرمانداره‌کانی سەلاحەددین (تقي الدين عمر) لەناوچەی جزیرێ کۆچی دوایی کردو سوپا کۆستی کەوت و سوڵتانیش گەلێکی پێ ناخۆش بوو، بەڵام لای سوپا دەنگی نەکرد تا کەس پێی نەزانێ و بەرگوێی دوژمن نەکەوێ. لەو تەنگانەیەو وەختە ناسکەدا[١٥٤٩]. هەر لەو ڕۆژەدا، کە ئەکاتە ١٩ی ڕەمەزانی ٥٨٧ك پایزی ١١٩١ز، فەرمانداری ئازاو نەترس میر (حسام الدين محمد بن عمر بن لاجين)ی خوارزای (خوشکەزای) سەلاحەددینیش بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد[١٥٥٠].

لەوانەیە هەواڵی ئەم خۆئامادەکردنەی سوپای ئەییوبییە بەرگوێی ڕیشارد کەوتبێ، لەبەر ئەوە نەیدەویست لەگەڵیدا بێتە نەبەرد. جگە لەوەش ئەم مەلیکە لەسەر دانوستاندن پێی دادەگرت و مکوڕبوو لەسەر وتووێژ، نەك شەڕ. ڕووداوەکانی پاشتریش هەر وای دەردەخست و بە داهاتنی زستانی ٥٨٧ك/ ١١٩١ز، هەردوولا وەستانەوە، ئیدی شەڕ لە نێوانیاندا ڕووی نەدا. کاتێکیش باران زۆری هێنا، سەلاحەددین چوو بۆ قودس و خاچپەرستمانیش گەڕانەوە بۆ یافاو بەشێکیشیان بۆ شاری (عکا). بەڵام ڕیشارد هەمیشە زەلامی بەڕێوەبوو بۆ لای سەلاحەددین و دنەی دەدا بۆ پێکهاتنەوەو ئاشتی، وەلێ سەلاحەددین زۆر بە تەنگەوە نەبوو و حەزی لە پێکهاتنەوە نەدەکرد، تەنیا لەبەر ئەوە نەبێ کە دەیویست ئەو زستانە سەختە بەسەر بەرێ، نەخاسمە میرگەل و لەشکرەکانیان گەڕابوونەوە بۆ وڵاتی خۆیان، تا سەرماکە بەسەر دەچێ، لەبەر ئەوە. جارێکی دیکەش. داوای لە (الملك العادل) کرد کە ڕیشارد تەفرە بدا، تا لەشکرەکان دەگەڕێنەوە، ئەوەبوو (الملك العادل) لە بەرایی (ربيع الاول)ی (٥٨٨ك/ ئاداری ١١٩٢ز) دا قودسی بەجێ هێشت[١٥٥١]، بەڵام دانوستاندنەکە سەری نەگرت. ئەوجا چەند کۆمەڵێ لە خاچپەرستمان دەرفەتیان هێناو هەندێ شارۆچکەو قەڵای کەم هێزو لاوازیان داگیر کرد، بە نموونە چوونە ناو عەسقەلانەوەو ڕیشارد دووبارە ئاوەدانی کردەوەو[١٥٥٢] کردی بە قەڵایەکی قایمکاری ئەوتۆ، لە هەموو کەناراوەکانی فەلەستینیدا قەڵای قایمی وەهای لێ نەبوو.[١٥٥٣]

خاچپەرستمان، پاشان قایمکاری (الداروم)یان گرت کە پێشتر سەلاحەددین وێرانی کردبوو، ڕیشارد کە چووە ناوی، بەرەڤانیکارانی لە ناوبرد.[١٥٥٤] جگە لەمانە لە کەناراوەکانی فەلەستین جێگەو پێگەی بچووکی دیکەشیان داگیرکرد.

---

1546 النوادر، ص ١٩٦ ـ ١٩٧.

1547 الفتح القسي، ٥٦٥. مفرج الكروب ٣٧٥/٢. الروضتين ١٩٤/٢.

1548 الكامل، ٧٤/١٢. الفتح القسي ٥٧٩. الروضتين ١٩٤/٢. مفرج الكروب ٣٧٥/٢.

1549 النوادر، ١٩٨. الفتح القسي، ٥٦٦. الروضتين ١٩٤/٢. مفرج الكروب، ٣٧٥/٢.

1550 النوادر، ١٩٣. الفتح القسي، ٥٧١، الروضتين، ١٩٥/٢.

1551 النوادر ٢٠٥.

1552 الكامل ٧٨/١٢.

1553 رنسيمان ١٢٠/٣.

1554 النوادر ٢١٠. الروضتين ١٩٦/٢.

**٥- خۆخرِکردنەوەی ریشارد بۆ داگیرکردنی قودس :**

لە بەرەبەیانێکی (جمادی الآخرة)ی ٥٨٨ك/ حوزەیرانی (١١٩٢ز)دا، ریشارد رێگای لە کاروانێکی گەورە گرت کە لە میسرەوە دەهاتن، باروبارخانەیەکی زۆریان پێ بوو. تاقمێ لە سارانشینانی (النقب) کە (ابن شداد) بە (عارەبی گەندەڵ)[1555] ناویان دەبا، ئەوانە بوو بوون بە (جاش)ی ریشاردو سیخوڕی خاچدروشمان، هەواڵی هاتنی کاروانەکەیان گەیاندە ریشاردو وە پێش خاچدروشمان کەوتن تا بردیاننە سەر کاروانەکە. جەنگاوەرانی کاروانەکە، ناچار هەڵاتنو هەموو شمەکەکانیان بە جێ هێشتو ئەوەی نەکوژرا لەو بیابانەدا وێڵ بوو. وەك (ابن شداد) دەڵێ: بەختیاریان ئەوەبوو، کە بە سەر سەلامەتی دەرباز بوو. ئەم رووداوە کارێکی خراپی لە سوپای سەلاحەددین کرد، چونکە ئومێدێکیان بەو کاروانە بوو شمەکیان بۆ بهێنێ.

ئەم مێژوونووسەو مێژوونووسانی دیکەش، ئەم بۆسەو بەسەردادانە بە "شەڕی بێ ئابڕوویی" ناودەبەن کە "ئیسلام زۆر دەمانێك بوو لێقەومانی وەهای بەسەردا نەهاتبوو".[1556] ئەوەشیان گوت کە "فەرەنگ پشتی وایان بۆ پەیدا بووە لە کۆڵیان دەگرێو راستیشیان دەکاتەوە، پارەو دارایی واشیان بۆ رەخساوە لە خۆیان بایی بکاو گاڵیشیان بدا، ئیدی لەمەودوا بە چ لەشکرێكو بە چ چەكو جبەخانەیێ جەنگیان لەگەڵدا بکەین".[1557] بەڕاستی، سوڵتان بەم رووداوە گەلێ دڵتەنگ بوو، چونکە "بە درێژایی ژیانی هەواڵی گورچکبڕی وەهای نەبیستبوو، خەبەری هەند قێزەونی پێ نەدرابوو". (ابن شداد)یش هەر دڵی دەدایەوەو دەیویست بیهێنێتەوە سەرخۆ، بەلام بێ هودە بوو.[1558]"بەلام خاچدروشمان ئەم رووداوەیان زۆر پێخۆش بوو، بەسەرکەوتنیان لەم پیلانەداو بە دەستکەوتنی ئەو هەموو شمەكو حوشترو چەكو ئازووقەو خاروبارە، ئیدی ورەیان بەرزتر بووەوەو زیاتر ددانیان لە قودس تیژکرد".[1559]

ئنجا سەلاحەددین شوورەکانی قودسی بەسەر میرەکاندا دابەشکردو ئامێرو ئامرازی گەمارۆی بۆیان دابین کرد. هەستا ئاوەکانی دەوروپشتی شارەکەشی پڕ زەهر کردو تانکیو بیرو حەوزەکانیشی تێکدا، بە جۆرێ کە ئیدی لە دەوروبەری قودس شتێك نەما بخورێتەوە، بەو جۆرە دوژمن ئەگەر بیەوێ هێرش بکاتە سەر شاری قودس، بەدەردەکەی (حطین) دەچنو لە تینوانا کوێر دەبن، نەخاسمە خاکی قودسیش هەمووی رەقەنو تەقتەقە، بەردەو بیر لێدانی زۆر زەحمەتە.[1560] پاشان ناردی لە دووی لەشکرگەلو هێزەکانی، تابێن بەرەڤانی لە قودس رێك بخەن. (الملك الأفضل) بە خۆیو لەشکرەکانی لای رۆژهەلاتەوە گەیشتە قودس. (بدرالدين دلدرم الياروقي)ش پێشتر لەگەڵ تاقمێ تورکماندا زووتر هاتبوون، ئەمان بەر لە هەموو کەسێ هاتبوون، پاش ئەمانیش (عزالدين ابن المقدم) بە دوویاندا هات.[1561]

لەو فەرماندارانەی لەگەڵ سوڵتاندا، لە قودس بوون، (الملك الظافر)ی کوڕیو میر (أبوالهيجاء الهذباني – السمين –)و (بهاءالدين قراقوش)و (سيف الدين المشطوب) کە تازە لە بەندیخانەی (عکا) دەرچووبوو، لە بەرایی (جمادی الآخرة)ی هەمان ساڵدا گەیشتە قودس، ئەمانە بوون.

میر (شێرکۆ بن باخل)یش کە لە بەندیخانەی (عکا) بەشێوەیەکی سەیرو سەرسامهێنو بەیاریدەی میری دیل (ابن باریك) هەڵاتبوو، ئەویش گەیشتبووە قودس.[1562]

سەلاحەددین ئەو میرانەو کەسانی دیکەشی بانگ کرد بۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی جەنگەکەی، تا پرسو رایان

---

1555 انوادر ١١٣. الروضتين ١٩٨/٢. مفرج الكروب ٣٨٣/٢.

1556 النوادر، ٢١٤. مرآة الزمان، ٤١٥/٨. الروضتين، ١٩٨/٢. مفرج الكروب، ٣٨٤/٢. شفاء القلوب، ١٧٤.

1557 الفتح القسي، ٥٩٤.

1558 النوادر، ٢١٥.

1559 النوادر، ٢١٥. مرآة الزمان، ٤١٦/٨. الروضتين، ١٩٨/٢. مفرج الكروب، ٣٨٥/٢.

1560 النوادر، ٢١٥. الروضتين، ١٩٨/٢. مفرج الكروب، ٣٨٤/٢.

1561 النوادر، ص٢١١.

1562 النوادر، ١٩٤. مخرج الكروب، ٣٧٣/٢.

لەگەڵدا بکا بۆ مەسەلەی پاراستنی قودس. ئەوەبوو هەموویان لە ئەنجومەنەکە ئامادەبوون، لەسەر هەمووشیانەوە، میر (أبو الهیجاء السمین) بوو کە زۆر بە زەحمەت گەیشتبووە قودس و سەلاحەددین لەسەر کورسییەکەی بەرامبەر بە خۆی دایناو، داواشی لە قازی (ابن شداد) کرد کە کۆبوونەوەکە بکاتەوە، ئەمیش پێشەکی باسی سوودو چاکەی غەزای کردو داوای لێ کردن، چاو لە پێغەمبەر ﷺ بکەن، هەموویان بە قسەکانی خۆشحاڵ بوون. پاشان بێدەنگییەك دایگرتن، هەر دەتگوت خۆڵی مردوویان بەسەردا کراوە. پاش نەختێ، ئنجا سەلاحەددین دەستی بەقسان کردو لە هەندێکیدا گوتی: "خوێن‌و سەرو ماڵ‌و منداڵی موسڵمانان لەسەر ویژدانی ئێوە وەستاوە، ئەم دوژمنەش ئێوە بۆی نەیەنە مەیدان، هیچ موسڵمانێکی دی بۆی نایەتە مەیدان، ئەگەر لێیان بپرنگێنەوە، ئەوە وڵاتەکەتان بەلوولدان لوول دەدەن، ئەوەش دەکەوێتە ئەستۆی ئێوە، نەخێر، ئەگەر ئێوە بەرەنگاریان ببنەوە، ئەوە موسوڵمانان بەگشتی پشتتان بەرنادەن، وەسسەلام".[1563] ئنجا میر (سیف الدین المشطوب) وەڵامی دایەوە، گوتی: "گەورەم، ئێمە موڵکی تۆین‌و بەندەی تۆین، هەر تۆش چاکەت بەسەرمانەوە هەیە، تۆ بەخێوت کردین‌و تۆ گەورەت کردین‌و تۆ دەوڵەمەندت کردووین، فەرموو ئەوە سەرو ملیشمان دەخەینە بەر دەستت، بەخودا قەسەم کەسمان پشتت بەرنادەین تا دەمرین".

هەموو ئامادەبووانیش ڕەزامەندییان بەم قسەیە پیشانداو سوڵتانیش گەلێکی پێ شادبوو. بەڵام میرەکان.. وەك (أبو الهیجاء) هەواڵ دەدا. هەر زوو بۆ سبەینێ پەشیمان بوونەوەو ڕایانگەیاند کەوا ئەو هەڵەیە ناکەن، بچنە قودس‌و لە ناو ئەو شارەدا گیر بخۆن‌و بەدەردەکەی خەڵکی شاری (عکا) بچن، وای بە باش دەزانن شەڕەکە بخەنە دەرەوەی شوورەکانی قودس، گوتیشیان: "ئەگەر خودا سەرمانبخا بەسەریاندا، ئەوە باقیمەنی شارەکانی دیکەشیان لێ دەسێنین، دەنا سوپاشمان خۆی بە دەستەوە دەداو قودسیشمان لە دەست دەچێ".[1564]

سەلاحەددین بەم وەڵامەیان قایل نەبوو، چونکە "مەسەلەی قودس، بەلای ئەوەوە، مەسەلەیەکی گەورەیەو چیا بۆی هەڵناگیرێ". میرەکان بە تووڕەیی‌و بە وشکی وەڵامیان دایەوە. وەکو باسمان کرد. لەسەر ئەو جۆرە وەڵامە ڕاهاتبوون‌و شەرمی سوڵتانیان لەلا نەمابوو. وا دیارە لە ناو لەشکرو سەربازو میرەکانیدا دووبەرەکی‌و ململانێی نێوان کوردو تورکمان سەری هەڵدابوو. ئەو ململانێیەش بە قسەکانیاندا دەردەکەوێ کە پێیانگوت: "تۆ ئەگەر ئێمەت دەوێ فەرموو وەرە. ناو قودس. لەگەڵمانا، ئەگەر خۆیشت نایەیت، با هەندێ لە منداڵ‌و خزمت، بێن لە تەکماندا بن‌و ئێمەش لە دەوری خڕ ببینەوە، دەنا ئەگەر وەها نەکەیت، نە کورد بە قسەی تورکمان دەکاو نە تورکمانیش بە قسەی کورد دەکا".[1565]

ڕاستیشت دەوێ، سەلاحەددین کەوتبووە دۆخێکی نالەبارەوە. (ابن شداد) هەستی بەم نیگەرانیی‌و هەناسە ساردییەی سەلاحەددین کردبوو، بۆیە پێی گوت: بیدەرە دەست خواو خەم مەخۆو داوای هێزو وره لە خوا بکەو دەردی دڵی خۆت لای خوا بدرکێنە، بەڵکو خوا دوعات قبوڵ بکا. ئەم مێژوونووسە، بە چاوی خۆی سەلاحەددینی دیت "لەسەر بەرماڵەکەی نوێژی دەکردو خوڕ خوڕ فرمێسك لە چاوەکانییەوە دەکەوتە سەر بەرماڵەکەی لە کاتی کڕنووش بردندا"، ئەو ڕۆژی هەینییە لەبەر دڵگرانە، تێپەڕی. پاشان زەلامەکانی هەواڵگری هاتنە لایو پێیانگوت کە خاچپەرستان هێرشی بەرەو قودسیان وەستاند.

(ابن شداد) دەڵێ، ڕیشارد، داوای لە خاچپەرستە کۆنەکان (فەرەنگە شامییەکان) کرد کە نەخشەی باری شاری قودس‌و ئەو قایمکارییانەشی بۆ بکێشن کە سەلاحەددین بە دەوری شارەکەدا کردوویەتی. ئەوانیش نەخشەکەیان بۆ کێشا، کاتێ ڕیشارد سەرنجی نەخشەکەی دا، گوتی: تا سەلاحەددین مابێ، ئێمە ناتوانین گەمارۆی شاری قوس بدەین، نەخاسمە موسڵمانانیش یەك دەنگ بن.[1566] لەسەر ئەمە، خاچپەرستان، بوون بە دوو ڕا، ڕایەکیان داوای

---

[1563] النوادر، ٢١٦. الروضتين ٢/١٩٨. مرآة الزمان، ٨/٤١٦. مفرج الكروب، ٢/٣٨٦.

[1564] النوادر، ٢١٧. الروضتين ٢/١٩٩. مرآة الزمان ٨/٤١٦. مفرج الكروب ٢/٣٨٧.

[1565] النوادر، ٢١٧. الروضتين ٢/١٩٩. مفرج الكروب ٢/٣٨٨.

[1566] الكامل، ١٢/٧٥.

هێرشیان بۆ سەر قودس دەکردو، ڕای دووەم داوای وەستاندنیان دەکرد، کە ڕیشاردیش لەگەڵ ڕای دووەم بوو. وەڵێ فەڕەنسەکان لەگەڵ ڕای یەکەم بوون، گوتیان: "ئێمە لەبەر خاتری قودس وڵاتی خۆمان جێ هێشتووە.. تا قودس نەگرین ناگەڕێینەوە". ڕیشارد وەڵامی دانەوە، گوتی: "ئەم شوێنی ئاوەکەی پیس کراوەو لە بنەڕەتیشەوە ئاو لە دەوروبەریدا نەماوە، لە کوێ ئاو بخۆینەوە؟ گوتیان: ئاو لە (نقوع) دێنین."[١٥٦٧] ئەم گوندە تەنیا قۆناغێ ڕێگە لە قودسەوە دوورە، ئێمەش دەست بە ئاوەوە دەگرین‌و ڕۆژی یەك جار ئاو دەخۆینەوە.[١٥٦٨] خاچدروشمان بۆ ئەم کێشەیە کەوتنە دەنگ وەرگرتن‌و دەنگی زۆرینەیان لەسەر ئەوەبوو، هێرش بوەستێ‌و نەکرێ، ئەوجا ڕوویانکردە (الرملة)و[١٥٦٩] لێیاندلو ڕۆیشتن‌و سەلاحەددینیش گەلێ خۆشحاڵ بوو.

وادیارە نە فەرمانداری خاچدروشمان‌و نە سەلاحەددینیش، بە تەواوی نەیاندەزانی لە لەشکرگاو ئۆردوگاکانیان چی ڕوویداوە. وا پێدەچێ خاچدروشمان هێزی بەڕەڤانیکاری موسڵمانیان بەهەڵە قەرساندبێ‌و زۆر بە پترو ترسناکتریان لە قەڵەم دابێ، سەلاحەددینیش ئەو شپرزەییەی لە زیادەبووبێ، چونکە خاچدروشمانیش هەند بەهێزنەبوون، کە سەلاحەددین ئەو هەموو ترسەی لێ بنیشێ. هیچ گومانی تێدا نییە، گەر سەلاحەددین زانیبای هێزی خاچدروشمان دووڕاو دووبەرەکی تێدا پەیدابووەو، فەڕەنسی‌و ئینگلیزەکان هەریەکە لە ئاوازێ لێدەدەن، هەند دڵتەنگ نەدەبوو. هەر ئەو دوو بەرەکییەی ناو خاچدروشمان بوو، کە بوو بەهۆی وەستاندنی هێرش بۆ سەر قودس.[١٥٧٠]

**٦ـ گەمارۆ نەهاتەکەی شاری یافا :**

گەمارۆی یافاو ئەنجامەکانی ئەم گەمارۆیە، دوایین کوشتاری گەورەی نێوان خاچدروشمان‌و ئەییوبییان بوو. وەکو باسیشمان کرد، ڕیشارد، ئەم شارەی لەبەر باغ‌و بێستان‌و میوەی زۆرو ئاوو هەوای خۆش‌و سازگارەکەی، کردبووی بە بنکەی سەربازی‌و هەر دوای سەرکەوتنەکەی شەڕی ئەرسوّف لەگەڵ سەلاحەددیندا، ئیدی یافای لەبەر نزیکی لە قودسەوە، کرد بە ئۆردوگای سوپاکەی.

سەلاحەددین‌و میرەکانی دەرفەتیان بۆ ڕەخسا، ئەوەبوو ڕیشارد دووربوو، لە (عکا) بوو، دەشیەویست شاری بەیرووت داگیر بکات.[١٥٧١] لەم هەلەدا سەلاحەددین بەنیازبوو هێرشێ بۆ گرتنی یافا سەروبەر بنێ. دووریش نییە ویستبێتی دوو نیشان بە بەردێ بشکێنێ. ئەو دەیویست، لەو هەلەدا کە ڕیشارد لە یافا نەبوو، یافا بگرێ، ئەمە خوایە سەرکەوتنێ بەدەست بێنێ، دوای ئەو هەموو بەزین‌و تێکشکانەی کە بەسەر لەشکرەکانی هات، بە ئومێدی ئەوەی، ورەو بەرگی بڕوابەخۆیی بکاتەوە بە بەر سەربازەکانیدا،[١٥٧٢] کە دەمێك بوو بە چاوەکەی جارانیان سەیری سەلاحەددینیان نەدەکرد. دووریش نییە ویستبێتی کارێکی ئەوتۆ بکا، ڕیشارد واز لە بەیرووت بێنێ‌و نەچێ.

سەلاحەددین دەستی کرد بە تەیارو ئامادەکردنی سوپاو ڕێکخستنی پەل‌و لقەکانی‌و (الملك الظاهر)ی کوڕی کە خاوەن‌و سەرگەورەی حەڵەب بوو، کرد بە فەرمانداری قۆڵی ڕاستو (الملك العادل)ی برایشی کرد بە فەرماندەی قۆڵی چەپ‌و خۆیشی فەرماندەی بەرسنگ‌و ناوجەرگەی سوپاکەی گرتە دەست. لە پاشکۆی سوپاکەشەوە، ئازووقەو جبەخانەو ئامرازو ئامێرگەلی گەمارۆی بارکردو لە بەیانی ڕۆژی (١٥)ی ڕەجەبی ٥٨٨ك/ ٢٦ی تەممووزی (١١٩٢ز)دا، بەرەو یافا کەوتەڕێ‌و زۆری نەبرد گەیشتنە شوورەکانی‌و لەسەر جێگا چرووکەکانی مەنجەنیقیان لێ دامەزراند.

ئەییوبییان، بۆ سبەینێ بەیانی بەرەو شارەکە کشان‌و دیوارسمان دەستیان کرد بە سمین‌و کونکردنی شورەکانی

---

[1567] نقوع: گوندێکە لە گوندەکانی قودس. معجم البلدان.

[1568] النوادر، ٢١٧ ـ ٢١٨. الروضتین ١٩٩/٢. مفرج الکروب ٣٩٠/٢.

[1569] النوادر، ٢١٨. مراة الزمان، ٤١٧/٨. الروضتین، ١٩٩/٢. مفرج الکروب، ٣٩١/٢. البدایة والنهایة، ٣٤٩/١٢. شفاء القلوب، ١٧٥.

[1570] Grousset, Vol, 111, p. 109.

[1571] الفتح القسي، ٥٩٨. النوادر، ٣٢٢. الروضتین ٢٠٠/٢. مفرج الکروب، ٣٩٣/٢.

[1572] النوادر، ٢٢٥.

لای باکووری شارەکەو کەلێنێکیان تیَ خست. سمین و کونکردن و دامەزراندنی مەنجەنیق، شەویش هەر بەردەوام بوو، تا چوونە ناو شارەکەوە. ڕاستیشت دەویَ، ئەمە یەکەم شەڕبوو کە بکەوێتە شەوو درێژە بکێشیَ، "تا یەك لە سێی شەوگار ڕادەبووریَ".[1573]

بە ڕاستیش، جەنگاوەرانی بەرگری و بەرەڤانیانی ناو شارەکە، قارەمانانە دەجەنگان و شارەکە خۆیان دەپاراست، ئەم بەرگرییە بەتینە کاری لە دڵ و دەروونی موسڵمانان کردو ورەی سوپای سەلاحەددینی کز کردو هێرشبەرانی ساردکردەوەو زەینی (ابن شداد)ی مێژوونووسی. کە لەم شەڕەدا بەشدار بوو. بەلای خۆیدا کێش کردو سەرسامی کرد.

بەڵیَ، سەربازەکان مەنجەنیقی سێیەمیشیان لە شارەکە دابەست، بەڵام سوڵتان نەچووە دڵییەوەو دەیزانی کە ساردبوونەتەوەو ئەو گوڕوتینەیان نەماوە. ڕاستیشت دەویَ ئەم ساردی و ورەبەردانەی سەربازانی سەلاحەددین لەم دواییانەدا، لە هەندیَ شەڕدا، بە ئاشکرا دەبینراو دیاربوو، سەیرت دەکرد لە بەرایی شەڕەکەدا، گەرم و ورەبەرزبوون و بە توندی دەکەوتنە جەنگ، کەچی هەندەی پیَ نەدەچوو، سارد دەبوونەوە. سوڵتان سەلاحەددین لیَ نەگەڕا سەربازەکانی بەو حاڵەوە بمێننەوە، نەخێر "ئنجا بەزۆر بەرەو شەڕەکە وەپێشی خستن و خستنیە سەر دەستکردنەوەو پەلامار، شەڕەکە تاوی سەندو هەڵایسان و دوژمنیان بەگیر هێناو هەندەی نەمابوو شار خۆی بەدەستەوە بدات".[1574] بەڵام دوژمن توانیی هەندێکیان بەتیروکەوانی ئاسایی و بە زەردەتیر (الزنبورك) بکوژیَ و بریندار بکا، بە نمونە (الحاجب أبوبکر وختلخ)ی سەرگەورە (بعلبك) لە چاوی درابوو، (سراسنقر) دەموچاوی بریندار بوو بوو، (أياز چرکس) لەدەستی درابوو، ئەم بریندارانە هەموویان میرگەلی ناوداربوون.

خاچدروشمان دیتیان کوشتارەکە بە قازانجی خۆیان تەواو نابیَ، ناچار داوای ئاگر بەستیان کردو دوو نوێنەریان نارد، یەکێکیان لە خرستیانەکانی عەرەبیزانی شارەکە بوون. کاتیَ ئەم دوو نوێنەرە گەیشتنە لای سەلاحەددین، سەلاحەددین داوای بنکەی قودسی لیَ کردن، ئەوانیش قایل بوون، بەڵام داوایان لە سەلاحەددین کرد پەلە نەکا، تا ڕۆژی شەممەی (١٩)ی ڕەجەب کە یارمەتییان پیَ بگا. سوڵتان بۆ دووەم جاری بوو کە بەو داوایە ڕازی نەدەبوو، بەڵام ئەم دانوستاندنە موسڵمانی لەشەڕ ساردکردەوەو دووبارە ئارەزووی شەڕیان نەما، وەك (ابن شداد) دەڵیَ: "لەسەر بیَ شەڕو هەڵلایی ڕاهاتبوون و لەنگەریان گرتبوو".[1575]

بەڵام سەلاحەددین فەرمانی دا، کونەکان پڕ کەن لە سووتەنی و ئاگری پێوە بنێن، بەو جۆرە بەشێکی دیکەی شوورەکە ڕمیاو، بەرەڤانیکارانی ناوەوەش داری گەورە گەورەیان وەبەر کەلێنەکە دا، تا موسڵمانان لێوەی وەژوور نەکەون. جارێکی دیش دەبینین کابرای مێژوونووس بە ئازایەتی و قارەمانێتیی خاچدروشماندا هەڵدەڵیَ، کە چۆن خۆیان بەخت دەکەن و نایەڵن موسڵمانان لێیان وەژوورکەون. بەهەرحاڵ، کوشتار درێژەی کێشا تا تاریکایی داهات و بوو بە شەو، بەبیَ ئەوەی ئەنجامێکی لیَ کەوتبێتەوە، بەو هەموو کون و کەلەبەرانەشەوە کە موسڵمانان لە شوورەکەیان خستبوو. ئەوجا سوڵتان لەگەڵ میرەکانیدا بڕیاریاندا پێنج مەنجەنیقی تریش لە شوورەکان دابەستن و دایانهێژن و، سەربازەکانیشی نارده جێگای دوور تا لە ناو دۆڵەکانەوە خڕکە بەرد بۆ مەنجەنیقەکان بهێنن.

سوپا، بە فەرماندەیی سەلاحەددین و (الملك العادل)و (الملك الظاهر)، بە هەرسیَ باڵەکانییەوە دەستی کرد بە هێرشێکی بەتینی ڕێکوپێك و بوو بە غەڵبە غەڵب و دەنگی تەپڵی جەنگ و شەیپوری شەڕ بەرزبووەوەو مەنجەنیق کەوتە کارو دیوارسمان کەللەیان گەرمتر بوو و ئاوری کونەکانیان خۆشتر کردو بەر لە نیوەڕۆ شوورەکەیان لە ئەستوورایییەوە ڕمان و خاچدروشمان بە تەواوی ئالۆزو شپرزە بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان "بۆ کوشتن بەتین بوون و پێداگربوون، بۆ مردنیش ورە بەرزو گیان لەسەر دەست بوون و، موسوڵمانانیش لە پێداگرتن و ورەبەرزیی و کۆڵنەدەریی ئەو دوژمنە، هەر

1573 النوادر، ٢٢٣. مفرج الكروب، ٢/٣٩٤.

1574 النوادر، ٢٢٣.

1575 النوادر، ٢٢٣.

ئەوە نەبوو نەتۆقن". بەڵێ لەو دیوەوە بە نووکی ڕم کونەکانیان دەگرت و "کەلێنەکەش وەها گیرابوو کە بە چاو، هیچی لێوە نەدەبینراو دیارنەبوو".

خاچدروشمان، دووبارە دوو نوێنەرەکەیان بۆ دانوستاندن نارده لای سوڵتان. سوڵتان ڕەزامەندیی نیشانداو داوای ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکانی لێکردن، بە مەرجێ سوارە بەسوارەو تەرکەبلی بە تەرکەبلی و زەلام بە زەلام ئاڵوگۆڕ بکەن.[1576] بەڵام لە قسەی خۆی پەشیمان بووەوە کە دیتی قەومەکەی خۆی شەڕی چاك دەکەن، داوای لە سوڵتان کرد فەرمان بدا، شەڕ ڕابگرێ تا بگەڕێتەوە، ڕاوێژو پرسوڕا لەگەڵ گەورەکانی خۆیدا بکا. سەلاحەددین وەلامی دایەوە، گوتی: "ناتوانم ئەم شەڕە لە موسڵمانان قەدەغە بکەم، بەڵام تۆ بچۆ بۆ لای برادەرەکانت و پێیان بڵێ با بچنە ناو قەلاکەو واز لە خەڵك بێنن لەناو شاردا ئیشی خۆیان بکەن، ئیدی قەدەغە نەما".[1577]

کابرای شاند گەڕایەوە بۆ لای برادەرەکانی و داواکەی سوڵتانی پێگوتن، ئەوانیش چوونە قەلای شارەکەوە. پاشان خەڵك بەزۆر، چوونە ناو شارەکەوەو کەوتنە تالانکردنی قوماش و دەغڵ و ئازووقە، هەموویشی باروبارخانەی ئەو کاروانە بوو. وەك باسمان کرد. کە لە میسرەوە هات و خاچدروشمان تالانیان کرد.[1578]

بۆ سبەینێ عەسر، ڕێکەوتی بیستی ڕەجەب، زەلامێکی تەتەر لە لای. میر (قایماز النجمی)یەوە کە لەو پەڕی شارەکەوە بۆ سووسە کردنی هەواڵی ڕیشاردو ئەگەری هاتنی کۆمەکی خاچدروشمان لە (عکا)وە بۆ شارەکە. هەڵیدابوو، ئەم تەتەرە خەبەری دا کە ڕیشارد ئەم تالان و چەپاوڵەی یافای بیستووە، لەبەر ئەوە ناچێتە بەیروت و وا بایداوەتەوە، لە (عکا)وە بەرێ کەوتووە، بۆ یافا دێت.[1579]

ئیدی سوڵتان دەستبەجێ بڕیاریدا یافاش بگرێ و قەلاکەشی بگرێ "بەڵام خەڵکەکە هەند ماندوو بوون بەگوێی سوڵتانیان نەکرد، چونکە ئاسن و تینی گەرماو دووکەڵی ئاگر" وەهای پەکخستبوون، توانستی ئەوەیان نەمابوو چیدی دوژمن تەنگەتاو بکەن. بۆ سفیدەی سبەی بەیانی، دەنگی شەیپوور هاتە گوێیان، هەر زوو زانییان کۆمەك بۆ خاچدروشمان بەڕێوەیە، دەستبەجێ سوڵتان فەرمانیدا بە (ابن شداد)ی مێژوونووس بچێ بۆ لای (الملك الظاهر) تا فەرمان بەسەربازەکانی بدا بکەونە پاسەوانی کردنی دەرگای باشووری، واتا دەرگای بەرەو قیبلەی شارەکە. (ابن شداد) میر (عزالدین جوردیك، علم الدین قیصر، درباس المهرانی و شمس الدین)ی[1580] لەگەڵ خۆیدا بردن و سەرکەوتە سەر قەلاکە تا خاچدروشمانی لێ دەربکاو قەلاکەیان بەکەلوپەل و دارایی و چەکەوە لێ بستێنێ، لێ خاچدروشمان یاخی بوون و قەلاکەیان جێ نەهێشت و زانیبوویان کە ڕیشارد بەڕێوەیەو، هاکا گەیشتە هانایان، ئیدی چ پێویست دەکا لە قەلا دەربچن و بیدەنە دەست موسڵمانان. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو هێرشێکیشیان بۆ سەر موسڵمانان ڕێکخست و لە قەلاکەوە یەك دەست و یەك دەنگ، هەر هەموویان بە جارێ کەوتنە پەلامارو هەرچی سەربازی موسڵمانان هەبوو لەناو شارەکەشدا هەموویان لەشار دەرکرد. ئەوجا (ابن شداد) گەڕایەوە بۆ لای سوڵتان و هەواڵەکەی پێ گەیاند. سوڵتان دەستبەجێ جاڕچیی بانگ کرد، بەناو لەشکردا جاڕدراو تەپڵی جەنگ هاتە لێدان و هێرشیان کردە سەر شارەکەو دووبارە دوژمنیان لە قەلاکەدا گەمارۆ داو ناچاریان کردن دەخالەت بێنن و خۆیان بخەنە بەختی سەلاحەددینەوەو (بە تریکەکەو بەرپرسی) قەلاکەیان نارده لای سوڵتان و داوای لێبوردنیان کردو داواشیان کرد بنکەکە (القاعدة) دانوستاندنی لەسەر بکرێ.

---

1576 النوادر، ٢٢٤. الروضتين ٢٠١/٢. (ئەم دەقە گرنگییەکی تایبەتی هەیە، ئەوە دەردەخا کە سوپای ئەییوبیان گرووپگەلی - تەرکەبلی - یان تێدا بووە، بنۆڕە (المفرج ٣٩٥/٢)، هەرچەندیشە بەڵگەو ئاسەواری مێژوویی، ئەوە دەرناخەن کە ئەم گرووپانە لە سوپای سەلاحەددین هەبووبن، چونکە سوپای سەلاحەددین هەر هەمووی ئیسلام بووەو تەنیا (ابن شداد) ئەم قسەیەی گوتووە، نە (العماد)و نە کەسیدی ئەم ناوەیان نەهێناوە).

1577 النوادر، ص ٢٢٤.

1578 النوادر، ص ٢٢٤. الفتح القسي ٥٩٨. الكامل ٨٤/١٢. الروضتين ٢١٠/٢. مفرج الكروب ٣٩٥/٢. Lane-poole, p, 345.

1579 النوادر، ٢٢٥. الروضتين، ٢٠١/٢.

1580 النوادر، ٢٢٥. الروضتين، ٢٠١/٢. مفرج الكروب، ٣٩٦/٢.

ئەم هەلو دەرفەتە چاکە بۆ سەلاحەددین ڕەخسا، کەچی نەیکرد بۆ سوودی خۆی، بەچاکی بیقۆزێتەوەو مەسەلەکە بە تەواوی یەکلا بکاتەوەو بەهێزی چەك شەرتوشرووتی خۆی بەسەر دوژمندا بسەپێنێ‌و. چاو لە خاچدروشمان بکا. مەسەلەکە بە هەڵپەسێردراوی، بەبێ یەکلاکردنەوە مایەوەو لەوە دەچوو کە سەلاحەددین خۆیشی نەیدەزانی چیی دەوێ‌و سوپاکەی لە پێناوی چیدا شەڕدەکا! سەرەنجام ڕیشارد گەیشتەجێ‌و موسڵمانان هیچیان پێ نەبرا. ئالێرەدا، فەرق‌و جیاوازیی نێوان ئەم هەڵوێستە لەق‌و پەقە تازەیەی سوپای ئەیووبیان‌و هەڵوێستی پڕ لەتین‌و تاوی دوای (حطین)ی ئەم سوپایەمان بەڕوونی بۆ دەردەکەوێ، کە چۆن دلێرانە پەلاماریان دەداو قەڵاو قایمکارو شارگەلی دوژمنیان یەك لە دوای یەك ئازاد دەکردو دەچوونە ناوی. هەرچی ئەم ئیشە سەربازییە نەهاتەی یافایە، ئەوە ڕێك و ڕاست لەگەڵ ڕەوشی سەرەو هەڵدێری ئەم سوپایەدا دەگونجێ کە لە تێکشکانەکەی شاری (صور)ەوەو دواتریش بەسەر ئەم سوپایەدا هات.

خۆ ریشارد دەمێك بوو گەیشتبووە نزیك بەندەرەکە، بەڵام هۆی دواکەوتنەکەی ئەوەبوو، کاتێ خۆی‌و دەستەو دایەرەکەی گەیشتن، دیتیان ئالای زەردی سەلاحەددین‌و ئالای موسڵمانان بەسەر شارەکەوە دەشەکێتەوەو وەهای بۆچوون کە موسڵمانان قەڵاکەشیان گرتبێ، چونکە هاژەهاژی دەریاکە نەیدەهێشت گوێیان لە دادو هاوارو هانای خاچدروشمانی قەڵاکە بێ، ئەمەو "دەنگە دەنگ‌و هەراو تەکبیری موسڵمانانیش لەولاوە بووەستێ" خاچدروشمان لە قەڵاکەوە چاویان لێبوو، کەوا ڕیشارد پەنجا کەشتی‌و گەمیی گەیاندووەتە بەندەرەکەو لەنگەریان گرتووەو ناتوانن دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەن‌و ئەمانیش دەنگیان نایانگاتێ. لەوێ ناچار کابرایەکی خرستیان. وەکو (ابن شداد) دەڵێ، گیانی خۆی بە قوربانی مەسیح کردو لە قەڵاکەوە بازی دایە خوارەوەو کەوتە سەر لمی دەوروبەری قەڵاکەو هیچی لێ نەهات، هەر هەستایەوەو بەرەو دەریاکە ڕایکردو گەمیەك بەپەلە گەیاندییە لای ڕیشادو هەموو شتێکی تێ گەیاندو پێی گوت قەڵاکە هێشتا بەدەست خۆیانەوەیە. ڕیشارد بەهێزێکی هەشتا سوارەی زرێپۆشەوە و بە چوارسەد تیرەندازو نزیکەی دوو هەزار هێزی دەریاوانی ئیتالییەوە،[1581] خۆیان بەشاردا کردو موسڵمانانیان شکاندو ڕاویاننان.

هەرچی (ابن شداد)ە، ئەو سەیری ڕووداوەکەی دەکرد، چاوی لێبوو کە ڕیشارد چی دەکا. دەرحاڵ خۆی گەیاندە لای سوڵتان پێی گوت. سوڵتان فەرمانیدا پەلاماری دوژمن بدەن‌و ڕێگا لە ڕیشارد ببەستن‌و بەگژایدا بچنەوە، کەچی بەقسەیان نەکردو میر (الجناح)ی برای (سیف الدین المشطوب) لێی چووە پێش‌و بە تووڕەیی قسەی لەگەڵ کرد، سەلاحەددینیش لەقسە ڕەقەکانی تووڕە بوو،[1582] بەڵام چاری نەبوو، لەبەر ئەوە پاشەکشەی لە یافا کردو داوای لە برادەرانی کرد ڕوو لە (بازور) بکەن کە پێنج میل لە دەریاکەوە دوور بوو، بەلای ڕۆژهەڵاتی یافادا، هەرچی دەستکەوتێکیشیان لەو ماوە کەمەی گرتنی یافادا بە دەستیان هێنابوو، هەموویان بەجێ هێشت.[1583]

کەچی ڕیشارد دیسان داوای مۆرکردنی تەباینامەی کردەوەو چاوی بە هەندێ لە میرەکانی سەلاحەددین بکەوێ کە دۆستایەتی لەگەڵیاندا هەبوو، بەنموونە وەك (بدرالدین دلدرم، أبوبکر العادلی، ایبك العزیزی‌و سنقر المشطوب).[1584] کاتێ، ئەم میرانە گەیشتنە لای، پێیانی گوت: ئەم سوڵتانە سوڵتانێکی گەورەو گرانە، ئیسلام لەسەر ئەم زەمینەدا شایەکی وەها مەزن‌و گەورەو گرانی نییە، نازانم چۆن چۆنی بە گەیشتنی من، ئەم جێگایەی بەجێ هێشت، بەخودا قەسەم خۆم بۆ شەڕ ئامادە نەکردووەو لە زربول (پێڵاو)ە، دەریاکەی خۆم، زیاتر، چیدیم لە پێ نەکردووە. ئنجا هەڵگەڕایەوەو گوتی: "بەخوا پیاوێکی گەورەو گرانە، بەتەما نەبووم، یافا بە دوو مانگ بگرێ، کەچی بە دوو ڕۆژ گرتی،

---

1581 رنسیمان، ٣/١٣٦.

1582 الکامل، ١٢/٨٥. مرآة الزمان، ٨/٤١٨.

1583 النوادر، ٢٢٧. الروضتین، ٢/٢٠١. مرآة الزمان، ٨/٤١٨. مفرج الکروب، ٢/٣٩٨. Lane-poole, Saladin. P. 308.

1584 النوادر، ٢٢٧. الروضتین، ٢/٢٠١. مفرج الکروب، ٢/٣٩٨.

تێناگەم".[1585] ئەمجارەش داوای تەبایی نامەی کرد. ئەوەبوو. وەك باسمان کرد. ئەم جارەیان تەبایی نامەکە سەری گرت.

1585 النوادر، ٢٢٨. الروضتين، ٢٠٢/٢. مفرج الكروب، ٣٩٨/٢. البداية والنهاية، ٣٥٠/١٢.

## The Scope Of The Research

The study of the military aspects in history is one of the most important subjects of which our libraries are in dire need. For the military researchers in the Islamic history are still in the initial stage, wherase the other aspects had received much the grater share, especially its political and cultural aspects. It is that prompted me to select that period in which Salahud - din led the Islamic armies to liberate the Syrian lands from the crusade occupation, as soon as the circumstances became propicious for him to assume the position of the supreme responsibility, after the death of the Sultan Nurud - din Mahmud bin Imadud - din Zengi, and depending on the enormous human power reserve which came under his discretion and the economic capacities of Syria, Eygept and Jazerah, in addition to his talents for organization and leadership, and his military accomplishment.

The military type of the study requires refraining from following the lead of the political history, so we avoid tailing in detail of the early seventh through which Salahuddin had lived together with his family in Syria, then the developments in Egypt had witnessed and how he could weld in his hand the reign of power there, as well as his coming to Damascus and the detail of his movements in Syria, then his assuming the remainder of Nurud - din authority there, we also avoid entering in to details of his relations with the other Islamic dynasties, such as the Abbasid caliphate in Baghdad and the Atabegs of Mosul and the Jazerah princes and others, also his relations with Armenian leaders and the Byzantine Empire, except where extrme necessity requires some casual comments.

We try not to limit ourselves entirely to the quarter of a century during which Salahud - din geverned Egypt, then Syria. For organizations and institutions (military, administrative, economic, etc) would not disappear with the end of a period and of the new period, but they continue in the bossoms of the new regime for a while, then start to weaken and wither away if such was the destiny deemed for such institutions or else, they would commence a new period of growth and prosperity. For it is a thorny problem in the study of organizations to demonstrate a proof of the contribution rendered by this state or that regime, i.e, the new types of institutions and traditions. It is a fact that a certain state can not lay the bases of it is organizations without borrowing those which are older then itself, in particular those military organizations which suited its circumstances. Then new frementations begin, and new issues sprout in order to be added to the previous expeiences; and from all that emerge organizations attributable to the new state.

The organizations of the Ayyubid military state did not deviate from this rule.

And if we exclude the radical changes carried out by Salahud - din in Egypt especially in the structure of the Fatimid Army and Navy. we shall see that the Ayyubid state followed, mostly in the footsteps the Zengid traditions which tained it with its own color, and this is because the Ayyubid originally rose to prominance on the behest of Imadud - din Zengi and his son Nurud - din Mahmud, and because Syria had become the arena on which the army of Salahud - din moved, and in this way the Ayyubid organizations appeared as if they were extentions from the organizations of Nurud - dins state. Qalquashandi would mean the same when he states that: The Ayyubids upon succeding the Fatimid state and replacing it in Egypt, differed much in structure from it, and changed most of its appearances, and it followed on the footsteps of the Atabeg state as it was standing at the time of Imadud - din at Mosul, then his son AlMalik Al adil Nurud - din Mahmud in Syria” Perhaps this continuity is more applicable To the army organization and the increase in recruits and to the feudalism and maintenance of mamluks than to other aspects. We do explain this through the chapters

of this thesis. We are not concerned with the detailed study of the military organization in the Nurid or Zengid state, for this will drag us beyond the scope of this subject and returning backward to organizations preceded the Atabegid organizations, in particular to Saljuquid state from which the Atabigids sprang. Or as Abdul-Mahasin Ibn Taghri Barada stated that: "The Buwayids promoted the Saljuquids and Saljuquids prompted Artuquids and Aq Sungur the grand father of Zengids. then The latter sponsored the Ayyubids the Sultans of Egypt (and Syria), then the Ayyubids sponsored the Mamluks and the state of the Turks, and behold such are the twists and turns of fourtune as dynasties auspics and sponsor one another to this day?" (i.e up To the time of the historian).

In addition, our thesis is not a comparative study including the study of the Ayyubid Salahud - din an army as it stood, with shedding, whenever necessary, the light on the proceduers in the Nurid army in Syria and Jazerah, and in the Fatimid army in Egypt, we shall see that our knowledge of the structure of the Nurid regiment which Asadud - din Sherkow, Salahud - dins uncle, has led to Egypt. in particular in the third (last) campaign that permanently settled in that country of the Nurid army structure in general, taking at the same time in to considration the changes and expansions occured in the Ayyubid army after it had settled in Syria. We ought to refer to the fact that we do not take into considration the Ayyubid force dispaches to the lands of Yaman, under Salahud- dins brother Al Malik Al Mu'aaz'am Shamsuldawlwh Toran Shah bin Ayyub (569-577H/ 1137-1181 A.D) because we limit the research to the Ayyubid Salahud - dins army an Egypt in Syria, and because The Yaman did not contribute to any extent in the military efforts of Salahud - dins armies. But we point out otherwise that this campaign of Umar, nephew of Salahud - din to Burqua (Lybia), the news of which soon disappeared, had ingaged part of the army by garrisoning these two territories. In fact Turan Shah took a thousand knights to accompany him, except thise if his own entourage. We devide the thesis into seven chapters. In the first chapter we consider the characteristics of the period in which the Fatimid state has passed its last days. and how Egypt deteriorated to a weak state, descendig from a zenth power, of a strong, expansive state included within its limits wide regions of Syria and North Africa, and it was its weakness that had motivated the crusaders to aspire for the acquisition of the inexhaustible resoueces, and to use it to impose their complete controle over the Arab lands in Syria, Palastine and Egypt. The internal rivalry for acquisition of ministerial position in Egypt, however impelled aparty among crusaders to request help from Nurud - din Mahmud, who dispatched his forces in succesive campaigns to Egypt, and in this way could stop the crusaders attempts,and settle in Egypt and pave The way for the coup de etat against the Fatimid caliphate. In this chapter we consider the organization of th Ayyubid army and expatiate in the discreption of the city of Damascus, and the reasons that made Salahud - din chose it as a centre of his army, from where it was dispatched to vairous battlifields, and how it was made the asylum of the crusaders captives, and the seat of the department of the army in Syria. we make an exposition of the changes occured to the military uniform and costums at Salahud - dins time and his succesors such as the head gear or clothes of footwear. Then we deal with the subject of provisions and victuals, with Nurid and Fatimid military feudalism and their extentions under Salahud - din, we deal with the problem of military mobilization and the methods applied, and the case of the private entourage, as well as the Mamluks of the Sultan, the system of (Atlab) and the army ranks according to the weapons of each rank. We consider the case of the volunteers in the Ayyubid army whi had been prompted by love of Jihad (holly war) to volunteer avd combat the crusading enemy. Then we consider the regiments attached to the army, such as the engineering regiment, the

medical regiment and the military musical band, as well as the banner bearers of the army.

In the third chpter We continue the discussion of other auxiliary institutions of the army organization and the management of the battle, peace and prisoners affairs. We devide the chapter into two parts; in one part We discuss the case of the post and Al - Yazak (connaitoire ditachment) and pegion carrier post (Al - Huwadi) and ambuscade. We point out that the intelligence of Salahud - din was acquainted with criptology. In the second part of the chapter we deal with the military consultative council whose members were the princes and comanders who assisted Salahud - din with their opinions on the serious military affairs especially in critical military situations. Then the plans and schemes laid out at each of the battles, the seasons of the military actions or their cessation. Then we discuss the ways of dealing with the crusaders captives, and conclude the chapter with discussing the traeties concluded between Salahud - din and the crusaders, the last of which was the treaty of (Ramla), after which there followed the evaquation of Richard the Lion Heart from Palastine and his return to his country.

We dedicate the fourth chapter to the discussion of weapons of the Ayyubid army, and we have to adopt one of two alternative ways: a discussion of the priliminary usage of these weapons in the Arabic and Islamic history, to single out the innovations introduced by the Arabs or the borrowings from other nations; or a research in the weapons and equipments in use in that period. We choose the second alternative, for we do not search after weapons in general, but only the weapons in use at the time of Salahud - din, we consider the arms arsenal, or the so-called (Silah-Khana) or (Zard Khana), as it was known at the time of the Mamluks. We point out to the places where available the basic natural materials for the manifacturing of arms, such as wood or iron, then we divide the weapons to five kinds, firstly we consider the personal weapons carried by one person, as the sword, the lance, hatchet and the bow, this last weapon had been developed greatly, and many kinds of this weapon appeared; we consider five kinds among which bows implemented by more than one person, and in this way stopped from being personal weapon, yet we regarded them among the bows .

We consider heavy weapons, among which where fire-throwers; we describe the mangonel and its various kinds, the tank and accessories, we refer to many weapons of the sort of body protection, such as Maghfara, Al-Baida, Jawshan, lastly we consider traingulars and wellers. In the fifth chapter we consider the sea force navy at Salahud - dins Time, En order to complete the picture of Salahud - dins army. we describe the position and status of Egyptian sea power at the end of Fatimid era, the reforms Salahud - din introduced in this domain, then the centres of Egyptian shipbuilding, and the various vessels in the Ayyubid Navy, the equipments and the weapons used in the warships, also the special apparatus used to counter the equipments of the enemy. We consider the succesive stages of the development of the Ayyubid sea force. We divided it into three stages; for after the preparatory stage and the laying of basis, there came the second stage, when the Ayyubid navy played a prominent role in the struggle against the powerful crusading sea force in the mediterranean sea as the arena on which the tow navies contested, excluding the unsuccessfull landing attempt which the crusaders carried out in on the coast of the red sea. The last stage of the sea force building came after the battle of Hattin. In the last two chapters (6th-7th) we consider the military activities of Salahud – dins army in the most famous wars he waged against the crusaders, in order to demonstrate the organizations and plans of this army as it a state of movement and practice. In the sixth chapter we try to

ditinguish between seige battles and open battles, and we point to The examplars among his battles. We did not expatiate all the battles for the details are similar. We consider the failures of the Ayyubid army. We do not confine our considrations to the battles on Syrian and Palastinian arenas, but also describe the blockade of Alxandria carried out by the crusaders and the way the Moslems triumphed over them and foiled their plan to occupy Egyptian coast land once more, after their failure at Dimiatt. Then the successive seige of Karak and the successes of the Ayyubid army in capturing it after Hattin, and also the blockade of the Syrian coast towns, and Salahud- dins success in capturing them, also the liberation of Jerusalem which had a resounding effect al over the Islamic world. We consider the seig of Tyre and its failure, and how this became a turning point in the future behaviour of the Ayyunbid army. In the sixth chapter we stop at the end of the decisive battle of Hattin.

In the seventh chapter we consider the prolonged blockade of Acre which had lasted about two years, and the struggle raged between the crusade army besieging the city and the Ayyubid army which was surrounding the crusading army, then the tragic fall of the city, despite the unprecedented courage displayed by the city in opposing the enemy, and the reasons of this fall at the hand of Richard. we consider the events that followed this disaster and the weakness befall the army of Salahud - din, especially at the time of the march towards Askalon. Despite this his army never ceased from harassing crusaders who were led by the king who was able to defeat the Moslems in the woods of Arsuf. These two events (the fall of Acre and the defeat at Arsuf) had compelled Salahud-din to change his previous defensive plan to new defensive importance which the Ayyubid army was unable to defend, and which were apt to fall into the hands of the crusaders who could make them the starting Piont for attacking the important centres in Egypt and Jerosalem. The Prompted Salahud – din to destory these Cstles, and after completing this work he rverted to the organization of the defences of Jerosalem against the expected onslaught of Richard. In the end the Ayyubid army staged the first attack since a Iong time. Taking advantage of the absence of Richard, and tried to capture Jafa, but the undertakinge ended in failiure, especially after Richard had come back, and continued his negotiations with the comandres of the army of Salahud – din, displaying his desire to conclude armistices eith the Sultan.

As I conclude this exposition Iam under obligation to confess that my study can not succeed in the full exposition of the whole truth, and the expatition of the in its entirety, this is a far – fetched aspiration, because it is difficult for one study to comprechend all the facts of a subject, and what Iam triying to achieve is no more than an attempt to pave the way for compilmentary studies in future. Ihope that I have been able to contribute, Even to a small degree to the study of this history of Salahud – din. The liberator holy warrior .

## ژێدەرو سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە

### یەکەم: سەرچاوە کۆنەکان:


إبن أبي أصبيعة الخزرجي. أبو العباس موفق الدين أحمد بن القاسم (ت٦٦٨هـ/ ١١٦٩م).

١.عيون الأنباء في طبقات الأطباء، إصدار دار الفكر، بيروت ١٩٥٧. إبن الأثير، أبو الحسن عزالدين علي بن أبي الكرم بن محمد بن عبدالكريم الشيباني الجزري (ت٦٣٠هـ/ ١٢٣٣م).

٢. التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية بالموصل وحلب، تحقيق د. عبدالقادر أحمد طليمات. طبع دار الكتب الحديثة بالقاهرة ١٩٦٣.

٣. الكامل في التأريخ، دار صادر ودار بيروت، بيروت ١٩٦٦.

إبن الأزرق، أبو عبدالله محمد بن علي بن محمد بن علي بن قاسم بن مسعود (ت٨٩٦هـ/ ١٤٩٠م).

٤. بدائع السلك في طبائع الملك، تحقيق د. علي سامي النشار، منشورات وزارة الأعلام العراقية. دار الحرية للطباعة. بغداد ١٩٧٧.

ابن إياس، أبو البركات محمد بن أحمد بن إياس الحنفي المصري (ت٩٣٠هـ/ ١٥٢٢م).

٥. تأريخ مصر (بدائع الزهور في وقائع الدهور) المطبعة الكبرى الأميرية ، بولاق ، مصر ١٣١١هـ.

إبن تغزي بردي، أبو المحاسن جمال الدين يوسف بن تغري بردي الأتابكي (ت٨٧٤هـ/ ١٤٦٩م).

٦. النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة ١٩٣٨.

ابن جبير، ابو الحسن محمد بن أحمد بن جبير (ت٦١٤هـ/ ١٢١٧م).

٧. رحلة ابن جبير، دار صادر و دار بيروت، بيروت ١٩٦٤.

ابن الجوزي، أبو الفرج عبدالرحمن بن علي بن محمد بن علي (ت٥٩٧هـ/ ١٢٠١م).

٨. المنتظم في تأريخ الملوك والأمم، مطبعة دائرة المعارف العثمانية حيدر آباد الدكن، الهند، ١٣٥٨هـ/ ١٩٣٩.

ابن الجيعان، شرف الدين يحيى بن المقر (ت٨٨٥هـ/ ١٤٨٠م).

٩. التحفة السنية بأسماء البلاد المصرية، الناشر مكتبة الكليات الأزهرية، القاهرة ١٩٧٤.

إبن حمديس، عبدالجبار أبوبكر بن محمد (ت٥٢٧هـ/ ١١٣١م).

١٠. ديوان أبن حمديس، قدم له د. أحسان عباس، دار صادر و دار بيروت، بيروت ١٩٦١.

١١. العبر وديوان المبتدأ والخبر، (تأريخ ابن خلدون) دار الكتاب اللبناني، بيروت ١٩٦١.

ابن خلدون، ابو زيد عبدالرحمن بن محمد (ت٨٠٨هـ/ ١٤٠٥م).

١٢. المقدمة (مقدمة إبن خلدون) المطبعة البهية، القاهرة، (سنة الطبع بلا).

ابن خلكان، أبو العباس شمس الدين أحمد بن محمد بن ابي بكر الاربلي (٦٨١هـ/ ١٢٨٢م).

١٣. وفيات الأعيان وأنباء الزمان، تحقيق د. إحسان عباس، مطبعة الغريب، دار الثقافة، بيروت، ثمانية أجزاء، ١٩٦٨، ١٩٧١م.

ابن زيني دحلان، سيد أحمد.

١٤. الفتوحات الاسلامية، الناشر مؤسسة الحلبي وشركاه للنشر والتوزيع، مطبعة المدني، القاهرة، ١٣٧٨هـ/ ١٩٦٨م.

ابن الساعي الخازن، أبو طالب تاج الدين علي بن انجب بن عثمان البغدادي (ت٦٧٤هـ/ ١٢٧٦م).

١٥. الجامع المختصر في عنوان التواريخ وعيون السير، عني بنسخه ونشره، د. مصطفى جواد، المطبعة السريانية الكاثوليكية، بغداد ١٩٣٤.

ابن سيدة، ابو الحسن علي بن اسماعيل النحوي الاندلسي (ت٤٥٨هـ/ ١٠٦٤م).

١٦. كتاب المخصص، المكتب التجاري، بيروت، المطبعة الأميرية الكبرى، طبعة بولاق ١٣١٦هـ.

إبن شاهين الظاهري، غرس الدين خليل (ت٨٧٣هـ/ ١٤٦٧م).

١٧زبدة كشف الممالك وبيان الطرق والمسالك، باعتناء وتصحيح بولس راويس، المطبعة الجمهورية، باريس ١٨٩٤.

إبن شداد، لأبو المحاسن بهاء الدين يوسف بن رافع الأسدي (ت٦٣٢هـ/ ١٢٣٤م).

١٨. النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية (سيرة صلاح الدين) تحقيق د. جمال الدين الشيال، طبعة الدار المصرية، القاهرة ١٩٦٤.

إبن شداد، أبو عبدالله عزالدين محمد بن على بن ابراهيم الحلبي (ت٦٨٤هـ/ ١٢٨٥م).

١٩. الأعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشام والجزيرة (تأريخ لبنان والأردن وفلسطين) تحقيق د. سامي الدهان، مطبعة المعهد الفرنسي للدراسات العربية ١٣٨٢هـ/ ١٩٦٢م، ج٢، ق٢.

ابن الصيرفي، أبو القاسم أمين الدين علي بن منجب بن سليمان المصري (ت٥٤٢هـ/ ١١٤٧م).

٢٠. الأشارة الى من نال الوزارة، تحقيق و تعليق عبدالله مخلص، طبع المعهد العلمى الفرنسي، ١٩٢٤.

ابن الطقطقا محمد بن علي بن طباطبا (ت٧٠٩هـ/ ١٣٠٩م).

٢١. الفخرى في آداب السلطانية والدول الاسلامية، طبعة دار صادر، بيروت ١٩٦٦.

ابن طلحة الوزير، أبو سالم كمال الدين محمد بن طلحة (٦٥٢هـ/ ١٢٥٤م).

٢٢. العقد الفريد للملك السعيد، مطبعة الوطن، القاهرة ١٣٠٦هـ.

ابن العبري، أبو الفرج غريغوريوس أهرون الملطي (ت٦٨٥هـ/ ١٢٨٦م).

٢٣. تأريخ مختصر الدول، المطبعة الكاثوليكية، ط٢، بيروت ١٩٥٨.

٢٤. تأريخ الدول السرياني، صنفه باللغة السريانية، ترجمه الى العربية إسحاق أرملة السرياني. منشور في مجلة المشرق البيروتية، المطبعة الكاثوليكية، بيروت من السنة ٤٦ لعام ١٩٥٢ الى السنة ٤٩ لعام ١٩٥٥، ج٤، ٥.

ابن العديم، أبو القاسم كمال الدين عمر بن أحمد بن هبة الله الحلبي (ت٦٦٠هـ / ١٢٦١م).

٢٥.زبدة الحلب من تأريخ حلب، تحقيق د. سامى الدهان. المطبعة الكاثوليكية، بيروت ج٢، طبع سنة ١٩٥٤، ج٣، طبع ١٩٦٧.

ابن العماد الحنبلي، أبو الفلاح عبدالحي (ت١٠٨٩هـ/ ١٦٧٨م).

٢٦. شذرات الذهب في أخبار من ذهب، مطبعة القدسي، القاهرة، ط١٣٥٠هـ / ١٩٣١م.

ابن الفرات، ناصرالدين محمد بن عبدالرحيم (٨٠٧هـ/ ١٤٠٤م).

٢٧. تأريخ إبن الفرات، تحقيق د. حسن محمد الشماع. مطبعة حداد، البصرة ١٩٦٧.

ابن القاضي شهبة. أبو الفضل بدر الدين محمد بن تقي الدين بن قاضي شهبة الاسدي الشافعي (ت٨٧٤هـ/ ١٤٦٩م).

٢٨. الكواكب الدرية فى السيرة النورية (تأريخ السلطان نورالدين محمود ابن زنكى) تحقيق د. محمود زايد، دار الكتاب الجديد، بيروت ١٩٧١.

ابن قتيبة، أبو محمد عبدالله بن مسلم (ت٢٧٦هـ/ ٨٨٩م).

٢٩. المعارف، تحقيق ثروت عكاشة، مطبعة دارالكتب، القاهرة ١٩٦٠.

ابن القلانسي، أبو يعلى حمزة (ت٥٥٥هـ/ ١١٦٠م).

٣٠. ذيل تأريخ دمشق، مطبعة الآباء اليسوعيين، بيروت ١٩٠٨.

ابن كثير، أبوالفداء عمادالدين أسماعيل بن عمر القرشي الدمشقي (ت٧٧٤هـ/ ١٣٧٢م).

٣١. البداية والنهاية، مطبعة السعادة، القاهرة ١٩٣٢م.

ابن مماتي، الأسعد بن الخطير المهذب بن مينا المصري (ت٦٠٦هـ/ ١٢٠٩م).

٣٢. قوانين الدواوين، تحقيق عزيز سوريال عطية، طبع مصر ١٩٤٣.
ابن منقذ، أبو المظفر مؤيد الدين أسامة بن مرشد بن منقذ الكنانى الشيزري (ت٥٨٤هـ/ ١١٨٨م).
٣٣. الأعتبار، تحقيق فيليب حتي، مطبعة جامعة برنستون، الولايات المتحدة ١٩٣٠.
ابن منظور، أبو الفضل جمال الدين محمد بن مكرم المصرى (ت٧١١هـ/ ١٣١١م).
٣٤. لسان العرب، دار صادر، دار بيروت، لبنان ١٣٧٤. ١٣٧٥هـ/ ١٩٥٥. ١٩٥٦م.
ابن منكلي، محمد الناصر بن محمود بن منكلى المصري (ت٧٧٨هـ/ ١٣٧٦م).
٣٥. التدبيرات السلطانية في سياسة الصناعة الحربية، مخطوط مصور بالفوتستات في المجمع العلمى العراقي، تحت رقم (٦٤٦. سلاح).
ابن ميسر، محمد بن على بن يوسف (ت٦٧٣هـ/ ١٢٧٨م).
٣٦. أخبار مصر، باعتناء هنري ماسيه، مطبعة المعهد العلمى الفرنسي، القاهرة ١٩١٩.
ابن واصل، جمال الدين محمد بن سالم الحموى (ت٦٩٧هـ/ ١٢٩٧م).
٣٧. مفرج الكروب في أخبار بني أيوب، تحقيق د. جمال الدين الشيال ج١، مطبعة جامعة فؤاد الأول، القاهرة ١٩٥٣، ج٢، المطبعة الأميرية ، القاهرة ١٩٥٧.
ابن الوردي، أبو حفص زين الدين عمر (ت٧٤٩هـ/ ١٣٤٨م).
٣٨. تأريخ ابن الوردى (ذيل المختصر في أخبار البشر) المطبعة الحيدرية، النجف الأشرف ١٩٦٩.
ابن هذيل، علي بن عبدالرحمن بن هذيل الأندلسي (ق ثامن هـ).
٣٩. حلية الفرسان وشعار الشجعان، تحقيق محمد عبدالغني حسن، مطبعة دار المعارف، بغداد ١٩٥١.
ابن يحيى، صالح (النصف الأول من القرن التاسع الهجري/ النصف الأول من القرن الخامس عشر الميلادي).
٤٠. كتاب تأريخ بيروت، المطبعة الكاثوليكية، ١٩٦٩.
أبو شامة، شهاب الدين عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي الدمشقي (ت٦٦٥هـ/ ١٢٦٦م).
٤١. كتاب الروضتين في أخبار الدولتين (النووية والصلاحية) ج١، ق١، نشر وتحقيق محمد حلمى محمد أحمد، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة ١٩٥٦م.
ج١، ق٢، تحقيق د. محمد حلمى محمد أحمد، مراجعة د. محمد مصطفى زيادة، المؤسسة المصرية العامة للتأليف والترجمة والطباعة والنشر، القاهرة ١٩٦٢م.
الكتاب نفسه بجزأيه، مطبعة وادى النيل، القاهرة ١٢٨٧. ١٢٨٨هـ.
٤٢. الذيل على الروضتين (تراجم رجال القرنين السادس والسابع) باعتناء محمد زاهد الكوثري (القاهرة ١٣٦٦هـ/ ١٩٤٧م).
أبو الفداء، عمادالدين إسماعيل بن محمد بن تقي الدين عمر الأيوبي، صاحب حماه (ت٧٣٢هـ/ ١٣٣٢م).
٤٣. المختصر في أخبار البشر، مطبعة دار الكتاب اللبنانى، بيروت.
أبو يعلى الفراء، محمد بن الحسن بن محمد (ت٤٥٨هـ/ ١٠٦٤م).
٤٤. الأحكام السلطانية، شركة مكتبة مصطفى البابي الحلبي وأولاده بمصر ١٣٥٦هـ/ ١٩٣٨م.
أبومخرمة ، أبو محمد عبدالله الطيب بن عبدالله بن أحمد (القرن العاشر الهجرى).
٤٥. تأريخ ثغرعدن، مطبعة بريل، ليدن ١٩٣٦.
الأصفهاني، عماد الدين الكاتب، أبو عبدالله محمد بن محمد بن حامد بن عبدالله بن علي (ت٥٩٧هـ/ ١٢٠٠م).
٤٦. خريدة القصر وجريدة العصر (قسم شعراء مصر) نشر أحمد أمين وشوقي ضيف واحسان عباس، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة ١٩٥١.

. الكتاب نفسه، قسم شعراء الشام، تحقيق د. شكري فيصل، المطبعة الهاشمية، دمشق ١٣٨٣هـ/ ١٩٦٤م.
٤٧. الفتح القسي في فتح القدسي، تحقيق وشرح وتقديم محمد محمود صبح، الدار القومية للطباعة والنشر ١٩٦٥.
الأوسي الأنصاري، عمر بن إبراهيم (أوائل القرن التاسع/ أوائل القرن الخامس عشر الميلادى).
٤٨. تفريج الكروب في تدبير الحروب، حققه وترجمه الى الأنكليزية، الدكتور جورج سكانلون، منشورات الجامعة الأمريكية بالقاهرة ١٩٦١.
الأيوبي، الملك المنصور محمد بن تقى الدين عمر بن شاهنشاه بن أيوب، صاحب حماه (ت٦١٧هـ/ ١٢٢٠م).
٤٩. مضمار الحقائق وسر الخلائق، تحقيق د. حبشي، دار الهنا، طبع عالم الكتب، القاهرة، ١٩٦٨.
البغدادي، عبداللطيف بن يوسف بن محمد (ت٦٢٩هـ/ ١٢٣٠م).
٥٠. الأفادة والاعتبار في الامور المشاهدة والحوادث المعاينة بأرض مصر، نشر كمال حافظ زند وجون آ. وايفى أي. فيدين، طبعة لندن ١٩٦٥.
البنداري، قوام الدين الفتح بن علي (ت قرن سابع هـ/ ثالث عشر م).
٥١. سنا البرق الشامي (تلخيص البرق الشامي للعماد الكاتب الأصفهانى) تحقيق د. رمضان ششن، دار الكتاب الجديد، بيروت ١٩٧١، ج١.
بنيامين التطيلي، بنيامين بن يونه الاندلسي ( ت٥٦٩هـ/ ١١٧٣م).
٥٢. رحلة بنيامين، ترجمة من العبرية، عزرا حداد، المطبعة الشرقية، بغداد ١٩٤٥.
الثعالبي، أبو المنصور عبدالملك بن محمد (ت٤٢٩هـ/ ١٠٣٦م).
٥٣. فقه اللغة وسر العربية، مطبعة الاستقامة، القاهرة ١٩٥٩.
الجاحظ، أبو عثمان عمرو بن بحر (ت ٢٥٦هـ/ ٨٦٨م).
٥٤. الحيوان، تحقيق وشرح عبدالسلام محمد هارون، مطبعة مصطفى البابي الحلبي وأولاده، مصر ١٣٥٦هـ/ ١٩٣٨م).
٥٥. رسائل الجاحظ، تحقيق عبدالسلام هارون، القاهرة مكتبة الخانجى ١٩٦٤. ١٩٦٥.
الجواليقى، أبو منصور موهوب بن أحمد بن محمد (ت٥٤٠هـ/ ١١٤٥م).
٥٦. المعرب من الكلام الأعجمى على حروف المعجم، طهران ١٩٦٦.
الجوهري، أسماعيل بن حماد أبو نصر بن حماد الفارابي (ت٣٩٨هـ/ ١٠٠٦م).
٥٧. الصحاح، تاج اللغة، طبعة دار الكاتب العربي، تحقيق أحمد عبدالغفور عطار، القاهرة دار الكتاب العربي ١٣٧٥هـ/ ١٩٥٦م.
حاجى خليفة، مصطفى بن عبدالله (كاتب حلبي).
٥٨. كشف الظنون في أسامي كتب وفنون، المطبعة الاسلامية، طهران ١٣٨٧هـ/ ١٩٤٧م.
الحسيني، أبو الحسن صدرالدين علي ناصرالدين بن علي (عاش في القرن السابع الهجرى).
٥٩. أخبار الدولة السلجوقية، باعتناء محمد إقبال، طبع نشريات كلية بنجاب، لاهور ١٩٣٣.
الحموي، أحمد بن محمد (ت١١٤٢هـ/ ١٧٢٩م).
٦٠. النفحات المسكية في صناعة الفروسية، تحقيق عبدالستار القرهغولى، مطبعة التفيض، بغداد ١٣٦٩هـ/ ١٩٥٠م.
الحموي، أبو الفضائل محمد بن علي بن العزيزي بن علي بن مزهر بن بركات (ت٦٤٤هـ/ ١٢٤٦م).
٦١. التأريخ المنصور، تلخيص الكشف والبيان في حوادث الزمان، نشر بطرس غريا زنيويج، موسكو، دار النشر للآداب الشرقية ١٩٦٠.
الحموي، أبو عبدالله شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الرومي (ت٦٢٦هـ/ ١٢٢٨م).

٦٢. معجم الأدباء، نشر د. أحمد فريد رفاعي، مكتبة عيسى البابي الحلبي وشركاه بمصر.
٦٣. معجم البلدان، دار صادر، دار بيروت ١٩٥٥. ١٩٥٧.
الحميري، أبو عبدالله محمد بن محمد بن عبدالمنعم (عاش في القرن التاسع الهجري).
٦٤. الروض المعطار في خبر الأقطار، تحقيق د. إحسان عباس، مكتبة لبنان، طبع دار القلم للطباعة، بيروت ١٩٧٥.
الحنبلي، أبو البركات عزالدين أحمد بن إبراهيم بن نصرالله العسقلانى المصري (ت٨٧٦هـ/ ١٤٧١م).
٦٥. شفاء القلوب في مناقب بني أيوب، تحقيق ناظم رشيد، من مطبوعات وزارة الثقافة والفنون، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٧٨م.
الخزرجي، الشيخ على بن الحسن (ت٨١٢هـ/ ١٤٠٩م).
٦٦. العقود اللؤلؤية في تأريخ الدولة الرسولية، تصحيح وتنقيح محمد بسيونى عسل، مطبعة الهلال، القاهرة ١٩١١.
الخوارزمي، جمال الدين أبوبكر بن العباس، (ت٣٨٣هـ/ ٩٩٣م).
٦٧. مفيد العلوم ومبيد الهموم، المطبعة الشرقية، القاهرة (١٣٢٨هـ/ ١٩٠٩م).
الخوارزمي، أبو عبدالله محمد بن أحمد بن يوسف (ت٣٨٧هـ/ ٩٩٧م).
٦٨. مفاتيح العلوم، مطبعة الشرقية، إدارة المطبعة المنيرية، القاهرة ١٣٤٢هـ.
الدميري، كمال الدين أبو البقاء (ت٨٠٨هـ/ ١٤٠٥م).
٦٩. حياة الحيوان الكبرى، دار الطباعة، القاهرة ١٢٩٢هـ.
الدواداري، أبوبكر بن عبدالله بن أيبك (ت بعد ٧٣٦هـ/ ١٣٣٥م).
٧٠. الدرة المضية في أخبار الدولة الفاطمية، تحقيق د. صلاح الدين المنجد، مطبعة المعهد الألمانى للآثار، القاهرة ١٩٦١.
٧١. الدر المطلوب في أخبار ملوك بني أيوب، تحقيق د. سعيد عبدالفتاح عاشور، مطبعة عيسى البابي الحلبي، القاهرة ١٩٧٢.
الذهبي، أبو عبدالله شمس الدين محمد بن احمد الدمشقي (ت٧٤٨هـ/ ١٣٤٧م).
٧٢. مختصر تأريخ الأسلام، مخطوط مصور في مكتبة الدراسات العليا، (قسم ١، ٢) تحت رقم ١٦٥٩، ١٦٦٠.
٧٣. العبر في خبر من غبر، تحقيق د. صلاح الدين المنجد، مطبعة حكومة الكويت ١٩٦٣.
٧٤. دول الإسلام، مطبعة جمعية دائرة المعارف العثمانية، حيدرآباد، الدكن الهند (١٣٦٥هـ/ ط٢).
الزبيدي، أبو الفيض محب الدين محمد مرتضى الحسيني الواسطي (ت١٢٠٦هـ/ ١٧٩١م).
٧٥. تاج العروس من جواهر القاموس، المطبعة الخيرية، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت ١٣٠٦هـ.
سبط ابن الجوزي، أبو المظفر شمس الدين قزاوغلي التركي (ت٦٥٤هـ/ ١٢٥٦م).
٧٦. مرآة الزمان في تأريخ الأعيان، مطبعة مجلس دار المعارف العثمانية، حيدرآباد، الدكن الهند ١٩٥١، ج٨ قسم أول.
السبكي، أبو نصر تاج الدين عبدالوهاب بن تقي الدين (ت٧٧١هـ/ ١٣٧٠م).
٧٧. طبقات الشافعية الكبرى، تحقيق محمود محمد الطناحى و عبدالفتاح محمد الحلو، مطبعة عيسى البابي الحلبي، القاهرة ١٩٧٠.
السيوطي، جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر (ت٩١١هـ/ ١٥٠٥م).
٧٨. حسن المحاضرة في أخبار مصر والقاهرة، المطبعة الشرقية ١٣٢٧هـ.
الصفدي، صلاح الدين خليل بن أيبك (ت٧٦٤هـ/ ١٣٦٣م).
٧٩. الوافى بالوفيات، نشر باعتناء هلموت ريتر، دار النشر فرانز شتاينر فيسبادن، ألمانيا ١٣٨١هـ/ ١٩٦٢م.
الطبرسي، أبو على الفضل بن الحسن (ت ٥٤٨هـ. ١١٥٣م).

٨٠. مجمع البيان في تفسير القرآن، ط٢، طبع ونشر دار الفكر، بيروت ١٩٥٥.
الطبري، أبو جعفر محمد بن جرير (ت٣١٠هـ/ ٩٩٢م).
٨١. تأريخ الرسل والملوك، مطبعة الاستقامة، القاهرة ١٩٣٩.
الكتاب نفسه، ط إنتشارات جهان. طهران عن طبعة دى غوبة.
الطرسوسي، مرضي بن علي بن مرضي (ت٥٨٩هـ/ ١١٩٣م).
٨٢. تبصرة أرباب الألباب في كيفية النجاة في الحروب من الأسواء ونشر أعلام الأعلام في العدد والآلات المعينة على لقاء الأعداء.
مخطوط مصور بالميكروفيلم، نسخة شخصية للمؤلف عن نسخة مكتبة بودليان باوكسفورد تحت رقم ٢٦٤.
الطرطوشي، أبوبكر محمد بن الوليد الفهري المالكي (ت٥٢٠هـ/ ١١٢٦م).
٨٣. سراج الملوك، مطبعة بولاق ١٢٨٩هـ.
العباسي، الحسن بن عبدالله (بدأ بتأليفه سنة ٧٠٨هـ/ ١٣٠٨م).
٨٤. آثار الأول في ترتيب الدول، مطبعة بولاق ١٢٩٥هـ.
العصاصي المكي، عبدالملك بن حسين بن عبدالملك (ت١١١١هـ/ ١٦٩٩م).
٨٥. سمط النجوم العوالى في أنباء الأوائل والتوالي، المطبعة السلفية، القاهرة.
العليمي المقدسي، أبو اليمن مجيرالدين عبدالرحمن بن محمد بن عبدالرحمن الحنبلي (٩٢٨هـ/ ١٥٢٠م).
٨٦. الأنس الجليل بتأريخ القدس والخليل، قدمه محمد بحر العلوم، منشورات المطبعة الحيدرية، النجف ١٣٨٨هـ/ ١٩٦٨م.
عمارة اليمنى، أبومحمد نجم الدين عمارة بن ابي الحسن الحكمي (ت٥٦٩هـ/ ١١٧٣م).
٨٧. النكت العصرية في أخبار الوزارة المصرية، تحقيق هرتويغ دانبرغ، مطبعة مرسو، شالون، فرنسا ١٨٩٧م.
العمري، شهاب الدين أبو الفضل الله العمري (٧٨٦هـ/ ١٣٨٤م).
٨٨. التعريف المصطلح الشريف، مطبعة العاصمة، القاهرة ١٣١٢هـ.
الغساني، الملك الأشرف ابو العباس عمادالدين إسماعيل بن العباس (ت٨٠٣هـ/ ١٤٠٠م).
٨٩. العسجد المسبوك والجوهر المحكوك في طبقات الخلفاء والملوك، دراسة وتحقيق د. شاكر محمود عبدالمنعم، دار التراث الاسلامى، للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت. دار البيان. بغداد ١٣٩٥هـ/ ١٩٧٥م.
القزويني، زكريا بن محمد بن محمود (ت٦٨٢هـ/ ١٢٨٣م).
٩٠. آثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر، دار بيروت ١٩٦٠.
القلقشندي، أبو العباس أحمد بن علي بن عبدالله (ت٨٢١هـ/ ١٤١٨م).
٩١. صبح الأعشى في صناعة الإنشا، المطبعة الأميرية، القاهرة ١٩١٣. ١٩١٧.
٩٢. قلائد الجمان في تعريف بقبائل عرب الزمان، تحقيق إبراهيم الأبياري، مطبعة السعادة، دار الكتب الحديثة، القاهرة ١٩٦٣.
٩٣. نهاية الأرب في معرفة أنساب العرب، نشر وتحقيق علي الخاقاني مطبعة النجاح، بغداد ١٩٥٨.
الماوردي، أبوالحسن علي بن محمد بن حبيب البصري البغدادي، (ت٤٥٠هـ/ ١٠٥٨م).
٩٤. الأحكام السلطانية والولايات الدينية، مطبعة مصطفى البابى الحلبي، القاهرة، ١٩٦٠.
المقدسي البشاري، أبو عبدالله شمس الدين محمد (ت٣٨٧هـ/ ٩٩٧م).
٩٥. أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، ط / لندن ١٩٠٦.
المقريزي، أبو العباس تقى الدين احمد بن علي (ت٨٤٥هـ/ ١٤٤٢م).

٩٦. اتعاظ الحنفا بأخبار الأئمة الفاطميين الخلفا، تحقيق د. حمال الدين الشيال دار الفكر العربي، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة ١٩٤٨.

. الكتاب نفسه، تحقيق محمد حلمي محمد، مطابع الأهرام التجارية، القاهرة ١٩٧١.

٩٧. البيان الأعراب عما بأرض مصر من الأعراب، تحقيق د. عبدالمجيد عابدين، ملتزم الطبع والنشر عالم الكتب، القاهرة ١٩٦١.

٩٨. السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق د. محمد مصطفى زيادة، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة ١٩٣٤.

٩٩. المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار، مطبعة بولاق، ١٢٩٤. أوفسيت مكتبة المثنى.

. الكتاب نفسه، طبعة المعهد الفرنسي، القاهرة ١٩١٣. ١٩٢٢. مؤلف مجهول.

١٠٠. خزانة السلاح، مخطوط مصور بالفوتستات في مكتبة الدراسات العليا، كلية الآداب، تحت رقم ١٢٣٢.

النابلسي، عثمان بن إبراهيم (كان حيا في سنة ٦٣٢هـ/ ١٢٣٤م).

١٠١. لمع القوانين المضية في دواوين الديار المصرية، طبعة المعهد الفرنسي، دمشق ١٩٦١.

ناصر خسرو (ت٤٥٢هـ/ ١٠٦٠م).

١٠٢. سفرنامه، ترجمة من الفارسية د. يحيى الخشاب، ط/ دار الكتاب الجديد، بيروت ١٩٧٠.

النويري، شهاب الدين أحمد بن عبدالوهاب (ت٧٣٣هـ/ ١٣٣٢م).

١٠٣. نهاية الأرب في فنون الأدب، مصورة عن نسخة دار الكتب، القاهرة ١٩٥٤.

النويري، محمد بن قاسم بن محمد الاسكندراني (ت بعد سنة ٧٧٥هـ/ ١٣٧٢م).

١٠٤. الالمام بالأعلام فيما جرت به الأحكام، والامور المقضية في وقعة الاسكندرية، تحقيق د. أيتين كومب و د. عزيز سوريال عطية، مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية، حيدر آباد الدكن، الهند ١٩٦٨.

الهرثمي، أبو سعيد (صاحب الخليفة المأمون العباسي).

١٠٥. مختصر سياسة الحروب، تحقيق عبدالرؤوف عون، طبعة المؤسسة العامة للتأليف والترجمة والطباعة والنشر، القاهرة (سنة الطبع بلا).

الهروي، على بن أبي بكر بن علي (ت٦١١هـ/ ١٢١٥م).

١٠٦. التذكرة الهروية في الحيل الحربية، تحقيق مطيع المرابط، منشورات وزارة الثقافة، دمشق ١٩٧٢.

الهمداني، بدرالدين محمد بن حاتم بن على حاتم بن أحمد الهمداني.

١٠٧. السمط الغالى الثمن في أخبار الملوك من الغز باليمن، تحقيق ركس سمث، مطبعة جامعة كمبردج، ١٩٧٤.

اليافعي، أبو محمد عبدالله بن أسعد بن على اليمني المكي (ت٧٦٨هـ/ ١٣٦٦م).

١٠٨. مرآة الجنان وعبرة اليقظان، طبعة منشورات مؤسسة الاعلمي للمطبوعات، ١٩٧٠.

اليماني، تاج الدين عبدالباقي بن عبدالمجيد (ت٧٤٣هـ/ ١٣٤٢م).

١٠٩. تاريخ اليمن، المسمى بهجة الزمن في تأريخ اليمن، تحقيق مصطفى حجازي، مطبعة مخيمر، اليمن ١٩٦٥.

١١٠. ذيل مرآة الزمان، طبعة حيدر آباد الدكن. الهند، ١٣٧٤هـ/ ١٩٥٤م.

**دووەم: كتێبە تازەكان و بە عەرەبی كراوەكان:**

د. إبراهيم علي طرخان

١١١. النظم الاقطاعية في الشرق الأوسط في العصور الوسطى، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة ١٩٦٨.

إحسان هندي

١١٢. الحياة العسكرية عند العرب، مطبعة الجمهورية، دمشق ١٩٦٤.

أحمد رضا

